لە لایەن وەرگێڕەوە پێشکەشە بە بەرەی کوردستانی

# ئایدیۆلۆژیا مۆدێرنە سیاسییەکان

نووسین

ئەندرۆ ڤینسێنت

وەرگێڕانی

عومەر مەولوودی



## دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **ئیدئۆلۆژیا مۆدێرنە سیاسییەکان**
- نووسینی: ئەندرۆ فێنسێنت
- وەرگێڕانی لە فارسییەوە: عومەر مەولوودی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: محەمەد هاشم
- پیتچنین: عەلی جەوشەنی (بۆکان)
- ژمارەی سپاردن: ١٦١٠
- نرخ: ٦٠٠٠
- چاپی یەکەم: ٢٠٠٧
- تیراژ: ١٠٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆک)

زنجیرەی کتێب (٣٤٩)

هەموو مافێکی بۆ دەزگای موکریانی پارێزراوە

من خەریکم باوەڕ بکەم کە گشت جیهان رازێکە، رازێکی بێ ئازار کە کۆششەکانی ئێمە بۆ تەعبیری ئەو، ئەو جۆرە کە دەڵێی راستەقینەیەکی شاراوەی لە ناخی خۆیدا هەیە، ترسناک و تواناسواوی کردووە.

ئۆمبراتواکۆ، ئاونگ فۆکۆ

# ناوەڕۆک

# ئیدئۆلۆژیای مۆدێرنە سیاسییەکان

ئەم کتێبە دەسکەوتی سالانێکی دوور و درێژی وتنەوەی وانەی ئیدئۆلۆژیا لە خولی بکالریۆس (لیسانس)ە. نەسل و پالەوێنەیەکی زۆری خوێندکاران بۆ دەولەمەندتر کردنی بە سەعات بێپسانەوە لێدوان، لەگەڵ چرکەساتی بینینی رەخنەیی و گالتە و گەپ و گێرانەوەی نوکتەی خۆشی، ویستراو و نەویستراو لە پێکهێنانی ئەم کتێبەدا بەشداریان بووە. بەراستی ئەگەر بکرێ بو فێربوونی دەرسی ئیدئۆلۆژی سیفەتێکی باش گولبژێر بکرێ، بێ بەزییانە لە دەروون پاکی، کات، بە سەبری و پشوودرێژی و پسپۆری هاورێیان و هاوخوێندکارانم بەهرەمەند بووم. هەنووکە تێدەگەم کە لە شوێنێکی قەرەبالخی وەک زانکۆ ئەرکێکی گەلێک ئاستەنگ بوو کە من خستوومە ئەستۆی ئەوان. حەز دەکەم بەتایبەت لە (جینۆ بدانی) کە یارمەتییەکی فرەی داوم و کات و دادوەری روونی خۆی لێبووردوانە خستووەتە بە دەستم، سوپاسی لێ بکەم. هەروەها لە (لوئیس ئالان، رابین ئاتفیلد، ئەندرۆ بێلسێی، ستیفان بێرگێر، دەیڤید بوچێر، ئەندی دابسۆن، مارک دونوڤان، گریم دانکەن، دیانا کول، سارا دیلامۆنت، ئەندرۆ ئێدگار، یان فۆربێس، مایکل جۆرج، بروس هەدوک، دەیڤید هەنلی، دەیڤید جەکسۆن، روی جۆنس و باری جۆنس سوپاسیان دەکەم) کە چەند بەشێک لە کتێبەکەمیان خوێندەوە و تۆژینەوەیان لە بارەوە ئەنجام داوە. ئەوان ئەو توانایەیان بە من بەخشی کە لە زۆر هەلە خۆ ببوێرم و لە باشتر کردنی ناوەرۆکی کتێبەکە یارمەتیان کردووم. جگە لە وانەش، لە گرەوی زەحمەتەکانی خێزانەکەم، مەری، و کچەکانم، لیزا و راشل، دام کە لە کۆکردنەوەی کتێبەکەمدا یارمەتیان داوم. شایانی باسە کە بەرپرسایەتی داهێنان و لێکۆلینەوەی ئەم کتێبە تەنیا بە ئەستۆی خۆمە.

هەرچەند کە ئەم کتێبە بۆ فێربوونی ئیدئۆلۆژی کۆکراوەتەوە، بەلام هیچ شتێک بە هیچ شێوەیەک جێی خوێندن ناگرێ. کتێب هێندێ کەرەسەی دەسپێک لە بواری سروشتی ئیدیۆلۆژییەکان پێک دێنێ و لە ئاخاوتنی بەراوردی سەبارەت بە ئەندێشەگەل، ناوەرۆک گەل و بیرمەندان کەلک وەردەگرێ. ئەگەر خوێندکاران تێبکۆشن لانیکەم برێک لە ئاسەواری ناوبراو موتالا بکەن، ئەو دەم ئەم کتێبە دەبێ وەک داهێنانێکی تەواو بۆ بیرکردنەوە و تێرامان لەمەڕ ئیدئۆلۆژییەکان وەک سەرچاوەیەک کەلکی لێ وەردەگیرێ.

لەگەل ئەوەی کە کتێب زۆرتر تایبەت دراوە بە وانە ئیدئۆلۆژییەکانەوە، لە چەند لێدوانێکی دیکەشدا، لەسەرانسەری ئەودا هاتوونەتە ئاراوە. ئەم لێدوانانە پەراوێزی موتالا بەرفراوان دەکاتەوە و برێک لەسەر بەرینی راڤەکردنی جەوهەری ئیدئۆلۆژییەکان فراوانتر دەکاتەوە. بەم حالەوە هەول دراوە هەتا جەماوەری خەلک بتوانن کتێبی ئیدئۆلۆیای مۆدێرنە سیاسییە بخوێننەوە و سوودی لێ بەرن.

ئەندرو ڤینسێنت ـ زانکۆی ویلز، کاریف

لەم بەشەدا باس لە سێ بابەت دەکەین: یەکەم، بەگشتی مێژوویەکی چڕوپڕ لەمەڕ چەمکی ئیدئۆلۆژی و سەرەنجام لێکدانەوەیەکی سەرهەم بەندی لە پێکهاتەی کتێب.

ئەم کتێبە لەمەڕ چەمکی ئیدئۆلۆژی بە مانـای تایبـەتی ئـەو نییـە، بەڵـکو کتێبێکـە لەمەڕ ئیدئۆلۆژییەکان. لەگەڵ ئەمەدا، چونکە کێشە لە ناو بۆچوونەکان سەبارەت بـە ئیدئۆلۆژییەکان زۆرە، بێ را دەربڕین، ئەگەر کورتیش بێ، لـەو بـارەوە ناتوانـێ بـە مەبەستی دیاریکراو بگا. لە بەراورد کردن لەگەڵ ئیدئۆلۆژییـەکان خۆیـان، مێـژووی چەمکی ئیدئۆلۆژی کورت، رەنگە دووسەت ساڵ، بەڵام پێچراوەیە. مێژووی لە دایک بوونی وشەی «ئیدئۆلۆژی» وەکو زۆربەی «ئیـدئۆلۆژی»یـە سیاسـییەکان و نـوێ، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شۆڕشی مەزنی فەڕانسا لە دەیـەی ١٧٩٠. بـۆ ئاشـکرا و روونکردنەوەی مەبەست، مێژوو بە چەند قۆناخ دابەشـکەین و ئەمانـە قۆناخگـەلێکن کە هۆکارن بۆ سەرهەڵدانی ماناگەلی جیـاواز و جۆراوجـۆر. بەگـشتی، باسـەکە بـە وتەیەکی داهێنانەی، فەیلسووفی فەڕانسەوی، ئانتوان دستووت دوو تراسـی، دەیـەی ١٧٩٠ دەس پێدەکەین. ئەو کات بە کار کردی مارکس ئەم واژەیە لە دەیـەی ١٨٤٠ و مـیراتی داپۆشـراو و شـاراوەی مارکسیـستی ئـەو لـە درێژایـی سـەدەی بیـستەم دەگەین، پاشان بۆ کـارکردی ئـەم وشـەیە لـە بزاڤـی (دوا قۆنـاخی ئیـدئۆلۆژی) بـۆ دەیەی ١٩٥٠ دەگەڕێنـەوە. لـە کۆتاییـدا بـە سـیلەی چاوێـک دەڕوانینـە تـازەترین وتووێژ سەبارەت بەم وشەیە.

وشـەی ئیـدئۆلۆژی یەکـەم جـار لـە نێـوان ساڵـەکانی ١٧٩٦ و ١٧٩٨ ئـانتوان دووتراسی کاتێ هەواڵی زانستی لـەژێر ناونیـشانی رەسـالەیەک دەربـارەی هێـزی بیرکردنەوە لە ئەنستیتۆی نەتەوەی پاریس هێنایـە ئـاراوە، ئـەم رەسـالە پاشـان بـە شێوەی کتێب و بە ناوی بنەمای ئیدئۆلۆژی (١٨١٥ ـ ١٨٠٠) چاپ کرا. هەڵـبەت ئەمـە وەک سەرەتایەک راستە کـە رەنگـە تراسـی دەیویـست جگـە لـە پێوەندییەکـەی بـە وشەی ئیدئۆلۆژییـەوە، لـە لایەنـەکانی دیکـەش تـا رادەیـەک کەسـایەتی نەناسـراو

بمێنێ. سەیر لێرەدایە کە مانای ئاشکرا و دەروونی لـە نـاوەڕۆکەکـەی کـە تراسـی خستوویەتە بەرچاو، دەرناکەوێ. لە راستیدا دەتوانرێ چوار کارکرد لەم وشەیـە لـە یەکتر هاوێر بکرێ. کارکردی یەکەم، کارکردی پاکردەی بنەڕەتی تراسی بوو کە بـە زانستی کردەوەی ئەندێشە کۆتـایی پـێ دەهـات؛ کـارکردی دووەم بـە شـێوەیەک پێوەندی بە کۆمارخوازی لیبرالـی عـورفی رێنیـشاندەرە؛ کـارکردی سـێیەم ئامـاژە دەکاتە مانای دەروونی بە کەمزانینی لە بارەی نەزۆکی فیکری و کار بـە کـردەوە و هـەروەها جۆرێـک رادیکالـیزمی ترسـناک؛ سـەرەنجام کـارکردی چـوارەم و کـەم بایەختر و بەلکو ناسکتر و بەشێوەی گشتی پێوەند دەدرێ بە کوتایی، بـە مەسـلەکی سیاسییەوە. هەر چوار ماناکەی باسکراوە، لـە سالـەکانی ۱۸۰۰ تـا ۱۸۳۰ لـە بـاری سیاسییەوە بەبرەو و بازاڕیان گەرم بووە.

وشەی ئیدئۆلۆژی وشەیەکی نوێ بوو و پێکهاتەیەکە لە دوو وشەی یۆنانی eidos و logos کە ئەوە دەتوانێ بە مانای (زانستی ئەندێشە) بێتە ئاراوە.[1] تراسی بـە دووی ناوێکی نوێ بۆ زانـستێکی نوێـوە بـوو. ئـەو ناوانـەی متافیزیـک و دەروونناسـی بـە نابەجێی دەزانی و رەتی دەکردنەوە. بە بۆچوونی تراسی رشتەی متافیزیـک لاڕێ و بێبایەخ بووە، مەبەست لە دەروونناسی یان زانستی رۆح، زانست یـان ناسـینی رۆح بوو کە لەوانە بوو بە هەڵە بکەوێتە هەستی درۆزنانە و تـا رادەیـەک مەزهـەبی بێـت. تراسی کەسێ بوو لە ناخەوە دژی کلیسا و مادەگەرا، ئەو لە سـالانی دەیـەی ۱۷۹۰ و سـەرەتای دەیـەی ۱۸۰۰، بەتایبـەت لـە بـارەی پێراگەیـشتنی فێرکـردن و بارهێنـان سەرقالی خەباتێکی توندوتیژ دژی کلێسای کاتۆلیـک بـوو. لەبـەر ئـەوە هـەر نـاو و بابەتێک کە زانست باسی کردبایە دەبوو لە رازاندنـەوەی دیـن بـە دوور و بـێبـەری بوایە. لێرەدا جێی خۆیەتی بەو خالە ئاماژە بکەم کە داهێنانی وشەی ئیدئۆلۆژی کـەم تا کورتێ بەرامبەر و هاوسەنگ بوو لەگەڵ دەسپێکی دەستەواژەی (علم الاجتماع) ( La science sociale) لەو تافەدا. دەستەواژەی ئەم دواییانە، وەکو ئیدئۆلۆژی، نیشاندەری سەردەمی رۆشنگەری بوو. بەو مانا کە هەست بەوە دەکرا دەتوانێ یاسای زالـبوون بەسەر ژیانی کۆمەلگە و ئامانجی بەختەوەرییەکی زۆرتر و باشـتر بـوونی شـێوەی ژیانی مرۆڤ بە دەس بێنێ و بیخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە.

«تراسی» وەکو زۆرینەی فەیلەسووفانی فەڕانسەوی سەردەمی رۆشنگەری و ئەسحابی دائرەتولمعارف لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە لە هەموو مەیدانەکانی ئەزموونی مرۆڤایەتی، کە زۆربەی ئەوان پێشەکی لە بواری زانستی ئیلاهیات لێکدراونەتەوە، دەبێ عەقلانی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکرێ. زانستی ئەندێشە دەبوایە رێی هەستانی سروشتی ئەندێشەی هەڵسەنگاندایە و زانیاری بە پێوارەیەکی میزان سەبارەت بە هۆکاری بە دیهێنەری ئەندێشەگەل لەهەستەکان. ئەندێشەگەلی سروشتی رەت دەکرانەوە: هەموو دەبوون بە هەستەکان. تراسی ئیدئۆلۆژی بە لقێک لە بوونەوەرناسی ئەدایە قەڵەم و دەیوت هۆش و ئەندێشەی مرۆڤ بنەڕەتی فیزیۆلۆژیکی هەیە. تراسیش وەکو تەجربەگەراکان و کەللەڕەقێکی وەکو بیکێن، دێکارت، نیوتۆن، لاوازیە و کۆندیاک، دەیگوت: ناوەرۆکی ئەم لێکۆڵینەوانە دەبێ بە میتۆدگەلی زانستی بە وردی بچنە خانە و هێلی تایبەتەوە و پێرستی بۆ دابنرێ و هەموو بەشەکانی دیاری بکرێ. تراسی رێزێکی تایبەتی بۆ نیوتۆن دادەنا. یەکێک لە تۆژەرەکان دەیوت: بە ڕا و بۆچوونی تراسی، نیوتۆن سامانبەخشی ئەندێشەگەلی لێکۆلینەوە زانستییەکانی پێشین بووە، کەسێ بووە کە دەتوانێ بیسەلمێنێ. هەموو رووداوگەلی ئێستا و داهاتوو، پێڕەوی گەلالەگەلی دیاریکراوی چەند یاسای ساکارن.[2] لێکدانەوەی تراسی لە شێوەی بەدی هێنانی ئەندێشە و تێگەیشتن و پێوەندی ئەوانە بە یەکترەوە لە کۆی زانستی ئەندێشەگەل، ئێستا دەبێ وەکو دەروونناسی بەکردەوە باسیان بکرێ. لە راستیدا، وەکو یەکێ لە لێکۆلەرەکان دەڵێ: تراسی پێش هەنگاوی خاوەن میتۆدی روو بە رەفتارگەرانە لە زانیاری مرۆڤ بوو.[3] بۆ تراسی، ئیدئۆلۆژی بۆچوونی بۆچوونەکان بوو. شای هەموو زانیارییەکان بوو. چونکە پێوستانە لە پێش هەموو زانیارییەکانەوە بوو و پێویستانەش لە ئەندێشەگەل کەلکی وەردەگرت.

هەموو ئەو کەسانەی کە تاریفیان لە کتێبەکەی تراسی دەکرد لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە ئەم زانستە ئەندێشەیە دەتوانێ کاریگەرێکی گەورە، بەتایبەت لەسەر فێرکردن و بارهێنان، هەبێت. ئەگەر پێگەی راپەرین و هەستانی ئەندێشەگەل دیاری کرابا، ئەو دەم رەنگە بە سوودێکی زۆرترەوە لە گەشە کردنی فێرکردن و بارهێنان

کەڵکی لێ وەردەگیرا. لەوانە بوو ریشەگەلی نەزانینی مرۆڤایەتی ئاشکرا کردبایە و بناخەیەکی پتەوی بۆ کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو و عەقڵانی دابڕشتایە. بەم شێوە، تراسی و ئەوانەی لایەنگری قورس و قایمی سوود وەرگرتنی کۆمەڵایەتی، سیاسی و فێرکردنێک لە ئیدئۆلۆژی بوون، لە نێوانی ساڵەکانی ١٧٩٩ تا ١٨٠٠، واتە لەسەردەمی حکوومەتی دیکتاتۆر (دەستەی بەڕێوەبەر) لە فەڕانسا، تراسی بەرەو جێگری فێرگەی گشتی هەڵبژێرا راگەیاندنگەلێکی سەبارەت بە قوتابخانە گشتییەکان نووسی کە لەوانەدا جەختی لەسەر کارکردی ئیدئۆلۆژی لە پرۆگرامی دەرسی کرد بوو.[4] هەروەها هەوڵ دەدرا کە وەکو بێنتام (فەیلسووفی ئینگلیزی) زانستخانەیەک بە ناوی زانستی یاسادانەر دابنرێ. تراسی و هەموو ئیدئۆلۆگەکان بۆ بەدەس هێنانی ئەم ئامانجانە دەستیان کرد بە هاوکاری لەگەڵ لیبرالیزمی کۆمارخوازی جیا لە مەزهەب کە باوەڕیان بە حکوومەتی نوێنەرایەتی بوو و بە هەڵبژێراوانی رۆشنبیران لەقەڵەم دەدران. بەم چەشنە، ئیدئۆلۆژی لە تێگەیشتنی گشتیدا بە ناوی باوەڕی سیاسی تاقمێک لە رۆشنبیرانی لیبرال، بوو بە (زانستگای تەجربی)[5] لێرەدا بوو کە بە شێوەیەکی ناسک مانای دووهەمی ئیدئۆلۆژی کەوتە برەو، ئیدئۆلۆژی ئەگەرچی بە شێوەیەکی زۆر تایبەت مانای باوەڕی سیاسی دەگرێتەوەخۆ. دوا مانای واژەی ئیدئۆلۆژی ریشەی لە هاوکاری و ئەنجوومەنگەلی تراسی و هاونیشتمانی دایە. یەکێک لە ئەندامە دەرەکییە سەر بەرزەکانی ئیدئۆلۆگەکان ناپلیۆن بوناپارت بوو. بەڵام دواتر کە ئەو بە دەسەڵات گەیشت بە کردەوە بەرزەفڕە سەرەڕۆکانی خۆی درێژەی دا و سەرەنجام لە ناخەوە بوو بە دوژمن لەگەڵ ئیدئۆلۆگەکان و ئەوانی بە گێرەشێوێنی سیاسی دەدایە قەڵەم. بوناپارت لە ئاماژەکانیدا ئەوانی بە کەسگەلێ دەزانی کە تەنیا لە دەروونی خۆیاندا ئارەزووی گۆڕینی جیهانیان هەیە، متافیزیکزانانی زۆر بلێ و بێ کردەوەن کە لە بینای سیاسی بێ سوودن، یان زۆر کەم سوودن. بوناپارت لە فوریەی ١٨٠١ لە شۆرای دەوڵەتی ئەوانی خستە بەر هێرشی رەخنە و ناوی زۆر بلێ گەلێکی لێ نان کە هەوڵ ئەدەن توانایی سیاسی وڵات لاواز بکەن. بوناپارت هەر کە پەیماننامەی ١٨٠٢ لەگەڵ کەنیسەی کاتۆلیکەکان بەسراو بوو بە باوەڕپێکراوی کەنیسە، دیسان هەر

ئـەم چەشـنەی کـە چـاوەڕوان دەکـرا ئیدئۆلۆگـەکانی مـەحکووم کـرد و نـاوی ئەنجوومەنی بێ خودایانی لێنان. لەو تافەدا خانمی دوو ئەستال (یەکێک بوو لە ژنـە بە ناوبانگەکانی فەڕانسا لە بواری ئەدەبی و لەسەردەمی شۆڕشـدا) وتوویـەتی: وا ویدەچی ناپلیۆن بوناپارت تووشی نەخۆشی جاڕز بوون لە ئیدئۆلۆژی (ئیـدئۆفوبی) بووە[6]! ئەو کات ئەو کارکردە دژایەتییە بە کەم زانینە بەگشتی کاریگەرییەتی لەسـەر ئیـدئۆلۆژی، کـە ئاشـکرا بـەیانی نـەزۆکی و ئەسـتیوری سیاسـی، بـێبایـەخی بـێ کردەوەیی، بەتایبەت هەست بە ترسـێکی سیاسـی بـوو، وردە وردە هاتـە گـۆڕێ و سـەری هەڵـدا. کـۆڕ و کۆبوونـەوەی خۆپـارێزان (پارێزکـاران) و لایـەنگرانی گەڕانـەوەی رژێمـی کـۆن و شـاخوازان لـە فەڕانـسا، لـە ئیدئۆلۆگـەکان بـە سـوود وەرگـرتن لـە کـارکردی دوا واژە رەخنـەیان دەگـرت. لـە سالـی ١٨٩٢ کتـێبی کۆمارخوازانەی (توخمە ئایدلۆژییەکان) تراسی بـە نـاوی بەشـێک لـە تێکۆشـان بـۆ رووخانی (برایەتی دێرینەی تەخت و مێحراب)[7] مەحکووم دەکـرد. لێـرەدا بـوو کـە مانا و واتای دوا قۆناخی واژە سەری هەڵـدا. ئێـستە کـە نـاوەڕۆکـی ئیـدئۆلۆژی تـا رادەیەک لە زانستی ئەندێشەکانی تراسی، کوندیاک و رێبازی هەسـت گـەرایی دوور دەکەوێتەوە و بە واتایـەکی گرنگتـر بـاوەڕی سیاسـی (کـە لەسـەرەتاوە بـە واتـای کۆمارخوازی لیبرالی دوور لە مەزهەب بوو) نزیک دەبۆوە، هەر هـەنگاوێکی مـابوو کە رەخنەگەلی سەڵتەنەت خوازانیش بە باوەڕی سیاسی بدرێنە قەڵەم، کە ئەویش بە ناوی ئیدئۆلۆژیک جێی بـاس بـوو. بـەم جـۆرە، ئیـدئۆلۆژی لـە کـەش و هەوایـەکی ئاستەنگی وەک فەڕانسا بەرامبەر بوو لەگەڵ (باوەڕی سیاسی) کەوتە چوارچێـوە و قالبەوە. واتایەکی دیکەی ئیدئۆلۆژی بەو روانگەیەی دواییەوە بوون بە هاوژین.

ئێـستا ئـەم مەتەڵـە نـەمرە و هەمیـشە زینـدووە دەمێنێتـەوە کـە مـارکس بـە چ مەبەسـتێکەوە واژەی ئیـدئۆلۆژی هەڵـبژاردووە؟ مـارکس لـە نووسـراوە سەرەتایەکانیدا بە دوو شێوە ئاماژەی دەروونی کردووەتە تراسـی. سـەرەتا ئەمـە کە ئەو، بە ناوی چاوەدێرێکی ساکاری مێژوویی، بە هەبوونی تاقمێک لە بیرمەنـدان، واتە ئیدئۆلۆگەکان، ئاماژە دەکا و لە تراسی، لەپلەی ئەندامی سەرەکی ئەم تاقمـە، بـە بەرچەسپی ئابووری زانانی سیاسی بورژوا لیبرال و سووک و چرووک و بێبایـەخ

ناو دەبا. سەرەنجام، ئاماژەیەکی زووتێپەڕ بە بەشی چوارەمی کتێبی توخمەکانی تراسی، واتە بابەتی ئابووری سیاسی دەکا. دووەم، مارکس ئەم واژەیە لە باسێکدا، لە بابەتی یەکەمیدا بە ناوی ئیدئۆلۆژی ئەڵمانی (کە لە پاش مەرگی بڵاو بووەوە) وەک بەر چەسپێکی بە کەم زانی بۆ ئاماژە بە کەسگەلێ (بەتایبەت تاقمی هێگلیە لاوەکان) بە کاری هێناوە کە فەیلسووفانە شیکاریان لەسەر جیهان کردووە بەلام لە رواڵەتا توانای گۆڕانکاریان نییە. لەگەڵ ئەمەدا کە هەم هێگلیە لاوەکان و هەم تراسی هۆکاری (ئەندێشە) تەئکیدیان لەسەر دەکا. مارکس رەنگە وەک یەک بوونێکی لە نێوان ئەواندا دیبۆوەوە. ئاسانکاری، ئەندێشەی تراسی هەڵگری هێندێ باوەڕی فەلسەفەی (ئیدەئالیستی) بوو.

مارکس بە ئاشکر کارکردی سەرەتایی واژەی ئیدئۆلۆژی بە ناوی (زانستی ئەندێشەگەل) شارەزا بوو، بەلام بایەخێکی ئەو تۆی بەوە نەداوە. تاقانە واتایەک کە سوودی لێ بردووە، لە یەک هەنگاودا، هەر ئەو کارکردە بە کەم زانینەی ناپلیۆن بوو، ئەویش کەم تا کورت هێگلییە لاوانی (زۆربڵێ) و متافیزیکزانانی و راوەکەری بێ کردەوە دەدایە قەڵەم. لەوەش پتر، ئەو هەم ئیدئۆلۆگەکان و هەم هێگلییەکانی بە چاوی بورژوا لیبرال هەڵدەسەنگاند و بۆیان دەڕوانی. ریشەی ئەو سەری ئەم ئەندێشەیە لە مانا و واتای ئاماژەی دەکردە سەڵتەنەت خوازانی سەرەتایی فەڕانسا کە ئیدئۆلۆگەکانی بە لیبرالیزمی رادیکالی ریفۆرمخوازی ترسناک دەدانە قەڵەم.

بەم حاڵەوە، مارکس بە شێوەی ناسیستماتیک، واتای واژەی بەربلاوتر کرد و لە بوارگەلی جۆراوجۆردا بە کاری دێنا. لە ئاسەواری مارکسدا، ئیدئۆلوژی نەک تەنیا لە بێبایەخیدا و نەبوونی کارکردی بە کردەوە، بەڵکو بە گومان و دوودڵی و ون کردنی راستەقینە زەق دەبێتەوە. لەمە نادیارتر، ئیدئۆلوژی بە دابەشکردنی کار لە کۆمەڵگەدا، لەگەڵ دەستەگەلێکی کۆکەناوی چینی وەخۆگرت و لەوە بەولاتر، زاڵ بوون و دەسەلاتی هێندێ چین، پێوەندی بەدی هێنا. هێندێ لایەنی ئەم تەنینەوە مانا و واتایە، بەتایبەت لایەنی فیکری و گومانی ئەوی بە جۆری دەروونی لە کارکردی بە کەم زانینی بوناپارت لەم واژەدا شک دەبەین، بەلام تا سەردەمی مارکس کەڵکێکی ئەوتۆی لێ وەرنەگیرا بوو. سەیر ئەوەیە کە مارکس هێندێ

لایەنــەکانی کــارکردی ئیدئۆلۆگــەکانی پاراســت، واتــە بــاوەڕ بەمــە کــە دەتوانــێ کۆمەڵگەکان عەقڵانی و زانایانە بتۆژێتــەوە. هــەروەها ئەمــە کــە مرۆڤــایەتی بــەرەو بیچمێک لە کۆمەڵگەی عەقڵانی، بە رووناک بینی ئــابووری و سیاســی، بــەرەو پــێش هان بدا. بۆ تێگەیــشتنی کــارکردی مــارکس لــەم واژە، پێویــستە کــە ئــەم بۆچوونــە ماتریالیستییە بە شێوەی کورتکراو توێژینەوە و راڤە بکرێت.

ئەگەرچی ئەم مەبەستە راستییە کە ئاشکرا دەمانخاتــە گومانــەوە، دیــسان دەبــێ بڵێم، مارکس بە جۆرێکی تایبەت جەوهەری بیرمەنــدی ماتریالیزمــە. شــتێک کــە بــۆ مرۆڤ لە پلەی یەکەمی بایەخ دایە، پێویستی ئەوان بە مان و ژیانــە. مــرۆڤ بــۆ ئــەم چەمکە پێویستی بە کار و دروســت کــردن و داهێنانــە. ئەندێــشەش لــەم رەوەنــدەدا تووشی کێشە دەبــێ، بــەڵام کــردەوە لــە پلــەی یەکــەم و ئەندێــشە دەکەوێتــە پلــەی دووەم.

ویستە مادییەکانی مرۆڤ لە پلەی سەرەتای بایەخدان. ئەندێــشە و زانیــاری بــە شێوەی گشتی لە پێناوی رازیبوونی ئەم ویستانە کاریگەتی دەبێ. مرۆڤ لــە کــاتی دروست کردن و داهێناندا پێ دەنێتە گۆڕەپانی وەک یەک بوونی کۆمەڵ و تێکەڵ بە ئالوگۆڕێکی پێچراوە و پڕ لە گرێ لەگەڵ یەکتر دەبــن. هــەروەها مــرۆڤ ئەگــەر بــە شێوەی کۆ کار بکەن، بە جۆرێکی کارامەتر بە داهێنانەوە سەرقاڵ دەبــن، ئەرکــەکان لە سەرەتاوە لە یەک جیا دەبنەوە و مرۆڤ بە تواناتر بار دێنــێ و بــە دەســکەوتێکی زۆرتر و باشترەوە درێژە بــە کــار دەدەن. لێــرەدا یەکــەم دیــاردە و بیچمگــەلی لــە دابەشکردنی کار دەکەوێتە بەرچاو.

بێ گەڵاڵەی بیر و رای گشتی، پێویستە تێگەین کە لە نــاخی کۆمەڵــگە و ئــابووری ئێمەدا چ شتێک لە پلەی یەکەمدایە. مارکس خــاوەنی فەلــسەفەی مــاددە گەرایانەیــە. لەم هەستی‌ناسیە، زانیاری ئێمە بــە جــۆرێکی قــووڵ و هەمەلایەنــە شــی دەکاتــەوە. ئەندێشەش رەنگە زایەڵەی ئەم رەوەندە بێ و هەمیش بە هەڵــە ئــەوە لێــک بداتــەوە. گرفتی گەورەی (دابەشکردنی کار) لە سەرەتادا ئەمەیە کە لــە نێــوان کــاری فیکــری قەشەکان و رۆشنبیران لەگەڵ کــاری جــسمی جیــاوازی بــۆ دانــراوە. بەرژەوەنــدی قەشەکان و رۆشنبیران لە مەدایە کە کاری خۆیان بە زیاتر لە کاری جسمانی بــزانن.

ئەوانە بە دوای داکۆکی و پاڵپشتی ئەربابە گەورەکان، واتـە کەسـگەلێکەوەن کـە لـە قۆناخێکی تایبەتیدا لـە قۆنـاغێکی تایبـەت بـە بۆچـوونی کۆمەڵـگە، بەسـەر ئـامێر و کەرەسەی بەرهەمێنان، بلاوکردنەوە و سات و سەودا و ئالوگۆڕی کۆمەڵـگەدا زاڵـن و ئەو شتانە مسۆگەر دەکەن. ئەم کاردانەوە فیکریانە، چ بە ئامێر و چ بـێ ئـامێر، بـە پاساو دانەوەی فیکری بـەربلاو و کـراوەی بـارودۆخی ئێسـتە وەگـەڕ کـەوتوون و وزەی فیکـری خۆیـان (لـە سـەدەی نۆزدەیـەم) بـۆ سـەرمایەداری (بـورژوازی) و دەوڵەت تەرخان کردووە. هەروەها وجوود و پاسـاو دانـەوەی ئـەوان ئارخـەیانێک بوو بۆ ئەو کەسانەی کە لە سیستەمی کۆمەلایەتی و ئابووری رەنجیان دەبرد. ئـەم کاردانەوە فیکریە دەروونییە و لە ناخەوە ئیدئۆلۆژیستگەلی سیستەمـی سیاسـی و ئابوورین. بەم حاڵـەوە زۆرتـر زاینـەوەی فیکـری ئـەوان گومـان و لادانـە لـە ڕێـی راسـتەقینە. پێویـستە بـزانین کـە بناخـەی سەرهەڵـدانی فەلـسەفەی سـەرەکی ئـەم هەستیناسیەی ماتریالیزمییە (و تێگەیشتنی مارکس لە ئیدئۆلۆژی) بە رەخنە لە دیـن خۆراگر و قایم بوو. لێرەدا تێگەین و زانینی رۆمـانتیکی ئاڵـمانی و بەتایبـەت هێگڵـی، جێی سەرنجێکی تایبەتییە. سوننەتی ئاڵمانی، لە کانتەوە بگرە هەتا دەگاتـە فیختـە و هێگڵ، تەئکیدی زۆریان لەسەر بە خۆدا چوونـە و خۆگـۆڕینی مـرۆڤ کـردووە. بـە جـۆرێکی سـاکار، هۆشـی مـرۆڤ لـە دارشـتنی جیهـان و کـەش و هـەوای ئـەو کاریگەرییەتی هەیە. تراسی گوتەنی: هەستی مرۆڤ تەنیا بەشێوەی کار تێکراو کـار ناکا و دیاردەگەلی دەرەوەی کارتێکراون وەرناگرێ. بەتایبەت بە بۆچـوونی هێگـل، ئـەم هەوڵـە فـۆرم بـە خۆدانـە و خۆسـاز کردنـە، لـە چوارچێـوە و قاڵـبی مێـژوودا دەکەوێتە بەرچاو. زانیاری تەنیا لەوەدا کە ئێمە ناومان ناوەڕاستی و حەقیقەت، پێک نەهاتووە بەڵکو هێور هێور لە رەوەنـدەدا لـە حاڵـی گـۆڕانی مێـژوو پێـک هـاتووە. زانیاری لە درێژایی مێژوودا راستییەکان دەگۆڕێ و راستی گەلێکی نوێتر و بـاشتـر دروست دەکا. هێگلییە لاوەکـان، بەتایبـەت لودویـگ فـویر بـاخ، هێگلیـان تـاوان بـار دەکرد کە لەسەر دەوری هۆش بە گشتی، لەسەر دەوری زانیاری و واتـای رۆح لـە مێژوودا لە رادەبەدەر تەئکیدی کردووە. بە بۆچوونی ئەوان، ئەمـە (رۆحـە گشتی)

نیه که خۆ دروست دەکا، بەڵکو چێژی تـاکی بـوونی مرۆڤـایەتی هـەمیشە لەگـەڵ پێداویستییە جسمییەکانە کە فۆرم بە راستییەکان دەبەخشێ.

فویر باخ رستەیەکی بەناوبانگی هەیە کە دەڵێ (گشتی ئیلاهیـات، مـرۆڤناسـییە) مرۆڤــەکان خــودا، رۆح یــان مێژوویــان لــە ئەندێـشەی خۆیانــدا خوڵـقاندووە و دەیخولقینن. مارکس ئەم بابەتەی بۆ دەربڕینی مەبەستەکانی خۆی بەکار بـرد. ئـەم کارە زاینەوەی مرۆڤانە، بەتایبەت چینایەتی ئابوورییە کە لـە قۆنـاخێکی تایبـەتی لـە مێژوو (بەرامبەر لەگەڵ پێویستییە ئابووری و شێوە گەلی زاینەوە) فۆرم بـە جیهـان دەبەخشێ. بەم شێوە، ئەم فۆرم پێدانە رەنگە بـە بیچمێکـی پێچەوانـەوە سەرهەڵـدا. لەسەرانسەری مێژوودا، رۆشنبیران لاریگەلێکی زۆریان لـەم جۆرانـە بـەدی هێنـاوە کە زاڵ بوونی سەرەکی و چەوسانەوەی چینێ بە دەس چینێکی دیکەیان بردووەتـە نێو تەمی گومانـەوە. دەبـێ لەگـەڵ ئـەوە بـە قۆنـاخی تایبـەتی کۆمەڵـگە، بەتایبـەت شێوەی زاینەوە و فۆرم پێدانی چینـەکان بیچمێکـی باشـتری لـە راسـتەقینە بخرێتـە روو، بەڵام ئەم بیچمە هێشتا لار و وێـرە. هێنانـە ئـارای تێکۆشـانی ئـابووری لـەم رەوەندەدا بەو مانایەیە کە مارکس بە شێوەێکی شیاوی فەلسەفەی ئاڵـمانی، لەگـەڵ ئابووری سیاسی بریتانیایی و ماتریالیزمی فەڕانسەوی هاوتەرازی کردوون.

دواتر بابەتی ئیدئۆلۆژی مارکسیزم، لە کۆتـایی سـەدەی نۆزدەیـەم کەوتـە ژێـر هێندێ گوشار و لێکۆڵینەوەگەلی جۆراوجۆر. پرسیارگەلێ هاتە ئـاراوە. مـارکس لـە نووسراوە سەرەتاییەکانی خۆیدا بە رواڵەت ئیدئۆلۆژیای (بەناوی ئەندێشە)یـەک لـە بەرامبەر راسـتییەک (بـەناوی کـردەوە) نووسـیویەتی ـ کـە بیچمـی هەسـتیناسـی ماتریالیزمی فەلسەفی بوو ـ چونکە سەرمایەداری لیبرالیش هەڵوێستێکی ئـەوتۆی لـە بەرامبەر بـە دیـن، بـەناو لادان لـە جەوهـەری مرۆڤـی بـوو. پاشـان ئـەم دژایەتیـە، ئیدئۆلۆژییەی (بەناوی لادان) لە بەرامبەر زانست (بەناوی حەقیقەت یان زانـین) دایـە قەڵـەم. واتـا یـەک لـە خـۆ بێگانـەیی لـە نووسـراوە سـەرەتایەکانی مـارکس، لـە نووسراوەکانی دوایدا بوو بە دزی و داگیرکراوی بایـەخی زیـادی و چەوسـانەوەی ئابووری. لەگەڵ ئەمەشدا، روون نەبوو کە ئایا مـارکس وشـەی زانـستی بـە مانـای (زانستی سروشتی) بـە کـار دەبـا یـان بـە مانـای قـەدیمی ئاڵـمانی Wissensehoft

(زانـینی سیـستماتیک) . هێنـدێ لـە مارکسیـستە قەدیمییـەکانی ئـەم سـەدەیە ئـەم گۆڕینەیان خستووەتە ئەستۆی بوونی دوولایەنی (جیا بوونەوەی شوناس‌ناسی) لـە مارکسییە و دەزانن کـە مارکـسی لاو لـە مارکسی پوختـە هەڵـداوێرێ. تەنانـەت لـە دەروونی ئەم دوو لایەنە، روون نییە کە چ شتێک بە شیکردنەوەی ئیدئۆلۆژی پێوەنـد دەدرێ. لە هێندێ لە نووسـینەکان، مـارکس دەڵـێ (زانیـاری گـشتی) بەتایبـەت هـەر لایـەنێک لـە کۆشـشی مـرۆڤ، بـۆ وێنـە هونـەر و زانـستی سروشـتیش. لـە ریـزی ئیدئۆلۆژی دەدرێتە قەڵەم. بەڵام لە نووسراوەی دیکەدا وا دەکەوێتە بەرچاو کـە ئـەو تەنیا بە ئەندێشەگەلی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابووری کە لەسەر پێکهاتەی سیاسی و ئابووری کاریگەرییەتیان دەبێ و ئـەویش لارێ دەکـەن، فیکـری دەکـرد، بێجگەلەمـە، ئاماژەی یەکەمی مارکس لە کتێبی ئیدئۆلۆژی ئاڵمانی بە رەسمـی دووربـینی تاریـک هێندە یاریدەدەر نەبوو. مارکس ئیدئۆلۆژیای لە زانیـاری مـرۆڤ بـە دوورنوێنیـەکی تاریکی دەشوبهێنێ کـە جیهـانی سـەرە و ژێـر تیـا بنوێنـێ. شـێوە و مانـای قووڵـی مەکانێکی ئەوەندە لە رێ‌لادەرانە بوو کە تەنانەت مارکسیش بە راستی ئەوەی قبووڵ نەکرد.

مارکس هەروەها پێوەندی راستەوخۆی ئەندێشەکان (کە زۆرتر دەرەکی ناویـان لێ‌نراوە) و بنـەڕەتی ئـابووری روون نەکردۆتـەوە. لـە هێنـدێ لایەنـەوە ئەمـە بـە رواڵەت یەکێکە لە جەبر باوەڕێ (یەک‌لایەنە)یە، واتە بنەما سەر بنـەما دیـاری دەکـا. بـەم حاڵـەوە، دیـسان مـارکس هـەرگیز روونی ناکاتـەوە کـە مەبەسـتی لـە واژەی (جەبری باوەڕ) چییە؟ بۆ وێنە روون نییە کە ئایا (جەبری باوەڕی) بە مانای ئەوەیـە کە A هۆی B و کارتێکردنی لە Bیە یان دیاردە و دیاریکەری پارامترگـەلی Bیـە. لـە هەندێک باری دیکەوە، ئەم پێوەندییە بە پێوەدیگەلی پێکـەوە ژیانـە، یـان وەک یـەک کاریگەرییەتی نێوان ئیدئۆلۆژی و بنەڕەتی ئـابووری دەگۆڕێـت. ئـەنگلس لـە نامـە گورێنەوەیەکی زۆر و شی کراوەی خۆیدا وەک هەمیشە لەم بارەوە لەسەری دەڕوا و بۆچوونی دوای پێویست دەزانێ.[٨]

چارەنووسی دوایی مانای مارکسیستی ئیدئۆلۆژی لە کـۆکراوە دژ بـە یەکەکانـدا تووشی ئاڵۆز و تێکـەڵاو بـوون دەبـێ (نێونەتەوایـەتی دووهـەم) لـەژێر دەسـەڵاتی

حزبی سۆسیالیستی ئەڵمانیا و بە سەرپەرشتی ئەنگلس سەری هەڵدا، نزیکایەتییەکی بەتەوژم لە نێوانی کردەوەی مارکسیستی و ئیدئۆلۆژی بورژوازی لە ئارادا بوو. بەتایبەت ئینگلس تایبەتمەندی بەناوبانگ (زانیاری بە درۆ)ی داهێنا کە مارکس پێشتر هەرگیز لە بارەی زانیارییەوە وای نەوتبوو. ئەندێشەی زانیاری راستەقینە و درۆزنانە بە رواڵەت و لانیکەم لەم ئاستە ناسکەدا، بۆ مارکس لە رادە بە دەر وشک و بێ رۆح بوو.[۹]

لنین لە بەرهەمگەلی وەکو چ دەبێ بکرێ؟ لایەنێکی شێواوی لە ئیدئۆلۆژی پێناسە کرد. واتاگەلێکی دەروونی و بە کەم زانین لە ناکاو لە ئەدەبیاتی سیاسی درهاوێژران و لە بۆشایدا بە لەنگەر وەستان. لنین بە دڵنیایەوە دەڵێ: سوسیالیزم جۆرە ئیدئۆلۆژییەک لە قەڵەم دەدرێ کە لە خەباتی گشتی چینایەتیدا لە حاڵی مەیدانداری لەگەڵ بورژوازی دایە. لنین ئیدئۆلۆژی سۆسیالیزمی وەک چەکێک لە خەباتی چینایەتی دەزانی. ئەم کارکردە بە کارکردی فەڕانسەوی ئەو دەیەی ۱۸۳۰ و هەروەها هێندێ کارکردگەلی هاوچەرخی نزیکە کە تەواوی باوەڕگەلی سیاسی ئەویان لە دەروونەوە بە ئیدئۆلۆژی دەزانن. ئەمە بێگومان وێچوونێکی وای لەگەڵ واتای (زانیاری درۆینی) ئینگلس، یان جیاوازێکی قورس لە نێوان زانستی مارکسیستی لە بەرامبەر بە ئیدئۆلۆژیا نیانە.

کاتێ کە پێ دەنێینە سەدەی بیستەمەوە، ئاستەنگی ئیدئۆلۆژی لە رێبازی مارکسیزمدا پێچراوەتر دەبێ. لەگەڵ نووسەرانی وەک لۆکاچ، ماتریالیزمی دیالێکتیک وەکو ئیدئۆلۆژییەک وەرگیراوە ـ ئەگەرچی وەک هەڵە، زانستیتر لە ئیدئۆلۆژی بورژوایی زانراوەو هەروەها بە بۆچوونی لۆکاچ، ئیدئۆلۆژی زۆر زیاتر لەوەی کە لنین فیکری دەکرد، لە ژیانی کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسیدا ریشەی داکوتاوە. لە بەرهەمگەلی ئانتۆنیۆ گرامشی بە رووبەڕووبوونەوەی وردبینانەتر و پێچراوەتر، ئەگەر دوو لایەنە، لەگەڵ مانا و واتای ئیدئۆلۆژی بەرەنگار دەبێتەوە. لە بۆچوونی گرامشیدا دەسەڵات لە سیستەمی سەرمایەداریدا تەنیا بە کردەوەی زۆر وەدەس نایە بەڵکو بە جوانکاری و رێبەرایەتی ئەندێشەگەل وەرێدەکەوێ. ئیدئۆلۆژی چینی سیستەمی لە دەروونی فام و تێگەیشتنی هاووڵاتیانی مامناوەندی

جەماوەر پەسند بووە. دەسەلات تەنیا یاسای وشک و توندوتیژی، یان بە گوشار و زۆری فیزیکی نییە، بەلکو حاکمیەتی زمان، ئەخلاق، فەرهەنگ و شعووری گشتی و عەقلی سەلیمە. جەماوەر بە دەروونی کردنی دەسەلاتی ئەندیشە سەرکوت دەکرێن. لە راستیدا ئەندێشەگەلی رێنوێن و زاناتر دەبن بە ئەزموونێکی راستی و ئێستای چینە زۆرلێکراوەکان. رۆشنبیرانی سوننەتی بە ئامێری سەرەکی ئەم دەزگا پێچراوەیە ئەدرێنە قەلەم. باوەرگەلی تاکەکەسی، میتۆد و ئارەزووگەلی پرۆلتاریا سەرکردەیی بورژوایی پێکی دەهێنی و دەیخاتە قالبەوە؛ لەم رووەوە گرامشی خەباتێک لە رادەی ئیدئۆلۆژی بانگەواز دەکا. رۆشنبیرانی فێرکراوەی نەزم و تەرتیب لە دەروونی پرۆلیتاریادا دەبێ بە پێکهێنان و دروست کردنی دژێکی بەتەوژمی دەسەلات لە بەرامبەری رۆشنبیرانی سوننەتی کە پروپاگەندە بۆ بورژوازیی دەکەن دەس بکەن بە کردەوە.

لە رێکوپێک کردنی گرامشی، وردەکاری و پالاوتن و پێناسە کردنی زانستی مارکسیستی و رەسالەی ئیدئۆلۆژی ( زانستێک لە گرامشی بە واژەی خۆی توندوتیژی (ئابووریگەرایی) ئەوە رەت دەکاتەوە) تووشی دەبین: ماتریالیزمی دیالکتیک؛ جەبر باوەری بیر ساکار؛ رەسالەی زانیاری درۆین و ئاخری، ئەندیشەی مارکسیستی. وا وێدەچێ کە لە بەرهەمەکانی گرامشیدا، ئیدئۆلۆژی بە شێوەیەکی گشتیتر لەسەر باوەری سیاسی ساخ بووەتەوە، ئەگەرچی لە عەینی حالدا لە ناخی زمان و فەرهەنگدا ریشەی داکوتاوە. بە پێچەوانەی جوانکاری رێدۆزینەوەی گرامشی، هێشتا بە دوای هۆکار و بۆرهانگەلی پێچراوە و گومان لێکراوە لەسەر (حەقیقەتی) مارکسیزم لە بەرامبەر بە دۆزینەوەی رێگەلی دیکە تەئکید دەکرێ. بەم هۆیەوە، دەبێ بلێین کە هەر ئەوە هەلاویژ و جوێ بوونەوەی رابردووی، بەلام بە جل و بەرگی جوان، دیسان سەرهەلدەداتەوە. پاشان، چ لە لێکۆلینەوەی ئیدئۆلۆژی دەگۆرن. لەگەل ئەمەدا، ناوەرۆکێکی رەوا و رەوان بە جێ دەمێنێ و ئەوە: پێوەندێکی زەریف و پێچراوە لە بەینی ئیدئۆلۆژی، هێز و دەسەلاتە.

کارل مانهایم یەکێک لە قوتابیانی لۆکاچ بوو کە لە کۆی واژەکانی مارکس سوودی وەرگرت و پێگەیەکی فیکری ئەوی بە شێوەیەک گۆری. لە کتێبی

ئیـدئۆلۆژی ئوتـۆپی ١٩٢٩ مانهـایم دەکـرێ بـە نـاوی دوا قۆنـاخی مانـا و واتـای ئیدئۆلۆژی نـاو بـەرین. لێـرەدا لـە بـەرەی بۆچوونـەکانی مانهـایم نـادوێین. بـەلام سەبارەت بـە مانهـایم دەبـێ سـەرنج ندەینـە ئـەم پرسـیارە. پۆل ریکۆر ئـەوەی (پارادوکس مانهایم) ناو دەنێ. ریکۆر لە پرسیاری خوارەوەدا ئـەم پارادوکسە بـەو چەشـنە دێنێتـە ئـاراوە: (ئەگـەر هـەر وتووێژێـک ئیدئۆلۆژێکـە، کەواتـە پێگـەی شوناسناسی ولەناو بابەتی ئایدۆلۆژی چییە:[١٠] ئەم پرسـیارە لـە مارکسیش کـراوە هـەتا لـەم پێوەندیـەدا گریمانـەی خـۆی سـەبارەت بـە ئیـدئۆلۆژی شـی بکاتـەوە و تێبگەیێنێ. کاریگەرییەتی مەنتق پرسیار لە دەرەکێکێ زۆر رووخێنەر و وێرانکەرە.

مانهـایم بـۆ پەرەپێـدانی بینایـەکانی مـارکس، هەوڵـی داوە هـەتا بۆچوونـە بەربلاوەکانی دەربـارەی ئیـدئۆلۆژی کـۆ بکاتـەوە. شـەش کـۆکراوەی پێکهێنـەری سەرەکی بۆ ئەم کارە هەیە. یەکەم کۆکراوە، لەگـەڵ سـوودمەندی جەوهـەری ئـەو، پێوەنـدی بـە ئێمـەوە نییـە. مانهـایم هـەم ئیدئۆلۆژییـەکانی دەتۆژییـەوە و هـەم ئارەزووی شارەکان.

ئیدئۆلۆژییەکان زۆریان بۆ پشتگری لە سیستەمی تایبەتی کردەوە لـە خۆنیـشان دەدەن، ئەگەرچی لە کەش و هەوایەکی تایبەتا رەنگە وێرانگـەریش بـن. ئوتوپیاکـان (کە بـە پێچاوەنـەی مـارکس، مانهـایم دەڵـێ: (لـە ژیـانی کۆمەلایەتیـدا بایـەخێکیان بەرامبەر بە ئیدئۆلۆژی هەیە) بەرەو پێـشکەوتن پێـشچوونیان زۆرە و راسـتەقینەی ئێستای کۆمەڵگەیان بـەرەو مەیـدانی خـەبات دەخـوازن و دەیانـەوێ گۆڕانکـارێکی بەربلاو و گەورە بخولقێنن.

مانهایم لە بۆچوونێکی خۆیا لە ئیدئۆلۆژی، بەینی ماناکان تایبـەت و گـشتی جیـا دەکاتـەوە و جیاوازیـان بـۆ دادەنـێ. مانـای تایبـەت بـە (تـاک) بۆچـوونی هەیـە، دەروونناسی و بەرژەوەندی و هۆگری تاک، زۆر بەشێوەی گـشتییە، دەیتۆژێتـەوە هەتا لایەنی لاوازی مەبەستی بەرانبەر نیشان بدا. ئەندێشەی گـشتی ئیـدئۆلۆژی بـە حیـسابی گریمانـەی (جیهـانبـینی) تـەواو و کەمالـی کـەلتووری گـشتی و رەنگـە دەورەی مێژوویی چاو لێ بکا. بە جۆرێکی دیکـە، بـە پێکهاتـەی گـشتی ئەندێـشەوە سـەرقاڵ دەبـێ. بـە بۆچـوونی مانهـایم، مـارکس، لـە بـەراورد لەگـەڵ بۆچـوونی

کۆمەڵایەتی پێشووی، ئەم دوو کۆکراوەی پێکەوە لێکداوە و خستوویەتە بەرچاو کە بۆ کردنەوە و یەک کاڵە بوونەوەی ئیدئۆلۆژی تەواو دەبێ فەرهەنگێک پەردە لەسەر باوەڕە تاکەکان هەڵداتەوە. ڕاست بەم هۆیەوە مانهایم داوای لە مارکس کردووە بە واژەگەلی مارکسیستی دەس بە کار بێ بۆ پێگەیاندنی ئەندێشەکانی خۆی، ئەمە شتێکە کە ئەنجامدانی ئەوە بۆ مارکس دژوار بوو. بەپێی نووسراوەی مانهایم:

مومیکن نییە لەم دەسکەوتە ئاشکرا و گشتیەی ئیدئۆلۆژی خودوور ڕابگرین، کە وەک ئەو، ئەندێشەی گشت ڕێکخراوەکان لە هەموو خولێکدا خووی ئیدئۆلۆژیکێکیان بووە، بە ڕێکەوت هەڵوێستێکی تەنیا عەقڵانی ڕێدەکەوێ، مارکسیزم هیچ جیاوازێک بۆ ئەم بنەمایە، کە لەسەراسەر مێژوودا نەگۆڕ بووە، حیساب ناکرێ. بۆ مارکسیستێ نابێ ئەوەندە گرنگ و دژوار بێ کە بناخە و ریشەی کۆمەڵگەکەی خۆی بناسێ.[11]

ئەم پرسیارە، مانهایمی بە سێیەم بنەڕەتی ئەندێشەکانی خۆی گەیاند. ئەگەر مارکسیزم لەم لێکۆڵینەوەدا لە دەروونەوە رووخاوە. ئێمە هێشتا نابێ بینایەکانی ئەو لە ئیدئۆلۆژی دەربهاوێژین. بە بەیانێکی دەقیقتر، دەبێ لە بارەی باوەڕەوە، ئیدئۆلۆژییەکانی خۆمان، بە بۆچوونی ژیانی خۆمان و بارودۆخی مێژوویی ئەوان بدۆزینەوە و خۆمان بە زانیاری تێر و تەسەل بکەین بە بێ خۆ سازدان، بینایەکانی مارکس لە قەوارەی ریشەیی ئاکادمیک بپارێزین. مانهایم ئەم قاڵبە نوێ ئاکادمیکەی ناو ناوە کۆمەڵناسی ناسین) ریشەیەک کە بە تۆژینەوەی ناسین و هەر (پێناسەیەک) لە بوارێکی کۆمەڵایەتی و مێژوویی تایبەتا دەس پێ دەکا. بەم جۆرە کە لە مانا و واتای مارکسیستی ئیدئۆلۆژی نووسی: ئەویکە سەردەمێک بە کەرەسەی عەقڵانی تاقمێک حیساب دەکرا، ئێستا بوە بە میتودێکی لێکۆڵینەوەیی لە مێژووی کۆمەڵایەتی و فیکریدا.[12]

چوارەم، مانهایم دەیوت کە ئەئدێشەی ئەو نسبیگەرا نییە. ڕێژەگەرایی لەگەڵ ئەوەی ئەو ناوی نابوو پێوەندیگەرایی، جیاواز بوو. زۆر لە توێژەران کە ئەم جیاوازیە بە کردەوە سەلماوە.[13] مانهایم دەیوت لەو جێیەدا کە پێوەندیگەرایی بە واتای ڕاستەقینە پێوەندی بە مێژووەوە نییە، پێوەندیگەرایی (پێوەندی جیاوازە لە خووی تەنیا ڕێژەیی هەر جۆرە فامێکی مێژوویی)[14] لە پێوەندیگەرایدا، زانین و فام ناسی لە

بواری مێژوویی و کۆمەڵایەتیدا جیا نەبوون (ئەو جۆرە کە لە پێشمەرج و گریمانەی داپۆشراوی ڕێژەیی گەرایی ئەم کارە دەکەوێتە بەرچاو) پێنجەم، مانهایم پارسەنگگەلێکی زۆری بە لێدانەوەی ئەم ئەندێشەیە زیاد کرد، بەرامبەری ڕێنوێن (مانا و واتای تەواوی پێوەندی ئیدئۆلۆژی) نێوان جێکەوتووەکانی جیا لە لێکدانەوە و لێکدانەوەی بابەتی موتالا و هەم سەرنجڕاکێشەرە، لەم ڕووەوە، لەبارترین میتۆدە بۆ کومەڵناسی فام. سەرەنجام وێدەچێ پێچەوانەتر ئەمە کە، مانهایم لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەم ڕشتە نوێیە تەنیا دەتوانێ بە هۆی کەسگەلێکی تا ڕادەیەک بێچین، مامناوەندی، کە هەم بیرمەند بن و هەم توانایی ئەم خۆ توێژینەوەیان هەبێ، بخرێتە بەرباس و لێکۆڵینەوە. ئەو ئەم جۆرە کەسانە بە پێڕەوی لە ئالفرد و بە گشتی ڕۆشنبیران بە بێ پێوەندی ناو دەبا.[15]

مانهایم لەگەڵ وەڵامگەلێکی زۆر جیاواز لە یەک و وەک هەمیشە لەگەڵ زۆر ڕەخنە ڕووبەڕوو بوو. بەو جۆرە کە هێندێ بەتەواوی ڕەتیان کردەوە و هێندێکی دیکە بە لانیکەمەوە تاریفیان لە بەرەنگاربوونەوەی لەگەڵ بابەتگەلێکی هورووژێنەری ئەندێشەی مێژوویی کردووە. جیا بوونەوەی ڕێژەیی‌باوەڕی و پێوەندیگەرایی ئەو، بە ڕاستی و تەواو شی نەکراوەتەوە. بێجگە لەوەش، دەور و ڕۆڵی ڕۆشنبیرانی بە شێوەیەکی پڕۆگرامی زۆر ناتەواو باسی کردووە. سەرەنجام ئەمەیکە پرەنسیپێکی نادیار لە ئەندێشەی ئەودا هەیە: ئایا بە بۆچوونی ئەو هەر ئەندیشەیەک، بەتایبەت زانست و ڕیازیات (بیرکاری)، لە باری کۆمەڵایەتی و مێژووییەوە ڕێژەییە؟ وەڵام ڕوونە. هەروەها، ئایا بە کەڵک وەرگرتن لە پلەی بالای ئاکادمیک (کۆمەڵناسی فام) تێکۆشاوە وا نیشان بدا کە کردەوەیەکی بەرچاوتر و زانستیتر (لە زانستی کۆمەڵایەتی) بخاتە ڕوو و لەم ڕێگاوە ناوەڕۆکی جوان و زەریف بە سەرەنجێکی بێ لایەنەوە سوودی بردووە؟ لەم بارەوە، تارادەیەک ڕەخنەی ئەم دواییە باوەڕ پێ کراوانەیە و بە ڕواڵەت بەتەواوی دەکەوێتە بازنەی مانهایم. بەو سەرەنجامە دەگەین کە ئەو بۆ قەرەبووی بن بەستی خۆی بە مەسەلی وەکو لاری بوون لە ڕاستی پەنا دەباتە بەر ئەوە کە میتۆدی خۆی وەلاناوە.

مانهایم بە شێوەیەکی‌تر کە زۆرتـر ناراستـەوخۆیە، ڕێگـای بـۆ قۆنـاخی دواتـری واتای ئیدئۆلۆژی پـاک دەکاتــەوە کـە لـە سـالاکانی دوای ١٩٤٥، واتـە پـاش جـەنگی جیهانی دووهەم سەری هەڵدا و ئەوە زۆرتر نـاوی سـەردەمی (کۆتـایی ئیـدئۆلۆژی) لێناوە.[١٦] تێکـەڵ بـوونی لەسـەرەخۆی ئیـدئۆلۆژی بـە هـەوڵ و دەوڵی سیاسـی لـە ڕشتەگەلی ئاکادمیکی کۆمەڵناسی، نەک تەنیا واتای تێکشکان لە وتووێژی ئیـدئۆلۆژی بــێ چــاو پۆشـــی و ئێحـــساساتییە، بەڵـــکو ڕاســـتەوخۆ بـــە واتـــای بایـــەخی پێشکوتووخوازانەیە. مانەوە و حەیاتی سیاسی بۆ ناخی زانستە کۆمەلایەتی مـەنتقی، بە بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیرانی کارناس کێشراوە.

ڕێبازی (دوایی پێهاتنی ئیدئۆلۆژی) دەسکەوتی قۆناخی دەیەی ١٩٥٠ و سـەردەمی شەڕی سارد بوو. ئەگەرچی پێشمەرج و گریمانەگەلی سـەرەکی ئـەم بزاڤـە پێـشەکی جێگای پەسندی زۆربەی ئەو کەسانەی کە خۆیان بە بیرمەندی کۆمەلایەتی و سیاسی دەزانی، بـوو. پاشــان بـــە ڕووداوگـــەلێکی وەک «لافــاوی کۆتــایی دەیـــەی ١٩٨٠ و ڕووخانی کومۆنیزم لە ئەورووپای ڕۆژهەلات و گەڕانەوەی بـەرەو ئـابووری بـازاڕی ئازاد» تاقمێک دەستیان کرد بە پێشبینی بە تالووکەی سـەبارەت بـە بەرهـەق بـوونی سەرکەوتوانەی ئەم ئەندیـشە.[١٧] ئـەم باســە تایبەتـە سـەرەتا لـە نەهادگـەلی زانـستە کۆمەلایەتییـەکانی ئـەمریکاوە سـەری هەڵـدا، ئەگـەرچی لەگـەڵ هێنـدێ ئاڵـوگۆڕ لـە ئەندێشەی ئەورووپایش بێ پێوەندی نەبوو، ئەم کارە نەک تەنیا لەگەڵ بزاڤـی (مـەرگی ئەندیـشەی سیاسـی) و ڕێبـازی باتـسکل لـە بریتانیـا بەڵـکو بـە لـێ دەرهاویـشتن و هاوێرگــەلێکی وەیــشوومەتری بزاڤـی دژی کومــۆنیزمی مــەککـارتی لــە ولاتــە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش وێچوونی هەیە.

جێی خۆیەتی بڵێم کە ئەم دەلیلانە لەگەڵ هەڵوێستگەلی جیـاواز، بـەلام پڕزایەلـەو دەنگدانەوەی هێندێ لە ڕۆشنبیرانی دەورانیش هاودەنگی و هاوســەنگی هەیـە. ئێمـە لەپێشدا لەگەڵ بزاڤێ لە فەلسەفە کـە (بەتایبـەت لـەژێر کاریگەرییـەتی پۆزیتیـۆیزمی مەنتقی بوو) بەرەنگار بووینەتـەوە کـە دەیگـوت ئەندیـشەی سیاسـی کلاسـیک (یـان ئیدئۆلۆژی) مردووە. لێکدانەوەی واتایی دووشکی زۆر و مـەنتق هەڵوێـستی خـۆ بـە گەورە زانینی پاراستبوو. لە هێندێ تێگەیـشتنی هەسـتپێکردن، ئیـدئۆلۆژی هاوتـەراز

بوو لەگەڵ ئەخلاق یان جوانناسی کە خۆی پێوەندی دابوو بە (بایەجەوە) و خۆی بە زیاتر دەزانی. لە قۆناخە سەرەتایەکان و کاڵی هۆکار، ئەم بایەخگەلە و خۆ بە زۆر زانینە جیا لە راستەقینەیان دەزانی و ئەوانیان بە چاوی پڕ جۆش و خرۆشی هۆش، بێ مایەی عەقڵانی سەیریان دەکردن.

مایکل ئەوکشات خاوەن ئەندێشە و بە دەسەڵات، لە پرۆژەیەکی فەلسەفی و زۆر جیاوازی خۆیدا، لە کتێبێکی وەکو عەقڵگەرایی لە سیاسەت جیاوازی لە نێوان هەلوێستی سوننەتگەرا و ئیدئۆلۆژیکی لە تێڕامانی سیاسیدا داناوە. ریشەگەلی فەلسەفی ئەم جیاوازییە پێوەندی بە باسەکەی ئێمەوە نییە. خاڵی سەرەکی ئەمە بوو کە ئیدئۆلۆژی جۆری ساکارسازی، لە ریشە دەرهێنان و ئەوەیکە ئەوکشات (هەڵبژاردەیەک) لە راستەقینەی کۆمەڵگای ناو لێدەنێ و دەیخاتە روو. ئیدئۆلۆژیستەکان لە راستییە کومەڵایەتییە فرەپێچراوەکان، ئەوەیکە دەیانەوێ هەڵیدەبژێرین و لە ئەنجاما دەس دەکەن بە پێچ و پەنا تێخستنی. ئەو جۆرە کە چاوەروان دەکرێ (بە لەبەرچاو گرتنی خووی سروشتی سەفسەتەگەرانە (گۆڕینی راستی بە پێچ و پەنا) زۆرتر باسی ئیدئۆلۆژیکی سەدەی بیستەم) جێکەوتنێ کە بەناوی جێکەوتنی جیا لە ئیدئۆلۆژیکی، فەلسەفی و زۆرتر ئاکادمیک باس دەکرێ و لەسەر پێچراوەیی جوانیگەلی گشتی راستی کومەڵگە جەخت دەکا، شێوەیەک لە پارێزکارییە[18] ئەم جیاوازییە دواکاتەکانی دەیەی ١٩٨٠ دەکەونە بەرچاو.[19]

بەڵگەیەکی گرنگی دیکە کە لەگەڵ (کۆتایی پێکهاتنی ئیدئۆلۆژی) دەنگی دایەوە ئەم جەختە بوو کە (ئەندێشەی سیاسی) لەگەڵ ئیدئۆلۆژی جیاوازی هەیە. ئیدئۆلۆژی لە فام و بینینی ئەوانەیکە بە ئارەزوو گەیون رێنوێنی هەیە کە لە هەر جۆرە باسێکی سیاسی بێجگە لەوەیکە لەگەڵ خۆی سازگارە، پێشگری دەکا. ئیدئۆلۆژی لەگەڵ کۆمەڵگەی ئازاد، زاوزێ، موداراکەر و عەقڵانی کە پێگەی (ئەندێشەی سیاسی)یە سازگاری نییە. نووسەرانی جۆراوجۆری وەکو رالف دارنرورف، ج. ل. تالون، بێرناد کریکی، هانا ئارێنت، کارل پوپێر، وریمون، هەر یەکەیان بە شێوەگەلێکی جۆراوجۆر لە (ئیدئۆلۆژی تەواو گەرا) و کۆمەڵگەی داخراو (فاشیزم و کومۆنیزم) دەدوێن کە لەگەڵ ئەندێشەی سیاسی مەدەنی ئاسانکاری و کۆمەڵگەی کراوە جیاوازیان هەیە. لەم

خوێندنەوە، ئیدئۆلۆژی لە بەراورد لەگـەڵ جـۆری ئەندیـشەگەلی جیـا لـە ئیـدئۆلۆژی کراوە و ئاسانکاری، دووربینی بێکەلک، داخراو و بەرتەسک دێنێتە بەرهەم.

کتێبی دەسەڵاتە بێگانەکان: ئەندێشەگەلی ئیدئۆلۆژی، نووسینی کێن مینوگیش بە جۆرێکی‌تـر نزیکایـەکی زۆری بەوانـەوە هەیـە. ئـەم کتێبـە بـە نـاوی کۆمەڵـگەیەکی کراوەتـر، هـەروەها تـا رادەیـەک بـە نـاوی ورد ئەندێـشی فەلـسەفی و ئاکادمیـک، کوشتاری ئەژدیهای ئیدئۆلۆژیکی بە ئاوات گەیـشتووی شـەڕی سـارد دەسـت درێـژ دەکا و باوەڕی هەیە کە ئیدئۆلۆژیستەکان پێچراوەیی جیهانی کۆمەلایەتی ئەوکـشات لە قەید و بەندگـەلی ئیـدئۆلۆژیکی تـەنگ و بەرتەسـک دەکەنـەوە. بەڵـگەی بنـەڕەتی مینوگ ئەوەیە کە ئیدئۆلۆژی فۆرمێکی مامناوەندی نوێ ئەندێشەیە کـە ڕیـشەی ئـەو دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆزدەیەم. ئیدئۆلۆژییەکان (کە بـە ڕواڵـەت مەبەسـتی گـشت ئەوانە بێجگە لە لیبرالیزم، پارێزکاری و سۆسیال دیموکراسییە) لە جیهـانی داخـراوان کە بەدفەڕی و شەیتانی شـتێکی جیـاواز لـە سروشـتی مرۆڤـایەتی دێنـە ئـارا. هـەر ئیدئۆلۆژێکی شەیتانی دەرەوەی خۆی هەیە (بۆ وێنە سەرمایەداری سەرەڕۆیی یـان سیستەمی پیاو سالاری) ئەمانە (دەسەلاتگەلی بێگانە)یەکن کە دەبێ ئیدئۆلۆژیستەکان لە ناویان بەرن. ئـازاد و کـەماڵ لـە لایـەن شۆڕشـەوە دژی ئـەم دەسـەلاتە بێگانانـە بەدەست دێ. بە بۆچـوونی مینـوگ، ئیدئۆلۆژیـستەکان لـە بنـەڕەتدا لـە تاکگـەرایی، زاینەوە گەرایی و کۆمەڵگەی لیبرال بێزارن؛ بە کورتی لـە مۆدێرنیتـە بێزاریـان هەیـە. ئەوانە بێزارێکی سەیریان سەبارەت بە شارستانیەتی رۆژئاوا هەیە کە خووی هێنـدێ لە رۆشنبیرانە. هەروەها، ئەو جۆرەیکە چاوەڕوان دەکرێ، بەڵگەی مینوگ لە دەور و بەری ئەم گریمانە (کە ئاشکرا لەگەڵ ئەوکشات جیاوەزە) دەخولێتەوە کە هەڵوێـستی پێچەوانە و جیا لە ئیدئۆلۆژیکی، فۆرمێکی لە لیبرالیزمی کلاسیکی ئەمرۆیی گرتووە بە خۆوە.

هۆی سەرەتایی بیچمی ئـەمریکایی (دوایـی پێهـاتنی ئیـدئۆلۆژی) لەسـەر کانگـای گەورە سەرچاوەی گرتووە. یەکەم، لـە دەیـەی ١٩٥٠ و لـە نێـوان بەرەیەکدا کـە لـە دەیەی ١٩٣٠ و ١٩٤٠ دا ژیاون، ئاگـادار و شـایەدی شـەڕەکان، ئەنفالـەکان، دادگـایی کردنی نمایشی، نازیزم، قەلاچوو کردنی یەهوودییەکان، ئیتالینیزم بوون. ئەم بـاوەڕە

روونە بەدی هات کە ئەندێشەی سیاسی ئیدئۆلۆژیکی بەشێک لە کۆی گۆمانی ترسناکە. مارکسیزم، لنینیزم چاوگە و ناوەڕۆکی سەرنجی ئەم بیر و گومانە ڕوالەتییە، لە سەردەمی شەڕی سارد بوو. بەم جۆرە قبوول کرا کە ئەندێشەی ئیدئۆلۆژیکی ریشەی سەرەکی ڕەنجی جەماوەرە. نەبوونی و دەس تەنگی و شەڕ لە نیو دی سەدەی بیستەمدا بووە. هێندێ لە نووسەرانی دەیەی ١٩٥٠ لە راستیدا ڕۆشنبیرانی یەهوودی بوون کە دڵ لەدوایی پەژارەی قووڵی خۆیان سەبارەت بە چارەنووسی یەهوودییەکان لە نیزامگەلی جەزمی ئیدئۆلۆژیکی دەهەکانی ١٩٣٠ و ١٩٤٠ دەنگیان دەدایەوە. ئیدئۆلۆژی کارتێکەری خوازیاری ئەندێشەی سیاسی وەک دون کیشۆتە و هێرش دەکاتە غوولە شەیتان خەیاڵەکان.

دووهەم. بە پێچەوانەی ئەم راستە کە ئیدئۆلۆژییەکان لە کۆمەڵگەی روو بە پیشکەوت کارکردی باشی هەیە. ئەم باوەڕە لە ئارادایە کە دەوری ئەوانە لە کۆمەڵگەی دیموکراسییەتە پیشەسازییەکان شتێکی زۆرتر لە دەوری رازاندنەوە و جوان کردنی نییە. لە دوا کۆمەڵگە، گشتیان لە بارەی ئامانجە بنەڕەتییەکانەوە پێکهاتوون. زۆرینەی ڕێکخراوە گەورەکان لە کۆمەڵگە پیشەسازی، لە خۆش رابواردن و پێکهاتە ئابوورییە تێکەڵاوەکان، بە زۆرینەی ئامانجگەلی ریفۆرمخوازانەی خۆیان گەیشتوون. باڵی چەپ مەترسیگەلی بوونی دەسەڵاتی دەوڵەتی توندڕەویان پەسند کردووە. هاوکاری گشتی و بە یەکەوە بوون و یەک پارچە بوون لە ئامانجگەلی سیاسی لە زۆر لە وڵاتە پیشەسازییەکاندا دەبینرێ. هەر ئەو جۆرەی کە سیمور مارتین لیست نووسیویەتی، (ئەمە سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ شۆڕشی کۆمەڵایەتی دیموکراسییەتی غەرب کە بە ئیدئۆلۆژییەکان، یان ئارەزووە شارییەکان بۆ بزاڤی خۆی بەرەو دەسپێکی سیاسی پێویستی بەوە هەیە)[20] پێکەوە سازانی بنەڕەتی لە بارەی بایەخە سیاسییەکان بە دەست هاتووە. ئەندێشەگەلی سیاسی زۆرتر دەربارەی ساماندان بە زانستی پەراوێزی، زاینەوەی خالیسی میللی، قیمەتگەل، هەقدەستەکان، دابینکردنی کۆمەڵایەتی و وەکو ئەوانە بووە. شتەکانی دیکە زۆرتر خۆ پێوەرادان هارە و گیڤە و قسەی خۆراییی بووە. بە وتەی لیپست (خەباتی

دێموکراتییـەت درێـژەی هەیـە، بـەڵام لـەم خەباتـەدا ئیتـر لـە ئیدئۆلۆژییـەکان، ئـاڵا سوورەکان و خۆ پیشاندان و خۆ نواندنی ڕۆژی یەکی مانگی مەی خەبەرێک نابێ.[٢١]

لە مانە بەو لاوەتر، دەیەی ١٩٥٠ شایەدی بەهرەمەندی پایەداری گەشـە سـاندنی زاینەوە (تەولید) ی ناخالیسی میللی لە بریتانیا و ئەمریکا بوو. لە لایەنێکەوە، ئەم خولە (دوایی پێهاتنی ئیدئۆلۆژی) هەتا ڕادەیەک بووە هۆی دەنگدانـەوەی گـۆڕان و گەشـە کردنی ئابوورییەکانی غەربی لـە دەیـەی ١٩٥٠. [٢٢] پێوانەگـەلی ژیـان ئاڵـوگۆڕی بـە سەردا هات و زۆرینەی دانیشتووە شارییەکانی ئەمریکایی و بریتانی، لەسـەروەت و سامانێکی زۆرتر بەهرەمەند بوون. ماوەیـەکی دوور و درێـژ بـوو کـە دابـە شـکاری ئابووری و کۆمەلایەتی لە کۆمەڵگەدا هەتا ئەم ڕادە نەبووە بازنەیی و سـەرەکی. لـە بریتانی، موتالای باتلر و ئەستۆکس باسیان لە ئاوا بوونی پێوەندی چینی کۆمەلایەتی لەگەڵ ڕادەی بەشداری لـە دەنگدانـدا دەکـرد. دەوڵـەمەندی ئـابووری لەگـەڵ گەشـە کردنی دەوڵەتی دەوڵەمەند، لە جیاوازییە کۆمەلایەتییەکان، ئابووری و سیاسی کەمی کردووەتەوە.[٢٣] سێیەم، (دوایی پێهاتنی ئیدئۆلۆژی) نزیک بوو لەسەردەمی پاڵەوانەتی کۆمەڵناسی، بەتایبەت کۆمەڵناسی ئەمریکایی (دووربـینی و هیـوای ڕزگـار بـوون لـە ئیدئۆلۆژی لە بەرامبەر جیهانییەکاندا کردبیەوە، چونکە لە بـاتی بێهوودەپەرەسـتی، (زانست) کۆمەڵگەی پێناسە دەکرد)[٢٤] ئەم کارە بە جۆرێک گەڕانەوە بـوو بـۆ ئـانتوان تراسێ، ئەگەرچی واژەگەلی ئەو گۆڕا بوو. بەلای تراسییەوە، ئیدئۆلۆژی زانستی بوو کە بێ هوودەیی پاک دەکردەوە. لە زانیاری کۆمەلایەتی دەیەی ١٩٥٠، ئیدئۆلۆژی بێ هوودەیەک بوو کە پێویستی بە پاک کردەوە و سڕینەوە بوو. پێچەوانـەی ئاڵـوگۆڕ و گۆڕانکاری ترمینۆلۆژیک، هۆی هەر دووک ڕووداوەکـە یـەکێک بـوو و ئـەوە شـتێک نەبوو جگە لەم تێکۆشانە زانستییە عەقڵانییە لە بەرامبـەر بـە بـێ هـوودە پەرسـتی و قسەلۆکی بێ ناوەڕۆکـی ڕۆشـنبیرانە بـەرەنگاری بێتـەوە. پێشکەوت و تەنینـەوەی کۆمەڵناسی تاقیکراوە پێویـستی بـە سـەرنج و وردبـینی ئـازاد بـە بایـەخ پێدانـەکان، دڵکرمۆلی، لێکۆڵینەوەی تـاقیکراو یـان دەسـتێوەردان، ئـالوودە نـەبوون بـۆ بـەرەو چوونی دڵۆڤانی ئیدئۆلۆژی یـان تەنانـەت ئەندێـشەی سیاسـی تەشـریفاتی نـەبووو

عەقڵگەرایی یان نئۆپۆزیتیڤیزم دەبوایە راستییەکانی لە بایەخ و گەورە شاراوەکان لـە
پشتی ئەم حوکمانە هاوێر بکات.

دەرئـەنجام، لـەم بـارەوە گـەلێ بەڵـگەیان دەهێنـاوە کـە ئیـدئۆلۆژی بـە واتـای
ـ ستەقینەی وشـە لـە کۆمەڵـگەی دیموکراتییـەتی پیـشەسازی پێشکەوتوو تەمـەنی
ـەسەرچووە. ئیـدئۆلۆژی بـە دوو دڵـییەکی زۆرەوە و لەگـەڵ زانیـاری کۆمەڵایـەتی
ـەسەر بنەمای تاقیکراو بەرهەڵستییەک دژایەتیان بوو. زانیاری کۆمەڵایەتی رێگایـەک
بوو بۆ بەرو زانینی سیاسی، ئێستە ئەوە کە ئیدئۆلۆژی بە مانا و واتای دەروونی بیر
و گومان بوو. بە وەتەی ئەدوارد شلیز: (زانـین لـە تـەک ئیـدئۆلۆژی بێگانەیـە)[٢٥] لـەم
بـڕدوە، ئاماژە بە گومانی ئیدئۆلۆژی، بەپلەی یەکەم خودی مارکسیزمی پێکا بوو.

بابەتگەلێکی زۆر لـە دووربـینی (دوایـی پـێ هـاتنی ئیـدئۆلۆژی) لـە ئـارادا بـوو.
ـ دتوانین بڵێین ئەم رووداوە قۆناخێکی تێپەڕ بووە لـە کۆمەڵـگە پیـشەسازییەکان کـە
بەرامبەر بە توندوتیژی سالانی شەڕ لە خۆیان نیشان دەدا. خەڵک، لە پـاش دەروانی
ڕۆژەرەشی و دەسکورتی سالانی شەڕ، ئێستا لەگـەڵ خـۆش گـوزەرانی و سـامان،
بەکاربردن و گەشەی ئابووری رووبەڕووبوونەتەوە. ئیدئۆلۆژی بە جۆرێکی پێچراوە
بیردوەرییەکانی سەردەمی تالیان وەبیر دێنیتەوە. لەگەڵ ئەمەدا، لە رادەی بۆچوونی
گـشتیتـر، ئـەو جـۆرە مـە ئالیـسدر مـەک ئـەینتایر، بیرمەمەندانـە بۆچـوونی خـۆی
ڕاگەیاندووە، خاوەن ئەندێشانی دوایـی پـێ هـاتنی ئیـدئۆلۆژی (لـە هەڵـسەنگاندنێکی
دژواردا ئیمکانی وجوودی لە جێدانانێکی تێشکاو بوون: واتە ئەمەی کە دوایی پێهاتنی
ئیدئۆلۆژی، بێ ئەوەی کە بە راستی دوایـی ئیـدئۆلۆژی بـێ، خـۆی لـەو سـەردەمەدا
جۆرێک ئیدئۆلۆژی دەدرایـە قەڵـەم.[٢٦] بۆچوونگـەلێ کـە رێبـازی (دوایـی پـێ هـاتنی
ئیدئۆلۆژی) گەلالە دەگیرا هەڵگری هێندێ گریمانەی بایەخی بوو و کێـشان و پێـوانی
دەربارەی سروشتی مـرۆڤ، چۆنیـەتی کـارکردی عەقڵانیـەت، بایـەخی هـاوبیری و
وەردەکاری لە باری تایبەتمەندییەکانی ئەم جۆرە شێوازە و ئاسـانکاری بـە یەکـەوە،
چۆنیەتی پەروەردەی کۆمەڵگای مەدەنی کردەوەگەرایی. کۆشش بۆ ئەم ویـستە کـە
ئـەم بۆچوونانـە تـەنیا پێشمەرج و گریمانەگـەلێ دەربـارەی دووربـینی زانـستی
کۆمەڵایەتین و بۆچوونگەلێکی دیکەی ئیدئۆلۆژی دێنـە ئـاراوە. یـان لـە نابینایـە یـان

هەڵخەڵەتانی رۆشنبیرانەیە. (دوایی پێهاتنی ئیدئۆلۆژی) خۆی بابەتێکی ئیدئۆلۆژیکی و جۆرێک لە لیبرالیزمی کردەوە گەرایانە بوو. ئەم تێکشانە سێیەری بەسەر دووربینی (دوایی پێهاتنی ئیدئۆلۆژی) داکشا بوو هەتا لیبرالیزم بەناوی ئیدئۆلۆژی تاقیکراو لێک بداتەوە.

لەگەڵ ئەوەی کە هۆگری بەم رەساڵەیە لە کۆتایی دەیەی ١٩٨٠ زیندوو بۆوە، بزاڤی (دوایی پێهاتنی ئیدئۆلۆژی) هێشتا بەناوی قۆناخێک لە بەربڵاوی واتای ئیدئۆلۆژی، بە دوو دڵیەکی زۆرترەوە چاوی لێ دەکرێ.

پێگەی ئێستەی ئیدئۆلۆژی زۆر چڕوپڕ و پێچراوەیە و بۆ هەموو قۆناخەکان دەگەڕێتەوە کە هەتا ئێستا لەو بارەوە باسیان کراوە. بەبرەوترین ناوەڕۆک هێشتا دژایەتی توندی لە نێوان (حەقیقەت و ئیدئۆلۆژی)دا هەیە. زۆرینەی ئەو کەسانەی کە لە بارەی ئیدئۆلۆژییەوە دەدوێن دەڵێن خۆیان بێ لایەن و جیا لە ئیدئۆلۆژیکن. خوازیارانی هەڵگری ئەم بێ لایەنییە وەکو هەمیشە پسپۆڕانی زانستییە سروشتییەکان و کۆمەڵایەتی، فەلسەفە و ئەندێشە سیاسییەکانن. کاتێ تێدەگەن کە زۆر لە لیبرالەکان، پارێزگارەکان، فەمینستەکان، مارکسیستەکان و ئەوانی دیش دەڵێن لایەنگری زانست یان فەلسەفەی بەرامبەر، لەگەڵ ئیدئۆلۆژین، مەبەست ئاڵۆز و پێچراوەتر دەبێ.

ئەمە لە تایبەتمەندیەکانی رەوەندی ئینگلیزی ـ ئەمریکایی بووە کە هەوڵی دەدا هەتا شێوەی جیاوانی زانین و ئیدئۆلۆژی بەپێز و رامانێکی قوول و ریشەدارە کە چووە تا ناخی خۆئاگایی زانیاری کۆمەڵایەتی (دوایی پێهاتنی ئیدئۆلۆژی) یەوە. ئەگەرچی بە شێوەی دەروونی لە گشت رامانی سەردەمی رۆشنگەریشدا هەیە. لەم دواییانەدا لە وتارێکی کورت، بەڵام کراوە، لە بارەی جەوهەری ئیدئۆلۆژی، شکۆدار دەبێ کە ئەگەر واتای ئیدئۆلۆژی بە شێوەی گشتی (سیستەمی باوەڕەکان) کۆ دەکاتەوە. کەوا بێ پێناسەی باسکراو جیاوازی لە نێوان شێوە جۆراوجۆرەکان نامراد دێڵێتەوە... جیاوازی لە نێوانی زانست و ئیدئۆلۆژیشدا نامراد دەبێ.[٢٧] هەڵوێستی بنەمایی و ریشەیی ئەوەیە کە بۆ کار کردنی زانستیە کۆمەڵایەتی یان سروشتی، زانینی ئێمە دەبێ پرۆژەیەکی نەگۆڕ، راوەستاو و بەرچاو هەبێت. ئەم پرۆژە کە بەڵگە

و پیواری حەقیقەتە دەتوانێ وەک بڕیارێکی دادگاه دووپات بوونەوەی بسەلمێ و وەکار بکەوێت. بایەخگەل و باوەڕەکانی ئێمە نابێ کاریگەرییەتی لەودا هەبێت. حەقیقەتی باوەڕەکانی ئێمە، کە توانایی بە ئێمە دەبەخشێ ئەوانە وەک زانین بناسین و وەری بگرین، ئەمە کە دەبێ هەتا رادەیەکی مومکین لەگەڵ ئەم پڕۆژە بەرچاوە هاوکێشی و هاو سەنگیان هەبێت. عەقڵانیەتیش وەک هەمیشە وەکو پێکهاتوو و سازان و بە کۆبوونەوەی گشتی دەربارەی پێوارەکان چاوی لێ دەکرێ و ورە و وزە بە ئێمە دەبەخشێ کە لەگەڵ یەکتر پێوەندیمان هەبێت. لە زانستەکانی کۆمەڵایەتی، بەتایبەت ئەم پڕۆژەگەراییە زانستییە دەبێ دووری و جیاوازی خۆی لەگەڵ بایەخەکانی فامیتر و دڵۆڤانیتر و باوەڕگەلی تەواوی ئیدئۆلۆژی بپارێزێ. هیچ پرۆژەیەکی دەرەکی لە بووندا نییە کە ئیدئۆلۆژییەکان لەگەڵ ئەودا هاوکێش و هاوسەنگی هەبێت. ئیدئۆلۆژییەکان هەر ئەو جۆرە کە لەگەڵ ئەندێشەکاندا گرێیان خواردوە، لەبەر ئەمە، مەنتقی تایبەتی هەیە، چونکە ئەندێشە رێبازی راستەقینە بنەماکانی دەرەکییە، بۆ دەستێوەردان دەبێ.

گرفتی ئەم روانگە زانستییە ئەوەیە کە زۆر کۆن رەتکراوە و ناڕەزامەندی زۆری لە بارەوە دەربڕاوە. لێرەدا ناکرێ سەبارەت بە باسیاتی پێچراوەیی فەلسەفەی زانست بەو باسە درێژە بدێ. بەم حالەوە، ئاسەواری فەیلسووفانی زانست وەکو تامس کوهن، پۆل فیربند، ئەیمرە لاکاتوس و مری هس و تاقمێکی دیکە، گەلێ کێشەیان لە بارەی جەوهەری زانست بەو لاوەتر لە بۆچوونە باسکراوەکە کردووە.[٢٨] بە بۆچوونی کوهن، زانست بە سەریەکدا کەوتن و زۆر بوون و پەسندی تاقیکراو بەرەو پێش ناچێ، بەڵکو ئەم (نموونانە حاکمن) یان لە لایەن تاقمەکەی (گشتالتی) یان گۆڕینی باوەڕگەلێکی شێوە مەزهەب دەسەلاتیان بە دەستەوە گرتووە. ئەم نموونانەن کە جەوهەری پارادۆکسگەلێ کە دەبێ بتوێنەوە، دیاری دەکەن و دڵێن کە چ زانستێک باش و رێکە و چ زانستێک نییە. هەرکە وێنەیەک دیاری کرا، جەماوەری تۆژەرەکان هەتا ماوەیەک وەکو ئەو کار دەکەن. وێنەیەک پێویستانە (شیاوتر) لە وێنەکانی دیکە نییە؛ ئێستا ئەوەی کە هەر وێنەیەک جیاوازی، پێوەرەکانی جیاواز، واتای جیاواز لە راستی دەخولقێنێ. لەبەر ئەمە مێژووی زانست جۆرێک لە

جۆرەکانی کورت نابێتەوە، بەڵکو زۆرتر رشتەیەک، پەلێک لە گۆرانی وێنەی دەورانییە کە هەموو جەوهەری زانست و وەرگرتووەکانی ئەو لە راستی دەگۆرێ. لە لایەکیترەوە، فیربند کێشە بێلایەنەکانی و سەربەخۆیی زانیاری سروشتی (ئەفسانەگەلی پەریئاسا) دەزانێ کە خەڵکی زانست برەویان پێ داوە و ئامانجەکەشیان کۆمەڵایەتی و ئابوورییە. ئەو دەڵێ هەر پێوارەیەکی میتۆدی زانستی، چ عەقڵانی بێ، چ تۆژینەوە و لێکۆڵینەوە، لە پێوەندی لەگەڵ دۆزینەوە و داهێنانی گەورەی زانستی لەوانە تەختەتی کراوە. لەبەر ئەمە، هیچ مەرجێکی پێویست و تەواو کردەوەی بێ عەیبی زانستی و هەڵبژاردنی ئەندێشە لە گۆرێدا نییە.

لە راستیدا ئێستا زۆر لە فەیلەسووفەکان دەڵێن کە ئەندێشەگەلی زانستیش تا رادەیەکی زۆر تافی و کاتین. ئەندێشە، تایبەتمەندی راستی دەسنیشان دەکا. ئەندێشە ئەندامی بێ خەوشی راستییە. با بە جۆرێکی دیکە بڵێم: هیچ راستییەکی بەرچاو لە دەرەوەی بنەمایی بێخەوش لە گۆرێدا نییە کە هەموو ئەندێشەکان لەگەڵیدا بەرامبەری بکەن. خاڵی سەرەکی ئەمەیە کە هەم واتا و هەم زاینەوەی ئەندێشەی زانستی لەگەڵ رێک بوونە دەروونییەکەی و وەرگرتنی لە لایەن کۆمەڵگەی زانستییەوە بە تاقی دەکرێتەوە. ئەم راگواستنە لە زانست، لە لایەن تیشکێکی زۆر بێهێز کەوتە سەر ئەو جیاوازیە گریمانە راست و دیاری کراوە، هێشتا زۆر جار لە زانیاری کومەڵایەتی، لە نێوان زانست و ئیدئۆلۆژیدا جێی باس و سەرنجە. هۆی ئەوە تا رادەیەک پێوەندی بە میتۆدێکەوە دەبێ کە زانست بە هەمان دەنگەوە لە بارەیانەوە ئەدوێ کە لە رابردوودا ئیدئۆلۆژی بە شێوەی سوننەتی لەم بارەوە دەدوا .

لە باری ئەندێشەی سیاسی و فەلسەفەوە، تەنانەت دۆخ پڕ مەترسیتر بووە. مەبەست پێوەندی فەلسەفەوە هەیە. فەلسەفە (ئەندێشەی سیاسی) لەگەڵ ئیدئۆلۆژی، تا رادەیەکی زۆر بە فامی فەلسەفە دیاری دەکرێ. ئەگەر کەسێک لە لایەن پێکهاتەی فەلسەفە شیکارییەکانەوە، زمان ناسی، یان گێرانەوەیی و ساختشکێنی بە رووداوەکە نزیک دەبێتەوە، لە هەر بارەوە تۆژینەوەی فەلسەفە پێوەندی لەگەڵ ئیدئۆلۆژی بە شێوەیەکی بەرچاو دەگۆردرێ. باس کردن لە بارەی هەموو ئەم فەلسەفانە لەم ئاستەتەنگ و بەرتەسکەدا ناگونجێ، بەم بۆنەوە، بە چەند وێنەی

هەلبژێراو کۆتایی پێدێنین. بە گشتی کردنی مەبەست، بزاڤەکانی فەلسەفەیە بەربڵاو و پێچراوەکان دەخاتە مەترسییەوە. لەگەڵ ئەمەدا، گرنگ نییە کە تەئکید بکرێ فەلسەفەی شیکاری لە کردنەوەی ئەو مەبەستانەی کە بۆ ناساندن دەبن، وەک رێ و شوێنێک زانست و زانیاری بەرچاو و زانینی سروشتی (بە واتایەکی سوننەتی‌تر) هی ئەوان بووە، بە شێوەی سوننەتی هەر ئەو رێگا دەرەکیەی فەلسەفەکانیان گرتبووە بەر. فەلسەفە لەگەڵ شیکاری زاتەن بێ‌لایەنانە، وردبینانەو، مەنتقی کار دەکا. فەلسەفە بە شیکاری سروشت پێویستانەی راستی رووداوەکان لە بارەی جیهانەوە دەدوێ. لێرەدا گریمانەی بنەڕەتی ئەوەیە کە تەنیا لە زانیاری سروشتی بێ خەوشی ئێمەدا زانست و زانیارێکی ئاوەها تووش دێین. ئیدئۆلۆژی، وەک ئەخلاق، جوانی‌ناسی یان دین، شێوەیەکی دیکەی بۆ ئەندێشەزانان هەیە کە زانستی و بەبایەخ نییە. ئیدئۆلۆژی بەشتگەڵ و تەئکیدی شیاو دەس پێدەکا، بەڵگە ناهێنێتەوە. ئیدئۆلۆژی زۆرتر خوازیاری کردەوەیە و لە جیاتی شیکاری رەخنەگرانە بە رازی کردنی دڵۆڤانییەوە سەرقاڵ دەبێ. بەم جۆرە کە لەم دواییانەدا لە نووسراوەیەکدا بەڵگەیان بۆ هێناوەتەوە، کاتێ دەست دەکەین بە راوێژ دەربارەی مەسەلەگەلی فەلسەفەی ئیدئۆلۆژی، نابێ (میتۆدی شیکار) لەگەڵ (ئەوەیکە شیدەکرێتەوە) تێکەڵ بکەین. بە جۆرێکی‌تر، فەلسەفە بەناوی میتۆدی شیکاری و تێگەیاندنی بێ لایەنانەی ئیدئۆلۆژی، نابێ لەگەڵ ئیدئۆلۆژییەک کە شی دەکرێتەوە، تێکەڵ بکرێ.[29]

ئەم واتا بێ خەوشە لە فەلسەفەدا لەژێر دوو گوشار دایە کە شێوە و بیچمی جیاواز و روونی لە نێوان شیکاری و کارێک کە بۆ شیکردنەوەیە، دژوار دەکا. یەکەم ئەوە کە، واتای زانست، وەک ئەوێکە لەسەرێ گریمانە بوو، تووشی ئەو گۆڕانە زۆرە بووە کە ئێتر قسە کردن لەوە بەشێوەی فەیلسووفانی شیکاری سەرەتایی، کارێکی ناپەسند و رێ پێنەدراوە. واتا گەلی دواتر، ئەو جۆرەیکە ئەوترێ، لە تەجرەبەگەرایی دەقیق‌تر، بەرەو مۆدێلی توژینەوە رێیان پێ گۆڕیوە، بە دوای ئەوشدا، سەرهەڵدانی (زمانی ئاسایی) و فەلسەفەی زمان ناسی، کە بەتایبەت لە نووسراوەکانی ئاخری ویتگنشتاینەوە سەرچاوە دەگرێ، تێبینی ئێمە سەبارەت بە سروشتی زمان، حەقیقەت و زانینیان گۆڕیوە، تەنیا لایەنە کۆمەڵایەتییەکەیان بۆ ئێمە بە جێ هێشتووە. بەیان

کردنی واتا پێوەندی بە قسەکردنەوە هەیە کـە دەزانــێ چـۆن زمـانی هەڵسووڕێنێ. زمانەکان نەدۆزراونەتەوە بەڵکو لە باری کۆمەڵایەتییەوە داهێنراون. واژەگەلی ئێستا لە زمانەکاندا بە راستی پێوەنـدیان بـە شـتەکانی جیهانــەوە نییـە بەڵـکو دەسـکەوتی جۆراوجۆری گەورەی کار پێکردنەکان لە دەروون (یاریگەلی زمانی) گـرفتی ژیـانی. فێربوونی واتایەک بریتیە لە فامی جەوهەری ئـەو یـان فێربـوون و زاڵـبوون بەسـەر بیچم و وێنەی زەینی ئەو نییە بەڵکو دەرک و تێگەین کارکردگەلی جۆراوجـۆری ئـەو لە زمانی حاڵی عامـە، لەبـەر ئەمـە، واتـا گـەڵ راسـتەوخۆ لەگـەڵ شـتەکانی جیهـان بەرامبەری نییە. لە راستیدا، سروشتی زۆرینەی واتاکان کە لەگەڵ ئـەوان رووبـەڕوو دەبن، باس هەڵایسێنی زاتی ئەوانەیە. واتا زۆرتر بە دەستوورگەلی زاڵـبوون بەسـەر کەڵک وەرگرتن لە یاریگەلی زمانی بێخەوش بووە بەوە. یەکێک لـە ئاسـەواری ئـەم کارە، گەڕاندنەوەی ئیدئۆلۆژییەکانە بۆ دەروون گێڕانەوەی (فۆرم گەلی حەیات) یـان (یاریگەلی زمانی) یە. ئیدئۆلۆژی بیچمی و وێنـەیی بـەرەو جیهـانی بـوون ناگـەڕێ، بەڵکو بەشێکە لە جیهانی رمان و کردەوەیە. مەبەستی قسە هەڵاییسێنتر بۆ هێندێ لـە فەیلسووفە شیکارەکان، ئەمەیە کە زانست بەشێوەی بەربڵاو بووە بە یـاری زمـانێکی دیکە. ئەم واتایە، ئەگەرچی وازی لـە میتـۆدی تـەواو و شـیکاری نـەهێناوە، بێگومـان بەرگری ئاشکرای نێوانی ئیدئۆلۆژی و فەلسەفە دەبێ.

گشت رشتەکانی گومان و داپۆشراوی فەلسەفەی هاوچەرخ، وەکو پێکهاتە شـکێن و هێرمنۆتیک، لە باری تێبینیگەلێکی زۆر جیاواز لە خۆشـی، بـە تێـرامانێکی یـەکجار زۆرتری لە فەلسەفەی شیکاری و دواخراو، چ لەبارەی سەربەخۆیی گریمانەی زانست و چ دەربارەی جیاوازی دەسکردی نێوان فەلسەفە و ئیدئۆلۆژییەکان لەو پێوەندییەدا، گومانیان کردووە. نووسەرانێکی وەک فۆکۆ، دریدا، هابێرماس، ریکـۆر و گـادامێر لـە پێوەندی لەگەڵ جیاوازییە ئاسانەکانی پێوەندیدار بە ئیدئۆلۆژی کـە سـێبەری بەسـەر زانیاری کۆمەڵایەتیدا کێشاوە، گومانگەلێکی پێداگرانەیان دەربڕیووە.

هەڵوێستی ئێستای ئیدئۆلۆژی پەیتا پەیتا جێی قسە و کێشەیە. ئێستا رواڵەتەن ئەم وایە کەوتووەتە بەر مەترسی یەکتر بڕینەوەیەکی ئاست ناسکی نادیـارەوە. زۆربـەی واتاکانی ئیدئۆلۆژی کە دیتمان کە هێشتا لە مەترسی لێکۆڵینەوە و لێدواندان ونـە کـار

کردی واژە بە ناوی (زانستی دۆزگـەل) یـان (دۆزناسـی) وە نـەک ئـارەزووی وەهـا زانستێک هێشتا، لەژێر ناوگەلێکی جۆراوجۆر، لە هێندێ لە مەیدانی دەروون تـوێژی و دەروونناسی، بوونیان نییە. بێجگە لەمە، ئەم واژە بـە واتـای فەڕانـسەوی سەلـتەنەت خوازەکانی ئەو، کە لەسـەر کۆمـارخوازی پـڕ مەترسـی دژی خواپەرسـتی ڕێنـوێنی دەکرد، بە کار نابرێ. ئیدئۆلۆژی هێشتا کارکردی تێکەڵ بە لەم زانینی هەیە، بە واتـای هەبوونی تێبینی بەرتەسک یان دەمارگرژی بایەخی، وا یان بە شێوەیەکی گـشتیـتر، بە واتای ئەندێشە و گومانە. جگە لەوە، ئیدئۆلۆژی دەتوانـێ لەسـەر تێبـینی سیاسـی تاک ڕێنوێنی بکا: واتە کۆمەڵێ لە ڕوانگەکان کە تێدەکۆشن بە دەسەڵاتی سیاسی یان هـەموو ئەندێـشەکانی سیاسـی بەسـراوە بـەوەوە، ڕەوای پـێ بـدەن.[30] هـەروەها ئیدئۆلۆژی ڕەنگە بـە گـشتی بـە واتـای دۆزگـەلی حزبێکـی سیاسـی، جیهانبینییـەکی متافیزیکی تەواو یان زانیـاری مرۆڤـانە بـێ کـە گـشت باوەڕەکانیـان یـەکێک لەوانـە هونەری زانست دەگرێتەوەخۆ. زانست دەبێ بەشی سیاسی بوونی هەموو فیکرەکان بێت کە لێرەدا جێگۆڕکێ یەکجار جۆراوجۆر و زۆرن.[31]

## خاڵە بەئاگاهێنەرەکان

بە بۆچوونی من، ئیدئۆلۆژییەکان کۆمەڵێکن لە واتاکان، بایەخ و نیهادێکن کە مانا و واتای سروشتی مـرۆڤ دەگرێتـەوەخۆ و لـەم بـارەوە، بـۆ مرۆڤـەکانی دیاریـە کـە دەستیان بە چشتگەلێکی مـومکین یـان نـامومکین دەگـا، واتـە: ئەندێـشەی ڕەخنـەیی دەربارەی کرداری سروشتی ڕووبەڕووبوونەوەی مرۆڤـایەتی. ئـەو بایەخانـەی کـە مرۆڤەکان دەبێ ڕەتی کەنەوە یان ئـارەزووی گەیـشتنیان بەوانـە ببـێ، بـەربڵاوێکی تکنیکی دروست بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسـی کـە پێوەنـدی بـە نیـاز و عەلاقـە و بەرژەوەنـدی مرۆڤـەوە هەیـە. بـەم جـۆرە ئیدئۆلۆژییـەکان هـەم مـرۆڤ تەوسـیف دەکـەن هـەم ئیـزنی شـتگەلێک بـەوان ئـەدەن. ئـەم دوو ئامانجـەیان لـە ئیدئۆلۆژیدا پێکەوە گرێ داوە. هەروەها ئیدئۆلۆژییەکان هـەم هێنـدێ هەڵـسووران و بەربڵاوی بەرەوا دەزانن و هەم تاکەکان بـە یەکـەوە دەلکێـنن و بـەم جـۆرە، هێـز و توانایی بەوان دەبەخشن کـە لـە دەوری ئامانجگـەلێکی دیـاریکراو کۆببنـەوە. ئـەو

ئیدئۆلۆژیانەی کە لەم کتێبەدا دەربارەی ئەوان باس دەکرێ، هەر ئەو ناوەرۆکەیە کـە لەسەرەوە باس کرا بە تەواو مانا چاوکراوانە جستوجۆ دەکەن.

چەند خاڵێکی رەخنەیی لەسەر ئیدئۆلۆژی هەیە کە دەبێ تیشک بخرێتـە سـەری. یەکەم، یەکێک لەو رەخنانە کە دێتەوە سەر ئیدئۆلۆژییەکان ئەوەیە کە زۆرتر ساویلکە و بە کردەوەن و بەتەواوی لە فەلسەفە نین و کەمتر رەخنە لە خۆ دەگـرن. جـاری وا هەیە فلان ئیدئۆلۆژی وەکو هەڵەی زمانی یان پرۆپا گەندە دێتە بەرچاو. بەم حاڵەوە، ئەمە تەنیا نیوە لە حەقیقەتە. زۆربەی لە بیرە فەلسەفەیی و زانستییەکان لـە دەروونی ئیدئۆلۆژەیەکاندا کارکردیان بووە، لـە راسـتیدا زۆر لـە فەیلـسووفەکان و پـسپۆرانی زانستی سروشتی ئیزنیان داوە لە باوەڕەکانیان بـە شـێوەیەکی ئیـدئۆلۆژیکی کەڵـک وەربگرن، چ زۆر بە مەیل و ئیشتیا لە زاڵبوون بەسەر ئیدئۆلۆژی تایبەتا بەشدار بـبن. بە بڕوای من، ئیدئۆلۆژی دەکرێ هەم بەشێوەی زمان بە دەست بێ و هەم بە شێوەی لە ریشە دەرهێنان ئەندێشەی فەلسەفی یان زانستی. فلان نووسراوەی ئیـدئۆلۆژیکی رەنگە بە شێوەێکی بەربڵاو بە پێچراوەی ئەندێشەی تێدا بە کار برابێ، بەڵام هەر ئـەم بیرە بنەڕەتییە لەوانەیە بە کاڵترین شـێوەی دروشـم یـان پرۆپاگەنـدە بـەیان بکـرێ. هەروەها لە حاڵێکدا کە فلان ئیـدئۆلۆژی لـە ئاسـتی بۆچـوونێکی پێچراوەدایـە، فـلان فەلسەفەی زانستی ئیدعای دەوری بە کردەوە دەبێ. ناوەرۆکی شای فەیلسووفەکان (یۆتۆپیا) ئەفلاتوون، لە گۆڕەپانی مێژووی فەلسـەفە تا ئێستا دەنـگ دانـەوەی بـووە، مەگەر لە بوارە زەریفەکان و پێچراوەکانـدا سروشـتی فێـر بـوون و خـۆ فێرکـردنی ئەندێشە. ئەندێشەگەلی ئیدئۆلۆژی دەتوانن سەر کۆنەکەر، یان بەتەواوی بە دەدەبانە بن. خاڵی گرنگ ئەوەیـە کـە ئێمـە پێـڕەوانی ئـەو وتانـەی سـەرەوە، نابـێ هەمیـشە چاوەڕوان بین کە لە وەرێکەوتنی ئیدئۆلۆژییەکان پێکهاتەگەلێکی رێکوپێک بە دەست بێنین. ئەو جۆرە کە گوتمان، ناوەرۆکی ئیدئۆلۆژیکی دەکرێ هەمیشە لە هەڵـە تێکـەڵ و پێکەڵەکانی زمانی کە دەیانەوێ زیرەکانە ئەندێشەکانیان وەخۆ گرێ، ببینێ. تەنیا لە کۆتایی ئەم درێژ پێدانە کە دەتوانین چاوەڕوانی وەها یـەکگرتنێکمان هـەبێت. بێجگـە لەوە، لە هەموو ئاستەکانی ئیدئۆلۆژیدا لەگـەڵ بیرمەنـدانێکی جیـاواز لـە بوارگـەلێکی جۆراوجۆر رووبـەڕوو دەبینـەوە. لـە دووی یـەکگرتنێکی مـەنتقی دەگـەڕێین، بـەڵام

ناتوانین هەمیشە چاوەڕوانی ئەوە بین کە بیدۆزینەوە. تەنیا لە دوایی پێهاتنی ئەم ڕیژە پێدانەیە کە دەتوانین چاوەڕوانی یەک گرتنێکی ئەوتۆمان هەبێت. جیا لەوەش، لە هەموو ئاستە ئیدئۆلۆژییەکان لەگەڵ بیرمەندانێکی زۆر جیاواز لە بوارگەلێکی جوراوجۆر ڕووبەڕوو دەبینەوە، لە دووی یەککگرتنێکی مەنتقی دەگەڕێین، بەڵام ناتوانین هەمیشە چاوەڕوانی ئەو دۆزینەوە بین.

نیگەرانییەکی دیکە پێوەندی بەو ئاستەوەیە کە ئیدئۆلۆژی لەودا بەکار دەبرێ. ئەم بابەتە مەسئەلەی یەکگرتنی دەروونی ئیدئۆلۆژی ئاشکراتر دەکا. مارتین سلیگر لە وتالای زانستانەی لە بارەی ئیدئۆلۆژی، جیاوازی لە نێوان ئاستە بنەڕەتییەکان و زانستی ئیدئۆلۆژی دادەنێ. سلیگر ئەگەرچی بەڵگە دێنێتەوە کە (ئەندێشەی سیاسی لە ئیدئۆلۆژی جیا ناکرێتەوە)، دەڵێ سیفەتی زەق و بەرچاوی ئیدئۆلۆژی لە هەلسەنگاندن و بەراورد لەگەڵ فەلسەفەی بە کردەوە ئەوەیە. لە بارەی ئەو خاڵەی کە لەسەرەوە باسمان کرد. بە بۆچوونی سلیگر، سروشتی بنەڕەتی، باوەڕەکان و تەجرەبەکان و ڕاسپاردەکانی ئیدئۆلۆژی هەمیشە پێویست بە بە کردەوە یان دەست پی کردن لە جیهان کە بنەما دەخاتە مەترسی و ئەوانە بە جۆرێکی حاشا هەڵنگەر پێکیان دێنێت، ڕووبەڕوو دەبنەوە. بەم جۆرە، بە بۆچوونی سلیگر (پێکهاتن لە لایەکی دەبێتە هۆی ئیدئۆلۆژی نێوان لایەنی بەڵگەی باشتر، لەم ڕووەوە تایبەتی تر و بنەڕەتی‌تر، لە لایەکی دیکەوە لایەنێکی ورد تر و بە کردەوەتر ببێ بە دوو لق. لایەنە دواییەکەی، ئیزنگەلێکی ئەخلاقی زۆر جار... ئیزنی تەکنیکی لاواز دەکەن.[٣٢] بە بۆچوونی سلیگر، دەسکەوتی ئەم دوو لقە و دوو شەق بوون، جیاوازی نێوان هەرێمە بنەڕەتییە ئیدئۆلۆژییەکان و لە لایەکەوە هەرێمی بە کردەوە، فەنی ئەو لە لایەکی دیکەوەیە. ئەسڵی بنەڕەتی، نەک تەنیا لە لایەن خەبات لەگەڵ هەموو ئەسڵە بنەڕەتییەکان بەڵکو هەروەها پێویستەکانی تەکنیکی و بە کردەوە زۆربەیان دەگۆڕدرێن یان دەکەونە بەر گۆڕانکاری و بۆچوون. لە لایەکی دیکەوە، مەسەلە بە کردەوەکان و تکنیکەکانیش لە بەردەمی دادگای پێویستی ئەخلاق و بێ خەوشی ئیدئۆلۆژیکی دەکەونە بەر لێپرسینەوە و دادگایی کردن و تووشی گۆڕانکاری دەبن.

هێندێ لە ئیدئۆلۆژییەکان، وەکو لیبرالیزم، لە بارەی بە کردەوە کردن و پەرەپێدان بە مەسەلەی هۆگری خۆیان، لێزانتر و سەرکەوتووتر بوون. ئیدئۆلۆژییەکانی دیکە، وەکو ئانارشیزم بە هۆگەلی جۆراوجۆر زۆرتر کێشەیان لەگەڵ ئەسڵی بنەڕەتا بووە و ئەو جۆرەش ماونەتەوە. لە پلەی بەراورد، ئاناشیزم لەچاو لیبرالیزم یان سۆسیالیزم کەمتر بەس لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ مەسەلەی فەننییەکان بە کردەوەیان هەبووبێت. لەم خاڵەدا مومکینە لەگەڵ ئەم بڕیارە نارەوایە رووبەروو بێتەوە کە لیبرالیزم باوەڕی حەقانیتر، بە کردەوە و نا ئیدئۆلۆژیترە. ئێستا ئەوە کە ئاناشیزم لە دنیایەکی سەرەکی باوەڕی ئیدئۆلۆژیدا دەژین کە توانای پەرەپێدانی بەوانە نییە. لەگەڵ ئەوەدا، لێرەدا مەسەلەی راستێکی نەگۆڕ لە ئارادا نییە. بەڵکو لە ئاستێکدا کە ئیدئۆلۆژی کارکردی هەیە، لەگەڵ قەزاوەتی لێکۆڵینەوە رووبەڕوو دەبێتەوە کە لیبرالیزم لە جیهاندا باشتر دەروەستی ئەوە هاتووە. بەڵام تەنانەت ئەگەر ئیدئۆلۆژییش کارکردی بە کردەوە لە خۆ نیشاندابێ، ئەم کارە تەنینی ئێستای لە ئاستێکی بنەڕەتی بۆچوونی لە دەروونی ئەو ئیدئۆلۆژییە کەمناکاتوە. مێژووی داڕشتنی سیاسەتی لیبرال هەمیشە لەگەڵ ئەم پرسایرە رووبەڕوو بووەتەوە کە: ئایا بە راستی ئەمە لیبرالیزمە؟ جیاوازی بنەڕەتی، کردەوەی سەرکەوتوو لە بابەت لێدوان دەربارەی گۆڕینی ئیدئۆلۆژیشەوە سوودمەندە. بە بڕوای سلیگ، گۆڕین هەم مومکینە بە مانای (سازگاری دووبارەی سروشتی بەکردەوە لەگەڵ پێناسەی ریشەیی یان پێناسەی بنەڕەتی و ئەسڵی بنەمایی، و هەم سازگاری و وەک یەک بوونی پێناسە لەگەڵ ئەوەیکە بە کردەوە بەرێوە چووە یان ببێ بە جێگر).[٢٢] بە زمانێکیتر، رەنگە گۆڕین هەم لە لایەنە بەکردەوەکەوە روو بدا و هەم لە لایەنە بۆچوون و بنەڕەتییەکەیەوە، بەڵام زۆرتر لە لایەنە دواییەکەوە روو دەدا، ئەمە تا رادەیەک لەو رووەوەیەکە لایەنە بۆچوونەکە زۆرتر لەبەر دەستی رووداوەکان و بەسەر هاتە زمانەکان و جیهانییەکاندایە. بەسەرهاتەکان هەم مومکینە بنەڕەتە ئەسڵییەکەی قەوی و بەهێز بکات و هەم رەنگە ئەوانە کز و لاواز بکات. تاقە خاڵێک بۆ زیاد کردن ئەمەیە کە دەرک و پێزانینی بەسەرهاتەکانیش پێوەندی بە روانگە ئیدئۆلۆژییەکانەوە هەیە. بەسەرهاتگەلی بێ ئامرازی نەگۆڕ لە ئارادا نییە کە ئیدئۆلۆژییەکان ناچار بە وەک یەک

بوونی خۆی بێ لەگەڵ ئەوان. ئەو جۆرە کە لایەنگرەکانی مێژوو دوایی تێگەیوانە ـەگە دێننەوە، گۆڕانی مێژوویی دەبێ بە شێوەی تێگەیشتوانە تێی بگەین. ئێمە لە جیهانی واژەدا دەژین، ئەم واژانەن کە کتێب و هەرچی ئێمە داوای دەکەین و دەس ـیشانیان دەکەین. ئێمە بە واژەگەلی یەکترەوە گرێمان خواردووە. ئەوەیە کە ـەنجامی دەدەین و لە ناخەوە لەگەڵ چاوگەی زمانی ئێمە، لە باری واتاوە، بەڵگە و ـەنعەتێکی نوێیە بەرتەسک کراونەتەوە. دەبێ بڵێم بەرتەسکی زمانی و ئەخلاقی و سیاسی من، بەرتەسکی جیهانی ئەخلاقی و سیاسی من دەس نیشان دەکا.[٣٤] هەموو بەگە و هۆ و بەسەرهات و رووداوەکان بە ناوجێیی کردنی تێگەیشتن ئەنجام ـدرێ. ئەو جۆرە کە یەکێکی دیکە لەم تاقمە دەنووسێ: گۆڕینی تێگەیشتنی بەرەبەرە تا رادەیەکی زۆر بە سراوەتەوە بە تێگەیشتنی گۆڕانی سیاسییەوە و بە پێچەوانە. ئەم دەرک و فامە پێویستانە دەبێ مێژوویی بێ.[٣٥]

خاڵێکی گرنگی دیکە کە دەبێ باسی بکرێ، پێوەند و تێکەڵ بوون و یەک داپۆشین و پێکەوە لکاندنگەلێکی ئیدئۆلۆژیکی هەم لە ئاستی بنەڕەتیدایە و هەم لە ئاستی کردەوە. زۆربەی بەڵگە و ئامانجگەلی جۆربەجۆر ، تا کی بنەڕەتی، یان ئەندێشە، یان بەڵگەگەل، یان فەن وە یان بیرمەند بیخەنە بەر باسێکی گشتی ئیدئۆلۆژیا کە بەتەواوی سەبارەت بە یەک بێگانەن. ئەم تێک ئالاوی و پێکەوە گرێ خواردنە، مەسەلەی ناساندنی ئاشکرا دژوار دەکاتەوە و زۆر جار بە داهێنان ناونیشانی وەکو سۆسیال ـیبرال، پارێزکار لیبرال، مارکسیست فەمینیست، کومۆنیست ئانارشیت و سەرمایەداری ئانارشیست دەبەخشێ. ئیدئۆلۆژییەکان پێکهاتەگەلێکی پچڕاوی وتەیەکن کە بە رادەیەکی زۆر باری میراتی و لێک هەڵپێکانی فیکرییەکە زۆر جار هەموو ساڵێکیش پەرە دەگرێ و دەیهێننە ئاراوە. لەبەر ئەمە، هەر ئیدئۆلۆژییەک لە دوو ڕگە فیکری پێک هاتووە.

ئەم لەیەک ئالاوانە دەبێ ناوەڕۆکێک لە باری ئیدئۆلۆژییەکان بگرێتە خۆ کە دەڵێن میراتگری ئەندێشەی راستیەقینەن. لە رواڵەتا پیشەی ئەلیاس پێغەمبەر بە میرات بەوان گەیشتووە. ئەم رووکردە بە (باوەڕی راستەقینە) هەر ئەو شتەیە کە تێگەیشتنی ئەوان ئاسانتر دەکا و ئەوان لە بەڵگە هێنانەوە قورس و قایم و کاریگەر

دەکا، بە قوەتی خۆی لە باری دەسەلاتی گۆڕینی باوەڕی خۆی تووشی نیگەرانی و دوو دلی دێ. لەوە ناچێ لە رادەبەدەر لەژێر گوشار و باری گوناە و گوماندا بن، ئەم بۆچوونە فیکریە لە گشت هەلوێستە ئیدئۆلۆژییەکاندا دەبینرێ. کۆمەلگای پارێزکاری، سۆسیالیزم و لیبرالیزم بە ئەلیشعگەلێکی (پێغەمبەری بەنی ئیسرائیل) زۆر هاتوونەتە خوارێ، بە رادەیەک کە ئەمڕۆ بووە بە کۆمەلگەی لەت لەت. هەموو خاوەن هەلوێستە ئیدئۆلۆژییەکان لەژێر گوشاری ئەم بارە قورسە دانین، بەلام هاوکات لەگەل تێپەڕینی زەمان، نیشانەی نەخۆشی بەرەوپێش دەروا. هێندێ لەسەر سووڕهێنەرترینی ئەم ئەلیشعانە کەسگەلێکن سوورن لەسەر ئەوە کە مانا و واتای ئیدئۆلۆژی و شێوازی بەکردەوە و ئاکادمیک دەنووسن. هێندێ لە وانە شتگەلێ بە خوێنەر رادەگەێنن کە دەلێن حوکمی بێ لایەنانە لەباری ئیدئۆلۆژییەوەیە، ئێستا ئەوە کە لە راستیدا خۆی بەشێکی جوان لە ئیدئۆلۆژییەکانی دیکەن. ئەو مەترسەیە هەڕەشە لە هەموو ئەو نووسراوانەی کە پێوەندی بە ئیدئۆلۆژییەوە هەیە دەکا. ئەگەرچی هێندێ لە نووسەرەکان کەمتر لەوە ئاگاداران یان لە چاو ئەوانی دیکە ئامادەی وەرگرتنی ئەم خالەیان کەمتر هەیە. لەبەر کردن و فێر بوونی وتوویژی ئیدئۆلۆژی لە لایەنی دروست. بابەتی حوکمی باش و تا رادەیەک جوانیناسانەیە، تەنانەت لەو شێوەدا گومانەکان هەمیشە دەگەڕێنەوە.

لەو چەمکە بەربلاوە ئەنجام دەگرین کە، ئارەزووی دایمی بە پاراستنی بێخەوش و پاکی لە ئیدئۆلۆژی دایە، زۆر کەس خەیال دەکەن شتێکی بە دەر لەویکە پارێزکاری، فەمینیزم یان سۆسیالیزم ناودێر دەکرێن، ئاشکرا بوونیان هەیە. ئەم (شتە) بەرچاوە، وەکو دیوارێکی خشتی راوەستاوە و تاتە و هیچ شتێکی لێوە تێناپەڕێ و دەبێ پاک و بێخەوش بمێنێتەوە. بە باوەڕی بیرمەندان. ئەم کارە شێوەی پشتگیری لە باوەڕ بە خۆبوون دەگرێ بە خۆوە کە گشتی یەکێکە بەشێوەی دەستوورێکی پێویستی بۆ ڕێبازێک دەکەوێتە روو. هێندێ جار بەو پاکی و بێخەوشییە لەگەل زەرافەت و باریکبینییەکی فیکری زۆر دەپارێزێ. هەروەها ئەم کارە لەگەل بابەتی پێشوو پێوەندییەکی نزیکی هەیە واتە باوەڕی بێخەوش بەشێوەی جیا لە مێژوو، وەک ئەوە وایە بێ وچان لە کێوی سینا بێنێتە خوارێ فۆرمگەلێکی گرنگی دیاری بە خۆوە

ـەگری. مەسەلەی پێوەندیدار بەوە (پێویستی بە باو باپیران یـان ئاسـەواری دێـرین)
ـێ ـەری. زۆربەی ئیدئۆلۆژییەکان دیاردەی دێرین بۆ خۆیـان دەتاشـن و لـە هێنـدێ
ـوێن سوورن لەسەر ئەوە کـە لەگـەڵ نیازەکـانی جیـا لـە مێـژووی مـرۆڤ کـە لـە
ـــرۆشتی مرۆڤایەتیدا هەیە. هاوکێشن. ئەو کارە چێژێکـی زۆرتـر بـە ئەندێـشەکانی
ـەی ـ دەبەخشێ. لـەم ڕووەوە وتـراوە ئێمـە هـەموومان لەبـەر سروشـتی خۆمـان،
ـــ ـشیست یان پارێزکارین؛ خەڵکانی دێرین، تـافی بـەردین، لایـەنگری پێگـەی ژیـن
ـوون: یـان (مەسـەلەی ژن) لەسـەرەتادا بوونیـان بـووە. بـە بـاوەڕی مـن هـەموو
ـیـئۆلۆژییەک، تا رادەیـەک شـێوەگەلی نـوێی ئەندێـشەن کـە بـێ‌پسانەوە لـە دوای
ـۆرشــی مــەزنی فەڕانــسا ســەرچاوەیان گرتــووە. جگــە لــەوە هــیچ بــاوەڕ و
ـەـیشەیەکی بێ‌خەوش لە بووندا نییە. گشت ئیدئۆلۆژییـەکان لـە دەروونـی خۆیـدا
ـێچـراوە و هەڵـگر و یەکترداپۆشـن. هـیچ ڕوانگەیـەکی سۆسیالیـستی یـان لیـبرالی
ـی‌خەوش لە جیهاندا بوونیان نییە. پێداگریی بێ‌خەوشی، وەکـو پێـداگریی حەقیقـەتی
ـەگۆڕی بوون، هەمیشە درۆزنانە و داتاشەر یان لە ڕێ‌لابەرن.

ـەسەلەیەکی‌تـر، بەڵـگەی (حەقیقـەت و ئەندێـشە)یـە کـە پێـشەکی ئامـاژەم بـەوە
کـرـبوو. ئەم ئەندێشەیە بـەپێی ئـەم گریمانـە هەیـە کـە فـلان ئیـدئۆلۆژی لـە بـارەی
جیهانەوە، ڕاستییەکان بەیان دەکا؛ هەموو شێوەی بیر ئەندێشی و گومانن و دەبێ لـە
بەرامبـەری ئەوانـە خـۆڕاگری بکـرێ. ئـەم ئەندێـشەیە تەئکیـدی لەسـەر سـادەترین
ـرۆژەی خۆی هەیە کە دەڵێ: (ئێمە بێ‌لایەن و ئێوە دەمارگرژن) ئەندێشە و گومان بە
ـێوەگەلی جۆراوجۆر سەر هەڵدەدا و پێوەی دەچەسپێنن. هـەموو ئیدئۆلۆژییـەکان،
ـێچمگەل و بوتەکان و شەیتانناسـی و یـان زانیـاری داپۆشـراو و شـاراوەی گومانـە
ـیبەتەکانی خۆیان هەیە. هێندێ جـار تێگەیـشتن لـەم بەڵـگەیە زۆر دژوارە و لەگـەڵ
ـەرهەڵدانی هاوکێش و هاوتـەراز داپۆشـراو پێچـراوە دەبـێ. بـۆ ئێمـە دژوارە کـە
ـەبارەی ئیدئۆلۆژیایەک کە ماوەیەکی زۆر برەویان هەیە، بـە شـێوەی ڕاسـتەوخۆ و
ـبراوانـە حەقیقـەت لـە ئەندێـشە هـەلاوێرین. کاتـێ پێغەمبـەرانی پارێزگـاری یـان
ـوسیالیزم سەبارەت بـە حەقیقـەت لەگـەڵ ئێمـە قـسە دەکـەن، هەمیـشە ئێمـە جیـا
کردنەوە و هاوێرەکانی ئەوان بە چاوی هۆگر، بەلام بێ ڕۆح، تەماشای دەکەین. کاتێ

ئیدئۆلۆژییەک سەردەمی منداڵیەی خۆی بە شەوق و زەوقەوە بەسەر بردووە، کێشدان بە بەڵگەگەل و لێکۆڵینەوە لەو بارەیەوە سووک و سانا نییە. ئەو کات پەرە پێدانی حەقیقەت و ئەندێشە بە وەها دەسەڵات و شەوق و زەوق و راستگۆییەوە دێنە بەرچاومان کە خۆڕاگری لە بەرامبەر بەڵگەگەلی ئەوان دژوار دەبێ. لە روانگە هۆگرانەوە، هەمیشە پێکهێنەرانی ئەم ئیدئۆلۆژیانە بە جۆرێ ناحەز و ترسهێنەر یان خەندەهێنەر دەبێ کە بە جولەیەک وەخەبەرماندێنێ.

ئیدئۆلۆژییەکان بە ناوی کەسانێکی هاودەرد لێک دەدەینەوە نەک بە ناوی شاهێدانی بێلایەن. تەماشاکەرانی ئەرشمیدوسی نەگۆڕ لە گۆڕپانی ئیدئۆلۆژیدا بوونیان نییە. باوەڕی سەرەکی ئەم کتێبە ئەوەیە جیهانی گریمانە بوونی نییە کە ئیدئۆلۆژییەکان لەودا وەک بن یان نەبن. هیچ ڕێگایەکیش بۆ وەلانانی پێشمەرج و گریمانەکانی لە بووندا نییە. ئێمە بە جێکردنەوە و گونجاندنی گریمانەکانی خۆمان، لەگەڵ ئیدئۆلۆژییەکان وەکو تێگەیشتن لە راستی هەر وەک جیهان هەڵسوکەوت دەکەین. ناتوانین تەواو دوور لەم تێگەیشتنە هەنگاو هەڵێنین و ئەوانە لەگەڵ شتە دەرەکییە تایبەتەکان بەراورد بکەین و بیسەلمێنین، ئەگەرچی دەتوانین لەگەڵ جیهانەکان بەراوردی بکەین. ئیدئۆلۆژییەکان وەها لێزانانە و زەریفانە ئەم راستییە پێک دێنن کە شان لە شانی شتە راستییەکان دەدەن. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەگەرچی نەخۆشین بەلام تەواو نا، هەم دەتوانین هی یەک بین و هەم، تارادەیەک، لەگەڵ راستی بیرمەندانی خۆ ئاگا خۆ دوورخەینەوە. موتالای ئیدئۆلۆژی کۆششێکە لەبەری پێکهاتووە ئاگایانەی پرۆژەی خۆتێگەیاندنی لەگەڵ پرۆژەیەکی دیکە، کە رەنگە تەجرەبەی بەچاو بێ. لەم بوارەدا قسە کردن لە راستی یان درۆی ئیدئۆلۆژییەکان کێشە و قسەڵۆکی لێ دروست دەبێ، بەوەتەیەکی دروستتر، هێندێ لە ئیدئۆلۆژییەکان دەوڵەمەندمان دەکەن و هێندێکی دیکەیان دەوڵەمەندییەکەمان لێ دەسێنێتەوە. هێندێ دەسەڵاتمان دەدەنێ کە ئەرکەکانی خۆمان لەم دنیایەدا بەرێوە بەرین و هێندێکیان تا رادەیەک بەر گریمان دەکەن.

## دەق

کاتێ کە پێدەنێینە هەرێمی ئیدئۆلۆژیاوە مەترسی گەلێک دێتە سەر ڕێمان و زۆربەی کەسەکان سوورن لەسەر ئەوە مافی خاوەنماڵیان لەم بوارەدا هەیە کە یەکێکی دیکە لەو بارەوە بدوێ قینیان هەڵدەستێ و بە گڕ دار و بەردا دەچن. هەروەها مەیدانێکە پڕە لە داو و چاڵێکە پڕ لە ئاو. بەم حاڵەوە، من سەبارەت بە ئەوانە و بازدانم لەم لق بۆ ئەو لقە و داوای لێبووردن ناکەم. مافی هەنگاو نان بەم هەرێمەدا جێی پرسیارە، بڵێیت و نەڵێیت چارەسەر نەکراوە ماوەتەوە. ئەم ناوەرۆکە بۆ بەرێوە بردنی دوو ئەرک نووسراوە، یەکەم ئەمەیە کە بۆ پۆلەکانی خوێندنی ئایدۆلۆژی گەلالە کراوە، لە گۆڕەپانی ئەوتۆدا کێشە هەلایسێن و هوروژانی قسە و قسەلۆت تەنیا دەتوانرێ بە لێکدانەوە و توژینەوە ڕێی چارە بدۆزێتەوە، لەم کتێبەدا بەشێک لەو بەگانە بێنەئاراوە کە ڕوانگەگەل تا رادەیەک نارەوانین.

هەر بەشێک لەم کتێبە بەشێوەی پێکهاتەی خۆی نووسراوە. بەو هیوایەکە لە کاتی پیویستا بتوانی هەر بەشێکی بەشێوەی جیاواز بخوێنرێتەوە. سەرەتا پێشەکی دەسپێک و توژینەوەی ریفۆرم ناسی هەر ئیدئۆلۆژییەک (بۆ وێنە فاشیزم، لیبرالیزم و هتد) دێنینە ئارا. دوای ئەوە بە کورتی چاوێک بە خوازیاری و مێژووی ئیدئۆلۆژیدا دەخشێنین. پاشان دەربارەی سروشتی ئەو ئیدئۆلۆژیە دەدوێین. لەژێر ئەم ناوە سەرەکییە کە تێگەیشتنی ئەوە بۆ بەشەکانی دواترکە گشتی ترەو، دەکەوێتە بەر باس. ئەو ئیدئۆلۆژیە کە باسی دەکەین (ڕێبازگەلی فیکری) جۆراوجۆر ئاماژەیان بەوەیە و بە ورد بینیەکی زۆر بەشکراوە. تایبەتمەندی هەر ریشە ناسی ئیدئۆلۆژییەکی تایبەت، مێژوو و خوازیاریگەلییەو، شیکاری و سروشتی ڕێبازە پێچراوە ئیدئۆلۆژییەکان بەوەوە گرێیان خواردوە، لەبەر ئەمە، ئەم بەشە لە گشت بەشەکانی دیکە درێژترە و جیاوازە لەوانی دیکە. ئەو کات ڕشتەیەک لە ڕشتەکانمان هێناوە کە بابەتەکەی گشتی‌تر و تایبەتمەندییەکانی هەموو ئیدئۆلۆژییەک لە خۆدەگرێ، ئەم پێکهاتانە هەمەلایەنە و سەرەکی‌تر هاتوونەتە ئارا و بەناوی (ڕێبازە فیکرییەکان) بیرمەندانی تاک خراونەتە بەر باس و توژینەوە. لەم برگانەدا دەربارەی هێندێ لە بابەتی پێچراوەتری لێدوان و توژینەوەی فیکری جیاواز و هەڵبژێراو

دەدوێین. لە کۆتایی هەر بەشێکدا دەر ئەنجامەکەی هاو کات راپرسییەکی کورتی رەخنەییمان هێناوەتەوە.

پۆلی خوێندنی ئیدئۆلۆژی، چ بۆ مامۆستا و چ بۆ خوێندکار، مومکینە ئەزموونێکی قوولی بە بایەخ فرە بە پێز و خاوەن دەسکەوت بێ. لە لایەکەوە، خوێندکار تێدەکۆشێ، بە گریمانەی ئەمە کە شێوەی فیکری جۆرێک پێناسەی هەیە پێوەندی مەنتقی ئەو بەیان بکا. لە لایەکی دیکەوە، بەڵگە دەربارەی ئەم کۆیلە فیکرییە، پێویستی تۆژینەوەی رێبازە جۆراوجۆرە فیکرییەکان لە (دەروون) ی ئیدئۆلۆژی و هاو بەشە بیرمەندەکانی تاک لەوە دایە. ئەرکی ئەم دواییە گرفتگەلێ بۆ خوێندکار بەدی دێنی. بۆ وێنە تۆژینەوەی بورکە (دەسخۆشانەی قومارباز لە کاتی بردنەوە بە دانیشتوی چاو لە دەسی دەدا، لە کوردەواری پێی ئەوترێ پارە بۆ پاچرا) پێویستی بە وتن لە بارەی بەشی ئەو لە بابەتێکدایە کە پارێزکاری ناودێر دەکرێ. ئێستا ئەمە کە پارێزگاری لە روانگەی بیرمەندێکی دیکەوە بە گشتی جیاوازە. ئەگەر تۆژینەوەی زانکۆیەک دەربارەی بورکە بگرینە بەرچاو، مەسەلە دژوارتر دەبێ. سەرەڕای ئەمە، ئایا رێکەوتنی تاک سەبارەت بە ئیدئۆلۆژی، دەبێ لە لایەن بیرمەندەوە بێ یان رێکەوتنی بیرمەند لە لایەن ئیدئۆلۆژی؟ هەر دوو رێگا پڕ مەترسییە. مەترسی میتۆدی یەکەم، سەر لێ شێواوی لە زەلکاوی مەسەلەگەلی تویژەری و ناوەرۆک گەرایانەوەیە. مەترسی میتۆدی دووهەم، بەرتەسک کردنەوەی دەوڵەمەندی ناوەرۆکی فیکرییە. دەرەنجام ئەمە کە، روانگەگەلی ئیدئۆلۆژیای تویژەری کامیانە؟ ئایا ئەوانە کاریگەری خراپیان لەسەر موتالای ئیدئۆلۆژیا دەبێ؟ پۆلەکانی خوێندنی ئایدئۆلۆژی هەمیشە بوونەتە قوربانی ئەم کێشە دەروونیانە کە هەم ممکینە کارە کە خراپتر بکات و هەم بە لێدوان رەنگە گیانی تازەی پێ ببخشێ و دەوڵەمەند بکات.

لیبرالیـزم پێچراوەتـرین و زیرەکتـرین ئیدئۆلۆژییەکانـە. ئـەم ئیدئۆلۆژییـە بـە چەشنێک ئاوێتەی ژیانی کەلتـووری رۆژئـاوا بـووە کـە هـەلاواردنی توێژینـەوەی لایەنگرانە لـە توێژینـەوەی بـەرچاوتری ئـەو بـە دژواری خـۆ بـە دەسـتەوە دەدا. زۆربـەی موتـالاتی ئاکادمیـک (لـە راسـتیدا واتـای لیـبرالی ئاکادمیـک) لەسـەر گریمانەگەلی تاکخوازی، ئاسانکاری و بـەرەو پێشچوون پـڕۆگرامی بـۆ دارژاوە. ناوەرۆکی لیـبرالی بەشـی هـەرە زۆری ئەندیـشەی سیاسـی هاوچـەرخ، تایبـەتی نووسراوەگەلی ناودارانی بە ناوبانگی وەک جان راولیز، رابرت نووزیـک، مایکێـل والزر و فریدریش فۆن هایک پێکدێنێ.

دێرینەترین کارکردی جیا لە وشەی سیاسی لیـبرال، ئامـاژەی بـە جـۆری فێـر کـردن و بـار هێنانـە. لـە خـولی سـەدەکانی نـاوەڕاسـت، ئـەم وشـە دوو گرنـگ دەگرێتەوەخۆ: سەرەتا فێرکردن و بار هێنانی پەرەدار و بـەربلاو، دووهـەم، فێـر کردن و بار هێنانی پیاوێکی خـاوەن ڕێـز و جـوامێری هـاو ولاتی لـێ بـووردوو. واتای یەکەم واژەیەکی لە ناو چووە، ئەگـەرچی لـە روالـەتا لـە کـۆڕی فێرکـردنی سیاسیدا دووچاری بێ مەیلی رۆژگار بووە. واتای (فێرکردن و بار هێنانی لیبرال) لە ئێستەدا پێوەندی بە تەوژمی لەگەڵ ریشەی زانستی مرۆڤدا هەیە. مەبەسـت لـە فێرکردن و بار هێنان و توێژینـەوەی لیـبرال، توێژینـەوەی داب و نـەریت و خـووی دەروونی تایبەتییە. بەم جۆرە، واژە رەنگە ئافەرین بگرێتە خۆ یان بێبایـەخ بـێ. واتای ئافەریم رووناکبیری دەگەێنێ، حەوانە، یان گەورەیی (واتای دوایـی زۆرتـر بە وشـەی Liberality (دلئاوا و دەس ئاوالا) بەیان دەکرێ) کە بایەخ و پلە دەدرێتە قەلەم. لە کۆتایی سـەدەی شـازدەیەم واتایـەکی دیکـە لـەم واژە بـوو بـە بـاو کـە بێبایەخ و سووک بـوو و لیـبرال بـە مانـای کەسـێک بـوو کـە ئـازادی بـۆ خـۆی دەویست. ئەم واژە بە واژەی Libertine گرێ درا بـوو (پیـاوی بـێ بـەر گێـڕەوە ژنی سەر بەڕێ) هاتە ئاراوە کە لە سەدەی شازدەیەمدا هەم بە مانای لایەنگری لە

ئازادی کردەوەی رەگەزی و بزرکردنی یاساگەلی ئەخلاقی بوو و هەم بە مانای کەسێک کە مەیلی بە توندوتیژی دژ بە باوەڕی مەزهەبی هەیە. لە شانۆگەری ئۆتللۆ کاتێ کە دزدمونا وەک (گەندەڵترین و لیبرالترین جێگر) ئاماژە بە یاگو دەکا، مەبەستی بارەکەللا و ئافەریم گوتن بەو نییە. ئەمە مانای هەتک کردنی لیبرال دەگەیێنێ کە ئێستاش بەبرەوە.

مانای سێیەمی واتای لیبرال، لەگەڵ جۆری پلە و بایەخە ئەخلاقییەکان نزیکی هەیە. بە شێوەیەکی دیکە، ریشەیەک لە پلە و بایەخەکان (ئاسانکاری، پێشکەوت، ئازادی، تاکخوازی) بوونی نییە کە چەند سەدەیە لە پشت لیبرالدا شاراونەتەوە، بەلام لە سەدەی نۆزدەیەمەوە بەخدەی (دەروونی لیبرال) دەدرێتە قەڵەم. بەم هۆیەوە، واژەی لیبرال بۆ دەربڕینی بیرمەندێکی وەکو جان لاک یان مونتسیکۆ بە کاردەبرا کە دێرینەتر لەسەر هەڵدانی ئیدئۆلۆژی و وشەی لیبرالیزم لە ئەندێشەی ئەوروپایدا بوون. جگە لەمە، واژەی لیبرال بە هۆی واتای بە جێماوی بەربلاوی دەروونی، ئاسانکاری و حەوانەوە، توانای بە هێز و ئازاد ئەندێشی و گەورەیی رۆحی، زۆر جار لەگەڵ کردەوەی فەلسەفی هاوکیش دەدرایە قەڵەم. فام و دەرکی کراوەتر و لیبرالتر خووی فەلسەفییان بوو. لەم واتادا، فەلسەفە مەلەکەی هونەرگەل و رەوشتگەلی لیبرالی دەهێنا ئاراوە.

مانای دوا پلەی واژەی لیبرال، دیاریکردنی کارکردی سیاسی ئەوە. دەبێ سەرنج بدرێتە ئەوە کە لە زمانی ئەوروپاییدا ئەم واژە سیاسییە تارادەیەک بە چاوی نوێ سەیری دەکرێ. یەکەم کارکردی ئاشکرای ئەم واژەیە نیشاندەری لایەنگری سیاسی، یان دەستەبەندی سیاسی بوو کە لە نێوانی سالەکانی ١٨١٠ و ١٨٢٠ لە ئیسپانیا بەکاردەبرا. واژەی لیبرالەکان بۆ وەسفی کەسانێک بەکاردەبرا کە تاقمێک بوون بە شێوەی سوننەتی لەگەڵ دارودەستەی سەلتەنەت خوازان (زۆر جار بە ناوی سەر سپێران ئاماژەیان پێ دەکرا، واتە ئەشراف و روحانی خاوەن زەوی گەورە) دژایەتیان دەکرد.[١] لیبرالەکان، لەژێر کاریگەرییەتی رووداوگەلی فەرانسا، لایەنگری بەدیهێنان و وەری خستنی یاسای بنەرەتی جیا لە مەزهەب و ئازادی چاپەمەنی بوون. ئەم واژە لە لایەن دارودەستەی سەلتەنەت

حو ‌ز‌ەکانەوە تا رادەیەک لایەنی بێ حورمەتی بوو کە لیبرالەکانی بە لایەنگری پڕ
ـەترسی ریفۆرم خوازی و ئازادی بەکردەوە دەدایە قەڵەم. لە راستیدا، لەگەڵ
ـگەڕ نەوەی سەڵتەنەتی تەلاق دراو، رووداوەکان بەسەر لیبرالەکانی ئیسپانیادا زاڵ
ـوو. ئەم واتا سووک و چروکە واژەیەک بوو لە ئەورووپای پاش ۱۸۲۰ برەوی
ـگشتی پەیدا کرد. کاستل ریگ، سەرۆک وەزیری حزبی توری لە بریتانیا، ئەو
ـسەردەمە ئەندامی حزبی ریگ بوو بە زمانێکی جرووددار و ژاراوی بە ناوی
ـیبرالە ئینگلیسییەکان) یان (لیبروە ئینگلیسەکان) ئاماژەی دەکرد کە لە رادیکال
ـیکە و کۆمار خواز و باوەڕی شۆڕشگێڕانەیان بوو. رەنگە بە هۆی کارکردگەلی
ـیـری گیراوی پێشووتری واژەی لیبرال، ئەم لایەنە سەرکۆنەکەر زۆر نەخایەنێ.
ـە کوتایی ۱۸۵۰ واژەی لیبرال لە ئینگلستان زۆرتر بە ئەندامی حزبی گلادستۆن
ـوتیی پێ دێ.
جیی خۆیەتی لێرەدا بوترێ کە گشت کۆمەڵگەی ئەورووپایی لەم رووداوە
ـسییە تایبەتییەدا پێڕەوی بریتانیا نەبوون و واژەی لیبرال وەک هەمیشە
ـشانەی بە ئەندام بوون لە حزبێکی تایبەتا نەبوو. کەسایەتیگەلێکی وەکو گیزۆ،
ـتیرز، کونستان و مازینی بە روانگەی سیاسی بەربلاو و هەمەلایەنەوە، باوەڕێ
ـگشتی و گەش بینانە سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ، حکوومەتی مەشرووتە،
ـیخراوەگەلی ئازاد، دیموکراسی دیاری و سنووردار، پێشکەوتی کۆمەلایەتیان
ـوو و لە پێشکەوتی جۆری مرۆڤدا بەشدار بوون، بەلام ئەندامی حزب نەبوون،
ـئەم جۆرە خۆنواندنە سیاسییە، واتە تەئکید لەسەر هێندێ بایەخگەڵ و پلەگەلی لە
هەریمی حزب بە دەر، هێشتا بایەخێکی لە رادەبەدەری هەیە. هەندێک کەس بە
ـاستی بە هەق و بە راستی مەنتقی خۆیان دان بەوەدا دەنێن کە ناتوانن ئەندامی
حزبی لیبرال ) بن، چونکە لیبرال بوون. مێژووی حزبی لیبرالی بریتانیا پڕە لە
ـابەتگەلی پەیوەندیدار بەو کەسانە کە حزبیان جێ هێشتووە و چونەتی حزبێکی
ـیکە، چونکە هەستیان دەکرد کە لیبرالیزم لەم حزبەدا بە شێوەی کارتێکراو
بوونی نییە و لە دەستە بەندیە پارێزگاکان، یان سۆسیالیستیدا باشتر بوونی
هەیە. ئەم کردەوە لەوانەیە ببێتە هۆی ئالۆی و گومان، بەلام گرنگە لە بیرمان

نەچێ کە جیا لە لیبرال، پێویستانە سەرەڕۆ و لیبرال پێویستانە ئازادی خواز نەبوو.

لێدوان دەربارەی لیبرالیزمی سیاسی، لە زمانی توێژەرێک (بە واتای پێکهێنانی پلانی ئیدئۆلۆژی لە گۆڕانکارییەکی گەورەدایە کە لە سەدەی حەڤدەیەمەوە لە بریتانیا و لە جێگەگەلێکی دیکە روویداوە)[٢] لە تێکەڵاوی لەگەڵ ئیدئۆلۆژییەکانی دیکە کە رێی هەلاتنی نییە، بوونی هەیە، هیچ باوەڕێکی بێ خەوش لە لیبرالیزم و هیچ ناوەڕۆکێک کە کاکڵەی ناوەندی، یان بیرمەندانی سەرەکی لیبرالیزم نیشان بدا، بوونی نییە. هەروەها هیچ ناوەڕۆکێکی پاککردە و بێ خەوش لە گومان لە ئارادا نییە. بەلام ئەندێشەی کاکڵەی روالەت لە ئارادایە کە لە ناوەڕۆکگەلی جۆرا و جۆر و بۆ بیرمەندانی جۆراوجۆر بە شێوەی جیاواز کردەوە لە خۆ نیشان دەدەن. دوو سەدەی رابردوو پڕە لە وێنەگەلی ئەزموونی لیبرالەکان. ئەم جۆراوجۆرە پێویستانە بە واتای ئالۆزی و نەبوونی یەکێتی نییە، بەلکو بە واتای ئەمەیە کە رەوەندی هەمیشەیی لە ئەندێشەی دەروونی لیبرالیزمدا لە بووندا بووە. هەر ئەم دووپات بوونەوە ئەندێشەیەکە لیبرالیزمی کردووە بە یەکێک لە بەربلاوترین و هوروژێنترین ئیدئۆلۆژی لە جیهانی هاوچەرخدا.

## پێگەی ئەندێشەی لیبرالی

لێکۆلینەوەگەلێکی زۆر سەبارەت بە پێگەی لیبرالیزم لە بووندایە. هێندێ لە توێژەران لێکۆلەرانی سەرەکی لیبرالیزم لە پانتای مێژووی دەولەت، نەتەوەکانیان هێناوەتە ناساندن. لیبرالیستە ئەلمانییەکان، ئیتالیایی، ئیسپانیایی، فەڕانسەوی و ئینگلیزی لە پێگەگەلی یەک لایەنی سیاسی و کۆمەلایەتی، کەلتووری گەشەیان کردووە. کۆشش لە بواری یەکگرتوویی سیاسی میللی لە ئیتالیا و ئەلمانی سەدەی نۆزدەیەم، کاریگەرییەتی شۆڕشی سالی ١٧٨٩ لە فەڕانسا و جیا بوونەوەی بریتانیا تا رادەیەک، هەموو هاوکێش کراوانی دیاریکراوی لیبرالیزم لەم ولاتانەن. لەبەر ئەمە، یەک دەس بوونێکی گشتی لە لیبرالیزمدا بوونی نییە، بەلکو سوننەتە

جۆر وجورەکـان دیـار و بـەرچاون. لەگـەڵ ئـەوەی کـە راسـتییەک لـەم خاڵـەدا ... ودتەوە، رەنگە ئەم تەئکیدە بێ هوودە بێ.

... ی دۆزینەوەیـەکی دیکـە، لەسـەر خـووی سـوننەتی ئیدئۆلۆژییـە لیبرالییـە ... یـەتەکان تەئکید دەکا. بەبرەوترین میتۆد لێرەدا بەڵگە بۆ رازی بوونی جیـاوازی ... یوان لیبرالیزمی قارەی (ئـەوروپا) و لیبرالیزمـی بریتانیایـە.[3] هەمیشە خـووی ... لیزمـی بریتانیـایی بـە خـاوەن ئـەزمـوونتر و دێرینـەتر دەزانـن. لیبرالیزمـی ... یشـودری زۆرتر لە سەردەمی رۆشنگەری فەرانسا و هەروەها بە کارکردی تـاک ... دەوەی ئازموونی) پێوەندی بـە کـردەوەی مرۆڤـەوە هەیـە. لێـرەدا پێوەنـدی ... ەتی بـە دوو سـوننەتی ئیـدئۆلۆژیای جیـاوازە دەلکێنـرێ. هـەرکام لەوانـە لـە ... ێژووە کەلتوورییە جیاوازەکانـدا جێـی خۆیـان هەیـە. ئـەم جیاوازیـە دەربـارەی ... لیزمـــی بریتانیـــایی بەرتەســـک دەبێتـــەوە بـــە لیبرالیزمـــی (راســـتەقینە) و ... لیزمەکانی دیکە کە باوەرگـەلی ریفـۆرم خوازەکـان و نوێخـواز، یـان رێ ون ... ەزانن. ئـەم روانگـە تایبەتیانـە، دەربـارەی پێگەگـەلی بزاڤـی لیـبرالی کـە زۆر ... ێچراوەتر و کاڵ و سەرەتایین، پارمەتییەکی ئەوتۆیان لە دەس نایە.

سێیەم رێ دۆزینەوە دەربارەی پێگەی لیبرالیزم، بەشێوەی تایبەت سـەرەنجی ... ودتە بەرەو پێشچوونی جۆری ئابووری. نووسەر گوتـەنی: (هـەتا ئـەو کاتـەی ... ـەرمایەداری هەیە، لیبرالیزمیش لـە شـێوەی جۆراوجـۆری ئـەودا هـەر دەبـێ و ... دەمێنێ)[4] سەرهەڵدانی سەرمایەداری پیشەسازی دەکـرێ هاوکـات و هاوسـنوور ... لەگەڵ سەرهەڵدانی لیبرالیزم بەراورد بکرێ (ئەگەرچی ئەم بەڵگانە لـە هاوسـنوور ... بوونی ئەو لەگەڵ زۆربەی ئیدئۆلۆژییەکانی دیکە بێ هەواڵ دەمێنـێ). بـەم شـێوە ... لیبرالیزم بە ناوی ئیدئۆلۆژی سەرمایەداری دێتە ئاراوە. ئەمە روانگەیەکە لە پلـەی یەکـەم، نـەک تایبەتمەندانـە، مارکسیـستی و لـە ئاسـتێکی گـشتیتـر روانگـەی سوسیالیستی دەربارەی لیبرالیزم، تاقمێک لە تۆژەرانی لیبرالیزم لەم باوەرەدان.[5] ئەم روانگەوە، خاوەندارێتی تایبەتی بە شێوەی ئاشـکرا لـە رووگـەی بایەخگـەل و پلەی بەرزی لیبرالی فۆرم دەگرێ و پەروەردە دەبێ. لەم رووەوە، دەبێ دەمامک لەسەر روخساری لیبرالیزم لادرێ و تاوانە زۆر خوازانەکەی ئەو بخرێتە بەرچاو.

نووسەرگەلێکی وەکو ئاربلاستر لەسەر ئەو باوەڕەن کە بە شێوەی گشتی، لیبرالیزم لە دوو سەدەی رابردوودا کاریگەرییەتی زۆریان بووە.[٦] ئەگەرچی ئەم چەشنە بەڵگانە لە روانگەیەکی زۆر بەرتەسکەوە لیبرالیزم دەخاتە روو.

بە بڕوای من، پێگەی لیبرالیزم لە سەدەی نۆزدەیەمدا ریشەی لە سوننەتی مەشروتە خوازی ئەندێشەی ئەوروپاییدا بوو. لە سەدەی رابردوودا، مەشروتە خوازی ئاشکرا لەگەڵ لیبرالیزمدا دەناسرا. دوو باوەڕی لیبرالیزم و مەشروتە خوازی دواتر ئاشکرا خاوەنی سنوورێک بوون و تێکەڵاویان بوو. بەم حاڵەوە، جێ خۆیەتی کە بێژم ئەم جۆرە وەک یەک دروست کردنە لە بارەی مێژووییەوە دیاردەیەکی تا رادەیەک نوێ دەدرێتە قەڵەم.

لێرەدا زۆر پێویست نییە کە لە دووی سوننەتی پێچراوەی مەشروتە خوازی ئەوروپا بگەڕێین کە ریشەی ئەو لە تازەکردنەوەی یاسای رۆمی دێرینەوە لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست، ئەندێشەگەلی ئاشتیخوازانە، بیرگەلی خوراگرانە سەربارەت بە خۆڕاگری لە لایەن نووسەرانی دەورەی ریفۆرم خوازی و دژێ ریفۆرم خوازی، کێشەگەلی چەواشە و ئاڵۆزی مەزهەبی فەرانسە و شەڕی ناوخوی ئینگلستان دایە.[٧] سەرەڕای ئەمە بزووتنەوەگەل و رووداوگەل و ئەندێشەگەلێکی دەربارەی مافی تاک، ئازادی تاک، پێکهاتن، جیا بوونەوەی هەرێمی تایبەتی و گشتیمان هەیە کە حکوومەتی بەرتەسک و هاوکێش و دەسەلاتی خەلک لە ئەوروپادا بە شێوەی سەرکەوتوانە بوون بە رووداوێکی سیاسی بەبرەو و گشتی. دژایەتی و جیاوازی لێرەدایە کە ئەم جۆرە ئەندێشەگەلە لە تاقمێکی هەرە سەرەڕۆن، بەڵام پڕ هەر و هوریای وەک کالوین کیشی، یان ژرۆئیت (یسوعی) سەر چاوەیان دەگرت کە لە دەروونەوە زۆربەیان مەزهەبین و دژ بە وەن، بۆ ئازادی ویژدان خەباتیان دەکرد. سەرەڕای ئەمە، بە بێ پەرەسندن دوو بزاڤی دیکە، ئەندێشەی یاساخوازی (مەشروتە خوازی) یەک لایەن دەمێنێ: یەکیان سەردەمی رۆشنگەری و رۆڵەکانی ئەو لە فەرانسا، ئینگلیستان و ئیسکاتلەند، ئەوانی دی شۆڕشە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە خاڵی

سەرووی ئەوان راگەیاندنی سەربەخۆ لە ١٧٧٦ و شۆڕشـی کـەبیری فەڕانـسا لـە سـالی ١٧٨٩ بوو.

پەیامی رۆشنگەری، کەلکی تەواو و ئەزموونی عەقلی لە بارەی مرۆڤەوە بووە. ئیلاهیات، زانستی ئابووری، زانستی سیاسـەت، یاسـا . فەلـسەفەی پـڕگری لـەژێر کاریگـەری ئـەم بزاڤـەدا بـوون. هـەتا ماوەیـەکی زۆر حکوومـەتی سـەرەرۆ لـە عەزهەب و سیاسەتدا دەسەلاتی نەگۆڕ و بێ لەمپەری بوو. لە فەلسەفەدا، میتۆدە رۆشنگەرییەکان لە ئەندیـشەگەلی بیرمەنـدانێکی وەکـو دکـارت (١٦٥٠ ـ ١٥٩٦) و هابز (١٦٧٩ ـ ١٥٨٨) دا رەنگدانەوەی بوو. بە بۆچوونی دکارت هیچ شتێک قبـوول نەبوو مەگەر ئەوەی کە عەقلی تاک بەرگری لەوەبکات. بەرهەمـەکـانی سـەردەمی رۆشنگەری زۆریان لـە کۆمەلـگە جۆربـەجۆرەکان بـەرچاو دەکـەون. هێنـدێ لـە بیرمەندانی هاوچەرخ، وەکو فۆن هایـک لـە راسـتیدا جیـاوازی زۆریـان لـە نێـوان بەرهەمەکانی سەردەمی رۆشـنگەری لـە کێشوەری (ئـەورووپا) و لـە ئیـسکاتلەند داناوە. لە ئیسکاتلەند، دەوری سەرەکی رێبازی ئیسکاتلەند ئابووری سیاسی بـوو کە پڕ ئـاوازەترین نوێنـەرانی ئـەو ئـادام سمیـت و ئـادام فرگوسـن بـوون. ئـادام فرگوسن کارکردی بە شێوەی هاوکێش، گومان، ئەزمـوونی و بەرتەسـکی قبـوول بـوو. لـە ئەندیـشەی ئەلـمانی و فەڕانـسەویدا، بـە هـۆی جۆراوجـۆری عـەقل، بەرزەفڕانەتر بوو.

شۆڕشگەلی ئەمریکا، بەتایبەت فەڕانـسا، ئەندیـشەگەلیکی زۆریـان دەربـارەی دەسەلاتی خەلک، مافی سروشتی، پێکهاتن و بڕیارنامەی کۆمەلایەتی خـستە بـەر باس و کولینەوەی توندوتیژی سیاسی. دێتە بەرچاو کە ئامانجخـوازی کەسـانێکی وەکو تام پین، کە هێلە گشتییە پڕۆژەکانی ئوتۆپیای بڕیارنامـەی بـۆ کۆمەلـگەکان لەسـەر بنـەمای یەکـسانی تـاک، مـاف و ئازادییـەکـان کێشابێتەوە و دایڕشـتبێ، هاتووەتە بەر. وردە وردە بەلگە و فایلی جۆراوجـۆری پـەیـوەندیـدار بـە یاسـای بنـەڕەتی لەسەرانـسەری ئـەورووپا خرایـەڕوو. ئامـانجی ئـەم بزاڤـە هـەتا ئـەمرۆ درێژەی هەیە. خالێکە کە دەبێ لێرەدا وەبیر هێنەرەوەی ئەوەبێ کـە تـەنیا بیـست سال دوای شۆڕشی کـەبیری فەڕانـسا، ئێمـە لەگـەل وشـەی (لیـبرال) رووبـەڕوو

دەبینەوە کە بۆ دەستەبەندیگەلێکی تایبەت، واتە لیبراڵەکانی ئیسپانیا بوو بە باو کە کەوتنە ژێر کاریگەرییەتی رووداوەکانی فەڕانسا. هەروەها ئۆردووکێشیگەلی ئەرتەشی شۆڕشی کۆماری فەڕانسا لە دەهەکانی ۱۷۹۰ و ۱۸۰۰ یارمەتی ئەم ئەندێشەگەلەیان لە کیشوەری ئەورووپا کرد بۆ رەواج و پەرەسەندنی.

لەگەڵ ئەمەدا، میراتی شۆڕش لە رادە بە دەر داپۆشراو بوو. روانگەی هاوکێشتری یاساخوازی لە بەربەرەکانێ لەگەڵ ئەندێشەگەلی کۆمۆنیستی دەربارەی خاوەندارییەتی بوون. بنژمن کۆنستان، نوێنەری سەرەکی بیری یاساخوازی لیبراڵی مامناوەندی، بە بۆچوونی توندترەوە لایەنگرانی بەشداری دەوڵەت لەسەردەمی شۆڕش و بەتایبەت ژان ژاک رۆسۆ و ئەندێشەی ئەو دەربارەی (ئیدارەی گشتی) رەخنەی دەگرت.[8] نووسەرە لیبراڵەکان پاش جەنگی جیهانی دووهەم، وەک ج.ل. تالمون لە قەزاوەتی کۆنستان لە سەدەی بیستەم لایەنگریان کردووە.[9] لە فەڕانسا بەم شێوە، دوای شۆڕش، باوەڕی لیبراڵی لە نێوان لایەنگرانی رادیکاڵی بەشداری دەوڵەت و لیبراڵە یاساخوازەکاندا دابەش دەکرا.[10] لە بریتانیاش ئەم باوەڕە لە نێو ویگەکان و رادیکاڵەکاندا بەش کرا.

لەگەڵ نزیک بوونەوە بە دەیەی ۱۸۲۰ و ۱۸۳۰، هێندیهێندی لەگەڵ لیبراڵی خۆئاگا رووبەڕوو دەبینەوە. لەم حاڵەدا یاساخوازی سەرنج دەداتە لیبراڵیزم. لە ئەندێشەی بریتانیا و ئەورووپادا، دەوری گەشە کردنی لیبراڵیزم بەرانبەرە لەگەڵ گەشەسەندنی پیشەسازی و بەرین بوونەوەی بازاڕە کەرەسەیەکان؛واتە سەرمایە و کار. هێندێ لە بیرمەندە لیبراڵەکان لە نیوەی سەدەی نۆزدەیەم کە تا رادەیەک مێژووی ئەو لە بریتانیا دەگەڕێتەوە بۆ (یاسای ئازاد بوونی کاتۆلیکی) ساڵی ۱۸۲۹ هەتا بڕیارنامەی بازرگانی ئازاد لەگەڵ فەڕانسا لە ساڵی ۱۸٦۰.

دەیەی ۱۸۷۰ جارجار دەسپێکردنی ئاوا بوون، یان گۆڕانی بنەڕەتی لە لیبراڵیزم دیتراوە. لەم روانگەوە، لیبراڵیزم جێی گواستەوە بەرەو کۆخوازی، ئەگەرچی، ئەو چەشنە کە لە بەشەکانی دواییدا دەیبینین، هەموو لەگەڵ ئەو هەڵسەنگاندنەدا نین. لە ئەورووپا، ئەندێشەگەلی لیبراڵی فەڕانسا لە دەیەی ۱۸۵۰ و لە ئاڵمان لە دەیەی ۱۸۷۰ لەگەڵ سەرهەڵدانی بیسمارک بەرەو ئاوا بوون

ـ.ێـشت.[11] درێژتـرین دەورەی هــەوڵ و کۆشــشی کاریگەرییــەتی سیاســی و ــەوری ئەو لە بریتانیا بوو. مێژووی ئەندێشەی لیبرالی لە بریتانیا لە قاڵبی حزبی ـیـرـا دەگەڕێتەوە بۆ دەیەی ١٨٤٠ هەتا ساڵـی ١٩٢٢، واتـە سـەردەمێک کـە دوا ــەرۆک وەزیری ئینگلستان، دەیڤید لوید جۆرج کە بـە لیـبرال دەدرایـە قەڵـەم، لـە ـەی خۆی دابەزی. قالبێک لە حزبی لیبرال لە بریتانیا تا ئەمڕۆیش مانەوەی خـۆی ـ ـستووە. زۆرتـر لایـەنگرانی لیبرالیـزم دوای ئـەم دەورە لـە دەرەوەی حـزبی ـیـر ـ بوون؛ لە راستیدا لایەنگرانی لیبرالیزم لە حاڵی حازردا زۆرتر لە نێو هـەموو ـێکخراوە سیاسییەکاندان هەتا لە ناو حزبەکەی خۆیاندا.

ــەرجەم لەسەر ئەم بنەمایە توێژینـەوە لـە پێگـەکانی لیبرالیـزم لـە ئەندێشەی ـــاخوازی هێندێ لە ئامانجە شاراوەکانی لە پشت ئەندێشەگەلی مـافی ئـازادی، ـەـتەسک بوونەوەی دەسەڵات و ئاسـانکاری و سـازان، لەسـەر چـاوەی قووڵـی ـــەـدرۆییەوە هەڵدەقوڵێ. هیچ کەس ناتوانێ بـە زووتـرین کـات چ یـسوعیان و چ ـخۆین باوەڕان لایەنگری سازان و ئاسانکاری، یان ئازادی تاک بێنێتـەبـەر بـاس. ـەڵام زۆر جار هەر ئەم بەشەکەمە بێ سەبر و تێنەگەیشتوو و دەمارگرژانە بـوون کە بۆ پاراستنی سەربەخۆیی خۆیان بە چنگ و ددان لە پێگەی دوژمن و گەڕان بـە ـووی بەڵـگەگەلێکا بـۆ پاسـاوی ســەربەخۆیی خۆیــان، بوونــە ســەرچاوەی ـەندیشەگەلێک کە بە وتەی بیرمەندێک: (ئەندێشەی ئازادی سیاسییان هێنـا ئـاراوە کە بنەچەی بێ وزەی باوەڕە سەرکەوتووەکان لـە ساڵـی ١٦٨٨ بـوو و لـە لایـەن جێ لاکەوە لە ١٧٨٩ بوو بـە بنەچـەی ئـەوان).[12] جـان لاک ئەگـەرچی بـواری بـۆ وتوویژ دەربارەی دەسەڵاتداری زۆرینـە تـاقی کردبـۆەوە، کـەمترین هـۆگری بـە پەردگرتنی ئەم فیکرە تا رادەیـەک راپرسـی گـشتی، هەڵـبژاردنی دەروەیـی، یـان تەنانەت زاڵ بوونی سیستەمی پارلەمانی نەبوو. بـەم شـێوە، دەربـارەی گەشـەی پاساخوازی و لیبرالیزم هۆکارەکان بە راستی بە رێکەوت بەشدار ببوون.

## سروشتی لیبرالیزم

لەم بەشەدا دەمەوێ هێندێ لە ڕێبازە ئەندێشەکانی لیبرالیزم و ئازادی خوازەکان بخەمە بەر توژینەوە. ئەگەرچی دەربارەی نوێنەرانی سەرەکی و بیرمەندی لیبرالیزم وتەگەلێک هەیە، بۆ وێنە هێربێرت سپێنسێر، بیرمەندی دوا قوناغی سەدەی نوزدەیەم، هەم بە ناوی کەسایەتێکی گەورە ناسراوە کە لیبرالیزمی سەدەی نوزدەیەم لەودا دەبینرێ و هەم بە ناوی (تەکرەو و خوبژێو)ێکی تەواو کە لە دەوەوەی بزووتنەوەی سەرەکی باوەڕەکاندا وەستاوە.[١٣] دەربارەی کەسایەتیگەلێکی وەکو جان لاک، ئادام سمیت، جێرمی بێنتام، تالکسی دوتوکویل، ئیمانوئێل کانت، جان ستوارت میل و لەم دوایانەشدا فریدریش فون هایک و جان راولریش بەسەرهاتێکی دژایەتی ئەوتۆیان بووە. لەبەر ئەمە، کوشش بۆ هاوێر و جیا کردنەوەی بیرمەندانی سەرەکی لیبرال ئەرکێکی گەورەیە و ئێمەش ئەم کارە ناکەین.

هێندێ لە بیرمەندان بە باوەڕێکی جیاوازانە و روونەوە پەنایان بۆ لیبرالیزم بردووە. لەگەڵ ئەمەشدا، گشتیترین و هاوبەشترین هێڵی توژینەوە هەولی داوە چوارچێوەی ڕێبازە لیبرالیزمەکان دیاری بکا. بە بڕوای ئێمە مەکتەبگەلێکی جیا لە ئەندێشەی لیبرالیزم بوونیان هەیە و ئێمە تێدەکوشین لە دێری کتێبەکەی خوماندا وەک ئامێرێک بۆ تیشک خستنە سەر سوننەتە پێچراوەکانی بابەتەکە کەلک وەرگرین. دوو مەکتەبی سەرەکی کە دەیتوژینەوە بریتین لە لیبرالیزمی کلاسیک و لیبرالیزمی کومەلایەتی، یان نوێ.[١٤]

دێرینەیی و دوا ئاستی لیبرالیزمی کلاسیک پێچراوەیە. رووداوی سەرەکی، بەتایبەت لە بریتانیا، پێوەندی بە ویگ، یان ویگیزم و لایەنگرانی ئەو حزبەوە هەیە. لەسەرانسەری سەدەی نوزدەیەمدا، ڕێبازی ویگیزم بە چەشنێکی زور بەرچاو لەگەڵ ڕێبازی پارێزگاریدا هاودەنگ بووە. بەو هویەوە کە خودی لیبرالیزمی کلاسیک بوونێکی سادە و لەسەر پێی خوی نەبووە، لە دەروونی ناقمە پارێزگارەکاندا هەڵسوورانەوە روشت و نمایان کردووە. ویگیزم لە بریتانیا دوای سالی ١٦٨٨ بایەخ و ناوبانگی پەیدا کردووە. لەو کاتەدا سەرقالی و فیکری

ــەرەکی ویگەکان لایەنگری لە بەرەوپێش بردنی سیستەمی پەرلەمانی، پشتگری حکوومەتی یاسا و داکۆکی کردن لـە خـاوەنـداریتی زەوی بـوو. زۆر لەوانـە لـە ناخەوە دڵیان بە ئەفسانەی یاسای بنەڕەتی دێرین و مـافی بنـەڕەتی خـۆش کـرد بوو. هێندێکی دیکە، لە واتای ئازادی چاپەمەنی و بەیانێک بە ناوی مـافی بنـەڕەتی پشتگریان دەکرد.

یاسـای بنـەڕەتی دێـرین ئەندێـشەیەک بـوو کـە لـە لایـەن کەسـایەتییە بـە ناوبانگەکانی حزبی ویگەوە، وەکو ویسکۆنت مولس و وەرسەوە ئاشـکرا ببـوو و باوەری بەوە بوو کە یاسـایەکی بنـەڕەتی دێرینـەی بریتانیـایی بـووە کـە رەنگـە دێرینەی بۆ ئانگلۆساکسۆنەکان و تەنانـەت بـۆ گوتـەکان و خەڵـکی شـاری ترۆیـا بگەڕێتەوە.[15] پێویستە بوترێ کە یاسای بنـەڕەتی دێـرین، مـافی سروشـتی لاکـی نەگرتبووە خۆ، بەڵکو زۆرتر هەڵگری مافی تایبەتی سەردەمی زۆر کـەون دەبـوو کە کارکردی درێژخایان و دێرینەی ئەوی پێکـدەهێنا. زۆر لـە ویگـەکان باوەڕیـان بوو کە پشتگری لەم مافە لە بەرامبەر هەر چەشنە گەڕانەوەیەک بـۆ خۆخـوازی و سـەرەڕۆیی نەگۆڕ کە جێی نزیکی بنەماڵەی ئەستوات بوو دەبێ هۆشیاری بـە کـار ببرێ. هەڵبەت بڕیار بوو کە دەسەلاتی پاشایەتی بپارێزرێ، بەلام لە رادەی مـەرج و بەرتەسک لە چوارچێوەی یاسای بنەڕەتی هاوکێشدا کە هەڵگری مـەرج کـردنی دەسـەلات لەگـەڵ هاوکێـشی عـەقلانی کۆکراوەکـان بـوو. ویگیـزم لـە راسـتیدا پێناسەیەکی سـەیرە لـە تێکـەلاوی لەگـەڵ داکـۆکی لـە وەدەس هێنـان و هاوکـات وەدستان لە بەرامبەری حکوومەتی سەرەڕۆدا بوو. ویگەکان باوەڕیان بە راپرسـی بەرتەسک بوو. بەم حاڵەوە، تەنانەت هەتا ساڵی ١٨٣٢ راپرسیان بە دەسـکەوتێکی بەرتەسک دەزانی نەک بە مافێک.

ویگیزم لەسەردەمی شۆڕشی فەڕانسادا پەرەی سەند و بەرین بووەوە. تاقم و گرووپـە دێرینـەکانی ویـگ هێـشتا بـە ئەندێـشەگەلی یاسـای بنـەڕەتی دێرینـەوە هەڵسوکەوتیان دەکرد. ویگەکانی جـان لاک لـە نێـوانی دەهـەکانی ١٦٨٠ و ١٧٧٦ هەرگیز پێگەیەکی ئەوتۆیان بە دەس نەهێناوە.[16] ئـەوانی دیکـە لەگـەڵ سـەروەتی بازرگانی، رۆشنگەری، پێشکەوتی هەستی هێدی هێدی مامەڵەیان دەکرد و خۆیان

بەرەوپێش دەبرد و نزیکایەتیان لە ناسین دەکرد. ئادام سمیت لایەنی ویگە گەش بینەکان و دەیڤید هیوم لایەنی رەش بینەکان دەدرانە قەڵەم. کەسایەتی وەکو ئەدمۆند بەرکیش بوو کە، بە پێچەوانەی ستایشی لە پێکهاتنی ١٦٨٨، نە لەگەڵ یاسای بنەڕەتی دێرینی ویگەکان هەستی بە نزیکایەتی دەکرد و نە لەگەڵ هەڵوێستی لاک، هیوم یان سمیت. شۆڕشی فەڕانسا هۆکاری هورۆژاندن بوو. ئەندێشەی ویگە دێرینەکان هێشتا ما بوو، بەلام قالبە نوێکانی گوفتمان پەروەردە دەکرا و گەشەی دەکرد: ئەندێشەگەلی بازرگانی ئادام سمیت؛ کارکردی رێکی جێرمی بێنتام لە سوودی باوەڕی، کورت کردنەوەی رادیکالی پرایس و پریستلی لە زمانی جان لاکەوە.

تام پین یەکەم و کاریگەرترین دەنگی رادیکالیزم بوو کە هەولی دەدا رووداوی ساڵەکانی ١٦٨٨ لەگەڵ ١٧٨٩ پێکەوە گرێبدا. کتێبی مافی مرۆڤ کە ئەو نووسی بووی، لە بریتانیا لەگەڵ پێشوازی فراوانی گشتی خەلک رووبەڕوو ببووەوە. نووسەرانی گەورەی دیکە کە لەم بابەتەیان دەکۆڵییەوە بریتی بوون لە جۆزف پریستلی، ریچارد پرایس، جیمز مکینتاش، ویلیام گودوین، مری وولستن، کرافت و پرسی شلی. ناوەڕۆکی ناوەندی ئەم رادیکالیزمە، تۆژینەوەی کتێبی دوو بڕیارنامەی (١٦٨٩) جان لاک و کتێبی قەراردادی کۆمەلایەتی (١٧٦٢) ی ژان ژاک رۆسۆ بوو، ئەگەرچی زمانی تام پین رواڵەتەن زایەلەیەکی بە هێزتری لە یەکسانی چینایەتی دەیەی ١٦٤٠ ی بوو. رەسالەی بنەڕەتی ئەوانە هەر ئەو باوەڕە بە ناوبانگە بوو کە حاکمیەت بە سەلتەنەت و بە داورودەستەی سەرمایەداری بە دەسەلاتەوە پێوەندی نییە بەلکو هی خەلکە. دەولەت دەبێ تەنیا بە رازی بوونی خەلکەوە حکوومەت بکا، رازیبوونێک کە بە وتەی جان لاک کە لە بەشێک لە کۆتایی کتێبەکەیدا، بە ناوی بڕیارنامەی دووهەم ، دەبوو دەستی بەسەردا بگیرێ و وەربگیرێتەوە. مافی سروشتی خەلک دەبوو وەک ئەمریکا و فەڕانسا بەشێوەی ئەسنادی یاسای بنەڕەتی کۆبکراێتەوە و رابگیرایە. هەر ئەم رادیکالیزمە بوو کە رێی بۆ سەردەمی گەورەی یاسای بنەڕەتی پاک کردەوە و رێخۆشکەری بڕیارگەلی مافەکان بوو.

له دەیەی ١٧٩٠ وە هەتا دەیەی ١٨٢٠، زۆرتر رادیکالیزمی بریتانیا لەسەر ناوەرۆکی ریفۆرمی پارلەمانی و هەڵبژاردن جەختی کردبوو و ئەم کردەوە زۆرتر بە ئەستۆی تاقمێکی وەک (ئەنجوومەنی هەوالنێرانی لەندەن) دروست کراوی سالی ١٧٩٢ بوو. زمانی ئەم رێکخراوانە وەکو زمانی تام پین لەسەر بنەمای مافی سروشتی و ئەندێشەی دەسەلاتی خەلک بوو. ئەنجوومەنی هەوالنێری لەندەن و تاقمگەلی گرێدراو بەوانەوە لە ١٧٩٤ پرۆژەی دروست کردنی یاسای بنەرەتی میللی لەسەر بنەمای وێنەی شۆرشی فەرانسا پێکیان هیناوە. ئەم کارە بوو بە هۆی ئەوە کە رێبەران، هۆرن توک، جان تل ول و تامس هاردی بە تاوانی خەیانەت بە ولات قولبەست بکرێن. کێشەی نێوان فەرانسا و بریتانیا لەو سەردەمەدا دەولەتی زۆرتر خستە گومانەوە لەگەل ئەوەی کە رێبەرانی ئەنجوومەن لەو تۆمەتە پەرێنەوە، بەلام هەر لە مەترسیدا بوون و هەمیشە دەترسان قۆلبەس بکرێنەوە. ئەم کارەی دەولەت لە کاریگەرییەتی بە کردەوە بزووتنەوەی کەم کردەوە و دەمارگرژی ئەوی هێنایە خوارێ. لەگەل ئەمەشدا، رادیکالەکان واژەگەلێکیان بۆ ئاخاوتن لە بارەی مافی دیموکراتیک و سروشتی حاکمییەتی خەلکەوە هێنا ئاراوە کە لە سەدەی دواتردا هاتە ناو بزاڤی روو بە گەشەی کاریگەرییەکان و سۆسیالیستی و لە رووداوی ئەندێشەی لیبرالیشدا مایەوە.[17]

بنەما و کردەوەی ویگەکان و رادیکالیزم و هەر دوو لە ماوەی سەدەی نوزدەیەم، لیبرالیزمی کلاسیکیان تەسەل کرد. لیبرالیزمی کلاسیک تێکەلاوی تایبەتی لە ئەندێشەکان و ئیستراتژییەکان دەربارەی چۆنیەتی باشترین رێی بە دەس هێنانی ئازادی، یان داکۆکی لەوە. هێندێ سروشتی بنەرەتی ویگ تێکەلاویەکی زۆر نزیکی لەگەل پارێزگاری پەیدا کردووە. زۆر لە ویگە دێرینەکان دەربارەی رۆحی نوێی پیشەسازی و بازرگانی کە زۆربەی لیبرالەکان ئەوەیان بەیان دەکرد و هەستیان بە گوشارێکی بە تەوژم دەکرد. کەسایەتییەکانی حزبی لیبرال لە بریتانیا وەکو برایت و کابدن لە دەیەی ١٨٤٠، بێزارییەکی زۆریان سەبارەت بە پلەی سەرمایەداری خاوەن زەوی، چ حزبی ویگ، دەردەبری. ئەوان

هەرچی رۆژەڕەشی و گرفتێک کە بەسەر بریتانیادا هاتبوو، لە چاوی ئەوانەدا دەیان بینی و بە خاوەن زەوی بوونی ئەوان لەو ناوچە بەرینە کە لە پەرەگرتنی چینێک لە وردە مالکی ئازادەوە سەریان هەلداوە، بە هۆکاری رۆژە رەشی. لاتیان دەناسین. لە راستیدا ئەم بەلگانە دەگەڕاوە بۆ سەدەی حەڤدەیەمی میلادی.

لیبرالیزمی کلاسیک، پێچەوانەی ویگەکان یەکگرتوویی دەستووریان بوو. ئەم رێبازە ئاشکرا باوەڕێ خۆی بە میتۆدی تاکخوازی دەردەبڕی. دەکرێ تاکخوازی بە ناوی میتۆدێکی سیاسی و ئەخلاقی پێناسە بکرێ کە باس لە بوونی بایەخی تاکی مرۆڤ دەکا. جگە لەمەش. ئەم لیبرالیزمە بۆ ئازادی و مافی یەکسانی گشت تاکەکان و بۆ کەلک وەرگرتن لە ئازادی هەلوێستی دەگرت. ئەم ئازادیە بەشێوەی سوننەتی وەک دوور کەوتە، واتە بە ناوی ئازادی زۆرەملێ سەرەرۆ پەی پێ دەبرا. یەکێک لەو پانتایانە کە ئازادی لەودا لە هەمووان زیاتر خوازیاری دەکرا، پانتای ئابووری بوو. ئازادی ئابووری بۆ رەزامەندی گشت مرۆڤ و گەیشتن بە بەرژەوەندی ئەوان باشتر دەهاتە ئاراوە. ئابوورییەکی ئازاد کە هەموو بە شێوەی یەکسان لە بارەی بەرهەمهێنان و بەکارهێنان هەیانبێ، هەلگری ئەوەیە کە دەولەت لانیکەم ئەرک، وەکو پاراستنی دەسەلاتی یاسا، سیستەمی ناوخۆ، پارێزگاری لە خاوەندارێتی تایبەتی و هێمنایەتی ولاتی بە ئەستۆ بێ. لەم روەوە دەولەتێک کە لە رادە بە دەر حەز و مەیلی خۆی نیشان بدا هێندە جێی متمانە نییە. بە تەوژمترین پشتگری لەم بەلگەیە دەتوانین بریتانیای نێوان سالەکانی ١٨٣٠ هەتا ١٩١٤ بکەین بە وێنە. بەرچاوترین نوێنەرانی ئەوە بریتین لە مەکتەبی ئابووری سیاسی کلاسیک، خاوەن سوودان، مەکتەبی ئابووری مەنچستێر، زۆربەی بیرمەندی تاکی وەک جان ستوارت میل، هێربێرت سپێنسێر و هێنری سیج ویک. ئەگەرچی ئەمجۆرە ئەندێشانە لە ئەورووپا پێوەندییەکی کەمیان لەگەل ئابووری سیاسیدا بوو و کاری کەسانێکی وەک بنژمن کونستان، گیزۆ، شارل دورموزا، ماتزینی، ئەلکسی دوتۆکوویل و ویلهلم فۆن هۆمبولت بوو.

بەڵگە بە دەس هاتووە کەی ئەم شێوە لیبرالیزمە لە ساڵی ١٩١٤ لە ئارادا نەماوە. جۆرج دنجرفیلد لە کتێبەکەی خۆیا، بە ناوی مەرگی سەیر و سەمەرەی ئینگلیستانی لیبرال دەربارەی بریتانیای ساڵی ١٩١٠ دەنووسێ: (لەبەر ئەم بارە قورسە ڕێزدارە، هەر وەک جۆرە جەواڵێکی ناڵەبار خۆی لە بەریدا نەدەگرت و شانی پێوە هەڵداتەکاند. وەک ئەوە دەچوو بێ هوێ لە دەس شەڕی ئەو لیبرالیستە خۆ ڕزگار بکا).[18] بەم حاڵەوە، بەرەو ڕووخان و مەرگی لیبرالیزم لە ڕادەبەدەر شات و شووت کەرانە بووە. لە سەردەمی پاش ساڵی ١٩٤٥ و بەتایبەت لە کۆتایی دەیەی ١٩٧٠، لیبرالیزم بە هیچ چەشنێک لە ناو نەچوو. تەنانەت هێندێ ئەو ورەیان بە خۆ دابوو کە ئەو (دەورەیان ناو نابوو سەردەمی ڕوشنگەی نوێ)[19] ئەم قالبە نوێیەی لیبرالیزمی کلاسیکە، وەک جۆرە جۆرەکانی سەدەی نۆزدەیەم، ڕوانگەگەلی جۆراوجۆر دەگرێتەبەر. بە ناوبانگترینی ئەوانە ڕوانگەی مەکتەبی ئابووری ئوتریشە کە باشترین ڕۆڵەی ئەو فۆن هایکە؛ هەروەها ڕێبازی شیکاگۆ بە ناوبانگترین نوێنەری ئەو میلتۆن فریدمن، ڕێبازی ویرجینیا با کار جیمز بوکانان؛ هێندێ نووسەران و فەیلسووفانی تاک وەکو ئاین ڕەند و ڕابرت نوزیک. لە بریتانیا، پشتگرانی ئەو هەم زاکۆکان و هەم سیاسەتزانان و هەم ڕێکخراوەگەلی تۆژینەوە و پڕۆپاگەندەیی وەکو (موئەسیسەی کاروباری ئابووری) بوون.

لە کۆتایی دەیەی ١٨٨٠ وا دیار بوو کە لیبرالیزم ڕێبازی خۆی دەگۆڕێ.[20] نێوانێکی زۆر زانایانە، بەتایبەت لە بریتانیا، سەبارەت بەم هەڵوێستە بەڕێوە دەبرێ.[21] هێندێکیان حەز دەکەن ئەم مەبەستە ڕەت بکەنەوە کە لیبرالیزمی نوێ بە ڕاستی لیبرال بووە. لیبرالیزمی نوێ ئاشکرا و ڕەسمی خۆی بە (تاکخوازی کۆمەڵایەتی) دەزانی: هەرچی بۆ تاک بە کەڵکە و بەرژەوەندی ئەو دەپارێزێ، بۆ کۆمەڵگەش باش دەدرێتە قەڵەم. ئەتۆمیزم ڕوانگەی کلاسیکی ڕەسمی لە بابەتی ئەخلاقی و کۆمەڵناسییەوە بە ساویلکە ناسراوە. دەبوایە دەربارەی داهاتووی کۆمەڵگەی بە پیشەسازیبوون لە ئاستێکی بەرینتر لێکۆڵینەوەی لەسەر ساز بکرایە و نەدەبوو بیسپێرن بە سەدەقە سەری و خێرخوازی تاک. کەنەفتی و نەداری، بێ

کاری و دەردەداری تەنیا و تەنیا پێوەندیان بە تاکەوە نەدەبوو بەڵکو دەبوو بە دەردی گشتی کۆمەڵگە کە لێدوان لە بارەی ئەوانەوە لە بایەخگەلی تاک تێدەپەڕی. بێجگە لەمە، ئازادی تەنیا پێوەندی بە ژیانی تاکەوە نەدەبوو بەڵکو مەلەیەک بوو کە بە کردەوە لەگەڵ ژیانی ڕەسەن و خاوەن شەرف تێکەڵاوی دەبوو. دەبێ خاوەن ژیانە ژیانییەکان بۆ وەدەس هێنانی هاوکاری و پێکەوە بوون لە ژیانێکی بە بایەخ و بە کەڵک دەربارەی وەدەس هێنانی دەسەڵاتی ئابووری، کەلتووری، سیاسی و کۆمەڵایەتی بەهرەمەند بن. زۆرتر حزبە سۆسیالیستە ریفۆرمخوازە ئەوروپییەکان لە سەدەی ئێستەدا ئەم ئەندێشەیان لە مێشکدا بوو. لیبرالیزمی نوێ لەگەڵ کەسایەتیگەلی وەکو ت.ە. ل. ت. هابهاوس و ج. ئا. هابسن لە دەیەی ۱۸۸۰ هەتا ۱۹۱٤ دەناسرێنەوە، سەر و کاری بوو. لە ڕاستیا ئەم ئەندێشە بە شێوەگەلی جۆربەجۆر سروشتی بنەڕەتی بزاڤە گشتییە دیموکراتیکە کۆمەڵایەتییەکانی بریتانیا و هەموو وڵاتە غەربیە ئەوروپایەکان لە دەیەی ۱۹۳۰ هەتا سەرەتای دەیەی ۱۹۷۰ فۆرمی پێ بەخشی. لەگەڵ ئەمەدا، دەبێ سەرنج بدەین کە جۆربەجۆر لە دەروونی ئەم لیبرالیزمە دیموکراتیکە کۆمەڵایەتییە نوێیەدا هەیە کە لەم دواییانەدا بیرمەندان دەستیان داوەتە تۆژینەوەیان.[۲۲]

لێدوانێکی ئاڵۆز و پڕ لەگرێ دەربارەی پێوەندی نێوان لیبرالیزمی کلاسیک و نوێ ماوەتەوە. ڕوانگەی یەکەم ئەوەیە کە لیبرالیزمی کلاسیک باوەڕێکی بێ خەوش بوو کە لیبرالیزمی نوێی شێوە بە سۆسیالیست خەیانەتی پێ کردووە. دەربارەی ڕووداوی بەرە و ئاوا بوون چوونی و خەیانەت، تۆژینەوەیەک لە ئارادایە. ج.ە. هالوول ڕووخان و مەرگی لیبرالیزمی یەکپارچەی بە لە دەستدانی ناوەڕۆکی ئەخلاقی ئەو دەزانی. ڕێزی مەزهەبی بە ڕۆحی تاک بە هۆی تێکەڵ خوازی ئەخلاقییەوە لە نێو چووە.[۲۳] بەبڕەوترین خەت لە نێو مێژوونووسان هەتا دەیەی ۱۹۷۰، لیبرالیزمیان بە دوو ڕوو دەزانی: یەکیان تاکخوازی و ئەوی دی کۆخواز. لیبرالیزمە کۆخوازە نوێکان، لیبرالیزمیان لەگەڵ پێویستییەکانی سەردەمی نوێ، داوەتە قەڵەم و لەبەر ئەمە، گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە ئیدئۆلۆژیا

ڕووی داوە. لە دوو دەیەی دواییدا لەم ئەندێشەیان توێژیوەتەوە و موو بە موو لێکیان داوەتەوە.[24] بەڵگەیان هێناوەتەوە کە بە ڕاستی هیچ چەشنە دابەشکارییەک لە نێوان لیبرالیزمی کلاسیک و نوێدا لە ئارادا نەبووە. هەر دووکیان بە شێکن لە باوەڕی یەک.[25] لیبرالیزمی کلاسیک هەر تەنیا مەسلەت و ئاشتی لەگەڵ لیبرالیزمی نوێ نەکردووە. ئەم واژەناسییە بزووتنەوەییەکی قووڵ و زیرەکانەی دەروونی ئەندێشەی لیبرالی پۆشراوە دەکا. ئەندێشەگەلی ڕەسمی جەوهەری خۆی لە ڕایەڵە و پۆی چنراوی و بارودۆخە جیاوازەکەی وەرگرتووە. ئەوانە هەمیشە و زۆرجار لە ئارادا بوو. هیچ چەشنە گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە ئارادا نەبووە، بەڵکو گەشە و پێشکەوتنی بە تەوژم لە توێژینەوەدا دەوری هێندێ باوەڕ لە بزاڤەکاندا بووە. زۆر لەم باوەڕە ڕەسمیانە هەموو بزاڤە سیاسییەکان لێیان کۆڵیوەتەوە و دۆزیویانەتەوە. دوا خاڵ ئەمە کە زۆرتر ئەم گۆڕانکارییە لە سروشتی لیبرالیزمدا، مادەی دەروونی لە ئیدئۆلۆژیا بووە و لە دەرەوە نەسەپێنرا بوو. زۆر لەو باوەڕانە کە لە لیبرالیزمی کلاسیکا قسەی یەکەمیان دەکرد، بە ڕادەیەک شل خۆیان دەنواند کە لیبراڵە نوێکان سوودیان لەوە دەبرد. دەرەنجام، لیبراڵەکان وردە وردە لە دەوڵەتی خۆیان لە حاڵەتی بەڕێوە بردنی کاردا دیتەوە کە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ هەستیان دەکرد لە بابەتی سروشتی بنەڕەتییەوە ئازاری ڕۆحی دەبینن. هەر ئەو چەشنە کە لە بەشەکانی دواییدا دەبینین، زۆر جار هۆکاری گەلێک هەم بۆ دژایەتی و هەم بۆ پشتگری لە دامەزرانی یاسا بووە.

ئەرگەرچی جیاوازی نێوان لیبرالیزمی کلاسیک و نوێ دیاریکراوە، ئەم کارە بە دوو هۆی سەرەکی، نەبڕاوە بۆەوە، ئەوەڵەن، ڕێبازە لیبرالیزمەکان بەتەواوی جیاواز نین. لەوە دەچێ کە بەڵگەگەلی لیبرالیزمی کلاسیک هەتا ڕادەی دەروونی لیبرالیزمی نوێ فۆرمی گرتبێ و گەشەی کردبێ؛ لەبەر ئەمە، تێپەڕانی قۆناخگەلێکی کوتوپڕ وجوودی نییە. خاڵەکەی دیکە ئەمەیە کە بیرمەندانی لیبراڵ لە دەروونی ڕێبازە تاقانەکە ڕاستەوخۆ بەیەکەوە هاودەنگیان نییە. سەرقاڵی هۆشی و ئەخلاقی لیبراڵە کلاسیکەکان هەمیشە جۆراوجۆرە. لە ڕاستیا، لەو

قۆناخەدا وادەر دەکەوێ کە ئەم بیرمەندانــە بـیری ئیدئۆلۆژیـە جۆربـەجۆرەکانن. دەیڤید هیوم، ئالکسی دوو تۆکوویل، ئەدمۆند برک و فریدریش فۆن هایک دەکـرێ هەم بە بەشێک لە لیبرالەکان و هـەم بـە بەشـێک لـە پارێزکارەکـان بـزانین. ل.ب. هابهاوس. ئا. هابسۆن، جـان دیـویی و جـان راولـزیش دەتـوانین هـەم لـە ریـزی لیبرالەکان و هەم سۆسیالیستەکان دابنێین. هیچ شتێکی دوور لەسەرنج لەم کارەدا نابێ بوونی هەبێ.

## تاکخوازی

هەمەلایەنکردنی سروشـتی مـرۆڤ لـە روانگـە لیبرالـەوە دژوارە، ئەمـە هـەتا رادەیەک لەو رووەوەیە کە هەوالگەل و بەلـگەکان زۆر جۆراوجـۆر و پێچـراوەن. لەگەل ئەمەشدا، واتایەک بـوونی هەیـە کـە هـەمیشە لـە ئاخـاوتنی لیبرالیـدا خـۆ دەنوێنێ و وەک تەرجیح بەندێکی گرنگ کارکردی هەیە. ئـەم واتایـە، تاکخوازییـە. کاکلەی جیا لە سروشـت و هەسـتیناسـی ئەندێـشەی لیـبرالی و بنـەمای بـوونی ئەخلاقی، سیاسی، ئابووری و کەلتوورییە. تاک، هەم راستەقینەتر لـە کۆمەلـگایە و هەم لەو لە پێشترە. ئەم لە پێش بوونە بە شێوەی جیاواز لێکدراوەتەوە، و دەکرێ سروشتی یان ئەخلاقی بێ.[٢٦] بایەخەکانیش پێوەندی بە تاکەوە هەیە. تاکپێوارە و بەلـگەی ئـەخلاقی و راسـتییە. لەبـەر ئەمـە، تـاکخوازی بـە جۆرێـک روو بـە یەکسانخوازی دەروا. هەرتاکێک بەشێوەی بایەخی بەرامبەر چاوی لێدەکرێ.

بەم حالەوە، ئەندێشەگەلی گرێ دروا بە بەرامبـەری و تـاکخوازی شـتێکی زۆر دەربارەی روانگەی بنەرەتیتری لیبرالەکان بە ئێمـە نالـێن. کـەمتـرین شـارەزایی لەگەل ئاسەواری لیبرالی، جیاوازی نێوان جۆرەکانی تاکخوازی دەخاتە روو. جان دیویی، فەیلسووفی لیبرالی ئەمریکایی، یەکەم کەس نەبوو کە لە کتـێبی تـاکخوازی خۆیـا، کـەون و نـوێ، جیـا کردنـەوەی نێـوان (تـاکی هەلـکەنراو)ی لیبرالیزمـی سـەرەتای سـەدەی نۆزدەیـەم و تێگـەیـشتن لـە پێکـەوەبوونی زیـاتر لـە تـاکی لیبرالیزمی کۆمەلایەتی دەس بەکار بـووە.[٢٧] فـۆن هایـک لـەم جیـا کردنـەوەدا بـە شێوەی جۆراوجۆر لە بڕوانامەکەیدا بە ناوی (تاکخوازی: راست و درۆ) سوودی

وەرگرتووە، ئەم لەو جێیەوە دەسی بە جیا کردنـەوەی تـاکخوازی عـەقلانی (لـە نووسەرانی وەک ویلهلم فۆن هۆمبولـت و جـان دەسـتوارت میـل) لـە تـاکخوازی سەتەقینە (کـە زۆرتـر لـە خـەتی سـوننەتەکان و قـەراردادەکانی کۆمەڵـگەی گەزرگانی) کردووە.[28] بە بۆچوونی هایک، تاکخوازی تەنیا عـەقلانی، نـەگونجاو و نەکردەنییە. ئەم جۆرە جیا کردنەوە زۆر و کەم لە زۆربەی ئـەو بەرهەمانـەی کـە پێوەندی بە لیبرالیزمەوە هەبێ بوونی هەیە و شەریکن.[29]

لە پرۆژەی لیبرالی ملاسیکا، (تاک) هەمیشە بە ناوی بوونەوەری تاق حەساری بە دەوردا کێشراوە (داخراو لە هۆش و بیری خۆیـدا)[30] زانـراوە. سـنووری لـەش سنووری تاک پێکدێنێ. تاک، لەبـەر مـافی سروشـتی، خـاوەنی لەشـی خۆیـەتی. بۆچوونـە گـشتی و هەمەلایەنـە بەشـی زۆری ئەندێـشەی (خـاوەنداریـیـەتـی تاکخوازانـە) دێنێتـەوە یـاد، بـەم واتایـە کـە هـەر کـەس خـاوەنی لەشـی خـۆی و ئامادەیی فێربوونی ئەوە و هیچ شتێک هی کومەڵـگە نییـە. هـەر کەرەسـەیەک کـە هەر کەسێک دروستی دەکا، بە درێژەی مافی خاوەندارێتی لەشی ئەو دەزانرێ.

حەز و ئارەزوو و هۆگری تاک دەسەڵاتی نییە. عەقل ئامێرێکە بۆ گەیـشتن بـە حەز و ئارەزووی هەر تاکێک. هەر کەس لە حەز و ئـارەزوو و سـات و سـەودای خۆی هۆ و ئیلهامێک وەردەگرێ، لەبەر ئەم پێناسـەیە، باشترین دەرمان، هۆگری و بەرژەوەندی خۆیەتی. لەم بابەتەوە، رێکخراوەکان دەبێ خـۆ لـە داوەری بـەجێی تاک بپارێزن. هیچ چەشنە بەر پرسایەتییەکی گشتی یان رێکخراوەیی بوونی نییـە، چونکە هەر کەسگەلن کە دەتوانن بەر پرسی خۆیان بن. تاقانە چاکە، چاکەی تاکە.

لەگەڵ ئەمەدا، جۆرجۆرەکان و هەمەچەشنەکانی مـومکین و زۆربـەی زۆر لـە ناوەرۆکی پلەبەرزیدا بوونی هەیە. بێ خەوشترین و یەکپارچەترین و پایەدارترین شێوەی تاکخوازی،(تاکخوازی جیا لە دەولەتسازی)یە. هیچ ئەخلاق یان باوەڕێک بوونی نییە کە بتوانێ ناچاری بکا. هیچ کەس ناتوانێ بە زۆر شتێک بەسـەر ئـەودا بسەپێنێ، چونکە ئەو کانگا و سەرچاوەی گشت بایەخەکانە. ئەم بە گشتی هەڵگری هەموو تەنیایەکان و سەربەخۆییە. موتڵەقەن هـیچ دەسـەڵاتێک بـۆ کۆکردنـەوەی ئەندێشەیەک لە بەرژەوەندی و بەرژەوندی گشتیدا لە ئارادا نییە. بەرهەمی نهـایی

وەها باوەڕێک دەتوانێ لە ئانارشی یان شێواوە و کەس لە کەس‌خوازی تاکخوازانەدا بەدی بێ کە باشترین وێنەی ئەوروپایی ئەوە، ماکس ئەستیرنرە کە ئەندێشەکانی ئەو لە بەشی پێنجەمدا دەخەینە بەر باس و تۆژینەوە.

وەها بەلگەیەک نە دەتوانێ لایەنگری مافی خاوەندارییەتی بێ و تەنانەت نە ئابووری بازاڕ. بەم حالەوە، دەبێ تەئکید بکرێ کە ئەم جۆرە مەنتقە بەلگەی تاکخوازانەیە. زۆربەی لیبرالەکان کوتوپڕ لە بەرامبەر ئەم دەرئامانجانەدا دەوەستن، بەلام کەسگەلێکی دیکە هەن کە بەو هەستەوە نزیکایەتی دەکەن و هەنگاو بەرەو ئانارشیزم دەنێن و بە ترس و دوودلییەوە، بەلنگەلەرزێوە پێ دەنێنە هەرێمەکەیەوە. هێندێ لەو ئەندێشە ئازادیخوازانەی دوایی، ئەگەرچی خۆیان بە لیبرالیزمەوە بەستووەتەوە، بەلام باشترە دەربارەی ئەوانە لەژێر چەتری ئانارشیزمدا باس بکرێن. بە بۆچوونی هێندێ لە نووسەرانی وەک مووررای راتبارد، ئەم رێبازە بە واژەی گشتی (سەرمایەداری هەرج و مەرج‌خواز) یان (ئانارکوکاپیتالیزم) دەبێ پێناسە بکرێ.[31] لە بریتانیا، لە کۆتایی سەدەی بیستەما، هێندێ لە مریدانی دەوروبەری هێربێرت سپێنسێر وەکو ئابرۆن هێربێرت و ووردس دورس دانیس توریپیش لە لایەن تاک‌خوازییەوە تێکەلاوییەکی نزیکی لەگەل ئانارشیزم و هەرج و مەرج خواز پێک‌هێناوە.

بە قەولی یەکێک لە نووسەرانی هاوچەرخ، ئابرون هێربێرت، (هەر ئەو بەرێز هێربێرت سپێنسێرە بێ هێربێرتە)[32] هێربێرت تەنانەت لە قوولایی دلەوە رەخنەی لە تاکخوازی (ئەنجوومەنی پشتگری لە ئازادی و خاوەندارییەتی) دەگرت و دەیگوت: (هێندێ زۆرتر هۆگری خوشکی خۆشەویستی خاوەندارییەتی بووە... هەتا خوشکی خۆشەویستی ئازادی)[33] ئەو دلپەرۆشی ئازادی تاک بوو. لەگەل ئەوەی کە لە دەولەتی ئیختیاری و مالیات دلخوازانە پشتگری دەکرد کە رەنگ و بۆی سەرمایەداری هەرج و مەرج‌خوازی ئێستەی بوو. هەروەها ئەو روانگەی ئەم دواییانەی سپێنسێری بە پارێزکارانە دەزانی لە حەسرەت ئارمانج‌خوازی کتێبی یەکەمی سپێنسێر، بەناوی ئیستاییناسی بوو. لە ئەمریکا، ئاین رەند باوەڕی تەواوی بە ئازادی بۆ تاک و جیا لە روانگەی فەلسەفە بوو. بە بۆچوونی رەند

ـ‌ی جوامێرانە ئەمە بوو کە هەر تاکێک لە خۆخوازی بێ خەوشی خۆی پێڕەوی
بێ پێشمەرج و گریمانەگەلی فەلسەفەی ئەم باوەڕە بەلای ڕەندەوە، کەڵک
وەرگرتنی سەیر و سەمەرەی ئەو لە ئەندێشەی ئەرەستۆ و تام پێن بوو. ئەو
جۆرە کە یەکێک لە نووسەرە نوێکان گوتوویە، (بە بۆچوونی ڕەند) (مەبەستی
مرۆڤ لە ژیان، پەرەپێدان بە حەز و ئارەزووەکانی خۆیەتی و ئەگەر بیهەوێ
خۆی بکاتە قوربانی کەسانێکی دیکە، ئەویش لەبەر خاتری بوونەوەرگەلێکی
گۆمەڵ لێ کراو بەناوی (کۆمەڵگە)، لەم باوەڕە لایداوە).[34] ڕەند ئەم باوەڕەی لە
سەتیک بە ناوی (پلەی خۆخوازی) هێنابوە ئاراوە.[35] ژیان و مانەوەی خودی تاک
تاقانە پێواری بایەخ دێتە ئەژمار؛ لەبەر ئەمە، خۆخوازی تاقانە بنەڕەتی ئەخلاقە.
ـ‌نی عەقلانە تایبەتەن گرێ دراوە بە بەرژەوەندی تاکەکەسی و خۆخوازییەوە.
کەسانخوازی و مرۆڤدۆستی لە ڕاستیدا بە مرۆڤخوازی دەدرێتە قەڵەم.
سەرمایەداری تاقانە نەزمێکە کە توانایی ئەم جۆرە ژیانە دەگەێنێتە دوا قۆناغی
پێکهاتن. لەم ڕووەوەۆ، ڕەند باوەڕی بوو کە لیبراڵەکان (لە ڕێگای
سەرمایەدارییەوە خەبات بکەن نە لە پێناوی ئامانجی (زانستی) و نە لە پێناوی
ئامانجی (ئابووری)، بەڵکو بە لە خۆبایی بوون بە ماف و شیاو لە پێناوی
ئەرمانجی ئەخلاقی).[36]

پێچەوانەی ڕوانگەکان، ئابرون هێربێرت و ئاین ڕەند ئامادە نەبوون هەتا
ئەنتقی تەواو و کەماڵی ئەم بەڵگە تاکخوازانە بسەلمێنن. هێربێرت وەک لاک و
سپێنسێر باوەڕی بە مافی سروشتی نەبوو و لەم ڕوەوە، بۆ زەرووڕەتی
ڕێزلێنانی ڕووبەڕوو و ڕازی بوون بەڵگەی دەهێناوە کە بە بۆچوونی تاکخوازی
بێخەوشی وەکو ئەستێرنر بەکەم زانین بوو. ڕەند هەروەها بەورەی
توندوتیژەوە سەبارەت بە ئانارشیزم ڕەخنەی دەگرت، بە سیستەمی بینایی و
عەقلانی باوەڕی قایم بوو . بوونی شێوەیەک دەوڵەتی بە پێویست دەزانی.

لە بەرهەمی هێربێرت سپێنسێر و ئەنجوومەنی پشتگری لە ئازادی و
خاوەندارییەتی جۆرێک لە (تاکخوازی پێویستانە) دەبینین، ئەگەرچی باشترە
بۆترێ کە زۆربەی لیبراڵەکانی ئەو سەردەمە ئەندامی ئەم ئەنجوومەنی بە

کەسانێکی توندوتیژ دەناسران. گرفتی گەورەی سیاسی سپێنسێر ئەمە بوو کە لە رابردووی لیبرالیزمدا هەمیشە بۆ ئازادی تاک لە بەرامبەر کردەوەی زۆرەملێ لە لایەن دەولەتەوە خەباتی دەکرد. کتێبە بەناوبانگەکەی ئەو، بەناوی مرۆڤ لە بەرامبەر دەولەت، لیبرالەکانی کۆدەکردەوە کە بگەڕێنەوە بۆ پێگەی خۆیان و لە سۆسیالیزمە ئەزموونییەکەی گلادستۆن و تاوانی یاسادامەزرێنەران دوور کەونەوە. بە بۆچوونی سپێنسێر، تاک لەبەر مافە سروشتییەکەی خاوەنی لەشی خۆیانن. هەر کەسێک لە مافی یەکسانی بۆ ئازادی یەکسان بەهرەمەندە. سەرچاوەی مافی سروشتی ڕەوەندێکی بیۆلۆژیکی لە بابەتی بەرتەسکییەوە بەرامبەر و گرێبەستەکە بۆ خەلکی کۆمەلگە زەروورییە. خالی گرنگ و جێی قسە دەربارەی سپێنسێر ئەو بە کە دەلیلی ئەو دەربارەی تاک، ریشەی لە بەرزەفڕییەکانی متافیزیکی بە کەمال گەیشتنی سروشتیخوازانەدا بوو. ئەو دەیویست تاک لە کردەوەی زۆرەملێ رزگار بکا. تەنیا کۆمەلگەی پیشەسازی کە زۆرینەی ئەم تاکانە دابین دەکا دەیتوانی بە بنەچە لیبرالیزم بێ.

باشترە لیبرالیزمی سەرەتایی فۆن هۆمبولت لە ئەلمان بە شێوەی سەرجەم لەگەل لیبرالیزمی سپێنسێر بەراورد بکەین هۆمبولت وەک سپێنسێر، لەو مەرامەی کە دەولەت بچێتە نێو ژیانی تاکەوە، بێزار بوو. سپێنسێر لەگەل ئەو مەرامەی هۆمبولتا بوو کە دەیگوت: (دەولەت نابێ نیگەرانی چۆنیەتی ژیانی ژیارییەکان بێ، لەوەی کە بۆ ئارامشی بەرامبەر و پشتگری ئەوان لە ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن و بێگانە، پێویستە هەنگاو بەولاترەوە نەنێ).[۲۷] بەم حالەوە. پێناسەی هۆمبولت لە تاکخوازی لەگەل پێناسەی سپێنسێر زۆر جیاواز بوو. هۆمبولت ئازادی بۆ دابین کردنی لانیزۆری پەروەردەی جوانناسی تاک(Bildung) دەویست، باوەڕێک کە بە شێوەی بەرین لە ئەدەبیاتی ئالمان لە سوننەتی Bildung raman دا بوونی بوو. هەر کەس هەستەتایبەتییەکانی خۆی پەروەردە دەکا.

ئەم کارە بە بنەڕەتەوە کوکراوەی گشتییە. بە بۆچوونی هۆمبولت (هەستی مرۆڤێک لەگەل دەولەمەندی و پرسەمەر بوون دەگۆڕێ و دەبێ بە فیکر.

ـیکردکانی ئەو لە هەستیدا، ئەسلیەتی ئەو پلەی بەرز دەکاتەوە و بەرزەفری پێ ـدەبەخشی).[38] تاک لە لایەن ئەزموونە جۆربەجۆرەکانەوە گەشە دەکا و پەروەردە ـدەبی و باردی و بارهاتووتر دەبێ. ئازادی توانا Bildung (پەروەدە و بە کەمال گەیشتن)ی ئەو پێکدێنێ. دوا ئارمانجی (باشترین و هاوئاهەنگترین پەروەردە... ـو پێکهێنانێکی گشتی و پایەدارە) ئەمە ئەندێشەیەکە کە جان ستوارت میل لە کتێبی دەربارەی ئازادی[39] خۆی سوودی لەو وەرگرتووە. کردەوەی زۆرەملێ لە لایەن دەوڵەتەوە ئەم پەروەردە جوانناسانە سەرکوت دەکا.

فیکری هەستی کۆمەڵگە بە شێوەی بنەڕەتێکی بەرتەسک و سنووردار ڕووبەڕووی تاک و قەرارداد کە لە ئەندێشەی سپێنسێریشدا دەبینرێ، لەگەڵ فیکری لیبرال کلاسیکێکی دیکە بەناو هەنری سیجویک لە کتێبی پڕەنسیپی ئەندێشە سیاسییەکانی ئەودا وێکچوونیان هەیە. بە باوەڕی سیج ویک، گرێبەست بۆ سیستمی تاکخوازانە بایەخی ریشەیی هەیە. قەرارداد بۆ پێوەندیدان بە جەوهەری ـکەوە لە کۆمەڵگەدا، سەرەکییە. لەگەڵ ئەمەدا، بە بۆچوونی سیج ویک، لە بەراورد لەگەڵ ئامانجەکانی سپێنسێر، تاکخوازی قازانج باوەڕانەی یەک بە دوای یەکی لەگەڵ (تاکخوازی توندوتیژ)ی سپێنسێر دوورن لەیەک. لە حاڵێکا کە سپێنسێر لە دژایەتی خۆی لەگەڵ (یاسای دەست کورتەکان) و دابین و ئەمن کردنی گشتی فێر کردن و پەروەردە لاسار و کەللەڕەق بوو، سیج ویک ڕێگای مامناوەندی نێوان توندوتیژخوازی سپێنسێر و سۆسیالیزمی تەجروبی دەوڵەتی گلادستونی لە دەیەی ١٨٨٠ هەڵبژارد. لانیکەم پاراستن بوونی تایبەتی، بەهێز کردن و قایم کردنی قەراردادەکان و مافی خاوەندارێتی تایبەتی بۆ تەواو باشتر کردنی ژیانی تاک دەسەبەر و نایەتە ئاراوە. شێوەیەک لە تەداخولی تاکخوازانەمان هەیە کە ئارمانجەکەی (ئەمن بوونی (تاک) لە بەرامبەر ڕەنج و زیان) دایە.[40] پارێزیاری لە بواری پاک و خاوێنی و لەش ساخییەوە، خانووبەرە و فێرکردنی پزشکی، باشترینی ئەوان کە دەوڵەت دەبێ بەسەریاندا رابگا و بیانگرێتە ئەستۆ. ئەمانە لەگەڵ تاکخوازی دەگونجێن. سیج ویک باوەڕی بوو کە تاکەکان لە راستیدا هەمیشە بە و بەرژەوەندی زۆر بە بایەخی خۆیان ئاگادارنین و نابێ ئیزن

بدرێ که ئەوان له نەزانینی خۆیان تووشی ئازار بن، یان له بێهێزی و لاوازی ئەوان کەسانێکی دیکه سوود بەرن.

سیج ویک، لەگەڵ ئەوەی که له حکوومەتی لیبرالی ساڵی ۱۸۸۰ که به بڕوای ئەو به خراپترین واتای وشه باوکسالاری بوو، بەم جۆره لیبرالیزمی کۆمەڵایەتی زۆرتر له سپێنسێر نزیک بوو. سپێنسێر لەو باوەڕەدا بوو که رەنج و ئازار و رۆژەرەشی و دەس کورتی وەک به هۆشیار کردنەوە و به ئاگابوونەوەی سیستمی لەش کار دەکەن. کەند و کۆسپ قوتابخانەیەکی باشه بۆ بێهێزکردنی تاوانباران پشتگری درۆزنانه و ناسروشتانه له تاکی دواکەوتوو و بێبایەخ هۆکاره بۆ بێهێزکردنی بزاڤی به کەماڵ گەیشتووی رەگەزی گشتی (مرۆڤ). بەوتەی سپێنسێر: (پەرەپێدانی بێ دەسەڵاتی و هیچ له جانتادا نەبوون به نرخی هەوڵ بۆ وەدەس هێنانی معاش ستەمکارییەکی به تەوژمه).[41] زۆرتر پێوارەکانی سیج ویک به ئاشکرا له لایەن سپێنسێرەوه رەت دەکرانەوه و ئەوانەی لەگەڵ تاکخوازی راستەقینەی به ناسازگار دەزانی.

دژایەتی سپێنسێر لەگەڵ تاکخوازی فایده باوەڕانەی سیج ویک له راستیا کراوەی دژایەتی گشتی ئەو لەگەڵ فەلسەفەی بێنتام به شێوەی فەلسەفەی بەرژەوەند ئەندێشی بوو. به پێچەوانەی قەزاوەتی ئا. و. دایسی دەربارەی رێبازی بێنتام که لەسەر ئەو بڕوایه بوو (شتێکی دیکه به ئەندازەی تاکخوازی سیستمی بوه) بەتەواوی رێگا بۆ خراپ کەڵک وەرگرتنی سەرەرۆکان خۆش دەکا.[42] بنەڕەتی (گەورەترین بەختەوەری) بێنتام و دواتر جان ستوارت میل کەلکیان لێ وەرگرتووه، مومکین نەبوو بناخەی یاسادانەران پەسندی لیبرالی بێ. سپێنسێر لەم داوەرییەدا تەنیا نییه. پێچەوانەی کەسایەتییه بەناوبانگەکانی وەک بێنتام و میل بەناوی دامەزرێنەرانی لیبرالیزم، هەنگاوێک له لیبراڵەکان، سپێنسێر و لەم داییانەشدا رابرت نوزیک، له سەلاحییەتی ئەوان به گومان بوون،[43] نوزیک هۆکاری هێنابۆوه که یەکێک لەسەرەکیترین تاوانەکانی قازانج باوەڕی ئەمەیه که کۆششی ئەو بۆ سوود و بەهرەیه و هۆکاره بۆ رووخان و لەبەین بردنی تاکەکان و بایەخی تاک.

ـفون هـایکیش ئەندامگـەلێکی لـەو بـارەی هەیـە. ئـەو دەربـارەی پێـشمەرج و ـگریمانەی عەقڵخوازانە باسکراو لـە ڕێبـازی قـازانج بـاوەڕی لەسـەر ئەمـەی کـە ـهەموو کەسێک دەتوانێ بەختەوەری گشت کۆمەڵگە لێکبداتەوە، گومانی هەیـە. بـە ـڕوای ئەو، عەقڵ ئامێرێکی بەرتەسک و سنووردارە کە تاکەکان بـەرەو قەناعـەتی ـبەرژەوەنـدی خۆیـان هـان دەدا. ناتوانـێ هـیچ کـەس لـە بەرژەوەنـدی خـۆی ـتێوەرخاتەوە.[٤٤] سوودباوەڕان تووشی ئەم تاوانە فەلسەفییە دەبن کـە بەرتەسـکی ـو بەرتەنگییە عەقڵییەکان ناناسن: لە حاڵێکا کە جان ستوارت میل دەیویست تاک لە ـگرفتی قـەراردادەکان ئـازاد بکـا. هایـک لەسـەر ئـەم بـاوەڕە بـوو کـە سـوننەتە ـکۆمەڵایەتی و ئەخلاقییەکان تاک پێکدێنن.[٤٥]

هایک دەربارەی فۆرمگیری کۆمەڵگەی تـاک دەبێـژێ: ئەگـەرچی زۆر جیـاواز ـلەگەڵ لیبرالی نوێ، پردێکی لە بار بۆ واتای تـاکی جێـی کەڵـک وەرگـرتنی لیبرالـە ـکۆنیکان هەڵدەبەستێ. یەکێک لە هۆکارە سـەرەکییەکانی دەرکـی لیـبرالی نـوێ لـە ـتاک. بەڵگە و دەلیلی پێکـەوە ژیـان و ئاشـتبوونەوەی ئـەو لەگـەڵ کۆمەڵـگە بـوو. ـدەربارەی لیبرالی ئیدەئالیستەکان، تەنیا لەبەر هۆکاری متافیزیکی بوو. تـاک وەک ـپێکهاتەیەکی کەش و هەوا چاوی لێدەکرێ. تاکێـک کـە کـردەوەی خـۆی لـە نێـو ـپارامترەکانی کۆمەڵگەی عەقڵانیدا دیاری دەکرد، ڕیشەیی لـە بابـەت بـارودۆخی ـئەخلاقی ژیارییەوە جوامێر دەهاتە ئاراوە.

ت. ە. گـرین، لەگـەڵ پێـشمەرجی ئیدەئالیـستی، بـاوەڕی وابـوو کـە کۆمەڵـگە ـئامێرێکـە بـۆ بـە ڕاسـتەقینە گەیـشتنی تـاک و گەشـە کـردنی کەسـایەتی ئـەوە. ـبیرمەندان لەگەڵ سـەرنجدان بـە توانایگـەلی تـاک، درێـژە بـە خـەباتی (سیاسـی) خۆیان دەدەن. دەسەڵات بۆ وەها گەشەیەک بەسراوەتەوە بـە بـوونی ڕێکخـراوە کۆمەڵایەتییەکانەوە. هەر تاکێک دەسەڵاتێکی شاراوەی مەعنەوییە کە دەتوانـێ لـە لایەن کۆمەڵگەوە بە خۆی بسەلمێنێ. گرین دەیوت: سوودێک کە هەر مرۆڤێک بـۆ خۆی لە دووی دۆزینەوەی بێ، ئەوە حەز و خۆشی نییە، بەڵـکو ئامانجگەلێکـە کـە کاتێک بە حەقیقەت گەیشت بەشێکی هەمشەییان لە سوودی کۆمەڵگەدا دەبێ و بەم شێوە، خۆ بەردەوام بوون و لەسەر پێوەستانی، تاکیش بە قەناعەت دەگـەیێنێ.[٤٦]

خـۆڕاگری لەگـەڵ سـوودی کۆمەڵـگە یـەکگرتوویی هەیـە و یەکێکـە. ڕێکخـراوە مەدەنییـەکان فـۆرمی دەرەوەی ڕەنگدانـەوەی ئامانجـە ئەخلاقییـەکانن. تاقانـە بـەیانێک بـۆ بـوونی ڕێخکراوەکـان، بەشـی ئـەوان لـە گەشـەکردنی ئـەخلاقی تاکەکاندایە. لەبەر ئەمە، ناکرێ سوودی کۆمەڵگە لە سـوودی تـاک هـاوێر بکـرێ. تاکەکان بەناوی ئەندامی کۆمەڵگە تاقە مافێک و تەکلیفێکیان هەیە.

باوەڕگەلێکی ئەوتۆ لـە ئاسـەواری ل. ب. هابهـاوس‌دا بـەدی دەکـرێ. لەسـەر وتـەی هابهـاوس، لـە کتـێبی دەوران سـازی خۆیـدا بـەناوی لیبرالیـزم، بنـەڕەتی لیبرالیزمی لە دۆزینـەوەی ڕێگـای تاکـا قـەرار داوە. بـەم حالـەوە. (... بـە وتـەی گرین... تـاک بـە پێکهـاتنی شایـستەگییە هەسـتییەکان، ژیـانی و فیکـری و وزەی لەشی خۆی،... سوودی خۆی لە سوودی گشتی‌دا دەبینـێ)[47] ژیـانی کۆمەڵایـەتی پێگە و کەش و هەوایەک بەدی دێنێ کە مرۆڤ دەتوانێ لە دەروونی ئەودا ژیـوار و گەشە بکا و پەروەردە بکـرێ. کاتێـک کۆمەڵـگە ئـازادە (کـە هـەموو هۆشـەکان دەرفەتی گەیشتن بە کەماڵـیان ببـێ. ئـەم دەرفەتـە تـەنیا کاتێـک هەڵـدەکەوێ کـە بارودۆخی سەرەکی هەڵـسوکەوت و پێوەنـدی وەک یـەک بـوونی ئەوانـە لەگـەڵ تێکۆشانێکی ڕێکخراو دابین کرابێ.[48]

ئەم ئەندێشە پێناسـەی هیچ چەشنە بەڵێنێکی پێچەوانە لـە لایـەن تاکخوازییـەوە نەبوو. بەڵگەیان هێناوەتەوە کە تاکەکان لە کۆمەڵگەدا گەشە دەکـەن و پـەروەردە دەکـرێن و تاقمێـک لـە تاکـەکان، بـە فـەرمـی ناسـین و قبـوول کـردنی ئارمانجـە گـشتییەکانی کومەڵـگەیە. لـەم بەڵـگەدا، لیبراڵـەکان لـە پلـەی یەکەمـدا هـۆگری تاکخوازی مـەدەنی بـوون. مایکێـل گوتـەنی: (لیبراڵـە نوێکـان... گریمانـەی بـەر پرسایەتی کۆمەڵگەیان بۆ هەرێمە پێناسراوەکانی تێکۆشـانی مـرۆڤ بابەتانـە بـۆ گەشە و بە کەماڵگەیشتن و باشـترکردنی تاکـەکان باسـی دەکـرد).[49] تـاکخوازی، بەتایبەت بۆ لیبراڵە ئارمانجخوازەکان، تا ڕادەیەک بۆ جان ستوارت میل، ڕەوەندی گەشانەوە بەرەو ژیانێکی تەواوتر بوو. گەشە و باڵا کـردن و بـە کـەماڵگەیـشتنی تایبەتی ئێمە، هەڵگری دڵپێوەبوونی وەک یەکە.[50] ئێمە ناتوانین سوودی خۆمان لە سوودی خەڵکان هـەڵاوێرین. زۆربـەی ڕوانگـە گـشتییەکـانی سـوننەتی سـەدەی

ـو ـ ـدیەم دەربارەی تاکخوازی، هی کەسگەلێکی وەک سـامۆئیل ئـەسمایلز، یـان مە ـێیت مارتینۆن کە بە سروشت، خۆیاری و پاڵپشتی نەفسی خۆیان باوەڕیـان ـو ـ باوەڕی ئەوان بە زیرەکی و وردبینی بوو بە بەڵگەگەلێک بـۆ لیـبرالی نـوێ. ـ ـ ـ بەخۆ و خۆباوەڕی لە خۆکۆڵینەوە فۆرمی دەگرت. لەم بوارەوە، بۆ ریفۆرم ـ ـ نی کۆمەڵگە ئاسانکاری بوو کە لەمپـەری مـاددی لـە خۆکۆڵـینەوە (و لەبـەر ـەمە. ـەمپـەری خۆیـاری و فـۆرم وەرگـرتنی سروشـت) قسەبکن. کارکردگـەلی ـ ـەکانی دەیەی ١٨٩٠ و دەیەی ١٩٠٠ وەکو بیمەی میللـی دیـاری کـردنی مـافی ـ ـیشتن بۆ بە سالاچووەکان (خانەنشین)، بە شـێوەی رۆژ لەگـەڵ رۆژ بـە نـاوی ـە ـ دتی سەرەکی خۆیاری راگەیێنرا. تەنانەت هێندێ کەس بیمـەی میللـی یـان بـە ـ ـی کردنی دەس پێوەگرتن و هەڵەخەرجی تەوسیفیان دەکرد.

خاڵێک کە پێویستە لێرەدا باسی لێ بکرێ، تاکخوازی و سروشـتی مرۆڤـایەتی ـە ـیبرالیزمـدا شـاراوەماوەتەوە. بێگومـان هـیچ جیاوازییـەکی ئاشـکرا و بـێ ـ ـشراوەیی نێـوان (تـاکخوازی) و (کۆخـوازی) بـوونی نییـە، ئـەم واژانـە زۆرتـر ـ ـدەری شاراوەن هەتا تیشک خستنە سەر شاراوەکان و ئاشکرا کردنیان. بێجگـە ـەوە. شێوەی جیاواز و وەرگرتنگـەلێکی جۆراوجۆرمـان لـە تـاکخوازی هەیـە کـە ـ ـنگە فەلسەفییە جۆرجۆرەکان ئەوانە رادەگـەیێنن. دەرەنجام، بۆچـوونگـەلێکی جۆراوجـۆر دەربـارەی تـاکخوازی، نێـوان رەتکردنـەوە و تـەواو قبـووڵکـردنی ـ ـشکرای زەروورەتی دەست تێوەبردنی دەوڵەت، بێ کەلک و داماو ماوەتەوە.

## بایەخی ئازادی

ئازادی بۆ لیبرالەکان پلە و بایەخێکی حەیاتی هەیە. لەبـەر ئەمـە گرنگـە، دەبـێ ـەرنج بدەینە ئەم وتەیەی مایکێل فریدین کە دەڵێ: (وردبۆنەوە لەمە کە باوەڕ بـە ـزادی پرەنسیپی سـەرەکی و کاڵـکەی ئەندێـشەی لیـبرالی پێکـدێنێ، راسـتییەکی ـاشکرا و حاشا هەڵنەگرە. بەڵام باوەڕ بەمە بکرێ کە ئازادی هۆیـە بـۆ یـەکگرتنی ئیـدئۆلۆژی لیبرالـەکان، تاوانـە. ئـازادی، وەک هــەموو واتاکـان، هەڵوێـستگەلی جۆربەجۆر دەگرێتـەخۆ.[٥١] جیـاوازی گرێبـەستی دەروونی ئـەم واتایـەی، نێـوان

ئازادی رووخاو و ویران و ئـازادی بـەردەوامـە.[٥٢] بێجگـە لەمـە، زۆر جـار بەڵـگە هاتووەتەوە کە ئازادی پایەدار بەراستی بەشێک لە لیبرالیزم نییـە. بـۆ وێنـە، فـۆن هایک ئاوابوونی لیبرالیزمی بریتانیـا لـە دەیـەی ١٨٧٠ی لـە پێوەنـدی راسـتەوخۆ لەگەڵ لێکدانەوەی دوو بارەی ئازادی دەزانی. ئێمە لەگەڵ لێکدانەوەی ئەم کتێبـەدا نین.

ئەگەر ناوەڕۆکی لیبرالی کلاسیک بپشکنین، بە ئاسانی بە فیکرە رووخاوەکانی ئەوان دەگەین. نووسەرانێکی وەک بنژەمن کنستان، ئالکسی دووکوویل، هۆمبولت، سپێنسێر و سیج ویک و لەم دواییانەشدا ئابزایا بـرلین، هایـک، میلتـۆن فریـدمن و رابرێت نووزیک، لایـەنگری ئـەم پێناسـەن. کاتێـک تـاک ئـازادە کـە لـەژێر زۆر و گوشاری تەنگانەی ئەندێـشەدا بـێ. بـە شـێوەی سـوننەتی و میتـۆد، هەرچەشـنە تەداخولێکی دەوڵەتیان بە هۆکار بۆ بێهێزکردنی داهێنانی تاک و دەس درێژی بـە ئازادی ئەوانیان زانیوە. پرسیاری گرنگ لێرەدا واتای بەرتەسکی و سـنووردارە. ئاشکرایە کە زۆر گرنگە بیخەینە روو کە ئایا دەست درێژی کراوەتە سـەر ئـازادی یان نـا؟ بـارودۆخێکی زۆر میـزان بـۆ ناسـینی بەرتەسـکی لـە ئارادایـە. یـەکـەم، بەرتەسـکی زۆر ئاسـایی بـە خـاوەنی سروشـتی جـسمانی دەزانـین، وەکـو لـە بەندکردن یـان بخرێتـە بـەر هەڕەشـەی چـەک. دووهـەم: بەرتەسـکی شـتێکە لـە دەرەوەی تاکـە، واتـە ئەمـە کـە X بەسـەر Y دا بـسەپێ. دەرەنجـام، بەرتەسـکی بریتییە لە کارێکی بەراورد کراوی گشتی. لـەم روانگـەوە، هـیچ کـەس ناتوانـی بـە شێوەی راستەوخۆ و بێ ئەوەی خۆی بیهەوێ، سنوور بۆ کەسـێکی دیکـە دیـاری بکا و بەرتەسکی کاتەوە و ناچاری بکا. هایک وشەی (کـردەوەی زۆر) بـە واژەی خزی (بەرتەسکی) دەگۆڕی و بە باشتری دەزانێ. مەگەر ئەوەی کە ئاشکرا بێ کە (هۆکاری بەرتەسک کردنـەوە) هەیـە.[٥٤] لێـرەدا روون نییـە کـە بـۆچی کـردەوەی زۆریان بەرتەسکی دەبێ لە ئانقەست بن مەگـەر ئـەوە کـە ئـەم پێویـستە ئاشـکرا کرابێ.

هایک هەروەها جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کـە نابـێ ئـازادی لەگـەڵ واتـای سروشـتی ئـازادی تێکـەڵ کـەین. بێجگـە لـەوە، بـێ دەسـەڵاتی، لـە دەسـت دانی

ـئامادەیی یان دەسەلات بە واتای بەرتەسکی و بێ شەرت و مەرج نییە. ئامادەیی، توانایی یان دەسەلات دەبێ هەل بڕەخسێنێ بۆ کەلک وەرگرتن لە ئازادی، بەلام لەگەڵ ئازادی هاوکێش نییە؛ لەبەر ئەمە، نابێ ئازادی لەگەڵ بارودۆخی بە دەست هاتوو و کردەوەی ئەو لێک بدرێ. ئەم هۆکار و بەڵگەیە ئەوە باسدەکا کە نەخۆشی، بە سالاچوون، بێهێزی یان ئیفلیجی لەش، نەداری، بێکاری یان لە دەس چوونی هەل و دەرفەت هیچ پێوەندی لەگەڵ ئازادیدا نییە، چونکە بەرتەسییەکان بە ئەنقەست نادرێتە قەڵەم.

ئەم بۆچوونە گشتییە دەربارەی ئازادی زۆرجار، گرێ دەدرێ بە بابەتی مڵکییەتەوە. لەسەردەمی جان لاک بەدوا، بابەتی خاوەندارییەتی پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵ ئازادی پێک هێناوە. جان گرەی، بە پێڕەوی لە هایک، دەڵێ: خاوەندارێتی تایبەتی سەرچاوەی ئازادی تاکە)[55] مالکییەت درێژەی مافی لەش بیتە ئاراوە. زۆرینەی هۆکار و بەڵگەی لیبرالەکان دەربارەی ئازادی، زۆرجار پێروی ئیدعای (ئازادی) لە کردەوەی زۆرەملێ، یان بەرتەسک کردنەوەی لە لایەن دەوڵەتەوە لە مافی لەش و خاوەندارییەتە. دەوڵەت، زۆر ئاسایی لەم کردەوە زۆرەملیەدا دەوری سەرەکی هەیە. دەربارەی سوننەتی یاسای بنەڕەتی ئەم کردەوە ئاشکرایە، چونکە زۆربەی ئەو نووسەرانەی کە پێوەندیان بە یاسای بنەڕەتی دەربارەی حکوومەتی سەرەڕۆی نەگۆڕەوە هەیە، دەدوێن. ئەم ترسە لە کردەوەی دەوڵەتی سەرەڕۆ بۆ لیبراڵە کلاسیکەکانی وەکو کۆنستان لە فەڕانسا، لە سەرەتای دەیەی ۱۸۰۰، ترسێکی ڕاستەقینە بوو، ئەو جۆرە کە بۆ لیبراڵە کلاسیکەکانی سەدەی بیستەم کە دژی دەوڵەتی سۆسیالیستی بوون، ئەو چەشنە دەکەوتە بەرچاو.

لەگەڵ ئەم حاڵە، پاساوهێنانەوە بۆ ئازادی ڕۆخاو بەرینتر لە پشتگری خاوەندارییەتە. زۆرتر لایەنگرانی ئەویش حەز دەکەن ئیددعا بکەن کە هەم سەرهەڵدان پێویستە و هەم داهێنان. ئازادی رووخاو هیچ پێکهاتەیەکی ئەخلاقی تاکی یەک دەست بۆ تاکەکان پێشنیار ناکا. لە راستیدا گریمانە لەسەر ئەوەیە کە قبوول کردن، ئاسان و ڕێزگرتن لە گۆڕین و جۆراوجۆر دەس لێنەدراو بمێنێ. بەم

جۆره، تاکخوازی باشەیە جۆراوجۆرەکان لە خۆ دەگرن. زۆر ئاسایی گوتراوە کە ئازادی پایەدار هاوکێش لەگەڵ ئەم کردەوەدا هەیە. هۆکار بەڵگەی لیبراڵەکان دەربارەی بەرتەسکی هەتا ئەم رادەیە لە کردەوەدا رووڕاست و ئاشکرا نین، نیگەرانی گەورەی سەرەتای ویگەکان سەبارەت بە یاسای بنەڕەتی، کە لەگەڵ میراتی سەرەڕۆیی لە حکوومەتا خەباتیان دەکرد، بەخشینی ئازادیە مەدەنییەکان دەربارەی وتار، مەزهەب وەکو ئەو بوو. خاڵ ئەمە بوو کە تێبکۆشن هەتا وەئەستۆگرتنی یاسایی بەرین بێتەوە. هێندێ لە ویگەکان و رادیکاڵەکان، دەیەی ١٧٩٠ ئەرک و بەرپرسایەتی بەرتەسکی ئازادیان بەرەو سیاسی بوون برد. هۆگری بە بەرەو چوونی بەرین کردنەوەی مافی راپرسی لە هەڵبژاردن سووری خوارد. لەگەڵ ئەمەدا، لە سەرەتای دەیەی ١٧٥٠شدا جەوساياتوکر کە لە ویگەکان بوو، بانگەوازی (شۆڕشی بەشکۆ)ی لە بواری ئابووریدا کردبوو. خوازیاری ئازادی ئابووری لە دەیەی ١٨٤٠ لەسەر بازرگانی ئازاد و پووچەڵ بوونەوەی یاسای دەغڵ و دان کۆبۆوە. لە لایەک لیبراڵەکان، برایت و کابدن ئەم ئازادییە ئابوورییەیان بە پەرەسەندی ئازادی سیاسیان دەزانی. ئازادی بە واتای ئازادی لە دەسکەوتی سیاسی چینی بەکارهێنەری خاوەن زەوی بوو کە بە شێوەی دەسکرد نرخی کەرەسەی خواردەمەنی کە لەودا تووشی بێهێزی ببون، دەیانبردە سەرێ. داخوازی بۆ ئەم ئازادییە لە ئەنجوومەنی دژی یاسای دەغڵ و دان بە رادەیەکی زۆر چووەسەرێ.

لە دەیەی ١٨٧٠، زۆرلە لیبراڵەکان، زۆرتر لە جاران نگەرانی بەرتەسک بوونەوەی تاک لە کەلتووری پیشەسازی بوون. زۆرتر نگەرانی لە بارەی ئازادییە کۆمەلایەتییەکانەوە بوو. ئازادی کۆمەلایەتی (وەک ئازادی سیاسی و مەدەنی) تەواوکەر و هەلگری بەرین بوونەوەی سیستەمی دەوڵەت بوو. ئەو جۆرە کە یەکێک لە هاوچەرخەکانی سپێنسێر و توویە خەلک پێویستیان بە وەئەستۆ گرتنی فێربوون و پەروەردەی تەواو لە لایەن دەولەتەوە هەتا بتوانن لە بەلگە و هۆکاری سپێنسێر دەربارەی پێویست بە پووچەڵ بوونەوەی کێشەی دەوڵەت لە فێر کردن و بارهێنان بگەن.[٥٧]

ئەوەیکە لە بابەتەکاندا دەبینرێن، لە بواری گۆڕانکاری بەرتەسکیدایە. لە سەردەمی ئادام سمیت بەدوا، ئاشکرا کردنی شێوەی جۆراوجۆر دەربارەی بەرتەسکی یاسایی لە ئارادابوو. ئەگەرچی لیبراڵە کلاسیکەکان سەبارەت بە کردەوەی بەربلاوی دەوڵەت ڕەش بین بوون. بەڵام ئەوەی ڕاستبێ، ئەنجامی کردیان بێ بوونی دەوڵەت بەلاوە گرنگ بوو. هەر ئەم خاڵە ئێستەش دەربارەی ـ ەکان ڕەنگدانەوەی هەیە. تەنانەت لیبراڵە کەمینەخوازەکانی (minimalist) وەک ڕابرت نووزیک بە خەیاڵ و پێشبینی هەوڵ دەدا «دەوڵەتێکی هاوکێش» کە بە شێوەی سروشتی سەر هەڵدا و بە شێوەی خودبەخود کاری دابین کردن و حورمەت بگرێتە ئەستۆ.[58]

بەم جۆرە لە ئەندێشەی لیبراڵیدا، جیاوازییە ئاشکراکانی نێوان بەرتەسکی ـ وهەڵگر و پاساوهەڵنەگر دەکەوێتە بەرچاو. سێ خاڵ دەبێ لێرەدا باس بکرێ: یەکەم، بڕێک پەیوەندی نێوان ئەو کردارانەی کە لیبراڵەکان بەرتەسکی دەکەنەوە، دەبینرێن؛ دووهەم، بڕێک بەڵگە لە بواری بەرتەسکی پاساوهەڵگر بە دەست هاتووە؛ سێیەم، چۆن کەسێک بێ ئەوەی بەرتەسکی پاساوهەڵگر لە جۆرە تایبەتییەکانی جیاکاتەوە، چ شتێک بایەخدار و بە کەڵکە، دەتوانێ پێناسەیبکا؟

ئاشکرایە کە بەرهەمی ئازادی رووخاو هیچ چەشنە ڕێنوێنییەک سەبارەت بە دەوڵەت و تێکۆشانەکانی ناخاتە روو. چ. ب. مەک فەرسۆن، بۆ وێنە دەربارەی ـەگەی پێناسەکراوی ئازادی رووخاو بۆ پشتگری کردن لە سۆسیالیستیمەدار، پەیوەندی کۆمەڵایەتی و ئابووری لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکانی ڕۆژئاوا سوود وەردەگرێ.[59] ئەم کردەوە بە دژواری دەتوانێ لە مێشکی لیبراڵە کلاسیکەکاندا ـوەر بەدی بێنێ. جگە لەمە، هیچ کام لە لیبراڵە کلاسیکەکان ئەم پرەنسیپە قبووڵ ـکەن کە بەرتەسکی لە هەناوی ئەهریمەنێکدایە. کردەوەی دەوڵەت خۆی لە خۆیدا بەناوی کردەوەی دەوڵەت، پێویستانە بەرتەسک نییە. بڕێکی زۆر لە کرداری ـدوڵەت، دەکرێ بە گشتی بێکینە و بێزیان بێ. لە ڕاستیدا، بەرتەسکی لە ئەندێشەی لیبراڵیدا میوانێکی گەڕۆکە. پەرەگرتنی کارکردی ئەو، ئەو جۆرە کە پێشەکی باسی لێوە کرا، هەمیشە لە خولی سەرەتای سەدەی ئێستەدا،

ئەندێشەگەلی لیبرالی نوێ بە مانەوەی خۆی درێژەی داوە. سروشتی هێندی لە بەرتەسکییەکان پاساوهەڵگرن چونکە یارمەتی بە وەلاتانی بەرتەسکییە پاساوهەڵنەگرەکان دەکەن. بەتایبەت ئەمە لە کاتێکایە کە بێکاری، نەخۆشی یان پیری چاوی هیوایان بڕیوەتە ئەو بابەتەی دوایی. لێرەدا ئاگاداری بزاڤی ڕەوای دەروونی لیبرالیزم هەین.

دەربارەی خاڵی دووهەم بە رادەیەک گرێ دراوە بە بەڵگەوە کە مومکینە بەو هۆیەوە بەرتەسکی بەربڵاو بێتەوە. هێندێ لە لیبراڵە هاوچەرخەکانی وەک فۆن هایک و ئایزایابرلێن بەڵگەیان هێناوەتەوە کە واتای گشتی بەرتەسکی مومکین نییە دیاردەگەلێکی وەک نەداری یان بێکاری بگرێتە خۆ. هەر تەنیا (بەرتەسکییەکانی دەرەوە پایەدارن) کە هۆکاری بەرتەسککراوی ئانقەست دەگرنە بەر. بەم جۆرە. هیچ کەس ناڵێ نەداری یان بێکاری دەبێ لە ئازادیدا بن. ئەمە تاقە واتایەکە کە هایک لەو کارکردە هاوکێشەی (بەرتەسک) و (کردەوەی زۆر) قبووڵییەتی. بەم حاڵە، ئایا بەڵگەی پلەی یەکەم وجوودی هەیە کە بۆچی واتا بەرتەسکەکان کردەوەی زۆر دەبێ بەم شێوازە بەرتەسک ببنەوە؟ میگرێن و ژانەسەرە توندەکان، نەخۆشە تاقەتپڕووکێنەکان، نەزانین، لە دەستدانی دەستوبردەکان، ڕەجاڵی و ڕەبەنەماڵی و بێکاری لە ریزی بەرتەسکییەکاندان کە سەپاوە بەسەر تاکەکاندا. دەکرێ بڵێین ئەوانە ناچارن لە تێکۆشانگەلێکدا، کە لە رووی وێنە تایبەتییەکانەوە دەیدەن. بوونی ئیدعای لە تەنگانە کەوتن (بەرتەسکی دەرەوەی بەردەوام) هەم لە باری واتایەوە ناپەسندە و هەم لە باری مێژووەوە واتایەکی سەیر و نائاساییە. وا دێتە بەرچاو کە زۆربەی لیبراڵە کلاسیکەکانیش لەگەڵ ئەم ئەندێشە بەرتەسکەدابن.

لیبراڵەکان بەڵگەی گرێدراو بە بەرتەسکییەوە لە سەدەی بیستەمدا بە باشی بەرینیان کردووەتەوە، خاڵگەلێکی نوێیان پێوە چەسپاندووە. لێرەدا تووشی خاڵێک دەبین کە بۆچوونێکی باشتریان دەربارەی ئازادی هەیە. بێ ئەوەی کە دەستنیشان بکرێ، لە هێندێ کردەوەکاندا چ شتێک بایەخدار و بەکەڵکە چۆن دەکرێ تێبگەین کە چ بەرتەسکییەک شیاوە؟ مەگەر ئەوەی کە کەسێک ڕوانگەی

ئوتەرتیژی هەڵبژێرێ و بەڵگە بێنێتـەوە کـە هـەر بەرتەسـکییەک خـۆی لـە خۆیـدا
بەرتەسکی شەیتانیە (کە زۆربـەی لیبرالـەکان ئـەوە بـە پووچـەڵ دەزانـن) و لـەو
شێوەدا جیاوازی روالەتی نێوان بەرتەسکی پاساوهەڵـگر و پاساوهەڵـنەگر دابنـێ.
ئەم کردەوە مرۆڤ بە شێوەی چێژوئیـشتیای نێـوان کـردەوە جیـاوازی دادەنـێ،
لەبەر ئەمە، دەستەوبەجێ لـە ئاماژەیـەک زیـاتر بـە ئـازادی روخـاو، بـەولاترەوە
دەچێ؛ بەم جۆرە، ئازادی لەگەڵ جـۆرە دیاریکراوەکـان لـە کـردەوەی بەکەڵـک و
بەخدار دەناسرێتەوە. ئەمە گریمانەی بەردەوامی واتای ئازادییە.
ت.ە. گرین لە دەیەی ١٨٨٠دا بەڵگەی هێناوەتەوە کە دەتوانین ئـازادی بـەناوی
بە دەسدانی بەرتەسکی یان زۆر تێبگـەین. ئـەو بـاوەڕی وابـوو کـە (نـاکرێ هـەر
جورێک کە دلمان دەخـوازێ واتـای ئـازادی لێکدەینـەوە. نـاکرێ مەبەسـتمان لـە
ئازادی ئەمەبێ کە کەسێک لەوە سوود بەرێ... بەم قیمەتە خەڵکان لەو بێ بـەهرە
بن). ئازادی (دەسەلاتی ئەنجامدانی کردەوەی پایەداری سوود وەرگرتنە، شـتێکە
کە ئێمە لەگەڵ خەڵکان بە شێوەی پێکەوە بوون ئـەوە دەخەینـە گـەڕ و لـە سـوود
وەرگرتن شەریکین)[٦٠] ئەمەیـە خالـە گرنگـەکان کـە پێشکەوتنی کۆمەڵـگە لەگـەڵ
پێشکەوتنی ئەم جۆرە ئازادییە بەراورد دەکرێ کە گرین بە بەراوردی ئەوە لەگەڵ
بـەردگرتنی لیبرالیـزم بـاوەڕی تـەواوی بـوو، بـەوەی کـە کۆمەڵـگە پێـشمەرجی
کردەوەی ئەم ئازادییەیـە خۆنابـێ بـەواتای نـەبوونی ئـازادی خەڵـکانی دیکـەبێ.
ئازادی لەگەڵ سوودی گشتی پەیوەندی هەیـە. بـەم چەشـنە، ئـازادی تـاک لەگـەڵ
ئازادی کۆمەڵگە یەکسان بەرانبەرە.
لانی زۆری دەسەلاتی گشتی ئەندامی کۆمەڵگە لەوەدایـە کـە باشـترینەکان بـۆ
خویان هەڵبژێرن. بەم جۆرە، گرین باوەڕی بوو کە لە بواری ئازادی، چوونـە نـاو
کاری فرۆش و بەکارهێنانی ئەلکۆل، شوێنی نیشتەجێ، کەرەسەی دەرمانی و پاک
و خاوێنی. مەسەلەیەک کە پێوەندی بە کار و پیشەوە هەیە، خاوەنداریتی زەوی و
فێرکردن و بارهێنان کارێکی پاساوهەڵگرە. ئەم کردەوانە ئەگـەریش زۆری لەگـەڵ
بێ، بارودۆخی پێویست بۆ کردەوە ئازادییە رەسـەنەکان پێکـدێنن. لەبـەر ئەمـە،
دەبێ یاسا لە ژیانی کەسانێک کە کاری قورس تاقەت پـڕووکێنیان هەیـە، تووشـی

نەخۆشی بێ خواردەمەنی بوون، یان شوێنی نیشتەجێ و فێرگەی خراپیان هەیە، ئاوڕیان لێ بدرێتەوە.

ئەم بابەتانە دەربارەی ئازادی بەردەوام لە زۆربەی نووسراوەکانی لیبرالی نوێدا رەنگدانەوەی هەیە. هەر ئەو چەشنە کە هێربێرت سامۆئەل دەڵێ: (ئەگەر مرۆڤێک بە هۆی نەدارییەوە بکەوێتە تەنگانە یان بکەوێتە ژێر گوشارەوە، ناچار بێکاری لەرادەبەدەر بکا، بۆ بەرێوەبردنی ژیان هێمنایەتی نەبێ، ئازادی راستەقینە نەگەیوە بە حەقیقەت... مرۆڤ بۆ ئەوەی ئازاد بێ، دەبێ لەم گرفتانە رزگاری بێ؛ لە زۆر شوێندا هەر دەسەڵاتی یاسایە کە دەتوانێ ئەم گرفتە قورسانە لە ناو ببات. زۆر جار یاسا باشتر بە واتای ئازادی زۆرترە.[61] ناودارانی لیبرالی نوێ، هابهاوس، وینستۆن چەرچیل و ە. ە. ئاسکیب باوەرگەلی ئەوتۆیان هێنابووە ئاراوە.[62] دەوڵەتە لیبرالەکانی ساڵی ١٩٠٦ هەتا ١٩١٤ لە بریتانیا و یاساگەلی خۆش بژیوی قبووڵ کراوی ئەوان لەبەر تێگەیشتنە لە ئازادی بوو. هەر ئەم هێڵە فیکرییەش لە هێندێ لایەنەکانی سوننەتی دیموکراتیکی کۆمەڵایەتی سەدەی بیستەمدا کاریگەرییەتی بوو.

## عەداڵەت و وەک یەکبوون

لە روانگەی لیبرالیزمی کلاسیکەوە، عەداڵەت هەڵگری پاراستنی فۆرمی گشتی میتۆدی و شێوەگەلی فەرمییە. ئەم جۆرە عەداڵەتە، پێکهاتەی هەمەلایەنە و دەسەڵاتی یاسا دابین دەکا هەتا لە دەروونی ئەودا کەسانێک بتوانن بۆ لە دووگەڕانی بەرژەوەندییەکانی خۆیان پشتگری بکرێن. یاسا بۆ دەستتێوەردان لە تێکۆشان و هەڵبژاردنە تایبەتییەکانی مرۆڤ نییە. بوونی یاسا بۆ دابین کردنی بارودۆخێکە کە مرۆڤ بتوانێ لەودا ئاشکرا گەشە بکا. عەداڵەت گرێ نادرێ بە دەسکەوتی گەشە کردنەوە. دەست کورتی، نایەکسانی کۆمەڵایەتی بێکاری خۆی لە خۆیدا بابەتی عەداڵەت نین. ئەم واتا گشتییە لە عەداڵەتا، (عەداڵەتی گۆڕین) ناو نراوە و گوتراوە کە جەوهەری ئەو شتێک دێنێتە ئاراوە کە مەبەستی لیبراڵەکانە لە عەداڵەت.[63]

عەدالەتی گۆڕین لە بەرامبەر لەگەڵ عەدالەتی دابەشکاریدایە کە زۆرینە ئەویان خراپ لە عەدالەت لێکداوەتەوە. زۆرتر هەوڵی عەدالەت بۆ بەکاربردنی دابەشکاری ـش بوون و چلۆنایەتی رەنج و خەمی کۆمەڵگەیە. بەم حاڵەوە، بیرمەندانی وەکو ﻓﯚن هایک باوەڕی وایە کە قبووڵ کردنی پرەنسیپێک بۆ دابەشکاری بژێو لە کۆمەڵگەدا بوونی هەیە. تەنانەت ئەگەر وەها پرەنسیپێک هەبێ، دەسەڵاتی بە هەقیقەت گەیاندنی ئەویان لە کۆمەڵگەدا نییە کە (بەهرەوەرگرتن لەو بە بوونی ئازادی تاکەکان لە کەلک وەرگرتن لە فێربوون و توانایییەکانی خۆی بۆ وەدەی هێنان پێوەندی بە ئارمانجەکانیەوە هەیە).[٦٤] دابەشکاری هەڵگری بوونی پرۆگرام و دارشتنی پرۆگرامە کە هەوڵ بدرێ پرەنسیپی خۆیان بەسەر کەسانی دیکەدا بسەپێنن. ئەم جۆرە رەوەندانە بە هۆی خۆخوازی و سەرەڕۆیی بوونی خۆی، بە شێوەی نەبوونی هەڵبژاردنیەوە دەبێتە هۆی بێ عەدالەتی. ئەمە ناوەرۆکی سەرەکی کتێبی فۆن هایکە بەناوی رێگای کۆیلایەتی بوو. هێربێرت سپێنسێر لە ووتایەکا کە لە ئاوابوونی کۆمەڵگەی پیشەسازی بە کۆمەڵگەی کێشەخواز و شەڕخواز خستوویەتە دەرێ، ئەم کردارانەی پێشبینی کردبوو. کۆمەڵێک لە نووسەرانیش لە پشتی عەدالەتی دابەشکاری تەنیا شارەزا بە ئارمانجی شاراوەی بەرچاو تەنگی بوون.[٦٥] بازرگان یان کارفەرمایەک کە لە کاری خۆیدا سەرکەوتوو نابێ، رێگایەکی دیکە هەڵدەبژێرێ هەتا سەرکەوتنی کەسانێکی دیکە بێهێزکا و یەکێک لە گرنگترین رێگاکان وەدەس هێنانی سامانی خەڵکە لە لایەنماڵیاتەوە. بەرای سپێنسێر، یەکێک لە گرنگترین گرفتەکان کە عەدالەتی دابەشکاری دەیهەوێ بیتوێنێتەوە، رەنج و دەردێکە کە لە نایەکسانیەوە سەرچاوەی گرتووە؛ ئەم دەرد و رەنجە شتێکە چەشنی سیستمی بە ئاگا هێنانەوەی بیۆلۆژیکی لەشە. دەبێ پرەنسیپی نەخۆش، تەوەزەل، بێبەندوبار و بێکەڵک لە قاپووری لەش بخرێتە دەرێ. رزگاری ئەم جۆرە کەسانە لە لایەن دابەشکاری دووبارەوە سەرچاوەیەک بۆ ئەوان، باوکسالاری نابەجێ و ناشایستە و لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر رەوەندی گشتی و بەکەماڵگەیشتووی کۆمەڵگە کاریگەرییەتی ئابووری هەیە.[٦٦]

ئــەو بەڵــگانەی ســـەرەوە پێوەندییـــەكی نزیكیـــان لەگـــەڵ بەڵـــگە كەڵـــك لێوەرگیراوەكـانی لــە بواریكـا یەكسانیان هەیـە. لیبرالیزمـی كلاسـیك رەواجـی بەربلاویان بە تێگەیشتن و دەركی شـێوەی وەک یـەكبوون بەخـشی. نایەكسانی بەناوی واقعیەتێكی سروشتی یان دەرنجام بەرهەمە بەدەس هاتووەكانی جیـا لـە تایبەتییە. یەكسانی لە رووبەڕووی یاسادا بەپێی مافی مەدەنی كـارێكی بنـەڕەتی بوو. یەكسانی ئابووری بە واتای دەسرەسی یەكسان بـە بـازاڕ بـوو. هـەموو بـۆ پێڕەوی لە بەرژەوەندی و هۆگری خۆیان دەبێ لە ئازادی یەكسانی، لە رادەیەكـدا كـە دەسـت درێـژی نەكرێتـە سـەر مـافی كەسـانێكی دیكـە، بەهرەمەنـدبن. لـەم روانگـەوە، یـەک یـەكبوون خوازیـاری دۆزن هــەوڵ دەدا كـە لـە لایـەن كۆششی دەوڵەتەوە بە دابەشكارییەكی باشتری سامان بگا. ئەمە ترسێک بوو كـە سپێنسێر لە (كۆمەڵگەی كێشەخواز) بووی. سپێنسێر لە ساڵی ١٩٠٢ بەڵگەی هێناوەتەوە كـە ئامـانجی (یەكـسانی مـرۆڤ نییـە). بەڵـكو یەكـسانی شایـستەگییەكانی ئـەو بـۆ ئـەنجامی زۆرتـرین و باشـترین كۆششـە.[٦٧] پێـڕەوی لـە ئەندێـشەی بەرامبـەری بنەڕەتی ئابووری و كۆمەلایـەتی ناچـار رەوەنـدی بـازاڕ بێهێـز دەكـا و ئـازادی قەلاچۆ دەكـا. بـەم جـۆرە، ئـازادی هەمیـشە لەگـەڵ یەكسانی لـە كێشەدایە. بـە بۆچوونی زۆرینەی لیبراڵە كلاسیكەكان، پیرەوی لە ئەندێشەی یەكسانی بنـەڕەتی هەمیشە بە كردەوەی زۆر و ملهوڕی لە لایەن دەوڵەتەوە ئەنجام دەدرێ.[٦٨]

بە پێچەوانە رەخنەگەلی كۆمەڵێک لە لیبراڵە كلاسیكەكان لـە واتـا گـشتییەكانی عەدالەتی دابەشكاری و یەكسانی بنەڕەتی، ئاشكرایە كـە فیكـرە ناوبراوەكـان لـە سوننەتی لیبرالیدا پێگەیەكی باوەڕ پێكراویان هەیە و فیكری رادیكاڵـگەلێكی وەكـو تام پـین دەكرێتــەوە. ئـەو جـۆرە كـە گ.ف. گـاوس نووسـیویە: (هـەموو لیبراڵـە مەدەنییەكان راولێز و ستوارت میل، بەڵگە دێننەوە كە دەبێ كەش‌وهەوا بـۆ گەشـە و پێكەوە بوونی یەكسانی بەدی بێنن و بیخەنە بەردەم كەسانێكی دیكـە)[٦٩] ئەگـەر بیسەلمێنن كە هەر كەس مافی یەكسانی بۆ ئازادی بەرامبەر هەیە، ئازادی بـەناوی ئەنجامی كردەوەیەكی دەسەلاتی بـە بایـەخ دەرک بكـرێ، لـەو شـێوەدا دەلیـل و

ـەگەی لیبرالی دەگۆڕدرێ. لەوانەیە بـە ئەسـتۆگرتنی ئـازادی بەرامبـەر هەڵـگری
ـ بەشکاری سەر لە نوێ بنەڕەتی لە لایەن دەوڵەتەوەیە.

لیبراڵە دواکەوتووەکان دەیانی کە پەرەنگ پەرەنگ بوونی ناشایـستی سـامان
ـعادلانـە و بـێ ئینـسافانەیە و ڕێچارەیـەک لـە لایـەن بەرتەسـکی دابەشـکاری
ــەرلەنوێ بوونی هەیە. ئەوانـە نەیاندەویـست سیـستەمـی بـازاڕی بێهێـز بکـەن،
ـەلکو هەستیان دەکرد کە دەکرێ کاریگەرییەتی ئەوە هاوکێش بێ. ئەو جۆرە کـە
ت.ە. گرین دەڵێ: (جەماوەرێکی بەکەم زانراو، ئەگەر کەس لێیان نەپرسـێ یـان لـە
ڕووی دەروون پاکی خۆیانەوە خۆوراستان بکەوێتە ئەستۆ، دەکرێ خۆی بەرینی
کاتەوە).[٧٠] لیبرالیزمی دواکەوتوو پێویستە بە شێوەی دابەشکاری سـەرلەنوێ، بـە
هۆیی ئازادی رەسەن، یەکسانی و عەداڵـەت بـسەلمێنێ. ئـەم ئەندیـشە بێخەوشـە
ـەگەل پێچراوەیەکی زۆر لە ساڵەکانی ئاخردا لە ئەندێشە کۆمەلایەتییە لیبراڵەکانی
جان راولێزدا لە دووی گەراون. لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا، فیکرە لیبراڵە نوێکـان
ـە بارەی لانیکەمی هەق دەست، بیمـەی پـاک و خـاوێنی و دەرمـانی و بێکـاری،
بژیو و خواردەمەنی لە قوتابخانە، مووچەی دانشتنی کاتی بـە سـالاچوون وەکـو
ئەمانە دەسکەوتی ئەم هێڵە فیکرییە بوون. ئەمە بزاڤێک نەبوو بەرەو سۆسـیالیزم،
بەلکو زۆرتـر بـەرین بوونـەوەی بەڵـگەکان دەربـارەی مافـە یەکـسان و ئازادییـە
بەرمبەرییەکان بوو.

## ماف و دیموکراسی

پێگەی مافە سروشتییەکان لە ئەندیـشەی لیبرالیـدا زۆرینـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ
بیرمەندێکی وەکو جان لاک. لە پشت مافـە سروشـتییە رەسـەنەکانەوە، کۆمەڵـێک
ئەندیـشەی شـکۆداری یاسـای سروشـتی و جۆرێـک خودابـاوەڕی سروشـتی
گەشبینانە بوو کە جیهانی هەستی بە بەروبوومی یاسـاکانی خـودا کـە فـام بـڕی
پێدەکا، دەزانی. ئەم مافانە جیاواز لـە کۆمەڵـگە، گـشتی و بەشـێک لـە سروشـتی
مرۆڤ دەدرایە قەڵەم. بە خـاوەن بـوونی ئـەم مافانـە و ڕێزگرتنیـان، پێـشمەرجی
گەشەکردنی مرۆڤ دێتە ئاراوە.

مافه سروشتییەکان، لە دەستی جان لاک، لەو گرنگتر، موستەعمەرەنشینەکانی ئەمریکایی و شۆڕشە فەڕانسەوییەکان، بوون بە باوەڕی رادیکال و بەدی هێنەری نیگەرانی و پێناسەی نارەزایەتی دایمی سەبارەت بە حکوومەت دامەزرا. ئەم باوەڕانە حەز و مەیلێک بوو کە لە لایەن کەمینەکان، تاقمە بنەچەیەکان، ژنان و رووت رەجالەکەنەوە دەست و بردانە لە داخوازییەکانی ژیانەوە بوو بە داخوازی خاوەندارییەتی، بەیانی ئازاد، بوو بەسەربەخۆیی سیاسی و ئازادی مەدەنی. زۆربەی رادیکالەکان، وەکو تام پین، خوازیاری ئەوە بوون کە ئەم مافانە بەیەکەوە هاوکێش و یەکسان نەبوون. لە ئەمریکای باکوور کە سەرکەوتووەکان و براوەکان لە سەرەتای بەشێک لە مافە سروشتییەکانی مالکیەت دەدرانە قەڵەم، مافی ئازادی و مافی خاوەندارییەتی بە شێوەیەکی سەیر و سەمەرە کەوتنەڕوو.

داخوازی یەکسانی بنەڕەتی هەڵقولاوەی مافە سروشتییەکان، سەرەنجام کاری کردە سەر بزاوتە سۆسیالیزمەکانی دوا خولی سەدەی نۆزدەیەم. لایەنێکی دیکە لە بەڵگە پێوەند دراوەکان بە مافە سروشتییەکانەوە، سەریهەڵدا و راپەڕی و بوو بە پشتگری مافە خاوەندارییەکان و پێی لەسەری داگرت. بە جۆرێکی دیکە، مافە سروشتییەکان گۆڕان و بوون بە پشتگری زوڵمی ئابووری و کۆمەڵایەتی. د. گ. ریچی ئەم پێکهاتەی (شێوەیەکی دیکەی لە رێگایەکەوە زانیوە کە پارێزکارانی بەرەیەک مومکینە ئەندێشەگەلی رادیکاڵەکانی بەرەی پێشوو بە دەست بێنن).[٧٢]

واتای گشتی مافە سروشتییەکان، بەتایبەت مافە مالکییەتەکان، لە دوا خولی سەدەی نۆزدەیەمدا بە شێوەیەکی زیرەکانە لە لایەن تاقمێک لیبرالەوە فۆرمیان گۆڕی. ت.ە. گرین تەئکیدی دەکرد کە ئەندێشەی (حالەتی سروشتی) جیاواز لە کۆمەڵگە، ئەندێشەیەکی درۆزنە. مرۆڤەکان خولقێنەری کۆمەڵگەی سروشتن. مافی (سروشتی) بەر لە کۆمەڵگە وجوودی هەیە. مافەکان هەمیشە هاوپێواری بە فەرمی ناسینی شیاوە دەستوورییەکان لە چوارچێوەی کۆمەڵگەدا هەن. بەم جۆرە، گرین مافە سروشتیەکانی بە شێوەیەکی کورتترکراوەی ئەو مافانەی دەزانێ کە هەم لە سوودی تاک و هەم لە سوودی کۆ بەهرەمەندە. بە بۆچوونی گرین، ئەوانە بارودۆخی روخاوی راستی و توانایەکان و دەسەلاتەکانی تاکن.

وەهــا بەڵــگەگەلێک بەتایبــەت پێوەنــد دەدرێ بــە مەســەلەی مافــەکانی
ـەوەنداریییەوە. ئەو جـۆرە کـە پێشتر لیبراڵـە کلاسـیکەکان تەئکیـدیان کـردووە،
خاوەنداری پێشمەرجی بەربڵاوی پێشکەوتنی تاک دەدرێتە قەڵەم. دەسـتتێوەردان
ـە خاوەنداری تاوانێکی ناپەسـندە لـە مافـەکان و ئازادییـەکان. بـەم حاڵـەوە، ئـەم
ـەڵگەیە لایەنێکی دیکەی هەیە. ئەگەر خاوەنداری پێشمەرجێکی گرنگی پێشکەوتنی
ـەرۆڤ دەدرێتە قەڵەم، کەواتە کۆمەڵگەی ئازاد ئەخلاقەن ئەرکی خۆیەتی گەیشتنی
هەر کەس بە مالکییەت مسۆگەر بکا. لە لایەکی دیکـەوە، لایـەنگری سپێنسێر یـان
هایک مومکینە وەک رەتکردنەوە بڵێن بەرامبەری تەنیا لە دەسکەوت یان دەرفـەت
ـدەبێ مسۆگەر بکرێ. هیچ نابێ پێش بە بەشداریکردنی تـاک بـێ لـە بـازاڕ، بەڵـکو
ـدەرئەنجامی کار، چ سەرکەوتوو و چ ناسەرکەوتوو، تایبەتەن پێوەندی بـە تاکـەوە
ـدەبێ. بە شێوەیەکی دیکە، باوەڕ بە بایەخی خاوەنداری بۆ پێشکەوتنی تاک هەڵگر
و هاوپێواری دابەشکاری سەرلەنوێی بەربڵاوتری سامان و رەواجی خـاوەنـداری
ـە نێو هەموو مەدەنییەکانە. تاک پێشمەرجی خاوەنداری دەدرێتە قەڵەم.

لایەنگرانی روانگەی رووخاو ئیدعایان دەکرد کە بەڵـگەی نـاوبراوی سـەرەوە
هەڵگری هەموو مافـەکانی مالکیەتـە کـە گریمانـە لەسـەر درز نـەبردنی ئەوانییـە.
هێندێ لە لیبراڵە نوێکان رێگایەکیان لە دەوروبەری ئەم ناوەرۆکە رەچاو کردووە.
سـەرەتا ئەمەیە کە، دەبێ ئەوانە بە نـاوی شـیاوی کومەڵـگە قبـوول بکـەن. ئەگـەر
کومەڵـێک خەڵـک نـاتوانن وزە شـاراوەکانی خۆیـان بخەنــەڕوو، کەواتــە ئــەم
خاوەندارییە مافێکی رەسەن نییە، چونکە پێوەنـدی بـە سـوودی گشتی و قبـوول
کردنی کۆمەڵگەوە هەیە. ناتوانی ئازادی خەڵک داگیر و زەوتکەی و ئازادی خـۆت
بە دەستبێنی. ئەمە لە لایـەک و لـە لایـەکی دیکـەوە ئەگـەر مالکییـەت پێشمەرجی
ئازادی بێ، کەواتە هەموو ئەندامی کۆمەڵگە دەبێ بۆ دابینکـردنی سـوودی گشتی
ئەم ئەرکە بگرنە ئەستۆ کە ئامێری ئازادی بـۆ گـشت مەدەنییـەکان خۆیـان دەبـێ
پێکی بێنن. دەرەنجام ئەمەکە، ئەمجا نێوان خاوەنداری بۆ کەڵک، یان خـاوەنـداری
بە مافی وەدەست هاتوو، مالکییەت بـۆ دەسـەڵات، کـە لـە دەسـکەوتی رەنـج بـۆ
نەکشاوی، بەدەسـت دێ، بـاس لـە بەشـکردن دەکـەن. خـاوەنـدارێتی بنـەڕەتی،

خاوەندارێتی جۆری یەکەم نەک خاوەندارێتی جۆری دووەم. ئەم بەڵگە باسی لە پانتایەک بۆ سامان دەکرد کە دەیتوانی بۆ دابەشکاری سەرلەنوێ کەلک لەوە وەرگرێ. لە راستیدا سوودی بایەخەکان سامانێکە کە باهێناویە. ئامانجی سەرەکی پرۆژەکانی لیبرالی دواکەوتوو کە مالیات بەندی هێور هێوری دەهێنا ئاراوە.

دەبێ قبووڵ کرێ کە لیبرالە کلاسیکەکان بە گشتی لەگەڵ باوەڕی مافە سروشتییەکان هەستیان بە هێمنایەتی نەدەکرد. لە سەدەی نۆزدەیەمدا لایەنگرانی بێنتام ئاشکراترین وێنەی دەسپێکی بابەتی رووخاوی مافە سروشتییەکان بوون. لە روانگەی پێڕەوانی بێنتامەوە، مافە بنەڕەتییەکان بەربڵاوکردنەوەیەک بوون بۆ پشتگری لە بەرژەوەندی، کە لە کۆتاییدا پێشمەرجی زانیاری قازانجی دەدرایەقەڵەم. مافە سروشتییەکان پێشتر لە بنەڕەتیبوون یان پێشتر لە کۆمەڵگە بوون، بوونی نەبوو، بێنتام ئەم جۆرە مافانەی (کردەوەی ناپەسندانەی تاک کە پێی دارینی هەیە) باسی کردووە. لەم سەدەدا، لیبراڵگەلێکی وەک هایک هەڵوێستی نزیکتر بە کانتەوە کە هەڵوێستی یاساپەرستانە و میتۆدخوازانەی دەربارەی مافەکان، قبووڵی دەکا. بە وتەی جان گرەی، ئێمە لە بەرهەمەکانی هایک (زۆرتر لە ناوەڕۆکی مافەکانی لیبرالی لە بارەی رەنگدانەوەی داخوازی عەدالەت لێک جیا دەکەینەوە... هەتا پێداچوونەوە و تێرامان دەربارەی بەرینبوونەوەی مافە باسکراوەکان لە لایەن جان لاک، لە حاڵەتێکی سروشتی و خەیالی)[٧٣] ئەم جۆرە بەڵگە هەمیشە پێشمەرجی جیاکردنەوەی نێوان (ماف) و (سوود)ە. کارکردی مافەکان، دابین کردنی چواچێوەی کردار و عادلانەیە کە تاکەکان بتوانن لە دەروونی ئەودا سوودی خۆیان بدۆزنەوە. ئەم واتا گشتییە لە ماف هیچ واتایەکی تایبەتی لە سوود پێشنیار ناکا[٧٤]. لەگەڵ ئەمەدا، ئەو (مافە)ی کە لە لایەن کانتەوە هاتووتە ئارا، رەخنەگران و بیرمەندانی وەکو مایکیل سەندل توێژیویانەتەوە.[٧٥] لەم ئاستەدا، تا رادەیەک، وەک گەڕانەوەیەک بۆ ناوەڕۆکەکانی لیبرالە ئامانجخوازەکان، ت. ە. گرین هەست پێدەکرێ کە لایەنە کۆمەڵایەتییەکەیان بە

ـبـوی شێلگیرانه دەگرتە بـەرچاو و ئامانجـە کۆمەڵایەتییەکـەیان لـە وتووێژێکـا ـەـردت بە مافە جۆراوجۆرەکان بایە، بە سیلەی چاو بۆی دەڕوانین.[76]
ـیردا بابـەتێکی گرنگتـر، پێوەنـدی لیبرالیـزم لەگـەڵ دیموکراسـییە. گریمانـە ـەـەر ئەمە کە لیبرالیزم چۆن پێوەندییەکی زاتی لەگەڵ دیموکراسیدا هەیـە. ئـەم ـبـوە گشتییە زۆر لە ڕێ لادەرانەیە. سـەرەتا، ئەمەکـە، لیبرالیزمـی کلاسـیک زۆر ـــی جیاوازی لەگەڵ دێموکراسی هەیە. شێوەیەک لە دێموکراسی، دێموکراسـی ـ ـەـانی، بـەناوی یـەکێک لـە ئـامێرە بنەڕەتییـەکانی لیبرالیـزم لـە سـەدەی ـ ـ ـدیەمدا قبـوول کـراوە و ناسـراوە. دوای پـێدرێـژی دێموکراسـی هاوبەشـی ـ ـشـی ١٧٨٩ی فەڕانسا، لیبرالەکان، بەتایبەت لە فەڕانـسا، هێنـدێ باوەڕیـان بـە ـیـوکراسی ڕاستەقینە پەیدا کرد. لـە بریتانیـا، ویگـەکانیش هـۆگری دێموکراسـی ـەـوون. ویگەکان، بـە پێچەوانـەی شـەبەیخوونەکان، جارنـەجار خۆیـان بـە ڕازی ـ ـ و حاکمییەتی خەڵک، هێشتا لە بـارەی دەسـەڵاتی سیاسـییەوە، لـە ناخـەوە ـەـنـجام خواز بوون. لە ڕاستیدا، نەبوونـی ئـەم هۆگرییـە بـە پەرەپێـدانی مـافی ـ ـسی لە سروشتی هێندێ لە نووسەرانی لیبرال، لە سەدەی بیستەمیشدا مابوو.
ـەردرای ئەمە، لایەنێک لە سوننەتی لیبرالیدا بوو کە خوازیاری پەرەسـەندنی ـفی ڕاپرسی بوون، بەناوی بنـەمای مەدەنیـەتی خـاوەنـدار./ لایـەنگرانی بێنتـام ـەـیکردنەوەی مافی ڕاپرسیان بـە ئـامێرێکی سـوودمەن بـۆ بـە دەسـت هێنـانی ـ ـ ـیـەی بەختـەوەری لـە لایـەن بەرتەسـکی و هـاوکێش کـردنی بەرژەوەنـدی حـ ـ وجور لە کۆمەڵگەدا دەزانی، بـە جۆرێـک کـە چ بەرژەوەنـدی وەیشوومەی ـ ـعـایدا و چ بەڕەڵلای ملهوڕ دەرفەتی دەسەڵات وەدەست نـەهێنن. ئـەم جـۆرە ـجوونە لـە دیموکراسـی، نـەفێر کـردن و بارهێنـان بـوو و نـە سروشـتی شـیاو ـ ـدری بوو، بەڵکو لە پرەنسیپی بەرژەوەندی خاوەندارییەت پشتگری دەکرد.
جـێن ستوارت میل ڕەنگە گەشبینترین بیرمەند دەربارەی دێموکراسـی بووبـێ. ـ ـودری بوو کە دێموکراسـی دەتوانـێ کاریگەرییـەتی سـوودمەند و بـە کەڵـکی ـەـەر پێشکەوتی مەدەنییەت هەبێ. ئەم ڕوانگە تەواکەرە دەربارەی دێموکراسییە کە بەلای کۆمەڵـێک لـە لیبراڵـەنوێکانی وەکـو گـرین، هابهـاوس و دیـویی شـەوە

دەکرێ بدۆزرێتەوە. بەم جۆرە، لە سەدەی بیستەمدا گومان و دڵەراوکێ دەربارەی دەور و نیاز بە دیموکراسی لە نێو لیبرالە کلاسیکەکاندا کەم و زۆر لە ئارادایە. بۆ هێندێ لە لیبرالەکان، کێشە لەگەڵ دیموکراسی ئەمەیە کە دیموکراسی پێویستانە نابێتە هۆی بەدیهێنانی سیاسەتە لیبرالییەکان. جەفەرسۆن ئەم کێشە و گرفتەی لە سەدەی هەژدەیەمدا هێنایەوە بیر و بەڵگەی لەسەر هێناوە کە لە بەرامبەر دێموکراسییدا (مومکینە تا رادەیە، بەڵام بەپارێز) پێویستە. هایکیش دێموکراسی و ئازادی بە خاوەنی ئارمانجە جۆراوجۆرەکانی دەزانی کە ڕەنگە لەگەڵ یەک هاوکێشیان هەبێ یان نەیان بێ. دێموکراسی پشتگری بەرتەسکی ڕەنگە لایەنگری ئازادی بێ، بەڵام مەترسی گەلێک لە ئارادایە. هایک دەڵێ: ڕەنگە ئەمە ڕاستە کە دیومانە ملیۆنەها لەوانەی کە لە ڕاپرسیدا بەشداریان کردووە و ڕای خۆیان دەربڕیوە، ڕاستەوخۆ،خۆی بە دەستی فەرمانڕەوایەکی سەرەڕۆ سپاردووە بە بەرەی ئێمە حاڵی دەکا کە هەڵبژاردنی یەک کەس بۆ دەسەڵات پێویستانە ئازادی مسۆگەر ناکا.[٧٧]

## ئابووری

هەموو لیبرالەکان بایەخی بازاڕی ئازادی ئابووری دەزانن. بەم حاڵەوە، دەربارەی جەوهەری ئەوە بۆچوونی جۆراوجۆر هەیە. گومانە کە ئایا پێگەکانی ئەو پێوارەی کارتێکراو و کارایەکانیشی پێ زانراوەیان پێوارەی بایەخی ئەو لەسەرکەوتنی ئەو لە ئازادیدایە. ئەو جۆرە کە ئالبرێت هیرشەمن گوتوویە، لە دەورەی زایین بەدوا، مرۆڤ بە بوونەوەرێک ناسراوە کە لەژێر دەسەڵاتی هەوا و هەوەس و حەزەکانی خۆیدا بووە. مەسەلە ئەوەیەکە لەگەڵ ئەم هەوا و هەوەس و حەزانە چۆن هەڵسوکەوت بکەین. ئەو ئەندێشە جۆراوجۆرانە کە کەوتوونە بەر لێکۆڵینەوە، واتە: پاکتاو قەڵاچۆکردنی هەوا و هەوەس، بە کەڵک وەرگرتن لە هەوا و هەوەسی دژ و تۆڵەئەستێن لە جێگایەک کە ئەوین بە چێژ بردن لە ڕێڕەوی ئەوین بە پێشکەوت بەرتەسک بێتەوە؛ لە کۆتاییدا، دەمبێن کردنی هەوا و هەوەس لەگەڵ هەوڵی بێ تاوانانە یان هەوڵی کۆمەڵایەتی بێ زیانە. هیرشەمن نیشانی دەدا

ـە چۆن وشەی (هەوا و هـەوەس) بـە شـێوەی زیرەکانـە گـۆڕاوە و بـووە بـە ـشـەی (بەرژەوەنـدی). ئـەم بەرژەوەندییـە سـەرەنجام گـۆڕاوە و بـووە بـە ـەرژەوەندی ئـابووری و بـەکاوخۆ لـە ژوورەکـانی شـۆڕای دەوڵـەتەوە ڕێـی ـبووری دەگرێتەبـەر و دەیدۆزێتـەوە. سـوود (بـە کۆکردنـەوەی مـاڵ، پـارە ـڕوست کردن عەتا کرا بوو، واتایەکی دەروونی پۆزەتیڤ و دەرمـانی)[78] پـارە ـڕوست کردن و کۆکردنەوەی سامان بە چاویلکەی بـێ تـاوانی سـەیر دەکـرا. ـــات و ســـەوداگەران و بازرگانـــان کەســـگەلێکی هێـــدی و هـــێمن و ـەسلەحەتخواز و بێ زیان دەناسران. زۆرکەس لەسەر ئەو باوەڕە بـوون کـە ـشترە ڕۆحی بازرگانی بخرێتە جێی ڕۆحـی سـەر کـەوتن. هـەموو، بەتایبـەت ـدام سمیت، دەربارەی ئاسەواری بازرگانی ئازاد لەسەر شارسانییەتی مرۆڤ ـەشبین بوون.

ئادام سمیت ئەگەرچی بـە گـۆڕان و پێـشکەوتنی بایەخـە بازرگانییـەکان بـە ـاستی هۆگر بوو، دەربارەی بەرهەمـەکـانی ئـەو لەسـەر پـاکی و باشـییەکانی ـەر و سیستەمـی شارسـانیەتیش نیگـەران بـوو. بایـەخی ئـابووری ئـازاد لـە ـهاتوویی ئەو بۆ بەربەست کردنی هەوا و هەوەس لەغاوی پساند بوو. بێجگـە ـەمە، زۆر لە لیبراڵەکان، لە تام پین بە دوا، بەشداری لـە بـازاڕ و خـاوەنـدارێتی ـارایی بە هۆکاری سەرهەڵدانی پلەی مەدەنی دەزانی. لەبەر ئەمە، هەڵـچوونی ـازادی و کارایی پێویستانە کارتێکراوی یەکەم بـازاڕ نییـە. لـە ڕاسـتیدا، دەلیـل گەلێکی زۆر لە ئارادایە کە بۆچی ئابوورییەکانی بازاڕی ئـازاد دەبـێ بایەخـدار بدرێتە قەڵەم؟ ئەوانە خۆراگرِ و باوەڕیان بە نەفسی خۆیان هەیە. ئەوانە ئاشتی و سیستەمیان بە دیاری هێناوە. هێندێ بیرمەند خودبەخود بایەخ بە سیستەمـی بازار: هێندێکی دیکـە ئاکامـەکانی ئەوانـە بـە بایەخـدار دەزانـن. تونـدڕەوترین ئەندامی تاقمی یەکـەم، لوودویـک فـۆن میـزس، دەڵـێ: بازاڕەکـان بـە شـێوەی تیبینی و چاوپۆشی لە ئاکامەکانی خۆی، باشن. هەڵبەت لیبراڵگـەلێکی زۆر لـەم هێلە فیکرییە تایبەتە پێڕەوی دەکەن. یەکێک لە هۆکاری برێک بە ئازار لە پـشت ئەندیـشەی هاوئاهـەنگی سروشـتی ئـابووری ئـازاد ئەوەیـە کـە زۆر جـار

ئەندێشەیەکی متافیزیکی نادیار لە بنەڕەتی باسەکەدا بوونی هەیە. نووسەرێکی وەکو سمیت بوونی دەستێکی نادیار بە شێوەی خودا باوەڕانەی سروشتی خۆبینانە دەبینێ. ئەوچەشنە کە دەردەکەوێ خودا بە راستی رووداوە خود بە خودەکانی بازاڕی لەژێر دەسەلات و بەرگێڕەوەی خۆیدا دەبوو. جگە لە فۆن هایک کە لە واتای گشتی کە لە سیستەمی خود بە خودی یان گۆڕینەوەی ئابووری ئازاد خستیەڕوو، هەولیدا بارودۆخی ئەم متافیزیکە دیاری بکا، ئەم هۆکارە بەلای زۆرینەی لیبرالە نوێکانەوە بەردەوام و براوە و بێ چەند و چوون ماوەتەوە.[٧٩]

برێک لە لیبرالەکان لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە سەردەمی زێڕینی ئابووری لیبرالی لە ئارادا بووە. تەنانەت هێندێ رەخنەگریش لەگەڵ ئەو باوەڕە بوون.[٨٠] زەمانێک ئەویان ناو نابوو سەردەمی ئابووری ئازاد. تاقمێکیش باوەڕیان وابوو کە هیچ فەلسەفەیەکی یەکگرتوو لە دەستتێوەردانی دەولەت هەتا نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم فۆرمی نەگرتووە. پرەنسیپی بەبرەو و بەردەوام بریتی بوو لە دەستتێنەوەردانی ئابووری ئازاد. وەبیرهێنانەوەی ئەم خالە گرنگە کە ئابووری ئازاد[٨١] هیچ کات لیبرالی نەبوو. ئەم فیکرە پاش دەست پێکردنی، بەگرژی لە لایەن پارێزکارانەوە پەسند کرا لە نیوەی سەدەی نۆزدەیەمەوە هەمیشە بە شێوەی دەورانی کەلکیان لێ وەرگرتووە. بە بۆچوونی لیبرالەکان لە سەدەی رابردوودا، ئەمە ئامێرێکی بەکەلک بوو بۆ سوود وەرگرتن دژی خاوەن ئیمتیاز و دەست بەسەرداگرتن. ئابووری ئازادی مەکتەبی مەنچستێر کە لایەنگرانی ئەو بە دەست بەسەرداگری سەرمایەداری خاوەن زەوی کە دەسەلات و ئاگالێبوونی مەودای خواردەمەنی سەرەکی لە بەردەستی ئەواندا بوو، لێی ئاگادار بوون، باشترین سوودیان لەو ئەندێشە وەرگرتبوو و سەرمایەداریان بە شەیتانی گەورە ناودێر دەکرد. ئەمە واژەیەکی دژی دەرەبەگایەتی بوو. هەر وەکو پێدا هەلگوتنەکەی خودی ت.ه.گرین، زۆربەی چارە رەشییەکانی بریتانیای دەخستە ئەستۆی بنەمالە خاوەن زەوییەکانی نۆمەنەوە.

هەرچەند کەسایەتییەکانی وەکو هێربێرت سپێنسێر لە ئارادا کە لەگەڵ
ـەتی ئابووری ئازاد پێوەندییەکی نزیکیان هەیە و بەو ناوە دەناسرێن، بەڵام
ـیـێ ڕێکخراوەی وەک ئەنجوومەنی پشتگری لە ئازادی و خاوەندارێتی لە
ـتیدا پڕە لە پارێزکارانی وەکو بەرپرسی خودی لۆرد و میس و باوەڕیان
ـەم کارە بوو. تەنانەت ڕەخنەگرانی تاکخوازی توندڕەوی ئەنجوومەن، ئابرۆن
ـێربێرت، ژیانی سیاسی خۆیان لە حزبی پارێزکار دەسپێکرد. ئەگەرچی
ـبووری ئازاد لە ساڵی ١٨٣٠ بە دوا لە زۆربەی ئاخاوتنە گشتییەکان و
ـەنکیدا لیبرالی وجوودی هەیە، لە دەیەی ١٨٨٠دا، لە بزاوتی پرەنسیپی
ـەندیشەی لیبرالی چووەدەرێ و هەرگیز ئاوڕی نەداوە. لە ڕاستیدا، زۆر لە
ـرمەندان گومانیان بوو کە ئایا ئەم فیکرە بە کردەوە لە ساڵەکانی نێوان
ـەدەی نۆزدەیەمدا بوونی بووە یان نا؟[٨٢]

کۆمەڵێک لە لایەنگرانی لیبرالیزمی کلاسیک، لە نزیکایەتییەک کە خۆیان بە
جێ لە لیبرالیزم دادەنێن، بەڵگە دێننەوە کە هەموو لیبرالەکان، وەک لایەنگری
ـنتام، وردە وردە لە ڕێی ئەندێشەی خۆیانەوە دەسیان لە ئابووری ئازاد
کێشاوە و دڵیان هۆگری دەستتێوەردانی دەوڵەت ببوو. لە ڕاستیدا ئەم فیکرە
ـە ڕێ لادەرە. ئەگەر بکەوینە تۆژینەوەی هۆکارەکانی لیبرالیزمی سەدەکانی
ـۆزدەیەم و بیستەم، لە هۆگری ڕوو بە پەرەگرتنی هەمیشەیی و لەسەرەخۆی
ـە دەوری دەوڵەت دەگەین.[٨٣] لیبرالە دواکەوتووەکان بەرینکردنەوەی ئەم
ـدساڵە گشتییە و قبووڵی کردووە کە هەر مەدەنییەک وەک یەک بەهرە لە
ـافە سەرچاوە بنەڕەتییەکانی ئابووری، سیاسی و کەلتووری هەیە و
ـوەردەگرێ. ئەم ڕەوەندە هەڵگری دەستتێوەردان و کۆنترۆڵی ژیانی
ئابوورییە. ئەو جۆرە کە ج.ئا. هابسن دەڵێ: (کۆنترۆڵەکان .. هەرگیز خۆی بە
ئەندێشەیان هێڵی فیکری ئەم تاکخوازە بیر تەسەکە ئابوورییە ئازادە
نەبەستووەتەوە).[٨٤] بە بۆچوونی لیبرالە دواکەوتووەکان، بەرینبوونەوەی
هەرێمی دەوڵەت، هەمیشە فرەبوونی ئازادی تاک دەگرێتەوەخۆ. دەبێ بوترێ
کە هیچ کام لە لیبرالە دواکەوتووەکان هەوڵیان نەدا بیری ئابووری ئازاد

لەبیربەرن. زۆرینەی ئەوان بەر لە ساڵی ١٩١٤ دەیان ویست سەرمایەداری بکەن بە ئەخلاقی. دەربارەی لیبراڵە ئابووری زانەکان، کینز لە دەیەی ١٩٣٠، تەئکیدی جۆراوجۆر بوو و زۆرتر دەربارەی ئابووری رووخاوی سەبارەت بە سەرپەرشتی دەوڵەت لەسەر سیستەمی بازاڕی ئەودا هەتا کارکردی ئەو زۆر بکا و لە بێکاری و نەداری کەم کاتەوە و بەم شێوە، لێهاتوویەکانی بەهرەوەرییەکانی سیستەمی سەرمایەداری هێنائاراوە. لە دەیەی ١٩٢٠، ئەمە بوو بە کالکەی پرەنسیپی لیبرالیزمی نوێ کە لووتکەی ئەو ساڵی ١٩٢٨ بلاوبوونەوەی کتێبی داهاتووی پیشەسازی بریتانیا بوو. ئەم کتێبە کە بە هۆی رەنگی روو بەرگەیەوە بە (کتێبی زەرد) بەناوبانگ بوو. پرۆگرامێکی بەربلاو لەژێر چاوەدێری کارکردەکانی دەوڵەتدا بوو کە کارگەلێکی سوودبەخشی گشتی، زایەڵە و دەنگدانەوەی خاوەنداریيەتی، بەرینبوونەوەی مالیاتی پلە بە پلە و هاندان بۆ پاشەکەوتی دەگرتەخۆ. بەگشتی جۆری سەرمایەداری گەلاڵەگیراو و سەرپەرشتی دەخستەڕوو. وا وێدەچوو کە خودی کینز زۆر شارەزای بابەتی نەبوونی و هەژاری نەبووبێ، سیاسەتەکانی کۆمەڵگەی کۆ لەمەڕ هەژاری لە راپۆرت دەربارەی بیمە کۆمەلایەتییەکان و خزمەتگوزاری هەمەلایەنەی هاودەنگ لە ساڵی ١٩٤٢ لە لایەن و.ه.بەوریج بلاو کراوە و کەوتە بەر باسێکی هەمەلایەنە کە بنەماکانی سیستەمی دابینکردنی کۆمەلایەتی لە بریتانیا دەهێنا ئاراوە. ئاشکرایە کە لیبراڵە کۆمەلایەتییەکان یان نوێ، گۆرانکارییە گەورە سیاسییەکان لە بواری کۆمەلایەتی و ئابووریدا لە بریتانیای سەدەی بیستەمی هەتا دەیەی ١٩٧٠ی هێنابووە ئارا و پەرەیان داوە. ئەم بەرینکردنەوە سیاسییە کۆمەلایەتیانە پێویستانە دژایەتی لەگەڵ لیبرالیزمی کلاسیک نییە. پەرە و راپەڕینی پلە بە پلەی ئەندێشەکان لەسەرانسەری سەدەکانی نۆزدەیەم و بیستەمدا بوونی بوو کە بە هۆی پەرەسەندنی دەستتێوەردانی دەوڵەت لە هێڵە فیکریەکانی ئابووری کۆمەلایەتیدا.

# سیاسەت و دەوڵەت

ـ تای گشتی لیبرالی دەوڵەت لە سوننەتی فیکری زۆر دێرینەتر لایەنگری لـە
ـسـەلاتی یاسا سـەرچاوە دەگـرێ. لیبرالیـزم لـە سـەرەتای سەرهەڵدانییەوە
ـ ـجی داوەتە ناوەڕۆکی دەسەلاتی یاسا و یاسـاخوازی. هەڵـبەت، زۆربـەی
ـ ـــەرانی سـەرەتای یاسـاخوازی هـیچ چەشـنە وەرگرتنێـک لـە زۆربـەی
ـ ـ ـوکـەکان کـە ئەمـڕۆ بـە بەشـێک لـە لیبرالیـزم دەزانـین نـەبووە. بـەلام
ـ ـیزمی سوننەتی یاساخوازی تێر و تەسەل کـردووە و بـەکردەوە زۆر زۆر
ـوی لەگەڵـی هاوپێناسـە ناسـاندووە. دڵـگەرمی سـەرەکی ئـەم سـوننەتە
ـ ـخوازە، وەکو لیبرالیزم، بەرتەسک کردنەوەی پەراوێزی دەوڵەت، وەلامگـۆ
ـ ـ ـپرس زانینی ئەو لە ئاست کردەوەی خـۆی و وەئەسـتۆگرتنی هێنـدێ لـە
ـ ـحە تایبەتییەکان لە لایەن ئەوەوە دەسەبەر کراوە.

ـ دێن لیبرالیزم خوازیاری وجوودی دەوڵەتی لانیکـەم بـووە، دەوڵـەتێک
ـ ـرکەکانی بە دابینکردنی سیستەمی ناوخۆ و دەرەوە بەرتەسک دەبۆەوە
ـ ـ نێوان پانتا تایبەتی و گشتییەکاندا جیاوازی داناوە. هەرچەند کۆمەڵێک لە
ـ ـ کلاسیکەکان بە شێوەی دەروونی تووشی هێنـدێ کـۆلانی دوودڵـی و
ـ ـ ـاوکێک دەربـارەی چۆنیـەتی بەرتەسـککردنەوەی دەوڵـەت بـوون، ئـەم
ـ ـتییە ئەوانی ئیفلـیج کردبـوو کـە یاسـاخوازی و لایـەنگری لـە دەسـەلاتی
ـ ـی لیبرالی ئەندێشەیەک لـە بابـەتی دەوڵـەتەوە و پێوەنـدی بـە سـوودی
ـ ـتییەوە هەیە. مـەرجی پێویـستی بەرتەسـکی، وجـوودی خـودی دەوڵـەتە.
ـ ـوزی ئەگەر و گریمانەی ئێستەی نێوان گشتی و تایبەتی، بێوچان لە گەڕ
ـ ـۆراندایە. دەوڵەتی لیبرالی بە شێوەی فەرمی وەئەسـتۆی دەگـرێ کـە بـۆ
ـ ـیمە تایبەتییەکان دابنـێ و ئـەوە بپارێزێ، بـەم حالـە، ئـەو جـۆرە کـە لـە
ـ ـــەکانی پێـــشوودا دیمـــان، هـــیچ پێوەندییـــەکی دیارینـــەکراو یـــان
ـ ـچاوتەنگییەک بۆ جیاوازی نێوان تایبەتی و گشتی لە ئارادا نییە. ئاشـکرایە
ـ ـ کاتی شەڕ و ئالۆزیدا، دەوڵەتە لیبرالەکان، بەناوی کارێکی سروشـتی و
ـ ـکرا. سنوورەکان دەگۆڕن.

لێرەشدا، وەکو باس دەربارەی ئابووری، سەرنجی لەسەرەخۆ و روو بە گەشەی لیبرالەکان لەسەرانسەری سەدەکانی نۆزدە و بیستەم سەبارەت بە دەوری پۆزەتیڤی دەولەت ئاگادارین. بەلگەی لیبرالەکان لەم بارەشەوە کەسانێک کە لە نێوان هۆگری بە ئانارشیزم داماوانە مابوونەو، هۆگرییەکیان بە دەولەت نەبوو یان ئەوەیان بەلاوە زەرووورەتێکی تالە. ئەمە لە لایەک و لە لایەکی دیکەوە، کەسانێک کە دەوری باش و چالاکانەیان بۆ سەرکەوتنی تاکی رەسەن و باشی مەدەنییەت گێراوە، کەم و زۆری هەیە.

کەسایەتییە مەدەنییەکان (مینیمالیست) وەکو ئابرۆن هێربێرت، لایەنگری راستەقینەی دەولەتی ئیختیارین. لیبرالە نوێترەکانی وەک رابێت نووزیک لایەنگری دەولەتی کەمینە و بەرتەسک کراو لەگەل مافە سروشتییەکانن. بەلام لیبرالە لایەنگرەکانی هایک، بە هۆی کەمینەخوازییەوە رەخنەیان لە نووزیک گرتووە.[85] هێربێرت سپێنسێر دەولەتی بە (کومیتەی مەدەنییەتی) تال، بەلام پێویست دەزانی. ئەو تۆمارێکی دوور و درێژی لەسەر ئەوەی کە (نابێ) دەولەت ئەنجامی بدا، دەیخستە روو. سپێنسێر کۆمەلێک لە یاساکانی بریتانیای بە بەلایەکی بێوێنە دەداتە قەلەم: هێزی یاسا دادەمەزرێن هەمیشە جۆرە یاسایەکی هێناوەتە ئەرا و لەسەریەک هەلی چنیون هەتا نوقسانییەکانی یاسا پێوەکانی تۆلە بکاتەوە. وەها دەولەتێک لەگەل بەرەوپێشچوونی کۆمەلگە بەرەو کۆمەلگەیەکی پیشەسازی لە لایەن پەروەردەی بەسراو بە جەماوەر و بێهێزکردنی لەسەر پێوەستانی تاک، گەشە دەکا. لەبەر ئەمە، بە بۆچوونی سپێنسێر، دەولەت نابێ نیگەرانی یارمەتی بە هەژاران، دانانی یاسا بۆ کارخانەکان، پاک و خاوێنی و دەرمانی گشتی، ئاوەرۆ و واکسیناسیۆن بێ. بە پێچەوانەی هۆمبولت، ئادام سمیت و مالتۆس، سپێنسێریش دژی هەر چەشنە دەخالەتێکی دەولەت لە بواری فێرکردن و بارهێنان بوو. ئەو لەگەل (ئەنجوومەنی پەرستاری بریتانیا) و (ئەنجوومەنی میللی بەرگری لە کردەوەی خراپ لەگەل مندالان) بەو ناوە کە تاقمێکی لە رادەبەدەر (کۆ)ن کە تاکخوازی بێهێز دەکەن، هەروەها دژی بوو. لە لایەکی دیکەوە، سپێنسێر لەگەل کۆنترۆلی

ـدوڵەتی دەربارەی یاساتۆمەتییەکان و هاودەنگ کردنی تێکەڵاوی و ناپاکی، هـات و هاوار و دووکەڵ دابوو، پرۆژەی گشتی کردنی زەوی لە لایەن ـدوڵەتەوە دەبوونە هۆ کە هێندێ لە لایەنگرانی لێی دڵسارد ببنەوە.

وەها دوو لایەنەیەک سەبارەت بە دەوڵەت لە ئەندێشەی لیبرالە فایدە ـوەرەکانیشدا دەبینرێ. بێنتام، ستوارت میل و سیج ویک، بە پێچەوانەی ـاوەری ئاشکرای بە بەرتەسک کردنەوەی دەوڵەت، پلە بە پلە ئەرکێکی ـورتری بۆ ئەو لەبەرچاوگرت، ئەو جۆرە کە، لە وتەکانی سپێنسێریش ـەولاترەوە چوون. زانیاری قازانج باوەڕ ئیزنی بە قازانج باوەڕەکان دەدا کە ـو لێکدانەوەی دامەزراندنی یاسا چالاکانە دەست بە کاربن. هیچ بوارێکی زاتی ـو دژایەتی لەگەڵ چالاکییەکانی دەوڵەت خۆی لە خۆیدا ئازاد نەبوو. هیچ کام ـە لیبرالەکانی کێشوەری (ئەوروپا)، وەکو کۆنستان، لەگەڵ کەمینەخوازی ـسپێنسێر بەر بەرەکانێی نەدەکرد. کۆنستان و تۆکوویل زۆرتر بە دوی ـزگاری بەرتەسکییەکانەوە لە لایەن بەدیهێنانی هاوکێش و هاوێرکردنی ـدەسەلاتەکان لە دەروونی پێکهاتەی دەوڵەتەوە بوون. ترسی گەورەی ئەوان گەشەی دیکتاتۆری خەماوەری خەڵکی و ئابوابوونی ئازادی تاک بوو. لیبرالە کلاسیکە دواکەوتووترەکان، هایک، لەگەڵ دەوڵەتی زۆر کەمینەخواز یان تەنانەت کەمینەویست بە واتای نووزیکی ئەونین، ئەگەرچی لە بێنتام بە دوا لەگەڵ سوننەتی قازانج باوەڕی دژایەتیان هەیە.

لەبەر ئەمە، روانگەی پۆزەتیڤ تری دەوڵەتی نە بەرهەمی زووتێپەڕی کوتوپڕ و نە ئەنجامی دووبارە رادەربڕنی سەرەکی لە ئەندێشەی لیبرالی، بەڵکو دەسکەوتی بزاوتی لەسەرەخۆ لە دەروونی ئەندێشە لیبرالەکاندایە. باشتر ئەوەیە کە بڵێین ئەم بزاوتە تا رادەیەک بیرمەندانێکی وەکو گرین یان تاوداوە. واتای گشتی ئیدەئالیستی لە دەوڵەت، ئەو بەخاوەنی رۆڵێکی ئەخلاقی پۆزەتیڤ لە کۆمەڵگە دەناسن. دەوڵەت هەر تەنیا نەهادێکی راستەوخۆ نییە بەڵکو پێکهاتەیەک لە ویست و ئارەزووە مەدەنییەکانە کە ئەو پێکدێنێ. دەوڵەت هەستی ئۆرگانێکێکە لە بۆ گەیشتن بە ئارمانجە گشتییەکانی مرۆڤایەتی

بەدیهاتووە، ئەو ئارمانجانەی کە لەگەڵ تاکی راستەقینە و ئازادی پەیوەندییان هەیە. ئەو ریکخراوانەی کە لە نێو دەوڵەتان پێناسەی ئارمانجە ئەخلاقییەکانن. واتا و بایەخەکانی دەوڵەت پێوەندی بە بەرەو باشتربوونی ئەندامەکانی ئەوەوە هەیە، بەم جۆرە، هەلگری واتای تاکخوازانەیەکی گرنگە و ئازادی تاک دەگیرێتە ئەستۆ و دەسەبەری دەکا. هەرچەند ئەم ئازادییە هاوکێشی ئەوەیە کە دەوڵەت بارودۆخی پێویست بۆ گەشەو پێشکەوتنی هەموو مەدەنییەکان پێک بێنی.

ئەم فیکرانە، کارکردە رادیکالترەکانی ئەندیشەی قازانج باوەڕانە و تەواوکەرن، کەواتە سەرهەڵدانی لیبرالیزمی نوێ لە بریتانیا بوونی هەبووە. بە بۆچوونی بیرمەندانێکی وەکو هابسۆن و هابهاوس، کۆمەلایەتی کۆمەڵگە بوو. دەوڵەت هەر بۆ ئەو نەبووە کە تاکەکان لە لەمپەری چالاکییە ئابوورییەکان رزگار بکا، بەڵکو بۆ بەرەوپێشچوونی ژیانێکی مەدەنییەتی ژیاری دەورێکی بالای هەیە. لیبرالەکان لە سەرەتاوە هەتا ئەمڕۆ هیچ کات بەتەواوی لە دەوڵەت رازی نەبوون. رووداوی دوو جەنگی جیهانی یەکەم لە سەدەی بیستەم و دەست تێوەردان و لەسەر پێوەستانی دەوڵەت لە پانتا بەرین جۆراوجۆرەکان، بەراستی بیری ئەوانی چەواشە کردبوو. ئەم دڵتەنگییە لە بریتانیادا لە ماوەی جەنگی جیهانی یەکەم و دوای ئەو بۆ لیبرالەکان کەوتە قالب و قەوارە و فۆرمی راستەقینەی بە خۆوە گرت، بەتایبەت دەربارەی مەسەلەیەکی وەک خزمەتی سیستەمی سەربازی لە ناخەوە تاڵ بوو. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەم دژە نارەزامەندەیە لە دەوڵەت هیچکات نەبووە هۆی ئەوە کە بۆ سەرکەوتنی ئازادی، بەرابەری دابەشکاری، چوارچێوەی یاسایی بۆ پێوەندی ئابووری، بەرەوپێش بردنی ئابووری تێکەڵ و دابینکردنی هێندێ کەلوپەلی گشتی کەڵک وەرنەگرن. دەکرێ لەم واتادا دەوڵەت بە رێخراوەیەک بزانرێ کە دەسەلاتی هەیە ژیانێکی لە بار و باش بۆ هەموو مەدەنییەکان دابین بکا.

## دەرەنجام

ئێستە سەبارەت بە هێندێ ڕەخنەی گەورە دەدوێین کە ڕەنگە داگیرکەرانی ئەندێشەی لیبرالی بگرێتەبەر. کۆمەڵێک لەم ڕەخنانە دەگەڕێتەوە بۆ زەینی گشتی لیبرالی، بڕێکیش بە شێوەی تایبەت ڕەخنەیان لە ئیدئۆلۆژی لیبرالی هەیە. بۆ ئاسانکاری، ئەم ڕەخنانە بە سێ ئاخاوتنی سەرەکی دابەش دەکەین: ڕەخنە لە زەینی تاکخوازانە، ڕەخنە لە واقعییەت و ئەندێشەی ئیدئۆلۆژی لیبرالی، دەرەنجام هێندێ فیکر دەربارەی لایەن و لووتکەی ئەندێشەی لیبرالی لە سەدەی بیستەمدا. ڕەخنە لە زەینی تاکخوازانە کۆمەڵێک بەڵگە دەگرێتەوەخۆ کە بە شێوەی کورت کراوە لێرەدا ئاماژەی پێدەکەین. بەر لە گشتی ئەوانە، گوتراوە کە لیبرالەکان لە کۆکردنەوەی هەر چەشنە واتایەکی ئاشکرا و واقیبینانە دەربارەی ژیانی کۆمەلایەتی تووشی گرفتێکی فراوان بوون. هەم سۆسیالیستەکان و هەم پارێزکارەکان ڕەخنەیان لەوان گرتووە و بە ساویلکەی کۆمەڵناسی تاوانبارکراون. ئەگەر لیبرالیزم بە تاکە بنەڕەتییەکانی ئەزموون بە ناوی بەشێکی نەگۆڕ باوەڕی هەیە، چۆن دەتوانێ فورم بە واتای کۆ ببەخشێ؟

ئەگەر کەسێک هەوڵ بدا هەتا ئەندێشەیەکی ڕەسەن دەربارەی تاک کۆبکاتەوە، ئایا دەسی لە کارێکی نەشیاو وەرنەداوە؟ چونکە دەبێ ئەمە بە گریمانەیەک کە هەر دەسەلاتێک ناچارە ڕەزامەندی هەر تاکێک بە دەسبێنێ. بەکردەوە لیبرالەکان هەرگیز وەها بەڵگەیەک ناهێننەوە، لەم ڕووەوە، لەگەڵ هەلوێستی گشتی بەڵگەکانی خۆی دەکەوێتە دژایەتی و ناسازگاری. ئاشکرایە کە زۆربەی لیبرالەکان ئامادەی قبووڵ کردنی ئەم خالە بوون کە دەبێ تاکەکان بکەونە ژێر گوشارەوە کە ئەمەش ڕوالەتەن لەگەڵ پێشمەرچی تاکخوازی ئەوان بەتەواوی جیاوازی هەیە. هەر ئەم میتۆدە، هێندێ لە ڕەخنەگران لەسەر ئەو باوەڕەن کە لیبرالەکان تێدەکۆشن بە شێوەی نهێنی هاوکاری ئەخلاقی یان کۆمەلایەتی بێننە ئاراوە. هایک پاش وتوێژێکی درێژخایان دەربارەی گرنگی بەرپرسایەتی تاک و جیاوازی ئەو لەگەڵ بەرپرسایەتی کۆ، لە ڕووبەڕوو

بوونەوە لەگەڵ مەنتقی بەڵگەی خۆی حاشا دەکا و تێدەکۆشێ کۆمەڵگە بە کۆمەڵێک لە گرێبەستە ئەخلاقییەکان بداتە قەڵەم کە وا بیری لێ کراوە هەموو بێ بیرکردنەوە ئەوە دەسەلمێنن. دەکرێ ئەمە بە جۆرە فێڵ و تەڵەکەیەک دابنرێ. لە لایەکەوە، باشترین لیبرال، کە جیهان لەگەڵ بەرژەوەندی تایبەتی سازگار ئەداتە قەڵەم، رەنگە بە چاوپۆشی لە نرخ ناچارن بیدەن، بە کەسانێک کە تاقەسواری تاکباوەڕی بن.

ئەگەر کۆکردنەوەی بەرژەوەندی تاک لە دەوری یەک ئەستەمە، کۆکردنەوەی ئەندێشەیەکی شادی هێنەر سەبارەت بە سوودی گشتی یان ئاشت کردنەوەی دەسەلاتدارانی تاک و کۆکارێکی نەگونجاو نەشیاوە. چۆن دەکرێ ئەوانە لە دەوری یەک کۆکرێتەوە؟ گۆڕینەوەی بەرژەوەندی تاک لەگەڵ بەرژەوندی گشتی، کە لە کۆتاییدا وەک هەمیشە دادەسەپێنرێ، بۆ کۆکردنەوە نابێ. سەرجەم، وادەردەکەوێ کە لیبرالەکان، ئەگەرچی رێز بو تاک دادەنێن، بە راستی ئامادەیی تەواویان بۆ جەماوەری کردنەوەی مەنتقی تاکخوازی نییە. تاکخوازی لە بنەماترین واتای خویدا هەڵگری خوخوازی و ناوەندخوازی لە هەموو مەسەلە ئەخلاقی و راستییەکانە، روالەتەن، هیچ رێگایەک بۆ جیاوازی نێوان راستی تاک و بەرژەوەندی درۆ نایەتە بەرچاو. بەڵگەیەک هەیە کە بۆچی هەتا ئەم رادە بابەتی ئەخلاقییە پێچەوانەکان لە ئەندێشەی لیبرالیدا هاتووتە ئاراوە؟ ئایا دەتوانین وەها سەقەت و ناتەواویەک، قەتل لە رووی بەرزیەوە یان دایکێکی ناوبژیکەر مەحکووم بکەین؟ ئایا مافی ئێمەیە پرنۆگرافی (وێنە هەڵگرتن لە ئاورێشم) بقرتێنین؟ گرنگی و بایەخی تاکەکان و ئازادی ئەوان لە پشت ئەم پرسیارانەدا شاراونەتەوە.

بێهێزی بنەڕەتی رەخنە لەم بوارەدا ئەوەیە کە هەر کۆمەڵێکی بەرتەسک لە لیبرالەکان دەگرێتەبەر. جۆرێک تاکخوازی کۆمەلایەتی لە ئارادایە کە لە لای زۆربەی نووسەرە لیبرالەکانی سەدەی نۆزدەیەم بەدوا پەیدا دەبێ کە ناچار نین وەلامی ئەم پرسیارە بدەنەوە چونکە هەندێک لە بایەخە کۆمەلایەتییەکان لە

ـیکهاتـه و تێکـەڵاوی کۆمەڵـگەی تـاکی قبـووڵ کـردووە. دەرەنجـام، رەخنـە
ـومکین نییە هەموو سوننەتەکانی لیبرالی بە ناوی گشتی بگرێتەخۆ.
دووەمین دەستەی رەخنەکان دەگرێتەوە سەر راستی و گومانی ئیدئۆلۆژی
ـیبرالی. ئەم رەخنانە دەکرێ هەڵگری هێندێ دژایەتی بێ. بەڵگەیان هێناوەتەوە
کە لیبرالەکان رێز بۆ ئازادی کەسانێک دادەنێن کە توانای کەڵک وەرگرتنیان لـە
ـازادی نییە، مەدەنییەتی یەکسانی بۆ هەمووان رادەگەیێنن و ئەوە بۆ زۆرینـەی
ـی زیان پێکدێنن. لیبرالەکان لـەم بـارەوە زۆرتـر هـۆگری مافـە مەدەنییـەکانن
هەتا خەڵکی برسی. رەنگە زۆربەی لیبرالەکان بڵێن ئامـادەن کـە لـە کۆمەڵـگەی
ـیبرالیدا لە برسان بمرن هەتا ئەوەی کە لـە کۆمەڵـگەی سـەرەڕۆ و خۆخـوازدا
ـش برێوە بچن، ئەمە خۆی سەرنج راکێشە. لیبرالـەکان لەگـەڵ بـڕێک واژەی
ـەتام و چێژ لە بابەخی خاوەندارییـەتی دەدوێـن، بـەڵام لـە کۆتاییـدا لـە لایـەن
ـیکخراوە ئابووری و بازارییـەکانی خۆیانـەوە، ئەمـە بـۆ ملیۆنـان کـەس رەت
ـدکەنـەوە. لـە راسـتیدا لـە لیبرالـەکان، بەتایبـەت لەسەرانـسەری سـەدەی
ـۆزدەیەم، بە هـۆی کـردەوەی خراپیانـەوە لەگـەڵ هـەژاران و زگبرسـییەکان
ـرەخنەیان لێـی گـیراوە. هـەر ئەوەنـدە بەسـە وشـە و کردەوەکـانی دەوڵـەتی
ـیبرالی سەردەمی گرانی گـەورەی ئیرلەنـد، یـان دیـتنی بیچمـی وەک مـالتۆس
ـدربارەی کرێکارە هەژارەکان بێننەوە یاد هـەتا ئـەم ئەندێـشەیە بـسەلمێنرێ.
ـیبرالیـزم بایەخـە هاوبەشـییەکانی مـرۆڤ رادەگـەیێنێ و پاشـان دەکەوێتـە
ـیداهەڵگوتنی خۆخوازی تاکخوازانە، هەڵوێستێک کە بەتایبـەت لـە بابـەتی ئـاین
ـرەند دەربارەی پلەی خۆخوازی بە وردی کورت کراوەتەوە. لیبرالیزم هـۆگری
یەکسانی یاساییە، بەڵام نەک یەکسانی لـە مالکییـەت یـان دەسـەڵاتدا. ئـەو لـە
ـێوانی مالکیەت و یەکسانیدا جیاوازی دەرفەتەکان دانانێ. بە بۆچوونی هێنـدێ
ـە رەخنەگران، لیبرالەکان لە رادە بە دەر لەگەڵ لایـەنی پـۆزەتیڤی چاپەمەنیـدا
بوون. ئێستە ئەوەی کە دەبێ سەرنجی بدرێتێ واقعییـەتی پشت ئەندێشەکان
یان لانیکەم لایەنە خراپەکان بەراوردی لایەنە باشەکان چاویان لێ بکرێ.

ئازادی یان مەدەنییەتی یاسای بەرامبەر بۆ تاکی هەژار و برسی یان نەخۆش و دەردەدار کەڵکی چییە؟ چ سوودێکی هەیە؟ لیبرالیزم ئەوە نابێنی کە خاوەندارێتی نایەکسان دەتوانێ بە دەسەڵاتی نایەکسان بگا و لەبەر ئەمە، پێوەندی رووبەڕووبوونەوەی ومرۆڤ زیان بگەیێنێ. نەداری بە جۆرێک بە تاوانی خۆد تاک زانراوە. تاکی نەدار خۆی بەرپرسی وەزعی خۆیەتی. لەلایەکەوە، مالکییەت بە کارێکی بنەڕەتی زانراوە. بەلام لە لایەکی دیکەوە سیستەمی سەرمایەداری قبووڵ دەکا کە زۆربەی تاکەکان لەوە بێ بەهرەبن؛ بەم هۆیەوە، قسەکردن دەربارەی خاوەندارێتی تاکەوە دەست درێژی ئاشکرایە بە مافی تاکەکان. بەم شێوە کەسی نەخۆش یان کۆخنشین کە دەمرێ ئازادە و هیچ نابەرابەرییەک سەبارەت بەو رووی نەداوە. ئێستا کە میلیارد دێرێک کە دەبێ پلەبەپلە و هێورهێور مالیات بدا، بووەتە قوربانی نابەرابەری. رابرێت نووزیک مالیات بەپێی سامانی جۆرێک کاری زۆرەملی و کۆیلەتی باس دەکا. تاقمێکی زۆر لەم جۆرە دەرەنجامانە تاڵی و ناخۆشیان چێشتووە.

کۆمەڵێک لەم رەخنانە دەگەڕێتەوە بۆ لیبرالە کلاسیکەکان. هەر بەو چەشنە کە لەم بەشەدا دیمان، واتاگەلێکی جۆراوجۆر لە ئازادی، مەدەنییەت، مافەکان و خاوەندارێتی نێوان لیبرالە جۆربەجۆرەکان بەبڕەو بووە. رەنگە کەسانێک وەبیری بێنێتەوە ئەو تاقمە لە لیبرالە کۆمەڵایەتییەکان کە بەڵگەیان دەهێناوە ئازادی تەنیا هەر بە واتای لێدە و بڕۆی تاکەکان نییە بەڵکو بۆدابینکردنی ژیانێکی باش و بەکەڵکی ئەوان، لە ئاڵوگۆڕێکی دوور نوێن دەخاتە بەرچاو.

دەستەی کۆتایی رەخنەکان دەگەێنەوە بۆ چارەنووسی لیبرالیزمی سەدەی بیستەم. باوەڕی یەکسانی و ئازادی لە هێندێ رێکخراوەی ڕێکەدا کە دەبوو کەڵک لە یەکسانی وەرگرن، خراونەتە پشتگۆی و پاشقول دراون و لێیان شاراوەتەوە. ئەو جۆرە کە روگجی یرۆ گوتوویە: (لەژێر پۆششی لیبرالیزمی جیهانیدا، بورژوایی پلەیەکی وەکو ئەوە کە سەردەمێک سەرمایەداری شانازی پێوە دەکرد، شاردوویەتەوە، بەم چەشنە کۆششی پرۆلیتاریاکان بۆ لە ناو بردنی پلە نوێکانی، هەرچەند کە لە رواڵەتا دژی لیبرالییە، بەلام لە راستیدا

ـيراليزمێکـی بـەربلاوتری بـە دیـاری هێنـاوە).[86] هـەتا سـەدەی بیـستەم، جەماوەرێکی فرەی کرێکـار و ژنـان لـە بەرژەوەنـدی مەدەنییـەتی لیـبرال، لـە ـبەتی یەکسانی مافی سیاسـی، کـەلتـووری، ئـابووری و کۆمەڵایەتییەکانـەوە ـەش براو کـرا بـوون. لەگـەڵ پـەرەگرتن و بەرینبوونـەوەی ئـەم رێکخراوانـە، ـروشـتی لیبرالیـزمیش گۆڕانکـاری بەسـەردا هـاتووە. سـەرەتا ئـەم کـارە ـدرباره‌ی رێکخراوەکـانی چـینی کرێکـار بـوو و پاشـان لـە سـەدەی بیـستمدا ـەبارەت بـە ژنـانیش پـەرەی سـەند. بـەم جـۆرە کـە روگجـی یـرۆ بەڵـگەی هێناوەتەوە، هاوکاری روو بە گەشەی لیبراڵەکان لەگەڵ رێکخراوە کرێکارەکان ـە دەیەی ١٨٩٠ (راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ هەڵـخوازی سیاسـی نییـە، بەڵـکو ریـشەی لـە قـوولایی زەرووڕەتـە دیموکراسـییە نوێکـان دایـە)[87] دەبـێ ئـەو پرسیارە بکرێ کە ئایا ئەم رەوەندە هێشتا لـە ئەندیـشەی لیبرالیـدا بەردەوامـە یان نا؟

لەم بەڵگەدا خولانـەوە و سـووڕخواردنێکی زۆرتـر رووی داوە. لـە دەیـەی ١٩٣٠ تاقمێـک لـە مارکسیـستەکان بـۆ رەخنـەگرتن لـە لیبرالیـزم بەڵـگەیان هێناوەتەوە کە لیبرالیزم نەیتوانیوە بەم بەرینکردنەوە سروشـتییە سـەرکەوتنی ـە مەنتقی خۆیدا هەبێ، چونکە سەلماندنی ئەم کارە پاشەرۆژێکی گـەورەی بـۆ سیـستەمـی سـەرمایەداری و بەرهـەمی لانیزۆری سـوود و مالکییـەت هەیـە. ـیبرالیـزم بـەوەی نەزانییـەوە کـە (دیموکراسـییەتێکی سیاسـی کـە ئـەو بـەدی هێناوە لەسەر ئەم ئەگەر و گریمانـە بـاس نـەکراوە دارژاوە کـە خـاوەنـدارێتی تایبەتی کەرەسەی بەرهەمێنـانی دەسـت لێنـەدراو راگـرێ)[88] ئـەو بەرادەیـەک نیگەرانی شێوەی سیاسی بوو کە لە بابەتی پرۆژە ئابوورییەکان کە ئەمـە بـوو کە بەدووی کەرەسەیەکدا بگەڕێن هـەتا هـەموو هەرسـەکان بوەسـتێن. دەڵـێن ئەوان ئەم کەرەسەیان لە وجوودی فاشیزمدا دۆزیوەتەوە. فاشیزم پشتگری لە کۆکردنـەوەی سـەرمایە دەکـرد و بـزاوت و هەسـتانی پـرۆلتاریای سـەرکوت دەکرد. بەم چەشنە سیستەمی فاشیستی (تکنیکی بەردی بناخەی سەرمایەداری لە قۆناغی سەرهەڵدانی دژایەتییەکانی ئەوە)[89] هەڵبەتە ئەم بەڵـگانەی لیبرالیـزم

بە مەرامێکی روو لە ئاوا بوون دەزانرێ کە پێوەندی بێپسانەوەی بـە شـێوەی تایبەتی بەرهەمێنانەوە هەیە. کۆتایی پێیهاتنی سەرمایەداری بـە واتـای کۆتایـی پێیهاتنی لیبرالیزمە. بێهێزی گەورەی ئەم بەڵگە ئەوەیە کە شی ناکاتەوە بـۆچی فاشیزم لـە دەیـەی ١٩٢٠ لـە وڵاتێـک سەریهەڵـدا کـە سـوننەتێکی لیـبرالی زۆر لاوازی بوو؟ (ئاڵمان) و لە بەراود لەگەڵ بریتانیا، بـەردی بناخـەی پیـشەسـازی سـەرمایەداری ئـەو زۆر ریـشەدار نـەبوو؟ (ئیتاڵـیا) لـە راسـتیدا لیبرالیـزم لـە گۆڕپانی ئەندێشەی ئەوروپیدا مایەوە، هەرچەند رووداوی دوو جەنگی جیهانی فـامی لیـبرالی گەنـدەڵ کردبـوو. زۆرتـر ئەندێـشەی لیبرالـەکان گەشـبینانە و کەماڵخوازی سەدەی نۆزدەیـەم و سـەرەتای سـەدەی بیـستەم، لـە بەسـتێن و لێـواری چـۆمی سـۆم (somme لـە فەڕانـسا) و ئیپـڕ (لـە بلژیـک) و پاشـان لـە کەمپەکانی داخائۆ و بۆخن واڵتدانێژرا بوون و لەناو چووبوون. بوونی هەستی گەشبینانە سەبارەت بە جۆری مرۆڤ ئەستەم بـوو. ئـەم کـارە بـووە هـۆ کـە هێندێ لە لیبراڵەکان خۆ بـدۆڕێنن و لـە ناسـیۆنالیزم تەرەکەمـەبن. لـە دەیـەی ١٩٣٠، بۆ کەسانێک کە تێکەڵ بە بانگەشەی فاشیزم یان سۆسـیالیزم نـەببوون، بەفریو بردنی خۆخوازی و چاولێکەر و خۆهاوکێش کردنی تاک جێگای سەرنج بـوو، ئەگـەرچی رێنـوێنی ئەندێـشەکان لـە دەیـەی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ لـە پێنـاوی گەشەکردنی پلە بە پلەی حزبی لیبرالی بریتانیا، بەتایبەت لە کاتی هاونی، نابـێ لە بیر بکرێ.[٩٠] پاش جـەنگی جیهـانی دووهـەم، لیبرالیـزم دیـسان بـە شـێوەی سیاسـی جۆراوجـۆر سـەری هەڵـدایەوە. لـە دەی ١٩٥٠ تـاقمی (کۆتـایی ئیدئۆلۆژی)، کە لە بەشی یەکەمدا سـەبارەت بـەوان دوایـین، وێنـەی بـەرچاوی ئەو لە سەدەی جەنگی سارددا بـوو ئـەو چەشـنە کـە هـەم ئـەمریکا و هـەم لـە ئەورووپا کاریگەرییەتی بـەرچاوی لـێ کەوتووتـەوە. دژایـەتی لەمـەدا بـوو کـە لیبرالیزم ئەمجارە لە بەرامبەر فامی ئیدئۆلۆژیکیدا دەسـتی کـردەوە و وەسـتا. فامی ئیدئۆلۆژیکی لە رواڵەتا هەمیشە (یان هێندێ جار یان بەتـەواوی) حـەز لـە بـەرەو سـەرەڕۆیی چـوون دەکـرد. لـەم تافـەدا، لیبرالیـزم بانگەشـەی بـۆ یەکگرتوویی سیاسی دەکـرد کـە ئـەوەی لەگـەڵ ئەندێـشەی سیاسـی جیـا. لـە

ـیـۆلـۆژی بـە هەڵـەگرتبوو. بـە بۆچـوونی تاقمێـک، مەودایـەکی دیکـەی لـە
ـەـیشەی لیبرالی بـەرین کـردەوە کـە بـە (کۆتـایی ئیـدئۆلۆژی) نـاودێر کـرا.
ـشترین رەنگدانەوەی ئەوە رەنگە نووسراوەکانی فۆن هایـک بـێ. تێدەکۆشـا
ـە کۆمەڵگە غەربیکان بە تیشکی بێخەوشـی روانگـەی خـۆراگری و ئیتووپیـایی
ـبرالیزمی تـاکخـوازی کلاسـیک یـان وەکـو ویگـەکان لایـەنێکی بـێخەوشـی
ـیشکداربوونی نـەبوو. پـرۆژەی فـۆن هایـک روانگەیـەکی بەرتەسـک و
ـەرەزکـەری لـە بـارەی لیبرالیزمـی رەسـەن بـە پلـەی زەیـنی (کۆتـایی
ـیـئۆلۆژی)یە. سێیەمین جیلوەی لیبرالیزم کە قەرەباڵغتر و قسە دروسکەرترە:
ـوپاتبوونەوەی رووداوە جۆربەجۆرەکانی ئەندێشەی لیـبرالی کۆمەلایەتییـە.
ـەرگ و رووخانی بەرواڵـەتی لیبرالیـزم لـە هەڵـبژاردن، لـە بریتانیـا و هـەموو
ـلاتـەکان، بـە واتـای مـەرگی لیبرالیـزم و ئەندێـشەی ئـەو نییـە. بەڵـگەیان
هێـوەتـەوە کـە زۆربـەی حزبـە سۆسیالیـستە ریفـۆرم خوازەکـان و
ـیـاچوونەوەخوازەکان لە ئەوروپا (بە تەئکیدەوە لە حـزبی کرێکـاری بریتانیـا)
ـەرگی لیبرالیزمـی کۆمەلایـەتیان پۆشـیوە. لەراسـتیدا، ئـەم لیبرالیزمـە
کۆمەلایەتییـە لـە زۆربـەی حزبەکانـدا سەریهەڵـداوە. ئاخـاوتنی ئیـستا لـە
ـەندێشەی سیاسی بریتانیا بە چەشـنێکی زۆر بـەرچاو، وەکـو وتـوێژی نێـوان
ـیبرالـە کلاسـیکەکان و لیبرالـە کۆمەلایەتییـەکان هەیـە هـەتا ئاخـاوتنی نێـوان
ـاریزکاران و سۆسیالیستەکان. یەکێک لە دواقۆنـاخترین جیلوەکـانی لیبرالیـزم
کـە لەسـەر ئەندێـشەی سیاسـی کاریگەرییـەتی هەیـە، گەشـەی بـە تـەوژمی
فەلسەفەی سیاسی لیبرال، بەتایبەت لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایـە کـە لـە
ئیستەدا هۆکارە جۆربەجۆرەکان و دژایەتی لەگەڵ ئیـدئۆلۆژی لیـبرالی نیـشان
ـدەدا. نووسەرانێکی وەکو جـان راولیـز، رابـرت نووزیـک، رانلیـد دوو ورکـین،
مایکیل والزێرو کەسانێکی دی، لەلایـەنی جۆراوجـۆری ئەندێـشەی لیـبرالی، لـە
بابەتە گـەورەکان دەکۆڵـنەوە. نووزیـک زۆرتـر لیبرالـەکان بـەرەو تـاکخوازی
ئازادیخواز هان دەدا، هاوکات لەگەڵ ئەوە کە روالێز بە پەلەوتالووکە بـووە بـە
پیرۆزی لیبرالی کۆمەلگە. هەر تەنیا ئەو لیبرالانەی وەکو کێنز و بوریج نین کـە

له بریتانیا کاریگەرییەتیان لەسەر ئەندێشە و سیاسەتی حزبی کرێکارخۆیان بۆ کەتەن کردووە. تاقە مەسەلە دەربارەی ریشەکان و بوارە ئیدئۆلۆژیکەکانی ئەو زۆر زانیاری هەبێ. سەبارەت بە راولێز، نووزیک و هاویکیش لە بابەتی واتای سوننەتی لیبرالی ئەوەوە زۆر هەڵبژاردە و بەرتەسکە و بە هەڵبژاردنی ئەوەی کە روانگەی ئێستەی ئەو دەسەلێمنێ ئەوەی کە نایسەلمێنێ، سەرقاڵە. ئەم سروشتی هەڵبژاردنە، تێگەیشتنی ئێمە سەبارەت بە سوننەت بێهێز دەکا. مەترسییەکی دیکە لەم سوننەتە بەدیدەکرێ، سروشتی چیا لە مێژووی ئەوە کە دەڵێ ئەگەر و گریمانەمان بۆ داناوە کە ئەندێشەی لیبرالی، فەلسەفەیە یان میتۆدی فەلسەفی هەیە. بەم جۆرە، گریمانە لەسەر ئەوە دەکەین کە تۆژینەوەکانی ئەوان تەنیا بە چەند بەڵگەی لێکدانەوە و فەلسەفی بزانین. مەسەلەی گەورە لێرەشدا مەسەلەی زانیاری لەم بارەوەیە کە ئەمە هەر تاقە شێوەیەکی فەلسەفییە کە ریشەگەلی مێژوویی هەیە یان نا.

بایەخەکان و پلەوپایەکان و فیکرە لیبرالییەکان لە سەدەی حەڤدەیەم بەدوا جیاجیا بوونەوە. خودی ئیدئۆلۆژیش لە سەرەتای دەیەی ١٨٠٠ بە ناوی شێوەی ئەندێشە و خۆناسین و پێوەندی ئێمە لەگەڵ ئەم و ئەو فۆرمی گرتووە. ئەم رێبازە کاری کردووەتە سەر ئەندێشەی ئێمە، بەلام دەبێ دەربارەی جۆری بینینی ئەو بە ناوی حەقیقەتێک سەبارەت بە جیهان و جۆری مرۆڤ بەپارێز بین.

واژەی پارێزکاری، وەکو لیبرالیزم، زۆر جار دوو کارکردی ئاسایی و تکنیکی
هەیە. کارکردی ئاسایی هەمیشە دەگەڕێتەوە بۆ ئەندێشەی پارێز یان (دەست لێ
نەدراوی پارێزاوی شتێک). مێژووی ئەم ئەندێشە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی
چواردەیەم. نووسەرانی هاوچەرخ دەربارەی پارێزکاری، وەکو راسێل کرک و
رۆبرت نیسبت تەئکیدێکی زۆریان لەسەر ئەم پێگانەی سەدەکانی ناوەڕاست هەیە.
بۆ وێنە کرک شوێنی پێی پارێزکاری هەتا (کۆنسراتورەکان، کۆنسێرڤاتورەکان)
پیاولانی شارە قورِوون وستایەکان)، چووسر (شاعیر و شۆڕشگێڕی بە
ڕەوانگی ئینگلیسی) بێ هەوال و رێکخراوە دادپەروەری ئاشتی ئینگلستانی[1]
هەڵوادا چووە.

کارکردی راشکاوانەتری واژەی پارێزگاری، هەر وەکو لیبرالیزم، پێوەندی بە
ڕووداوی دوای شۆڕشی کە بیری فەڕانساوە هەیە. زۆربەی بیرمەندان لەسەر ئەم
بڕوایەن کە مێژووی دەقیقتری پێگەی سیاسی ئەم واژەیە دەگەڕێتەوە بۆ
سەرەتای دەیەی ۱۸۰۰ لە ئەمریکا کە بە ناوی سفەتێک بۆ وەسف و لێکدانەوەی
هەڵوێستی مامناوەندی لە کارەکان دەهاتە ئاراوە. بەم واتایە، هێندێ لە کۆمارخوازە
فیدراڵیەکانی سەرەتای ئەمریکا خۆیان بە پارێزکار دەزانی. لە فەڕانسا بۆ یەکەم
جار ئەم واژەیە بەناوی رۆژنامەی شاتووبریان Lc Conservatcur لە دەیەی ۱۸۲۰دا
بەکار برد. نەشریەی ئەو دەورە ناوبراوانە بۆ پشتگری لە ئەندێشەی کەنیسەکان و
گەڕانەوەی بارودۆخی سیاسی رابردوو تێدەکۆشان. لە بریتانیا سەرەتا لەم واژەیە
لە گۆڤاری quarterly Review لە ساڵی ۱۸۳۰ کەڵکی وەردەگیرا. لە ساڵی ۱۸۳۵ گۆڕا
و بوو بەناوی رەسمی حزبی توری. بلیک دەڵێ کە وەرگرتنی رەسمی ئەو لە ۱۸۳۲
بەدوا (هەوڵی وردبینانەی بۆ پاککردنەوە و سڕینەوە حزب لە پێوەندیە
رابردووەکانی بوو و ئەگەر نەڵێین بڕین لە رابردووە، لانیکەم نمادێک بوو لە
گۆڕانی ئەو).[2] لە دەیەی ۱۸٤۰ ئەم واژە لەسەرانسەری ئەورووپادا پەرەی سەند.
شۆرش و بەر خۆدان و ئاڵۆزییە سیاسییەکانی ۱۸۲۹ ـ ۱۸۳۰ و ۱۸٤۸ ئەندێشەی
پارێزکاری بەرەو مەترسیە شۆڕشەکان برد. ئەگەرچی بەرەو پیشەسازی چوون و
ڕەوەندی دێموکراسی بوونیش دەورێکی بەرچاوی گێڕا. ●

دیالۆگێکی درێژخایەن دەربارەی پێوەندی نێوان کارکردە سیاسییەکانی ئاسایی و تکنیکی ئەم واژەبوونی هەیە. زۆربەی لایەنگرانی پارێزگاری سیاسی، هێندێ ئیمتیازی تایبەتیان بۆ ریشەی هەستە سیاسییەکانی ئەو لە کارکردی ئاسایی ئەم واژە داناوە. ئەم خاڵە هەتا رادەیەک راستە کە هەموو ئێمە پاش خواردنی شێوێکی باش هەتا رادەیەک دەبینە پارێزکار. کۆمەڵێک لە پارێزکارە سیاسییەکان دەیانەوێ لەو کەش‌وهەوایە سوود بەرن، بەڵگە دێننەوە کە ئێمە (بەپێی سروشتی خۆمان) پارێزکارین. دەرەنجام، لەبەر ئەمە میتۆدە؛ پارێزکاری هەر مەسلەکی سیاسی نییە بەڵکو لە ریشەی سروشتی ژیانیشدا هەیە. وەها ئەندێشەیەک، گشت مرۆڤایەتی بە پارێزکار دەزانێ. گرفتی وەها بۆچوونێک، چۆنیەتی ئاشکرا کردنی لایەنگری لە هەموو ئیدئۆلۆژییەکان دەدرێتە قەڵەم کە هاوکات لەگەڵ لیبرالیزم و سۆسیالیزم سەری هەڵدا و لە هێندێ واتای ئەواندا شەریکە، دەیخاتە پشتگوێ و چاوپۆشی لێدەکا. لەم رووەوە، تاقمێک لە توێژەران دەرەنجامەکەیان بەدەس هێناوە کە کارکردی ئاسایی واژەی پارێزکاری بۆچوونێکی بێ بایەخ دەربارەی واتای سیاسی تکنیکی ئەو پێکدێنێ.[3] لەوەیکە هەوڵ بە پێهێنانی ئیدئۆلۆژییەکی یەککگرتوو، دەسکەوتی ساکار لە گومانی گشتی پارێزکاری هەم کاڵ و سەرەتایە و هەم بێسوودە.[4]

بەر لە دەسپێکی دیالۆگ دەربارەی پێگەکان و سروشتی ئیدئۆلۆژی پارێزگاری، دەبێ سەرنج بدەینە مەسەلەی گرێدراو بە پێناسەی ئەوەوە. نابێ وا بیر بکەینەوە کە قاڵبێکی دیاری و پێناسەکراو لە فیکرەکاندا وجوودی هەیە، هەموو پارێزکارەکان لایەنگری ئەوەن. لە راستیدا پارێزکارانێکی زۆر هەن کە حاشا لە نزیکی خۆیان بە باوەڕی ئیدئۆلۆژییەوە دەکەن. دەکرێ ئەم پارێزگارییە (دژی فەلسەفەی سیاسی) ناوبنرێ.[5] لە هێندێ شوێندا حاشا کردن لە ئەندێشە کەمتر دەتوانێ جێی موتمانە بێ و لە هێندێ شوێنی دیکەدا زۆرتر هاندەری ئەندێشەیە. پێنج تۆژینەوەی بەربلاو لە سروشتی پارێزکاریدا هەیە کە ناوەڕۆکەکانیان زۆر جۆراوجۆرە. پرۆژەی گشتی تۆژینەوە ناوبراوەکان دەکرێ بە شێوەی خوارەوە راڤەی لەسەر بکرێ: ئیدئۆلۆژی سەرمایەداری، هەڵوێستی ئیدئۆلۆژیکی کرداری،

ـوانگەی هەڵوێستی یـان بـارودۆخی، پارێزکـاری بـەپێی نـەریت یـان شـعوور، بـە گۆڕتی راڤەی ئیدئۆلۆژیکی.

ـە روانگەی یەکەمەوە، پارێزکـاری بریتییـە لـە بۆچـوونی زەوت کـراو بـەپێی کـردەوە لە خۆ نیشاندانی چـینی سـەرمایەداری خـاوەن زەوی وەکـو دەرەبـەگ، ـەتایبەت پاش شەڕ و شۆڕێک کە هۆکارەکەی شۆڕشی فەرانسا بوو. لەم قاڵـبەدا، پـارێزکاری دەوێکـی بـە گـوڕی مێژوویـی و ئـابووری بـەرچاوی گیـرا. پێناسـەی هەڵوێستی بەرگری رووخاوی چینی دەرەبەگایەتی بەرەو ئـاوابوون لـە کۆمەڵـگە ئەورووپایەکان بوو. لەم واتایەدا، کرانـەوە و بەرینبوونـەوەی نـەمانی پارێزکـاری ـەکری لە ۱۷۹۰ هەتا ۱۹۱٤ لەبەرچاو بگرین. لە بریتانیا، ساڵـی ۱۸۳۲ (زۆرتـر لـە ۱۹۱۰) هاوکات لەگەڵ سەرهەڵدانی رووبـە گەشـەی دیموکراسـی بـوون. خاڵـێکی ـوەرحەیاتی و گرنگ دەدرێتە قەڵەم. فراوانبوونـەوەی بـەخـشین مـافی پـرس، بـە پیشەسازی بوونی کۆمەڵگە و سەرکەوتنی ئەنجوومەنی یاسای دژی دەغڵ و دان ـە ـدەیەی ۱۸٤۰، گوشارێکی مەرگ ئاسا بوو بۆ حزبی توری. ئەمە روانگـەی ئـەو تـوێژەرانەیە کە جیاوازیان لـە نێـوان گـەڕۆکی جیهـانی دێرینـەتر و ئەندێـشەکانی پـش ۱۸۳۲ دادەنا. هەرکە بایەخی سیاسی و ئابووری ئەم چینە دەرەبەگە روو بـە ـەمان رۆیشت، ئایدلۆژی ئەویش سیس هەڵگەڕا و بێ رەنگ بوو و زیرەکانە، بەڵام جیراوانە جێی خۆی، بە کـردەوەو بـە لیبرالیزمـی کلاسـیک بەخشی، لـەم روانگـە پـارێزگاریەوە دەکرێ پەی بە دیـاردەی کـاتی دیـاریکراو و بەرتەسـکی مێژوویـی بـەرین کـە نوێنـەری حاشاهەڵـنەگری چینێـک بـووە کـە لـە بـاری سیاسـی و ئـابوورییەوە بە شێوەی راستەقینە روو لە ئاوا بوون بووە.

بەڵـگەی دووەم کـەمتر جێـی دڵخوشـییە. پارێزکـاری لـەم روانەگـەوە لـە پلـەی یەکەمدا بەپێی قالبێک لە پـراگۆماتیزمی سیاسـی دەزانـن، باوەڕێـک کـە نـاوەڕۆکـی ـردسەنی نییە. ئەم باوەڕە تەنیا سروشت و میتۆدی سیاسی، کەلتووری و ئـابووری بە نرخ لە خۆیدا دەتوێنێتەوە. ئێستە ئەوە کە هەموو مەرامە سیاسـییەکان هـەمیشە ـە حالی سەرهەڵدان و بەرەوپێش چـوونن. بـەم جـۆرە، تـا رادەیـەک بـە دروسـتی گوتراوە کە لە دوو سەد ساڵی رابردوودا، پارێزکاری هێـلە باوەڕییـەکانی خـۆی لـە

پشت ئیدئۆلۆژییه سیاسییەکان وەرگرت و جار نه جارێک پشتگریان لە یەکێک لە وانه دەکرد. ئەگەرچی ئەو هێڵه باوەڕیه باسکراوانه بە ئازموونی باشەوە لە ئاو دەرهاتوون و قبوول دەبوون، بەرژەوەندی وەرگرتنی شیاو بۆ هێڵه فیکری پارێزکاری بەدی دەهێنا. ئەو جۆره که هێندێ له بیرمەندان گوتوویانە، پارێزکاری هەم دەتوانێ له پێوەندی لەگەڵ خۆراگریدا بێ و هەم دەتوانێ پێوەندی نزیکی لەگەڵ فیکره توندوتیژه ئازادیخوازەکاندا بێ. بەم حالەوە، ئەم بەڵگانه دەربارەی ئەندێشەی وەرگیراوی پارێزکارانه له رادەبەدەرە.

روانگەی پراگماتیکی (پرەنسیپی مەزهەبی بەکردەوە) ناوبراو هێندێ جار دەکرێ لەگەڵ دوو راڤه لێک بدرێ. راڤەی یەکەم، واته روانگەی هەڵوێستی یان بارودۆخی، له راستیدا زۆرتر هاوکێشه لەگەڵ دیالۆگی ئاسایی لەم بارەوەیە.[٦] بەم بۆچوونە، بەلای تۆژدەران و رۆژنامە وانابەوە وا لە چاو دەدا کە بەتەواوی ناشارەزایان و نازانیاریانه له دەستەبەندیه پارێزکارەکاندا، بۆ وێنه لە دەروونی حزبی سۆسیالیستییەوە دەدوێ. لەم روانگەی پارێزگارییەوە، پێوەندی بە هیچ چین و توێژێکی تایبەت، رووداوی مێژوویی، پراگماتیزم یان تەنانەت هەڵوێستێکی تایبەتیەوە نییە. روانینی هەڵوێستی، وەکو روانگەی پراگماتیک، هیچ چەشنه پرەنسیپ و گەوهەرێکی دیاریکراوی نییه. هیچ ئارمانج یان ئارمانجێکی ژیاری کە بۆ ئەو بکەوێته چالاکی و بەرخۆدان، نییە. بە پێچەوانە، زایەڵە و رەنگدانەوەی هەڵوێستی بەرگری ئاگایانە و زانستانه لە هەر باوەڕێکی سیاسیدا بووەتە بنەڕەتی و بەردی بناخه. پرۆسە سیاسییه بنەمایی نەکراوەکان کە زۆرتر لە واقعیەتە سیاسییەکانی ئێسته هەنگاو هەڵدێننەوە و دەخوازن لەگەڵ فیکره هاوکێشەکان، جیهان له هێڵێکی تایبەتدا بگۆڕن، دوژمنانی سروشتی پارێزکاری دەدرێنه قەڵەم. پارێزکاران ئەو کەسانەن کە لە شێوەی بنەمایی کراوی ژیاندا ریشەیان هەیه و زاتەن له سیستەمی تایبەت پشتگری دەکەن. هەمیشه پشتگری له (بارودۆخ) کێشه و گێچەڵ لەگەڵ رێکخراوه فیکرییه بەرزەکان دێنێته ئاراوە. بەم جۆره، پارێزکاران، لایەنگری سیستەمی ئێستا، پێچەوانەی چۆنیەتی سیمای سیاسی ئەو، لە بەرامبەر گێچەڵ و بەهۆی سەرکۆنەکەر دەکەوتە ئاشتی و

ـرحەوە. لەگەڵ ئەم پێناسە بارودۆخە دەكرێ (پارێزكاری چەپ) یش بدوێین.
ـ چەشنە، ناوەرۆكێك بۆ ئیدئۆلۆژی پارێزكارانە لە ئارادا نییە. هەر چەشنە
ـیكی بنەرەتیكراو (چ كۆمۆنیزم چ لیبرالیزم) دەكرێ پارێزكار بن.

چو ـرەمین راڤە ئاوڕ لە خوو و نەریت دەداتەوە. لەم بارەوە دوو بەڵگە لە ئارادا
ـیە یەكەمیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو كێشەیەی سەرەتا كە پارێزكاری بە بەشێك لە
ـرشتی خودی ژیان دەزانێ. لۆرد هیوسسێل ئەمە بە (پارێزكاری سروشتی)
ـیر دەكا كە (نزیكایەتی سەرەتای مرۆڤ) پێناسە دەكا. ئەم سروشتە دژی
ـركێرییە و هەتا رادەی رەشبینانە سەبارەت بە هەر شتێكی نەناسراو و
ـرچوە دەگرێ و زۆرتر وەبیر هێنەرەوەی ئازموونە هەتا عەقلی بۆچوون.[7]
ـلی گرنگ ئەوەیە كە پارێزكاری بەپێی ئیدئۆلۆژییەك چاوی لێ نەكراوە؛ زۆرتر
ـری و میتۆدی سروشتی بوونەوەری مرۆڤە كە داب و نەریتەكان یان ئامێرە
ـرموونكراوەكان بە داب و. نەریت و ئامێرەنوێكان رانەهاتووە، دەگۆڕتەوە و
ـوری بە وان گرتووە. ئەم فیكرە بە ئاسانی دەبڕێتە پانتای سیاسەتەوە. كردار یان
ـكخراوە دامەزراوە ناتەواوەكان بەسەر هێندێ شتی خۆیاندا دەسەڵاتیان هەیە.

ـەڵگەی دووەم پشتگری فەلسەفی پێچراوەتری سروشتی لە پارێزكاری
ـیـوەتە ئاراوە. ئەم پشتگرییە دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی زیرەكانەی نێوان
جۆرەكانی عەقلی (عەقلی بۆچوونی و كردەوە) و هەروەها هەڵگری هۆكاری
ـەرهەڵدانی مرۆڤایەتییە. لێرەدا بەڵگەی خولقێنەر، بەڵام لە لەرێ لابەری ئازادییە.
پشتگری فەلسەفی لە رەسالی خوو و خدە لە لایەك باوەڕی هەیە كە پارێزگاری
ـیرەدیەكی جیاواز لە ئارمانجی سروشتییە، لە لایەكی دیكەوە تێدەكۆشێ ئێمە بە
حەقیقەتی ئەم فیكرە لەگەڵ بەڵگەی سەر ریژ لە پرەنسیپی ئارمانجی بە قەناعەت
ـگەینێ. لەم رووەوە كە لەسەرەتادا ئەوەیان بە (سیاسی، دژی فەلسەفی) ناو
ـدبرد. ئەگەرچی واژەی (فەلسەفە، دژی فەلسەفە) لە رواڵەتدا بۆ ئەو پڕبەپێستە.
ـەڵگەی پێچراوەتر دەربارەی نزیكایەتی پارێزكارانە، چوارمین راڤەی
ئیدئۆلۆژیكی بە خۆوە پێچاوە.

لەم وتارە ئاخرەدا، پارێزگاری ئیدئۆلۆژییەکی بێ سەرپۆشە کە لەگەڵ هیچ چەشنە تێبینییەکی پراگماتیک یان بارودۆخێک ناتوانێ سازگار بێ. نە لەگەڵ کەش‌وهەوای مێژوویی خۆی پێناسە دەکرێ نە پێویستانە لەگەڵ هیچ چین و توێژێک هاوپێوارەی ناسینەوەیە. لە هەر چەشنە نزیکایەتییەکی سروشتیش بە دوورە. لێرەدا کۆمەڵێک لە فیکرەکان لەگەڵ ناوەرۆکێکی بینایی تایبەتییە. زۆرکەس ئەدموند بەرەک بە دامەزرێنەری ئەم ئیدئۆلۆژییە دەزانن کە ئەمڕۆ زۆر ناو بەدەرەوەیە. لەم روانگەوە، پارێزکاری هەمیشە تێکۆشاوە دژایەتی لەگەڵ هێندێ لە فیکرەکان بکا کە زۆربەیان لە کەش‌وهەوای شۆڕشەکاندا سەریان هەڵداوە و کەڵکیان لێ وەرگیراوە؛ واتە، هەڵگری بە کەماڵ گەیینی جۆری مرۆڤ لە لایەن بەدی هێنانی گۆڕانکاری کەش‌وهەوای کۆمەلایەتی و سیاسی، جۆراوجۆری سروشتی مرۆڤ و داهاتە ئابووری و سیاسییەکانی ئەم فیکرانە، باوەڕ بە سەرکەوتنی عەقڵ و شعووری مرۆڤ لە جیهان؛ بێبایەخانە یان بە کەم‌زانینی دەسەلات، پلە، رێچکەی یەک بە دوای یەک و سوننەت. لە سەرەتا، لە فەرانسا و ئەڵمانیا نووکی تیژی رەخنەی پارێزکاری رووی لە فیکرە پرنسیپە رۆشنگەرییەکانی سوننەتی فەیلسووفەکان و بەدوو بەرەکی بوونی (ئینشعاب) توندوتیژی ئەو، واتە ژاکۆبینیسمی شۆڕشگێڕ بوو. لە بریتانیا، بە سوننەتی لیبرالی رادیکاڵی (پین و پرایس) و پاشان بە فیکری ئابووری زانانی قازانج باوەڕ و لیبرال هێرشیان کرایە سەر. سەرەنجام، لە سەدەکانی نۆزدە و بیست، شێوە جۆراوجۆرە سۆسیالیستەکان بوونە هۆی ترس و نیگەرانی رێکخراوە پارێزکارەکان.

دەربارەی تێگەیشتن و زانیاری جیا لە ئیدئۆلۆژیکی پارێزکاری دیسان دیالۆگمان دەبێ و کارتێکراوی و هەمەلایەنە بوونی ئەو ناتوانین لەبەرچاو نەگرین. هەروەها باشترە بنووسین کە لەگەڵ ئەم بەڵگە دیسان بە دیالۆگ دەربارەی هەموو ئیدئۆلۆژییەکان رووبەڕوو دەبینەوە. پاش ناوبردنی مەسەلەی پێناساندنی پارێزگاری، پاشماوەی بەشەکە تایبەت دەدەین بە لایەنە دواکەوتووەکەی ئیدئۆلۆژیکییەوە.

## پێگەکانی ئەندێشەی پارێزکاری

زۆربەی ئەو نووسەرانەی کە دەربارەی پارێزکاری بابەتیان نووسیوە، -وەریان هەیە کە خاڵی گرنگی راستی ئەندێشەی پارێزکاری، شۆڕشی گەورەی مەرنسا بووە. ئەمە رووداوی فەڕانسا بوو کە تۆوی کردەوە لە خۆنیشاندانە بە -وبانگەکانی ئەدموند بەرەکی چاند، هەڵبەت، لە دەیەی ۱۸۰۰ دایە کە یەکەم ـکردی وشەی پارێزکاری بە واتای سیاسی دەبینین. بەم حاڵەوە، هێندێ تۆیژەر ناوەرۆکە گرنگەکانی بەر لە ساڵی ۱۷۸۹ی (شۆڕشی فەڕانسا) دەبینن کە هەرچەند ئاگاهانە پارێزگارنین، بەڵام دەستێکی کەمیان لە پێکهێنانی پارێزکاریدا ـبووە. دەتوانین ناوی ئەوە بنێن (پارێزکاری نائاگا). لە وەها کێشەیەکدا لایەنی حەعل و نەسخکراو وجوودی هەیە.

دەسپێکی سەرەتای پارێزکاری لە ئەندێشەی یۆنانی و رۆمیدا دیتراوە. ـۆرجار نووسەران لەم بارەوە ناوی ئەفلاتوون و رەواقیونی رۆمی دێنن، هەرچەند ناوی ئاریستوفانی شانۆنووسیش لە کتێبی راسڵ کرکدا بەرچاو ـدەکەوێ.[۸] هەڵبژاردەیەک لە نووسراوەکانی پارێزکاری کە لە ساڵی ۱۹۷٦ بڵاو کراوە لەگەڵ چەند هەڵبژاردە لە کتێبی کۆماری ئەفلاتوون دەسپێدەکا.[۹] نووسەرێکی دیکە دەڵێ: (گرنگ ئەوەیە کە یەکەمین کار دەربارەی پارێزکاری ـدەسپێکەکەی لەگەڵ کتێبی کوماری ئەفلاتوونە)[۱۰] خولی دەسپێکێکی دیکە سەدەکانی ناوەڕاستە، هەرچەند دژوارە کە بەو تەوسیفەی مۆزتۆن ئۆیرباخ لە کتێبی پۆلیکراتیکوس، نووسراوەی جان سالیسبوری (سەدەی دوازدەهەم) بە ناوی بەرهەمی (تەنیا پارێزکارانە) باوەڕ بکەن.[۱۱] تەنانەت زۆرتر توندوتیژی لە خۆنیشان دەدا و سەرجەم بزاڤی پارێزکاری سەدەی نۆزدە و بیست لەژێر ئاڵای سەدەکانی ناوەڕاست دەشارێتەوە. بە بۆچوونی نیسبەت، بەرەک بە ناوی کەسێکی (وگ) بناسین، کارێکی تاوانە. بەرەک بە راستی تێدەکۆشا بۆ ئەوە کە جەماوەری گەرەک و ناوخۆ و پێکهاتەکانی یەکگرتووە مەدەنییەکانی کۆمەڵگەی دەربەگایەتی زیندوو کاتەوە. زۆرینەش بۆچوونە یاسایە سروشتییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستیان بە دەسکردی بەرەک دەزانی، بەڵام ئەمە دیالۆگێکی

جیاوازە.[١٢] کەلتووری سەدەکانی ناوەڕاستیان خوازی نوێش لـە ڕێکخراوەگـەلێکی وەکو (ڕێکخراوە ئینگلستانی نوێی ئیسرائیکی) نێوانی سەدەی نۆزدەیەم دیتراوە. پۆل سمیت ئەو ڕێکخراوە بەناوی (زیندووکەرەوەی دەربەگایەتی) پێناسە دەکا.[١٣] زۆر لە توێژەرانی دوایی لە خوێندنـەوەی سـەدەکـانی نـاوەڕاسـت خوازانـە هـەم بەرەک و هەم پارێزکاریان بە کارێکی درۆزنانە و دوور لـە شـعووریان زانیـوە.[١٤] لـەم جـۆرە ڕوانگانـەوە پڕەنسیپێکی بـەهێز لـە حەسـرەتی ڕابـردوو، بـەرەودوا گەڕانەوەخوازی مێژوویی و خەیاڵی خاو بوونی هەیە.

ئەم بەرەودوا گەڕانەوەخوازییە مێژووییە لە خولەکانی دوایشدا درێـژەی دەبـێ. لە حاڵێکدا کە کێت فیلنگ و هیوسیسل بەناوی خولی (ریفۆرمات) سەرنجیان داوەتـە سەرچاوەی ئیدئۆلۆژی پارێزکاری، نووسەرانێکی وەکو ئانتۆنی کینتۆن، هانتینگتۆن و رابرت ئەکلشال لەگەڵ ریچارد هۆکر و ئیلبزایت ستلمنت دەست پـێ دەکـەن.[١٥] بـە بۆچـوونی ئەکلـشال، هـۆکر بـاپیرەی پارێزکـاری دەدرێتـە قەڵـەم. بـەپێی نووسـراوەکانی ئـەو (خـەتێک لـە پێشکەوتەکان لـە لایـەن هـۆکر و فیلمـرەوە لـە پێکهێنانی حزبی تۆریدا لە بەشی کۆتایی سـەدەی حەڤدەیەمدا وجـوودی هەیـە).[١٦] ئەو هێرشی هۆکر بۆ پورتینەکان (پاک دینەکان) لەگـەڵ هێرشـی دوایـی بـەرەک بـۆ سەر ژاکۆبنەکان لە یەک پلەدا دەبینێ.[١٧] لەگەڵ ئەمەدا، فرانک ئۆگورمـەن گوتویـەتی کـە ڕیـشەداکوتن و مانـەوەی دەورانی ئـەلیزابتی بـێ (دوور نـوێنی مێژوویـی دەربارەی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتی و سیاسییە تایبەتییەکانی پارێزکاری نوێیە).[١٨]

هەموو توێژەرە بنەڕەتییەکانی ئیدئۆلۆژی پارێزکاری لە باوەڕی مافی ئیلاهـی و ڕێبـازی بـاوکسـالاریدا دەبیـنن. بـە بۆچـوونی گـوردون شـوکت، کتـێبی باوکسالاری نووسەراوەی فیلمرستۆن چەنـدین جـار ئەندیـشەی تـۆری دەدرێتـە قەڵەم.[١٩] گوتراوە کە باوەڕی مافی ئیلاهی، کە چارەنووسی حکوومەت بە دەستی خودایە، پێچەوانەی خـۆڕاگری و فەرمانبـەری کارتێکراوانـە لـە ئەرکـە دینیەکانـە، کۆمەڵگە بۆ مرۆڤەکان سروشتی و وەکو بنەماڵەیەک لەگـەڵ یـەک بـە دوای یەکـدا سروشتی زاتییە، هێشتا لە ئەندیشەی پارێزکاری سەدەی نۆزدەیەمـدا ماوەتـەوە. لە دەروونی پارێزکاریدا باوەڕ ڕەنگـە دەربـارەی سـەرچاوە و مـاک بگـۆڕدرێ،

ـەلام دەربارەی جەوهەر و چۆنیەتی پیرۆزی دەسەلاتداری و دەسەلاتی میللی
ـگۆردریّ. دەسەلات هەر تەنیا لە سەلتەنەتەوە بۆ پارلەمان گۆڕا بوو.[20]
ـوگورمەن لەگەڵ کێشەی پاشایەتی لە دەیەی ١٦٦٠دا هەیە، واتە کاتێ کە واژەی
ـتۆری) کارکردی سیاسی بە دەس هێنا. ئەو جۆرە کە خۆی دەڵێ: (بەنرختر
ـەوەیە کە بڵێین سەرهەڵدانی بینینی تایبەتی (تۆری) لە سیاسەت لە نیوەی
ـدووەمی سەدەی حەڤدەیەم لە مشتومڕ کردن دەربارەی پاشماوە و
شەجەرەنامە درۆینەکان باشترە).[21] ئەوانەی دیکە لە رواڵەتا (خۆڕاگری) ساڵی
١٦٨٠ بە شێوەی ساتێکی بە بڕشت قبووڵە. مارکی ئاو هالیفاکس زۆر جار بەناوی
کەسایەتییەکی سەرەکی پارێزکاری لەم قۆناغە ناسراوە. هەرچەند کە
ـەترسییەکی زۆر لە هەموو ئەم فیکرانەدا وجوودی هەیە. عەقیدەی ویگەکان و
تۆرییەکان پاش ١٦٨٨ پێوەندییەکی نزیکیان پێکەوە بوو. هیچ کام لە رێکخراوەکان
بە واتای نوێ حزب نەبوون. ئەوانە نە سیستەمێکی رەسمیان بوو و نە
بیوارەیەکی دروست بۆ بە ئەندام بوون. باشترە ناوی یەکگرتوانی بەرژەوەندی
گورانکاری لەوانە بنێین. کۆشش بۆ ناسینی هەڵوێستی پارێزکارانەی خۆڕاگر لەم
ـدورانە نادروستە.[22] هەروەها باشە لە بیری نەبینەوە کە بەرەک لیبرال بوو نەک
تۆری. ئەو هەم لایەنگری بە شەوقی شۆڕشی ساڵی ١٦٨٨ بوو و هەم لایەنگری
کۆچەرەکانی ئەمریکایی لە دەیەی ١٧٧٠. ئەو، بە پێچەوانەی تامپین، دەیویست لە
نیوان ئەم شۆڕشانە لەگەڵ شۆڕشی ١٧٨٩ (فەرانسا) جیاوازی دابنێ.[23]

یەکێکی دیکە لە فەیلسووفەکانی سەدەی هەژدەیەم کە نووسەرانی پارێزکار
زۆرجار بە شێوەی کەسایەتییەکی دامەزرێنەر ناوی دەبەن، دیویی هیومە،
ئەگەرچی ئەو زۆرجار فیکری لیبرالی لە مێشکدا گەڵاڵە کردبوو، دەربارەی هیوم
باوەڕەکان جۆراوجۆرە. کۆمەڵێک لە نووسەرەکان بە شێوەی ئیلهام بەخشێکی
گەورەی ئەندێشە پارێزکاری رێزیان بۆ ئەو دادەنا.[24] نووسەرێکی دیکەی
پارێزکار، یان گیلۆر، دەربارەی هیوم دەنووسێ: چۆن دەکرێ پاوێک کە
گومانەکانی هۆکاری رەتکردنەوەی خودا، رۆح، موعجزات، یاسای سروشتی،
ماددە و جستوجۆکراوە، بە پارێزکارێکی باش بناسرێ؟)[25] جیاواز لە مەزهەب

بوونی قووڵ و گومانە وێرانگەرەکانی هیوم هەمیشە بەزاری پارێزکارەکان خۆش نەبوو. دۆکتۆر جانسۆن تەنیا کەسێک نەبوو کە لە وتوویژ لەگەڵ بۆس وڵ، هیومیان بە (تۆرییەکی ئیتفاقی)[٢٦] دادەنا.

زۆربەی توێژەران لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە ئیدئۆلۆژی خودئاگای پارێزکاری وەڵامێک بوو بۆ شۆڕشی گەورەی فەڕانسا. خولی ١٧٨٩ هەتا ساڵی ١٩١٤ زۆرجار بە خولی گەشەکردنی ئەندێشە و کرداری پارێزکاری دانراوە.[٢٧] شۆڕشی ساڵی ١٩١٤ هۆکاری سەرهەڵدانی کتێبی بەناوبانگی بەرەک، بەناوی تێرامان، و هەروەها سەرهەڵدانی خودی وشەی (پارێزکاری) بوو. نووسەرانی ئەورووپایی هاودەنگ لەگەڵ پارێزکاری وەکو کالریج، مایستێر، بوونالد، لاموونەیَ، شاتۆبەریان، نوو والیس و مولێر، هەموویان باوەڕی خۆیان لە پێوەندی لەگەڵ ڕووداوە شۆڕشییەکان ڕوون کردەوە و زۆربەیان بەرەکیان کردە سەر مەشقی خۆیان. هەڵوێستی بەرەک لە ئەندێشەی پارێزکاریدا، چ بۆ ستایش بۆ ستایشکارەکان و چ توێژەران کەم و زۆر تا ئەمڕۆ بەرچاو و پێشڕەو ماوەتەوە. بە بۆچوونی بەرەک، شۆڕشی فەڕانسا بە شێوەی ڕەوەندی بەربلاو و نویَ بوو. ئەم شۆڕشە هەر ئەو خوو و ڕەوەشتی شۆڕشەکانی ١٦٨٨ و ١٧٧٦ بوو. فیکرەکانی کانوونی شۆڕشی فەڕانسا ئەمە بوو کە مرۆڤەکان هەم یەکسان و هەم ئاشتیخواز بوون. ئەم سازگارییە بە بۆچوونی شۆڕشگێران دەکرا لەگەڵ پەروەدەی عەقڵی مرۆڤ و سامانبەخشین بە ڕێکخراوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان بە ڕاستەقینە بگەن. بە بۆچوونی بەرەک، ئەم فیکرانە هەڵگری واتا دەروونییە قووڵەکان بۆ سیاسەت بوو. هەر ئەو واتا دەروونیانە بوون کە ئەو و پارێزکارەکانی دوایی لەبەرامبەر ئەواندا دەوەستان. ئەم وەستانە بە هەڵاواردنی ڕاستەقینەی ئیدئۆلۆژی پارێزکاری فۆرمی گرت.

تایبەتمەندی مێژووی دواییی پارێزکاری لە سەدەی نۆزدەیەم، کۆمەڵێک ناوەڕۆکی ڕووخاو بوو. پارێزکارەکان، بەتایبەت لە بریتانیا، تێدەکۆشان هەتا خۆیان لەگەڵ گەشەی دیموکراسی ڕێک خەن. بەڵام ڕێگا هەموار نەبوو.[٢٨] پارێزکارەکان زۆر جار حەزیان لە دەسەڵاتی خەڵک یان مافی پرسیگشتی پیاوان

نەبوو. ئەوان بە نەریتی خۆیان (خەلک) یان لە جەماوەری (هەمەلایەنە) و بێ سەر و پا بە جیایان دەزانین. خەلکێک کە سامان و ملکیان بوو تا رادەیەک دەیانتوانی نوێنەرانێکیان هەبێ، بەلام خەلکی ساکار یان بێ سەر و پای هیچنەزان وەها مافێکیان نەبوو. سبات و هۆگر بە خێری گشتی کۆمەلگە پێوەندی بە خاوەنداریتی مال و ملکەوە بوو. نووسەرانێکی وەکو ماتیو ئارنۆلد، تامس کارلایل، سەرهنری مین و و.ە.لکی و بەتایبەت سیاسەت زانانێکی وەکو لۆرد سالیسبوری هێستا لە سەدەی نۆزدەیەمدا نیگەرانی مافی پرسی جەماوەری ساکار و نەزان بوون. بەرەک تەنانەت دەرەبەگەکانی بە چەندین پەلی تر دابەش دەکرد و بە (نوێنەری بەکردەوە) باوەڕی بوو. واتە (ئەمە کە تەنانەت بێ ئەوەی رادەی مافی پرس ببێ، تاکەکان دەتوانن (بەکردەوە) بە هۆی ئەم و ئەوەوە لە کۆمەلگەدا نوێنەریان بێ).[٢٩] بەرەک رادەی پرسی دەرەبەگەکان هەتا رادەی چوار سەد هەزار مەدەنی پێ دەزانی. لەگەل ئەمەدا، پارێزگارە ئینگلیزییەکان بە کردەوە لەگەل دیموکراسی زۆرتر لە هاوکێشە ئەوروپایەکانی خۆیان هاتنە ئاراوە.

پارێزکارانی سەدەی نۆزدەیەم دەربارەی پیشەسازی بوون و بەرەو سەرچوونی ئابووری سیاسی لیبرالی زۆر دوو دل بوون. لە ڕێبازی پارێزکاریدا، لە موزر و کالریج بگرە هەتا کابت و دیزرائیلی و چارلێز موراس، ت.س. ئەلیوت و کریستۆفر داوسۆن لەم سەدەدا بزاوتێکی بەهێزی دژی پیشەسازی و دژی تاکخوازی وجوودی بوو. پیشەسازی بوون و تاکخوازی بە واتای زەوالی کۆمەلگە، سوننەت، سیستەم و دینە. لەبەر ئەمە، بە جۆرێک هێلی فیکری پارێزکاری ئاشکرا دژی سەرمایەداری بوونی هەیە.[٣٠] بەم حالەوە، بارودۆخی سیاسی حزبی پارێزکار لە بریتانیا لە سەدەی بیستەمدا لەسەر بنەمای شیاوی سازگاری و دۆزینەوەی سازشی سەرهەمبەندی لەگەل خورەوشتی پیشەسازی و دیموکراسی بووە.[٣١]

## جەوهەری پارێزکاری

سێ پانتای بەرین و فەراوان لە موتالای پارێزگاریدا هەیە: پانتای دەولەتی نەتەوەیی)یان دەولەتی نەتەوە) مێژوویی، پانتای زەمانی و پانتای فیکری. هەلبەت

ئەمانە لەگەڵ یەکدا لەمپەری کۆ نین. ئەم سێ پانتایە لە هێندێ موتالادا بە چەشنێکی بەرچاو زۆرجار دووچاوی تەوژم دەبن و دەکەون بەسەریەکدا. هیچ کام لەم پانتایانە، جگە لە لایەنێک لە روانگەی فیکرییەوە، هیچ هەڵوێستێکی جیاواز، یان هەڵوێستێکی پێویستانەی پارێزگارانەیان نییە.

لەسەر بنەمای ئەندێشەی دەوڵەتی میللی و مێژوویی، پارێزگاری هەر تەنیا دەکرێ لە ئاستی بارودۆخێکی تایبەتی مێژوویی و کەلتووری دەوڵەت، بەراستی نەتەوە دابەشی بکرێ. بە وتەیەکی دیکە، ئێمە لەگەڵ پارێزگاری ئەڵمانی، بریتانیایی و فەرانسەوی رووبەڕووبوونەتەوە نەک لەگەڵ ئەندێشەی بەرین و هەمەلایەنە. ئوسولیڤان لەگەڵ ئەم بابەتە یاری دەکا، بەلام بە تێکەڵاوی ئەو لەگەڵ تەئکیدی فیکری لەسەر عەیبەکانی خەریکە. بەم جۆرە پارێزگاری فەرانسەوی لە سەرەتادا زۆرتر روانگەی مەزهەبی و ئەخلاقی بوو و بانگەشە بۆ پلە و سیستەمی دین دەکرا. لە بەرامبەر و پێچەوانە، پارێزکاری ئالمانی بە روانگە متافیزیکی و مێژووییەکانەوە کە لەسەر ئەندێشەی فەلسەفەی مێژوویی زۆر تەئکیدی دەکرد، بەرەو ئەوە چوو. کارول مانهایم لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا بوو و دەیگوت لە پارێزگاری ئەڵمانیدا لەگەڵ (بەرینبوونەوەی فەلسەفە خالگەلێک کە بەرەک هێنا بوویە ئاراوە، رووبەڕووبووینەتەوە کە لەگەڵ پرەنسیپی ئالمانی تێکەڵ بوون... ئەوەیکە فەڕانسا بۆ سەردەمی رۆشنگەری پلە بە پلە ئەنجامی‌دا، ئالمان لە لایەن ئیدئۆلۆژی پارێزگارییەوە بەوە گەیشت و دەسکەوتی عەقلانی و مەنتقی خۆی لەو وەرگرت).[٣٢] دەرەنجام، لە بریتانیا روانگەی گومانلێکراو و ئەزموونی دەبینین کە لە بابەتی فیکرییەوە ئالۆز و چەواشە، لە ئاشتی و سولحدایە و یەکگرتوویەکی کەمتری هەیە، بەلام لە سەرەنجامدا بە ئامانجی سیاسی خۆی دەگا.[٣٣]

لەم پانتادا چەند بایەخێک وجوودی هەیە. لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئامەریکا لە راستیدا زۆر لە پارێزگارەکان ئاشکرا پشتگری لیبرالیزمی کلاسیک بوون. بە بۆچوونی لوئیس هارتێز، (ماف) لە ئەمریکا لە سوننەتی لیبرالیزمی خاوەنداریتی گەورە وێنەوەردەگرێ دەکا.[٢٤] کەسانێک لە ئەمریکا، لە دەیەی ١٩٣٠ لە باوەری

ـ..ـرالی کلاسیکی سوننەتیدا دژی (پرۆژەی نوێ) پشتگری کردبا، بەرچەسپ و ـ..ـرکی پارێزکاریان پێوە دەچەسپاند، ئێستە ئەوەکە رۆزۆلت و وودرو ویلسۆنیان ـە ..ـبرال دەزانی.[٣٥] لە ئالمانیش مەسەلە تایبەتییەکانی یەکگرتوویی سیاسی لە ـسەدەی نۆزدەیەم، هەڵوێستی زالبوونی یۆنکرە سەرەڕۆ پرۆسییەکان، پانتای ـ..ـفیزیکی بە تەوژمی بیرمەندانی پێشڕەوی ئەوان، بە شێوەی حاشا هەڵنەگر ـ..ـنگی پانتای ئیدئۆلۆژی پارێزگاری بە خۆوە گرت. لە کۆتایی دەیەی ١٩٢٠دا ـ..ـربەی ئەندێشە ناسیۆنالیست و پارێزگارەکان لەژێر کاریگەرییەتی ناسیۆنال ـوسیالیزمدا بوون.[٣٦] بابەتە ناوخۆیی و بوومیە مێژوویی، کەلتووری و ـ..ـسییەکان لە زۆربەی وڵاتەکان لەسەر خوو و سروشتی پارێزگاری شوێنی ـ..ـوە.

پانتای دووەم، پارێزگاری بەپێی خولە زەمانییەکان پلەبەندی دەکا. پلەبەندی حو..ـەکان تێکشکان و سەرکەوتنی حیزبە پارێزگارەکان دەکرێتەبەر. لە بریتانیا، ـ..ـرێزگاری پیلیت جێی خۆی بە دیزرائیلی، سالسیبووری بەخشی و هەر ـ..ـوشێوەی درێژەی بوو هەتا (ڕێگای سەربڕ) مەک میلان و سەردەمی مارگارێت ـ..ـچیر لە دەیەی ١٩٨٠. هەرکام لەم قۆناغانەی پارێزگاری مۆر و هێمای تایبەتی کەسایەتیە دەسەڵاتدار و پێویستەکانی ئەو سەردەمەیان بە تەوێڵەوەیە. وەها ـ..ـبەشکارییەکی زەمانی لەگەڵ ئەوەیکە تێگەیشتنی ئاسانترە، دەتوانێ ڕێکبوونی ئیدئۆلۆژیکی تووشی گوکان بکا.

دوایین لێکدانەوە لەسەر پارێزگاری دەگەڕێتەوە بۆ پلەبەندی فیکری. دوو هەڵوێستی گشتی دەربارەی ڕوانگەی فیکری دەکەوێتە بەرچاو. یەکەمیان بەڵگە ـ..ـنێتەوە کە باوەڕی بێخەوش لە پارێزگاریدا بوونی هەیە، تەنانەت ئەگەرچی ـ..ـیشەگەلی فەلسەفەی جۆراوجۆریشی بێ. ڕێبازە پارێزگارییەکان بوونیان نییە؛ ـ..ـەبەر ئەمە، هەوڵدان بۆ پلەبەندیە جۆراوجۆرەکانی پارێزگاری بێسوودە.[٣٧] دووەم، کە ڕوانگەیەکی گشتیترە، باوەڕی بە ڕێبازە جیاوازەکان لە پارێزگاریدا هەیە. ڕەنگە ـ..ـە بابەتی شێوەی بایەخ و فیکرەکانەوە جۆرێک یەکگرتوویی بوونی بێ. بەڵام شێوەیەک کە ئەم فیکرانە لێکی دەدەنەوە لەوانەیە بە دەرەنجامێک لە ڕیشە

جۆربەجۆرەکان بگـا. گـرفتی ئەندێشەی دوایـی ئەوەیـە کـە هـەموو جـۆرە سەرسـوورهێنەرەکان لـە نـاوەڕۆکـە ڕەدەبەندییەکانـدا هەیـە. جـاری واهەیـە پارێزگارەکان جیاوازی لە نێوان تورییـەکان، سـوننەت پەرسـتان و کردەوەخـوازان دادەنـێن. دەتـوانین لـە دەروونی پارێزگاریـدا پلەبەندیگـەلێکی دوولایەنـە ببیـنین، پارێزکـارانی کۆخـواز و ئـازادیخواز یـان پارێزگـارانی بنـەڕەتی و پـڕاگماتیک.[٣٨] پلەبەندی سێ لایەنەش هەیـە، پارێزگـارانی دواکـەوتووخواز، لایـەنگری بـارودۆخی ئێستا و سوڵحخواز، یان پارێزکارانی ئەزموونخوازی لیبرال، پارێزگـارانی شـاهیدی لیبرال.[٣٩] ڕەدەبەندیگەلێکی بەربلاوتریش لە ناوەڕۆکەکانی پارێزگاریدا هەیە.[٤٠]

ئاشکرایە کە لێرەدا تـا ڕادەیـەک هـاوبۆچوونی دەکەوێتـە بـەرچاو. بـۆ واتـا بەخشین بە جۆرەکانی ئەندێشەی پارێزگاری پێویستە سـەرنج بدینـە ڕەدەبەنـدی پێنچ لایەنی: سوننەتخوازی، ڕۆمانتیـک، بـاوکسـالاری، لیـبرالی و پارێزگـارانی (ڕاستی نوێ)و لەم پانتادا تاقمی دوایی لە هەموویان نوێتر و دیالۆگ هەلایسێنترە. لەگەڵ ئەمەدا، هیچ کام لەمانە بەتەواوی دەستەی داکووژێنەر نادرێتـە قەڵـەم. ئـەم تاقمانە هەمیشە لە کاری یەکتردا دەسـتتێوەردانیـان هەیـە و لـە زۆرکاتـا هەڵـگری سەرنجی تایبەتین.

پارێزگاری سوننەتخواز زۆرترین واتا گشتییەکان بۆ داب و نەریت، گرێبەسـت و سوننەت لەبەرچاو دەگرن. ئەمە پارێزگارییە کە زیادە لە هـەموو هۆگریمـان بـە بیچمی ڕایجی بەرەک گرتووە. عەقڵی بۆچوونی زەبوون دەدرێتە قەڵـەم و لەگـەڵ دەمـارگرژی و عەقـڵی کردەوەیـی ڕووبـەڕوو دەبێتـەوە. یاسـای بنـەڕەتی و دەسەلاتی یاسا دەسکەوتی مرۆڤ نییە بەڵکو دەسـکەوتی سالـیانێکی کـردەوەی بەسـەریەکدا کـەوتووە و هەڵـگری پێـشبینی نییـە. ئەگـەر ئاڵـوگۆڕێک ڕوو بـدا بەرهەمی ئەندێشەی مەنتقی پەسندی عەقلانی نییە بەڵکو بەشـێوەی سروشـتی لـە سوننەتەکانی کۆمەڵگەوە هەڵقوڵاوە. ڕێبەری، دەسەلات و پلەریزکـراوەکـانی نـاو سروشـتن. هـەر بـەو سـاکارییەی کـە پـشوو دەکێـشین دەسـت دەکـەین و فەرمانبەری. ئیرادە و مافەکانی ئێمە ریشەیان لە ڕێ و ڕەوشە کۆمەلایەکاندایە.

پاریزگاری رۆمانتیک تایبەتمەندی تایبەتی زۆر لە بیرمەندانی ئالمانی وەکو یوستوس موزر، ئادام مولێر، ئەشلگێلەکان. فریدریش نووالیس و هەروەها پارێزگارە ئینگلیسەکان وەکو س.ت. کالریج، ویلیام وردت ورت، سەروالێتر سکاتۆ ویلیام کابێت و ت.س. ئەلیۆتە. بەلای زۆرینەی ئەم بیرمەندانەوە حەسرەتێکی زۆر بە رابردووی ئارمانجی کراوی سەردەمی شوانی، گوندنشینی و ویچووی دەرەبەگایەتی تووش دێین کە لەگەل یۆتۆپیای کە دەبێ لە کۆمەلگە بەرقەرار بێ، تێکەل بوە. ناوەرۆکی گشتی ئەندێشەی پارێزکارانی رۆمانتیک، پێکهێنەری کۆمەلگەی دژە پیشەسازی بوو. ئەوانە لە ناخەوە لە شعووری پارێزگانی و بایەخە بەیانکراوەکانی ئەو رەخنەیان دەگرت. ئابووری سیاسی لیبرال لە بناخەوە بە ناجۆر لەگەل سروشتی مرۆڤ دەزانرا. پارێزگارانی رۆمانتیک لەگەل شێوەیەکی ژیاندا بوون کە سادەتر، مەزهەبی، و تێرکراو لە هەستەکانی کۆمەلگە بێ. بە شێوەی پارێزگاری سوننەتخواز خوازیاری پلەبەندی سروشتی بوون کە لەودا ورە جوامێری خانەدان و بایەخی پالەوانانێکی وەکو زۆربەی کەسایەتییە دیرۆکەکانی ئەسکات یان پالەوانە خەیالییەکانی کارلایل لە ئارادا بن. ئەم شێوە لە پارێزگاری کەمتر نیگەرانی پەست بوون و بەکەم زانینی رۆلی عەقل بوو. عەقلخوازی شۆرشەکانی ژاکۆبن، چ لە باری غەریزی و چ لە باری عەقلی بەکردەوە کەمتر دەکەوتە بەر هێرش بەلکو لە بلندایە وەرگێژکەرەکانی عەقلی بۆچوونی (بە ئالمانی Vernunft) چاوی لێ دەکرا. ئەمە ئاشکرا هاوکێش بوو لەگەل پانتای کالریج.

پارێزگاری باوک سالارانە هێندێ لایەنە سوننەتخوازەکان و رۆمانتیکی لە خۆ گرتبوو. ئەو ئەرکەکانی دەولەتی بە پێکهێنانی ژیانێکی خۆش بۆ هەموو ەدەنییەکانی دەزانی و بە جۆرێک لە بەرپرسایەتی سەرمایەداری دەدایە قەلەم. ئەم پرەنسیپە زۆربەی لە پارێزگاکانی بە رێیەکی رێنوێنی کراوتری هاندان.[41] بیچمی حکوومەت بە چاوی باوکی خێرخواز دەبینرا کە ئارمانجەکان بەرەوپێش دەبا و پێکهێنانی دەرفەتگەلی یەکسان و عادلانە دەسەبەر دەکا. پارێزگاری باوکسالاری لە دوو سەدەی رابردوودا رێک بە دووی یەکدا دیتراوە. لە کاری

شافتسبووری لـه دەیـەی ١٨٣٠ و پاشـان دیزرائیلـی و چەمبـەرلین هـەتا رێـی ناوندی پارێزکاری مەک میلان ئەدوارد هـەیس. ئـەم ڕێبـازە هـەر بـەمجۆرە لـە دێموکراسـی مەسـیحی ئـەوروپایی لـە ئالـمان و ئیتالیـای دوای چـەرخی ١٩٤٥ وجوودی بووە. سازان لەگەڵ بەرپرسایەتی هەڵبژێراوەکان و ڕێککەوتن لەگـەڵ ئەوان، پرەنسیپێکی مرۆڤدۆستانەی بەهێز بوو. لە بریتانیا ئەم ڕووداوە لە پلـەی یەکەمدا دەکرێ لە ئەندێشەی پیاوانێکی وەکو ئاستێلر، سـەدلێر، و شافـسبووری و کاری ئەوانە دەربارەی یاساگەلی کارخانەکان بگرنە بەرچاو. ئـەوان هەمیـشە لە عەقڵخوازی، ڕێبازی بێنتام و ئابووری سیاسی کلاسیک کەڵکیان وەردەگرت: لە (یاسای نوێی هەژاران) (١٨٣٤) بێزار بوون و بە توندی لەسـەر ڕۆڵی دەوڵـەت لە دەستەبەر کردنی مەسکەنی بابەتانە، کەشوهـەوای کـار، مـافی کـار و هـەق دەست و کردەوەی بابەتانە لەگەڵ هەژاران تەئکید و باوەڕیان بـوو. لـە کۆتـایی سەدەدا لە بریتانیا ئەم نگەرانییە دەربارەی پشتگری لە بـارودۆخی بابەتانـە بـۆ هەمووان شێوەی پارێزگاری (نەتەوەیـەک) بـەخۆوە گـرت. بێگومـان چۆنیـەتی کاریگەربوونی ئەوە لە سەدەی نۆزدەیەم، کارێکە بۆ توێژینەوە دەبێ.

لـە دەیـەی ١٨٣٠ بزووتنـەوە و هۆکـارێکی دیکـە هاتـە نێـو ئـەم بزاوتـە باوکسالارانەوە. ئەم ڕووداوە واقعبینانەی هەڵبژاردن بوو. واقعبینی دەربارەی سروشتی گۆڕانی ئەوانە لە ڕاپرسیدا بەشداربوون. ئەم خاڵە لە بەیانییـەی (تـام وورس) (١٨٣٤) کەوتە بەر ئاماژەی سەر ڕابرت پیل.[٤٢] ئەم بەیانیەیە کۆمەڵـێکی بەربلاو لە ئیدەکان نەبوو بەڵکو وادەهاتە بـەرچاو بـە جـۆرێکی بـە تاڵـووکە بـۆ ڕاپرسی پێکهاتبوو. بەم حاڵەوە، زۆربەی بیرمەندان لەسەر ئەو باوەڕەن کە ئەم ڕەنگدانەوە بە جۆرێک لە جۆرەکان گۆڕینی ورە بوو و دەیویست حزبی تـۆری دێرینەتر لەگەڵ ڕادەربڕە نوێکان (یاسای پـەرلـەمانی خەڵـکی) ئاشـت بکاتـەوە. دەوڵەت خاوەن هێز، یاسا و سیـستەمـی بـەهێز، یاسـای بنـەڕەتی سـوننەتی و بەرژەوەندی مالی بوونی دەبوو لەگەڵ ڕادەربڕە نوێیەکانی چـینی مامناوەنـدی پێوەندی بەدی بێنێ. ئەگەر حزبی پارێزگار بیویستبا لە ڕاپرسـیدا بـە مانـەوەی خـۆی درێـژە بـدا، دەبـوو لەگـەڵ ئـەوە خـۆ ڕێـک بخـا، ئـەم پـەیامی بەشـە

ـر ـدبەجۆرەكانی حزب، بەتايبەت لە دوای تێكچوونی ياسای دانەوێڵە لە ساڵی ـ۱۰ـ بە دەستيان گەيشت.

ـيزرائيلی بزاڤی پيليتی قاييم كردەوە. رێكخراوەی تازەوە سەر پێكـەوتووی ـگـستان، ئـەو ئەنـدامی بـوو، وەرگێرانێكـی روونتـری لـەم باوكـسالارييە و ـ غعـينی گرێدراو بە رادەربڕە نوێكان دەدرايـە قەڵـەم، ئامـانجی ئـەوان، كـە لـە ـوـنێی ديزرائيلی بە ناوی سايبل يان دوو نـەتـەوە هاتووەتـە ئـاراوە، بناخـەی ـرـی پارێزگاری ميللی بـوو كـە كۆكردنـەوەی سـامانی بـۆ خـۆی، تـاكخوازی ـبـر ـنی و دابەشكردنی چينايەتی لە خۆی دوورخستەوە و پارێزگاری ديزرائيلی ـەد لـە نوێنەرايـەتی سياسـی دەگـەڕا و هـەم باشـتركردنی كـەش و هـەوای ـيـنـەسازی كۆمەڵايەتی دەويست. ئەم كارە لەگەڵ ڕێز و حورمەتی پاشايەتی و ـــی بنەڕەتی دێرينە گرێ درابوو. بەگشتی، ئامانجی ئەو (يەک نەتـەوە) بـوو. ـرـ ێنان و ستايشی ديزرائيلی لە ئاست ياسای بنەڕەتی دێرين لە كتێبی يەكەمی ـەوـا، بەناوی هەقانيەتی ياسای بنەڕەتی ئينگليز روونكراوەتەوە كە ڕێزی خۆی ـ ـ ستەی بەرەک .و كالريج كـردووە. باشـتربوونی بـارودۆخی كۆمەڵايـەتی و ـوـوری زۆر دەرەكی بوو. لەگەڵ ئەمەدا، دەسكەوتی روانگەی ديزرائيلی. جگە ـە قبـوول كـردنی نـاوخۆی حـزب، لـە بەرينبوونـەوەی بـزاواتی راپرسـی لـە ـوينەرايەتی ياسای خەڵک لە ۱۸٦۷دا شاراوەتەوە.

سـوننەتی باوكـسالاری بـۆ زيـاتر لـە سـەدەيەک دەوری گرنگـی لـە حـزبی ـرـيزگاريدا گێراوە. تەئكيد لەسـەر بەرپرسايەتی و ئەركی ماڵ و موڵكيان، بەرين ـكردنەوەی مافە سياسييەكان، سازدانی كەلک وەرگرتن لە دەوڵەت بۆ تـەبايی و ـيـک و خاوێنی و باشتر ژيان بەسـەر بردنی نەتەوە، چاو كراوانە جێگای قبوول و ـشتيوانی و پاڵپشتی كەسايەتيگەلێكی وەكو لۆرد رەندۆلۆف چـەرچيل، جـۆزف چمبەرلين و كوڕەكەی نێويل لە دەيـەی ۱۹۲۰ بـوون. ئـەم پانتايـە هـەروەها لـە ـايبەتمەندييەكانی پارێزگاری مامناوەندی مەک ميلان لـە دەيـەی ۱۹٥۰ و بـڕێک لايەنەكانی سەردەمی سەرۆک وەزيری ئەدوارد هەيس بوو. يەكێک لە تازەترين لايەنگرانی ئەو لە حزبی پارێزگاری بريتانيا، سيريان گيلمورە. گيلمور لە كتـێبی

بریتانیادا دەتوانێ دژی سەرهەڵدان و زۆربوونی بێکاری لە دەیەی ١٩٨٠ لە بواری بێهێز کردنی بۆچوونی نەتەوەیەک) کاربکا، دەڵێ: رەخنە لە (یاسای نوێی نەداری)، مامەڵە لەگەڵ سازشی دیزرائیلی سەبارەت بە چاتیستەکان، نیگەرانی دەربارەی یاسای کارخانە، هەموویان بە بەشێک لە سوننەتی پارێزگاری زانراون. دەرەنجام، گیلمورنگەرانی قووڵی خۆی سەبارەت بە روانگەی لیبرالی کلاسیکی هەڵبژێراو لە لایەن زۆربەی هاوڕێ حزبیەکانییەوە لە دەیەی ١٩٨٠ دەری دەبڕێ و ئەگەرچی ئابووری ئازاد تا رادەیەک پێویستە، نابێ بۆ پارێزگاری ببی بە بایەخی دەسەلات. بە بۆچوونی گیلمور، سیاسەت دەبێ هەمیشە لەسەر ئابووری لە پلەی یەکەمدا بێ و قسەی یەکەم بکا.[٤٣]

دروشمی پارێزگاری لیبرال پێچەوانەی دروشمی گیلمورە. ئابووری لەسەرووی سیاسەتەوەیە. بێپسانەوە بۆ ناسینەوەی شعووری پارێزگاری لیبرال دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆزدەیەم. رەنگە تا رادەیەک بکرێ بیرمەندانێکی وەکو کۆنستان و تۆکوویل لە ریزی ئەو دابنرێن. لەگەڵ ئەم حاڵەدا، هێشتا جێی قسە و باسە کە ئایا ئەم دەستە بەندیە راستە یان نا؟ پارێزگاری لیبرال حەز دەکا زۆرتر باوەڕە رەسمییەکانی لیبرالیزمی کلاسیک قبووڵ بکا: تەئکید لەسەر تاکخوازی، ئازادی رووخاو، مافە تایبەتیەکان و دەوڵەتی لەگەڵ لانیکەمی دەسەلاتی یاسایی. بەلام ئەم واتایە لە دەوڵەت، کە زۆرجار لەگەڵ چارەنووسی ئەمپراتۆری تێکەڵ بەیەکە، هەمیشە لەوە توندوتیژترە کە بە شێوەی سروشتی لە لایەن لیبرالە کلاسیکەکانەوە قبووڵ بکرێ. زیندووبوونەوەی پارێزگاری لیبرال لە پاش ساڵی ١٩٤٥، لە زۆربەی کۆمەڵگە ئەوروپاییەکان، نووکی تیژی هێرشی خۆی کردبووە خاوەندارێتی بەشی گشتی و خەتە فیکرییەکان دەوڵەتی تەبایان پێکهێناوە.[٤٤]

ئەم شێوە لە پارێزگاری لیبرال شوێنی پێی باوەڕەکانی بەرەک لە کتێبی ئەندێشەکان و برگەکانی دەربارەی کەم و کووڕی هەڵگرتووە. هێندێ کەس کۆتایی دەیەی ١٨٨٠ بە خاڵێکی دەسپێکی باوەڕ پێکراوتری دەزانن. لە بریتانیای دەیەی ١٨٨٠ ئەم باوەڕە لە نێو ئەندامی پارێزگاری (ئازادی سپێنسێری) و

ـەنجوومەنی پشتگری لە مالکییەت) دێتە ناساندن. ڕێکخراوەگەلێک کە پێوەندی ـەـامەتیان لەگەڵ حزبی پارێزگاردا بوە، وەکو (ئەنجوومەنی مافە تایبەتیـەکان) ـەجوومەنی بە کەماڵ گەیشتنی سیاسـی (دواتـر یـەکێتی خۆڕاگری دەولـەت)، ـەنجوومـەنی یاسـای بنـەڕەتی بریتانیـا)، (یـەکێتی دژی سۆسیالیـستی) و ـەنجوومەنی ئازادی پیشەسازی) هەروەها حاڵەتی ڕۆحی گشتی پارێزگاریـان ـە خۆیان نیشان داوە. چالاکییەکانی ئەم ڕێکخراوانە هەمیشە لە پێنـاوی هێـرش ـــە گەشـــەکردنی دەولـــەت بـــووە. پاراســـتنی سەرپەرشـــتی دەولـــەت و ـیـبەتمەندکردنی ئامانجە پێداویستەکانی ئەوانی پێک هێناوە.

ئەم سوننەتە تایبەتە لە لایەن هێندێ لە ئەنجوومەنەکانەوە لـە دەورەی پـاش ـەردوە درێژەی پێ درا و بەتایبەت لە دەهەکانی دوایدا کاریگەرییەتی ڕوو بـە گەشـــەی لەسەرانـــسەری ئـــەورووپا و ئـــەمریکادا ڕەنگیـــداوە. لـــەوە دەچـــێ ـەـوبانگترین ڕێکخراوە ڕۆشنگەری، ئەنجوومەنی مانت پلرین بێ. لـە بریتانیـا، ـوەندی کاری ئابووری)، (ئامانجە پیشەسازییەکان) و لەم دوایانەدا (نـاوەنـدی ـــام سمیـت)، (ئەنجوومـەنی ئـازادی) و (ناوەنـدی موتـالایی سیاسـی) ئـەم ـەشـعەلەیان بـە دەسـتەوە گرتـووە و هێناویانـە. لـە کۆتـایی دەیـەی ۱۹۷۰ و ـــەرەتای دەیـەی ۱۹۸۰ زۆر لـە کەسـایەتییە ڕێبـەرەکان لـە حـزبی پارێزگـار ـریتانیـا بەتـەواوی جـەزبی پارێزگـاری لیـبراڵ و تارادەیـەک بـڕان لـە هـەموو ـودرۆکـە سـوننەتییەکانی پارێزگـاری. سـیرکیت جۆزێـف و کۆمەڵـێک لـە کەسایەتییەکانی نەک زۆر بەناوبانگ، نوێخوازی باوەڕی نوێیان بوو کە سیفەتی کرداری دووپات کردنەوەی جەزمی و پلە و پایەی وەکو کۆیلە و نییەتی پاکیـان ـزاری ئازادی لیبرالی. بوو. وتەکانی ئەوان بە کردەوە نـەدەکرا لـە لیبرالیزمـی کلاسیک جیا بکرێتەوە.

ئاخرین تاقمی پارێزگاران، واتـە، (ڕاسـتی نـوێ) زیـاتر لـە هـەموویان بـەدێ هێنەری دیالۆگە. شتێک نییە کە بە ئاسـانی بـاس کـرێ بـەم هۆیـە تـا ڕادەیـەک ئەنـدامی جۆراوجـۆر دەگرێتـەوەخۆ. ئـەم بزاوتـە ڕاشـکاوانە زۆر لەگـەڵ ـوننەتخوازی دێرینـەتر و سـوننەتە ڕۆمانتیکـە بـاوکسـالارییەکان جیـاوازە.

دژایەتی لێرەدایە کە دەربارەی پارێزگاری دەتوانین بڵێین کە یەکێک لە بزاوتەکانی (راستی نوێ) دەدرێتە قەڵەم. سەرچاوەی بێپسانەوەی ئەو یەکەم پایەداری و بەردەوامی سوننەتی پارێزگاری لیبرالییە، دووەمەن رەخنەگەلێکی دژی سەرەڕۆیی دەیەی ١٩٥٠، بەتایبەت لە نووسەرانێکی وەکو هایک و ئەوکشات کە لە خەباتێکی هەمیشەیدا لەگەڵ گشت شێوە سۆسالیزم و لیبرالیزمە کۆمەڵایەتییەکاندا کردوویانەو بێجگە لەمە، شکستە راپرسییەکانی پارێزگارانی باوکسالاری لە دەیەی ١٩٦٠ و سەرەتای دەیەی ١٩٧٠، زۆربەی کەسەکانی رازی کرد کە گۆڕینی لایەن پێویستە. سەرەنجام خەلک باوەڕیان کرد کە سیاسەتەکان و پەیبردن بە هەمەلایەنەکردنی رێخراوە ئابوورییەکان، بزاڤی تەعاونی، بەرێوبەرایەتی کینزی و دەولەتی تەبا تێکشکاوە، ئەم سەر لەبەرد دانە بەرامبەر بوو لەگەل ترسە ریشەدارەکان لە وەستانی نرخ و باکردنی لە ئابوورییە غەربییەکان لە دەیەی ١٩٧٠دا.

ئەوەی لەژێر ناونیشانی (راستی نوێ) دایە، ئێستاش وەک مەتەلێکی هەڵنەهاتوو ماوەتەوە. هەمیشە ئەوە بە ئالیاژێک (پێکهاتەیەکی فلز لەگەل جیوە) لە پارێزگاری لیبرالی سوننەتی، ئەندێشەی ئابووری لیبرالی رێبازی ئۆترش (لۆدویگ فۆن میسیز و فۆن هایک)، ئازادیخوازی توندوتیژی (ئانارکوکاپیتالیزم) و خەڵکخوازی دواکەوتووانە و سەرەتای دەزانن.[45] دەیڤید گرین لە بەرگری خۆیدا لایەنی لیبرالی فراوانتر دەکاتەوە ئەو جۆرە کە رێبازی فریدمن شیکاگۆ و فیکرەکان رێبازی هەڵبژاردنی گشتی ویرجینیاش دەگرێتەبەر.[46] هیچ کام لەم پرەنسیپانە لە باری فیکرییەوە یەک ناگرنەوە. هێندێ ناوەڕۆک، وەک ناوەڕۆکی گرین، ئەگەرچی موتالا بە لایەن لیبرالی نوێ بەرین دەکاتەوە، هەڵگری سەلماندنی ناوەڕۆکی پارێزکاری نوێ یان پرەنسیپی سەرەڕۆی نوێیان نییە. راجێر سکرۆتۆن و هەموو ئەندامی کۆڕی سالیسبوری جیا لە باسەکەن و ئەوانە قبووڵ نەکراون. هەرچەند رەنگە کەسانێک ئەوە ببینن و بڵێن بۆچی وایە، چونکە تەنانەت یەکگرتوویی ئیدئۆلۆژی (راستی نوێ) زۆرتر ئالۆز دەکا، بەلام دەربارەی بزاوتی ئەم کارە عادلانە نییە.[47]

یەکگرتوویی ئیدئۆلۆژیکی رواڵەتی ئەگەر خۆی بە پرەنسیپی لیبرالی نوێ
ستێنێتەوە، تا رادەیەک لە بەخت و نەسیب بەهرەمەند دەبێ. تەئکید لەسەر
سیاسەتی لیبرالی نوێ بە خۆشییەوە لەگەڵ بازاڕی ئازاد رووبەڕووبووەتەوە.
دێتە بەرچاو کە دەخاڵەتی دەوڵەت بەتەواوی دووچاوی تێکشکان بووەتەوە.
سیاسەتە دارێژراوەکانی بەرنامەرێژی دوای جەنگ. دەوڵەتی تەبا و رەبا،
وەرگرتنیماڵیاتی زۆر، خەرجەکان و کۆی دەسکەوتی گشتی، گەشەی دیوان
سالاری. زیادکردنی هەقدەستەکان بێ سەرنجدان بە بەرهەم، و هەرەوەزی
گشتی لەوە دەچێ بێ کەلک بن. رواڵەتەن هیچ جێگرێک بۆ ئازاد کە دەبێ بە
وەری نهایی هەموو مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان ( لەگەڵ ئەوانەدا تەندروستی و
دەرمان و فێرکردن و بارهێنان) بزانرێ، بوونی نییە.

ئامانجە سیاسییەکان بریتی بوون لە رزگاری تاک لە دەسەڵاتی دەوڵەت،
رینەوە و بەر بەستی ماڵیاتەکان، کەمکردنەوە و لاوازکردنی دەوری دەوڵەتی
تەبا، کۆنترۆڵی کەمکردنی دەسکەوت و دەرخستنی پارە، تایبەتی کردنی دەست
بە سەرداگرتنی دەوڵەتییەکان. جیاوازی لەگەڵ سوننەتی پارێزگاری لیبرالی
ئەوەدایە کە لە (راستی نوێ) لیبرالی نوێ پێوارەکانی بازاڕی کردبووە پاڵپشتی
خۆی. سەرمایەداری ئانارشیست (یان ئانارکۆکاپیتالیزم) یان پرەنسیپی
ئازادیخوازە توندوتیژەکان لە (راستی نوێ) دا بانگهێشتنی دەوڵەت بۆ چاوە
دێری کردن بەسەر مادە سڕکەرە قەویەکاندا، بێبایەخ بینین و لە هێندێ جاردا
چالاکی گەورە وەکو باجگیری و دەمارگرژیان دەکرد. دەگوترا ئەگەر کە ئەم
بابەتانە لە بازاڕی ئازاددا ببێ لە درێژخایاندا مەسەلەیەک پێکناهێنێ و ئەگەر
تاکەکان رێز بۆ ناوبانگی خۆیان دانێن و بتوانن بڕیارنامەیەک بۆ خۆیان بنووسن
کە کەسێک زانیاری دەربارەی ئەوانەوە ئاشکراکا، لەو شێوەدا تەنانەت باجگیری
و دەمارگرژیش بەپێی پێوارەکانی بازاڕ جۆرێک گۆڕینەوەی شیاو و رەوا
دەبوو. هەڵبەت پارێزگارانی لیبرال دانیان بە هیچ کام لەم فیکرانەدا نەناوە و
قبووڵیان نەکردووە. لە راستیدا، پارێزگارانی لیبرالی وەکو ئەنوک پاول لە
بریتانیا ناتوانێ بیسەلمێنێ کە پاک و خاوێنی و دەرمان یان فێرکردن و بارهێنان

پەیڕەوی پرەنسیپی بازاڕ بن. بەم چەشنە، لەسەر ڕۆیشتنێکی دوور و درێژ دەربارەی بەرینبوونەوەی بازاڕ لە ئارادایە. زۆر لە بیرمەندان و ئەندێشمەندانی بازاڕ لەگەڵ بەرنامەی (ڕاستی نوێ) پارێزگارانی نوێدا هاو باوەڕنین، واتە هاودەنگ لەگەڵ ناسیۆنالیستی، وڵاتپەرستی، کەلتووری نەتەوەیی، نایەکسانی سروشتی، بایەخی ژیانی بنەماڵەیی بە دەسەڵاتی باوک سالارانە، فێرکردن و بارهێنانی مەزهەبی مەسیح ئیجباری. پارێزگاری نوێ سکرۆتۆن یان مووریس کاولینگ پێوەندییەکی زۆرتری لەگەڵ هێندێ لایەنە پارێزگارە سوننەتخوازەکاندا هەیە.[48] ئەوانە بە گەرم و گوڕی و لێبڕوانە هاوکێشی خۆیان هەم لەگەڵ باوکسالاری و هەم پارێزگاری لیبرال ڕەت دەکەنەوە و کەمێک هۆگریان بە ئازادی و یەکسانی هەیە یان لە بنەڕەتا هۆگریان نییە. لە ڕاستیدا مەدەنییەکان لە سەردەمی دوای شەڕ ئازادی و یەکسانیان زۆرتر بووە. بە بۆچوونی کاولینگ، هەم مارکسیزم و هەم لیبرالیزم دەبێ لە یەک ئاستا بکەونە بەر پەلاماری گاڵتەجاڕ و گومانی پارێزگاران. یەکێک لە ئامانجە چاوکراوەکانی تاقمی سالیسبوری ڕاستکردنەوە و هەڵە هەڵگرتنەوەی بەرەو لاچوونی لیبرالیزم لە دەروونی دەوڵەتی پارێزگاردا بوو. بە باوەڕی کاولینگ، پارێزگارانی ڕاستەقینە دەبێ، نیگەران و دڵ لە دوای مەسەلەگەلێکی وەک پشتگری کردن لە خاوەندارێتی تایبەتی، ئازادبوونی سەبارەت بە چۆنیەتی وەدەس هێنانی دەرامەد و پاراستنی سەرلەنوێی پێناسەی نەتەوایەتی بن.[49]

## سروشتی مرۆڤ

پارێزگاری، بێجگە لە ڕێبازەکانی پارێزگاری لیبرال و (ڕاستی نوێ) کە زۆرتر هۆگری نووسراوەکانی لیبرالی کلاسیک بوون، تا ڕادەیەک داوەری نەگۆڕی دەربارەی سروشتی مرۆڤ هەیە. بە بۆچوونی پارێزگارانی سوننەتخواز، ڕۆمانتیک و باوکسالار، مرۆڤ بە و مرۆڤخوازی ئامادەیی بەرتەسکی هەیە کە هەمیشە بنەماڵە، دراوسێ و نزیکان دەگرێتەخۆ. ئێمە بەپێی جەوهەر و سروشتی خۆمان، نەک تایبەتەن، خۆخوازین. غەریزە

ـۆرخوازییەکەمان ئێمەی بە شێوەی نەگۆڕ هەڵگری خراپەکاری بارهێناوە، بەڵام
ئەوەزەلی ئێمە گۆڕەپانی ئەم خراپەکارییەی بەرتەسک کردووتەوە. لەم بارەوە
ـتوانین زۆربـەی عەقـڵی خۆمـان بخەینـە گـەڕ. ئـەم واتـا عەقلانییـە لەگـەڵ
ـێچراوەیی مرۆڤدا هاوکێش نییە و لە کێشەدایە. مرۆڤ زۆرجار بۆ ئازادی خۆی
ـ زۆرینەی کەلک وەرگرتن لە سـەرچاوەی خـۆی هەوڵـی داوە بایـەخی بـداتێ،
ـەڵام لە هـۆگری عەشـقی خـۆی بـە خـۆش رابـواردن، تـەوەزەلی سروشـتی و
ـەرەمەن بوون لە ژیان ناتوانێ چاو پۆشی بکا. مـرۆڤ مەکینەیـەکی بیرمـەند
ـیە بەڵکو شەبەکەیەکی پێچراوەیە لە حەز و خۆشەویستی، ئەندێشە و زۆرجـار
ـۆکاری دژ بە یەکن. لێرەدا شتێک کە هۆی شەرمساری بێ، لـە ئـارادا نییـە. لـە
ـوگەڕانی هاودەنگی و سازگاری تەواو، دیرۆکەی عەقڵخوازانەیە. ئەگەر ئەمـە
ـە هۆکاری سەرەتای عەقڵی مرۆڤ بزانین، بۆچوونێکی دەرەکییە. ئەم بۆچوونە
هـۆی سەرهەڵـدانی ئەندێـشەی گومـانلێکراو سـەبارەت بـە ئارەزووەکـانی
عـقلبوونی مـرۆڤ دەبـێ. ئـەم خاڵـە دواییـە لەگـەڵ یـەکێک لـە دژایەتییـەکانی
ـەرەتای رەخنەگرانی پارێزگار بە پارێزگاری لیبراڵەوە پێوەندی هەیە. باوەڕی
وایە کە ئەوانە ساویلکانە دەڕواننە سروشتی مرۆڤ و لەوە ناگەن.

زۆر لە پارێزگاکان نە باوەڕی کۆمەڵگەی پڕ جەماوەریان بە لاوە مانا دارە و
نە پرەنسیپەکانی تـاک. رەخنـە لـە تاکـەکان هۆیـە بـۆ ئالـوگۆڕبوونی دیـالۆگی
توندوتیژی نێوان پارێزگارانی لیبراڵ و گـشت رێبـازە پارێزگارەکـان. هـەر دوو
واتـا گـشتییەکە (تـاک و کۆمەڵـگەی پـڕ جـەماوەر) زۆرجـار بـە بـەر و پـشتی
ـککەیەک زانـراون. جـەماوەر لـە تـاک و تاقـە تاقـە پێکهـاتووە. لـە روانگـەی
زۆرینـــەی پارێزگارانـــەوە، بوونـــەوەری مرۆڤـــی لـــە دەروونی پێکهاتەیـــەکی
پێچراوەی خاوەن کەلتووری مێژوویی و کۆمەڵایەتییەوە گەشە دەکەن. ئـازادی
تـاک بەرهـەمی سالـیانی گەشـەی کۆمەڵـگەی دەروونی سـوننەتێکی تایبـەتی
نەتەوەیـە. زمـان، داب و نـەریت، ئەندێـشە، بـەر لـە هـەر جـۆرە ئەندێـشەیەکی
چاوکراوانە دەربارەی ئەوانە لە بنەماڵەدا، تاقمە هاوتەمەنەکان، قوتابخانـەکان و
کار و کرداری بەرامبەری کۆمەڵگە بە دەس دێ. تاکی ئاڕمانجی و مرۆڤە جیهان

وەتەنەکان پێکهاتەی ئەندێشە و گومانن. ئەو جۆرە کە ژووزف دوومستر دەڵێ: (یاسای بنەڕەتی ساڵی ١٧٩٥ وەکو یاساگەلی بنەڕەتی بەر لە خۆی، بۆ مرۆڤ نووسرا بوو. بەڵام شتێکی گشتی بەناوی مرۆڤ لە جیهاندا لە ئارادا نییە. من لە ماوەی تەمەنی خۆمدا فەڕانسەوییەکان، ئیتالیایەکان، رووسییەکان و... دیوە، بە سایەی نووسراوەکانی مۆنتسکیوییەوە تەنانەت لەگەڵ مرۆڤە ئێرانییەکانیش ئاشنا بووم. بەڵام دەربارەی مرۆڤ رادەگەیێنم کە لە ژیانمدا لەگەڵ وەها شتێک رووبەڕوونەبوومەتەوە. ئەگەر وەها بوونەوەرێک لە ژیانا بێ، بۆ من نەناسراوە.[٥٠] راجێر ئەسکرۆتون کاتێ دەڵێ: (تاک شتێکی دەسکرد، بەرهەمێکە کە گرێ دراوە بە ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤەوە)[٥١] هەر ئەم خاڵە دووپات دەکەینەوە.

بە پێچەوانەی دەربڕینی هەستی زۆربەی نووسراوەکانی پارێزگاری دەربارەی هەستە مێژووییەکان، روانگەی ئەوان سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ هەم جیهانین و هەم جیا لە مێژووە. بەڵام سەبارەت بەو جیهانی بوونە، بیرمەندانی پارێزکار لەگەڵ لیبرالیزم لە باوەڕدا شەریکن. زانیاری مێژوویی رەنگە بە رێژەبوونی سروشتی مرۆڤ دابنرێ. دەربارەی پارێزگاری، دەبێ بڵێین ئێمە بە پێچەوانەی ئەمە کە بەرەو رۆڵەی تاف و کۆمەڵگەی خۆمانین، سروشت و هۆکاری پرەنسیپی ئێمە مەگۆڕ دەمێنێتەوە. سروشت و جۆری جیهانی شێوە و قالبی وجوودی ئێمە دیاری دەکا. لە لایەکەوە، ئەم زانیارییە مێژووییە پارێزگارەکانی بە رەتکردنەوەی باوەڕ دەربارەی مافە سروشتییەکان هاندەدا، بەرەو ئەندێشەی قەراردادی و بارودۆخی سروشتی کێشاوە. ئەم باوەڕانە مرۆڤەکانی لە سوننەتە میللییە تایبەتییەکانی خۆی و رێخراوەگەلێک کە بە ژیانی ئەوان مانا دەبەخشێ، دەکا بە بێگانە. بوونەوەری مرۆڤ ناکرێ لە کۆمەڵگە بەدەر بیری لێ بکرێتەوە. لە لایەکی دیکەوە، پارێزگاران لەسەر ئەو باوەڕەن کە مرۆڤەکان هەمیشە لە دەرەوەی زەمان و ویستەکانی ئەو دەمێننەوە. ئەم باوەڕە هەرچەند کە لە نێوان گۆڕانکاری مێژوویی و سروشتی نەگۆڕی ئێمە بەدی هێنەری سازگارییە، بەڵام توانایی ئەوەی نییە بە قەناعەتمان

بکەینی. نووسەرانی پارێزگار خوازیاری بەرژەوەندین، بەلام خوازیاری هیچ کام لە خەرجە ڕێژەی زانیارییە مێژووییەکان نین.

لەو جێیەدا کە ئێمە لە بابەتی کۆمەلایەتی و مێژووە بوونەوەرێکی ـیاریکراوین، پێویستانە ڕەنگدانەوەی وێنە سروشتییە نایەکسانەکان لە بابەت ئامادەیەکان و سەرکەوتنەکان لە کۆمەلگەداین. دەسەلات هەمیشە لە کۆمەلگەدا پێویستە و دەسەلات هەلگری نایەکسانیە. مرۆڤی خاوەن دەسەلات فەرمان دەدا و ئەم و ئەو فەرمانەکانی ئەو بەڕێوە دەبەن. پارێزگاران بە دەسەلات بەڕێوەبەرانی هێندێ ڕێکخراوە یان تاک باوەڕیان هەیە.[٥٢] بەردی بناخەی نایەکسانی هەم لە سروشت و هەم بەرهەمی کەش و هەوای سیاسییە. کۆمەلێک لە خەلک، چ لە باری فیکری و چ لە باری ڕۆحی و ئەخلاقی، بە شێوەی سروشتی بە سەرووی ئەم و ئەوەوەن. ئەم نایەکسانییە نابێ هۆی شەرمەزاری بێ. ئەم نایەکسانییە ناتوانێ لەگەل ئامێرە کۆمەلایەتی و سیاسییەکان لە بەین ببرێ. هێندێ بۆ فەرماندان لە دایک دەبن و برێکی بۆ فەرمانبەری. لەگەل ئەمەدا، دەبێ دەربارەی ئەم خالە بوترێ کە تاقمێک لە پارێزگارەکانی سەدەی بیستەم، چ ئەو کەسانەی کە باوەڕی لیبرالیان هەیە و چ ئەوانەی کە زۆرتر پێڕوەی بیری باوک سالارانەن، زۆر لەژێر کاریگەری باوەڕی یەکسانی دەرفەتەکان و مەدەنییەتی یەکسانیدان.

سەرەنجام، پارێزگاری دلنیگەرانی رووخان و لەناو نەچوونی و جیهانی بوونی و سروشتی مرۆڤایەتییە. ئەم بیرە گشتییە بە واتای ئەوەیە کە مرۆڤەکان هەمیشە تێکشکاو دەمێننەوە و بە هیچ چەشنێک ناکەونە سەر دەور و ڕێک نابن. ئەم ئەندێشەیە بێگومان مرۆڤ دەخاتە بیری وتەکەی ویرک کە دەیگوت پارێزگاری دەکرێ بە جۆری (شێوەی دژەمەزهەبی و سیاسی بوونی ئەو باوەڕەی مەزەب دەربارەی تاوانی سەرەتا)[٥٣]ی دانا. دوو سەرچاوەی سەرەکی دەربارەی ڕوانگەی رووخاوی سروشتی مرۆڤی لە ئارادا هەیە: ئیلاهیات و کردار. سەرچاوەی ئیلاهیات ڕوانگەیەکی دێرینەترە. لە ئیلاهیاتی مەسیحیدا ئەم ئەندێشە لە پلەی یەکمدا بە باوەڕێک بۆ تاوان و گوناهی سەرەتا

(ناوبراو لە کتێبی پیرۆز) دەگەڕێتەوە. ئێمە لە دنیایەکدا ژیان دەکەین پڕە لە گوناه و تاوان. هیچ کارێک ناکرێ مەگەر ئەوە کە جەماوەر و کۆمەڵگە دژی گەندەڵ کردەوە لە خۆ بنوێنن. ئەمە بارودۆخی مرۆڤایەتییە و شەرت و مەرجی بوونی ئەو دەدرێتە قەڵەم. لە (شاری مرۆڤ) لەگەڵ ئیلهام لە واژەی (شاری خودا) کە ئەگوستینی قەدیس بەکاری بردووە) گشت دەسەلاتی سیاسی دەکرێ بۆ هەڵبژاردن و ئەنجامدانی باشترین کار لە نێوان خراپترین کارەکان کەلکی لێ وەربگیرێ. ئەو جۆرە کە مستێر گوتوویە: (لە کارەکانی مرۆڤدا، هەر شتێک بە هەمان شێوەی خراپی و رۆژەڕەشی خولقێنەری ئەوە).[٥٤] مستێر دەربارەی رەوشتی ناحەز و بە گەندەڵ کێشراوی مرۆڤایەتی زۆر زیاتر لە ئەدمۆند بەرەک دل کرمێ بوو.[٥٥]

لەگەڵ بوونی ئەم راستییەدا کە پارێزگارانێک لەم سەدەدا هەن کە بە ئەندێشەی مەزهەب تێکشکاون و هەلگری ریفۆرم نەبوون باوەڕیان هەیە، زۆری دیکە هەن کە ناتوانن ئەم بۆچوونە قبووڵ بکەن.[٥٦] لە راستیدا هێندێ بێ چاو کردنەوە ناوەڕۆکە دینییەکان رەت دەکەنەوە. سوننەتێکی بەهێز لە پارێزگاری دژە مەزهەبیدا هەیە کە دەربارەی پێشکەوتوویی فیکری ئەم سەدەیە گومانی تێدانییە. پارێزگارانی دژە مەزهەبی بەوەی کە بەربلاوانە دەتوانن ئەوە مەسەلەکی کردەوەی رووخاو و ریفۆرم هەڵنەگر ناو بنێن، باوەڕیان هەیە. ئەم باوەڕە لە بەرژەوەندی ئەندێشەی ئەخلاقی، ئاشنایی ناسی و دەروونناسی جەخت دەکەنەوە. باوەڕی بنەڕەتی ئەوەیە کە مرۆڤەکان بەپێی ئامادەییەکان و لێهاتووییەکانیان لە تێگەیشتنی جیهان ناتەواون. هەموو ئێمە پاشەکەوتێکی زۆر کەممان لە زانیاری لەبەر دەستایە. هەروەها لە بابەتی مێژوو و کۆمەلایەتییەوە ئاسۆمان بەرتەسکە. لێهاتوویی پێراگەیینی عەقلی و زانیاری مرۆڤ زۆر لاوازە و ناتوانین باوەڕ بەوە بکەین. لەبەر ئەمە، داب و نەریت و سوننەتی رێنوێنانی باوەڕ پێکراوتر بو رێنوێنی مرۆڤ دەدرێتە قەلەم. ئەم زانیارییە بەرتەسک و لاوازەی مرۆڤ لە دیاری کردنی خێری دەم و ئەو شتێک نییە کە گۆڕانکاری بێنێتە ئاراوە. ئەمە راستییەکی جیهانی مرۆڤە. هەر ئەو جۆرە کە پاشەکەوتی

گشتی مرۆڤ زۆر دەبێ، تەنانەت لە ناخی کەلتووری خۆماندا مەحکوومین کە بە نەزانییەگشتییەکەی خۆشمان زیاد بکەین. دەور و رۆڵی بەکردەوەی ئێمە حاشا هەڵنگرە. بەم جۆرە، بێجگە لە باوەڕی پارێزگاری لیبرال. گریمانەی گشتیتری پارێزگاری ئەوەیە کە پرەنسیپی مرۆڤ ناتەواو و خاوەن عەیبە و وەکو ئەندێشەی سیاسی ئەو دەمێنێتەوە.[٥٧] لەبەر ئەمە، ئەندێشەیەکی سیاسی کە لە کەماڵخوازی مرۆڤ دەدوێ، مایەی بێزە.

## عەقڵ و کردەوە

بەر لە هەموو دیالۆگێک دەربارەی باوەڕە ئابووری و سیاسییەکانی پارێزگاری، گرنگە کە یەکێک لە شاراوەترین و پێچراوەترین بەڵگەکانی ئیدئۆلۆژی پارێزگاری بزانین. ئەم بەڵگەیە پێوەندی بە ئاشکرا کردنی جەوهەری کردەوە و رۆڵی عەقڵی مرۆڤەوە هەیە. لەم بارەوە لە بەشەکانی پێشوودا بە گشتی باسمان لێوە کرد و ئێستا دەبێ ئەم بابەتە پەرە پێبدەین.

چونکە دەسپێکی پارێزگاری لەگەڵ دیارەی بەڵگەکانی سەرکردەی عەقڵخوازی شۆڕشی فەرانسا پێوەندی بووە، هەمیشە هەستی دژایەتی عەقڵخوازی لە ئیدئۆلۆژی پارێزگاریدا لە ئارادا بووە. روانگەی پارێزگاری سەبارەت بە پێوەندی عەقڵخوازی لەگەڵ ئەندێشەی سیاسی گومان لێکراوە؛ راسل کەرک دەڵێ: (هەر پارێزگارێکی چاوکراوە لە تێگەیاندنی بنەڕەتی سیستەمە فیکریە پێچراوەکان و مەتڵەبە شاراوەکان و پڕ شاتوشووت بە بێگاری دەزانێ؛ ئەو تکنیکی بەلاوە باشترە لە جۆش و خورۆشی رادیکاڵەکانە.[٥٨] نەبوونی هۆگری بە فەلسەفەی سیاسی سیستماتیک و دەزگایی، باوەڕ بە کردەوەخوازی زۆرتر، پانتای گومان سەبارەت بە ئەندێشەی سیاسی، بووەتە هۆ کە پارێزگاران لە بەرەک هەتا ئوکشات بە رەتکردنەوەی دەوری ئینحساری عەقڵ لە سیاسەت دەس بەکار بن. بەم حاڵەوە، تاوانە ئەگەر پارێزگارانی سوننەتخواز، رۆمانتیک و باوکسالار بێ مەنتق و لایەنگری کردەوە دژەعەقڵانییەکان دابنێین. ئەو جۆرە کە ئەسکرۆتون گوتوویە: چونکە هیچ

سیاسەتێکی گشتی پارێزگارانە لە گۆڕێدا نییە. ئەم بۆچوونە هاتووەتە ئاراوە کە هیچ ئەندێشەیەکی پارێزگارانە لە دەسا نییە.[٥٩]

بنەڕەتانە، زۆربەی پارێزگارەکان جیاوازی نێوان دوو جۆر عەقل وەبیر دێننەوە. ئەم جیاوازییەی نێوان (بەکردەوە) و عەقلی (سیستەمی) کە دەگەڕێتەوە بۆ ئەرەستوو، هێندێ لە پارێزگارانی سوننەتخواز لە سەردەمی شۆڕشی فەڕانسادا کەلکیان لێ وەرگرتووە. بە بۆچوونی زۆر کەس، جیاوازی زۆر تیشکی نەخراوەتە سەر و نێوان (عەقل) و (غەریزە) و (شهوود) دەردەکەوێ. مستێر لەسەر ئەو باوەڕەیە کە فەلسەفە بە شێوەی گشتی (قوڕی گیراوەی پێوەلکانی مرۆڤەکان دەخوا و پیر و گەندەلی دەکا). بە وتەی ئەو فەلسەفەی نوێ، (لە ئێستەدا ئامادەخوازتر و لە خۆبایتر لەوەیە کە هۆکارە پرەنسیپەکانی جیهانی سیاسەت وەربگرێ) ئامادەیی و لێ هاتوویی لە شهوود لە جیهانی مەعنەوی ئێمە لە بوونەوەران جیا دەکاتەوە نەک عەقل. دامەزرێنەرانی یاسای راستەقینە (زۆرتر لەسەر بنەڕەتی غەریزە و مەیل کار دەکەن هەتا لەسەر بنەمای عەقل).[٦٠] بەلای یۆستوس موزرەوە ئەم باوەڕە بە شێوەی ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان ئەندێشە، کە وشک و ڕەق و سەر پێیە و ژیان کە چالاک گەشەکەرە، بەلام لەگەل ئەوەدا ریشەی لە داب و نەریتە دێرینەکاندا هەیە، دێتە ئاراوە.[٦١]

بەرەک لە نێوان بنەبڕ و بنەڕەت جیاوازی دادەنی.[٦٢] پرەنسیپ، کە بەرەک ئەوانە نەبەدل بەکار دەبا، ریشەیان لە داب و نەریت و سوننەتا هەیە و لەگەل عەقلی وشک و رووتی متافیزیکی جیاوازن. بەرەک بۆچوونەکانی خۆی دەربارەی متافیزیکی عەقلی رۆشنگەری راشکاوانە لە کتێبی نووسراوەکان گوتوویەتی: (چوار سەد سال بەسەر ئێمدا تێپەڕی؛ بەلام بە باوەڕی من، ئێمە لە بابەتی ماددیەوە گۆڕانکارییەکمان بەسەردا نەهاتووە... بە سایەی خۆڕاگری بێزارانەمانەو لە ئاست نوێسازی، بە سایەی کەم بزووتنەوەی ساردی خووی میللی خۆمان، هێشتا مۆر و هێمای باوباپیرانی خۆمان بە تەوێڵەوە ماوە. ئێمە گەورەیی و شیاوی ئەندێشەی سەدە چواردەیەمان لە دەس نەداوە؛ و هەتا

ـــەش بە وردبینی لە نێوان وەحشیان و بارهاتووەکاندا دەس بەکار نـەبوون. ـە چووینەتـە سـەر بـاوەڕی رسـۆ، نـە بووینەتـە موریـدی ولێتـر، (بـاوەڕی) مـوسیوس-یش لە نێو ئێمەدا پێشکەوتی نـەبووە پرەنسیپی گرنگـی حکومـەت ـەجام نەدراوە).[٦٣]

ی داگری جێی بۆچوونی بەرەک ئەمە نەبوو کە بوونی هەر چەشنە عەقڵێک ـە سیاسەتا بێهێز بکا، بەلکو باوەڕی بوو کە نابێ سیاسەت لە رێگوزەری واتا لە ـێـە هەلـکەنراوەکانی وەکـو مافـە سروشـتییەکان دیـاری بکـرێ. حـەقیقـەتی مەـستی رێخراوەیەک یان داب و نەریت لە درێژەی زەمانـدا نیشاندەری بـوونی ـەک عەقلانییـەتی کـرداری زاتی بـووە کـە هـەمیشە لـە یەکـەم چاوپێکەوتـدا ـەکەوتووەتە بەرچاوی تەماشەکەر. گۆڕانکـاری شـتێکی پێویـستە، بـەلام نابـێ ـەگەڵ پێشمەرجێک لەسەر بنـەمای بـاوەڕە وەلانراوەکـانی پێـشوو دابمـەزرێ، ـەـکو دەبـێ سـەرنج بدرێتـە مەسـەلە دیاریکراوەکـان و رۆحـی رێخـراوە یوەندیـدارەکان. لـە نێـو بـردنی رێخـراوە کۆمەلایـەتی و شـیاوەکان ـووپاتبوونـەوە لەگـەڵ پێـشمەرجە عەقلانییـە نوێکـان، یەکـەمین تـاوانی ـورشگێڕانی فەرانسەوی بوو. وەها باوەڕێک بەلای یۆستوسیشەوە هەیە: (لـە هەر لایەک لەگەڵ داب و نەریتە دێرینەکان رووبەڕوو دەبم کە لەگەڵ بۆچـوونی گشتی مۆدێرنی ئێمـە هـاوکێش نییـە، بـە خـۆم دەلـێم بەلـگەیەکم نییـە کـە بـیر ـکەمەوە باو باپیرانی ئێمە گەوج بوون. لەبەر ئەمە، مەسەلەکە شی دەکەمەوە و ـدیدۆزم هەتا وەلامێکی مەنتقی بۆ بدۆزمەوە، و ئەو دەم کە دۆزیمەوە دەتـوانم ـە گالتەجاڕ بێم بە دەوری کەسانێکدا بێم کە بە نەفامی هێرشیان دەکـردە سـەر ـاب و نەریتی دێرینە).[٦٤] واژەناسی مایکێل ئوکشات بـۆ ئـەم بابـەت، دەسـەلات ـەخشین بە زانیاری بەکردەوە بەسەر زانیاری تکنیکیدایە. زانیاری بەکردەوە لە ـاخ و لایەن سوننەتەوە کـار دەکـا، ئێـستە کـە زانیـاری تکنیکـی هـەموو شـتێک ـەگۆڕێ و ساکاری دەکا.[٦٥]

گـشت پارێزگارەکـان بەتـەواوی لـە چواچێـوەی نـاوبراودا نـاگۆنجێن. پارێزگارانی رۆمانتیک، وەکو کالریج، تەئکیدێکی زۆری لەسەر بۆچوونی گشتی

ئالمانی (عەقڵی فەلسەفی) لە قبووڵ کردن لەگەڵ (فام) دەکەنەوە. عەقڵی فەلسەفی واتای گشتی دەگرێتەوەخۆ، لە حاڵێکدا کە فامی سروشتی بڕبڕ و لەت لەت دەکا. عەقڵ لان کەم دەبێ بە مودێلی گشتی ئەندامی کۆمەڵگە. لە ئەندێشەی کالریجدا مەکتەبی بێنتام و ئابووری سیاسی لیبرالی وێنەگەلێکن کە بڕبڕ بوونی دروزنانەی فامی کۆمەڵگەن. بەم حاڵە، پارێزگاری لیبرال کە لە راستیدا پشت ئەستوورن بە بەرهەمی ئامێرخوازانەتر لە عەقڵن کە لە ئابووری سیاسی لیبرالیدا هاتووتە ئاراوە. لە جیهانی کردەوەخوازانەی سەردەمی رۆشنگەریدا ژیوار دەکەن کە کەوتوونەتە بەر پەلاماری رەخنە و رەتکردنەوەی زۆرینەی پارێزگارانی سوننەتخواز و رۆمانتیک.

باوەڕ بە بوونی دوو جۆر عەقڵ، زۆر لە پارێزگاران بەرەو دوو باوەڕ بە دووجۆر راستی هاندراون. ئەمانە بریتین لە راستییەکانی عەقڵ و مەنتق کە لە ئاقاری ئەندێشەدا بوونیان هەیە. ئەم راستیانە رەنگە لەگەڵ دنیای ئەزموونی کە لە ژیانی رۆژانەدا بوونی هەیە، پێوەندی نەبێ یان پێوەندییەکی زۆر کەمیان هەبێ. راستەقینە بە کردەوە دارژاوە لەسەر داب و نەریت و سوننەتە. دامەزرێنەرانی یاسای راستەقینە لەسەر پرەنسیپی ئەم هۆکارە بەکردوەکار دەکەن.[٦٧] ئەو جۆرە کە ئەمڕۆ دەڵێن: (کردەوەیەک کە خۆی زۆر لەگەڵ کەش و هەوای تاکی هەر کەس دێنێتە ئاستێک و دەزانێ چۆن کەڵک لەو وەربگرێ پاکسازی زۆرتری لە ئەندێشە هەیە کە زۆرینەی بارودۆخی دیاریکراو دەخاتە پشتگوێ).[٦٨] کاتێک راستییەکانی عەقڵی بوچوونی دەربارەی هەستی دێتە ئاراوە، لادان دێتە گۆڕێ. ئەم باوەڕە ریشەی سکاڵای مستێر دژی دروست کردنی شاری واشینگتۆن بوو کە بە پێشبینی تووشی شکست دەبوو چونکە بەرهەمی لێکدانەوە و هەڵوێستی عاقلانە بوو.[٦٩] وەها بنەڕەتێک بەڵگەی مایکێل ئوکشات لەم بارەوە پێکدێنێ کە فێربوونی چێشت لێنان یان لێخوڕینی دووچەرخە لە لایەن خوێندنەوەی کتێبەوە. هەڵەیە. ئەم کردەوە ناکرێ لە میتۆدی تەکنیکی وەربگیرێ.[٧٠]

جیاوازی نێوان جۆرەکانی عەقڵ تا رادەیەک دەربارەی دژایەتی پارێزگاری لەگەڵ گومانەکانیش رۆشنکەرەوەیە. ئەوانە باوەڕیان هەیە کە دووجۆر گومان

ەیە گومانی بێخەوشی گریمانەی رەخنەی رادیکال سەبارەت بە هەرچەشنە
ەری مرۆڤایەتییە کە لە ئامێرە عەقلیەکان بۆ گەڕانەوەی عەقل لە جێی خۆیدا
ەکی لێوەردەگرێ. پارێزگاران وەها باوەڕێکیان نییە. ئەم رەوتە گوماناویە بە
ۆژم لە ئاسەواری دەیڤید هیوم و لەگەڵ میتۆدی ئەزموونی ئەو دەربارەی
وش و شعوور هاتووتە ئاراوە. ئەو بەم باوەڕەوە دەربارەی مێژوو،
روشتی مرۆڤ و داب و نەریت زۆرتر تەئکیدی کردووە.[71] ئامانجی
ستەقینەی هیوم عەقلی تەنیای سەردەمی رۆشنگەری لە زانینناسی و ئەخلاق
یە. زۆربەی پارێزگاران لایەنی گشتی بەڵگەکانی هیوم، بەتایبەت
وسراوەکانی ئەو دەربارەی دین، دەرکیان کردووە.
ووەمین شێوەی گومانەکان، کە تایبەتی پارێزگارانی سوننەتخواز و
کسالارییە، بە رەشبینی دەربارەی گەیشتن بە عەقلی بۆچوونی بەرتەسک
دەتەوە. ئەم گومانە، گریمانەی فەلسەفی لەم بارەوەیە کە ئایا ئارمانجە
ەقلانییەکان هەڵگری بەرهەمن؟ یان لە راستیدا ئایا بەپێی بنەما مانایان هەیە یان
لە پلەی یەکەمدا زۆر لە پارێزگارانی رۆمانتیک دەبێ لەو باوەڕە هاوێز
کرێن. هەر ئەو جۆرە کە پێشەکی باسکرا، ئەمانە خوازیاری بە مانەوە لەگەڵ
ی متمانەی واتای عەقلی فەلسەفین. لێرەدا هێندێ جێگا بۆ سکالا ماوەتەوە.
ووەم، پارێزگارانی لیبرالیش بە باوەڕە گرێدراوەکان بە سروشتی مرۆڤ،
ەقلی ئامێری، و جەوهەری چالاکی ئابووری، کە لە شێوەی دوو دڵیدا پارێز
دکا، ئیمانیان هەیە. بە لای پارێزگارانی لیبرال و لایەنگەلێک لە باوەڕە
ازخوازە (راستی نوێ) واتای دڵ خۆشانەیان لە حەقیقەتی عەقلانی بن
رکراو بوونی هەیە.
لە پارێزگاری سوننەتخوازدا پرەنسیپی کرداری مرۆڤ عەقلی بۆچوونی
یە، بەڵکو داب و نەریت، دەمارگرژی و عادەتە. ئەم کردەوانە هەڵگری عەقلی بە
کردەوەن. بە بۆچوونی مستێر، دەبێ لانکە بە دەمارگرژی دەوری تەنرابێ هەتا
ندال زۆرتر هەست بە هێمنایەتی بکا. ئەم دەمارگرژی و عادەتانە لە کەش و
هەوای مێژوویی و کۆمەڵایەتی تاکەوە سەرچاوەیان گرتووە. دەمارگرژی هەر

تەنیا کردەوەی کوێر و غەیرەمەنتقی نییە، بەڵکو پێچەوانە، (پێش داوەری) یە،شەهدی گیراوەی ئەزموونی بەرەی رابردووی دێرینە. میتۆدێکە بۆ زانینی ئەمەی کە چی بکەین، لەبنەڕەتدا بەسەر عەقڵی رووتا زاڵ و لە پێشترە. دەمارگرژی هەڵ بۆ هۆکار دەرەخسێنێ کە بزانێ، بەبێ ئەندێشە لە ئەخلاق سیاسەتدا، چ دەکا. کارکردن لەگەڵ دەمارگرژی کارکردنی شتێکە کە باوباپیران ئەنجامیان داوە. ئەم کارە لە زاتی خۆیدا، سوننەتە. سکرۆتۆنشی دەڵێ: (کاتێک مرۆڤێک لە پێناوی سوننەت کاردەکا، ئەوەی کە ئێستە ئەنجامی ئەدا، بە ناوی شتێک کە هەقی بە وێنەیەکەوەیە کە لە ناوەندی بەرژەوەندی ئێستەی ئەو بەولاوەتر دەڕوا، دیبینێ و بەوەیکە پێشەکی ئەنجامی گرتووە و سەریش کەوتووە، پەیمان و بەڵێنی لەگەڵ دەبەستێ).[٧٣] بەرەک ئەم کردەوە بە هەق (کردەوەی بێئەندێشە) ناو دەنێ. ئەو جۆرە کە هەمپشرمانک دەڵێ: بۆچوونی بەرەک دەربارەی دەمارگرژی (پشتگری لە گریمانە تۆژینەوە نەکراو کە بە ناوی دەرەنجامی پارمەتییە فۆرم گرتووەکان بە رابردووی کۆمەڵگە، باوەڕە سیاسی و ئەخلاقییەکانیشی دروست دەکا... بەرەک بێ سەرنجدان بە ناوەڕۆکی خودی دەمارگرژی، پشتکی ئەو دەکا، چونکە کردەوە مرۆڤ بە هۆی کۆمەڵگەیەکی پێشبینی کراوتر و هەڵگری ئیدارە کردنتر نیشان ئەدا).[٧٤] دەمارگرژی بە هوی پایەداربوونی خۆی، جەوهەری سوننەتەکان و کردەوەی مرۆڤ پێکدێنن و دروست دەکەن. رێبازی ژاکۆبنەکان و هەموو پرەنسیپی سیاسی وەکو یەک هەوڵ دەدەن هەتا بەناوی رۆشنگەری دەمارگرژی لە ناو پاک بکەنەوە و لە بەینی بەرن. سەیر نییە کە بەرەک توانی لەگەڵ تەئکید و شەوقێکی زۆر بڵێ (سوپاس بۆ خوا کە رۆشنایی رۆشنگەری بە بەشی ئێمە نەبووە).

سەرسووڕمان لێرەدایە کە یەکێک لە دەسکەوتەکانی سەرنج بە دەمارگرژی، عادەت و داب و نەریت، لەبەر ئەمە بە سوننەت، ئەمەیە کە مێژوو پێچمێکی بەرز بەدەس دێنێ. بەرەک لەگەڵ بەڵگەکانی خۆی دەربارەی سوننەت بەرەو واتایەکی دەوڵەمەند لە مێژوودا کێشرا. ئەو بێ ئەوەی بزانێ رچەی بۆ

ـ..ـدفری و پیشکووتنی مێژوویی له سـەدەی نۆزدەیـەم، بەتایبـەت لـە ئالـمان،
ـکـنـ. ئەم کاره بووەته هۆ کە بـەراوردەکانی نێـوان هێگـل و بـەرەک ئـەنجام
ـری. لەم بوارەدا دەبیـنین کـە پارێزگـارانی ڕۆمانتیـک و سـوننەتخواز لەگـەڵ
ـکـا یـەکگرتووییان هەیـە. هـەر دوو مێـژوو بـەناوی سـەرچاوە و تێـڕامانی
ـنجی قووڵ و مەعنەوی، بە چاوی کۆتاییخوازانه سەیری دەکەن. خاڵێک کـە
ـرتر پارێزگاران له وەها تێڕامانێکی مێژووییدا بەشدار دەکـا ئەمەیـە کـە نـەکا
ـێژوو بـێ کۆتـایی چـاوی لـێ بکـرێ، واتـە ئەندێشە و چـالاکی مـرۆڤ تـەنیا
ـودەگەری خولێکی مێژووی تایبەتی بێ کە هیچ مانا و ئامـانجێکی بـالاتر، یـان
ـولاوەتر لە خـولی ئێـستای ئەندێـشە بـێ. پارێزگـار، بەراسـتی نـاتوانن وەهـا
ـژەخوازییەکی مێژوویی بگرنه ئەستۆ.

## سیاسەت و دەوڵەت

زۆربەی ڕێبازە پارێزگارییەکان ژیانی سیاسی بە شێوەی کـۆی ئەندامـەکان
ـو لێ دەکەن. ئەم پارێزگارییه سەبارەت بە تاکخوازی بە گومـان و ڕەشـبینە.
ـە کۆتایدا، مێژوو به شێوەی پلـەبـەنـدی دەبیـنن، واتـە لێهـاتوویی ڕێبـەری و
ـودری سیاسی کـەم و لـە بـەردەسـتی تـاقمێکی کەمدایـە. دادپرسـی سیاسـی
ـیبەتی لێزانانـە. پارێزگـاری لیـبرال، بەتایبـەت ڕادەی تونـدوتیژتری ئـەو واتـە
ـیرمەندان (ڕاستی نوێ) باوەڕێکی ئەوتۆیان نییە.

ڕوانگەی ئۆرگانێک هەڵگری ئەم باوەڕەیە کە کۆمەڵگە شـتێکی دەسـکرد یـان
ـشینی یان مکانیزم نییـە بەڵـکو لـە پێوەنـدی بەرامبـەری بەشـە گرێـدراوەکان
پێکهاتووە. زۆربەی پارێزگارەکان، لەگەڵ هـەلاواردنێکی زۆرکـەم، بـە پێـوارەی
ئۆرگانیزمخوازی یان وەک یەک بینینی کۆمەڵگە لەگەڵ زیندەوار پێواویانـە. لـەم
ئۆرگانێکه گشتییەدا، هەر تاکێک جێـی خـۆی هەیـە. گـۆڕین یـان ڕیفـۆرم دەبـێ
ـسازگار و هاودەنگ لەگەڵ دەنگی گشتی ئۆرگانیزمـدا بـێ. بیرمەنـدانێکی وەکـو
لامۆنه، مستێر و مولێر بەم ئەندێشه ئۆرگانیکییـە واتـای مەزهـەبی و عێرفـانی
ـدەبەخشن. ڕەنگە توندوتیژترین وێنەی ئـەم حـەز و مەیلـە فریـدریش نـووالیس
ـەگەڵ کتێبی مەسیحییەت یان ئـەورووپا بـووە کـە دەوڵـەتی بـە ئۆرگـانیزمێکی

گەورە (مرۆڤێکی وەکو دێو) زانیوە.[٧٥] زۆرینەی پارێزگارانی دژەمەزهەبی پێوارەی ئۆرگانیزمیان تەنیا بۆ مودێل کردنی بایەخی کۆمەڵگە و نەتەوە بەکاریان بردووە.

ژیانی سیاسی بەشێک لە شانۆی بەربلاوتر، مەزهەبی یان دژەمەزهەبی، زانراوە. سیستەمێکی نەگۆڕ لە جیهاندا بوونی هەیە. سیستەمی سیاسی یان ئەخلاقی نە دەکرێ دابێ و نە بەتەواوی ئەو دەست پێ بکرێ؛ بەڵکو ئەم نەزمە ناوەڕۆکی هەناوی ڕێکخراوە سیاسی و ئەخلاقییەکان پێکدێنێ. ئەم سیستەمە لە گشت جیهان وەرگیراوە. کۆبان دەڵێ: (سەرانسەری ژیانی بەرەک کرنۆش بردنە بەر دەرگای رازی گەورەی ژیانی کۆمەڵایەتی بوو).[٧٦] نووسەرانی پارێزگار سروشتی ئەم نەزمەیان بە شێوەگەلی جۆراوجۆر لێکداوەتەوە. شعووری مەزهەبخوازتری وەکو مستێر، خوداوەند بە پەروەردگاری بە سیستەم دەزانی. بە باوەڕی ئەو، ڕێخراوەکان، (بە رادەیەک بەهێز و پایەدار هەن کە هۆی پلە و مەقامی خوداییان هەیە).[٧٧] بە بۆچوونی مستێرەو (هەتا رادەیەک کەمتر بەرەک) شۆڕشی فەڕانسا کردەوەی شەیتانی دژی سیستەمی خودا بوو. ئەم بوچوونە دینیە لە واتای نەزمدا هێشتا لە سەدەی بیستەمەدا بەلای هێندێ لە پارێزگارانەوە دەبینرێ.[٧٨] گشت نووسەرانی کاملبوونی مێژووی دژەمەزهەبی کۆمەڵگە و سوننەت بە چاوی نەزمێکی گرنگ و پڕمانا دەبینن. هێندێ جار، ئەم نەزمە ناوەڕۆکی دینی ڕەت دەکاتەوە. لە بریتانیای دوای ١٩٤٥، مایکێل ئوکشات وێنەی وەها پارێزگارییەکی غەیرەمەزهەبییە.[٧٩]

حەز و مەیلەکانی کۆمەڵگەخوازی و دژی تاکخوازی پارێزگاری، تارادەیەک لە پێوارەی ئۆرگانیزمەوە سەرچاوە دەگرێ. تاک بەشێک لە ئۆرگانیزمی گشتییە و بوونی ئەو، لە لایەن گشتی ئوزگانیزمەوە شعوور قبوولی نییە. لەگەڵ ئەمەدا، فیکری گشتی جەماوەر و کۆمەڵگە تارادەیەک کاڵ و سەرەتای ماوەتەوە. بە بۆچوونی نیسبت، کۆمەڵگە (تێکەڵییەکە کە لە سوننەت و بەڵێنی. لە ئەندامی و ویست). ئەم واتایە بە شێوەی ناوەڕۆکی دژی تاکخوازی سەردەمی رۆشنگەری بەکار دەبەن. نیسبت باوەڕی وایە کە بنەماڵە، خزم و تایفەگەری، گەڕەک، گوند،

ئەنیسە، یان جەماوەری خەڵک (بە گشتی ئاشکرا لە بابەتی مێژووییەوە ووکوولەکانی راستەقینەی گەورەتری بەناوی کۆمەڵگەن. ئەم کەسە شێوە ەتومیانەی یاسای سەیر و سەمەرەی سروشتە، نەک بە شێوەی لەبن هاتووی ڕوداوە راستییەکان، زانستی مرۆڤی راستەقینە دەدرێتە قەڵەم).[80] باوەڕی یی کۆمەلایەتی لەسەر ئەم بڕوایەیە کە پێناسەی قووڵتر و واتای پێوە ەلاواسراوی سەرچاوەی دلخۆشی و لەش ساخی مرۆڤ بووە. ئەم ناوەڕۆکە کۆلریج، دیزرائیلی و دواتر ت. س. ئەلیوت و کریستۆفر داونس لەگەل بەهێند ەگرتنێکی نەک ئەوەندە شاراوە سەبارەت بە کۆمەلگەی لیبرالی تاکخواز و لە ەرامبەر لەگەل کۆمەلگەی شوانی و نیوە دەرەبەگایەتی هێناویانەتە ئاراوە.

یەکێک لە واتا دەروونییەکانی کۆمەڵگەی ئۆرگانیک رێزگرتن لە داب و ەریتە. پابەندی بە سیستەمی مەوجوود پێویستی بە حەقیقەت گەیشتنی بایەخی سوننەتە. سوننەت عەقلانییەتی زۆرتری لە تاکەوە. هەیە. چونکە لە تەنینەوەی شێوەی دیاریکراو بۆ ژیانی بەرە یەک بە دوای یەکەکاندایە. بە پێچەوانەی ەندیشە لە ریشە هاتووەکان، دەکرێ باوەڕ بە سوننەت بکەی. خۆی لە خۆیدا گۆران لە دەروونی سوننەتا حاشا هەڵنەگرە. شتێک کە حاشا هەڵگرە، (رۆحی حوخوازانەی نوێخواز)یە کە دەیەوی جێگا عاقلانەکان بە هۆی خودی گۆڕینەوە، گۆری. سەرەنجام ئەمەکە، پابەند بە سیستەمی ریشەدار بە واتای ئەوەیە کە بۆ پەبەندی سروشتی نایەکسانی لە کۆمەڵگە رێز دابنێین. گشت رێبازە پارێزگارەکان، بێجگە لە پارێزگاری لیبرال، لایەنگری ئەم ئەندێشەن. سیستەمی کۆمەڵگە هەمیشە هەلگری وجوودی دەسەلات و رێبەری سروشتی تاقم یان تکی شارەزا و لێهاتووە. ئەو جۆرە کە ئالیسۆن دەلی: (ئەگەر بڕیار بێ ئەدەبیات، هونەرەکان و کۆمەلگە بوونیان بێ، بوونی سلسلەمەراتب، دەسەلات و کردەوەی دەسەلات و زوڵم و زۆریش پێویستە).[81] بەرەک ئەم رێبەرایەتییەی ە مافی سەرمایەدارییەتی سروشتی دەزانی. لە حالێکدا کە بەرەک، مستێر، موزر و نووالیس بیر لە سلسلەمەراتب و سەرمایەدارییەتی زەمینداری پایەدارتر دەکەنەوە، کالریج و ئەلیوت لە ئەندێشەی لێزانان و شارەزایانی بەربلاوتر

ڕۆشنبیران دەگرێتەخۆ؛ کالریج بە (ڕۆحانییەتی میللی) و ئەلیوت بە (ئومەتی مەسیحی) ئاماژە دەکا.[82] ئەم و ئەوی وەکو و.ە. مالوک لە کتێبی سەرمایەدارییەت و تەکامولی باوەڕی سەرمایەدارییەتی شایستەسالاری دێنێتە ئاراوە و ئەوە بۆ حکوومەت شیاوتر دەزانی.[83] نووسەرێکی دیکەی پارێزگاری باوەڕی هەیە کە خالی گرنگی ناوەڕۆکی سەرمایەدارییەت شارەزای هەڵبژێراو نییە بەلکوناخ و سفەتی ئەخلاقی ڕێبەرایەتی لە (خزمەت ئەرک ناسانە بە گشتی خەڵک، سووربوون و پێداگری لە چۆنیەتی و پێوارەکان و ئەدەب و ئەخلاقی چاوەدێری لەسەر ئەرکەکانی سەرمایەدارە).[84]

بە هۆی ناتەواوی سروشتی مرۆڤ، حکوومەت پێویست و زەروورییە. بە بۆچوونی پارێزگاران حوکوومەت بەخشەندە و باشە، بەلام تێکەڵی لە خۆناگرێ. جۆراوجۆریش لە جەوهەری حوکوومەتا نییە. نووسەرانێکی وەکو مستێر و موزر راشکاوانە بیر لە ڕژێمە وێچووە دەرەبەگایەتی و پاشایەتییەکان دەکەنەوە. تەنانەت لە بریتانیای سەدەی نۆزدەیەمدا، تامس کارلایل، لەسەر لێواری ئەندێشەی پارێزگاری بە حەواوە مابووەوە، بی سەبرییەکی قوولی سەبارەت بە پێکهاتەی پارلەمانی بریتانیا و پرسیاری پاڵەوانان و ڕێبەرانی دیکتاتۆری بە هێزی وەکو ئۆلیوێر کرامول لە خۆی نیشان دەدا. لەگەڵ ئەمەدا. بەرەک و زۆرینەی سوننەتی پارێزگاری بریتانیا لەگەڵ بوونی هاوکێشی لە حوکوومەتی یاسا و حوکوومەتی پارلەمانی هەستیان بە شادییەکی زۆرتر دەکرد.

حوکوومەت دەبێ قالب و چوارچێوەیەکی بەهێزی بۆ یاسای دیاریکراوی بەڕێوەبەر و داب و نەریت کە پارێزگاری ئاشتی، عەدالەت، ئازادی و خاوەندارییەتی بن، بێنێتە ئاراوە. بە بۆچوونی زۆرینەی پارێزگاران. حوکوومەت پێویستی ژیان بوو کە بیتوانیبا لایەنە جیاکراو و هۆکارەکان بی. پارێزگاران بیجگە لە تاقمە لیبرالەکان و لایەنگرانی بازار، لە کەڵک وەرگرتن لە دەسەلاتی دەوڵەتی ترسیان نەبوو. پارێزگارانی ڕۆمانتیک و باوکسالاری دەربارەی حەز و مەیلی خۆیان بە سوود وەرگرتن لە دەوڵەت بۆ یارمەتیدان بە

ـ.ۆستکردنی ژیانێکی باشتر بۆ مەدەنییەکان بەتەواوی شێلگیر و کرژ بوون.
ـ.ێزگارانی (مامناوەندی) مەک میلان و ئەمانیتر لە ئەندێشە یەکگرتووەکان،
ـو.ێریەتی کینزی و چالاکی روو بە گەشەی دەولەت لە دابینکردنی کۆمەلگە،
ـێ.کردن و پەروەردە و چاوەدێرییە پاک و خاوێنییەکان و دەرمانی کەلکیان
ـو.رگرت. حزبی پارێزگاری ئینگلیس یەکەم حزب بوو کە پرۆژەی نەتەوەیی
ـکـ.نی لە سالەکانی نێوان دوو جەنگی جیهانی دەسپێکرد. ئەو چەشنە کە ئەم
ـکـ.رە دەسپێکی سوود وەرگرتن لە رادێوی دەولەتیش هاوکات لەگەل ئەو بوو.
حگە لەوە، واتای دەولەتی تەبا و رەبا لە زۆربەی کۆمەلگە ئەوروپاییەکاندا هەر
ـەو رادە کە پێوەندی بە ئیدئۆلۆژییەکانی دیکەوە هەیە، پێوەندی بە
ـ.ڕێزکارانیشەوە هەیە.

ئەگەرچی ئارمانجە تایبەتییەکانی پارێزگاری دەربارەی دەولەت بوونی
هەیە. لایەنە گشتییەکان هەن کە شایانی باسن. سەرەتا ئەمە کە پارێزگاکان
ـڕژی حوکوومەتی تایبەتەن سەرەڕۆ بوون. ئەوانە لایەنگری حوکوومەتی بێهێز
ـێن. لایەنگری شتێکن کە زۆر بەهێز بێ هەتا سیستەمی ناوخۆ و دەرەوە
ـپارێزێ، بەلام لە بابەتی یاساشەوە بەرتەسک و هاوکێش بێ. ئەوان هەمیشە
ـ.وەریان بە یاسای بنەڕەتی نییە. یاسای بنەڕەتی وەکو یاساداندراوەکان و
ـافە نووسراوەکان مانای راستەقینەی نییە. میتود و مافەکان بەرهەمی سالیانی
گورانکاری کۆمەلایەتی و سیاسین.[٨٥] یاسا نووسراوە بەیانکراوەکان لە داب و
نەریت، پێشەکی ئامادەکراون کە یەکگرتوویی بە کۆمەلگە دەبەخشن. ئەو جۆرە
کە مستێر بەلگەی هێناوەتەوە: (ئەگەرچی یاسا نووسراوەکان هەر تەنیا
بەیانییەگەلێکن لە مافە پێشوەکان، ناکرێ هەموو شتێک بنووسرێ؛ لە راستیدا
هەمیشە لە هەر حوکوومەتی یاسایدا شتێک لە ئارادایە کە بۆ نووسین نابێ و
دەبێ... بەنرخی رەنجی داخهێنەری دەولەت شاراوە بمێنێتەوە.[٨٦] بە بۆچوونی
مستێر، یاسا بنەڕەتییەکان مرۆڤەکان چاوکراوانە بە دیان نەهێناوە بەلکو بە
یارمەتی خودا و خۆی لە خۆیدا دەردەکەون. بەرەک بەرادەی مستێر ناچێتە
پێشێ، بەلام هەر ئەو ئەندێشە پرەنسیپە دەربارەی یاسای بنەڕەتی دێرینە چاو

بەسراوانە لـە فیکـری ئەویـشدا بـوونی هەیـە. تەنانـەت نووسـەری پارێزگـاری دواکەوێ وەک ڕێژە هەست دەکا کە ناچارە یاسای بنـەڕەتی ئـەمریکا لـە چنـگ یاسا بنەڕەتخوازی لیبرال دەربێنـێ و لـە بناخـەوە، بەڵـگەی ئـەو وەهـا دەلیـر دێنێتەوە کە یاسای بنەڕەتی ئەمریکا، بێجگەلە (فەرمانی مافـەکانی مەدەنییـەت، زۆرتر واتای دیکەی ئەو وەکو جودایی دەسـەڵاتەکان، زاتـەن لـە داب و نـەریتی دێرینەی نەنووسراو ئیلهامی وەرگرتووە.[87]

وەها یاساگەلێک یاسای بەناوی هەلگری پێکهاتەی زاڵ، نایەکسانە یەکـدەنـگ بوونی دەسەڵاتەکان، و ڕێبەرایەتی سروشتی یان سەرمایەدارییەتە. پێشمەرجی ئەمانـە بـوونی بەرتەسـکەیەتی دەسـەڵاتەکان، پـشتگری لـە بـڕێک مافـەکان دەربارەی ئازادی و مالکیەت و تارادەیەک نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنییە خاڵی دوایی، هەر ئەو چەشنە کە ڕاپۆرتی ئەندێشەی لیبرالی کلاسیکا بەفـەرمـی باسکراوە، هەلگری جیاوازی بابەتی و یەکدەنگییە. لە ڕاستید، جودایی یەکدەنـگ بوو لە کۆمەڵگەی ئۆرگانیکیدا بە چاوی ڕەشبینانە سـەیرکراوە. ئەگـەر مـەدەنی بەشێک لە پێوەندی یەکگرتوویی تاک بووبا، چۆن جودایی دەیتوانی ڕوویدا؟ بەم حاڵەوە، پارێزگاران، بەتایبەت پارێزگارانی لیبرال، بایـەخی ئـەخلاقی و سیاسـی ئاقاری تایبەتیان قبووڵ کردووە.

پارێزگارانی سوننەتخواز، ڕۆمانتیک و باوسالار بایـەخێکی زۆریـان داوە بـە مافەکان. ئەم مافانە، هەر ئەو مافە تاکخوازیە لیبرالیانە نین. ئەوانە مافی تایبەتی. سروشتی یان بەر لە کۆمەڵگە نادرێتە قەڵەم. مافەکان بریتین لە بـەدەس هێنـانی بەرهەمە شیاوەکانی کۆمەڵگە. بە وتەیەکی دیکە، مافەکان ئـامێرە تاوێنـەرەکانی مەسەلە لە دەروونی کۆمەڵگە سیاسییەکانە. ئەو جـۆرە کـە بێژرێکـی پارێزگـار بەڵگەی هێناوەتەوە: هەر ئەو چەشنە کە نـاتوانی زمـانی تایبـەتیت ببـێ چۆنکـە وشەکان واتای خـۆی لـە بـەکاربردنی ئـەوان وەردەگـرێ، لەبـەر ئەمـە، حاشـا هەڵنەگرە کە پێگەی زمان کۆمەڵگە بێ...، هەر بەم جۆرە، مافـە تایبەتییـەکان کـە هیچ کەسێکی دیکە وەرگری ئەو نەبێ هەروەها ناتوانی بتبـێ. کاتـێ دەربـارەی ماف ئاخاوتن دەکەین، دەربارەی ژیانی کۆمەڵایەتی وتووێژ دەکەین.[88]

مافی خاوەندارییەتی ئەگەرچی بنەڕەتی، مافی نەگۆڕ هی تاک نییە. بەڵکو بە پێچەوانە مافێکە کە (بەپێی بەڵگە مەزهەبی و شەرعی) لە لایەن کۆمەڵگەی سیاسییەوە قبووڵ کراوە و مۆری تەئیدی پێوە چەسپاوە. رەنگە ئەم مافە بەخێکی پرەنسیپی بۆ وەستانی کۆمەڵگە نەبێ، بەلام هێشتا پێناسە و بوجوودیەتی تایبەتی تەواوی نییە. هەروەها ئەم مافە لە روانگەی زۆر لە پارێزگارانەوە هەڵگری سەختی و بەرپرسایەتییە.[89]

بێجگە لەمە، خاوەندارییەت وەبیر هێنەرەوەی ئازادییە، (هیچ کەس بەتەواوی ئازاد نییە مەگەر ئەوەکە خاوەنی مافە خاوەندارییەکان بێ).[90] ئازادی بەئازادی دانراوی لیبرالی نەزانراوە، واتە ئازادی کردەوەی دژە سەپاندن و دژە زۆر.[91] پارێزگارانی سوننەتخواز و باوکسالار هەمیشە ئازادیان بە مافی یاسای باڵای سوننەت و حوکوومەتی یاسا دەزانن. گریمانەی پێشوو لەسەر بوونی ژیانی سەرەتی دارژاوە. ئەم ناوەڕۆکە گرنگە لە سوننەتی پارێزگاریدا ئەژمار دەکرێ.[92] ئازادی بە پشتگری لە تاک (هەمیشە لە بنەماڵە) و مالکیەت ئەوەوە گری خواردووە. لەگەڵ ئەمەدا، ئازادی بایەخێکی نەگۆڕ نادرێتە قەڵەم. ئازادی پەیوەندی بە ئامانجەکانی کۆمەڵگەوە هەیە. ئازادی بێوەستان سیستەمی کۆمەڵگە بێهێز دەکا. ئازادی دانی زۆر بە هەر کەس کە لە رەوەندی سیاسیدا بەشدار بێ، ئازادی بە دەست نایە. ئەمە تاوانە گەورەی ژاکۆبنەکان و پاشان سۆسیالیستەکان بووە. مەدەنی هەر دەوڵەتێک لەگەڵ بوونی دەسەلات و حوکوومەتی یاسا ئازادی هەڵدەسەنگێنێ.

جێی خۆیەتی بڵێین کە پارێزگاران بە شێوەی گشتی، تەنانەت کەسانێک کە باوەڕێکی لیبرالتریان هەیە، بەراستی لایەنگری بایەخی دیموکراسی نەبوون. بە بۆچوونی زۆربەی نووسەرەکان، بەتایبەت بەرەک، مستێر، شارل مورا، موریس باریس، سێر هێنری مین، ویلیام لکی، ە. و. مالوک، ت. س. ئەلیوت و کریستۆفر داوسن، دیموکراسی راستەقینە هەڵگری بوونی یەک بۆچوونی و سەرەڕۆی تەواو و روخێنەری ژیانی سیاسی هاوکێش و ئازادە. بێزاری لە دووپاتکردنەوەی زۆری دیموکراسی لە نووسراوەکانی لیبرالی کنستان،

توکوویل، جان ستوارت میل و هایک و هەروەها تاقمێکی بەربلاو لە نووسەرە ئەوروپاییەکانی وەکو یاکوب بورکهارت، و قبوول کردنی نیچە و رەنگە ئۆرتگای گاست لە کتێبە بەناوبانگەکەی بە ناوی هەستانی هەمەلایەنەی جەماوەریش بێتە بەرچاو.[93] لەبەر ئەمە، هەر تەنیا پارێزگاران وەها بێزاری ترسێکیان نەبووە.

دیموکراسی، لە شێوەی پێکەوەبوون خوازانەی نابەرتەسکیترین خۆیدا، بە جۆری دەروونی لە زۆربەی بزاڤە شۆڕشگێڕییەکاندا هاتووەتە ئاراوە دیموکراسی هەروەها لەگەڵ باوەڕە نگەران کەرەکانی دەسەڵاتی خەڵکیش پێوەندی بوو. بە بۆچوونی زۆربەی ڕێبازە پارێزگارییەکان، مرۆڤەکان ناتوانن خودبەخود حوکوومەت بکەن؛ ئەوان بە یارمەتی و ڕێنوێنی شارەزایانە و ئاقڵانەی حوکوومەتی سروشتی هەڵبژێراوەکان پێویستیان هەیە. ئازادی لە لایەن دیموکراسییەوە بەرهەم بە دەستەوە نادا. مورا لە فەڕانسا و داوسن لە بریتانیا لەگەڵ ئەم مەنتقە دەستیان کرد بە رەخنە گرتن لە دیموکراسی پەرلەمانی بەرتەسک.[94] لە دەهەکانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠، ئەم ڕێبازە وەسوەسە هەڵایسێنە سەرنجراکێشە بۆ پرەنسیپی پارێزگار لە ئەڵمان و بریتانیا بوو، بەڵام لە فەڕانسا و بریتانیا بوو بە دەرنجامێکی جۆراوجۆر. کۆمەڵگە پێویستی بە دەسەڵات و پلەبەندی هەیە کە لەگەڵ دەسەڵاتی خەڵک ناسازگارن. بە بۆچوونی پارێزگاران، دیموکراسی بێخەوش هەڵگری سەرنجی بە تەوژمی بە بەرژەوەندی ئەهلی، رووخانی کۆمەڵگەی دەروونی جەماوەرەکان لەگەڵ خۆبێگانە و کاکڵەیی و کۆتایی دەسەڵات و شارسانییەتە.

زۆربەی پارێزگاکان دیموکراسی پەرلەمانیان بە شێوەی بەر بەست کراوە و بەرتەسکی ئەویان قبوول کردووە. لەگەڵ ئەمەشدا، گۆڕانکاری و برینداری و ڕاست کردنەوە لەم ئەندێشەدا روویداوە. بۆ وێنە بەرەک باوەڕی (نوێنەرایەتی بەهێز) دێنێتە ئاراوە واتە ئەمەکە تاکەکان، تەنانەت بێ ئەوەی مافی بۆچوونیان بێ، بتوانن لە لایەن ئەم و ئەوەوە نوێنەر بن. بەرەک بە ڕاستی بۆچوونێکی کەمی لە بیردا بوو. ئەم بیرکردنەوە گشتییە لە سوننەتی پارێزگاری بریتانیادا

ڕیشەی داکوتاوە. ماریتن پو سەرنجی داوەتە رۆحی ئەم خاڵە. کاتێک کە
ـدنووسێ پارێزگاران (و لیبراڵەکان) ی سەدەی نۆزدەیەم:
رایان دانەبوو کە سیستەمی ئەوان دیموکراسییە، واژەیەک کە رەنگ و بۆی
وەڵاتانی کیشوەری بوو و هەڵگری تایبەتمەندی یەکسانی توندوتیژی کۆمەڵگەی
ئەمریکایی بوو، بەڵکو زۆرتر سەرنجیان بە حوکوومەتی کارتێکراو و کارامە کە
ئازادی) دەستەبەر بکا و بە شێوەی پەرلەمانی بێ، بوو. نوێنەرایەتی
ڕاستەوخۆ لە بابەتی عەقڵ و سەربەخۆیی ئەو، لایەنی ماددی ئەو لە کۆمەڵگە،
فێرکردن و پەروەردە و زانیاری سیاسی بۆ کردەوەی ماف رەئیی پەرلەمانی
تایبەت تر بوو.[٩٥]

ئەم و ئەو دیانتوانی بە جێی کەسانێک کە مافی رەئیان نەبوو، قسە بکەن:
خاوەندارییەکان بە جێی وەرزێڕان، پیاوان بە جێی ژنان و زارۆکان،
خوێندەواران و ماڵکان بە جێی نەخوێندەوار و بێزەوی و زاران. ئێستاش
رەنگبێ کەسگەلێک هەبێ کە کینەی خولەکانی ساڵی سەرەتای سەدەی حازری
لە لۆرد سالیسبووری سەرۆک وەزیری پارێزگاری سەبارەت بە دێموکراسی
هەست پێ بکا و لە دڵیدا مابێ.[٩٦] هەر ئەم دوایانە، راجێر سکرۆتۆن دێموکراسی
بە (نەخۆشییەکی واگیردار و پێوەنەر)ی کۆمەڵگەی بریتانیای ناودێر کردووە.
لەو لە بارەی پێوەندی نێوان دەوڵەت و یەکێتییە مەدەنییەکان بە شێوەیەکی
شوومەوە دەڵێ: (جەوهەری راستەقینەی پێوەندی نێوان دەوڵەت و یەکێتییە
مەدەنییەکان هەر تەنیا سەردەمێک دەکرێ باش دەرک بکرێ کە پرەنسیپی
دێموکراتێک وەلابنرێ).[٩٧] دەرەنجام لە دەیەی ١٩٨٠ بە بۆچوونی ئەسکرۆتون
مەنتقێک دێتە گۆرێ کە بە دامەزراندنی رۆژنامەی پرۆپاگەندەی پارێزگاری، بە
توێژینەوەی سالیسبووری یارمەتی بکا.

لەبەر ئەمە، ئازادی رەسەن هەڵگری زۆر و ئیجباری کۆمەڵگەیە. تەنانەت
پارێزگارانی نوێ لەسەر ئەو باوەڕەن کە بریتانیای پاش جەنگ (لەگەڵ کەڵک
وەرگرتن لە شێوەی لێکۆڵینەوەیەک لە پرگرین وورسترۆن) لە رادەبەدەر ئازاد
بووە. وورسترۆن، لەگەڵ بە ئاگاکردن دژی سەرهەڵدانی پارێزگاری لیبراڵ لە

دەیەی ۱۹۸۰ بەڵگە دێنێتەوە (پێویستی خێرا ئەمڕۆ بۆ دەوڵەت بەدەست هێنانی هەوساری دووبارەی... (خەڵک) و بە دەسگرتنەوەی دووبارەی دەسەڵاتی خۆیەتی. بێ سوودە فیکر بکەنەوە کە ئەو کارە بە یارمەتی وەرگرتن لە پاشماوەی ئازادییە رەسم کراو و وێنەگیراوەکان لە لایەن نووسراوەکانی ئادام سمیت، جان ستوارت میل، و لیبرالیزمی سەدەی نۆزدەیەمەوە دەس دەدا).[98] ئاخاوتنی ئازادی دەربارەی خودموختاری تاک نییە، بەڵکو بە پێچەوانە دەربارەی تەئکید لەسەر برێک مافی سوننەتی لە دەوڵەتێکی دامەزراوە.

باوەڕی ئازادی ئاشکرا لەگەڵ کەمترین یان جۆرترین روانگە سەبارەت بە یەکسانی، یەکسانی لە ئاست یاسا، جیاوازی هەیە. لە شعووری پارێزگاریدا، داوا یەکسانییەکانی کۆمەڵگە، ئابووری و سیاسی لە ئاستی داواکارییەکانی ژاکۆبینیزم یان سۆسیالیزمدایە. خەڵک دەبێ پێگەی خۆیان لە کۆمەڵگەدا بناسن. بەرای زۆرنەی پارێزگارانی سوننەتخواز، رۆمانتیک و باوکسالار. مرۆڤەکان بەپێی سروشتی خۆیان نایەکسانن. برێکیان بە هۆشترین و بەرژەوەندییەکی زۆرتر بە دەس دێنن، برێک لە بابەتی بنەماڵەوە بەختەوەرترن، هێندێ بۆ حکوومەت زاناترن. کۆمەڵگە پێویستانە و بە جۆرێک پلەبەندی نایەکسانییە.

## ئابووری

لە ئیدئۆلۆژی پارێزگاریدا دوو هەڵویستی سەرەکی دەربارەی ئابووری هەڵبژێراوە. یەکەمیان کە رەنگدانەوەی رێبازە سوننەتخوازەکان، رۆمانتیک و باوکسالارییە حەز دەکا کە هەڵوێستی گومانلێکراوەنەتری سەبارەت بە واتای ئابووری بازاڕی ئازادی ببێ. هەڵوێستی دووەم زۆرتر لایەنگری بازاڕ و هەڵواسراو بە پارێزگاری لیبرال و چەند لایەنێک لە باوەڕی (راستی نوێ) وەیە.

دیالۆگ دەربارەی روانگە ئابوورییەکانی پارێزگاری دەگەڕێتەوە بۆ یەکێک لە باوەکە دامەزرێنەرەکانی ئەم رێبازە واتە ئەدمۆند بەرەک. کۆمەڵێک تۆژەر ئەو بە بێژەر و لایەنگری ئاشکرای روانگەی بازاڕی ئازاد، بەتایبەت لە رەسالەکەیدا بە ناوی ئەندێشەگەل و بەشبەشکردن دەربارەی کەمی و نەبوون

دەزانن. گوتراوە کە جیاوازییەکی زۆرکەم لە نێوان ئەندێشەی بەرەک و ئادام سمیتدا هەیە. بەڕای رابرت ئەکلش، لە ئاسەواری بەرەک (بۆ یەکەم جار ئابووری بورژوایی لەگەڵ واتای دێرینەتری کۆمەڵگە بە ناوی پێکهاتەی دەستووری پێکەوە گرێی خواردووە).[99] کەمتر کەسانێکی دیکە لەژێر کاریگەری ئەم روانگەدا. یان گیلمور نووسراوەکانی بەرەکی دەربارەی ئابووری سیاسی بەلادەر دەزانێ کە هێندێ باوەڕ (متافیزیکی وەحشیانە) لەو رێوە دۆزیویانەتەوە.[100] لە لایەکیترەوە، ئاین هەمپشر مانک زیرەکانە لەسەر ئەم باوەڕەیە کە لە نووسراوەکانی بەرەکدا (بەڵگەی سیاسی راستەقینە بۆ بازرگانی ئازادی رێکوپێک کراوی دژی مالیات وەرگرتن بۆ ئەمە بوو کە دەس پێراگەینی پاشایەتی بەسەر دەسکەوتە جەنگییەکانی ئیمپراتۆری بەرتەسک کاتەوە و دەرەنجام سەرچاوەی ئەو بۆ ئیدارەی ولات تەنگ کاتەوە. بەرەک بۆ بازرگانی ئازاد پێویستی بە بەڵگە ئابوورییەکانی ئادام سمیت نەبوو).[101] لەم واتایەدا، لە بەڵگەکانی بەرەکدا زۆرتر هۆکاری سیاسی لە ئارادا بوو هەتا هۆکاری راستەوخۆی ئابووری.

لەگەڵ بوونی بایەخێک کە پارێزگارانی لیبرال لە دەیەی رابردوودا بوویانە و تەئکیدێک کە لەسەر بازاڕی کردوویانە، زۆرتر باوەڕەکانی ئەو، رەنگدانەوە باوەڕە رەسمییەکانی لیبرالیزمی کلاسیکە. لەبەر ئەمە، خاڵێکی چەندان زۆرتر لەوەی کە پێشەکی لە بەشی دووەمدا دەربارەی بازاڕەکان بەیان کرا، بۆ لەسەر رۆیشتنی لە ئارادا نییە. بەم حاڵەوە، دەبێ بڵێین کە پارێزگارانی لیبرالی دەربارەی لێهاتوویی و شایستەیی مرۆڤ کەمتر لە لیبراڵە کلاسیکەکان گەشبینن. بەڕای ئەوان بازاڕ کەمتر پێویستی بە قالب و چوارچێوەی قەویتر و ئەمینتر لە بابەتی یاسا و نەزمەوە، سەبارەت بەوەی کە جێی سەرنجی لیبراڵە کلاسیکەکان بوە، هەیە. لەم رووەوە پارێزگارانی لیبرال بۆ پشتگری و بالابردنی بەرژەوەندی بازاڕ زۆرتر مایل بە سوود وەرگرتن لە بوونی دەوڵەتن، ئەگەرچی وتووێژە ناوخۆییەکان دەربارەی بازاڕ و پرسینەوەکانی کۆمەڵگە، بەتایبەت لە

پێوەندی لەگەڵ هێندێ پێشنیارەکانی (ڕاستی نوێ) لە نێوان ئەوانەدا لە حاڵی تەنینەوەدایە.[١٠٢]

بە پێچەوانە، زاڵبوونی پارێزگاری لیبراڵ و (ڕاستی نوێ) لە ئەورووپا و ئەمریکا لە دەیەی ڕابردوودا حەقیقەتی ئاشکرا ئەوەیە کە بڵێین زۆربەی پارێزگاران لە بابەتی مێژووەوە بۆچوونێکی ئێستا و پڕ لە گومانیان سەبارەت بە بازاڕە نارێکوپێکەکانیان بووە. ئەمە بەو مانایە نییە کە ئەم پارێزگارە سوننەتخواز و باوکسالارانە لایەنگر شتێکی وەک ئابووری دەستووری بووبێتن. ئەوانە هەمیشە ڕێڕەوی پراگماتیک و بەرژەوەندخوازانەتر و نەرم تر سەبارەت بە بازاڕەکان لە لایەن پایەبەرزە پێناسەکراوی کۆمەڵگەیان قبوول بوو. لە ڕاستیدا ئەندێشەی (مەسیحییەتی دیموکراتیکی ئەورووپایی) دەربارەی (ئابووری بازاڕی کۆمەڵایەتی) زۆرتر لەگەڵ سوننەتی پارێزگاری دەگونجێ.

بەرێنکردنەوەی پیشەسازی و ئابووری بازاڕی هەڵگری پێڕەوی لە بەرژەوەندی تایبەتی و وەسەریەکنانی سەرمایەیە. پارێزگاری دەربارەی ئەم بابەتە هێندێ وەڵامی زیرەکانەی هەیە. هێندێ لە پارێزگارانی ڕۆمانتیک دەربارەی بە پیشەسازی کردن و ئابووری بازاڕی ئاشکرا خاوەنی بۆچوونێکی زۆر وردبینانە بوون، هەموو هەتا کاتێک ئەم پرۆژانە لەسەر بایەخە سەرکەوتووەکانی وەک کۆمەڵگە کارتێکراوی خراپیان نەبوو، لەگەڵ ئەوان دەحاوانەوە. نووسەرانی جۆراوجۆری وەک کالریج، ساوتی، لامونە، مورا، و ئەلیوت نگەرانییەکی قووڵیان سەبارەت بەم پرسیارە هێنابووە ئاراوە کە ئایا ئابوورییە بازاڕییەکانی لیبرالی بۆ کۆمەڵگەی ڕەسەن موناسیبن یان نا؟ ئەلیوت لە کتێبی باوەڕی کۆمەڵگەیەکی مەسیحیدا زۆر بە داخەوەیە لە مەیکە:

عەیبی دەسەلاتدار بەسەر تافی ئێمەدا... تەماح و حەز و ئارەزووو و کۆکردنەوەی سامانە. بێگومان شتێکی هەڵە لە دیتنی ئێمە سەبارەت بە دراو و پارە بوونی هەیە. زۆرخوازی کۆکردنەوەی لە ڕادەبەدەری سامان زۆرتر لە غەریزە داهێنەرەکانی مەعنەوی هاندەدرێن... من بە هیچ کولۆنجێک دڵنیانیم کارێکی شیاوبێ کە دەسکەوتی خۆم لە ڕێگای دانانی بەشێک سەرمایە لە

...نیایەک بە دەس بێنم... سەبارەت بە ئەخلاقی بوونی ژیانم لە لایەن ...خۆریشەوە دلنیایەکی کەمترم هەیە.[102]

...ندان بۆ بەدەس هێنانی تایبەتی و حەز و تەماح، باوەڕەکانی بازاڕی ...ەکە دەکاتە ناوەڕۆکی، دژایەتی لەگەڵ هونەر، بێ کەلتووری لێ دەزێتەوە و ...کردن و پەروەردە و فەرهەنگ لاواز و بێهێز دەکا.[104]

...جگە لەمە، ئابووری بازاڕی لەگەڵ بەدی هاتنی نەداری (کالریج عادەتی بوو ...وری سیاسی لیبرالی ناوبنێ ئامێری بە توانای هەژار سازی) هەر بە ...ەوە کۆمەڵگەی ئێستە دەگرێتەبەر.[105] لە راستیدا وادێتە بەرچاو کە ئەم ...ینەوانە لە قۆناغە سەرەتایەکانی رەوەندی بازاڕ لە دایک دەبن. بەڕای ...، دیباچەگەلێک لە ئینگلستان، نووسراوەی ساوتی وەک پەیڕەونامەیەکی ...سیالیستی دژی سیستەمی کارخانەکان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم دایە.[106] ...تیش، وەکو کالریج و ئەوانی دی، لە ئابووری سیاسی لیبرالی بێزار بوون و ...یبی جادەی گوندەکان، خۆی لە خۆیدا نوکتەگەلێکی سەیر و سەمەرە ...دربارەی مالتوسی تێدا نووسراوە.[107]

یەکێک لە توێژەرانی کالریج لەگەڵ رادەربڕینی لایەنگەرانەی بۆچوونەکانی ...وی دەربارەی مالیاتی لەگەڵ ئەندێشە ئابوورییەکانی سەدەی بیستەم ...دربارەی بەکارهێنانی کەم بەراورد دەکا. کالریج بانگهێشتنی دەکرد کە (رۆحی ...دولەت) ی نیشتەجێی (رۆحی توجارت) دەکەین. بە بۆچوونی کالریج خولەکانی کەسپ و کار لە ئابووری بازاڕی (نەک هەر ژیانی سەخت و پڕ لە کوێرەوەری بۆ هەژاران بەرهەم دێنێ بەڵکو دەبێتە هۆی هێنانەخواری ئەخلاقی هەموو کۆمەڵگە).[108] بێجگە لەمە، فیکری گشتی ژیان و مرۆڤایەتی کە لە ئابوورییەکانی لیبرالی کلاسیکیدا دەرکەوتووە، بە درۆ دەزانرا. ئەم روانگە ...رووخاوە، بێبەهرە و مکانیکی دەدرایە قەڵەم. بە بۆچوونی کالریج، مرۆڤ هەر تەنیا ماشێنە جەماوەرییەکانی سامان نەبوون. تەندروستی کۆمەڵگەباش نەدەکرا تەنیا لەگەڵ تەبا و رەبای ئابووری ئەو پێوارە بکرێ و هەڵسەنگێندێ. ئەم بۆچوونە بەرتەسکانە لە ژیان هەموو بایەخەکانی دەڕووخاند. بەم شێوە، بۆ

ڕۆحی بازرگـانی وەکـو ڕاسـتییەکی بـەرچاو بـە حـەز و تەماحـەوە دەڕوانـین کالریج چاودێرییەکی دەخستە بەرچاو کە لە پارێزگـاری ڕۆمـانتیکی ئاڵمانیـشد دەبینـرا. لـەم سـەدەدا، مـورا و (دەس بـەکار بـوونی فەڕانـسەوی) (ئاکـسیۆن فەڕانـسز) دژایەتییـەکی بـە تـەوژمی ئـەوتۆی لەگـەڵ سـەرمایەداری لیـبرال و مـاددەخوازی مـەوجوود لـەودا نیـشانیان دا و یەکگرتوویـیـەکی بۆچـوونی زۆرتریان لەگەڵ سەندیکالیزمی سووڕێل هەیە.[١٠٩]

لەگەڵ ئەم حاڵەدا، پارێزگاران و ئابووری زانانی لیبرالی کلاسیک وەک یـەک بایـەخی خـاوەنـدارێتی خوسووسـیدا هاودەنـگ بـوون. تـەنیا جیاوازییـەک لـە ڕوانگەی ئەواندا بوونی بوو. خاوەندارێتی بە دەس هـاتوو لـە لایـەن ڕەوەنـدی بـازاڕی لیبرالـەوە دەیتـوانی لەگـەڵ وێنـەی سـوننەتی دەسـت لێنـەدراوەکـانی خاوەندارییەتـا دەسـتتێوەردانیـان ببـێ. لێـرەدا بـەرخۆدانی پیـشەسازی نێـوان ئـەوەی کـە خـاوەنـدارێتی سـەرمایەداری خـاوەندارییـەتـی نـاودەنرا لەگـەڵ خاوەندارێتی ماڵی بوونی بوو. بە بۆچوونی لیبراڵەکان، هەر کەس، چاوپۆشی لە پێگەی کۆمەڵایەتی، دەیتوانی لە بابەتی بۆچوونی خاوەنی خاوەندارێتی ماڵی بێ و ئـەوکات ئـەم ماڵکییەتـە بـە کـرڕی لـە بـازاڕ لـە دەسـت بـدا. ئـەم واتایـە بـۆ بەرژەوەندی پارێزگاری سوننەتیتر هەراسناک دەهاتـە بـەرچاو. چـۆن خەڵـک دەیانتوانێ جێگە و پێگەی خۆیان لە پلەبەندی کۆمەڵگەدا بناسنەوە ئەگـەر وەهـا سەرمایەیەک هەر کەسێک بیتوانیبا کۆیبکاتەوە، بێ ئەوەی کـە جێگـەی تایبـەتی کۆمەڵایەتی ببێ؟ ئەم وێنە بێپایـە و لەرزۆکـە مافـەکانی خـاوەنـدارێتی ئـەرزی لاواز دەکرد و پێکهاتە کۆمەڵایەتییە سوننەتییەکان و وێنەگەلی کۆمەڵگەی سست و گەنـدەڵ دەکـرد.[١١٠] کۆمەڵـگە دەبـوو بـە خـەرمانێک لـە بەربـەرەکانی و کێبـەرکێیکان، ناهێمنایەتییـەکان، ناهەمواریـیـەکانی کەسـگەلێک کـە بـەدوای بەرژەوەندی تایبەتی خۆیانەوە بوون.

لـە پارێزگـاری بریتانیـادا، لـە کـالریج و دیزرائیلـی بـەدوا، نیگەرانییـەکان و مەسەلەی نەتەوەیی زۆرجار باڵاتر لـە بەرژەوەنـدی ئـابووری بـازاڕی لیـبرالی چاوی لێ دەکرا. نووسەران و کارزانـانی دوایـی پارێزگـاری هێشتا بـە شـێوە

-ـــايەكان و ناشـارەزايی هـەر ئـەم بۆچوونـەيان هەيـە.[111] يـەكێک لـە وێنـە
-ـكراكانی ئەم پڕۆژەيان گيلمور دەری‌خستووە. ئەو لەسەر ئەم باوەڕەيە كـە
-ـووری زانست لەسەر پێ و خۆ تەواوكەر نييە... ئابووری و ئامانجەكانی ئەو
ئـە-دسـە و ئامێرێكـە بـۆ ئامانجـە بەرينـەكانی تـر).[112] بـە بۆچـوونی گيلمـور،
ـــووری زانــانی ليـبرال، وەكـو ماركسيـستەكان لــە رواڵـەتە لــە جيهانــە
-ـستەقانييەكاندا دەژين. لۆدوويگ فۆن ميزز، ئابووری زانی ليـبرالی ئوتريـشی،
-ـێنەی بـالانوينی راسـتەقينەی هـەمان جەزمگـەلی وەكـو ماركسە. هـەر دوو
حـودن ئەنديشە لەسەر هەرێمەكان (وەكـو راز) سـوورن. گيلمـور لەسـەر ئـەو
-ـوەڕەيە كە روانگەی هەر دووكيان دەربارەی سروشتی مرۆڤ و كۆمەڵگە لـە
يەک ئاستا نادروستە. پارێزگاران هەرگيز نابێ تەسـليمی ئەنديـشە ليبرالييـەكان
-ـ لەو رووەوە كە ئەوانە ئازادەيەک (هەميشە ئەنديـشە بـە پـەيـرەوی كـردەوە
-ـەزانن و... بە شێوەی سوننەتی پێوەندييـەكی نزيكتريـان لەگـەڵ واقعيەتەكانـدا
هەيە. هەتا لەگەڵ باوەڕ و بۆچوونە).[113] لە باری مێژووييەوە، پارێزگاران زۆرتر
لايەنگری دەوڵەتن بۆ سوود بردن لە كۆنترۆڵكردنی بازاڕ. هەر ئـەو جـۆرە كـە
هەربرت سپێنسێر لە كتێبی مرۆڤ لە بەرامبـەر دەوڵـەت، گوتوويـە پارێزگـاران
هـەول بـۆ بەربەسـت كـردنی كۆمەڵـگەی تونـدوتيژن. بـە بۆچـوونی گيلمـور،
كينزخـوازی مامناوەنـدی و ئـابووری تێكـەڵاو بـۆ ئـەم كـارە گونجـاوتـرە.
كينزخوازی هۆكاری ئاوابوون و لەناو چوونی ئـابووری دوای شـەڕی بريتانيـا
ـەبوو و گيلمـور ئـەم كـارە دەخاتـە ئەسـتۆی هۆكارگـەلێكی وەكـو كـردەوە
ـەرەتايەكانی يەكگرتووە مەدەنييەكان، بەرێوبەرايەتی لاواز و سياسەتی (شـل
كردن و توند كردن) ی دەوڵەت. لەبـەر ئەمـە، ئـەو لايـەنگری گەڕانـەوە بـەرەو
تەندروستی ئابوورييە بە هـۆی حـزبی پارێزگـارەوە.[114] بـە گـشتی رۆشـنە كـە
پارێزگاری بينينێكی زۆر دوولايەنەی سەبارەت بە سياسەتی ئابووری هەيـە كـە
ڕەنگدانەوەی هەڵوێستەكانی بەتەواوی جۆراوجـۆرە. لەگـەڵ ئەمـەدا، روانگـەی
سەركەوتوو ئەو روانگەيە كە هەڵگری دوولايەنانەتر و پراگماتيكتر سەبارەت بـە
بازاڕەكان و لە هێندێ بارودۆخی كۆمەڵايەتی و سياسيدا بەسوودن.

## دەرەنجام

یەکێک لە شاراوەترین بەڵگەکان کە لە پارێزگاریدا بوونی هەیە و بەر لەمە باسیکراوە، ئەوەیە کە ئەم ڕێبازە بە شێوەی ئیدئۆلۆژی بە واتای واژەی ئاسایی نییە. پارادۆکس لێرەدایە کە ئەمە بۆچوونێکە کە هەر چەشنە ئەندێشەیەک ڕەت دەکاتەوە. بە وتەیەکی دی، ئەم جۆرە رۆشنبیرخوازییە زۆرتر ڕواڵەتییە هەتا ڕاستەقینە. بە قەناعەتگەیێنترین شیکردنەوەیەک کە بە دوای برێک ڕەتکردنەوە و حاشاگەلێکی بۆچوونی ئەندێشەیی بوونی هەیە ئەمەیە کە کەلک لە جۆرە ئەندێشەیەکی دیکە وەرگیراوە. عەقڵی کردەوەیی لەگەڵ عەقڵی بۆچوونی جیاوازی هەیە. عەقڵی بۆچوونی کە لەسەر باوەڕە پێشزەینی و پێشمەرجەکان دارژاوە، لەگەڵ سیاسەت هاوکێش نییە. لەم واتادا، پارێزگاران ناتوانن وەڵامێکی بۆچوونی ئاشکرا بە پرسیارە سیاسییەکان بدەنەوە. تاقمێک ئەمە بە بێهێزی دەزانن؛ ئەم و ئەو لەسەر ئەم باوەڕەن کە ئەمە جۆرێک بەهێزییە.[115]

دژوارییەکی دیکە ئەمەیە کە دژی رۆشنبیرخوازی بیچمی پایەدارە هەمیشەیی پارێزگاری نییە. پارێزگارانی رۆمانتیک و لیبرال یەکێکن لەم بوارەدا بێجگە لەمە، شتێکی بە تەواو مانا لە ڕێ لادەر و لەناخەوە دژایەتی لەم حاشە بۆچوونییە وەلانراوەنەدا هەیە. هێرشی ئاشکرای عاقلانە دژی کەلک وەرگرتن لە عەقڵ لە سیاسەتدا سەیرە، بەتایبەت کاتێک کە ئەم هێرشە کەلکێکی بەهێزی بۆ مانەوەی سیاسی ببێ. ڕێگای ئاسایی دەرچوون لەم تەنگانە، سوود بردن لە عەقڵی کردەوەییە. بەڵام ئایا عەقڵی کردەوەیی بە ئاشکرا جیا لە عەقڵی بۆچوونییە؟ هێندێ لە پارێزگاران باوەڕیان بەوە هەیە کە عەقڵی کردەوەیی لەسەر بنەمای سوننەت و کردەوە دارژاوە، بەڵام دەبێ لە بیرمان نەچێ کە ئەم پێوەندییەوەوە هەیە کە کردەوە و سوننەت چۆن ببینین و لێکی دەینەوە. سوننەت شتێکی تەنیا و ڕاشکاو و بێشێلە و پیلە و شاراوە نییە کە هەر تەمادار دۆزینەوە وتێگەیشتنی ئێمە بێ. سوننەت گەلێکی زۆر بە هەموو شێوەیەکی جۆراوجۆر بوونیان هەیە. بێجگە لەمانە، سوننەتگەلێک دەربارەی

عەقڵخوازی و سوننەتە سیاسییە رادیکالەکانیش رەنگە بوونیان بێ. جگە لەمە، هێندێ لە سوننەتەکان دەستەبەرێکی بە بایەخیان نییە و بێگومان هەر تەنیا بە سوننەتی بوون نابێ بە بایەخدار بدرێتە قەڵەم. سوننەتەکان و دەمارگرژی وەکو مروڤ خۆری، دژی پایەبەرزی بوون یان کۆیلەداری بەوتەواوی بۆ دژایەتی کردن دەبن و رەتکراونەتەوە و بێگومان دەبێ وەلابنرێن. لەبەر ئەمە، بۆچی دەبێ (سوننەت) یان (دەمارگرژی) خۆی لە خۆیدا و هەر لەبەر ئەوە کە سوننەتن دەبێ بە بایەخ بناسرێن؟ سوننەتەکان دەبێ لەگەڵ پێوارە عەقڵانی و تایبەتەکان بەراورد و هەڵسەنگێنرێن.

بێگومان، خۆی لە خۆیدا هیچ شتێکی هەڵە لە گۆڕینی بۆچوونی سوننەتەکاندا بوونی نییە. ئەم رەوەندە ئاسایی و دواکوتووە و هیچ گومانێک لەوەدا نییە. ئەودری بۆچوونییەکانیش زۆرجار دەبێ لە کردەوەی باشدا تاقی بکرێنەوە. ئەوانەی کە لە پێش چێشت لێنان، پاسکل لێخورین یان کۆمپیوتەر پەنا دەبەنە بەر کتێبە رێنوێنەکانی چێشت لێنا، پاسکل لێخورین و کۆمپیوتەر و ئەوانە موتالا دەکەن بێگومان خوێندنەوەی ئەم کتێبانە بۆ کردەوەی دروستتر، باشترە لە نەخوێندنەوەیان. ئەندێشە وەلانراوەکانی زانیاری رووخاوی بۆچوونی لە هەموو لایەنە چالاکییەکانی مرۆڤایەتی، بەتایبەت سیاسەت، کارێکی زەرووریبە و رێگای کردەوە هەموار دەکا.

هەر وەکو ئیدئۆلۆژییەکانی دیکە، جیاوازی بۆچوونی ئاشکرا لە نێوان شێوە جۆر بەجۆرەکانی پارێزگاریدا بوونی هەیە. هەر ئەو چەشنە کە لە پێشدا چاومان پێی کەوت، تەنانەت زۆرتر لە لیبرالیزم، هێندێ پارێزگاران سەرنجیان داوەتە مەڕامگەلێک کە تاقمێکی دیکە بە گشتی ئەوانەیان رەتکردووەتەوە. برێک پارێزگار، بەتایبەت رۆمانتیکەکان و سوننەتخوازەکان، زۆر سەرقاڵی و داخ لە دڵی خۆزگەو ئاواتەکانی رابردوون. خۆزگەی نووالیس بە ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاست، کۆمەڵگەی شوانی ئەلیۆت، رژیمی سابقی دوومستێر هەموو ئەوانە جۆرێک باوەڕەدەست لێنەدراوە زەینییەکانن کەوا دێتە بەرچاو پێشی بەرەو پێشچوون دەگرن. هەموو ئەو پارێزگارانەی کە گۆڕینیان قبووڵە، لە داوی

مەنتقی لە ناخدا دژی یەکتردا پێوەبوون: لە حالێکدا کە بەرامبەر هێندێ لە باوەڕەکاندا دەوێستن، هەر ئەوەندە کە ئەم مەرامانە جێی پێیان لە کۆمەڵگەدا پتەو کرد و گیرسانەوە و لەگەڵ کۆمەڵگە گرێیان خوارد، دەبنەوە عەقلی دێرینەی سەردەم و ئەم باوەڕانە لە ریزی سوننەت دەدەنە قەڵەم. سوننەت دەبێتە ئەو شتە کە ئێستا خەریکە رووبدا. لە لایەکی دیکەوە، پارێزگارانی لیبرال بە رواڵەت هێندێ گۆڕانکارییان بە باوەشی ئاواڵەوە قبووڵ کردەوە. لە راستیدا هاژە و گیڤە نییە ئەگەر ببێین کە زۆربەی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و ئابووری بە راستی رادیکاڵی لە دەیەی رابردوودا لە زۆرینەی کۆمەڵگە پیشەسازییەکان. بەتایبەت لە بریتانیا و ئەمریکا، بە داهێنانی پارێزگاری لیبرال ئەنجامی گرتووە کەم نین ئەو کەسانەی کە دژایەتیەکی سەیریان لەم کارەدا بینیوە. سەرسوورهێنەر دەبوو ئەگەر بماندیتبا کە لە سەدەی داهاتوودا ئەوانە خۆیان لایەنگەلێکی کۆنتری پارێزگاری سوننەتخواز و باوکسالاریان سەرلەنوێ تۆێژینەوەیان لەسەر کردبا. ئەگەر پارێزگاران لێهاتوویی و زانیاری تەواویان بۆ مانەوەی سیاسیان ببێ، بێگومان گۆڕانکاری لەواندا بەدی دێ.

وشەی (سۆسیالیزم) ریشەی لە واژەی لاتینی sociarc هەیە کە بەواتای لەگەڵ یەکدا بوون و بە یەکەوە گرێدراویان لەگەڵ یەک بەشدار و شەریک بوونە. وشەی گرێدراو بەوەوە، کە واژەیەکی تکنیکیتر،ە، لە یاسای رۆمیان و پاشان سەدەی ناوەڕاست societas بوە. واژەی دوایی دەکرێ بە مانای هاوڕێیەتی و برادەری لێک بڕێتەوە و هەروەها بە واتای ئەندێشەی یاساپەرستانەتر پەیمانی یەکگرتوو لەسەر بنەمای پێکەوە هاوکاری کۆنێوان جوامێران. لێرەدا بە دوو واتای جیاواز لە واژەی «soccal» تووش دێین کە هەڵگری ناوەرۆکگەلێکە کە دواتر لە وشەی سۆسیالیزمدا کەوتە بەر تێرامان. واژەی social هەم بە مانای پەیمانی یاسای رەسمی لە پێوەندی نێوان مەدەنی ئازاد و هەم پێوەندی خۆشەویستتر و دۆستایەتییە.

بە بۆچوونی بڕێک لە توێژەران کارکرد یاساخوازنەتر و گرێبەست تری واژەی social هەڵگری شتێکی جیاواز لە دەوڵەت، لەبەر ئەمە، بە بڕوای کۆمەڵێک، جیاواز لە سیاسەت بە شێوەی گشتییە. ئەم و ئەو هێندێ پەیمان لەگەڵ یەکتر دەبەستن بەرامبەر بە یەک هاوکێش و پەیمان دەبن، بەم دەستوورە جیاوازی گشتی نێوان کۆمەڵگەی پێکهاتوو لە کەسانێک کە ئازادانە پەیمانیان بەستووە و (دەوڵەت) حکوومەتی یاسا بەهێز دەبێ.[1] کارکردی گرێبەسی ئەم واژە بە دژایەتی نێوان شۆڕشی سیاسی و شۆڕشی کۆمەڵایەتیش پێوەندی هەیە، کە مێژوویی ئەم دژایەتییە دەگەڕێتەوە بۆ دەیەی ۱۸۰۰. بۆ وێنە کۆمەڵێک لە نووسەران باوەڕیان وایە کە شکستی شۆڕشی گەورەی فەڕانسا و رووخانی ئەو بەرەو دیکتاتۆری ناپلێئۆنی سەرچاوەی لەم راستەقینە بوو کە ئەم شۆڕشە هەر تەنیا شۆڕشی سیاسی و لە ئاستی دەزگای دەوڵەتیدا بوو. شۆڕشی کۆمەڵایەتی (بە واتای سۆسیالیستی ئەو) لە لایەن خەڵک و لەژێر چاوەدێری ئەوان و شێوەی ژیانی ئەوان نەبوو. ئەم لێکدانەوە لە بناخەوە هی مارکسە کە شۆڕشی فەڕانسەی

بــه هەڵــسوکەوتی سیاســی بــورژوازی دەزانی.[٢] لــه ســەدەی بیــستەمد سۆسیالیستەکان و ئانارشیستەکان جگـه لـەو رەخنانـه، عەیبگـەلێکی زۆریـان لـه شۆڕش دەگرت.

واتای (کۆمەڵگەی مەدەنی)، کە ئەمەش ریشەی لە دۆزی گرێبەست دابوو، هاته ناو ئابووری سیاسی و ئـەوروپایی و بەتایبـەت هاتـه نـاو ئیدئۆلۆژیگـەلێکی وەک لیبرالیزمـی کلاسـیکەوە. بـەلام لەسـەر سۆسـیالیزم و نائارشـیزمی سـەرتاییش کاریگەری هەبوو. واتایەک کە پێئر ژوزف پرودون ئانارشیزمی لە کۆمەڵگە نیشان دەدا ریـشەی لـه دۆزە گرێبـەسـتەکانـدا بـوو. ئەگـەرچی بـه شـێوەی ئاسـایی کۆمەڵگەی مەدەنی بەشێک لە رووبەڕوو لەگەڵ واتای جێگری کۆمەڵگە بـوو، واتـه مانایەک کە برا و برادەر و جەماوەر و جەماعەتی دەگەیانـد. کۆمەلـگە، بـه واتـای کۆ، لە رووبەڕوو لەگەڵ تاکخوازی رووخاو (کە بە واتایەک لە کۆمەڵگەی مەدەنید هەیـه) جێکـەوت. ئێـستە ئێمـه ئـەم جیاوازییـه لـه ئاسـت نێـوانی سۆسـیالیزم و تاکخوازی، یان کۆخوازی لە ئاست تاکخوازی، کـه لـه ئەندێـشەی ئـەوروپایی لـه دەیەی ١٨٨٠دا پەیدا کردەوە، باشتر تێدەگەین.

واتـای دەروونـی دیکـەی شـعووری بـرادەری و هاوڕێـەتی و کۆبوونـەوە لـه وشەی (کۆمەڵگە)، پێوەندی ئەو لەگەڵ ئەندێشەی دەسـەڵاتی خەڵـک بـوو. ئەگـەر (کۆمەڵگە) بە واتای گشتی جەماوەر بوو، شیاوانە دەیتوانی بـه واتـا و هاوکێـشی سەرجەم خەڵک بێ. بەم جـۆرە (ویـستی کۆمەڵـگە) دەیتـوانی بـه واتـای ویـستی خەڵک یان ویستی گشتی بێ، خاوەندارێتی کۆمەڵگە هەر ئەو خاوەنـدارێتی خەڵـکە بوو. خاوەندارێتی سۆسیالیستی کراو یان کۆمەڵایەتی هەر ئـەو خـاوەندارییـەتـه گشتییە بوو. تەبایی کۆمەڵـگە یـان پـاک و خـاوێنی سۆسیالیـستی، واتـه تەبایـەک کەلەبەر دەستی گشتیدا بێ. هاوکاری و پێکەوە بوونی کۆمەڵایەتی لە حکوومـەتا بە واتای بەشداری گشتی خەڵک بوو. کۆمەڵگە لەم واتایەدا پێوەندییـەکی بـەهێز و پێـزی لەگـەڵ دۆزە دێموکراسـییەکان و دەسـەڵاتی خەڵـکدا گـرت. ئـەم دۆزانـه پێشینەیەکی درێژی لە ئەندێشەی ئەوروپاییدا بوو، بەلام شێوەی تایبەتی ئێـستەی خۆی لە تافی شۆڕشی فەرانسادا بە دەست هێناوە. بێجگە لەمە، چونکە بۆ ویـستی

ـیموکراتیکی خەڵک زۆرجار بایەخی ئەخلاقی رەچاو کردووە، واژەی کۆمەڵایەتی کـ ـ'کتێری ئەخلاقیش بە دەست دێنێ.

هەر بەم دەستوورە، واتایەکی دیکەی (کۆمەڵگە) یان (سۆسیال) بە ناوی کۆمەڵگەی مەدەنی و گرێبەست خوازی) زۆرتر پێوەندی زیرەکانەی لەگەڵ ـکخوازی ئەخلاقی و سیاسی بە دەس هێنا و یەکێک لە پرەنسیپەکانی ئەندێشەی ـەم دواییانەی دیموکراسی لیبرال لە کاری نوێنەرایەتی و پاڵەمانی پێکهێنا. لە ـدەی ١٨٤٠، پێوەندی (سۆسیال) و (دیموکراسی) بە ناوی پێوەندی بەرامبەر ـوان (لیبرال) و (دیموکراسی) بەتەواوی جێی گرتووە. واژەگەلێکی وەک ـۆسیال دیموکراسی، سۆسیالیست دیموکراتیک و سۆسیالیست دیموکرات تا ـ ـدەیەک لەسەرتاسەر ئەورووپادا ناوبانگی درەکردووە هەرچەند هێشتا خاوەنی هێندێ شاراوە و پێچراوەن.[3]

کۆمەڵێک لە بیرمەندان مێژووی وردی سۆسیالیزمیان لە لێکدانەوەی سیاسی و کۆمەڵێک لە باوەڕەکان، دیاریان کردووە. ئەم واژە، هەر وەک پارێزگاری ـیبرالیزم، منداڵی سەردەمی پاش شۆڕشی فەڕانسا دەدرێتە قەڵەم. لەم بارەوە ـەڵگەگەلێک لە ئارادایە کە راست لە کوێدا بۆ یەکەمجار ئەم واژە بەکار براوە. فەڕانسا و بریتانیا وڵاتانی سەرەکی ئەم پانتایەن.[4] بەم حاڵەوە کەس دژایەتی ـەگەڵ ئەوە ناکا کە دەیەکانی ١٨٢٠ و ١٨٣٠ لەم بوارەدا دەورەگەلێکی گرنگ بوون. وشەی سۆسیالیزم لە فەورییەی ١٨٣٢دا لە رۆژنامەی سن‌سیمۆن بە ناوی گلووب کە سەرپەرشتی ئەو بە ئەستۆی پییێر لوورو بوو، چاپ کرا. بەر لەم بەرەوارە، سەرجەم لە ١٨٢٧دا، لە نەشرییەی ئەوون گەرای گۆڤاری تەعاونی ئاماژە بەوە کرا بوو. ئەوون گەرایان لە بریتانیا و سن‌سیمۆن گەرایان و فەورییە گەرایان لە فەڕانسا یەکەم کەسانێک بوون کە چاوکراوانە ئەم واژەیان بە کار بردووە. مارکس پاشان لە مانیفێستی کۆمۆنیستدا ناسناوی (سۆسیالیستە خەیاڵییەکانی) بەم کەسانە بەخشی کە بەرچەسپێک بوو بە واتای دەروونی تاڵ و ناخۆش و لەرێ‌لابەر.

واتای سۆسیالیزم لە پێوەندی لەگەڵ واتاگەلێکی دیکەی وەک سیستەمی خاوەندارێتی هاوبەشی، کومۆنیزم و سۆسیال دیموکراسی چارەنووسێکی پڕ لە کەند و پێچ و خوارییەکی فرەیان بڕیوە. ئەم پێوەندییە بۆ لەناو بردنی هەر چەشنە خراپ تێگەیشتنێک وەکو خۆی سەرجەم لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەین. سیستەمی خاوەندارێتی هاوبەشی واتایەکە دەگەڕێتەوە بۆ دوایەکانی سەدەی نۆزدەیەم کە پێگە و جێگەی ئەو فەڕانسەیە. مەبەست لەوە، کەتا ئەمڕۆش بە جۆرێک پێوەندی مەنتقی پایەدار ماوە، سوود وەرگرتن لە دەوڵەت و دەسەلات بو کۆنترۆل، فەرماندەی و تەنزیمی بەشە ئابووری و کۆمەڵگە مەدەنییەکانە، ئامێرێک بۆ سیاسەتی گشتی دەدرێتە قەڵەم. ئەم نەزمە، بە پلەگەلی جۆراوجۆر، پێوارە و هاوکێشی بەرنامە ڕێژی دەولەتی ناوەندییە. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمد سیستەمی خاوەندارێتی هاوبەشی زۆرتر وەبیر هێنەرەوەی سۆسیالیزم بووە بەم حالە، مەسەلەگەلێک لە پێوەندی لەگەڵ ئەم وێکچوونیەدا ڕووی داوە. سەرەتا ئەمەکە، بە پێچەوانەی ئەم ڕاستەقینە کە زۆر لە سۆسیالیستەکان لە کردەوەدا لە سیستەمی خاوەندارێتی هاوبەشی سوودیان بردووە، تاقمێکی زۆر لەوانیش یان ئەوەیان لەبیر کردووە، یان حاشا دەکەن. دووەم، زۆربەی لە ئیدئۆلۆژییەکانی وەکو پارێزگاری و لیبرالیزم، هەر ئەو جۆرە کە دیتمان. ئامادەی کەڵک وەرگرتن لە میتۆدەکانی خاوەندارێتی هاوبەشی ببوون. سەرەنجام شایانی باسە کە سیستەمی خاوەندارێتی هاوبەشی زۆرتر ئامێرە نەک ڕەسالەیەک یان دەزگایەک لە باوەڕەکان دەربارەی پرەنسیپی مرۆڤ و یەکسانی، بەو جۆرە کە بۆ وێنە چاوەڕوانی لە سۆسالیزم دەکرێ. بەم جۆرە، سیستەمی خاوەندارێتی هاوبەشی خۆی لە خۆیدا ئەندێشەیەکی بەرتەسکتر، شێوەییتر و کارامەتر لە سۆسیالیزمە.

ئێستا بە شێوەیەکی گوشراوەتر دەربارەی بڕێک لە واتاکانی دیکە کە لەگەڵ سۆسیالیزم پێوەندی نزیکیان هەیە، دەدوێین. دورکیم لە کتێبی سۆسیالیزم و سن‌سیمۆن کومۆنیزم بە دێرینەترین واتا و شکلی سەرەتایی و ڕێکخراوەی سۆسیالیزم دەزانێ. کومۆنیزم دڵ گەرم و سەرقاڵی بەکارهێنانی مرۆڤ بە شێوەیەکی بەرامبەرانەیە. ئەم شێوە لە ڕێ دۆزینەوەی سەرەتایی و هۆزە

ـەرەتاییترەکاندا بـە کـاربراوە. لـە لایـەکی دیکـەوە، سۆسـیالیزم بـە بۆچـوونی
ـەرکیم ئامێرێکی زۆر نوێترە لە کۆمەڵگەی پیشەسازیدایە کە دەیهـەوێ پێوەنـدی
ـەرهـەمێنـانی رێکوپێـک بکـا. لێـرەدا جیابوونەوەیـەکی ئاشـکراتر لـە واژەکانـدا
ـەکەونە بەرچاو، ئەگەرچی رەنگە هەموو لەگەڵ ئەم جیاکردنەوەدا نەبن.

واژەی کومۆنیزم، کە نیشاندەری لایەنگری سیاسی چاوکراوانەیـە، هـەر تـەنیا
چەنـد ساڵـێک لەبـەر سۆسـیالیزمەوەیە. لـە فەرانـسا، گراکـوس بـابوف و
ئەنجوومەنی مساوات)، کـە بـە واتـای سیاسـی نێـوان ساڵـەکانی ١٧٩٤ و ١٧٩٧
ـەریهەڵدا، زۆرجار بابوفـخوازان و جارجار (کومۆنسیتەکان) ناویـان لـێ نـراوە.
ـبوف لە ساڵی ١٧٩٧ بە فەرمانی حکوومەتی دیرکتـوار بـە گیـوێتین سـەریان لـە
ـەشی جیا کردەوە. ئەنجوومەنی بەرنبەری لە بناخەوە تاقمێکی خراپـەخـواز بـوو
کـە خـۆی لـە پێنـاوی رووخانـدنی شۆرشـگێری و دامـەزرانی دیکتاتۆریـەک و
جەماوەرێک لەسەر بنەمای بـەرانبـەری دانـابوو. سـەیر لێرەدایـە کـە پرەنـسیپی
کومۆنـسیتی لـە تێکۆشـانی بـابوف پەیـدا نـەبوو بەڵـکو لـە ئەندیـشەی سیاسـی
پێـرەوانی ئـەو، بـۆ ئونـاروتی و بلانکـی بایـەخی زۆرتـر بـە دەس هێنـا. دواتـر
پۆپۆلیستەکانی رووسی و لـنینی لاویـش لـە دەیـەی ١٨٩٠ درێژەیـان بـە رێگـای
ئەودا. نووسەرێکی دیکەی فەرانسەوی، ئەتێین کابە. کەسێک بـوو کـە لـە کۆتـایی
ـدیەی ١٨٣٠ بە دوای بە دەست هێنـانی ئـەم مـساواتە رادیکـاڵ و خـاوەنـدارێتی
هاوبەشی، بەڵام لە روانگەیەکی زۆر خەیاڵی و ئەندیـشەیی‌تـرەوە بـووە. جیهـانی
خەیاڵییەک کە ئـەو لـە ئیکاریـا دروسـتی مردبـوو، زۆرجـار بـەناوی کومـۆنیزمی
خەیاڵی باس لێوە کراوە.

مارکس لە دەسپێکی نووسراوەکانی خۆیدا کومۆنیزمی بە پێکهاتەی سـەرەتای
سۆسیالیزمی زانیوە، بەڵام لە مانیفیستی کومۆنیستدا کە لـە دەیـەی ١٨٤٨ بـڵاوی
کردەوە، جیاوازییەکی بە گوڕی لە نێوان (کومۆنیزمی شۆرشگێر) و (سۆسیالیزمی
خەیاڵی) دانا؛ هەرچەنـد هـەم مـارکس و هـەم ئەنگلس، لـەژێر کاریگـەری لـۆئیس
مورگانی مرۆڤ ناس مانا و واتای کومۆنیزمی ئەوەڵـییەیان سـەلماندبوو.[٦] هێـور
هێور مارکس جۆرە بێزارییـەکی سـەبارەت بـە وشـەی سۆسـالیزمی تێـدا بـەدی

هاتبوو که له ئارین ئاسەواری دەودا، له کۆتایی دەیەی ۱۸۷۰ دەکەویتە بەرچاو به بۆچوونی ئەو، سۆسیالیزم مەسلەکێک بوو نەرمتر، بێ چین و تویژ، خەیالی و به گشتی، باوەڕێکی بورژوایی. لەگەڵ ئەمەدا، ئینگلیز له دوایین پێش وتاری خۆیدا لەسەر راگەیەندراوی کومۆنیست لە سالی ۱۸۸۸ ئەوەی لە (ئەدەبیاتی سۆسیالیتی) وە دەزانی.[٧] لە ۱۹۱۷دا بێزاری مارکس چووە نێو هێندێ لە بەلشویکەکانیش کە کومۆنیزمی بە قۆناغێکی مێژوویی پێش کەوتووتر سەبارەت بە سۆسیالیزم لێکیان داوەتەوە. لە بریتانیا، ویلیام موریس و ه. م. هیندمن (بناغەدانەری یەکەمین ریکخراوەی مارکسیستی بریتانیا)ش کەلکی لە واژەی سۆسیالیستی وەرنەدەگرت و ئەوەی دەخستە ئەستۆی سۆسیالیستی ریفۆرمخوازی فابیان. بە پێچەوانە ئەم فرەویژیانە، بەدیهێنانی سەددێکی تایبەتی دەست لێنەدراو لە نێوان واژەکاندا دەستووره. بێگومان یاوی شۆڕشگێرانە ناتوانێ به شێوەی ئەزموون و پێوار جێبگرێ. ئەگەر کەسێک روانگەگەلێکی قوولی یاساخوازی زۆرینەی کومۆنیستەکانی ئەوروپایی دەهەکانی ۱۹٦۰ و ۱۹۷۰ لەگەڵ تاقمە بڕبڕبووە یەک بە دووی یەکە شۆڕشگێڕییەکانی ئەو سەردەمە بەراورد بکا کە خۆیان ناو دەنا (سۆسیالیست)، کەواتە واژەی (شۆڕشگێڕ) پێوەندییەکی نزیکتری لەگەڵ سۆسیالیزمدا هەیە هەتا لەگەڵ کومۆنیزم.

(سۆسیال دیموکراسی) ش تووشی هەر ئەو دوولایەنییە بارودۆخییە بووە. ه.م. هیندمن خۆی بە سۆسیال دیموکرات دەزانی و لەم بارەوە، ئەمەی بە پلەیەکی بەرز بۆ لایەنگری لە مارکسیزم دەیدایە قەڵەم. ئەو پێڕەوی ریگا و میتۆدی ئالمانی بوو. هێزی بزووتنەوەی مارکسیزم لە چاخی ( نێونەتەوایەتی دووەم) کە مارکسیزمی ئەوروپایی هەتا ۱۹۱٤ بەسەر ئەودا زاڵ بوو، حزبی سۆسیال دیموکراتی ئالمان (SPD) بوو کە لەراستیدا لە ۱۸٦۹ حزبی کرێکارانی سۆسیال دیموکرات ناودێر کرا.[٨] بە پێچەوانە برێک دوولایەنەکان، سۆسیال دیموکراسی بە کردەوە بوو بە هاوکێش لەگەڵ مارکسیزم رێکوپێک کراوە. مارکسیزم بە ناوی سۆسال دیموکراسی لە بابەتی بۆچوونی بە توندی دژی سۆسیالیزمی لانشینخوازی ئەدوارد برنشتاین هەڵوێستی گرت.[٩] پاش رووخانی

ـیونەتەوایەتی سێیەم) بۆ هەموو ئەو ڕێکخراوانەی کە ئارەزووی بە ئەندام ـوونیان لە (نێونەتەوایەتی)دا بوو، ئەمە گرنگ بوو کە واژەی کۆمۆنیست جێی ـۆسیال دیموکراسی بگرێ. بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم، دوولایەنی و ـهاودەنگی بەرەبەرە زۆرتر بووو بە ناوی سۆسیال دیموکراسی کۆمەڵێک لە ـشینخوازەکان تێکەڵ بە سۆسیالیستە ئەخلاقییەکان و لیبراڵە نوێکان یان لیبراڵە کۆمەڵایەتییەکان بوون. دوای ساڵی ١٩٢٠ هەتا ئەمڕۆ، واژەی سۆسیال ـیموکراسی پێوەندیگەلێکی بەهێزیان لەگەڵ سۆسیالیزمی ریفۆرمخواز و ـوننەتی لیبراڵ کۆمەڵایەتی دامەزراندووە. لەم ڕووەوە، پێکهاتن و دامەزرانی حزبی سۆسیال دیموکرات لە بریتانیا لە دەسپێکی دەیەی ١٩٨٠دا دیاردەیەکی ـوێ یان گرنگ نەبووە.

بە گشتی دەربارەی پەیوەندیدانی پلە بەرزیە تایبەتەکان بە سۆسیال ـوشیاربین، چ بڵێین کە وشەی سۆسیالیزمەکان لایەنگری سیستەمی خاوەندارێتی ـاوبەشین، چ ئەمە کە کۆمۆنیزم بە گشتی لەگەڵ سۆسیالیزم جیاوازی هەیە، چ ـۆسیال دیموکراسی سوننەتی غەیرە سۆسیالیستییە. هەموو ئەم داوەریانە هەم ـە باری مێژوویی و هەم ئیدئۆلۆژیکییەوە لە ڕێ لابەرن. دەستتێوەردانی پێچراوەی نێوان ئەم پرەنسیپیە جۆراوجۆرانە هەڵگری ئەو ڕووداوەیە.

## پێگەکانی ئەندێشەی سۆسیالیستی

ئەگەرچی دەربارەی ڕیشەگەلی ئەندێشەی سۆسیالیستی دیالۆگ زۆرە، چەواشەیی ئەم دیالۆگانە لە دیالۆگەکانی پاریزگاری لیبرالیزم کەمترە. دوو ڕاپۆرتی بەربڵاو دەربارەی سەرچاوەی ئەندێشەی سۆسیالیستی بوونی هەیە. یەکەمیان کە بوارێکی بەرفراوانتری هەیە. هەمیشە شوێنی ناوەڕۆکاکانی سۆسیالیستی لە بزاڤە فیکرییەکانی سەرەتای سەردەمی نوێی گرتووە. دووەم ڕاپۆرت سەرنجی داوەتە تافی دوای شۆڕشی مەزنی فەڕانسا.

بەپێی راپۆرتی یەکەم دوو کەسایەتی کە زۆرتر لە هەمووان دەربارەی ئەوانە ئاخاوتن کراوە، بریتین لە تامس مور بە هۆی کتێبێک کە بەناوی ئۆتۆپیا (ئارمانج شار)ی نووسی و تاۆماس مونستێر ئاناباپتیست. کارل کائۆتسکی، پێش هەنگاوی مارکسیزم ئاڵمان (کە زۆرتر ئەویان بە پاپی مارکسیزم ناسیوە) کتێبێکی بەناوی تامس مور و ئارمانج شاری نووسی هەتا ئەم پێگە تایبەتە پێناسە بکا. لەم دواییانەدا ئەم بیروڕایانە چەند کەرەت دووپات کراوەتەوە.[10] جێی ئارمانجی دیکە بۆ سەرهەڵدانی ئەندێشەی سۆسیالیستی هەر لەم تافەدا، جەنگی ناوخۆی ئینگلیسە.

ڕێکخراوەگەلێکی وەک بەرانبەر خواز و ئەوانی دیکەش بوارێکی سازدراو بۆ ئەم راڤەیە تاقیکراوە.[11] بۆ وێنە کریستۆفر هیل دەربارەی رێبەرایەتی ئەم و ئەو (پیرەوانی بزاڤی مەزهەبی و ئابووری) دەنووسێ:

وینستنلی لە روانگەی خاوەندارێتی هاوبەش کە لە سەدەی نۆزدە و بیستەمی سۆسیالیزم و کومۆنیزمەوە پێشنیاری ئاخرین سوود وەرگرتنی کرد... وینستنلی خاڵێکی پڕەنسیپی ئەندێشەی سیاسی مۆدێرنی بە دەست هێنا و ئەوە ئەمە بوو کە: دەسەلاتی دەوڵەت بە سیستەمی مالکییەت و گشت ئەو دۆزانەی کە پشتگری لەم نەزمە دەکەن، پێوەندی هەیە. ئەو لەم بابەتەوە کە خوازیاری شۆڕشێک بوو کە گرفتەکانی کۆمەڵگە بکاتە جێگری بەربەرەکانی و تەئکیدی دەکرد کە ئازادی سیاسی بەبێ بەرامبەری ئابووری نامومکینە هەروەها بە توندی حەسابی لەسەر دەکرێ.[12]

رواڵەتەن، ئەو جۆرە لێکدانەوە مەسەلەگەلێکی نگەران و دوودلی دێنێتە بار، چونکە لەو تافەدا هیچ کومەڵە باوەڕێک کە وێچووی سۆسیالیزمی سەدەکانی نۆزدە و بیستەم بێ، لە ئارادا نەبوو. رەنگە بەڵگەی لەسەر بێننەوە کە واتا بەر لەسەرهەڵدانی وشەوە بووە. بەم حاڵەوە، بوارگەلێکی بەڵێنی و مەزهەبی و کەلتووری کە باوەڕەکانی ئەم و ئەوەکان لەودا سەری هەڵدا بە گشتی سەبارەت بەم جۆرە راپۆرتانە نەزان و ناشارەزا بوو. ئەمە ترس هێنەرە کە نیگەرانییەکان و هۆگرییەکانی ئێستەی خۆمان ببەستین بە رابردووەوە، کە هەر ئەو جۆرە کە لە بەشی یەکەمدا باسی لێوەکرا، رەنگە لە باری مێژووەوە ناهەم کات و لە رێ بەدەر لە ئاو دەربێ.

دووەم راپۆرت سەرنج دەدا بە خولی بێوچانی پاش شۆڕشی گەورەی فەڕانسا. هێندێ لە بیرمەندان لە بواری کارتێکراوی ڕووبەڕووی شۆڕشی پیشەسازیش توێژینەوەیان لەسەر سازداوە.[13] لیکتهایم دەربارەی دەیەی ۱۷۹۰ دەڵێ: (مێژووی سۆسیالیزم دەبێ لەگەڵ شۆڕشی فەڕانسا دەس پێبکا، بەم هۆساکارە کە فەڕانسە لانکی (سۆسیالیزمی خەیالی) و (کۆمونیزمی خەیالی) بوو... و هەردووک بزاوتەکە لە شۆڕشەکان و ئالۆزییە گەورەکانی سالانی ۱۷۸۹ هەتا ۱۷۹۹ سەرچاوەیان گرتووە).[14] شۆڕش کاسەی ئەزموون و کوورەی ڕووداوگەلێک بوو کە سۆسیالیزم، چ خودی وشەی سۆسیالیزم و چ بزاڤەکانی کۆمەلایەتی کە چاوکراوانە لایەنگری ئەم ئیدئۆلۆژییە بوون، لەوەوە هەڵقولاون. ڕیشەی گشت ئەم دیاردانە خولەکانی شۆڕش و دوای شۆڕشە. هەڵسووڕانێکی بەهێز بۆ بەرفراوانکردنەوەی دێموکراسی، مافەکان، بەرانبەری و یەکسانی، لە لایەن هەڵسوکەوتە ڕیشەیی سیاسی و کۆمەلایەتییەکان، هەرچەند بە بەهرەوەر گرتن لە گشت کارێگەرییەتی ئەو پێک نەهات، بەلام شەپۆلە لەرزینەکانی و بەرین بوونەوەی بە سەرانسەری ئەورووپا گەیشت کە دەنگدانەوە و زایەڵەی ئەوانە ئەمرۆژانەش هەستی پێ دەکرێ و بوونی هەیە.

شۆڕشی پیشەسازیش بە ڕێی جۆراوجۆری وەک کاتالیزوەری (یارمەتیدەر، هۆکار) کردەوە نیشان بدا لەو ڕووەوە کە گەشەی سەرمایەداری و گەشە و قال بوونی چینی کرێکاری شاری و ژیاری ئاسان کرد، بەتایبەت ئەمە کە چینی کرێکار پەیکەرەی ژیانی زۆربەی بزاڤە سۆسیالیستییەکانی پێک دەهێنا. هەڵبەت ئەم خالە تایبەتە، بە سەرنجدان بە برێک واتا و باوەڕێک کە زۆر دواتر مائۆئیزم و فرانتس فانون هێنایانە ئاراوە و وزەی هە میشەی شۆڕشگێری گوندنشینە وەرزێڕەکانی وریا کردەوە، هەلایسێنی قسە و باسە.[15] سەرمایەداری پیشەسازی هەروەها تەنینەوە و کێشەگەلێکی لێکەوتەوە کە کەوتە بەر سێرەو نیشانەی سۆسیالیستەکان. زۆرینەی سۆسیالیستەکان هەر لەسەرەتاوە سەرمایەداریان هۆی رق و بە سەرچاوەی هەموو نابەرانبەری و نایەکسانیکانیان دەزانی. سۆسیالیستەکان لەگەڵ ڕەخنە لەسەرمایەداری و کۆشش بۆ دۆزینەوەی ڕێ و

رەوشتە جێگرەکان بۆ ئەو، لە زاراوەی سوننەتی رادیکالی فەڕانسا سوودی وەردەگرت کە خوازیاری بەرفراوانکردنەوەی مافی رەیی گشتی دیموکراتیک مافە یەکێتییە مەدەنییەکان، ریفۆرم گەلی پەرلەمانی و عەدالەتی کۆمەلایەتی بۆ کرێکاران بوو. هەر ئەوچەشنە کە شۆرشگێرانی فەڕانسەوی نیشانیان دابوو، ئەم ئەندێشانە دەیانتوانی بە کەلک وەرگرتن لە بزاڤە جەماوەرییەکان بە شێوەی بە قەناعەت گەیشتوانە هەست بە بەختەوەری بکەن.

بەم حالەوە، راپۆرتی باسکراو کالکەی ئەم خالە نییە کە زۆربەی لە ئەندێشە کارکردییەکانی سۆسیالیستەکان، هەلقولاوە لە سوننەتە فیکرییەکانی رابردوو و لە زۆر شوێندا پێوەندی بە پێش شۆرشەوە بوو. لە راستیدا سۆسیالیزم دۆزەکانی خۆی لەسەرچاوە جۆراوجۆرەکان وەرگرتووە: کۆمارخوازی مەدەنی، عەقلخوازی سەردەمی رۆشنگەری، رۆمانتیکخوازی. شێوەی جۆربەجۆری ماددەخوازی، مەسیحییەت (چ کاتۆلیک و چ پرۆتستان). روانگەی یاسای سروشتی و مافە سروشتییەکان، فایدەباوەڕی و ئابووری سیاسی لیبرال هەموو ئەم ئەندێشانە و ئەم مەکتەبانە و بوارانە بۆ بیرمەندانی سۆسیالیستی دێنە ئاژمار. پرەنسیپگەلێکی جۆراوجۆر لە بزووتنەوەی سۆسیالیزمدا دەوراندەوری برێک لەم سوننەتە فیکریانەیان داوە و تێکەلاو بوون و بەم جۆرە، باوەڕی لایەنگری ئەوان بە شێوەگەلی جیاواز دەردەبڕێن.

هەر ئەو چەشنە بەر لەمە وترا، یەکەم بزووتنەوە چاوکراوانەی سۆسیالیستییەکان لە دەهەکانی ١٨٢٠ و ١٨٣٠ دەستیان بە گەشانەوە و پێشکەوت کرد. ئەوونگەرایان، سنسیمونگەرایان و فەوریەگەرایان رشتەیەک لێکدانەوە و راڤەگەلێکی رێکوپێکیان دەربارەی کۆمەلگە بلاو کردەوە. ئەوانە بەتایبەت ئەوونخوازان. لەگەل کۆمەلێک لە بزاڤەکانی دیکەی چینی کرێکاری وەکو چارتیستەکان هاوفیکریان بوو. سوننەت رادیکال، ئەو جۆرە کە لە رێکخراوەکانی وەک چارتیستەکان، یەکێتییە سنفییەکانی وەکو ئەو دەردەبرا زۆرجار لەگەل ئامانجە سۆسیالیستییەکان، هەرچەند بە شێوەی ناڕاستەوخۆ

ـەکلایەن بوو. لە دەیەی ١٨٨٠ وتە و باوەڕی سۆسیالیستەکان بەربلاوانە بەناوی
ـ ـەزووەکانی چینی کرێکار قبوول بوو.
ـوای وەستانێکی کورت، لە کۆتایەکانی دەیەی ١٨٤٠ هەتا کۆتایەکانی ١٨٦٠
ـەپۆلێکی دیکە لە پێشکەوتەکانی سۆسیالیستی لە ئەوروپا فۆرمی گرت. لەم
حوەدا، سۆسیالیزم هەتا دەیەی ١٨٨٠ پلە بە پلە کامڵتر بوو و بوو بە بزاوتی
ـئۆلۆژیکی چاوکراوانە. پێگەی ژیانی مارکس لە رووگەی سۆسیالیستی هەتا
ـ ـدی بەگرەو گیراوی ئەم راستییەیە کە ئەو پێکهاتەیەکی بەهێزی لە دۆزەکان و
ـشکرا کراوەکان بە قەناعەتگەیێن لەم سەردەمە ناسکەی مێژوو پێکی هێنا. بێجگە
ـە بریتانیا، زمانی مارکسیستی بوو بە زمانی دیالۆگی دووەمی مارکسیستی
ـەوروپا. حزبی سۆسیال دیمۆکراتی ئاڵمان (SPD) کە مارکسیست بوو هەتا ساڵی
ـ١٩٠ بوو بەهێزێکی سەرکەوتوو لە سۆسیالیزمی ئەوروپادا و وێنەی
ـئۆلۆژیکی خۆی بەسەر سۆسیالیستەکانی فەڕانسا لە سەردەمی دەسەڵاتداری
ـۆرگردا سەپاند و ئەم زاڵبوونە بوو بە هۆکە دەورەی (نێونەتەوایەتی دووەم) بە
ـدورەی زێڕینی مارکسیزم) باسی لێوە بکەن.
بەم حاڵەوە، هەڵوێستی زۆرینەی حزبە مارکسیستییەکان لە فەڕانسا، ئاڵمان و
ـوتریش بە بۆنەی شەڕەوە لە ١٩١٤ راپرسی کرا و رەئیان دا، بە توندی هەموو
ـنا و واتای یەکێتی و یەکگرتوویی نێونەتەوەیی (سۆسیالیستی) بێهێز کرد.
ـونەتەوەیی سێیەم (کۆمۆنیستی) کە لە کوورەی شەڕی ١٩١٨ـ١٩١٤ سەری
ـدەر نابوو، لەژێر دەسەڵاتی بەلشویکەکانی یەکێتی سۆڤیەتدا بوو. ئێستە لنین
کەسایەتی رێبەرایەتی بوو و مارکسیزم ـ لنینیزم بوو بە رێنوێنی دۆزی فەرمی.
ـەڵام لە دەیەی ١٩٣٠ بزووتنەوە تووشی قات و قوڕی بوونێکی زۆرتر بوو.
ـارکسیزمی تەجدید نەزەر تەڵەب کە لە سەرەتای دەیەی ١٩٠٠وەکو کوانێکی گەیو
ـرێژەی بە مانەوەی خۆیدەدا دووبارە لەسەرانسەری ئەوروپادا گەشەی کرد.
حزبی سۆسیال دیموکراتی ئاڵمان پلە پلە بەرەو هەڵوێستی پێداچوونەوە
خوازانەتری سۆسیالیست دیموکراتیک، بەتایبەت لە پاش ١٩٤٥ چوو. سۆسیالیزمی
بریتانیا بە بزاوتی ریفۆرمخوازی یەکلایەنە و دژەئاسایی خۆی درێژە دا. برینێکی

قوولتر لە دەروونی مارکسیزمدا سەریهەڵدا کە لە چاخی پاش ١٩٤٥ لە هەناوی برینە نوێکانەوە لە پشوو کێشان کەوت، ترۆتسکیزم، ئیستالینیزم، لنینیزم. مارکسیزمی پێداچوونەوەخواز، مارکیسزمی مرۆڤ دۆست، مائوئیزم، مارکسیزمی ئافریقایی. مارکسیزمی ئەگزیستانسیالیزم، کومۆنیزمی ئەوروپایی. مارکسیزمی پێکهاتەگەرا، مارکسیزمی فەمینیست، و زۆر لە بزاوتەکانی مارکسیستی دیکە فۆرمی گرت. لیستەیەکی ئەسکۆلاستیک لە مارکسیزمەکان زۆرجار بە دوژمنی یەکتر سەریان هەڵێناوە و پێشکەوتنیان بووە کە هەرکام لەوانە بڕوای راستەقینەی (ئۆرتۆدۆکسی) یان بوو. رۆینی ئاوی رووبار لە دەروونی ئاوەڕۆگەلێکی پڕ لە قوڕ و لیتەگرتوو بە رەوتی خۆی بەرەو ئاوهەڵدێری رووبار درێژە دەدا. سۆسیالیزمی بەجێماو کە لە دەیەی ١٩٩٠ بە تێڕامانی دووبارە دەربارەی خۆی دەستی پێ کردووە، (ئوستورەسازی) سروشت و جەوهەر هەتا رادەی بەرین بوونەوەی ریفۆرمخواز، دێموکراتیک و پێداچوونەوە خواز بوو. ئەگەر داهاتوویەک بۆ سۆسیالیزم لە ئارادا بێ. لەسەر بنەمای ئەم پڕۆژە دەبێ.

## جەوهەری سۆسیالیزم

یەکەم خاڵ کە دەبێ پێشکەکی تیشک بخرێتە سەری و بۆ خوێنەران روون بێتەوە ئەمەیە شتێکی بێگانە و تاک بە ناوی سۆسیالیزم بوونی نییە. زۆرتر دەبێ لە بارەی سۆسیالیزم گەلێکەوە قسە بکرێ کە هەمیشە لەگەڵ ئیدئۆلۆژییەکانی دیکە تێکەلاویان هەیە. هیچ باوەڕێکی روون و بێخەوش بوونی نییە. لەم بارەوە دەبێ زۆر بە پارێز بین چونکە هەلوێستی زاڵی سۆسیالیزم لە مێژووی بزووتنەوەی سۆسیالیستیدا زورجار بووەتە هۆکە سۆسیالیزم بە چاوی مارکسیزم ببینن. مارکسیزم سۆسیالیزمی راستەقینە نییە، مارکسیزم یەکێک لە جۆرەکانی رەسەنی سۆسالیزمە. چ مارکسیست بین و چ نەبین، ئاسان و زۆر ئاسانە کە واژەناسی و وتارەکانی مارکسیزم چاو بەسراوانە و بێ بیر کردنەوە قبوولیکەین، بۆ وێنە جیاوازی سۆسیالیزمی خەیالی و سۆسیالیزمی زانستی یان دانانی بایەخ بۆ چین لە باسی سۆسیالیزم. لەراستیدا وەها سنووردیاری کردنێکی دەقیق لە باسی

ـۆسیالیزمدا بوونی نییە. پێناسەگەلێکی زۆری واتایی و شێوە جۆراوجۆرەکانی بۆ
ێگەیشتنی ئەو لە ئارادایە. ئایا دەبێ سۆسیالیستەکان بە باوەڕ، بایەخەکان یان
ـەردەرچوونە سیاسییەکان ئەوان لە یەکیان جیا بکەنەوە؟ سۆسیالیزم کۆمەڵێکی
ـەولەمەند لە باوەڕە رەسمییەکان و بایەخگەلێکە کە ڕێبازە جۆراوجۆرەکان بە
ـیوەگەلێکی جیاواز راڤەیان کردووە.

چەند شێوەی مومکینی زۆر بۆ جیا کردنەوەی بیچمی سۆسیالیزم بوونی هەیە.
ـارکس و ئینگلیس (بەتایبەت ئینگلیس) یەکەم کەسانێک بوون کە جۆرەکانی
ـۆسیالیزمیان دەستە بەندی کردووە. یەکێک بە لە یەکەم دستەبەندییەکانی نێوان
ـۆسالیزمی زانستی و شۆڕشگێڕ لە بەرامبەر سۆسالیزمی خەیالی ئەنجامی گرت.
ـەم هاوێرە، چاوپۆشی لە بنەمایی بوون یان نەبوون ئەو، زۆر لە ئیددعا
ـستییەکانی ئارمانجخوازان و خەیالییەکانی لە دەروونی خودی مارکسیزمەوە
ـستە پشتگوێ. شێوەیەکی دیکەی رەدەبەندی سۆسیالیزم لە ڕێگای
ـەردەرچوونەکانەوەیە. رەنگە بێخەوشترین دابەشکاری نێوان سوننەتە
ـۆرشگێڕییەکان و ریفۆرمخواز بێ، هەرچەند وێدەچێ پێویستانە جیاوازە
ـوردەکانی دەروونی هەر وتارێک بەرچاو نەگرێ. چەمکی ئێمە جیاوازی
ـوانگەکانی رۆزالوگزامبورگ و لنین یان ئیستالین و ترۆتسکی دەربارەی شۆڕشە
کە هەرکام لەیەک جیایە. بێجگە لەمە، ئەگەر بناغە ناسییەکی دیکە قبوول کەین، واتە
جیاوازی سۆسیالیزمە سەرەڕۆخوازەکان و ئازادیخواز، ئەودەم سۆسیالیستە
ـیفۆرمخوازەکانی وەک وبز دەکرا بە (سەرەڕۆخوازی ریفۆرمخواز) بزانین. لە
حالێکدا کە روزالۆگزامبورگ یان بە جۆرێکی دیکە ویلهلم رایک و هێربێرت
ـارکووزە دەبێ بە (شۆرشگێرانی ئازادیخواز) بدرێنە قەڵەم. و.ە. گرین لیف
ـدستەبەندییەکی جۆراوجۆری قبووڵە، واتە سۆسالیزمی هاوبەشییەکی ڕێکوپێک
کراو لە بەرامبەر سۆسیالیزمی ئازادیخواز.[16] دیسانیش مەسەلەگەلێکی تێکەڵ و
پێکەڵ سەرهەڵدەدا. کۆمەڵێک لە لایەنگرانی خاوەنداریتی ئیشتراکی نیگەرانی
مەسەلە ئازادیخوازانەکان بوون. هەروەها لایەنگرانی سیستەمی هاوبەشی رەنگە
ئازادیخواز، شۆڕشگێڕ یان ریفۆرمخواز بن. سەبارەت بە ئازادیخوازیش

مەسەلەیەکی وەک ئەوە پێش دێ. لێرەدا یەکێک لە گرنگترین مەسەلەکان ئەوەیە کە سۆسیالیزم میراتگری هێندێ لە سوننەتە فیکرییەکان و بایەخەکان بووە. رۆڵی عەقلخوازی تافی رۆشنگەری لە لایەکەوە لە قووڵایی دڵەوە، قبوول کراوە و لە لایەکی دیکەوە حاشای لێ کراوە. لە لایەک، کەوتووەتە رێزلێنانی توندی گەشەی پیشەسازی و لە لایەکی دیکەوە وتەبێژ و سەناگۆی کومۆنە شوانییەکان بوون. لە گەشە و بەرەو پێشچوون پێشوازیان کردوە و لەگەڵ ئەویشدا دژایەتیان کردووە. بەهرەیان لە بوونی دەوڵەت وەرگرتووە و لە عەینی حالدا، ئەویان داوەتە بەر پەلامار. هێندێ خاوەن را، بێ هیوا لە دۆزینەوەی وێنەیەکی خۆرسک، لە دووی برێک ناوەرۆکی ناوەندی و کاکڵەیی دەگەڕێن. ر. ن. برکی وێنەیەکی باش لەم مایل بوونەیە. ئەو چوار بایەخ دەبینێ: یەکسانیخوازی، ئەخلاقخوازی، عەقڵخوازی و ئازادیخوازی. ئەمانە لەگەڵ روانگەی کۆمەڵێک لە بیرمەندانی سۆسیالیست هاودەنگ و لەگەڵ هێندێ هاودەنگ. ئەگەر ئەم باوەڕانە بە یەکەوە تێکەڵ بکەین ناچار بە روانگەگەلێکی زۆر جیاواز لە یەک دەگەین.[١٧]

بۆچوونی من ئەوەیە کە هەوڵ بدەم هێندێ رێبازی سۆسیالیزم بەپێی وێنەی بەڵگە یان رووداوەکان ئەوانە لە یەک هەڵاوێرم. رێبازە تایبەتە باسکراوەکان وتاری وشک و بە برشت نین. بیرمەندانی هەرکام لەم وتارانە دەبێ زۆر وەرگرتنی جیاواز یان دەربارەی هێندێ مەسەلە هەبێ. بنەڕەت ناسی بەو چەمکەیە کە بە بێ حەز و مەیل بە ساکار کردنی چەمک، بە سوننەتی جیاوان، پێچراوە و جۆراوجۆر واتا ببخشێ. کۆمەڵێک لە بەڵگەکان و باوەڕەکان لە دەروونی ئەم رێبازانە نەک هەر تەنیا لەگەڵ سۆسیالیستەکانی دیکە بەڵکو لەگەڵ هەموو ئیدئۆلۆژییەکانیش تێکەڵیان هەیە. رێبازەکانی سۆسیالیزم بریتین لە: سۆسیالیزمی خەیاڵی، سۆسیالیزمی شۆڕشگێڕی (مارکسیزم)، سۆسیالیزمی ریفۆرمخواز سەبارەت بە دەوڵەت، سۆسیالیزمی ئەخلاقی، سۆسیالیزمی رێکخراوەی زۆرخواز و سۆسیالیزمی بازاڕ.

سۆسیالیزمی خەیاڵی هەر تەنیا قۆناغێکی سەرەتایی بۆ گەیشتن بە مارکسیزم نییە. هەرکام لە سۆسیالیستە خەیاڵییەکانی سەرەتای، سن‌سیمۆن (١٨٢٥، ١٧٦٠)، شارل فەوریە (١٨٣٧، ١٧٧٢)، رابرت ئەووون (١٨٥٨، ١٧٧١)، لە رێبازی خۆیاندا

کەسایەتییەکی بەرچاو و لێهاتوو بوون. سۆسیالیزمی خەیالی، کە دەورێکی گرنگی لە ئەندێشەی سۆسیالیستی سەدەی بیستەمدا بووە، تێدەکۆشا هەتا شێوەی گونجاوی ژیانی کۆمەلایەتی کە لەگەڵ سروشتی راستەقینەی مرۆڤایەتی بگونجێ، تەنانەت یەکێک لەوانە وێنەی زاینەوە، موقەرەراتی بنامەلە، چۆنیەتی خواردەمەنی و بەرگ پۆشین ئەندامی کۆمەلگەی بە شێوەی لەسەر یەک و زۆرجار تەنانەت لەگەڵ وردەکاری بخاتە بەر باس و توێژینەوە.[18] ئەم کۆمەلگە سەرکەوتووە کە هاوئاهەنگی لەگەڵ هەستانەکانی سروشتی خووی مرۆڤ، دەبوو کەش و هەوایەک بڕەخسێنێ کە بوونەوەری مرۆڤایەتی بەتەواوی شاد، رازی، دڵخۆش پیرۆز لەوە بە ژیانی خۆی درێژە دەدا. سۆسیالیستە خەیالییەکان پێکهاتە کۆمەلایەتییە بنەڕەتییەکانیان دیاری نەدەکرد. کۆمەلگاکانی ئەوان کۆمەلگە رەوەندە داهێنەرەکان بوو کە (بەتایبەت دەربارەی فەوریە) دەرفەتی پێشکووتنی بە تەواو مانای مرۆڤایەتی بەدەس دەهێنا.[19] ئەم ئارمان شاریانە (فلانستر ـ یان کۆمەلگەی هاوبەشی ـ فەوریە، هاوئاهەنگی نوێی ئەوون، کۆمەلگەی پیشەسازی بەڕێوبەراییەتی سن‌سیمون) لە ناوەڕۆکی گۆڕانکارییەکی مێژوویدا جێکەوت و هەلگری گۆڕانکاری رادیکالی لە پێوەندی وئابووری و خاوەنداریتی کۆمەلگاکاندا بوو.[20]

سۆسیالیزمی شۆڕشگێڕ باشتر لە هەموو بە هۆی مەکتەبی مارکسیزمەوە بەیان کراوە. مارکسیزم بەهێزترین و زانایانەترین روانگەی سۆسیالیزمی گەلالە گرتووە کە لەسەر بنەمای پێکهاتەی رەخنەی ماددەخوازی تافی رۆشنگەری، ئیدەئالیزمی هیگلی، ئابووری سیاسی لیبرال و سۆسیالیزمی خەیالی دامەزرا بوو. لایەنی پلە بەرز و رەسەنی مارکسیزم راڤەی بەهێزی مێژوویی ئەو لە کۆمەلگاکانە. بارودۆخی ماددی و ئابووری ژیان بناخەی هەموو پێکهاتەکانی کۆمەلایەتی و سیاسی و هەروەها زانیاری مرۆڤایەتی پێکدێنێ. پەیوەندییەکان بەرهەمێنانی و زاینەوە ژێر بنا راستەقینەکانن کە رووبنا یاساییەکان و سیاسی لەسەر ئەوانە وەستاون. دەولەت رەنگدانەوەی بەرخۆدان و خەباتی چینایەتی زاتی و دەروونییە کە لەسەر ژێر خانی ئابووری کۆمەلگە دامەزراوە. لەگەڵ گۆڕینی کەش و هەوای

ماددی، پەیوەندییەکانی بەرهەمێنان و شێوەی گۆڕینەوە، پەیوەندییەکانی چینایەتی و سیاسییش گۆڕانکاری بەسەردا دێ. سەرەنجام، کۆمەڵگاکان لە رەوەندی پەرەگرتن و بە کەمال گەیشتنی خۆی بەشێوەی بەرهەمێنانی سەرمایەداری دەگا که فۆرم پێدانی چینایەتی لەودا پلەی یەکەمی هەیە و کار بە تێکهەڵچوونی نێوان پرۆلیتاریا و سەرمایەدارانی بورژوا دەگا.

دابەشکردنی گەورەی فەلسەفی کە زۆر دواتر لە مەکتەبی مارکسیزمدا روویدا لە نێوان باوەڕە مرۆڤ دۆستانەتر و نزا زانستییەکاندا بوو. لە تاقمی یەکەمدا دەکرێ ئاماژە بکەین بە ئانتۆنیۆ گرامشی، کارل کورش و گێئۆرگ لوکاچ. نووسراوەکانی ئەوان و هەروەها کۆششگەلێک کە لە پێناوی هێنانە گۆڕی پرەنسیپێکی بەهێزتری سەربەخۆیی مرۆڤ لە روانگەی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە ئەنجامی گرت. تاقمی دووەم میراتی بێزارهێنەرتر هەر ئەو سۆسیالیزمە زانستییە کە هەڵقولاوەی نووسەراوە دوایەکانی ئێنگلس و کارل کائۆتسکییە و لە شێوەیەکی پۆشراوەتر بۆ مارکسیزمی پێکهاتەگەرای دەیەی ١٩٦٠ و نووسراوەکانی لویی ئالتووسر دەگەڕێتەوە. ئەم روانگە پێوەندی بە بەراوردە یاسایەکانی پێکهاتەی کامڵ گەیشتووی مارکسیزمەوەیە. لەم جۆرە تایبەتییەدا مارکسیزم ئاوڕێکی کەمی لە خودموختاری یان تاکی مرۆڤ داوەتەوە. لێرەدا لە قەدەر وتەیەکی بەرینتر کە لە سۆسیالیزمی دەوڵەتی ریفۆرمخواز وەرگیراوە. کارکردی فیکری گشتی سیستەمی خاوەنداریتی ئیشتراکی لە رادەی بەرامبەر لەگەڵ سۆسیالیزم نیشاندەری باپیری واتای ئەم ئەندێشەیە. سۆسیالیزمی دەوڵەتی ریفۆرمخواز پێداچوونەوە خوازی ئەدوارد برنشتاین، فابینەکان (لانیکەم کۆمەڵێک لە فابینە گرنگەکان)، حزبی سۆسیال دیموکراتی ئالمانی پاش ١٩٤٥ و سۆسیالیزمی کراسلەندی بریتانیا لە دەیەی ١٩٥٠ دەگرێتەبەر. هەروەها پێوەندییەکی زۆر نزیکی لەگەڵ سوننەتی لیبرالیزمی کۆمەڵایەتی هەیە. لایەنە تایبەتییەکانی ئەم سۆسیالیزمە بریتیە لە وانەی خوارەوە: یەکەم ئەم سۆسیالیزمە هەمیشە و دەرهەق یان رەخنەی لە مارکسیزم بووە و حاشای لەو کردووە یان ویستوویە پێداچوونەوەی لەودا ببێ، دووەم، هەمیشە لە دەیەی ١٨٨٠ هەواداری ریفۆرمی پ

ـە پلە و یاسای دیموکراتیک بە شێوەی ڕێگایەک بۆ گەیشتن بـە سۆسـیالیزم بـووە.
ـۆسیالیزم هەرگیز نەیویستووە پەرلەمانەکان، حزبـە ڕەقیبـەکان یـان دیموکراسـی
ئـلمانی لە ناو بەرێ. سێیەم، لایەنی کەم هەمیشە، ڕۆڵی بـۆ بـازاڕی ئـازاد، زۆرجـار
ـە چوارچێوەی ئابووری تێکەڵ، بـووە. چـوارەمین ڕەخنـەی ئـەو لەسـەرمایەداری
هەمیشە بە شێوەی ئامێری بووە. سەرمایەداری لە پلەی یەکەمدا زۆرتر بە شـێوەی
ـیستەمی ناکامە و لە ڕادە بەدەر چاوی لێ کراوە هەتا سیستەمی ناشایـستە و دژە
ـەخلاقی. ئەمە بەو مانایە نییە کە لەم بارەوە نگەرانی ئەخلاقی لە ئارادا نییـە، بەڵـکو
هەتا ڕادەی تێری جیاواز و لەژێر وتاری تایبەتا کەوتووەتە بەر باس و وتـووێژەوە.
ـەرەنجام و لە هەمووی گرنگتر، سۆسالیزم لایەنگری سوود بردن لـە دەوڵـەت بـۆ
گەیشتن بـە ئامانجـەکانی خـۆی لـە بـواری کارامـەتر بـوون، یەکـسانی، عەداڵـەتی
کۆمەلایەتی  و مافە کۆمەلایەتییەکان بووە.

سۆسیالیزمی دەوڵەتی ڕیفۆرمخـواز کـە لـە ساڵـەکانی پـاش ١٩٤٥ لـە بابـەتی
کردەوەی سیاسی بەرچاو و ناوبانگێکی زۆرتری دەرکرد، پێوەندییەکی زۆر نزیکـی
ـەگەڵ دەوڵەتی ڕەفا هەیە کە لەسەرانسەری ئەوروپادا بەرین بووەتەوە.

سۆسیالیزمی ئەخلاقی پێوەندییەکی زۆر نزیکـی لەگـەڵ سۆسـیالیزمی دەوڵـەتی
ڕیفۆرمخوازدا هەیە. لە ڕاستیدا لە زۆر بابەتەوە ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەو تێکەلاوی بـە
ـدەست دێنێ هەرچەند وەرگرتنی ئەو لە دەوڵـەت هەمیـشە یـان زۆرجـار جیـاوازە.
جگە لەمە، سۆسیالیزمی دەوڵەتی ڕیفۆرمخواز هەمیـشە لـە هۆکـارە ئەخلاقییـەکان
کەلکی وەردەگرت، بـەلام مەعمووڵـەن ئـەوانی لـە پلـەی دووەمـی بایەخـدا دادەنـا.
خـووی تایبـەتی سۆسـالیزمی ئـەخلاقی، تەئکیـدی ئـەو لەسـەر لایـەنی ئەخلاقییـە.
سۆسیالیزم دڵنیگەرانی دروست یان حەقیقی بوونی بایەخەکانـە. سـەرمایەداری لـە
بابەتی ئابوورییەوە ناکارامە نادرێتـە قەڵـەم، بەڵـکو لـە بابـەتی ئـەخلاقی ناتـەواو و
بەرتەسکییە. ڕیفۆرم گەلی سیاسی، کۆمەلایەتی  یان ئابووری خۆی لـە خۆیـدا خـۆ
تەواو نین. بەدی هێنـانی مافـە ماددیـەکان بـۆ تـەبا و ڕەفـاە دابینکـردنی کۆمەڵـگە،
چاوەدێرییە پاک و خاوێنـەکان و دەرمـانی مـشە وبـەلاش یـان وەرگـرتنی پـارەی
دیاریکراوی بێکاری سوسیالیزمی ڕەسەن بـەدی نـاهێنن، بەڵـکو گـۆڕانی ئـەخلاقی

خۆدی مەدەنییەکان لەسەر گۆڕانی سیاسی پلەی بـاڵای هەیـە. کـردەوەی دەوڵـەت دەتوانێ لە لایەن فێرکردن و پەروەردەوە ئـەم گۆڕانکارییـە ئەخلاقییـە ئاسـان بکـ بـەڵام زەرووڕەتێکـی چارەنووسـازی نییـە. فێرکـردن و پـەروەردە مـومکین نییـە ئەخلاقی مرۆڤـەکان بگـۆڕێ. سۆسیالیـستە مەسـیحییەکان لـە بریتانیـا، فەرەنـسا و ئەڵمان و لەسەرانسەر سەدەکانی نۆزدەیـەم و بیـستەم بـە جـۆرێکی بـەربڵاو ئـەم لاگیرییەیان بوو. لەم حاڵەدا، ئەم بینینەیە کە ئێلهام بە لایەنگرانی (ئیلاهـاتی لیـبراڵی سـەدەی بیـستەم دەبەخـشێ، ئەگـەرچی روانگـەکانی ئـەوان هەمیـشە مەڵـهەمە (تێکـەڵاوی ئاسـن و جیـوە) یەکـە لـە مارکـسیزمی مـرۆڤ دۆسـتانە و ئـەخلاقی مەسیحی. زۆر لە رێبەرانی سـەرەتایی حزبی کرێکاری (بریتانیـا) وەکـو کرهـاردی. رابـرت بلچفـورد وچ، بـرووس گلازیـیش روانگەگـەلی ئـەخلاقیان سـەبارەت بـە مارکـسیزم بـووە. ئەمانـە سۆسـالیزمی ئـەخلاقی خۆیـان لـە نووسـەرانێکی وەک راسکین، کارلایل، دیکێنز و توورروو وەرگرتووە. ئـەم بۆچوونـە دەربـارەی زۆر لـە کەسانێکی وەکو ل. ت. هابهـاوس لـە سـوننەتی لیـبراڵی کۆمەڵایەتیـشدا هەیـە. لـە بریتانیای سەدەی بیستەم ر.ه. تـاونی رەنگـە بـەناوبانگترین نوێنـەری ئـەم رێبـازە بدرێتـە قەڵـەم. ئـەو لێبڕاوانـە دەوڵـەتی بـە رێخـراوەیـەک دەزانی کـە کـارکردە ئەخلاقییەکانی هەیە.[٢١]

سۆسیالیزمی زۆرخواز بە شێوەگەلی جۆراوجۆر پەیدا دەبێ. مـن بـە کـارکردی وشەی (زۆرخوازی) پێویستانە قەستی تێکخستنی واتای زۆرخـوازی ئـەخلاقی یـان سیاسیم نییە. بە وتەیەکی دکە، لێرەدا هیچ گومانێک دەربارەی پێکەوە ژیانی جێگرە ئەخلاقی، سیاسی یان ئابووری لە ئارادا نییـە. باوەڕەکـان دەربـارەی (زۆرخـوازی ئەخلاقی) بە شێوەی ئەخلاقی لە سۆسیالیزمی دەوڵـەتی ریفۆرمخوازیـشدا دەکـری پەیـدا بـێ. پێچەوانـە، زۆر لـە لایـەنگرانی سۆسـیالیزمی زۆرخـواز بینینگـەلێکی (گشتیخوازانە) نیشان دەدەن و هیچ جێگرێک بە جێی خۆیان قبـوول ناکـەن. کەڵک وەرگرتنی من لە پیتی (زۆرخواز)، لایەنی هەڵبژێراوی بنەڕەتی ئەمەیە کە دەوڵـەت وەکـو ئامێرێـک بـۆ کردەوەکـانی سۆسـیالیزم یـان زیـاد کـردنی ئـەو ناناسـری. سۆسیالیزم هەر تەنیا دەتوانێ لە لایـەن رێکخـراوە زۆرەکـانی کرێکارانـەوە خـۆی

ـــ زماندراو بداته قەڵەم: ئەنجوومەنە بەرهەمهێنەرەکان کە پلە بە پلە هەموو ـ کردەکانی ئیداری و تەبایی خویان (کە لە پێشدا دەوڵەت گرتبوویە ئەستۆ) بە ـەستۆی بگرن. لەبەر ئەمە. وتاری سۆسیالیزمی زۆرخواز ئەو سۆسیالیستانە ـگرێتەوە کە هیچ ئاڵوگۆڕ، یان مامەڵەیەکیان لەگەڵ دەوڵەتا نییە و ئامادەن بە ـپشت و پاڵدانەوە بە زۆر لەگەڵ ئەنجوومەنە کرێکارییەکان کار بکەن. لێرەدا ـێکەڵاوییەکی بەهێزی لەگەڵ کۆمەڵێک ڕێبازە ئانارشییەکان پێش دێ.

سەیر لێرەدایە کە هی وەک ئەم ڕوانگە زۆرخوازانە لە کومۆنیزمی شورایی ـ ـشیشدا نیشان دراوە. لەم ڕوانگەیە لنین-یش بە زۆر لە کاتی گەڵاڵەکردنی ـ ـوشمی (هەموو دەسەڵات بە دەستی شوڕاکان) سوودی برد. مارکس بێ ئەوەی ـیەوەێ، لەم ڕوانگەوە لە وتەکانی خۆیدا دەربارەی کومۆنی پاریس (١٨٧١)، لە ـتیبی شەڕی ناوخۆ لە فەڕەنسا و کاتی لایەنگری لە کومۆنە تاک و ناکۆکان ـشتگری کردووە.[٢٢] ئەم ڕوانگە بە تەوژمە بەرەولاچوونی ئانارشیزم، سەلما و ـشتگری توند و قایمی بزاڤی نوێنەرایەتی مەدەنی و ئانارشیستی، نوێنەرایەتی ـنفی بەرەو خۆی دەکێشێ. بیرمەندانی وەک گوستاو لندوئر یان پیئر ژوزف ـرودونیش لەسەر ئەم ڕوانگە سەحەیان داناوە، لەگەڵ ئەمەدا، ڕوانگە گشتییەکانی ـەوان ڕواڵەتەن بە دژواری بۆ پلەبەندی دەبێ و بە بێ سباتی لە نێوان سۆسیالیزمی ـۆرخواز و ئانارشیزمدا هەڵواسراوە.[٢٣] بە کورتی و گرنگتر لە هەموو، ئەم ڕوانگەی ـشکرا و جیلوەی ڕووناکی لە بزووتنەوەی سۆسیالیستی مەدەنی بریتانیا پەیدا ـدکا کە لەسەردەمی شا ئەدوارد دا پەرەی گرت. هەروەها وێچوونگەلێکی بێتێنی ـەگەڵ بزووتنەوەی هاوبەشی و بزاڤە یەکێتییە کرێکارییەکان لە سەردەمی پاش ـ١٩٤ هەیە. لە ڕوانگەی زۆرخوازییەوە، دەوڵەت دەبێ کردەوەکانی دەسەڵاتی بازار لە جێگای کردەوەکانی دەسەڵاتی دەزگای ئیداری دیوانسالارانە کۆبکاتەوە. بێگومان جیاوازیگەلێکی زۆر لە نێوانی ئەم زۆرخوازیانەدا هەیە. کومۆنیزمی شورایی و. سەندیکالیزم ڕوانگەکانی گشتبینی بوون کە باوەڕیان بە شۆڕشی خوێناوی و توورە بوو و بە شێوەگەلی یاسایی و ڕیفۆرمخوازانە باوەڕیان نەبوو، لە حاڵێکدا کە سۆسیالیستە مەدەنییەکان زۆرینەیان دژی ئەوان بوون. بە پێچەوانەی

ئەو جیاوازییە گرنگانە، ئەوانە لە دژایەتی لەگەڵ دەوڵەت بە شێوەی هۆکارێکی بە حەقیقەت گەیوی سۆسیالیزم هاو باوڕەیان بوو و هاو باوەڕ لەگەڵ چالاکی رێکخراوەیی بوون.

سۆسیالیزمی لایەنگری بازاڕ دیاردەیەکی زۆر نوێیگریَ دراو بە دەیەی ١٩٨٠ وەیە، هەرچەند شوێنی پێی دەگەڕێتەوە بۆ رابردوو و سەرچاوەی خۆی لە دۆزی مارکسدا دەدۆزێتەوە.[٢٤] پێشمەرج و گریمانەی ئەو تێشکانی سۆسیالیزمی دەوڵەتی ریفۆرمخواز لە سەدەی بیستەمە. گرنگترین لایەنی هەڵبژێراوی سۆسیالیزمی لایەنگری بازاڕ ئەو واتایەیە کە ئابووری بازاڕ دەتوانیَ پێوەندی بە سەرمایەدارییەوە نەبیَ و لەو جیا بێتەوە. زۆر لە سۆسیالیستەکانی هەموو رێبازەکان بە هیچ چەشنێک لەگەڵ ئەم باوەڕەدا نین. بە بۆچوونی سۆسیالیستە لایەنگرەکانی بازاڕ، سەرمایەداری مومکینە وجوودی بیَ بازاڕ نامومکین بیَ، بەڵام بازاڕەکان دەتوانن بیَ سەرمایەداریش درێژە بە ژیانی خۆیان بدەن، لە راستیدا بازاڕەکان دەتوانن لە خزمەتی ئامانجەکانی سۆسیالیستیدا بن و یەکسانی و تەبایی و ئەخلاقی هاوکات لەگەڵ کارکردی ئابووری بەدیاری بێنن. سۆسیالیستە لایەنگرەکانی بازاڕ سەبارەت بە دەوڵەت ڕەشبینن و لەسەر ئەو باوەڕەن کە پێکێنانی هەڵوێستەکان و هەڵوێستە گیراوەکانی ئابووری دەبیَ دژە کۆکراوتر بیَ و ریَ بۆ چالاکی بازاڕ بکاتەوە. سۆسیالیستەکانی لایەنگری بازاڕ بۆ ئازادیش بە شێوەی بایەخێکی لەبیر کراو دەڕوانن. بەڵام ئازادی پێویستی بە لێهاتوویەکی کاریگەی هەڵبژاردن هەیە. بەم جۆرە، سۆسیالیستەکانی لایەنگری بازاڕ دڵنیەکەرانی پێکهاتنی لانیزۆری دەرفەت بۆ هەڵبژاردنن. چونکە بازاڕەکان بە شێوەی ئامێرێکی پسپۆڕی قبووڵ کراون. ئەوە بەو مانا نییە کە ناتوانن لە بەرنامە رێژییە بەرتەسکەکاندا بە پارێزەوە کەڵک وەربگرن. هێندیَ لەوانیش تا رادەیەک لایەنگری هاوبەشی کرێکارەکانن.[٢٥]

## خووی مرۆڤ

هـه‌میشه گـشتی کـردنی پانتـا ئیدئۆلۆژییـه‌کان کـارێکی دژواره. بـه‌م حاڵـه‌وه، ـوسیالیسته‌کان هه‌میشه بۆچوونی گه‌شبینانه‌یان ده‌رباره‌ی گۆڕانکاری بوونه‌وه‌ی ـروڤ هه‌یه و تا راده‌یه‌ک باوه‌ڕی به کامـڵبوونی مرۆڤـایه‌تی قبووڵـه. بوونـه‌وه‌ری ـــروڤ ده‌توانـــێ گـــشه بکـــا و توانـــایی ئـــه‌خلاقی خـــۆی به‌هره‌مه‌نـــد بکـــا.[٢٦] ـوسیالیسته‌کان هه‌روه‌ها حـه‌ز ده‌کـه‌ن ریـشه سروشـتییه‌کانی مـرۆڤ لـه ژیـانی کۆمه‌لایه‌تیـدا ببیـنن. ئێمـــه‌ی مـــرۆڤ هـــه‌ر تـــه‌نیا که‌ســـانێکی کارتێنـــه‌کراوی ـژدکۆمه‌لایه‌تی نین، به‌شـێک لـه ژیـانی کۆمه‌لایـه‌تی پێکـه‌وه‌بوون ده‌درێتـه قه‌ڵـه‌م کەش و هه‌وایه‌ک که مرۆڤه‌کان له‌ودا جۆراوجۆر بـاردێن تـا راده‌یـه‌ک پێوه‌نـدی بـه جه‌وهه‌ر و زاتی ئه‌وانه‌وه هه‌یه. به واتایه‌کی دیکه، هـه‌م بـارودۆخی مـاددی و هـه‌م ـه‌عنه‌وی بوونه‌وه‌ی مرۆڤایه‌تی ده‌بـێ لـه نـاوه‌ڕۆکی کۆمه‌ڵـگه ده‌رکـه‌وێ. بیجگـه ـه‌مـه، بـه بۆچـوونی زۆر لـه سۆسیالیـسته‌کان، مرۆڤـه‌کان ده‌تـوانن عـه‌قڵ و فامـه جۆراوجۆره‌کان به‌ده‌س بێنن. سۆسیالیزم وه‌ک لیبرالیزم و پێچه‌وانه‌ی پارێزگـاری، ـۆزێکه که زۆرتر نزیکی به جیهان وه‌ته‌نییه‌وه هه‌یه. له‌سه‌ر ئه‌م باوه‌ڕه‌ن که هه‌موو ـرۆڤه‌کان به خستنه پشتگۆی و چاوپۆشی له‌مه که هی چ ولاتێک، چینێک، ره‌سه‌نێک و تۆرمه و بنه‌چه‌یه‌کن، ده‌توانن جۆربه‌جۆر بن.

له‌گه‌ڵ ئه‌م باوه‌ڕه ره‌سمییه گرێ دراوه ده‌رباره‌ی جه‌وهه‌ری مرۆڤ، جیـاوازی وردبینانـه و زۆرجـار دژ به‌یـه‌کیش لـه بابـه‌تی هه‌سـتی ناسـییه‌وه لـه روانگـه‌ی سۆسیالیـسته‌کاندا ده‌بینـرێ. ئـه‌م جـۆره هه‌سـتی‌ناسـیانه لـه هـه‌موو جـۆره سۆسیالیزمدا ناگونجێ به‌ڵکو ئـه‌وه بـه رێبـازه جۆراوجۆره‌کانـدا دابه‌شـده‌که‌ن. لـه نووسراوه‌کانی هێندێ له سۆسیالیسته خه‌یالیه سـه‌ره‌تایه‌کانی وه‌کو رابرت ئوون و سن‌سیمۆن، له به‌ڵگه‌ی زۆر له فابیانـه سـه‌ره‌تایه‌کان، و هـه‌روه‌ها لـه (مارکـسیزمی زانـستی) هه‌ڵوێـستی عـه‌قلانی سـه‌رده‌می رۆشـنگه‌ری سـه‌باره‌ت بـه مرۆڤـایه‌تی ده‌بینرێ. ئه‌م هه‌ستی‌ناسـییه سـوننه‌ت ره‌ت ده‌کاتـه‌وه و بـاوه‌ڕی بـه‌وه هه‌یـه کـه جه‌وهـه‌ری مـرۆڤ بـۆ ده‌سـتکاری و گـۆڕان و کۆنتـرۆڵ ده‌بـێ؛ یـان سـه‌رله‌نوێ دروست ده‌کرێته‌وه یان له رێبازی عـه‌قڵ و کـه‌ش و هـه‌وادا ریفـۆرم ده‌کـرێ. لـه‌م

رووەوە سۆسیالیزم بە باوەڕی عەقلانییەت دەدرێتە قەڵەم. ئەگەر بکرێ بارودۆخی جۆراوجۆری مرۆڤ نوێ بکرێتەوە و باش بێتەوە، کە واتە خوو و جەوهەری مرۆڤیش دەکرێ سەرلەنوێ دروست بکرێتەوە. ماتریالیزمی مێژوویی مارکسی وێنەیەک لەم حەز و مەیلانەیە. ئەم ماتریالیزمە بە ئێمە دەڵێ کە مرۆڤەکان لە کەش و هەوای ماددی تایبەتا چۆن کردەوەیەک لە خۆ نیشان دەدەن. ئەگەر بارودۆخی ماددی گۆڕانکاری بەسەردابێ، جەوهەری مرۆڤیش دەگۆڕدرێ.

لە لایەکی دیکەوە، لە هەستیناسی رۆمانتیکتر و مرۆڤ دۆستانەتری ئەندێشەی سۆسیالیستیدا باوەڕێکی بەهێز بە سەر بەخۆی کردەوەی تاک بوونی هەیە مرۆڤەکان هەر تەنیا لە بارودۆخی ماددیدا ناتوانن سەرلەنوێ دروست بکرێنەوە ئەوانە بۆ ناسینی راستییە ئەخلاقییەکان دەبێ دەورە ببینن و بەقەناعەت بگەن مرۆڤەکان خوڵقێنراوی سوننەتیش هەن. ئەوان رابردوو فڕێ نادەن یان هەمیشە بە دووی نوێکردنەوەی ریشەی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە نین. بێجگە لەمە، ئەوان پێشکەوت لە پەرەپێدانی پیشەسازی پێویستانە پەلە نازانن، لە راستیدا لە هێندێ شوێندا پێچەوانەی ئەمەیە. سۆسیالیزمگەلێک هەن کە دەتوانن کە ژیانی دێنشینی ئارام بە شێوەی ئارمانجی ژیان دەزانن.[۲۷] مرۆڤەکان خوڵقاوی خوڵقێنەرێکن کە دەتوانن لە لایەن کاری تێبینانەوە خۆیان پێبگەێنن. دۆزەکانی ئارتور پنتی و ویلیام موریس دەربارەی کاری داهێنان، ئەندێشەگەلی سۆسیالیستە ئەخلاقییەکان سەبارەت بە پێشکەوتی ئەخلاقی مرۆڤەکان، ئانتۆنیۆ گرامشی دەربارەی مارکسیزمی مرۆڤدۆستانە، هەموویان لایەنگەلێکی جیاوازی ئەم هەستی ناسییە گشتیە دەدرێتە قەڵەم.

لێدوانێک کە شاراوە جەوهەری مرۆڤ لە سۆسیالیزمدا پێشتر دەخاتە روو. بابەتی هەرگیز نەمری ئەخلاقی و زانست لە سۆسیالیزمە. لێدوان هەر تەنیا بە هۆکاریگەلێکی ساکاری نێوان زانیاری عەقڵخوازی زیان هێنەر بۆ ویستی ئازاد و ئەخلاقی کۆتایی پێێنایە. بیرێکی ئەخلاق لە ئەندێشەی زۆرینەی سۆسیالیستەکاندا هەیە کە بە زمانی دیاری زانستی تەواو پێچراوە و شاراوە دەبێ.

بوارگـەلێکی رووبـەرووی زانـستی سۆسـیالیزم، درێژاوەیـە لەسـەر پـرۆژەی سەردەمی رۆشنگری بۆ شیکردنەوەی راستی لە لایەن پرەنـسیپی عەقـلی و لەبـەر ئەمـە، رەتکردنـەوەی هـەر چەشـنە پـڕ و پووچێـک و بەشـێکی زۆری سـوننەت، دووەمین بواری ئـەویش پێناسـەی لـە زانـستییە تەجروبییـەکانی کۆتـایی سـەدەی نۆزدەیەمە. لەسەرانسەری سەدەی رابردوودا زانستییە سروشتییەکان بـە شـێوەی بەربلاو هـاوکێش لەگـەڵ (راسـتی) بـەراورد دەکـرا. بـۆ ئـەوەی کـە سۆسـیالیزم حەقیقیتر جیلوە بکا، زۆرجار زمانی زانستییە سروشتییەکانی بەکار دەبـرد. بـواری پرەنسیپی سۆسیالیزمی زانستی دەبێ لـە نێـوان سۆسیالیـستە خەیاڵـییەکاندا بـۆی بگەڕێی. ئەوان بەتـەواوی لـەژێر کـاتێکراوی جوسـتوجۆی پێکهاتـە زاتی و دەقیقـی جەوهەری مرۆڤدا بوون. ئەگـەر ئـەم پێکهاتـە بـۆ ناسـینەوە و پێرسـتبەندی بووبـا، کەواتە کۆمەڵگەکانیش دەبوو لەسەر بنەمای حەز و مەیلەکانی جەوهەری مرۆڤ بـە شێوەی تەواو دابڕژایە. خواردەمەنی، چالاکی رەگەزی، بەرگ لەبەرکردن، پێـوارە و تەنانەت دەرەکیترین حەز و مەیلەکانی مرۆڤ دەکرا دیاری بکرێن و پێشەکی تـەیار کرابان. دۆزی فەوریە دەربارەی حەز و ئارەزووە بنەڕەتییـەکانی هـەر تاکێـک کـە راستە و راسـت لـە فالانـستر یـان ئارمـانج شـاری ئـەودا شـی کراوەتـەوە، جـۆرە وێنەیەکی ئـەم پرۆژەیـە.[28] هـەروەها لـە خـۆڕاوە نییـە کـە ئوونخوازەکـان یەکـەم کەسانێک بوون کە ئەندێشەی زانـستییە کۆمەڵایەتییـەکانیان لـە بریتانیـا بـردە نێـو خەڵکەوە و هەمەلایانەیان کرد.[29]

تەنینـەوە و بەرینبوونـەوەی راسـتەقینەی سۆسـیالیزمی زانـستی لـە گـرەوی مارکس و ئینگلیسدایە. بەتایبەت ئینگلس لەگەڵ خولقاندنی ئاسـەواری پوزیتۆیـستی بە شێوەی ساکار و گـشت تێگـەین لـە کتێبگـەلێکی وەکـو سۆسـیالیزمی خەیالـی و سۆسیالیزمی زانستی، ئانتی دوورینگ و دیالکتیکی سروشتدا هەنگاوگەلێکی گرنگـی لەم رێوە هەڵێنا.[30] کتێبی ئانتی دوورینگ بەتایبەت لە پێکهێنانی ئەم روانگە زانـستییە کاردانەوەی زۆری بوو. بە راستی بۆ ئەوە دەبێ پرسیار بکرێ کە ئەم رێیە چۆن لە لایەن مارکسەوە خۆش کرا؟ بەراوردی ماتریالیزم لە لایەن مارکسەوە بە پـارێزتر و وردبینانـەتر لـە ئیـنگلس بـوو. هـەتا ئـەو رادە کـە دیـارە، مـارکس هـەرگیز لـە

بەراوردکردنی دیالکتیک بەسەر سروشتدا پێش هەنگاو نەبووو. ئینگلس لە گوتندا ئاهەنگێکی بە کاردەهێنا کە گوایە ئەمە بەشێک لە سۆسیالیزمی مارکسیستییەو بە شێوەی گشتی لەگەڵ ئالوگۆڕی زانیاری دەگونجێ. ئەو جۆرە کە خۆی لەسەر گلۆی مارکس گوتوویە: (هەر ئەو جۆرە کە داروین یاسای کامڵبوونی سروشتی ئۆرگانێکی (خانە) دۆزییەوە، مارکسیش یاسای کامڵبوونی مێژووی مرۆڤی دۆزییەوە).[٢١] ئەم خەتە فیکرییە نەک هەر لە لایەن مارکسیستە ئەڵمانییەکانی وەکو کائۆتسکی و ببل بەتەواوی لێیان کۆڵیەوە، بەڵکو پولخانوفی مارکسیستی رووسی لە کتێبی ماتریالیزمی خەباتکار، لنین لە کتێبی ماتریالیزم و ئامپریۆکریتسیزم و دواتر بوخارین و ئیستالینش هەر ئەو رێیان پێوا.[٢٢] زۆر کەس مارکسیان لە دەلاقەی روانگە ئینگلسەوە سەیر کردووە. لەم روانگەوە، مرۆڤەکان خوڵقێنراوی ماددی بوون کە (یاسا دیالکتیکەکان) زاڵ بەسەر سروشت و کۆمەڵگە لەسەر چارەنووسی ئەوان کاردانەوەی دەبوو. تاک لە لایەن چینێکەوە کە دەوری ئەو لە رەوەندی تەولیدا دەر دەکەوت، بۆ ناسینەوە دەبوو. بناغەی ماددی کۆمەڵگە چارەنووسی سەرەوەی ئەندێشەی مرۆڤی دیاری دەکرد.

هەر ئەو باوەڕە بوو بە پرۆژەی رەسمی حزبی سۆسیال دیمرکراتی ئەڵمان کە لە ساڵی ١٨٩١ شاری ئەرفورتا چەسپێنرا و دواتر بە ناوی پرۆژەی ئەرفوت ناوبانگی دەرکرد.[٢٣] هەروەها هەر ئەم باوەڕە بوو کە لە لایەن ئەدوارد برنشتاینی پێداچوونەوە خوازەوە رەتکرایەوە. لە رۆژگاری ئێمەدا ئیددعا سۆسیالیستییە زانستییەکان بە چاوی پڕ لە گومانەوە سەیر دەکرێن.

مارکسیستەکان تاقانە سۆسیالیستێک نەبوون کە لە بیری گشتی زانیاری سوود بەرن. زۆر لە فابیانە سەرەتاییەکان لە بریتانیا (لە باوەڕ بە دەرفەت، لە راستیدا زەروورەت، ریفۆرمی عەقلانی و زانستی و ئیداری ئیلهامیان وەرگرتبوو).[٢٤] بە بۆچوونی (وێب) کانی فابیان، سۆسیالیزمی باش ئەوەیە کە لەسەر بنەمای زانستی کۆمەڵگە بێ. زانستە کۆمەلایەتییەکان رەوەندی توێژینەوەی ئەزموونی سیستماتیکی دروست بوو.[٢٥] وبەکان هێندێ سەبریان سەبارەت بە وتەکانی خۆیان لە زانستی ئەخلاقی یان بایەخە سۆسیالیستییەکان لە خۆ نیشان دەدا. زمانی ئەوان

ـەژێر کارتێکراوی و نەفوزی داروینخوازی کۆمەڵایەتی (دەربارەی بئاتریـسی وێـب
ـ ـنگـە کاریگـەرتر لـە هێربێـرت سپێنـسێر)، بـە رەگـەزی (eusenics)، عەقـڵخوازی
ـەگوست کنت، ئابووری سیاسی نئوکلاسیک و فایدە باوەڕی رادیکاڵ بوو.[٣٦]

یەکێک لە لێکۆلینەوە سەرەتاکانی فابیان، راستەقینەگەلێک بـۆ سۆسیالیـستەکان،
ـ ـدوەندی گشتی ئەندێشەی بۆ زۆربەی سۆسیالیستەکان لـە بریتانیـا دیـاریکرد. لـەم
ـیکۆلینەوەیەدا بە تەئکیدەوە نووسرا بوو کە (هیچ تاکێکی مەنتقی و عاقڵ کە راستەکان
ـاسـن نـاتوانن لـە سۆسـیالیزم بوونـدا گومانیـان هـەبێ و کوتـایی بکـەن)[٣٧] حاشـا
هەڵنەگری زانستی سۆسیالیزم لەسەر ئاستی تەجربە دارڕژا بوو. بەرەوپێش چوون لە
لایـەن سۆسـیالیزمەوە لەگـەڵ زانـستە کۆمەڵایەتییـە ئـەزموونییـەکان دەردەکـەوت.
گومانەکان لەگەڵ کۆمەڵێک وردەکاری واستی دەربارەی کاردانـەوە و نزیکبوونـەوە
بە سوودی سۆسیالیزم و کاردانەوەی سەرمایەداری لە بێخ دەرهابوون. لەم بارەوە،
سۆسیالیزم بە واتای سیاسەتی کۆنترۆڵـە مەنتقییـەکان و سیـستمە بایەخیەکانییـەوە
باش بوو. ئەم کاردانەوە نەک هەر تەنیا ئـەو هەڵـبژاردانەی دەگرتـەوە کـە پـسپۆڕی
زانـستییە کۆمەڵایەتییـەکان بـوون و کاروباریـان لـە رووی پڕۆژەیـەکی دەقیقـەوە
کۆنترۆڵ دەکرد، بەڵکو لە ئاخر رادەی کۆنترۆڵی پەروەردەدا لە ئۆرگانـە کارییەکانـدا
بە سالاچووەکانیشی دەگرتە بەر. زانستەکانی ئێستا لەم روانگەوە هـەتا چ رادەیـەک
ڕێگـا بـۆ گومـان دەکاتـەوە؟ هـیچ کـام لـە فابیانـە گـەورەکان لـە بابـەتی زانـستی
فێرکـراوەوە و تەنانـەت بەتـەواوی خوێنـدەوار نەدەدرانـە قەڵـەم. وشـەی زانـست
(هەرچەند ریشەگەلێکی بەهێزی لە زانستی ئابووریدا بوو) زۆرتر واژەی گرێدراو بـە
سەلماندن و قبووڵ کردنـەوە بـوو. ئـەو چەشـنە کـە بیرمەنـدێک دەڵـێ: (چـەمک لـە
دووپاتکردنەوەی هەمیشە (وشەی زانست) متمانە پێدان بوو).[٣٨]

پێشبینی دەکرا کە سەرمایەداری تووشی ئاڵۆزی رووخانێکی حاشا هەڵنەگر بـێ،
رووخانێک کە یان دارڕژاو لەسەر بنـەمای تەنینەوەگـەلێکی چینایـەتی دەروونی ئـەو
بوو یان، بە بۆچوونی فابیانەکان، کارنەدانەوە و بێهێزی تەواوی ئەو کۆتایی پـێ‌دێ.
جێییەک کە جیاوازی ئاشکرای نێوان مارکسیزم و فابیانەکان بوونی هەیە، لە بابـەتی
بلاوکردنەوەیـە. فابیانییـەکان بـە شـێوەی گـشتی هـیچ چەشـنە واتایـەکی جـەبری

مێژوویيان قبوول نەبوو، واتە ئەمە کە هەموو شتێک پێوەندی بە قۆناغی مێژووی ئابووری و شێوەی بەرهەمێنانی ئەوەوە ببێ. ئەوان بە هەڵسوکەوت بڵاوکردنەوەی سەرچاوەکان لە لایەن دەوڵەتەوە باوەڕیان بوو، نەک تایبەتمەندی لە بوارە ئەخلاقییەکاندا بەڵکو لە بواری کاردانەوەی نەتەوەیی و ئابووری. لە لایەکی دیکەوە، مارکسیستەکان بۆ بڵاوکردنەوە لە لایەن دەوڵەتەوە بایەخ و گرنگییەکی ئەوتۆیان نەدەدایە. هەتا ساڵی ١٩١٤، لەژێر کارتێکراوی ئینگلیس، بۆچوونی گشتی مارکسیستی هەمیشە لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە لە بەرژەوەندی چینایەتی زاوەتەوە و هەرگیز ناتوانێ بە یەکسانی کۆمەڵایەتی بگا.

بەم حاڵەوە، لە بابەتی خاڵی باس کراوەوە، حوکم یان داوەری گشت ریبازە سۆسیالیستەکان گرنگییەکی لە رادەبەردەریان بوو. لە روانگە زۆر لە سۆسیالیستەکانەوە دژایەتیان لەگەڵ سەرمایەداری بە سۆنگەی دژەئەخلاقی بوونی ئەو بوو. سەیر ئەوەیە کە ئەم بابەتە ئەخلاقییە لە سۆسیالیستە ئەخلاقیە سەرەتایەکانی وەکو ئۆون و سن سیمۆن هاوڕێ لەگەڵ عەقڵخوازی سەردەمی رۆشنگەری لەوانیشدا دەبینرێ. سن‌سیمۆن و ئۆون باوەڕی مەسیحی‌یان نەبوو، بەڵام دوا کتێبی سن‌سیمۆن بەناوی مەسیحییەتی نوێ کە لە لایەن مەکتەبی سن‌سیمۆنەوە بە شێوەی مەسلەکی وێچووی مەزهەبی دەهاتە ئاراوە، پێشبینی نادیاربێژانەی دوایی ئۆون هەموو بە رەنگدانەوەی جۆرێک نادیاربێژی لە باردی سەردەمی زێرینی مەعنەوی داهاتوویان دەزانی.[٣٩] فەوریەش دەوری خۆی زۆر بە گەورە و پێغەمبەرئاسا دەزانی. سۆسیالیستە خەیاڵییەکان دەربارەی سەرمایەداری و ئابووری سیاسی لیبرال هەمیشە بە ئاهەنگی رەتکردنەوەی توندوتیژی ئەخلاقییەوە ئاخاوتنیان دەکرد.[٤٠] ئەم ناوەڕۆکە دەکرێ لەگەڵ دەربڕینێکی بەهێز لە کردارەکانی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمی سۆسیالیستە مەسیحییەکانی وەکو چارلز کینگزلی‌دا ببینرێ کە باوەڕیان بە پێوەندی بەهێزی مەسیحییەت و سۆسیالیزم بوو. هەروەها وەکو ئەوە لە نێو لایەنگرانی ئیلاهیاتی لیبرال، لە سەدەی بیستەمدا دەبینرێ.

ئەم روانگە لە لایەکی دیکە لە مارکسیزم، واتـە نووسـراوە فەلـسەفییەکانی تـافی
لاوی مارکس، هەروەها رەنگدانەوەی بووە. بەتایبەت کتێبە دەستنووسـە ئـابووری
و فەلسەفییەکان کە لە دەیەی ١٩٢٠ کەوتە بەر دەس و دەرکەوتن لایەنێکی دیکـە لـە
بیروەری مارکس ئاشکرا دەکا. واتـە لایـەنێک کـە نیگـەرانی سـەربەخۆیی مـرۆڤ و
ویستی ئازادی ئەوە.[41] لەم نووسراوە سەرەتاییانەدا، (لەگەڵ خۆ بێگانەیی) گرفتێکـی
ئەخلاقی و فەلسەفییە و هەر تـەنیا زاتی سیـستەمـی سـەرمایەداری نادرێتـە قەڵـەم.
مێژوو هەر تەنیا پێوەندی بە یاسای سەختی بـەرچاوەوە نییـە. زانیـاری و بـاوەڕە
ئەخلاقییەکان دەوری سەرەکی چارەنووس سازیان لە کاروباری مرۆڤدا هەیە. ئـەم
ڕووداوە گشتییە ئەندێشەییە لە سـەدەی بیـستەم لەگـەڵ ئاسـەواری نووسـەرانێکی
وەک گرامشی، مارکوزە، لۆکاچ، کورش و مەکتەبی فرانکفۆرت وەدوای کەوتن.[42] لە
ساڵە دوایەکاندا کۆمەڵـێک لـە بیرمەنـدان و خـاوەن ئەندێـشانی کۆمەڵایـەتی وەکـو
ئـاگنس هلـی و فرنـک فـەهریش سـەرلەنوێ ئـەوەیان خـستە بـەر تۆژینـەوە. ئـەم
نووسـەرانە، بـە شـێوەی لایـەنگـرانی فیکـری لۆکـاچ، تێدەکۆشـان نـاوەرۆکی
خودموختاری مرۆڤ و ئەخلاقی لەگەڵ روانگەی مارکسیستی بگونجێنن.

بابەتە ئەخلاقییەکان و خودموختاری و سەربەخۆیی مرۆڤ لە لێدوانـەکانی پێـدا
چوونەوە خوازی (مارکسیستی) شدا ڕێیان دیوەتەوە. ئەدوارد برنشتاین، یەکێک لـە
کەسایەتییە بەناوبانگەکانی حزبی سۆسیال دیموکراتی ئەڵـمان هـەتا بـەر لـە هاتنـە
دەرەوەی خۆی، لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە سۆسیالیزم دەبێ لەسـەر بنەماگـەلێکی
ئەخلاقی دابڕێژرێ و وتەکانی کانتی بە ناوی مامۆستایەک دەگێـراوە.[43] هەڵوێـستی
ئـەوان نزیکییـەکی زۆری لەگـەڵ دەسـتەبەندی لیـبرالی کۆمەڵایـەتی وەکـو ل.ت.
هابهاوس هەیە.[44]

حەز و مەیلی ئەخلاقی و مەزهەبی لە سۆسیالیزمی بریتانیایـدا هـەروەها حـەز و
مەیلێکی بەرچاو دەدرێتە قەڵەم. هێنـدێ تـوێژەر پێگـەی ئـەوەیان بـە سـیمای زەقـی
کەلتووری سیاسی بریتانیای نێوان سەدە دوور و درێژەکـان زانیـوە.[45] لـە کۆتـایی
سەدەی نۆزدەیەم، هەم ویلیام مـوریس و هـەم بلفـورت بـاکس سۆسـیالیزمیان بـە
سیستەمی ئەخلاقی لە کۆمەڵگەدا دەزانی. هـەروەها زۆربـەی ڕێبـەرانی سـەرەتای

حزبی کرێکاری بریتانیا بۆ وێنـه کرهـاردی، لـه بـارەی سۆسـیالیزمی خۆیـەوە بـه زمـانی مەزهـەبی ئاخاوتنیـان دەکـرد. هـەر ئـەو جـۆرە کـە یـەکێک لـە تـوێژەران گوتوویە، لە دەیـەی ١٨٨٠ (بـە دەس هێنـانی بـاوەڕ و بـەرەو سۆسـیالیزم چـوون زۆربەی بە شێوەی هەستە بە تەوژمە ئەزموونە مەزهەبییەکان بوو).[46] ر. ە. تـاونی کـه بـه وتـەی تـۆنی رایـت (بـەیانکـەری ئەندێـشەی بەرەیـەکی تـەواوی سۆسیالیستەکانی بریتانیا بوو) پڕشنگدارتـرین وێنـەی ئـەم ناوەڕۆکـە ئـەخلاقی و مەزهەبیەیـە.[47] هێرشـی ئـەو بـە سـەرمایەداری و کۆمەڵـگەیماڵپەرسـت بـە هـۆی نەبوونی جەوهەری ئەخلاقی و دژە مەسیحی ئەو بوو. سەرمایەداری هـەم تێکـەڵاو بە گوناهە و هـەم بـەرەو مەیلـە دژە ئەخلاقییـەکان لـە مەدەنییـەکان هانـدەدا.[48] لـە راستیدا تاونی هەتا ئەو جێیە دەڕوا کە دەڵێ مەسیحی رەسـەن و راسـتەقینە دەبـێ سۆسیالیزم بێ. ئەرکی کۆمەڵگەی سۆسیالیستی پێکهێنـانی سیـستەمـی دروسـت و دامەزرانـدنی بایەخـە مەسـیحییەکانە کـە خـۆی لـە خۆیـدا حاشـایە کـە بـۆ رۆڵـی سـەرمایەدارییە. پێـشکەوتی مـاددی بـەر لـە هـەموو شـتێک هەڵـگری پێـشکەوتی ئەخلاقی و گۆڕینی کۆمەڵگەی کەسایەتی مرۆڤایەتیە.

لەم روانگەوە، ئەمە مرۆڤە کە سیستەمی ئەخلاقی یان دژە ئەخلاقی خۆی فۆرمی پێ دەبەخشێ. ئەوان ئازادانە مێژوو پێک دێنن. رەخنەی سـەرەکی ئەخلاقییـەکان لـە سۆسیالیزمی زانستی تەنیا لە ئیددعا زانستییەکانی ئەو نـەبوو بەڵـکو دەگـەراوە بـۆ حاشاکردنی ئـەو دەربـارەی هۆکـاری سـەرەکی تۆژینـەوەی سۆسیالیـستی، واتـە ئـەخلاق، بـوو. سۆسیالیـستە بـە خـەیاڵ زانـستییەکان دەورێکـی زۆر کـەمیان بـۆ هەڵبژاردنی ئەخلاقی و تۆژینـەوەی ئـەخلاقی دادەنـا. جـەبرخوازی ئەوانـە بناغـەی سۆسیالیزمی وێران دەکرد. لە روانگەی سۆسـالیزمی زانـستییەوە، سۆسیالیـستێک ناتوانێ بە دووی بایەخەکانی وەکو مافە کۆمەڵایەتییـەکان، یـەکسانی کۆمەڵایـەتی بێ، چونکە سوسیالیزم ئەو جۆرەی ئەوان باسی دەکەن، بە هیچ جۆرێک دەربـارەی بایەخەکان نییە. لە روانگەی سۆسـیالیزمی زانـستییەوە لێدوانی دوایـی ئـەم بەشـە دەبوایە بێ سەمەر بدرایەتە قەڵەم. بە بۆچوونی زۆر لە مارکسیستەکان، بایەخـەکان و ئەخلاقی درۆدۆنگی و گومانی بورژواییین.

تەنانەت مارکسیستگەلێکی وەکو رامشی بە مەحکووم کردنی (ئابووریخوازی)، تەنانەت گرنگتر، لە دەروونی رێکخراوەی فیکری رێبازی فرانکفورت، رەخنەیان لە جەبرخوازییە وشکە گرت. گرفتی هەڵوێست گرتنی ئەخلاقی (جگە لە خەتی ئێشە بۆچوونییەکان جەنجالی ئەخلاقی) بوونی باوەڕە ئەخلاقییەکان یەکجار جۆراوجۆرە کە تایبەتمەندی سەرەکی توێژینەوە سۆسیالیستییەکان پێکدێنێ. جگە مەسیحییەکان، کانتی، فایدە باوەڕی، ئیدەئالیزمی هێگلی، یاسای سروشتی و مافە سروشتییەکان و زۆر لە بنەڕەتییە ئەخلاقییەکانی دیکەی سۆسیالیستیان پێکهێناوە. ئەم جۆراوجۆر بوونە باوەڕەکان زۆرجار دژایەتی و دوژمنایەتی کردن لەگەڵ یەکتر، هۆکاری ئەوەیە سۆسیالیزم لە بوونی هەڵوێستی بەرچاوی ئەخلاقی بێهێز بکا.

گشت روانگە پێوەندیدارەکان کە لەگەڵ مەسەلە سروشتییەکانی مرۆڤ و ئەخلاقی پێوەندیان هەیە، بایەخە بەرچاوەکان لە یەکێتی، دۆستایەتی، ئەنجوومەن، برایەتی و کۆمەڵگەن.[49] کاکڵەی بەهێزی باوەڕی لە سۆسیالیستە خەیاڵییەکانەوە بگرە هەتا دەگاتە سۆسیالیزمی سەدەی بیستەم بوونی هەیە و ئەوە ئەمەیە کە مرۆڤەکان خولقێنراون کە بە یەکەوە یەکێتی و هاوکاریان هەیە. کۆمەڵگە لە باری هەستیناسییەوە لە پلەی بالای تاکەوەیە. بێجگە لەمە، یەکێتی و جەماوەر بەخگەلێکی بالاتر لە تاکخوازی و خۆخوازییە. تاکخوازی نیشانەی جودا بوونەوە و بەربەرەکانێیە. سۆسیالیستەکان زۆرجار گوتوویانە کە ئێمە هەموومان بەشێکین لە یەکتر. ئەم دۆزە تەنانەت لە فۆرمێکی هێور و لەسەرەخۆتر بوونی مارکسیزمیشدا دەبینرێ. واتایەکی دیکە دەربارەی (سۆسیال) یان (کۆمەڵگە)، پێکەوە بوون، هاوکاری هاوپێوار و هاوکێش، بەشداربوون لە مەسەلەگەلی یەکترە. ئەم خاڵە لە یەکەم یەکێتییە مەدەنییەکان. ئەنجوومەنە دۆستایەتییەکان و ئەنجوومەنگەلی یەکگرتوویدا دەتوانین بیان بینین. بە پێچەوانەی پێویست بە هاوکاری بەرامبەر، ئاشکرایە کە سۆسیالیزم لە قۆناغی سەرەتایی خۆی کە کۆمەڵگە و جەماوەر بە واتای بارودۆخی ناکۆی بێ میللیەت و بێ نەتەوە بووە، راستەوخۆ واتای ئەندام بوونی لە کۆمەڵگەی هاوبەشیدا بووە. دواتر لە سەدەی نۆزدەیەم،

زۆربەی سۆسیالیستە ریفۆرمخوازەکان و سۆسیالیستە مارکسیستەکان بە پێچەوانەوە مایل بوون کە بۆ گەیشتن بە ئامانجە هاوبەشەکانی خۆیان ریگەی سیاسەتی تەبای کۆمەڵگەوە، دەزگای دەولەتی بکەنە پاڵپشت. لەگەڵ ئەمەشدا بەرەو هاوبەش بوون، ئەو جۆرە کە لە رێکخراوەگەلێکی وەک سۆسیالیستە مەدەنییەکاندا دەبینرێ، بێگومان لە سەدەی بیستەمیشدا بوونی هەیە. ئەم بەرەولاچوونە مەیلە هێشتا لە نووسراوەی کەسانی (چەپی نوێی) وەکو ریمۆند ویلیامز بایەخێکی بەهێز دەدرێتە قەڵەم.[50]

لە سۆسیالیزمدا واتاکانی جەماوەر و یەکێتی هەم بەهێز و هەم بێهێزە. بەهێزترین واتای جەماوەر کە وەکو هەمیشە پێشمەرجێکە بۆ باوەڕی بەرچاوتر، دارڕاوەی سەر هاوکاری ئەخلاقی لەگەڵ یەکترە یان مەزهەبییە. باوەڕ بە شعووری کۆ، باوەڕە مەزهەبییەکان یان ئەخلاقی کۆ، یان بە واتای بەرتەسکتری وشە، ئەوەی کە جۆری ئۆول باوەڕی کۆبە شەرم و حەیا و دەستوور و نەریتی ئەخلاقی مرۆڤەکان ناودێر دەکا،سێبەری خستووەتە سەر نووسراوەکانی سۆسیالیستی.[51] جۆری کۆمەڵگەیەک کە چاوەڕوانی دەکرێ و خەونی پێوە دەبینرێ هەمە لایەن و لەسەر بنەمای هاوکارییە. ئەم بۆچوونە، هەرچەند بە شێوەی دەرەکی کێششی هەیە، دژوارە کە لە شانۆیەکی پیشەسازی لەگەڵ بزووتنەوەیەکی گورجی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابووری ئەو بسەلمێنرێ. زۆر لە سۆسیالیستەکانی سەدەی بیستەم، لە ئاستی مەسەلەی بە پیشەسازی بوون، بە ئەندێشە و دووربینییەکی بێهێزتر و رواڵەتیتر لە بابەتی شعوور جەماوەر و کۆمەڵگەی دارڕاو لەسەر رێز و حورمەتی بەرامبەری مەدەنییەکان هەوڵیان داوە.[52] ئەم خوازیارییە دەکرێ بە شێوەی ئاشکراتر لە سۆسیالیزمی دەوڵەتی ریفۆرمخوازو وتەکانی ئەم دواییانەی سۆسیالیزمی لایەنگری بازاڕدا ببینرێ. هۆکارێکی دیکە کە لەم بێهێزتربوونەی واتای جەماوەردا بەشی بووە ئەم تێگەیشتنەیە کە لایەنگری بە تەوژم لە کۆمەڵگەی ئیشتراکی دەتوانێ یان بە شێوەی نەفامانە هەڵقولاوە لە حەسرەتی رابردوو بێ یان کردەوەیەکی دوا کەوتوانە. دەبێ بڵێین لە سەدەکانی نۆزدە و بیستەمدا کۆمەڵێک نووسەرانی پارێزگارو فاشیست و برس و را و لەگەڵ بایەخی جەماوەرە سوننەتییەکان رێکەوتن.[53]

## یەکسانی و ئازادی

زۆر لە تـوێژەرانی سۆسـیالیزم یەکسانیان بـە بایـەخی بنـەڕەتی و سـەرەکی سۆسیالیزم زانیوە. گوتراوە کە هەموو سۆسیالیستەکان دەبێ بەر لە گشت شتێک زۆرتر لە هەموو شتێک یەکسانی خـوازبن، لـە حالـێکدا کـە پێچەوانـە باسێک لـە ... ی نەهاتووەتە ئاراوە. زۆر لە تـوێژەرانی سۆسـیالیزم لـەم بـوارەدا زۆر جـار ... ـەر دابەشـکاری نێـوان یەکـسانی و ئـازادی تەئکیـدیان کـردووە. گـوتراوە کـە پشتگری کردن لە یەکسانی بە واتـای ڕەتکردنـەوەی هەلومـەرجی ئازادییـە. لەبـەر ئەمە، پشتگری کردن لە ئازادیش بـە واتـای ڕەتکردنـەوەی یەکـسانییە. بـەم جـۆرە گوتوویانە کە سۆسیالیستەکان ناتوانن لایەنگری ئازادی بن.

بێگومـان یەکـسانی بایـەخی حـەیاتی سۆسیالیـستییە، بـەلام لێـرەدا زۆر لـە پرسیارەکان بێ وەلام دەمێننەوە، ئایا گشت سۆسیالیستەکان باوەڕیان بە یەکسانی هەیـە؟ جگـە لەمـە، ئایـا هـەموو سۆسیالیـستەکان سـەبارەت بـە واتـای یەکـسانی بۆچوونێکیان هەیە؟ بە کورتی، ئایا یەکسانی خۆی لە خۆیدا لەگەڵ ئازادی دژایـەتی هەیە؟ بە جـۆرێکی دی، ئایـا واتـای سۆسیالیـستی لـە ئـازادی کـە دژایـەتی لەگـەڵ یەکسانیدا نەبێ دەتوانێ بوونی بێـ؟ خـراپ لێحالـی بـوونێکی گـشتی لـەم بـاوەڕە بوونی هەیـە کـە گـشتی سۆسیالیـستەکان لایـەنگری بایـەخی یەکـسانین. سـەرەتا ئەمەکە هەمووشت پێوەندی بەم کارەوە هەیە کە دەربارەی چ واتایەک لە یەکسانی ... وان بکرێ. بێجگە لەمە، بایەخێکی تاقانە کە هەموو سۆسیالیـستە خەیالـییەکان لـە ... ەی ئەوەوە یەک دەنگ بـن، بـوونی نییـە. فەوریـە دۆزە یەکـسانخوازەکانی بـە ... دەر دەزانی. ئەو قبوولی دەکا کە لە ئۆتۆپیای سۆسیالیستیدا نەزمـە پلـەبـەندی و ... یەکسانی لە تواناییەکان و لێوەشاوییەکان، سـامان و کـەش و هـەوا بـوونی ببـێ. فەوریـە دەسـتەبەری دەکـرد کـە لـە ئۆتۆپیـای ئـەودا سـامانداران دەتـوانن بـۆ کۆکردنـەوەی سـامان و ڕاگـرتنی دەسـتبەکاربن. سـن‌سـیمۆنیش بـاوەڕێکی وەک فەوریەی بوو، بەلام نەک بەرادەی ئەو وشک. سن‌سیمۆن لەسەر ئـەو بـاوەڕە بـوو کە نەزمە جۆراوجۆرەکانی کۆمەلگە دەبێ بپـارێزرێ. لەگـەڵ ئـەم سـەرنجە کـە لـە

ئۆتۆپیای هەر دوو بیرمەندبوون بانکداران و کار بەڕێوەبەرانی مالی لەبەرچە
گیراوە، بە دژواری توانیویانە مەیلی هێرشی توندیان بەم دەسکەوتانە بێ.
مارکسیش لە روانگەی جیاوازەوە رەخنەی لە باوەڕە یەکسانخوازەکان بوو
ئەوانی بە هۆکارەکان و ئیستدلالگەلی میتۆدی بیرمەندانی بورژوازی لیبرا
دەزانی. ئالن وود گوتەنی، مارکس لایەنگری ئەوە نەبوو کە یەکسانی خۆی ـ
خۆیدا شتێکی باشە.[54] کۆمەڵگەی دوا قۆناغی کومۆنیستی دەبێ لەسەر بنەمەی
یەکسانی دابڕژێ. بەلام بە بۆچوونی مارکس خەیال کردنەوە دەربارەی ئەم جۆرە
شتانە بێبەهرە بوو. تەنیا زانیاری لە بارودۆخی ئابووری زەرووری
کە بە شێوەی ژیان دەس دەدا رەنگە جۆری ئەو کۆمەڵگە بە ئێمە بناسێنی
ئێمە لەم کارە بێ هەوالین. لە بەلگەی دواییدا لایەنێک لە میراتی زانستی مارکس
دەبینرێ. مارکس، چاوپۆشی لەم خاڵە، هێندێ جار دەخزێتە نێو دەروونی
خەیالاتێک دەربارەی یەکسانی و عەدالەتەوە، هەرچەند هێندێ زانیاری
سیستماتیکمان دەربارەی باوەڕگەلێکی یەکسانخوازانە کە رەنگە بووبێتی یـ
نەیبووبێ، لەبەردەستماندا هەیە.
ناوەڕۆکێکی هاوبەش دەربارەی یەکسانی لە سۆسیالیزمدا، بەتایبەت
مارکسیزم، دوورخستنەوەیەکی بەربلاوی واتای هاوپێوار و وشەیی و وشک
یەکسانی راستەقینەیە کە بووە بە یەکێک لە پڕسوودترین و دیرۆکە وەهەرای
هێنەرەکانی گرێ دراو بە سۆسیالیزمەوە.[55] نزیکترین کەسانێک کە لەم وات
وشکەی یەکسانی سوودیان وەرگرتووە، گراکوس بابوف و کە بە بوون کە
روانگەی کومۆنیستییە توندوتیژەکانیان بووە. بەشی هەرە زۆری سوننەتی ئەم
واتایانە بە پووچەڵ دەزانن. یەکسانی راستەقینەی وشک شتێک نییە جگە لە دوەلێک
کە ئیدئۆلۆژیکە رەقیبەکان هەڵیانداوە. تاقانە تایبەتمەندێکی لاواز لەسەر ئەو
کێشەی باسکراوی هێندێ لە سۆسیالیستەکان، بەتایبەت لە بۆچوونگەلێکی
دەربارەی دوەڵەتی رەفا هاتووە کە (پێویست) دەتوانێ لە کۆمەڵگەدا پرەنسیپێکی
یەکسانخوازانەی تەجربی بێ بۆ بلاوکردنەوە. شیکردنەوەی ئاشکرای واتای
(پێویست) دژوارە و گرفتی زاتی زۆری هەیە.[56] لەگەل بوونی ئەم گرفتانە

ـیویست) هێشتا پێگەیەکی بچووکی لە واتای یەکسانی ڕاستەقینەی نـەگۆڕدا هەیـە،
ـیـەی ئەوە کۆمەڵێک ڕەخنەیە کە لە سۆسـیالیزم دەگـیرێ. وەڵامـی پێویـستەکەش
ـەگری کردەوەی یەکسانی گشتی نییە، ئەو جۆرە کە زۆرجار بە شـێوەی دوورا و
ـوور لە دۆزی یەکسانی وشکدا ئاماژە بەو کراوە.

پرسیارێکی دیکە ئەوەیە کـە ئایـا سۆسیالیـستەکان بـاوەڕێکی یـەکگرتوویان بـە
ـتی یەکسانی هەیە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە تا رادەیەک دەبێ نێگەتیڤانـەبێت. ئێمـە
ـێرەدا بۆ ڕۆشنکردنەوەی پێچراوەی ئەم پرسیارە دەبێ هێندێ زیاتر تیشک بخەینە
ـسەر ئەو خاڵانە. یەکەم ئەمەکە یەکسانی بە شێوەی بایـەخێک لەگـەڵ هـەر چەشـنە
ـەکیدێکی دەمی یان ڕاستی دەربـارەی یەکـسانی مـرۆڤ جیـاوازی هەیـە. دووەم
ـەمەکە، (یەکسانی بـە شـێوەی ئامـانج) دەبـێ جیـاواز لـە (بەرامبـەری بـە شـێوەی
ـێشمەرج) بەرچاو بگیرێ. ئاخر ئەوەکە، ئامانجە بە یەکسان گەیوەکان نابـێ لەگـەڵ
ـامانجە بەرامبەرییەکان تێکەڵ بکرێن.

جگە لەوە، بە پێچەوانەی کێـشەی هێنـدێ تـوێژەر، سۆسیالیـستەکان بێجگـە لـە
کەسانێکی کەم وێنەی لایەنگری ئەم باوەڕەن کە یەکسانی شتێکە کـە (دەبـێ) بـۆی
ـگەڕێی. ئەمە واتایەکی ئەزموونی یان ڕاستی نییە (کێشەیەکە بۆ پێویست هاتووەتـە
ـاراوە). سۆسیالیستەکان لەسەر ئەو باوەڕەنین کـە مرۆڤـەکان لـە بابـەتی توانـایی
ـەش یان شـعوورەوە بەرانبـەرن یـان ڕەنگـە بـبن. پێچەوانـە، باوەڕیـان هەیـە کـە
چاوپۆشی لە جیاوازییە سروشتییەکان لە بابەت نەژاد و تورمـە، جـۆری نێـر و مـێ،
توانایی یان چین، سیفەتێکی ئەخلاقیانەی بایەخدار لە ئارادا هەیە کـە دەبـێ ئێمـە بـە
کردەوەی یەکسان لەگەڵ خەڵک هان بدا. لەگەڵ ئەمەدا، بۆ هـەنگاونان بـەرەو خاڵـی
دووەم، شیکاری ئەخلاقی بۆ وەها یەکـسانییەک بـە شـێوەیەکی بـەرچاو جیـاوازە.
ئاسـاییترینی ئـەوان بـاوەڕی فابیانەکانـە کـە یەکـسانی زۆرتـر بـە کاردانـەوەی
زۆرترەوە دەچەسپێ. یەکـسانی لـەم واتایـەدا بایـەخی ئامێرییـە، هەرچەنـد گـشت
فابیانەکان بەم چەشنە لەژێر کاریگـەری بەرامبـەری. تەنانـەت لانیکـەم لـەم واتـادا
نین.[57] زۆربەی شیکردنەوە یەکسانییەکان لایەنە خراپ و رووخاوەکان دەگرێتـەخۆ،

واتە پرسیار دەربارەی وەرگرتنی نایەکسان، یـان هێنانـە ئـارای عەقـڵی باشـتر بـۆ کردەوەی بەرامبەر دەگرێتەبەر.

لە باری پۆزەتیڤ واتە تێگەیاندنی یەکسانی زاتی، سۆسیالیستە مەسـیحییەکانی وەک تاونی و هی وەک ئـەو، لەسـەر ئەندێـشەی یـەهوودی، مەسـیحی بەرامبـەری ڕۆحەکانیان لە دیوانی خودادا تەئکیـدیان لەسـەر کـردووە.[٥٨] باوەڕەکـانی کانـت و فایدە باوەڕی. بەتایبەت دوو باوەڕی دوایی، سـوودیان بـردووە. لەسـەر بنـەڕەتی ئەم دوو باوەڕەی دوایی، لە پلەی یەکەمدا یەکسانی لەسەر بنەمای ئەم پێشمەرجەیە کە هـەرتاکێک چونکـە خـاوەنی ویستی عاقڵانەیـە کـە بایـەخی یەکـسانی هەیـە و هەڵگری ڕێزی یەکسانە، دەبێ یەکسان بدرێتـە قەڵـەم؛ دووەم لەسـەر بنـەمای ئـەم پێشمەرجە کـە هـەرتاکێک توانـای ڕازیبـوونی بەرژەوەنـدی خـۆی و گەیـشتن بـە بەختەوەری هەیە و لەبەر ئەمە، شیاوی ئەوەیـە کـە لـە هـەر دوو حاڵـەتدا یەکـسان بدرێتە قەڵەم.[٥٩]

سێیەم ناوەڕۆک ئەوەیە کە یەکسانی بە شێوەی ئامانج یان دەرەنجام دەبـێ لـە یەکسانی بە شێوەی پێشمەرج جیاواز بزانرێ. سۆسیالیزم لە گەیـشتن بـە ئامـانجی یەکسانی لە کۆمەڵگەدا بەشێکی زۆری بووە. دەسکەوتی چالاکییەکانی مرۆڤ نابـێ سەر لە نایەکسانی دەربێنێ. سۆسیالیزم هەر بەو چەشنە لایەنگری ئـەم ئەندێـشەیە کـە یەکـسانی دەتوانـێ مـەرجێک یـان دەرفـەتێک بـۆ بـە کـەماڵ گەیـشتن و بەرەوپێشچوونی بوونەوەری مرۆڤ برەخسێنێ، ئەمە هەر ئـەو شـتەیە کـە ئێـستە زۆرجار بـە نـاوی (دەروازەی چوونـە ژوورەوەی) یەکـسانی ئەدرێتـە قەڵـەم. بـێ لانیکەمی کەش و هەوای سەرەکی فێرکردن و پـەروەردە، لـەش سـاخی و تـەبا و ڕەبایی بە ناوی دەسپێک، تاکـەکان نـاتوانن لێهـاتوویی توانـا بـە هێزەکـانی خۆیـان باربێنن. دەسکەوتی کۆمەڵایەتی و ئـابووری بـە دەس هـاتوو لـەم خاڵـە دەسـپێکە سـەرەکییە، دەتوانـێ ڕاسـتەوخۆ ئاسـتە نایەکـسانییەکان بگرێتـە بـەر. ئـەم واتـا و بۆچوونە لە یەکسانی لەگەڵ ئـازادی گونجـاوترە هـەتا لەگـەڵ (بەرامبـەری بـەناوی ئامانجێک).[٦٠]

سەرەنجام ئامێری گەیشتن بە یەکسانی نابێ لەگەڵ شێکاری ئامانجەکان یان
-ڕودۆخی یەکسانی تێکەڵ بکرێ. لەوەدا کە خۆماڵی کردن لە (بریتانیا) یان
-بووری دەستووری (لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو) بەناوی سۆسیالیزم ناو دەبرا،
-ۆرجار ئەگەر و گریمانە لەسەر ئەمە دەکرا کە هەموو سۆسیالیستە
یەکسانخوازەکان خوازیاری شێکاری ئەم ئامێرە تایبەتەن و لەبەر ئەمە، هەموو
-ۆسیالیستەکان باوەڕیان بە ئابووری دەستووری یان خۆماڵی کردن هەیە. ئەم
-یرکردنەوەیە بەتەواوی نادروستە. ئامێری گەیشتن بە یەکسانی خەیالاتێکی
-ەربلاوی لە پێشنیارەکان پێکدەهێنا. بێگومان ئابووریە دەستووریەکان لە
فەرەنسا، ئیتالیا و بریتانیا • هەروا لایەنگری یەکسانی لە لایەن ئابووری تێکەڵ یان
-بووری بازاڕەوە بوون. بەڵام سێبەرگەلێکی نادیار و شاراوە لەم باوەڕەدا بوونی
هەیە. لە کۆتایی ئەم خەیالاتەدا، کەسایەتیگەلێکی جۆراوجۆری وەکو فابیانەکان،
جۆرج برنادشاو و لنین بەلشویک لە هەوڵ بۆ گەیشتن بە یەکسانی ئابووری
مەسەلەی وەک یەکبوونی دەسکەوتیان هێنا ئاراوە. بەم حاڵەوە، بڵاوکردنەوەی
-ووبارەی سامان لە لایەن مالیات بەندییەوە پلە بە پلە و زۆر بوون و پلەبەرزی تەبا
و رەبایی لە لایەن سۆسیالیزمی تەجدید نەزەرخواز و ئەخلاقییەوە وەکو
گشت‌لایەنە پەسندترین هەڵبژاردە لەم سەدەیە قبووڵ کراوە. بە گشتی ریشەی پەل
هاویژ و سەرسووڕ هێنەر لە بایەخە جۆراوجۆرەکان لەم بوارە پێشنیار و
چەسپاوە.

سۆسیالیستەکان خۆیان بە خوازیاری یەکسانییەوە بەرتەسک نەکردووەتەوە،
بەڵکو لە بابەتی داواکاری یەکسانی سیاسی لە مافی رەئی بۆ هەموو مەدەنییەک
-ەگەڵ لیبراڵەکان هاوباوەڕن. بانگهێشتن بۆ یەکسانی تەواو یاسایی لە بابەتی مافی
مەدەنیشەوە یەکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی ئەوانە. یەکسانی کۆمەڵایەتی لە باری
-افە بەرامبەرییەکان بۆ ژیانێکی مەدەنیانەی لانیکەم، بەرامبەری لە بابەتی لەش
ساخی و فێرکردن و پەروەردەشەوە یەکی دیکە لە لایەنە گرنگەکانی ویستی ئەوان
دەگرێتەخۆ. لەم سالانەی دوایدا نزیکایەتییەکی بە تەوژم سەری هەڵداوە کە هەموو
ئەم لایانە یەکسانانە دەربارەی گرفتی رەگەزایەتیش بەرچاو بگرێ و لەسەر ئەو

باوەڕەن کە ژنان لە ڕابردوودا لەم مافانە بێبەش ماونەتەوە. ئێمە سەبارەت بەم گرفتە لە بەشێکدا کە پێوەندیی بە فەمینیزمەوە هەیە باسی دەکەین. دەبێ بوترێ کە هەموو ئەم مافانە یاسایی و پێشنیاریانەی دەربارەی بەرقەراری یەکسانی یەکێک لە تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی سوننەتی ڕیفۆرمخوازەکان لە دەروونی سۆسیالیزمدا بوە. مارکسیزمی کلاسیک بۆچوونگەلێک کە پێوەندیی بە مافەکانەوە بوو حاشای لێ دەکرد. ئەگەرچی لە دەهەکانی دواییدا زۆربەی حزبە کومۆنیستەکان، بۆ وێنە لە بریتانیا و حزبی کومۆنیستی ئیتالیا (حزبی سۆسیال دێموکراتی ئێستا) نزیکایەتییەکی زۆری بە هەڵوێستی یاسای سۆسیالیستی لە خۆ نیشان داوە و لە هێندێ شوێندا لە سۆسیالیزمی لایەنگری بازاڕ نزیکبوونەتەوە. لەم بابەتەوە، وێنەی ئێستە پێچراوەتر بووە.

بەم حاڵەوە، دەبێ وەبیر بێنینەوە کە سۆسیالیستە زۆرینەخوازەکان بایەخە هەستانەکانیان قبووڵ نەکردووە بەڵکو لایەنگری دەسەڵاتی بڵاوبوونەوەی ڕێکخراوە ناکۆکان یان ڕێکخراوە تەولیدکارەکان بوون. بەتایبەت سۆسیالیستە مەدەنی و سەندیکالیزمەکان لە بارودۆخی زۆر کەمی دەوڵەت یان بارودۆخی نادەوڵەتی لایەنگری دەکرد.[61] لەم بارەوە یەکسانی دەبوو لە دەروونی ڕێکخراوە کرێکارییەکاندا پێکهاتبایە. بەم شێوە، یەکسانی لە دەروونی سۆسیالیزمدا کەرەسەیەکی زۆری لەبەر دەسا بووە و نابێ ئەوە هەر تەنیا بە کەرەسەیەکی تایبەت بزانرێ.

بە کورتی، جیاوازی وشکی نێوان یەکسانی و ئازادی دەبێ بە گومانێکی زۆرەوە چاوی لێ بکرێ. پێشمەرجی ئەم جیاوازییە ناساندنی ڕووبەڕووانەی وشک لە ئازادی رووخاو بە شێوەی (نەبوونی بەرتەسکی)یە، (بەرتەسکی)یەش، ئەو جۆرە کە لە بەشی دووەم باسی لێوەکرا، بە شێوەی زۆر بەرتەسکی بۆچوونی پەی پێی دەبرا. ئەگەر وتراوە کە ئازادی بە لانیزۆرینەی هەڵبژاردن و بەرەوپێشچوونی تاک گرێبەست دەکرێ (کە زۆرینەی سۆسیالیستەکان باوەڕیان بەوە بووە) کەواتە پێکهێنانی کەش و هەوای یەکسان بۆ هەڵبژاردنە چاوکراوانەکان (فێرکردن و پەروەردەی تەواو، لەش ساخی و دەسکەوت دەگرێتەوە) و بەم جۆرە،

ـەرهەڵدانی مرۆڤـی پێشکەوتووی شـاراوە رێنـوێنی لەسـەر گونجـانی بایەخـە
ـ ـنیـەکان و یەکـسانی هەیـە. بـەم شـێوە، واتـای سۆسیالیـستی لـە ئـازادی
ـەـنیشەیەکی بە تەواو مانا عەقلانی و بۆ قبـوول کـردن دەبـێ و پێویـستانە لەگـەڵ
ـەکسانی بەناوی مەرجێک لەودا دژایەتی نییە.

## دەوڵەت و دیموکراسی

زۆرجار وای بیر لێ کراوەتەوە کە گشت سۆسیالیستەکان دەوڵەت خوازن. وەهـا
گومان کراوە کە هەموو سۆسیالیستە دەوڵەت خوازەکان تاقانە واتایەکیان لە دەوڵەت
ـە ئێشکدا هەیە و هەموویان یەک جۆر چاو کراوەییەیان دەربارەی بـوونی دەوڵـەت
هەیە. ئەم ئەگەر و گریمانانە بەتەواوی نارەوایە. گومانێک نییـە کـە لـە دەیـەی ١٨٨٠
ـەدوا بزاوتی زاڵی سۆسیالیزمی ریفۆرمخواز بوونی بووە و مارکـسیزمیش، زۆرتـر
ـە کردووە هەتا لە ئەندێشەی ئاشکرا دەوڵەتخواز بووە. بـەم حاڵـەوە، نابـێ وا بـیر
بکەینەوە کە ئەم دەوڵـەتخوازییە خـووی هـەموو بزاڤـەکە پێکدێنێ، یـان کـردەوەی
ـدوڵەتخوازی هەڵگری جۆرێک ئەندێشەی رێـکوپێکـە. هـەر دوو خـاڵ بـۆ لێـدوان
ـدبـێ. کۆمەڵـێک پرسـیاری قـووڵ و دژوار دەربـارەی سـەرچاوەی دەوڵـەت لـە
سۆسیالیزمدا بـوونی هەیـە کـە دەبـێ یـەکلای بکرێتـەوە. جیـاوازی ئـەزموونی تـا
رادەیـەک موناسـب دەتوانـێ سـەرەتا لـە لایەکـەوە نێـوان سۆسـیالیزمی لایـەنگری
دەوڵەتی رێکوپێک و لە لایەکی دیکەوە، سۆسیالیزمی زۆرخواز و لیبراڵ هەڵاوێرێ.

ئەندێشەی گشتی سۆسیالیزمی لایەنگری دەوڵەت خـاوەن سیـستەم زۆرجـار بـە
هاوکێش لەگەڵ کۆخـوازی دانـراوە. دەربـارەی ئـەم هـاوکێش بوونـە پێشەکی لێـی
دواوین. کۆخوازی هەر تەنیا میتۆدێک بۆ پلەبەرزی سۆسیالیزم نییە بەڵـکو لـە حاڵـی
ئێستادا رێنوێنیگەلێکی شاراوەی بەهێزی جۆراوجۆری لە خۆ گرتـووە کـە زۆربـەی
سۆسیالیستەکان ئەوانەیان رەتکردووەتەوە. جگە لەوە، بە پێچەوانەی ئەم راسـتەقینە
کە هەمیشە بە چاوی باوەرێکی دەوڵەتخواز سەیری مارکسیزم کراوە و بە شـێوەی
قـەراردادی بـە شـێوەی وێنـەی ئارمـانجی دەوڵـەتی سۆسیالیـستی کۆمەڵایـەتی
گیراوەتـە بەرچاو،لـە نووسـراوەکانی مـارکس و ئینگڵـسدا روانگەیـەکی موسـبەت

دەربارەی دەوڵەت نایەتە بەرچاو. ئەوەی دێتە بەرچاو لێکدانەوەیەکی بێکۆتایی رووخاو دەربارەی دەوڵەتە.[٦٢]

گوشراوەی هەڵوێستی سەرەکی مارکس ئەمەیە کە کەش و هەوای ماددی ژیان لە پێشترە. ئەمە کەش و هەوایە کە بناخەی پێکهاتەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و هەروەها زانیاری مرۆڤ بەدی دێنن. مرۆڤەکان، بەر لەوەی کە بتوانن بە شێوەی سیستماتیک بیر بکەنەوە، ناچارن بۆ مانەوەی خۆیان دەس بکەن بە دروستکردن. چینەکان لەسەر بنەمای بەرژەوەندی ئابووری و لە دەروونی شێوەی دروست کردن لە قۆناغی تایبەتی لە مێژوو دەکەونە قاڵبەوە و فۆرم دەگرن. تاکەکان بەپێی چینایەتی خۆیان پێناسە دەکرێن. ئەوان بە ناوی ئەندامی چینایەتی لەگەڵ یەکتردا پێوەندی دەگرن. لەوەی کە چینەکان سزا جیاوازەکان لە دەسەلات و مالکییەت وەر دەگرن و ئەم جیاوازیانە دەرەنجامی پێوەندی چەوسانەوەیە، پێکهاتەی دەوڵەتیش بە پێوەندانی خاوەندارییەت، چین و لەبەر ئەمە بەرژەوەندی چەوسانەوە فۆرم دەگری. دەوڵەت پێکهاتەی ئەندێشە یان حەز و مەیلی مرۆڤ نییە. بەڵکو پێچەوانەی ئەم چینایەتی خەبات و بەرخۆدانەی نێوان ئەوانەیە کە فۆرم بە دەوڵەت دەدا. لەبەر ئەمە، دەوڵەت هەمیشە بەناوی هۆکاری سەرکوتی چینێکی تایبەت چاوی لێ دەکرێ.

لەم روانگە قەراردادییەوە، گرفتگەلێکی زۆر بوونی هەیە. یەکەم ئەوەی کە مارکس هەرگیز راگەیاندنێکی دروستی دەربارەی ئەوەی کە دەوڵەت دەگرێتەوە راینەگەیاندووە. ئایا دەوڵەت هەموو دەزگا ئیدارییەکانە، نەهادە فێرگەکان، پۆلیس، حکوومەتی میللی و هەروەها دەزگای بەرێوەبەری، داد و یاسا دانانە؟ لە هیچ کام لە نووسراوەکانی مارکس و ئینگلسدا رێنوێنییەکی ئاشکرا لەم بارەوە نیشان نەدراوە. بێجگە لەوە، جگە لە ئاماژە و هێماگەلێکی نادیار و شاراوە دەربارەی کۆمۆنە فیدرالیزەکان کە پێوەندییەکی نزیکیان لەگەڵ ئانارشیدا هەیە، هیچ راپۆرتێکی سیستماتیکی سەبارەت بە جێگرەکانی دەوڵەت یان رێکخراوەی بریکاری ئەو لە ئارادا نییە. بێجگە لەمەش باسێکی رۆشن لە جەوهەری چین و پێوەندی وردی ئەو لەگەڵ خاوەندارییەت و دەوڵەت نەکراوە.

جارجاره مارکس و ئینگلس دەولەتیان هەر تەنیا بە هەلقاوەیەک لـە سـەرچاوەی ـندییەوە زانیوە. مانیفێستی کومۆنیست و هەموو نووسراوە عـامفامـەکانی ئـەوان، ـورجار دەولـەت هـەر تـەنیا بـە جیلـوە و ئـامێری حکوومـەتی چینایـەتی دەزانـێ، کومێتەی بەڕێوەبەرایەتی بورژوازی کە دەبێ لەگەل شۆڕش بڕووخێ. ئەم باوەڕانـە هەر تـەنیا لەسـەر روانگـە رەسمییـەکانی حـزبی سۆسـیال دیمـوکراتی ئەلـمان زال ـەبووە، بەلکو زۆر دواتریش لەگەل کومینتێرن کە بەلشویکە رووسـییەکان بەسـەریدا ـبوون پارێزا. لە شوێنەکانی دیکەدا، لە نووسراوەکانی وەکـو هەژدەیـەمین برومـر ـویی بناپارت دەولەت لەگەل پێکهاتەیەکی پێچراوەتردا ئاشکرا دەبێ کـە تـا رادەیـەک ـدوەنی خودموختارییە و لە چاو چینە تایبەتەکان سەربەخۆی هەیە. تەنانەت مارکس گوتوویە کە لەو ولاتانەی وەک بریتانیا بۆ بـوون ولات بـە سۆسـیالیزم پێویـست بـە شـورش نییە. نووسراوەکانی دوایی سـوننەتی مارکسیـستی بەتایبـەت ئەوانـەی کـە ـەژێر کاریگەرییەتی ئاساری گرامشی دان، دەولـەت بـە خـاوەنی خودموختارییـەکی ـەرچاو دەزانـن و دەرەنجـام لـە جـەبری کالـی (ئـابووریخـوازی) و پۆزیتیـوییزم پوزەتیڤخواز) کە بە کردەوە دیاردەی روانگەی ئینگلسە، رەخنە دەگرن.

لەم روانگە دوو لایەن و شاراوەی سەبارەت بـە دەولـەت مارکـسیزم تـەنیا نییـە. ـارکسیستە لایەنگرەکانی دەولەتی ریفۆرمخـواز، وەکـو فابیانـەکانیش لـەم بـارەوە ـستگەلێکی شـاراوەیان گوتـووە. بـە وتـەی نووسـەرێک (نووسـراوە سـەرەتاکانی فابیانەکان هەلگری برێک تۆژینەوە، یان باسی ناتەواوە لەوەیکە دەولەت بـە کـردەوە ـدەبێ ببێ).[٦٢] هەر ئەم خالە دەربارەی زۆربەی نووسراوەکانی فابیانەکان لـە دەیـەی ۱۹۹۰یش راستە. لـە کۆبوونـەوە و کـۆڕی فابیـان و تەنانـەت بـە هاوکـاری وبـەکان گومانگـەلێک دەربـارەی دەولـەت بـەدی هـاتبوو، بـەلام بـە گـشتی حـەز و ویـستی فابیانەکان ئەمە بوو کە دەولەت بە دەزگا یان ئامێرێکی بێ ئەسەر و کاردانەوە بـزانن کە دێموکراسی پەرلەمانی ئەوی بە سەرکەوتن گەیاندووە، بۆ ئامانجێکی گـەورەتری کاردانەوەی کۆمەلایەتی و ئابووری سوود لـەوە وەردەگـرن. رزگـاری بـە دەسـتی کارناسـانی کارامەی دیوانسالارە. لەگەل ئەوەی کە ناوی فابیانیزم لەسەرەتایی ئـەم سـەدەیە لەگـەل حکوومـەتی خۆمالـی و نـاوخۆیی، یـان شـارەدارییەکان و تەنانـەت

دیموکراسی پیشەسازی تێکەڵاو بوو، وبەکان و لایەنگرەکانیشان لایەنگری کۆنتڕۆڵ لە لایەن کۆی هەڵبژێراوەکان و دەزگایەکی دەوڵەتی باوکسالاری خێرخواز بوون.

روانگەی ناوبراو زۆربەی فابییەکان و بەتایبەت وبەکان هەروەها لەگەڵ دۆزی ئەوان دەربارەی دیموکراسی پێوەندی هەیە. هێندێ دیموکراسیان بۆ هەموو لایەنی سۆسیالیستی بەلاوە حەیاتییە.[64] بەم حاڵەوە، هەرچەند هێندێ پێوەندی نزیکتریان لەگەڵ سوننەتی سۆسیالیستیدا هەیە، هەموو فابییەکان لەم بۆچوونەدا شەریک نین. لانیکەم بۆچوونی جۆراوجۆریان دەربارەی دیموکراسی هەیە. بەڕای وبەکان یام جۆرج بێرنارد شاو، بەرینکردنەوەی مافی رای گشتی یان تەنانەت مافەکانی ژنان کێشێکی بەرتەسکی بووە.

ئەوانە هەنووکە باوەڕیان بە مەدەنی مامناوەندی نەبوو. بە شێوەی گشتی حکوومەت بۆ خەڵک بوو نەک بە هۆی خەڵکەوە. لەم بارەوە نووسەرانی سەرەتای سۆسیالیزمی خەیاڵیش خۆی لە خۆیدا هۆگرییەکی کەمیان بە دیموکراسی بەتایبەت دیموکراسی پەرلەمانی، بوو. رابێرت ئەوون بە توندی سەبارەت بە دیموکراسی پەرلەمانی گومانی بوو و ئەوی بە بە شتێکی جیا لەسەرپۆشی بێهێزی بۆ گەندەڵی و بێعەدالەتی نەدەزانی. مارکسیش هێندە هۆگر بەم بابەتە نەبوو زۆرینەی نزکی ئەو بەم خاڵە، تێرامانێکی غەیرەسیستمی ئەو دەربارەی دیموکراسی راستەوخۆ لە کۆمۆنی پاریس بوو. ئەم روانگە دەربارەی دیموکراسی هاوبەشی راستەوخۆ بە شێوەی شاراوە لە لایەنە ئانارشیستەکان و هێندێ سۆسیالیستە مارکسیستەکانی دوایی سۆراخ دەگرێ. لەگەڵ ئەمەدا، بە بۆچوونی مارکس و ئینگلس دیموکراسی زۆرتر گومانی سەرمایەداری و بورژوازییە کە پەردەیەکیان بەسەر بەرژەوەندی راستەقینەی چینەکاندا دەکێشا. ئەم روانگە جێگای قبووڵی حزبە کۆمۆنیستە نوێکانی ئەورووپایی نییە کە لێدوانێکی زۆریان دەربارەی تەجدیدنەزەرخواز و گۆڕینی ناوی خۆیان بووە. بۆ وێنە ئایا دەکرێ ئێستا حزبی کۆمۆنیستی ئیتالیا (حزبی سۆسیال دیموکراتی ئێستا) بەواتای راستەقینە بە مارکسیست بزانین؟[65]

سۆسیالیستە لایەنگرەکانی دەوڵەتی ریفۆرم خواز لەم سەدەدا، هەروەکو حزبی کرێکاری بریتانیا، حزبی سۆسیالیستی فەرەنسا و حزبی سۆسیال دیموکراتی ئاڵمان،

ـۆسیالیستە لایەنگرەکانی بازاڕ و هێندێ لە سۆسیالیستە ئەخلاقییەکان واتای
ـیموکراسی پەرلەمانی نوێنەرایەتیان قبوول کردووە. سۆسیالیزمی دەوڵەتی
ـۆرمخواز تا ڕادەیەک بارودۆخی نسبی ڕاپرسیان بە دەسهێناوە. هەرچەند ئەگەر
ـەسێک ئێستا سەرنج بداتە خولەکانی حکوومەتی حزبی کرێکاری ئینگلیس یان حزبی
ـۆسیال دێموکراتی ئەڵمان، ئەم دەسکەوتانە زۆر بەرچاو نین. هەروەها حەز و
ـەیەکان بە دیموکراسی پیشەسازی و هەرەوەزییەکان بوونی بووە کە هەمیشە لەگەڵ
ـرس دەربارەی کاریگەریتی بوون و کاردانەوەی ڕاستەقینەی ئەوانە هاوهەنگاوە.
ـۆسیالیستی لایەنگری دەوڵەتی ڕیفۆرمخواز هۆگرییەکی ئەوتۆی بە دێموکراسی
ـستەوخۆی پەرلەمانی لە خۆ نیشان نەداوە.

حەز و مەیلی باسکراو ڕەنگدانەوەی تەواوی وەلامی سۆسیالیست بە پرسیار
ـەربارەیی دەوڵەت یان دیموکراسی نەبووە. لە دەروونی سوننەتی سۆسیالیستیدا،
ـەو جۆرە کە باسکرا، مەیلی دژایەتی لەگەڵ دەوڵەتی بەهێزبوونی بووە کە لە
ـونگەکانی مارکس و ئینگلسەوە سەرچاوە دەگرێ. دەربارەی لنین و کتێبە
ـەوبانگەکەی ئەو بە ناوی دەوڵەت و شۆڕش دەبێ بوترێ کە ئەو باوەڕی بە
ـەبوونی دەوڵەت، کۆمەڵگەیەکی داڕژاو لەسەر کۆمۆن کە شوڕا (ئەنجوومەن)
ـرێکارییەکانی ناوخۆ ئەو بەڕێوەبەرن. ئەم خەتتە (ڕێڕەوە) فیکرییە سەیرە لە لنیندا
کە دواتر لەگەڵ ڕوانگە سەرەڕۆ دەوڵەتییەکان تێکەڵ بوو) لە بۆچوونی کۆمۆنیزمی
ـوراپی گرامشیدا کە لەسەر بنەمای ئەزموونی شاری تورین دامەزرا بوو زۆر جدی لە
ـەنەم دراوە. ئەم کۆمۆنیزمە شوراییە لەگەڵ لایەنە بۆچوونییەکەی گرامشی کە لەسەر
ـیکخستنی پرۆلیتاریا سوور بوو، پێوەندی نزیکی هەیە. ڕۆشنبیرانی چینی کرێکار
ـوانیان ئەم چاوکراوەیەی پرۆلیتاریایی گەلالە و بەیان بکەن.[٦٦]

لە سۆسیالیزمی سنفی بریتانیاشدا هێلێکی فیکری دژی دەوڵەتی و زۆرخواز لە
ـارادا بوو. هەرچەند دەبێ بوترێ کە لەم بوارەدا هەڵوێستێکی ئاشکرا نایەتە بەرچاو.
بۆ ئەوەی کە بمانەوێ بابەتەکە لە ڕادەبەدەر پێچراوە بکەین، هەر تەنیا ئاماژەیەک
ـەکەین کە مەیلگەلێکی زۆر لە بزووتنەوە میللییەکان، بوونی بووە.[٦٧] سۆسیالیستە
ـەدەنییەکان نەک هەر باوەڕیان بوو کە دەسەلات، تەبا و شتی لەو بابەتانە دەبێ بە

گروپە تەولیدکارەکان بسپێرێ، بەڵکو لانیکەمی ئەرکەکانیان بۆ دەوڵەت دانابوو. لە روانگەی گ. د. هـ. کول و س. ج. هابسۆن، دیموکراسی نوێنەرایەتی جوگرافیایی لە شان دیموکراسی هاوبەشی راستەوخۆ و دەکەوتنە دەروونی گروپە بەرهەمهێنەرەکانەوە، دیموکراسی کارکردێکی پێشگریمانە بوو بۆ ئەنجوومەنە تەولیدکارەکان کە هەموو بە یەکەوە کەم و زۆر پەرلەمانی پیشەسازیان پێکدەهێنا. تاونی بە سیاسەتی خۆماڵی کردن هۆگری نەبوو و لێدوانەکانی ئەو دەربارەی کۆمەڵگە کارکردی زۆرتری بینینی مەدەنی هەیە.[٦٨] بینینی مەدەنی هەمیشە بۆ بەرە سۆسیالیستەکان جوولەوکشانی بووە. ئەم فیکرە تەنانەت لە دەوروبەری لێدوانە نوێکانی سۆسیالیزمی لایەنگری بازارپیشدا دیسان هاتە ئاراوە. پشتگری لەوان هێشتا پلەی گەرمایی و لێدوانە جۆراوجۆرە سیاسییە هاوچەرخەکان لە نێوان سۆسیالیستەکاندا سەردەکەوێ.[٦٩]

مەسەلەی بەنرخی دەوڵەت لە سۆسیالیزمدا ئەمەیە کە لە بریتانیا، کە کەلتووری سیاسی لەباری مێژوووەوە بۆ قبووڵی روانگەی دەوڵەت بوونی بووە، سوننەتی سۆسیالیستی ئەندێشەیەکی ئاشکرا و روونی دەربارەی دەوڵەت بڵاو نەکردووەتەوە لە گشت وڵاتە ئەوروپاییەکانی وەک ئەڵمان و فەرەنسا، کە میتۆدەکانی دەوڵەتی چاوکراوە پەیدا دەبێ، لێدوانی سۆسیالیستی لە بابەت مێژوووەوە زۆرتر تەئسیری لە زمانی مارکسیستی وەرگرتووە و سێ ئاهەنگ دەگرێتەبەر: رەخنەی زۆر خراپ لە دەوڵەت؛ دوو لایەنی لەم بارەوە کە لە سیستەمی کۆمۆنیستیدا بارودۆخی دەوڵەت چۆن دەبێ؛ و لە ئەوروپای رۆژهەڵات بە داخەوە کە رابردوویەکی بناخەیی سەرەرۆیانەی بووە و لە هەموو ئارەزوو و ویستەکانی سۆسیالیستی بە دوور بووە. مەسەلەی دیموکراسی رێگای سەربڕی هەموو ئەم بابەتانە بووە. لەبەر ئەمە، هیچ بیچمێکی سابتی سۆسیالیستی چ دەربارەی دیموکراسی و چ دەربارەی دەوڵەت لە ناخی مەکتەبی سۆسیالیزمدا بوونی نەبووە.

هەر بەم شێوە، سازگاری و هاوئاهەنگییەکی زۆر کەم لە پرۆژە سۆسیالیستەکاندا بۆ گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی لە ئارادا هەیە. دوو لایەنی رێنوێنی سۆسیالیستی بریتین لە شۆڕش و ریفۆرمی یاسایی. نێوانی ئەم دوو سنوورە توندە زیندەخەونێکی

ـەیر لە پرۆژەکاندا لە ئارا دایە. کەسانێک کە پێگەی سۆسیالیزمی خەیاڵیان هەیە
ـەوی یارمەتی بانکدارانی دەوڵەمەندەوەن بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگەیەکی سۆسیالیستی
ـەبوونی هەتا جەماوەرێکی وێنە پێکبێنن. ئەوانە هەروا دەیانکردە گریمانە کە
ـەرچاوەیەکی هاوبەشی عەقڵی بوونی هەیە، سۆسیالیستە مەدەنییەکان لە سەدەی
بیستەمیشدا بەواتای پێکهێنانی وێنەیەک بۆ ئەوە کە ئەم و ئەو ئەوە پەسند کەن و
پەیڕەوی بکەن، سەرنجیان دابوێ.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا هێندێ میتۆدی زاڵ چوونەپێشێ. سۆسیالیستە
ـەوتەتیە ریفۆرمخوازەکان لایەنگری پێکهێنانی حزبە سۆسیالیستییە یاسایەکان
ـەبەر بە دەستووری دیموکراتیک نوێنەرایەتی مەوجوود بوون. بە بۆچوونی ئەوان
ـۆسیالیزم دەیتوانی لەگەڵ رەوەندی هەڵبژاردن گەشە بکا. ئەم میتۆدەیان ناو نابوو
ـیتۆدی پلە بە پلەخوازی سۆسیالیستی. فابیانەکان زۆر جار دانانی رێی کارناسان
ـەردزا)ی کارامە لە هەڵوێستە سەرەکییەکان و ئیداریدا دەهێنا ئاراوە کە پلە بە پلە
ـۆسیالیزم لە دەروونی دەزگا دەوڵەتی و ئیدارییەکاندا بگونجێنن.

لە باڵی شۆڕشگێرتردا، هێندێ لە سۆسیالیستە مەدەنییەکانی ئەندێشەی
ـەدیکالیستی دەس‌بەکاربوونی راستەوخۆیان لە مێشکدا پەروەردە دەکرد، واتە
ـەکە بە (مانگرتنی گشتی) هەموو کرێکاران پێوەندی بگرن هەتا سەرمایەداری
ـڕووخێنن. ئەمانە لەژێر کاریگەری ئەندێشەی لنین دەربارەی تاکتیکی هەستانی
ـستەوخۆ لە لایەن حزبی پێشڕەوی پێکهاتوو لە شۆڕشگێرانی پسپۆڕی کارامە و
ـەزم بوون. مارکسیستەکانی تر بەم فیکرە لە حوکمی کەلک وەرگرتن لە
ـۆڕشگێرانی ژاکوبن و نەک پرۆلیتاریای کرێکار هێرشیان کرد. لە دەروونی بزاوتی
ـرکسیستی، ستراتیژی چارەنووسێکی پڕکەسەری بوو. مارکس و ئینگلس لەم بارەوە
هیچ نەزەرێکی سابتیان نەدابوو کە لە نووسراوەکانی ئەوان بتوانرێ بە ناوی میتۆدێکی
پشتی و پشتگری هەڵبژێردرێ: خەبات و بەرخۆدانی درێژخایەنی پرۆلیتاریایی،
راپەڕینی کەمتەمەن و چاوەڕوانی سەرمایەداری پیشەسازی و تەنینەوە و
پەرەسەندنی دژایەتییە. کاتی ئەو دانیشتن هەتا شۆڕشی جەبری رووبدا، پێکهاتنی
حزبی پرۆلتێری کە بە فێرکردنی پرۆلیتاریاوە سەرقاڵ بێ؛ دروستبوونی راپەڕینی

خورسک له ناخی پرۆلیتاریا که دەست بکا به خەبات و بەرخۆدانی فیکری و سیاسی دژی سەرکردایەتی بورژوازیی؛ شۆڕش له ولاتێک؛ شۆڕشی جیهانی و... هەموو ئەم ڕێگایانه بوارێکی پشتگری کردنیان میتۆدی مارکسیستی دیوەتەوە.

ئەم نەبوونی یەقینه دەربارەی ڕێ به کار بردنی ڕەنگدانەوە خۆی له پۆشراوەکانی بەدیهێنەری سۆسیالیزمدا دیتوەتەوە. هۆکارەکانی سۆسیالیزم چ کەسانێکن؟ به ناوبانگترین مودەعی (چینی کرێکار)ە. بەلام زۆر لە سۆسیالیستەکان ئێستە لەمەڕ بوونی چینی کرێکار گومانیان هەیە.[٧٠] تەنانەت لە هەوالەکانی مارکس بۆ خۆی دەربارەی ئەمه که ڕێخراوە مەدەنییەکانی چینی کرێکار چ کەسانێک یان چ شتگەلێک پێکدێنن، پۆشراوەگەلێک له ئارادا هەیە. لەگەڵ ئەوەی که چینی کرێکار لەم سەدەدا لە هەموو ولاته ئەوروپایەکاندا زۆرینەی ڕاپرسیان پێکدەهێنا، بەلام ئەندامی ئەو بەگشتی لایەنگری ڕێکخراوەکانی پارێزگار، لیبرال، ناسیۆنال سۆسیالیست و فاشیستبوون. لێرەدا هیچ شتێک له ناخدا سۆسیالیستی پەیدا نابێ.

هەروەها ئاشکرایه که زۆر له سۆسیالیستەکان لە پلەی هۆکاری بەڕێوەبەرایەتی سۆسیالیزمدا باوەڕیان به چینی کرێکار نییه. سۆسیالیسته خەیالییەکان به کردەوە به واتاکانی چینی کرێکارەکان باوەڕیان نییه؛ به بۆچوونی ئەوان سۆسیالیزم بەرهەمی ئەندێشەی پەیامهێنەرانی وەک خۆیانه که دەبێ لەگەڵ پشتگری ئەربابه دەولەمەندەکان جێبکەوێ. له لایەکی دیکەوە لنین لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆیدا، «چ دەبێ بکرێ» گوتوویه که زانیاری سۆسیالیستی دەبێ له دەرەوە و له لایەن چالاکانی ڕاستەقینەی سۆسیالیست واته هەلبژێراوانی پێشڕەوی شۆڕشگێر لە دەروونی چینی کرێکاردا بتوێنەوە. ئەوانی دیکە، وەکو ڕوزا لوکزامبورگ لایەنگری حزبێکی بەربلاوی پرۆلیتاریایی بوون کە ڕێبەرایەتی پرۆلیتاریای زاتەن شۆڕشگێر بگرێتە ئەستۆ. گرامشی ڕۆشنبیرانیشی خستەپاڵ پرۆلیتاریای خۆسازدراو. مائۆ تسه تونگ وەرزەێرەکانی بە هۆکاری سەرەکی شۆڕش دەزانی. سۆسیالیسته سەندیکالیستەکانی ئیلهامگرتوو لە سۆسیالیسته هەرەوەزییەکان و سۆسیالیسته مەدەنییەکان، گرووپه هەرەوەزییه بەرهەمێنانیەکان، وەکو هەرەوەزییەکان و یەکێتیه مەدەنییەکان به هۆکاره ڕاستەقینەکانی سۆسیالیزمیان دەزانین. بەم حالەوە، به

ـوچوونی فابیاکانی وەک بێرنارد شاو و وبەکان، هـەم یەکێتییـە مـەدەنییـەکان و هـەم
چینی کرێکار بە شێوە گشتی کەسگەلێکی نەفام و گەوج بوون.[٧١] هۆکارانی راستەقینەی
ـوسیالیست، دیوان‌سالاری پسپۆڕ لـە زانـستە کۆمەلایەتییـەکان بـوون. لـە سـوننەتی
ـەربلاوی ریفـۆرم خـوازی، سۆسیالیـستەکان لـە چـین و تـوێژ و هەلـبژێراوانی روو
ـەرگێڕاو و لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە سۆسـیالیزم دەبـێ لـە لایـەن هـەموو ژنـان و
ـیاوانی خاوەن هزر و خاوەن باوەڕی پاک وەرپێبخرێ. بەم جۆرە، لێرەشدا راپۆرتێکی
ـەگوڕ لەمەڕ هۆکارە راستەقینەکانی سۆسیالیزم لە ئارادا نییە.

## بازاڕەکان و ئابووری

ئەگەر روانگەی تاقانە لەمەڕ کێشەی سۆسیالیست بوون بمانەوێ بیدۆزینەوە، دەبێ
ـەرنج بدەین کە سۆسیالیزم هەمیشە سـەبارەت بـە بـازاڕە ئازادەکـان و سیـستەمـی
ـەرمایەداری رەخنەی بـووە و ئـابووری بەرنامـەرێژکـراوی بـەجێی ئەوانـە پێـشنیار
کردووە. ئەم روانگە بەشی سەرەکی دیرۆکی گشتی لەمەڕ سۆسیالیزمە. بـەم حالـەوە،
ـوچوونێکی سەیر لە ئارادا هەیە. هەموو جۆرێک خاوەنداریتی گـشتی و خـاوەنـداریتی
ـەولەتی لە ئابووریدا بوونی هەیـە، هـەر ئـەو چەشـنە کـە هـەموو جـۆرە چالاکیـەکی
ـزاریش بەرچاو دەکەوێ.

لـە ئاسـتێکی زۆر سـاکار خـاوەنـداریتی گـشتی مومکینـە کۆنترۆلـی تـەواو کـۆ و
خاوەنداریتی دەولەت لەسەر پیشەسازییەکان بگرێتەبەر. ئەمە هەمیشە وێنەی سەرەکی
خاوەندارێت. هەروەها دەتوانێ بە واتای خـاوەنـداریتی پیشەسازی مـاک و فەرمانـدە،
ـانکەکان و شەریکەکانی بیمە لە ئابووریدا بێ. ئەمە بـە تـەنیا دەرفـەتی بـوونی بەشـە
ـایبەتی بەرفراوان بە دەستەوە دەدا. ئەمە رەنگە خاوەنداریتی زۆر شت بگرێتـەخۆ کـە
ـایبەتمەندییەکانی سروشت دەدرێنە قەلەم، وەک پێوەندییـەکان و موخابـەرات و ئـاوی
ـولەکێشی. جگە لەوە، رەنگە خاوەنداریەتی لە شەریکەیەکی نـاکۆدا بـێ؛ لـە رووداوی
ـوایبـدا دەولـەت دەتوانـێ چـاوەدێری خـۆی لەسـەر پیـشەسازی بپـارێزێ و دزەی
ناراستەوخۆی بەسەر خەتتی کرداری سەرەکی یان بڕیارگـەلێکی گرێـدراو بـە دانـانی
ـەرمایەگەلێکی بەڕێوە ببێ، یان دەرفەتی یارمەتییـە دەولـەتییەکان یـان هانـدان گـەلی

مالی بۆ هێندێ نووسینگەی ئابووری باربێنێ. ئەم کارە بەتەواوی لەگەڵ داهێنانی بەشی تایبەتی سازگارە. جەوهەری تێکهەڵچوونی دەوڵەت لە ئابووری بە هەر شێوە دەتوانێ بە جۆرێک بۆ باش تێگەیاندن جۆراوجۆر بێ. غەیرەز خاوەنداریتی کامل و تەواو بێخەوش، بەرێوەبەران مومکینە لە لایەن دەوڵەت و لەگەڵ بوونی بەرپرسایەتی لە بەرامبەر وەزارەتخانە دابنرێن. رەنگە چاوەڕوانی لەوانە بکرێ کە ئامانجە مالییەکان دابین بکەن. دەوڵەت مومکینە زۆرینەی باش یان بەشێکی گرنگی بەش لە ئیختیار دابێ و هەر تەنیا سیاسەتە گشتییەکان دیاری بکا. هەروەها دەتوانێ فەزای مالی، فێرکردن و کار فێر بوون، کاری مال جێگری بەرژەوەندی هێندێ پیشەسازی بکا. لە راستیدا دژوارە کە ببینین ئابووری هیچ کام لەم بارودۆخانە نەبێ. بەرفراوانترین ئابوورییەکان لە کەشوهەوای ئێستەی جیهاندا وەکو ژاپۆن و ئەڵمان دەرفەتی چالاکییە جۆراوجۆرەکانی دەوڵەتی لە ئابوورییەکانی خۆیدا رەخساندووە. لە راستیدا دەبێ بوترێ کە تەنانەت هێندێ لە حزبە کۆمۆنیستە ئەوروپاییەکان، وەکو ئیتالیا، بە شێوەی جۆراوجۆر لایەنگری مەنتقی بازارەکان بوون و لە ئەنجامدا لەگەڵ میتودە کودێرینەکان و سیاسەتی خۆمالی کردن دژایەتیان کردووە.

ئەم جۆراوجۆرەی داوەری و ناوبژییە لە تێگەینی پلانی دەوڵەت لە ئابووری دەبێ لە بارەی تێگەینی بازارەکان و سەرمایەداریش گشتی بێ. سەرمایەداری بە پێوارەی ئەو کۆمەڵگانەی کە لەودا بوونی هەیە شێوەی جۆراوجۆری بە خۆیەوە بینیوە. هەروەها ئەگەرچی بازارەکان پێویستی بوونی سەرمایەدارین، کە خۆی مێژوویەکی سەیر و پێچراوەی زۆرجار لە پێوەندی نزیک لەگەڵ پەرەسەندنی دەوڵەت بووە، ئەمە مەسەلەیەکی جێی لێدوانە کە ئایا بازارەکان خۆی لە خۆیدا پێویستی سیستەمی سەرمایەداری هەن یان نا؟ تەنانەت لەوپەڕی گەشە کردنی ئابووری دەستووری، ئەوەی کە لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو بوونی بوو، لە بازارەکانیشدا بوونیان بوو و لە هێندێ شوێن بە شێوەی بازاری رەش یان ئابووری رەش لە بەشی دەوڵەتیدا گەشەیان کرد. لەبەر ئەمە، واتای بازار ناکرێ بەرتەسک و سنووردار بە سەرمایەداری بزانرێ.[٧٢]

ئەمە راستە کە سۆسیالیزم راشکاوانە سەرەی سەرمایەداری بووە. بەڵام جەوهەری ئەم رەخنە نەگونجاو و ناهەموار بووە. بەشێوەی گشتی، سەرمایەداری لە

ـوان سـەدەی نۆزدەیەمـدا لەگـەڵ ئاسـتەنگی، نـەداری و ئـازارە کۆمەڵایەتییـەکان ـ ووبـەڕوو بۆتـەوە. ڕەخنـەی باسـکراو هـەمیشە هاوکێشی سـەرمایەداری بـوو. ـجگەلەمەش سەرمایەداری بەدیهێنـەری تـەرازووی سـەرکردووی نایەکسانییەکان و حوێنەری تەنیەوەی ناخی کۆمەڵگایە. ئـەم نەزمـە بـە هۆکـاری سەرهەڵـدانی بینینـە ـێـن‌هێنەرەکان، دژی کومەڵگە و بەدیهێنەری پێشبڕکێی دەزانن. بەکارهێنانی تایبـەتی و ـ ژیبوونی ویستەکان لـە قـەڵـەم دەدرێـن، ئێستاکە بەرژەوەنـدی گـشتی و سـوودی کۆمەڵـگە و ڕازی کـردنی ویـستە سـەرەکییەکانی مـرۆڤ دەکەونـە بـەر پـەلاماری ـەرامۆشی و لەبیرچوونەوە، دەرەنجام سەرمایەداری هۆکـاری لاواز کـردنی دۆسـتی ـیـەککرتوویی و هـەرەوەزە. وێنـە بڵاوکراوەکـانی لـە کۆمەڵـگەی سـەرمایەداریدا کۆنترۆڵ‌نەکراو و سەرەڕۆیانە و دڵخوازانەن. هەمیشە سـوود لەسـەر دروسـتکردنی کەرەسـەگەلی زەرووری و بـەهرەدار دەخرێتـە پلـەی یەکەمـەوە. لەبـەر ئەمـە ـەرمایەداری لەزەتی بەهرە وەرگرتن و جوانیناسینی ئامراندن و داهێنان لە ناو دەبـا. ـەرهەمهێنان بە پێوارەی ئامانجی سوود و زیان دەپێورێ و لە خەرجە گشتییەکان غافل ـدمێنێ. خەڵک خۆشیان بە چاوی کەرەسەگەلێک کە بۆ کڕین و فرۆش دەبـێ، سـەیری ـدکەن.

زۆر لە سۆسیالیستەکان ئالیاژ (دارشـتە)ی ڕەخنـە باسـکراوەکان لـە کلاوڕۆژنـەی ئەخلاقییەوە چاویان لێکردووە. بـە بۆچـوونی تـاونی و سۆسیالیـستە ئەخلاقییـەکان، ـەرمایەداری لە بناخەوە مابێتن دژی ئەخلاقە و سیستەمی بایەخی دروست هەیە. هەتا کاتێک ئەم بایەخانەی سەرمایەداری مابێتن، کۆمەڵگە هەرگیز توانای گۆڕان، ڕیفورم یان باشتربوونی خۆی نییە. بەم حاڵەوە سونەتی مارکسیـستی کلاسـیک، تەنانـەت کاتێـک ـدیهەوێ چاو لێکـردنی مرۆڤدۆسـتانەی هـەبێ، زورتـر بـە چـاوی جـەبری مێـژووی سەیری چارەنووسی سەرمایەداری دەکا. سەرمایەداری بە ناوی شێوەی بەرهەمێنـانی ئەباری مێژووییەوە مەحکووم بە رووخانە، ئێستا ئەم کارە چ بە شێوەی حاشاهەڵـنەگر لەسەر بنەمای یاساکانی ماتریالیزمی دیالێکتیـک فـۆرم بگـرێ، چ لـە لایـەن ڕووخـانی ڕاسـتەوخۆی شۆڕشـەوە، یـان لـە ڕێگـای وردبـینی بـەرین کردنـەوەی فیکـری و سیاسییەوە. لەم ڕوانگە ئەخلاقییەوە پێگەیەکی بەرچاوی بوو. لەم دوایانـە، ئـەو جـۆرە

که وترا، هێندێ لـە حزبـە کۆمۆنیـستە ئەوروپاییـەکان ئـەم ڕێکەوتنـەیان بـە جـۆرێکی فابییەکانی ئەمە بوو کە سـەرمایەداری هـەم ناکارامـە و هـەم ئیـسرافکارە، لـە بەڵـگەی دوایـیدا جێگایـەک بـۆ جـەبری مێژوویـی و ئـەخلاقی بـوونی نـەبوو. سـەرمایەداری دەزگایەکی دەوڵەتی لەژێر چاوەدێری و کۆنترۆڵی سۆسیالیستەکان، دەبێ لە نێو بەری هەتا ئابووری کاردانەوەی خۆی بەدەسبێنێتەوە، بە ڕادەیەک کە ئەشراف بەرژەوەندی مرۆڤی لە باری ئەخلاقییەوە سەرکۆنەی کـردووە، لـە بـاری پێکهێنـانی نایەکسانییەوە ئەوندە سەرکۆنە نەکراوە.

هەروەها دەبێ بـوارێ کـە هـەر لـە بەرتەسـکی ئـەم بەڵـگەدا، پێگـەکانی ڕوانگـەی ئـابووری سۆسیالیـستی بـە ڕادەی ڕەخنـەکانی ئـەو لەسـەرمایەداری هەمەچەشنە و جۆراوجۆرە. لە ڕوانگەی ئابووری مارکسەوە، ڕوانگەی ئابووری ڕیکاردۆ و کلاسـیک نووسراوەکانی نئۆکلاسیکی ویک ئیستید واج وۆرس، کنزگـرای، هـەموویان لـە لایـە ڕێبازە جۆراوجۆرەکانی سۆسـیالیزمەوە بـۆ لێکدانـەوەی سیـستەمـی سـەرمایەداری کەڵـکی لێـوەرگیراوە. لـە ڕاسـتیدا دەربـارەی سۆسـیالیزمی لایـەنگری دەوڵـەتی ڕیفۆرمخواز لە بریتانیا لە ١٩٤٥ هـەتا دەیـەی ١٩٧٠، منیـارد کـینزی، سۆسـیال لیبرال بێگومان بەنفووزترین ئابووریزان بووە.

هەروەها ئەگەر بریکارانی سۆسیالیستی بەجێی سەرمایەداری بۆی بڕوانین، لەگەڵ پلانە زۆر جیاوازەکان و زۆر جار دژیەکتر ڕووبەڕوو دەبینـەوە. دۆزە سـەرەتاییەکی کۆمەڵێک لە سۆسیالیستە خەیالییەکان بـەرفروانیان کردووەتـەوە کـە جەوهـەری دژی سیاسیان بوو. نووسەرانێکی جۆربـەجۆری وەکـو ویلیـام مـۆریس و شـارل فەریـە پاشەڕۆژێکی غەیرە پیشەسازی، بێدەوڵەت شەریکەیی و شوانانەیان گەڵاڵـە گرتـووە لەم جۆرە کۆمەڵگەدا کار دەگۆڕدرێ بە لەزەتی جوانیناسـانە و هەسـتی دەور و ئـەرکی مرۆڤەکان نابێ سابت و وەک خۆی بمێنێ. تەولید بە دروسـتکردنی کەرەسـەی جێ دروستکراو بۆ ڕازیکردنی ویستەکانی مرۆڤ دانراوە. مارکسیزم لەگەڵ گۆڕینی خۆی بە پێچەوانەی ئەمەکە زۆر جار باوەڕی کۆمۆنیستی نـاکۆی شـاراوەی بـۆ کۆمەڵـگەی داهاتوو پێشنیار دەکا. بە کردەوە لایەنگری کۆمەڵگەی تەواو پیـشەسازی خـاوەن بـە ڕێککراو و لەژێر چاوەدێری دەزگای دەوڵەتی دایە. ئاوابوونی نیعمەت لـە کۆمەڵـگەی

ـاهاتوو و لەژێر ڕێنوێنی پیشەسازییە دەوڵەتییەکاندا حەقیقەت دەسەلمێنێ. ئـەو جـۆرە کـە بـاکونینی ئانارشیـست لـە ساڵـەکانی سـەرەتای مارکـسیزمی کلاسـیک پێـشبینی کردبوو، دەوڵەتێکی سەرەڕۆی نوێ لەم باوەڕە مارکسیسته سەرهەڵدەدا. لە ساڵەکانی ـدوایدا بەتایبەت پاش رووخانی یەکێتی سۆڤیەت، مارکسیستەکان هەوڵیان داوە خۆیان ـەگەڵ لایەنگەلێک لە ئابووری بازاڕی بگونجێ و هاوئاهەنگ بکەن.

سۆسیالیـستەکانی دەوڵـەتی ریفۆرمخـواز ئـەم سـەدەی بەرینبوونـەوەی پیشەسازییەیان بە باوەشی کراوە قبووڵ کردووە، بەڵام وەک هەمیشە هاوکـات لەگـەڵ خاوەندارێتی تێکەڵ بەتایبەتی و گشتی، پرۆژەی خۆماڵی کـردنی بـەرینکراوە هاوکـات ـەگەڵ بەشی بازاڕی ئازاد.

سۆسیالیستە زۆرینەخوازەکان وەڵامگەلێکی جیاوازیان بووە. هەندێکیان وەکـو ئـا. ج. پنتی بە گەڕانەوە بۆ کۆمەڵگەی دژی پیشەسازی، شوانی و سەدەکـانی نـاوەڕاسـت بانگهێشت دەکەن. ئەوانی دیکە، وەک گشت باوەڕیان هەیـە کـە سـەرمایەداری، (بـەڵام نەک پیشەسازی بوون) و سیستەمی هەقدەستی وەلابنرێن و ئابووری لەسـەر بنـەمای ڕێکخراوە مەدەنییەکان پیشەسازی قبووڵ بکـرێ.[٧٣] ئـەم کـارە دەتوانـێ بـە کۆنترۆڵـی نرخەکان، هەقدەستەکان و تەبا و رەبایی ئەندامەکان کۆتایی پێ بـێ. وەهـا سیاسـەتێک لەسـەر پاککردنـەوەی کـۆ و پاککردنـەوەی دەوڵـەت پـێ دادەگـرێ. سۆسیالیـستە دەوڵەتخوازەکان لەم روانگە هێشتا هەر رەخنە دەگرن.[٧٤]

سەرەنجام، لە ساڵەکانی دوایدا کۆششێکی بە تەوژم بۆ سەپاندنی سۆسیالیستەکان بە ئاوڕدانەوەیەک لە واتای بازاڕ و جیاکردنـەوەی ئـەو لـە سیـستەمـی سـەرمایەداری بەرێوەبراوە. لە بریتانیـا ئـەم دۆزەیـان تـا رادەی هیوگیت ئەسـکل و سـوان دوربـان پەروەردە کردووە. زۆر لە دۆزە ئابوورییەکانی سۆسیالیستی لە ئەندێـشەی سیاسـی ئەڵماندا رەواجیان پەیدا کردووە. لە بریتانیـا کۆمەڵـێک لـە ئەندامـەکانی (ئەنجوومـەنی فابیانەکان) و (گرووپی فەیلسووفانی سۆسیالیست) لە دەیەی رابردوودا بـە نـاوی وەڵام بە پێشنیارە ئیدئۆلۆژییەکانی (ڕاستی نوێ) بەرەو سۆسیالیزمی لایەنگری بازاڕ رۆیـن. حزبە کۆمۆنیستییەکانی وەک حزبی کۆمۆنیستی ئیتالیا، هەروەها لـەم مـاوەدا خـەتێ میتۆدیکی ئاست ناسکتر سەبارەت بە بازاڕەکانیان گرتەبەر. دۆزی سەرەکی ئەمە بوو

که سۆسیالیزمی لایەنگری بازاڕ نە.بەتەواوی سەرمایەداری خالیسە نە کۆکراوەی دەوڵەتی، هەرچەند حەز دەکا لە کۆمەڵگادا (دەسەلاتێکی بەرینتر بلاوکرابێتەوە... بەرژەوەندی خاوەنەکانی سەرمایە، کرێکاران و بەکارهێنەران هەموویان وەک یەک و بە یەکسانی، بێئەوەی کەسی لە پێش بێ، بەرچاو بگیرێ).[٧٥] بازاڕ، بڕوا لەسەرمایەداری، مومکینە بە ناوی ئامێری تایبەتی سوودمەند بۆ کەرەسەکان وخزمەتگوزاری بپارێزرێ. دەبێ گشت مەدەنییەکان بتوانن بە ئینسافانەترین شێوە کە دەکرێ بێنە بازاڕەوە. بایەخی بەرامبەری ئازادی بۆ هەموو مەدەنییەک، بە هەمان پێواری پرەنسیپی یەکسانی لە ئازادیدا بایەخی هەیە. بە لەبەرچاو گرتنی ڕێژەی پلەی بازاڕ، لەگەڵ کەلک وەرگرتن، لە ئازادیمان و فۆرم دان، بە ژیانمان پێویستیمان بە ئەنجامدانی ئەم کارە هەیە. پارێزگارانی پاک و خاوێنی و دەرمانی تەواو و فێرکردن و پەروەردە دەتوانن بنەرەتی ئامێری هەڵبژاردنی تەواو بەدیبێنن. لەم ڕێیەوە ئابوورییەکی بازاڕی سۆسیالیستی مومکینە گەشە پەیدا بکا و لانی زۆرینەی یەکسانی و ئازادی بدا بە دەستەوە. بەرنامەدانانی دەتوانێ ئێستاش بوونی بێ، بەلام دەبێ لە بابەت تایبەتمەندی لەگەڵ دەستتێوەردانی ڕاستەوخۆ جیاوازێ بێ.

بەگشتی، لێدوانە ئاسایەکان لەم بوارە دایە کە لەوەیکە بە ئابووری میتۆدییەکانی دەوڵەتی و خۆماڵی کردنی سەرانسەری پێوەندی دەبێ بپچڕێ و هەروەها دژایەتی کردن لەگەڵ بازاڕەکان (بەتایبەت لە ئەورووپای ڕۆژهەلات پاش ١٩٤٥ بلاوە بوو) کارێکی درۆزنانەیە. سۆسیالیزم، وەکو زۆربەی ئیدئۆلۆژییەکان هی ڕوانگە بەرینەکان زیرەکانە و زۆرجار دژایەتیان هەیە..

## دەرەنجام

ئێستا وا نیشان دەدا کە شێوەیەک لە سۆسیالیزمی دیکە داهاتوویەکی نییە. یەکێک لە سەرکەوتووترین پرەنسیپی سونەتی سۆسیالیستی لە سەدەی بیستەم (مارکسیزم، لینینیزمی نرێخراوەیی کراو) لە دەیەی ڕابردوو لەگەڵ ڕووخانی ئەورووپای ڕۆژهەلات و لابردنی ئەوەی کە یەکێتی سۆڤیەت بەجێمابوو بە ئابوورییە بازاڕییەکانی یان لانیکەم ئارەزووی بەرینبوونەوەی لەم لایەنەوە، خەسارێکی مەرگهێنەری وەرگرت. ئەم زەربە

هەرچەند رەنگە بۆ ئەستێور و نەزۆک کردنی سۆسیالیزمی مارکسیستی لەگەل ئابوورییە میتۆدییەکان مەرگهێنەر و چارەنووسساز بووبێ بە کولۆەنجێک بۆ سوننەتی بەربلاوی سۆسیالیستی بە شێوەی گشتی (کە هێشتا مارکسیزمی بە شێوەی جوراوجۆر قبووڵە) و پێویستانە لە دووی لە نێو بردنی بازارەکان نەبووە، مەرگهێنەر نییە. سۆسیالیزمی لایەنگری دەولەتی ریفۆرمخواز لە دەیەی رابردوودا رەخنەگەلێکی راستەقینەی زۆری هێنایەوە سەر خۆی، ئەگەرچی گرێدراوی ئەو بە هێندێ جۆرەکانی سیاسەتی خۆماڵی کردن تووشی سەر لەبەردانی کردووە. بەم حالەوە، لەگەل ئەمەی کە هێلی میتۆدەکانی خۆماڵی کردن لە پشتگری هێندێ لە رێبازەکانی هەم پارێزگاری و هەم لیبرالیزم بەهرەمەند بووە، تاوانەکە بیر لە شکانی سۆسیالیزمی ریفۆرمخواز بکەینەوە. زۆرتر روانگەگەلی سۆسیالیستە ئەخلاقییەکان، دەولەتی ریفۆرمخواز و لایەنگرانی بازار بە باشی توانای ئەوەیان هەیە کە خۆیان لەگەل روانگە هاوچەرخەکان دەربارەی بازار بگونجێنن.

واتاکانی سۆسیالیزمی لایەنگری بازار و ئابووری بازاری سۆسیالیستی تاقمێک لە بیرمەندانی سۆسیالیست هەڵیان سەنگاندووە. لە راستیدا بە هۆی دەستێوەردانی بەرچاو نێوان ئەم سوننەتانە و سوننەتەکانی سۆسیال دیموکراتیک و لیبرالی نوێ، ئەوانە یەکێک لەبەرهەمهێنەر بیرکارەکان هەم بۆ سەرمایەداری پارێزگار و هەم سەرمایەداری لیبرالیان بەدیهێناوە. ئەو جۆرەکە لێداوانی ئیدئۆلۆژیکی سەرکەوتوو لە دەیەی رابردوو لە ئەورووپا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێکیهێناوە. سۆسیالیزم لەگەل بوونی مەترسییە ئاشکراکانی هێندێ لەو شێوە مەیلیشی بەرەو حەسرەتی کۆمەڵگەی شەریکایەتی پێوەندی جارجارەشی بە دەولەتخوازی مکانیکی و هەلبژێرخوازی، هێشتا سوننەتی ئیدئۆلۆژیکی سوودبەخش گونجاو دەدرێتە قەلەم، کە لە سەدەی بیستەمدا بایەخێکی مەزنی بۆ لە یەکگەیشتنی مرۆڤایەتی و ئارمانجە ئەخلاقییەکان هەیە.

لیدوان لەمەڕ سۆسیالیزم لەراستیدا سەر لە دیالۆگ لەمەڕ ئانارشیزم دەردێنێ کە هەر دووکیان لە هێندێ بابەتی عەزمەکانەوە ئیدئۆلۆژیایەکی هاوبەشیان هەیە. برێک لە دۆزەکان و رێبازە ئانارشیستەکان بە ناوی شێوەی سۆسیالیزم خراونەتە ریزەوە و هەر بەم جۆرە هێندێکی دیکەش بە شێوەی لیبرال خراونەتە ریزەوە. لە راستیدا ئانارشی لەگەڵ هەر دوو ئیدئۆلۆژی شێوەی هاوبەشی هەیە.

واژەی ئانارشی لە دوو وشەی یۆنانی an بە واتای (بەبێ) و arkhê بە واتای (حکوومەت) پێکهاتووە کە لەبەر ئەمە وەرگێڕاوی وشەیی ئەو بەبێ حکوومەت یان بەبێ فەرمان مانا دەدا. واژەی «دەوڵەت» (بەجێی حکوومەت یان فەرمانڕەوایان» لە سەدەکانی نۆزدە و بیست بەکاربراوە. رەنگە پۆشراوەیەک لێرەدا بێتەپێشێ کە لەمپەرێک بێ بۆ تێگەیشتنی ئاشکراتری ئیدئۆلۆژی. دۆز «بەبێ دەسەڵات یان مەرجەعییەت یان یاساکان» کە بەش بە حاڵی خۆی تاوانی وشەیی شتێکی هاوکێش لەگەڵ بێسیستەمی و بێسامانی و کەس لە کەس چەواشەکاری دێنێتە ئاراوە. دەتوانین ئەم دوو واتا لە ئاخاوتندا ئاسایی قبووڵی بکەین، واتە کاتێک مەبەستمان لە ئانارشی جۆری ژیانی بەبێ حکوومەت بێ یان بە شێوەی گشتی رێنوێنی کەس لە کەس و هەرج و مەرج بکا.[1]

ئانارشیستەکان بەراستی بەم تێکەڵ بوونی واتایانە لە قسەدا نارەزایەتیان هەیە. هەمیشەش لەگەڵ ئەم فیکرە کە ئانارشی بە واتای وێرانگەری و نالەبارەیە، نارەزایەتیان دەرنەبڕیوە. تێکەڵاوبوونی کاکڵی ئەندیشەی ئانارشی کە هەم لایەنگران و هەم رەخنەگران بەم رێبازە لەسەر ئەوە تەئکیدیان هەیە، هۆی سەرهەڵدانی تەنزەکان و گاڵتەجاڕگەلێک بووە. رستەی بە ناوبانگی باکونین ئانارشیستی رووسی کە (مەیل بە وێرانی مەیل بە سازکردنەوەیە) هەر رەنگ و بۆی ئەم دوو لایەنییە تەنزاوییە مانای هەیە. بێگومان ئەدەبیاتی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بە کێشانەوەی وێنەی ئانارشیستەکانەوە

سەرقاڵبوون، وەک کتێبی راسپێردراوی نهێنی، جۆزێف کێنراد یان ژێرمینـاڵ زۆلا. هەر بەم دوو لایەنە نییە و شاراوەیەی واتا کایە دەکەن.

بەم حاڵەوە، ئەو جۆرە کە پێشتر توێژەران باوەڕیان هەیە، ئانارشی خـۆی بـە شێوەی بزووتنەوەی ئیدئۆلۆژیکی، پێناسەکردنی لە چوارچێوە و قەوارەی خۆیـدا دژوارە. ئەم ئیدئۆلۆژییە، وەکو ئیدئۆلۆژییەکانی دیکە، زیندەخـەوێکی بـەربڵاو لـە دۆزەکان دەگرێتەبەر.[٢] لەبەر ئەمـە، نابـێ دەربـارەی ئـەو بـە سـاویلکەیی چـاوی لێبکرێ. ئەم کارە هەر تەنیا هەڵقوڵاو لە کۆمەڵێک لایەنگرانی ئانارشی نییە بەڵـکو هاوکات لەگەڵ ئـەوە پێوەنـدی بـە مەسـەلەگەلێکی بـاس هەژێنـەوە هەیـە کـە لـە ناوەڕۆکی ئیدئۆلۆژیدا خۆی دەبیننەوە. بۆ وێنە ئایا واتای «بێدەوڵەت» خـۆی لـە خۆیـدا بـە واتـای «بـێ حکوومـەت»یـە؟ ئایـا ئانارشیـستەکان هـەموو جـۆرە دەسەڵاتەکان رەت دەکەنەوە یان لە نێوان دەسەڵاتەکاندا جیـاوازی دادەنـێن؟ ئایـ جیاکردنەوەی نێوان دەسەڵاتی زاڵ و دەسەڵاتی ئـەخلاقی بـوونی هەیـە؟ ئەگـەر دەوڵەت لەوانەیە حکوومەت، بـوونی نـەبێ، ئایـا هەسـتییەکی کـۆ، وەک کۆمەڵـگە دەمێنێتـەوە، ئایـا کۆمەڵـگە بریتییـە لـە کۆیـەکی سـاکار و بەسـەریەکداکەوتووی تاکەکانە یان یەکگرتوویەکی زیندوو و ئۆرگانیک دەدرێتە قەڵەم.

ئەو جۆرە کە بەر لەمە، لە بەشی ئیدئۆلۆژییەکان باسـی لێـوەکرا، سـەرچاوەی وشەی ئانارشی تا رادەیەک تازەیە. ئەم وشە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا هاتـە ناو پێتە سیاسییەکانەوە. یەکەم کاردانـەوەی پیتێـک کـە هێمـای رێنـوێنی لەسـەر لایـەن دیـاریکردنی سیاسـی بـوو لـە کتـێبی پیتێـر ژووزێـف پـرۆدۆن بـە نـاوی خاوەنداری چییە؟ هەڵسەنگان لەمەڕ پرەنسیپی ماف و حکوومـەت دەبینـرێ. ئـەم کتێبە نەک هەر تەنیا رستەی بەناوبانگ (هەر خاوەندارییەک دزییە)ی داهێنا، بەڵـکو بەیانێکی ئاشکرا لـە ئانارشـی بـوو. ئـەو جـۆرە کـە پـرۆدۆن گوتوویـە: پـرۆدۆن ئانارشیی بە شێوەی (لە دەسدانی ئەرباب و دەسەڵاتدار) پێناسـەی دەکـرد.[٣] ئـەم وتەیە و دەربڕینێکی لەو بابەتانـە لـە کتێبەکەیـدا بـووە هـۆ کـە پـرۆدۆن نـاوبنێن (باوکی ئانارشی).

بەر لە پـرۆدۆن، ئانارشـی زۆرتـر وەکـو وشـەیەکی نـاخۆش بـەکاردەبرا کـە
ـێنـاندەری چەواشەکاری و بێسیستەمی بوو. لەم حاڵەتەوە وەک جوێنە تەنانـەت
مەت (نێونەتەوایەتی یەکەم) بڕەوی بوو. لـەم رووەوە، بـاکونین لەسـەرەتادا لـەم
ـژە بۆ باسی خۆی سـوودی نەدەویـست. ئـەو لـە کۆتـایی دەیـەی ١٨٦٠ واژەی
لایەنگری خـاوەنـدارێتی هاوبـەشـی) بـە باشـتر زانی کـە لـە راسـتیدا ئـەوی لـە
ـڕەوانی پرۆدۆن هاوێر دەکرد.[٤] بێجگە لەمە، لایەنگرانی خاوەندارێتی هاوبەشـی
ـیوستانە دژی دەوڵەتخواز نەبوون. تا رادەیەک کە هەتا ماوەیەکی زۆر هێندێ لە
ـارشیستەکان بارودۆخێکی ناڵەباریان لەگەڵ بـاکونین دەبردەسـەر. لـە لایـەکی
ـیکەوە، مارکس بە شێوەی وشەیەک سووک کەلکی لە (ئانارشیـست) وەردەگـرت
و بەم شێوە نەک هەر بێکردەوەیی سۆسیالیستە خەیاڵییەکان، بەڵکو لـە روانگـەی
ئەوەوە کەسـانێک کـە دەیانویـست (نێونەتـەوە) چەواشـە کـەن، دەیخـستنە بـەر
پەلامار. نووکی هێرش و رەخنەی ئەو زۆرتر رووی لە باکونین بوو، کە دەرەنجام
لەسـەرەتادا بڕیاریدا لـەم واژە دوور کەوێتـەوە. پاشـان نـاوزەدی (ئانارشـی) لـە
کۆنگرەکانـدا مێـژووی پێچـەڵاوپووچ و پڕگـەوەی پێـوا و لەسەرانـسەری دەیـەی
١٨٨٠دا بوو کە لەم پێتە بە شـێوەیەکی بـەربڵاوتر لـە ئـەوروپا و ئـەمریکا کەڵـکی
ـێوەردەگیرا و لەسەر بزاڤـی هەمەلایەنـە ئـازاد کـرا و هەڵوێـستێکی دیـاریکراوی
ئـیدئۆلۆژیکی گرت بە خۆوە.[٥]

## پێگەکانی ئەندێشەی ئانارشیستی

لێدوانەکان لەمەڕ پێگـەکانی ئانارشـیزم دەتـوانین بـە سـێ جـۆری پرەنـسیپی
دابەش بکەین. لەمەڕ جۆری یەکەم پێویست ناکا دابمێنن. ئەمە کەسانێکن کە دەڵێن
ئانارشیزم لە بناغەوە هەڵوێستی جیهان وەتەن و بەربڵاو و ڕێبازی بـێ مێـژوو و
ئازادیخوازە. ئەم تاقمە لەسەر ئەو باوەڕەن کە لە چاخی نووسـەرە یۆنانییـەکانی
دێرین بە دوا دەتوانین بۆچوونە بەیانکراوەکانی ئانارشیستی بە دەس بێنین. بـەم
جۆرە هەروەها تەئکید کراوە کە ناوەرۆکی ئانارشیستی لە نووسراوە دێرینەکانی

چینی وەکو تائۆدی چنگدا دەسدەکەوێ. نووسەری ئانارشیستی هاوچەرخی ئەمریکایی جان کلارک ئەم ئاسەوارەی تائۆئیستی وەکو «یەکێک لە مەزنترین ئانارشیستە کلاسیکییەکان» باس دەکا.[6] هەموو نووسەران و بزاڤە ئازادیخوازەکان بە گشتی لە سەردەمی سوقراتەوە کەوتوونەتە ئەم گشتەوە ئ لە ریزەی ئەم نامە نووسینە گشتی و پاسایە دابنرێن. سۆفستایەکان «دانراوە — سەفسەتە، ریبازە فەلسەفی کە لە سەدەی پێنجەمی بەر لە میلاد لە یۆنان سەری هەڵداوە»، هەلاوهەنگامەنانەوە، ئانارشیستەکان و بزاڤە کولتوورییەکان لە دەیەی ١٩٦٠ بەشێک لەم رووداوە پرکێشە ئازادیخوازانە دانراون. لێرەدا جۆرێک بێهێزی و خاوی پرەنسیپی یان نەزانی فیکری بوونی هەیە کە لە هۆکارە مێژووییەکان و کۆمەڵناسی بێ هەواڵ ماوەتەوە.

بۆچوونێکی دەرەکی وەک ئەوە لەمەڕ زۆرتری ئیدئۆلۆژییەکان و ئاشکرا کردنی ئەوانە دەکرێ پەیدا بکرێ. لێرەدا حەزێکی بەهێز بۆ دۆزینەوەی (تورەمەی دێرینە)ی هەموو ئیدئۆلۆژییەکان بوونی هەیە کە زۆربەیان پارێزی فیکر بۆش دەکاتەوە.

بینینی دووەم پرەنسیپێکی زۆر زیاتر باوەڕپێکراوی هەیە. ریشەی ئەم بینینە لە دوو گەرانێکی مرۆڤناسانەیە کە لە دەسپێکی سەدەی نۆزدەیەمدا لەگەڵ نووسەرانێکی وەکو لوئیس مۆرگان دەسپێکرد. کێشەی سەرەکی لێرەدا ئەوەیە کە ئانارشیزم بە شێوەی زگماک دەکرێ لە جۆری کۆمەڵگە سەرەتایەکانی بێ رێبەر یان بێ فەرماندە لەسەرانسەری جیهان پەیدا بکرێ. مەزنترین وێنەی ئەم باوەڕە بەهێزترە دەتوانین لە کتێبی پیتێر کروپوتکین بە ناوی «یارمەتی بەرامبەر» (١٩٠٢) ببینین. جۆری نوێی ئەم کێشە لەگەڵ ریشە فیکرییە جیاوازەکان لە کتێبی مایکل تایلۆر بە ناوی کۆمەڵگەی هاوبەشی، ئانارشی و ئازادی خراوەتەبەر دەست، بە نووسراوەی تایلۆر: (لانی کەم لە هەموو تافەکان لە خولی مرۆڤی ئەندێشەپیشەوە، مرۆڤ لە جەماوەری هاوبەشی «سەرەتایی» بەبێ دەوڵەت ژیانی کردووە).[7] زۆر لەم کۆمەڵگەیانە دەکرێ ناوی کۆمەڵگەی سەرەتایی ئانارشیستی بۆ دابنێن. ئەو جیاوازی لە نێوان هێندێ جۆرەکانی

کۆمەڵگەی سەرەتاییدا دادەنێ و تێدەگا کە ڕێکەوتنی کۆمەڵگاکان «بێ فەرماندە و بەرپرس»، «پێوەندییەکی نزیکتری لەگەڵ ئانارشی نەگۆڕدا هەیە».[8] تایلۆر لەگەڵ کۆکی لەم باوەڕە دەڵێ:

نازانم چۆن کەسێک کە هۆگری بە ئانارشی یان کۆمەڵگەی هاوبەشی بێ دەتوانێ لە تۆژینەوەی ئەم جۆرە کۆمەڵگەیانە خۆبپارێزێ؟ چۆنکە لانی کەم تاقانە وێنەکانی مێژوویی ئانارشی و وێچووی ئانارشی پێکدێنن و وێنە گرنگەکانی کۆمەڵگەی هاوبەشی لە بابەت واتاوە ئەم وشە بەکاردەبرێ.[9]

لەم ڕوانگەوە دەربارەی پێگەکانی ئانارشی مەسەلەگەلێکی زۆر دێنێتە ئاراوە. هێشتا بیچمێک لە ڕوانگەی (بنچینەی دێرین) لێرەدا بوونی هەیە. ئەگەرچی زۆربەیان بەیان نەکراوە، کە باری بەرپرسایەتی بۆ ئانارشیزمی کۆمەڵناسی و مێژوو بەجێدێڵێ. جیهانبینی واتای درۆزناە سێبەری بەسەر ئەم ڕوانگەدا کشاوە. هەر چەند ئەمە کە پێشمەرجی ئەو لەسەر واتا باوەڕپێکراوەکانی عەقڵخوازی ڕۆشناسانەی سەدەی نۆزدەیەم خۆراگر بێ. دەربارەی هەموو جۆرە ڕێکخراوەکانیش جۆرێک ساویلکەیی لە ئارادا هەیە. چونکە کۆمەڵگای بێدەوڵەت یان بێبەرپرس و بێپیشە وابووە پێویستانە بەو مانا نییە کە بکرێ ئەوە لە ڕیزەی ئانارشی تایبەتی سەدەی نۆزدەیەم بدرێتە قەڵەم. ئایا ئەمە شێوەیەکی دیکە لە ڕێکخراوەی کۆمەڵگە نەبووە؟ بۆچی حەز دەکەین ئەم دیاردانە لە ئاخاوتنە ئیدئۆلۆژییە هاوچەرخەکاندا بگونجێنین؟ جگە لەمە، ڕوانگە دینی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەم کۆمەڵگە سەرەتایانە لەگەڵ ئانارشی دنیای سەدەکانی نۆزدە و بیست جیاواز بووە. لەبەرئەمە، دیسان پرەنسیپی کەمبینانە و تا ڕادەیەک ڕۆمانتیک لە کۆششی بۆ وێنە نوێنی ئەم دنیا جیاوازانە دان. وا دەنوێنێ و نیشان دەدا کە لە پشتی ڕێنوێنە عامەپەسندەکانی ئەو وەحشییە خاوەن شەرەفە، ژان ژاک ڕۆسۆ شاراوەتەوە. لە ڕاستیدا شێوەگەلی باوەڕی و جۆری کۆنترۆل لەم چەشنە کۆمەڵگەیانەدا دەبێ خراپتر و توندوتیژتر لە کۆنترۆلی دەوڵەت لە کۆمەڵگەی نوێ بزانرێ.[10] زۆر لەم کۆمەڵگە سەرەتاییانە لەگەڵ ئەوەیکە

دەسەڵاتی فرەلایەنەی دەوڵەتیان لە دەس دابوو، بەڵام لە سێحربازی و جادووگەری، دەمارگرژی، هەڕەشە و دوژمنایەتی رووبەڕوودا دەتلانەوە و بێگومان وێنە خێرخوازەکان بۆ رێزلێنانی بەرامبەر یان ئازادی نەدەدرانە قەڵەم. ئەو جۆرەکە لە پرسینەوە لەم گروپە سەرەتاییە هاتووە:

نەبوونی دەوڵەت بە شێوەی ئامێر یان میتۆدێک لە رێکخراوەی کۆمەڵگەدا پێویستانە بە واتای لە دەسدانی ئەو شتە ناپێویستانە نییە کە بمانەوێ ئەوانە لە کۆمەڵگەی رۆژاوایان پاک کەینەوە کە بریتین لە: پێشبڕکێ و خەبات، دابەش کردنی چینایەتی، لە پلە و پایە گەڕان و جێخوازی، سەرەڕۆخوازی، بەرتەسک کردنەوەی ئازادی تاک و... قبوولکردنی ئەم دیرۆکە تا رادەیەک دەرەنجامی حەز و مەیلی سەدەی نۆزدەیەم دۆزینەوەی ئاشکراکانی یەک هۆیی جیهانبینینە.[11]

روانگەی سێیەم دەربارەی پێگەکانی ئانارشیزم تا رادەیەک منداڵی پڕەنسیپی رۆشنبیری و شۆڕشی مەزنی فەڕانسا دەدرێتە قەڵەم.[12] بێجگەلە ویلیام گودوین (١٧٥٦ـ١٨٣٦)، کە لە مژینی مەمکی یەکێک لە بزاوتە فرەکانی شۆڕشی فەڕانسا فرچکی کردووە؛ واتای ئانارشی بە دڵنیاییەوە بەیان کرد، ئانارشی بۆ خۆی بەرهەمی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمە. سەرهەڵدانی بەهێزی ئەو لە دەیەی ١٨٨٠دا کارێکی تەسادوفی نەبوو. دەتوانین ئانارشی بە شێوەی خاڵێکی بەیەکگەیشتن یان بۆشایەکی نێوان لیبرالیزم و سۆسیالیزم بدەینە قەڵەم. ئەو جۆرە کە ئانارشیستی ئەڵمانی بە دروستی دەڵێ، ئانارشیزم (جەمسەری بەیەکگەیشتنەوەی دوو بزاوتی مەزنە کە لە دەسپێکی شۆڕشی فەڕانسا و لە ماوەی ئەو جیلوە تایبەتیانەی کە لە ژیانی فیکری ئەورووپادا بوویانە: سۆسیالیزم و لیبرالیزم).[13] ئەمە بەو مانا نییە کە ئانارشی خۆی خاوەنی سیفەتێکی جیاواز نییە، بەڵام ئەمە بووتە هۆی کە نێوان ئەو و گشت ئیدئۆلۆژییەکان دەستێوەردانێکی گرنگ ئەنجام بدرێ.

خولی بزووتنەوەی ئانارشیستی دەکرێ لە دەیەی ١٨٨٠ هەتا دەیەی ١٩٣٠ دابنرێ. شەڕی ناوخۆی ئیسپانیا شاهیدی دواکۆششەکانی ئەم بزاڤە بۆ پێکهاتنی جەماوەرە ئانارشیستەکان بوو، هەڵبەت ئەگەر بزووتنەوە دژەکەلتوورییەکانی

دەیەی ١٩٦٠ لە بەرچاو نەگرین.[١٤] ئانارشیستەکان لە بناغەوە لە لێواری دوو شۆڕشی گرنگدا بەرەنگاریان بوونەوە:

یەکیان لە رووسییە بوو و ئەوی دی لە ئیسپانیا. لە هەر دوو جێ ئەوان بە توندی سەرکوتکران و لەناوچوون. لە وێنەی ئانارشیستەکانی ئۆکراین بە ڕێبەرایەتی نستۆر ماکنۆ پاش شۆڕشی رووسیە، سەرکەوتنی ئەوان لە هەموو خولەکانی شەڕدا درێژەی پێدرا. ئەمەکە ئایا بزاڤی ماکنۆ بزاڤێکی رەسەنی ئانارشیستی بووە یان نا، لەگەڵ سەرنجدان بە بارودۆخی تایبەتی جەنگی کارێکە بۆ لێدوان دەبێ.[١٥]

کۆمەڵێک لە نووسەران گوتوویانە لە گەڕانەوە بۆ ناوەڕۆکەکانی ئانارشیستی دەکرێ لە بزاڤە دژی کەلتوورییەکانی لە دەیەی ١٩٦٠دا ببینرێ. مەسەگەلێکی وەک گەشەی پیشەسازی، دەسەلاتی ناوەکی، پیسکردنی ژینگە، هەڕەشەی ئالۆزی ژینگەی پێگەی جیهانی، بەهێزکردنی دەسەلاتی دەولەت و شەڕ، بەرەیەکی نوێی لەگەڵ هەستە ئانارشیستییەکان بەدیهێناوە. لە دەیەی ١٩٦٠ نووسەرە ئانارشیستەکانی وەک پول گودمەن، ئالێکس کافورت، لکین وۆرد و بەتایبەت مورای بوکچین هەموویان لە دەلاقەی ئانارشیستییەوە بۆ ئەم ناوەڕۆکە دەڕوانین.[١٦] بەرەی نوێ لە چاپەمەنی وەکو دیراون، تلۆس، هاربینگێر و بلەک رۆز هەر بەو جۆرە رەخنەی ئانارشیستیان بلاودەکردەوە. بێجگەلە مانە نووسینگەی بلاوکردنەوەی وەک فریدم رزپرین، پرین بلەک بە بلاوکردنەوەی برێکی زۆر لە نووسراوەکانی ئانارشیستی دەس بەکار دەبەن.

پرسیار ئەمەکە چۆن ئانارشیزم لە دەیەکانی ١٨٦٠ و ١٨٧٠ پەرە و پێشکەوتنیان بەدەست هێناوە؟ زۆر پێچراوەیە و وەلامدانەوە بەوە بۆ بازرگان تایبەتی کۆمەلگەکان دەگەڕێتەوە. بۆ وێنە هۆکاری پەرەی ئانارشیزمی رووسی بەگشتی لەگەڵ هۆکاری پەرەی شێوەی ئەمریکایی، ئیسپانیایی یان فەرانسەوی ئەو جیاوازی هەیە. تا رادەیەکیش یەکلایەنی فیکری لە پێگەی شێوە جۆرەبەجۆرەکانی ئانارشیدا بوونی هەیە کە لە بەشی دوایدا لەمەڕ ئەو لێدوان

دەکەین. بەم جۆرە پێگەی ئانارشیزمی تاکخواز پێوەندی فیکری نزیکتری لەگەڵ لیبرالیزمی کلاسیکدا هەیە، ئێستا ئەوەی کە ئانارشیزمی کۆمۆنیست و لایەنگری روانگەی شەریکایەتی بە لێدوانە پڕ لە تەگبیر و را فیکرییەکان لەگەڵ بلانکیزم و مارکسیزم لە (نێونەتەوایەتی) پەروەردە کراون. لە دەیەی ١٨٨٠ بە دوا ئانارشیستەکان لە گشت کۆمەڵگە ئەوروپاییەکان، و هەروەها لە هێندوستان ئەمریکای باشوور، ژاپۆن و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەریان هەڵداوە.

دۆزینەوەی بناغەی مەنتقێکی روون لەمەڕ پەرە و تەنینەوەی ئانارشیزم بەڕاستی مومکین نییە. رێنوێنی گشتی و سەرەتایی دەتوانی ئەو خالانەی خوارەوە بگرێتەخۆ. لە سەدەی نۆزدەیەم هەیە دی جۆراوجۆری مێژووی مریانی تایبەتی هەین. گرنگترینی ئەوانە بریتییە لە گەشەکردن و زاینەوەی کۆی ولات نەتەوەکان بوو کە زاینەوەی ئیدئۆلۆژییەکان لە کۆی لیبرالیزمی لەگەڵدا بوو بێجگەلەمە، دەبێ ئاماژە بە پەرەساندنی سەرمایەداری پیشەسازی و شێواو و راپەڕینە مەزنە کۆمەلایەتییەکان، ئابووری و سیاسی و ناڕەحەتیگەلێکی هەلقولاو لەوانە بکرێ. یەکێک لە دەسکەوتەکانی ئەم کارەساتە، بەتایبەت لە کۆمەڵگەی گوندیتر، پێکهاتنی دژایەتی نێوان شێوەگەلی پیشەسازی و وەرزێری لێکەوتەوە لە خۆرا نەبوو کە ئانارشیزم هەتا دەیەی ١٩٣٠ پالپشتی خۆی لە کۆمەڵگە گوندیترەکان و وەرزێری هێند، رووسیا، ئیسپانیا و ئیتالیای بەدەستهێنا.

پەرەگرتنی کۆمەلایەتی ناوبراو هاوکات بوو لەگەڵ سوننەتی بەهێزی شۆڕشێک لە ولاتە ئەوروپایەکان. هێندێ لە مێژووەکانی ئەم سوننەتە بوو بە بەشێک لە پیرۆزە بوونی سۆسیالیزم و ئانارشیزم کە هەر کام لەگەڵ دەقی پێداهەلگوتنەکان یان نەبوونی یەک نەکەوتنی توند لەمەڕ واتای راستەقینەی ئەو لەگەڵدا بوون. شۆڕشەکانی سالانی ١٧٨٩، ١٨٣٠، ١٨٤٨، ١٨٧١، ١٩١٧ و ١٩٣٠ بە مەزندەی رووداوەیەک لە دووی یەک گۆڕانکارییەکانی پڕ لە داخوازی پیرۆزی دیاردەی ئازادیخوازی درانە قەلەم. لێدوانە مەزنەکانی «نێونەتەوایەتی یەکەم و دووەم و سێیەم» لە دەیەی ١٨٦٠ بە دوا سەلماندن و پرۆپاگەندەی بینینی ئەم

بیچمە پیرۆزە بوون. ئانارشیستەکان خۆیان بە بەشێک لەم پرۆژە ئازادسازییە ـدزانی. لە زۆر بابەتدا دژایەتی ئەوان لەگەڵ دەوڵەت و پیشەسازی کردنی گەورەی بەراورد بەرهەمی دژایەتی ئەوان لەگەڵ مارکسیزم بوو کە وایان بیر ـدکردەوە پشتیان لە ئەرکی ئازادسازی هەڵکردووە و خاین بوون و ئازادیان فرۆشتووە بە جۆرێک لەسەرمایەداری دەوڵەتی.

## جەوهەری ئانارشیزم

ئانارشیزم وەکو سۆسیالیزم کەوتووەتەبەر پەلاماری دەنگ بەرز بوونەوەیەکی یەکجار زۆری رەخنەوە. زۆر لە توێژەران و زۆریش لە ئانارشیستەکان بوونی روانگە جۆراوجۆرەکانیان قبوولە. بە بۆنەی ئیمانێکی بەهێز بە ئازادی عەقیدی بەرچاو بە باوەڕە ئانارشیستەکەیان، وەها چاوەڕوانییەک لەوان دەکرێ. هەروەها وەکو فرەئیدئۆلۆژییەکان، بە شێوەگەلی جوراوجۆر دەکرێ بزاڤەکان دەستەبەندی بکرێن. هەم دەتوانین ئانارشیستەکان بەپێی دۆزەکان و ئامانجە راگەیێنراوەکانیان دەستەبندی بکەین، هەم بەپێی ئەو تاکتیکانەی کە کەڵکی لێوەردەگرن واتە ئەمە کە میتۆدەکانیان دەمارگرژی بێ یان ئاشتیخوازانە.

جگە لەمە، دەربارەی برێک لە رێبازەکانی ئانارشی ئەخلاقی باوەڕێکی زۆر لە ئارادا هەیە. من حەز دەکەم ئەوانە بە جۆرەکانی تاکخوازی، کۆخوازی، کومۆنیست، بەرامبەرخواز و ئاناکۆسەندیکالیز دابەش بکەم. جۆرناسی قبووڵکراو ێرەدا دابەشکارییە دەرەکی ترەکانیش لە خۆدەگرێ. بۆ وێنە یەکێک لە جۆرە بەربلاوەکانی ئەندێشەی ئانارشیستی تاکخواز لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە دەیەی رابردوو لەگەڵ ناوی موورای راتبارد تێکەڵ بوو و ناوی ئانارکاپیتالیزمی بەخۆوەگرتووە. شێوەی مومکینی دیکەی لەم پلانەدا بوونی هەیە. هێندێ لە ئانارشیستە توندوتیژەکان «راگەیێنەری پێویست» لە دەیەکانی ١٨٨٠ و ١٨٩٠ بەرەو لای نیهیلیزم یان پووچبوونەوە دەچوون. لەم دواییانەدا

موورای بوکچینی ئانارشیستی ئەمریکایی خۆی بە «ئەکۆئانارشیزم» (ئانارشیست
لایەنگری پێگەی ژین) ناو ناوە. نووسراوە نوێکان هەروەها باسیان لە (ئانارشیست
فەمینیزم) کردووە. من هەولم داوە هەتا بناغەناسی واژەی سەرزاری گشتی
پێڕەوی بکەم. بەم جۆرە ئانارشیزمی نیهیلیست، ئەکۆئانارشیزم و ئانارشیزمی
فەمینیست بە شێوەی باسێکی جیاوازانە لێکۆڵینەوەیان لەسەر ناکرێ. لە راگەیاندنی
ئێستادا حەز دەکەم بوکچین لە ریزەی لایەنگرانی ئانارشیزمی کۆمۆنیست دابنێم

دەکرێ ئانارشی بە ئاشکرا لە نووسراوەی ئەمریکایەکانی وەکو جاشوا وارن
بنچمین توکار، ئالبێرت جینوک و مورای راتبارد ببینرێن، بە بۆنەی دلگەرمی تایبەتی
راتبارد سەبارەت بە سەرمایەداری پڕبەپێست نییە کە ئەو لە زومرەی ئەم دەستە
دابنێین. ئەگەرچی تاکخوازەکان لە زۆربەی مەسەلەکاندا وەک یەک نین، تالێکی
هاوبەش کە ئەوانە بە یەکەوە گرێبەست دەکا باوەڕی توندی ئەوانە بە دەسەڵاتی
تاکە، لە زۆر شوێنەکاندا تەئکیدی ئەوان لەسەر بایەخی بنەڕەتی ئازادی تاکە -
سوننەتی ئەمریکادا هەر بەو چەشنە تەئکیدێک لەمەڕ بایەخی خاوەنداریتی تایبەتی
لە ئارادا هەیە.

لەگەل ئەمەدا ئەوان باوەڕی تەواو و پێویستیان بە تاکخوازی هەیە. ئەوانە
وەلانێین، جیاوازییەکان و جیابوونەکان دەستپێدەکا. جگە لەم بایەخە بنەڕەتییە
تاک، دۆزەکانی مارکس ئەستیرنێر بە ساکاری لەگەل گشت ئانارشیستە
تاکخوازەکان سازگار نییە. هەر ئەم خالە دەربارەی ویلیام گودوین و لیئو تو
راستە کە بە پێچەوانە سەرنجی بە تەوژمیان بە تاک، لەگەل واتای تاکخوازی
ئەمریکایی گهونجانیان نییە.

ئانارشیزمی کۆخواز سەرەتا لەگەل ئەندیشەکانی میخائیل باکونین
نەخوارد. باکونین جگە لە دۆزە ئاسایەکانی پان ئیسلاویزم و هە
دژەئەلمانییەکانی خۆی، بە هۆی باوەڕێک کە بە شۆڕشی خورسک و هە
ئیشتیا و پێداگری روخێنەری لە بابەت بۆچوونی، بە ئێحساساتی بە دوژمنی
مارکسیستی و بۆچوونەکانیشی لەسەر دیکتاتۆری ئانارشیستی شۆرش

بەناوبانگ بوو. باکونین باوەڕی بەگشتی کردنی کەرەسەی بەرهـەمهێنـان نـەبوو و بە ڕای ئەو بلاوکردنەوەش دەبوو لەسەر بنـەمای پێـواری کـار دیـاری بکـرێ. لـەم ڕووەوە کروپۆتکین بەڵگەی دەهێنا و کە ئانارشیستە کۆخوازەکـان بۆچـوونی زۆر جیاوازیان لە عەدالەت لـەچاو ئانارشیـستە کۆمۆنیـستەکان هەیـە کـە بلاوکردنـەوە بەپێی نیاز هەڵدەسەنگێنن.[20]

ئانارشیزمی کۆمۆنیستی تا ئەمڕۆ یەکێک لە بەشە هەرە بـەهێزەکانی ئەندیـشەی ئانارشیستی بووە. کروپۆتکین بەناوبانگترین لایەنگری سەرەتای ئـەم بزاڤـە بـووە. ئەوانی دی بریتین لە ئەریکومالاتستا، ئەلێکساندێر بـەرکمن، ئیمـا گولدمـەن، کـولین وارد و مورای بوکچین. ئانارشیزمی کۆمۆنیستی بە پرەنسیپی خاوەنـداریتی گـشتی لە بابەتی ماڵ، بەرهەمهێنان و شوێنی نیشتەجێبوونەوە بـاوەڕی هەیـە. کروپـۆتکین بـەپێی نیـاز بـاوەڕی بـە بلاوکردنەوەیـە. ئـەم باوەڕانـە لەگـەڵ بـڕێک لایەنـەکانی سۆسیالیزمی ریفۆرمخواز و لیبرالیزمی کۆمەلایەتی هاوبەشی پێکـدێنێ. هـەروەها ئانارشیـستە کۆمۆنیـستەکان لەسـەر زەروورەتی پێکـەوە گرێـدانی کۆمەلایـەتی و نووسـینگە هەرەوەزییـەکان تەئکیـد دەکـەن. ئـەم واتایانـە بـە بەشـێکی سروشـتی مرۆڤایەتی دەدەنە قەڵەم. بوکچین ئەم خوازیارییە لە نووسراوەکانی خۆیدا دووپات کردۆتـەوە و ئـەوەی لەگـەڵ ناوەڕۆکـەکان هـاوکێش و هاوئاهـەنگی ئـەکۆلۆژیکی پێکەوە گرێبەست کردووە.[21] یەکەم کتێبی ئانارشیستی کۆمۆنیستی کتێبی یارمـەتی بەرامبەر، نووسراوەی کروپۆتکین بوو. ئازادی بابەتێکە کە لە ئانارشی کۆمۆنیستیدا تا رادەیەک شاراوە ماوەتەوە. ئەم کارە هەمیشە بە گەشەکردنی ئـەخلاقی و گەشـە و بەرەوپێشچوونی تاک لە دەروونی کۆمەڵگەدا بە پێکەوە بەسراو زانـراوە کـە بـە شێوەی واتایەکی بەکەڵک لە ئازادی باشتری لێتێگدەگەن. بەلام لەم بـارەوە لـە نێـو بڕێک لە نووسەرانی ئانارشیستی کۆمۆنیـستیدا تایبەتمەندیگـەلێک لـە ئـارادا هەیـە. سەرەنجام ئەمـە کـە وەک ئانارشـیزمی کۆخـواز، ئانارشـی کۆمۆنیـستی دژایـەتی لەگەڵ بازاڕ و بەرهەمهێنای تایبەتی کەرەسەکاندا هەیە.

ئانارشی بەرامبەرخواز لەگەڵ (باوکی ئانارشـی) واتـە پیتێـر ژووزێـف پێوەنـدی هەیە. پرۆدۆن لە ماوەی تەمەنی خۆیدا روانگەی خۆی گۆڕی. ئەو دواتر تەنانەت لـە ناوی (ئانارشیست) بۆ خۆی حاشای بوو. روانگەی سەرەتای ئـەو لەمـەڕ ئانارشـی دەکرێ لە واژەی (بەرامبـەرخوازی) خولاسـە بکرێتـەوە. ئـەو گومـانی لـێدەدا کـە دەوڵەت لە حوکمی رێکخراوەی سیاسی جێی خۆی ئەدا بـە رێکخـراوەی ئـابووری. دەسـەلاتەکان و دەوڵـەتەکان پاکتـاو دەبـن و پێوەنـدی تاکـەکان یـەکتر لـە لایـەن قەرارداده ئابوورییـە بەرامبەرییەکانـەوە پایـەدار دەبـێ. بەرامبـەرخوازی زورجـار (دەستەبەرخوازی)شی ناوی لێدەنێن کە شێوەیەک لە ئانارشی گرێبەستخواز بـوو. تاقانە رێکخراوەیەک کە بنەمای ئەو قەراردادی پێکنەدەهێنا، بنەماڵە بوو کە شێوەی یەک بە دووی یەک و بـاوکسـالارانەی خـۆی دەپاراست. مەسـەلەی ژنـان هێنـدە لەبەرچاوی ئانارشیدا نەبوو. پیاوان دەیانتوانی (هەتا جێیەک کـە بـە چەوسـانەوە و خراپ کەڵک وەرگرتن لەم و لەو خەریک نەبن) خاوەندارێتی تایبـەتی بـن و کـار بـۆ خۆیان بکەن. ئەوان دەتـوانن کەسـپ و کاریـان لەگـەڵ بـە دەسـتهێنانی ئیعتیبـاری بێسـوود لـە (بـانکی ئیعتیبـاری بەرامبـەر) دەسـت پێبکـەن. داهاتـەکانی ئـەوانیش دەتوانێ لەگەڵ بەراتەکان و بارەکان ئیعتیباری دەسـتەبەرکراوی بانکیـشدا ئاڵـوگۆر بکرێ. بلاو کردنەوە دەبێ گرێ درابـێ بـە کـار و بەرهەمەکانـەوە. بـە پێچەوانـەی ئەمانە، هێشتا وەها بوارێک لە یەکسانخوازی و ئازادی جەوهەری لـە ئـارادا نـەبوو. قەراردادەکان نەدەبوو لـەژێر گوشـاری ئـابووری یـان لـەژێر بـارودۆخی ئـازادی، نەبەرامبەردا ببەسترێ. کۆمەڵگەی دادخـواز کۆمەڵـگەیەکە کـە یەکسـانی و ئـازادی قەرارداد لەو دا بوونی ببێ. پرۆدۆن ئەم واتای قەراردادەی لە یەکساندا (عەداڵـەتی ئاڵوگۆڕی) ناو لێناوە.

دوایین بزاوتی ئانارشیزم، ئانارکۆسەندیکالیزمە کە لە بزاڤێکی بەربلاوتر و برێک دێرینەتری سەندیکالیزمدا گەشەی کرد.[22] وشـەی (سـەندیکالیزم) دوو مانای هەیە. لـە لایەکەوە رەنگە لەسەر یەکێتی مەدەنی بە واتای بێ لایـەنی ئـەو رێنـوێنی ببـێ، لـە لایـەکی دیکـەوە بـە واتـای رێبـازی یـەکێتی مـەدەنی شۆڕشـگێڕی یـان خـەبات و

ـەرخۆدانە کە خۆی لە پێناوی روخاندنی سەرمایەداری و دەوڵەت دادەنێ. مکانیزم
ـدسمکراوی رووخانی مانگرتنی گشتی بوو. سەندیکالیزم بـە دووپـات کردنـەوەی
گومانی کۆمەڵگەی بێدەوڵـەت، لەگـەڵ پـلانی فیـدرالیزە و لەگـەڵ بـوونی گروپـە
بەرهەمهێنەکانی بیر لە سەندیکایی دەکاتەوە. ئەم بزاڤە لـە مـاوەی دەیـەی ١٨٨٠ و
١٨٩٠ لـە فەرانـسەدا گەشـەی کردبـوو. لـە سـەرەتای دەیـەی ١٩٠٠دا ولاتـە
یـەکگرتووەکانی ئـەمریکای گرتەبـەر و رێکخـراوەی (کرێکـارانی مـەدەنی جیهـان)
(wobblies)ی بەناوبانگی بەدیهێنا کـە زۆر بـەهێز بـوو و لایـەنگرانێکی وەک یـۆجین
دیبز و دانیەل دۆلئۆنی بـوو. ئـەم بزاڤـە هـەروەها لـە ئیتالـیا، ئیـسپانیا، ئوسـترالیا،
ئەمریکای لاتین و بریتانیا پەرەی سەند. لە بریتانیا کاردانـەوەی ئـەو لـە بوارەکـانی
زوخال سەنگی ساوت ویلز بەر لە ١٩١٤ هەستی پێکرا. هەرچەند رۆڵی وردی ئەو و
کاریگەرییەتیش لە پەرەدان بە ئالۆزییەکان و ناهێمنایەتییەکاندا هێشتا بە توندی جێی
ـیدوانە.[٢٣]

بزووتنەوەی سـەندیکالیزم بـە هـۆی هەڵوێـستی خـەباتی دژی سیاسـی و دژی
دەوڵـەتی خـۆی پـشتگری و هـۆگری کۆمەڵـێک لـە ئانارشیـستەکان هەڵـبەت نـەک
هەموویان بەرەو لای کێشران. ئەوان بەداوی ریشە ماقووڵەکانی رێکخـراوەی دژی
سیاسـی ئـەو لـە دەروونـی چـینی کرێکـار بـوون. لەبـەر ئەمـە کـە کـەلتـووری
شۆرشگێری و پێکهاتە ناکۆنەکانی خەلکی پێشەکی بـەدیهاتبوو، کۆمۆنـەکان هێنـدە
سەرکەوتنیان بەدەستنەهێنا. پـاش بـەرێوەچوونی کـۆنگرەی ئانارشیـستی سالـی
١٩٠٧ لە ئامێستێردام، زۆر لە ئانارشیـستەکان هەوڵـیاندا لەگـەڵ سـەندیکالیزم یـەک
بگرن و شێوەی «ئانارکۆسەندیکالیزم» لێرەوە سەریهەڵـدا. بـرێکیان وەک رۆدۆلـف
رووکێـر ئانارشـیزمی (ئانارشیـست) ئەلـمانی، ئانارکۆسـەندیکالیزمیان بـە شـارێی
داهاتووی ئانارشییان دەدایە قەڵـەم. ئـەوانیدی ڤیکتۆر گریـف، ئێلـس لـە بـزاوتی
سەندیکالیستی و مالاتستا و کروپۆتکین لـە بـزاوتی ئانارشیـستی، هـەموو چەشـنە
پێوەندییەکی نێوان ئانارشیزم و سەندیکالیزمیان رەتدەکردەوە.

به شێوەی گشتی، ئانارکۆسەندیکالیزم هەموو سیاسەتە دەولەتخوازەکان. حزبەکان، پەرلەمانەکان، دیموکراسی و وەکو ئەوانەیان ڕەتدەکردەوە. ئەم بزاوتە هەروەها لەگەڵ ڕەتکردنەوەی فێرکردن و پەروەردە و شێوە فیکرییە بورژوایەکان. گەرایشی دژی رۆشنبیریان هێنایە سەرشانۆ. لایەنگری شەڕی چینایەتی و رووخانی سەرمایەداری بە هۆی خەبات و بەرخۆدانی چەکدارانە و مانگرتنە گشتیەکانەوە بوو. گروپە تەولیدکارەکان دەبوایە هەستەگەلی کۆمەڵگەی نوی پێکبێنن. ئەم هەستانە دەبوایە بە شێوەی ئەنجوومەنە کرێکارییەکان بن کە بە جۆری دیموکراتیکی خۆڕسک ڕێکوپێککراو و بە شێوەی فیدراڵی بەڕێوە ببرێ و کەلتووری کۆمەلایەتی، سیاسی و ئابووری تایبەتی خۆی بخولقێنێ و ئەم کارە تەنانەت دەبێ بەر لە ڕوودانی شۆڕش بەڕێوە ببرێ. پلۆتییەی سەندیکالیست کە ڕێبەری سەرەتایی سەندیکالیزمی فەڕانسا بوو بە شێوەی لایەنگرێکی گرنگ واتای (بورسکار)، (جێگای کڕین و فرۆشی کاغەزە بەبایەخەکان) کە خۆی بە دیهێنابوو بەتوندی لەم خودموختارییە سەندیکالیستییە لایەنگری دەکرد. (بورس) بە جێگای کۆبوونەوە کرێکارانی هەموو سەندیکاکان دەناسرا. بۆرس ئەرکێکی زۆری بە ئەستۆ بوو: جێگەی سات و سەودای وزەی کار، جێ کۆبوونەوە، جێی سندووقی تایبەتی مانگرتن و ناوەندی فێرکردن لەگەڵ کتێبخانەیەک. بورس لەگەڵ ئەوەی کە کارکردەکان و ئەرکە کردەوەییەکان و بەڕێوەبردنی بوو، لە داهێنانی کەلتووری نوێی کرێکاریشدا دەوری بوو.

بەر لەوەی دەس بکەین بە لێدوان لەمەڕ ئەندێشەی ئانارشیستی، مەسەلەیەک لەم شانۆگەرییەی (ڕێبازی ئانارشی) پێویستی بە تێرامان هەیە. ئایا هەموو ڕێبازە ناوبراوەکان دەکرێ بە ئانارشیست بدرێنە قەڵەم؟ لە ناوەڕۆکەکانی ئانارشیستیدا هەوڵێکی زۆر دراوە کە پانتای ئەو بەرتەسک بکرێتەوە. جگە لە ئانارشیستی کۆمۆنیست، تەقریبەن هەموو ڕێبازە ئانارشیستەکان کەوتوونەتە بەر هەڕەشەی ئەم بەرتەسکییەوە. بۆ وێنە لەسەردەمی دەسپێکی ڕێبازی ئانارکۆسەندیکالیزم، زۆر لە کەسانی ئەو بەدەر لە بزاڤی سەرەکی ئانارشیستی دراونەتە قەڵەم. بەلام لە هێنێدک

ـوێنیشدا کە ئانارکۆسەندیکالیزم بەشێک لە ئانارشی دانـراوە، دیـسان نووسـەرانێک کە لە پێوەندی لەگەڵ ئەم ڕێبازە ناویان دەرکردووە، وەکو ژۆرژ سورل، ئا. بێـرت و هـ. لاگاردل، زۆرجار لە بابەتی برێک بە شەوە کـە لـەودا بوویـەتی کەوتووەتـە بـەر حاشا لێکردنی و لە دەرەوەی ڕێبازەکان دراونەتە قەڵەم. بۆ وێنـە رودۆلـف رووکێـر گوتوویە کە هیچ کام لەم کەسانە نە لەسەر ئانارشی و نە لەسەر ئانارکۆسـەندیکالیزم کەمترین دزە و کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەبووە کە بۆ باسکردن ببن).[٢٤] تـوێژەرێکی نوێی وەک دەیڤید میلێر ـ یش باوەڕی وایـە کـە سـەندیکالیزم (هـەمیشە یـەکێتی لـە پرەنسیپە بڵاوەکاندا لەباری ئیدئۆلۆژیکی)یەوە بووە و (خۆی ئانارشیستی نـەبوە).[٢٥] بەم حاڵەوە رووکێر لەو کەسانە بوو کە لەگەڵ حـوکم و داوەری دوایـدا نـەبوە. ئـەو ئانارکۆسەندیکالیزمی بە ناوەڕۆکی ئانارشی دەزانی.

کەسایەتییەکی لەباری دیکە بۆ دەرچوون لەم ڕێبـازە، مـارکس ئەسـتیرنرە. ئـەو جـۆرە کـە جـان کـارۆل لـە پێشەکی لەسـەر کتـێبی ئەسـتیرنر بـە نـاوی خـۆی و خاوەنەکەیـەوە باسـکراوە: (موتـالای فیکـری ئانارشـیزم حـەز و مـەیلی بـوە کـە دوژمنییەکی بناغەدار سەبارەت بە فەیلسووفی خۆی نیشان بـدا».[٢٦] کـارۆل لەسـەر ئەو باوەڕەیە کە باشتر ئەوەیە ئەستیرنر بە نیهیلیستێک دابنرێ هەتا ئانارشیـستێک، ئـەو لـە هەڵـسەنگاندنەدا هـەر خـۆی نییـە. کـارۆل درێـژەی پـێدەدا: «لایـەنگری بێکشانەوە و ئاشتی هەڵنەگری ئەستیرنر لـە خۆنیـشاندانی راسـتی مـرۆڤ ئـەو لـە هەموو فەیلسووفانی ئانارشیست، بەتایبەت پرۆدۆن و کروپۆتکین جیا دەکاتەوە».[٢٧] لەم رووەوە هەموو لەگەڵ حکوومەدا هەن. جان کلارک لـە پرسـینەوەی خۆیـدا بـە ناوی خۆخۆازی مارکس ئەستیرنر بەراستی باوەڕی هەیە کە «دزەی ئەسـتیرنر لـە نێو ئانارشیزمی تاکخوازدا هەتا ئێستا بەردەوامە و من لە راستیدا زۆر گومانم هەیـە کە گەشەی کردبێ».[٢٨]

هەروەها گاوس و چایمەن لە پێشەکی لەسـەر لێکۆڵینـەوەیـەک لەمـەڕ ئانارشـی دەڵـێن کـە نـەک هـەر تـەنیا (ئانارکۆسـەندیکالیزم) بەڵـکو (ئانارکۆکاپیتـالیزم)ی تاکخوازیش دەبێ وەلابنرێن. ئەم خاڵـە لـە لێکۆڵینـەوە دوایـی ئـەم جلدە لـە لایـەن

دەیڤید ویکەوە دوویات دەکرێتەوە کە لەسەرئەو باوەڕەیە کە بزاڤی دوایی، واتە ئانارکۆکاپیتالیزمی تاکخواز «بەتەواوی لە دەرەوەی بزاوتی سەرەکی نووسراوە بۆچوونییەکانی ئانارشیستییەوەیە».[29] کەسانێکیش لە بزووتنەوەی ئانارشیستی کۆمۆنیستی، بەتایبەت دەربارەی قرتان و سووتانی ئانارشیستی تاکخوازەکانی وەک راتبارد وەک کۆسکەوتە ئازیەتبار بوون. بێگومان کەسەرهێنەرە کە مرۆڤ خۆی بە هاوبەشی ئەم دۆژە دژانە بزانێ. رواڵەتەن راتبارد نیگەرانی ئەم کێشە نییە و هێشتا خۆی بە هۆگری ئانارشیزمی ئازادیخوازی تاکخواز دەزانێ.

ئەگەر بە چاویلکەی نزیکبینتر سەرنجی بزاڤی ئانارشیستی بدەین، ئەم پرۆژە دەتوانێ تا هەتایە دوویات بێتەوە. زۆر لە ئانارشیستە کۆمۆنیستەکان و کۆخواز بێزاری خویان سەبارەت بە ئانارشیزمی قەراردادخوازی پرۆدۆن دەربڕیوە و باوەڕیان وایە کە ئەو «زەینی کاسبکارانە»ی کە نیشان دابوو.[30] هەروەها سەبارەت بە روانگەی بایەخی کاری ئەو، بۆچوونی ئەو لەمەڕ یەکسانی ئاڵوگۆڕی داڕژاو لەسەر بنەمای بازاڕ، روانگەی باوکسالارانەی ئەو لەمەڕ بنەماڵە، کۆششی ئەو بۆ ناوزەدبوونی نوێنەرایەتی پەرلەمان، پشتگری ئەو لە لایەنەکان و کۆیلەداری لە شەڕی ناوخۆی ئەمریکا و باوەڕی دوایی ئەو لەمەڕ دەوری دەولەتی فیدراڵ هەستیان بە ناڕەحەتی دەکرد. هەر بەو جۆرە توێژەرانی دواکەوتووی ئانارشیست، لەوانە ورنۆن ریچاردز و دانیەل گرن، کۆخوازی باکونیان پێشتر لەگەڵ بڕیاری مارکسیستی بە بەرامبەرخواز زانیوە هەتا لەگەڵ ئانارشیزم.

لە کۆتاییدا جێی ئاماژەیە کە ڕێبازە جۆراوجۆرەکانی ئانارشیزم، لەیەک سەردەمدا بوونی بووە لەگەڵ یەکدا دەستتێوەردانیان کردووە و پێوەندییەکی زۆر پێچڕاوەیان هەم لەگەڵ مارکسیزم و هەم لەگەڵ لیبرالیزمدا بووە و هەیانە. ئێمە لەمەڕ ئەم خاڵە جیاوازانە لێدوان ناکەین، بەڵکو لە ناواخنی لێدوانەکانی دیکە ئاماژەیان پێدەکەین.[32] ئێستا لەگەڵ پلانی ڕێبازە ئانارشیستەکان هێندێ لە پرەنسیپی ئەندێشەی ئانارشیستی لە چاوی ڕێبازە جۆراوجۆرەکانی لێپرسینەوە دەکەین.

## سروشتی مرۆڤ

لەمەڕ بابەتی سروشتی مرۆڤ سێ خاڵی سەرەکی شیاوی باس لە ئاراادا هەیە. سەرەتا ئەمە کە ئانارشیستەکان هەموویان پێداگرانە لەسەر تاقانە واتایەک لە سروشتی مرۆڤ تەئکیدیان نەکردووە. شایەدگەلێکی زۆر جیاوازی زۆر جیاوازی نێوان بیرمەندان و ڕێبازە ئانارشیستەکان لە ئارادا هەن. دووەم، بۆچوونەکانی ئەوان لەمەڕ سروشتی مرۆڤ هەمیشە نیشاندەری گەشبینی و پەرەسەندن نییە. زۆر جار ئانارکراون کە باوەڕی نابەجێ و ناگەشبینانەیان هەیە، بەڵام هەر ئەو جۆرە کە ڕاتبارد گوتوویە: «دانی پێدا دەنێم کە لە بنەڕەتی ئەم تۆمەتە ناگەم... من لەگەڵ زۆربەی ئاگالێبووان و شاهیدان لەسەر ئەم باوەڕەین کە جۆری مرۆڤ تێکەڵاوێکە لە باشە و خراپە، لە بۆچوونە هەرەوەز و تاوانەکانە».[٣٣] لە سەرەتای سەدەی ئێستە ماڵاتستای ئانارشیست کۆمۆنیست ڕاست هەر ئەم خاڵەی لەمەڕ تاوانهەڵگربوونی سروشتی مرۆڤ وەبیری هێنایەوە.[٣٤] سێیەم، ئانارشیستەکان بە گشتی، پێویستانە واتای نەگۆڕ و سابتیان لە سروشتی مرۆڤ نییە. لە بۆچوونی نووسەرانێکی وەک کروپۆتکین و ئەلیزە ڕوکلۆ، بوونەوەری مرۆڤ لە بابەتی بیولۆژیکی هەڵگری تەکامولن. هەم کروپۆتکین و هەم ڕوکلۆ لە بابەتی پسپۆڕی و هۆگری خۆیان جوغرافیازان و سروشتناس بوون. بەیانەکانی ئەوان دەربارەی کردەوەی مرۆڤ لە کۆتایدا دارڕژاو لەسەر بنەمای زانستییە سروشتییەکان بوو. ئانارشیستەکانی دی، چ پێشکەوتوو و چ دواکەوتوو، باوەڕیان بوو کە مرۆڤەکان پلە بە پلە لەگەڵ پەروەردە و جۆربەجۆری عەقڵ دەگۆڕێن. لەگەڵ گەشەی مادەکان و زۆربوونی کتێبەکانی بەردەست، کۆمەڵگەی مرۆڤ لە ئاخریدا بەرەو پێشکەوت دەڕوا. گودوین ئەم شێوەی لە دەلاقە و بینینی سەردەمی ڕۆشنبیریدا دەدی، لە حاڵێکدا کە نووسەرانی وەک باکونین و بوکچین ئەم ناوەڕۆکەیان پێشتر لەگەڵ ڕوانگەی هێگڵی دەربارەی گەشەی عەقڵ پێکەوەیان گرێ دەدان.

لەگەڵ ئەم هەمووە، دۆزی سروشتی مرۆڤ کەم و زۆر ناوەند و کاکڵی ئەندێشەی ئانارشیستی پێکدەهێنا. جیاوازی ڕوانگەکان لە بزاڤی ئانارشیستیدا

پێوەندە بە خاڵی دەسپێکی بزاوتی ئەوانەوە. ئەمانە هەر تەنیا دەکرێ بە جیاوازییە تاکەکان و کۆمەڵایەتییەوە ببەسرێتەوە. بینینێکی بوونەوەرانی مرۆڤ هۆکارانی ئازاد و خودموختار لە چوارچێوەی پڕۆژەگەلێکی تایبەت ژیانی خۆی لە دەرەوەی کۆمەڵگە دەتوانێ؛ روانگەیەکی دیکەی گەشە و جۆراوجۆری مرۆڤەکان لە دەروونی کۆمەڵگە و بەدەستهێنانی ئازادی و تاکی دەروونی ئەو جێبەجێ دەبێ. ئەمە خاڵی ئاشکرای بۆچوونە جیاوازەکان و بەربڵاوی دەروونی ئەندێشەی ئانارشیستە.

یەکێک لە بەناوبانگترینی مەیلە کۆمەڵایەتییەکانی دەکرێ لە ئاسار کروپۆتکیندا بە دەست بێ، ئەو پلەبەرزەی واتای کێشە لە تەکامولدا رەت دەکاتەوە. ئەو بە موتالای کردەوەی بوونەوەر و جەماوەری سەرەتایی لە سیبری، لەژێر کاریگەری کتێبی کارل کسلری بوونەوەرناس بەم ئەنجامە گەیشت کە بوونەوەران بەتایبەت بوونەوەری مرۆڤ، هەر تەنیا بە هەرەوەز و هاوکاری کۆمەڵایەتی دەگەشێتەوە و بەرەوپێش دەچێ. کروپۆتکین لەمەڕ دەرەنجامی بینینەکانی لە زۆربەی جۆرەکانی بوونەوەریدا دەنووسێ: «لە هەموو ئەم بەستێنانەی ژیانی بوونەوەری کە لە پێش چاوی من رووی دەدا، یارمەتی بەرامبەر و پشتگری بەرامبەر لە وەها رادەیەکدا دەمبینی کە گومان دەکرد گرنگترین دەور لە پاراستنی حەیات و پاراستنی هەر کام لە جۆرەکان و بە کەماڵ گەینی ئەوانی بە ئەستووەیە».[٢٥] یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی و یارمەتی بەرامبەر لەراستیدا مافی بوونەوەری مرۆڤە. ئەمە بەشێک لە یاسای سروشتی مرۆڤە. کروپۆتکین لەمەڕ هەرەوەز، سیفاتی داهێنەر و شێوەدۆستانەی سروشتی مرۆڤ لە ناخەوە گەشبین بوو. سروشت مامۆستای ئەخلاق بوو، کێشەیەک کە کروپۆتکین لە کتێبێکدا لەمەڕ زانستی ئەخلاقەوە بە پرسینەوە سەرقاڵ بوو، کروپۆتکین حاشای لە پرەنسیپی خەبات و کێشە نەدەکرد. بەڵام باوەڕی بوو موریدان و لایەنگرانی داروین رێگای شات و شوونیان پێواوە. گەوەزنە زەردەکان، پڵنگەکان. مێشهەنگوین، چوالوەکان (چالەکە) هەموو ئەوانە شاهیدی سەلماندنی پێشمەرجی یارمەتی بەرامبەرن. کروپۆتکین بە گرێ دانی ئەم پێشمەرجە لەگەڵ

ڕوانگەی سیاسی بە شێوەی ڕاستی وەبیر دێنێتەوە کە: «مێروولەکان و مۆریانەکان ـە «جەنگی هاوژی» چاوپۆشیان کردووە و لەم بارەوە باشترن».[٣٦]

بابەتی لێدوانی سەرەکی ئەمە بوو کە لە باری بیولۆژیکییەوە باسترین بوونەوەران ئەوانەن کە زۆرترین هەرەوەزیان بە یەکەوە هەیە. سروشتی چنگ و ـدانی سووری نییە. تەنانەت دەربارەی کۆمەڵگەی سەرەتایی مرۆڤ ئەم کردەوە ڕاستە.[٣٧] کروپۆتکین دەڵێ بۆ خەڵکانی سەرەتایی نامومکینە کە ئەگەر ئێمە هەرەوەز و هاوکاری ئەوان بەکاربێنن. تاکخوازی لە ئێمە بگەن. بۆ خەڵکانی سەرەتایی «قوربانی کردنی خۆیان لە ڕێی بەرژەوەندی کەلان [یان جەماوەری خۆی] کارێکی ئاسایی و ڕۆژانەیە».[٣٨] کروپۆتکین لە بەشەکانی دواتری کتێبی یارمەتی بەرامبەر شوێنی پێی ئەم یەکگرتوویەی لە جەماوەری گوندی، شارییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست و مەدەنییەکان هەڵگرتووە. بە بۆچوونی کروپۆتکین، ژیانی ڕکەبەرایەتی و کێشەیی لە دەوڵەت، کارێکە کە لە باری مێژووییەوە جۆرێک لادان و ناهەمواریە. هاوکاری و هەرەوەز و یارمەتی بەرامبەر هێشتاش بەپێچەوانەی بوونی دەوڵەت بەردەوامە.

کروپۆتکین باوەری گەشبینانەی بە جەماوەری مرۆڤ بوو، ئەم مامەڵە بووە هۆ کە تەنانەت کۆمەڵێک لە هاوڕێیانی ئانارشیست کۆمۆنیست، تۆمەتی گەوجیان لەودا.[٣٩] باوەری ئەو بە سروشت هێشتا لە نووسراوەکانی مورای بوکچین، ئانارشیست کۆمۆنیستی هاوچەرخ، ڕەنگیداوەتەوە کە دەونووسێ: ئیکۆلۆژی بە بوونی پلەبەندی لە ئاستی ئیکۆسیستم باوەڕێکی نییە. نە بوونەوەران شایانی هەیە و نە مێروولەکان خاوەنی چینایەتی پەستن... بە کردەوە هەموو بوونەوەرێک کە ژیان دەکەم... لە پاراستنی هاوکێش بوون و یەکپارچەیی گشتی [کۆمەڵگە خۆی] دەوری هاوشان و هاوپلەیان هەیە».[٤٠] لەبەر ئەمە، بە بۆچوونی بوکچین، سروشت زاتەن تێکەڵاو و چەواشەیە. ئەم باوەڕە بە چەواشەی (سروشتی) وێکچوونێکی لەگەڵ بۆچوونی ئەلێکساندێر بەرکمەن دا هەیە کە تەواو منداڵان (مەیلی زاتی و غەریزیان بە تاکی و سەربەخۆیی، بە ناسازگاری دەرکەوتن لە نافەرمانی ئاشکرا

یان شاراوە لە خۆنیشان دەدەن). لەبەر ئەمە، دەکرێ ئەوانە بە شێوەی سروشتی بە ئانارشیست بدەینە قەڵەم.[٤١]

هەموو ئانارشیستەکان لەم باوەڕە بە سروشت هاوبەش نەبوون. بۆ وێنە باکونین لە دژی پێکهێنانی وەکو مودێلەکانی مەنتقی و عەقلانی بەرەو ئانارشی حەزی لێ نەدەکرد. بە بۆچوونی ئەم، مێژوو وەک سروشت پانتای بەربلاو رووداوە نامەنتقەکان و نامیزان و ناسیستماتیک بوو و لەبەر هەرەشەی تەقینەوە کوت و پڕەکان و چاوەڕوان لێنەکراوی چالاکی غەریزی و خۆرسکدا بوو.[٤٢] بەم جۆرە باکونین لە (راپەڕینی ژیان دژی زانست) دەدوا. یاساکان و میتۆدەکان قەزاوقەدەر بەرەو لای غەریزە و بزر بوونی شعوور دەکەوتنە بەر هێرشی رووخانەوە. غەریزەکانی گوندی و نەخوێندەوار زۆرتر لە سیستمە فیکرییەکانی کەسگەلی خوێندەوار جێی باوەڕ بوون. لەم خەڵکەدا شۆڕش بە شێوەی غەریزی بوونی بوو. بە وتەی ئەو: (سەرشناسترین هەڵکەوتوو بەتایبەت بۆ خەڵک هیچ کارێکیان نەکردووە یان کارگەلێکی زۆر کەمیان کردوە... ژیانی خەڵک، گۆڕانی خەڵک، بەرەوپێشچوونی خەڵک، بەتایبەت دەگەڕاوە بۆ خەڵک بۆ خۆی.[٤٣]

ئەگەر ئەم پرسیارە کە ئایا ژۆرژ سورل وتەبێژی، ئانارکۆسەندیکالیزم بوو یان نەبوو، وەلابنێین. ئەم باوەڕە بە غەریزە بەتایبەت تایبەتمەندییەکانی بڕیاری گشتی سورل لە کتێبی تێڕامان لەمەڕ دەمارگرژیش بوو. بە بۆچوونی سورل ئەمە گوندیەکان نەبوون، کە ئەم وەلامە غەریزیەییان لە خۆ دەرهێنابێ، بەڵکو پێچەوانە، ئەم غەریزە لە پرۆلیتاریای پیشەسازیدا بوونی بوو. غەریزە دەبوو بە هۆی دیرۆکەکانی وەک مانگرتنی گشتییەوە شوێنی بۆ بکرێتەوە و رێنوێنی بکرێ. دەروونناسانی غەریزە کە بەسەر ئەندێشەی سورلدا زاڵبوو ریشەگەلی بۆچوونی قووڵتر لە باکونین بوو کە بریتی بوون لە ناسەوەری گۆستاو لۆبۆن، ئێدوارد فۆن هارتمان، فریدریش نیچە و هێنری بێرگسۆن.[٤٤] بێجگەلەوە، دۆخی حەماسی زەینی ئەم پرۆلیتاریانە ئاشکرا دژایەتی لەگەڵ ئەو شتە بوو کە باکونین تێیدەگەی.[٤٥]

کاتێک لە روانگەی ئانارشیستی تاکخوازیەوە دەڕوانینە سروشتی مرۆڤ
ـەربلاوییەکی زۆرتر دێتەبەرچاو. ویلیام گودوین خۆی بە تاکخواز دەزانی. ئەو
ـوەری بوو کە سروشتی بوونەوەری مرۆڤ لە پێگەی ئەواندا فۆرم دەگرێ و
ـێزی دەکرێ. بە وتەیەکیتر، مرۆڤەکان بوونەوەرێکی کاریگەر و بۆ رامکردن
ـدەبەن. ئەوان هەروەها ئامادەیی عەقلانیان هەیە. روانگەیەکی ئەخلاقی تایبەت کە
ـەو باوەڕی پێی بوو فایدەباوەڕی بوو. بەختەوەری راستەقینە لەسەر تاکە
جوراوجۆرەکانی ئێمە پایەدارە. تاک بە تەنیا دەتوانێ داوەری سوودمەندی خۆی
ی. ئەم خاڵە گودوینی بەم باوەڕە گەیاند کە هەموو شێوەی چالاکی هەرەوەزی و
ـاوکارانە دەبێ بە گومانەوە سەیری بکرێ. ئەو جۆرە کە خۆی دەڵێ: «هەر شتێک
هەمیشە لەگەڵ واژەی هەرەوەز لێی تێدەگەین تا رادەیەک شەڕ و شەیتانە».[46] هەر
شتێک کە لەمپەری بیرکردنەوەی لەمەڕ خۆی ببێ ـ کاری گشتی، خۆراکی گشتی،
ژن و مێردایەتی و تەنانەت پرۆژەکانی شانۆیی و مۆسیقایی ـ دەتوانێ هێرشێک بێ
بۆ سەر تاک. مرۆڤەکان دەبێ بتوانن بەبێ بوونی ئەم و ئەو کارەکانی خۆیان
بەرنبەرێوە و خۆڕاگری لە بەرامبەر گرفتەکاندا لەخۆ نیشاندەن. ئەو جۆرە کە
گودوین دەڵێ: «تەواوترین مرۆڤ کەسێکە کە بوونی کومەڵگە بە لایەوە
زەروورەتی ژیان نەبێ بەڵکو شتێکی جوان بێبەلایەوە.[47]

هەڵوێستی ناوبراو وێچوونێکی زۆری لەگەڵ هەڵوێستی موڕای تاکخوازی
سەدەی بیستەم هەیە، بێجگەلەوەی کە راتبارد باوەڕی بە روانگەی مافە
سروشتەکان بوو و قازانج باوەڕی رەتدەکردەوە. بە بۆچوونی راتبارد
بوونەوەری مرۆڤ سروشتی تایبەتی و دیاریکراویان هەیە. ئێمە بوونەوەرێکی
خوخوازی زۆرخوازین کە دەتوانین تێرامانمان بێ. ئێمە بە شێوەی تاکەکان هەست
دەکەین بیر دەکەینەوە و کردەوە لە خۆدەنوێنین و دەبێ ئەم ئازادییەمان بێ کە
فێر ببین و توانایەکانی خۆمان گەشەدار و بەرینکەینەوە. ئێمە لە بناغەوە خاوەنی
خۆمانین. دەتوانین یارمەتی ئەم و ئەو بدەین. بەڵام ئەمە پالاوتنی تاکە کە ئەنجامی
دەدەین. راتبارد ئەمە بە (پرەنسیپی بە خاوەنی خۆ) ناودێر دەکا. تاکەکان

پرەنسیپی خاوەنی خۆیان قبوولە، کە مافی بە خاوەن بوون لەسەر کەرەستە بەشێک لەوەیە و بەم جۆرە لە لایەن بازاڕی ئازادەوە لەگەڵ ئەم و ئەو پێوەندی دەگرن.

مارکس ئەستیرنر تاکخوازی دیکە، بێگومان پرەنسیپی بە خاوەن بوونی خۆی قبوول بوو، بەلام بۆچوونی ئەو لە واژەی Eigenheit (تایبەتمەندی) شتگەلێکی زۆرتر لە خۆ دەگرێ. ئەستیرنر جۆرێک بە توندوتیژییەوە بەڵگەی دەهێناوە کە تەنانەت ناسینی مافی خاوەندارێتی تایبەتی ئەم و ئەو، کردەوە و کرداری بەرامبەر داڕژاو لەسەر بنەمای گرێبەست، بایەخی دەوری بازار، لە بڕوای ئەودا دەستکردێکی بێخەوش بوون کە لەسەرسەری تاک هەڵدرابوون. خاوەنی (خۆ تایبەت بە تاک تەنانەت لەپێش ئازادییەوە بوو. مرۆڤی ئەستیرنر بوونەوەرێکی بەتەواوی بەسراوەیە کە جیهان و بایەخەکانی خۆی دروست دەکا. ئەمە ئەوپەری توندوتیژی تاکخوازی ئانارشیستییە. تەنانەت دۆستایەتی تاک، خەڵکخوازی بێخەوشیش کردەوەیەکی تەواو خۆخوازانە دەدرێتە قەڵەم. ئەم باوەڕانە (خۆخوازی دەروونناسی) ناولێنراوە. ریشەی ئەم باوەڕانە لە کێشە فیکرییە هەرە جیاوازەکان لە سنووری مەکتەبی هێگل بە شێوەیەکی راستتر، لە رەخنەی ئەستیرنر لە هێندێ رفێقی مەکتەبی «هێگلەوە تازەپێگەیوەکان»ی ئەو دایە. هەر تاکێک خۆی قازی و داوەری یەکێک لە راستییەکانە. لەم شانۆیەدا هیچ شتێک جگە لە پایەبڵندی هەستیناسی هەر (خۆی) بایەخی نییە.

ئەو جۆرە کە وێنەکانی سەرەوە دەبینرێ. هیچ باوەڕێکی تیشکدار لەمەڕ سروشتی مرۆڤ لە رێبازە ئانارشیزمدا نایەتە بەرچاو. لە راستیدا ئانارشی زۆرتر لەژێر کارتێکراوی باوەڕە ئیدئۆلۆژییەکانی دیکە کە خۆی زۆر جیاوازن. کاردانەوەی هەیە. ئەم خاڵە ئێمە بەرەو لێدوان لەمەڕ روانگەی سیاسی ئانارشیستی هاندەدا کە پێچراوەترە.

## ڕەخنە لە دەوڵەت

ئەگەر ناوەڕۆکێکی یەک لایەنە بێ کە بێپسانەوە لە لێدوانەکانی بەسراوە بە ئانارشیزم دووپات بێتەوە هەر ئەو ڕەخنە و ڕەتکردنەوەی «دەوڵەت» و جارجاریش «حکوومەت» و «دەسەڵات»ە. مەسەلەیەکی زۆر لەم ڕەت و حاشالێکردنەدا بوونیان هەیە. یەکەم لە دەستدانێکی ڕۆشن لە نووسراوەکانی ئانارشیستی دەربارەی چی تۆ مانای ئەم واژەیە. دەرەنجام، تێگەیینی ئەمە کە چ شتێک بۆ ڕەتکردن و حاشا دەبێ، دژوارە. دووەم، ئانارشیستەکان زۆرجار لەمەڕ ئەمەکە واتاگەلێکی وەک حکوومەت، دەسەلات و دەوڵەت، ئایا هاوکێشییەکن یان واتاگەلی جیاوازانە، لێکدانەوەکان زۆر جیاوازیان هەیە. بە واتایەکی دیکە، ئەم پرسیارە لە ئارا دایە کە ئایا لە سیستەمی ئانارشیدا دەکرێ دەسەڵات و توانا بەبێ بوونی دەوڵەت یان حکوومەت بپارێزرێ یان نا؟ سێیەم، بوارە ڕەواکان یان میتۆدێک کە لەسەر بنەمای ئەوان ئانارشیستەکان هێرش دەبەنە دەوڵەت و بە پاساودانەوە بریکارێک بۆ ئەو دادەنێن بە جۆرێکی سەرنجڕاکێش لە سەرچاوەیەکی ئەخلاقی جۆراوجۆرەوە هەڵدەقوڵێ. ڕوانگەی مافە سروشتییەکانی جان لاک، قازانج باوەڕی پڕەنسیپی، خۆخوازی دەروونناسی، مەکتەبی نوێی کانتی، هێگلخوازی، ڕوانگەی تەکامول و پڕەنسیپی مەسیحییەت، هەموویان بەناوبانگترین سەرچاوەی پاکانە پێکدێنن.[٤٩] ئەم جۆراوجۆرییەی پاکانەی ئەخلاقی، ڕێنوێنە ڕێکوپێکەکان و مەنتق دژوار دەکا. من سەرسەری بە پرسینەوەی واتای ئەم واژانەوە خەریک دەبم و پاشان بەم پرسیارە وەڵام دەدەمەوە کە بۆچی دەوڵەت ڕەتکراوەتەوە، دەگەڕێمەوە سەری.

سەیر لێرە دایە کە ئانارشیستەکان لەمەڕ ئەمە کە واتای دەوڵەت چیە زۆر کەم شتیان نووسیوە. ئەوان هەمیشە پێکهاتەکانی بناغەدانەری یاسا، بەڕێوەبەرایەتی، داد، ئیداری بوروکراتیک و جارجاریش پۆلیس، هێزە چەکدارەکان، لە هێندێ شوێندا دین و فێرکردن و پەروەردە یان لە زێهندا هەیە. هێندێکیان لەسەر پێکهاتەی کردەوەی زۆر تەئکید دەکەن، برێکی دیکەیان لەسەر سیستەمی دەروونناسی بیر دەکەنەوە.[٥٠] هیچ کام لەم پێوارانە بە جیاوازییە وردبینییەکانی سوننەتی دەوڵەت تایبەتیان نییە. بێجگە

لەمە، برێک نووسراوەگەلی پڕۆدۆن رواڵەتەن حکوومەت، دەوڵەت، حاکمیەت، یاسا و مەرجەعییەت و دەسەڵات بەکردەوە هەموویان هاوکێش لەگەڵ یەک دەبینن. پڕۆدۆن لە قرتاندنی دەوڵەت بە شێوەی قرتاندنی هەم حکوومەت و هەم دەسـەڵات دەدوێ.[٥١]
لە لایەکی دیکەوە، ئانارشیستی ئەمریکاییی ئالبێرت جی نووک لە کتێبی ـوژمنی ئێمـە دەوڵەت، بە تیژبینی لەنێوان حکوومـەت و دەوڵـەتدا جیـاوازی دادەنـێ. دەوڵـەت بـە دەستێوەردان بۆ دابینکردنی مافە سروشتیەکانی ژیان، ئازادی و خاوەنـداری بـوو.[٥٢]
دەوڵەت هەمیشە پێکهاتەیەکی سەرکوتگەر و لـە راسـتیدا رێکخراوەیـەکی سـزادانە. راتبارد هەم ئەم خەتتـە رێنوێنییـەی گرتووەتەبـەر و ماڵـیات سـەندنی پێچراوەتـرین شێوەی دزی دەداتە قەڵەم.[٥٣]
لەبەر ئەمە، کـوێی کـاری دەوڵـەت و حکوومـەت گـرفتی هەیـە؟ لـەم بارەشـەوە ئانارشیستەکان وەڵام گـەلێکی جۆاروجـۆر دەدەنـەوە. بەشـێوەی گـشتی، دەوڵـەت رێکخراوێکـی دەسـکرد و بێگانـە دەدرێتـە قەڵـەم کـە لـە خراپتـرین لایـەنی خـۆی. رێکخراوەی سزدان و رێگرییە. ئـەو جـۆرە کـە ئەلکساندێر هرتـزن بـە تونـدوتیژی گوتوویە، دەوڵەتی «چەنگیزخانی لەگەڵ تەلگرافە». ئەگەرچی ئەم رۆژانە باشـترە لـە رایانە بدوێین. هەموو رێبازەکانی ئانارشـی زۆر و کـەم هـەر ئـەم روانگـەیان هەیـە دەوڵەت جیلوەیەکی گوشار و دەمارگرژیە. لەباری مێژووییەوە، دەوڵەتەکان لەسـەر بنەمای زاڵبوونی نیزامییەوە فۆرمیان گرتووە و دروست کراون. سەرچاوەی ئـەوان هەمیشە سامانی بە تالان هێنرا و گیراوەیێکە کە فۆرمی یاسایان داوەتێ. لەبەر ئەمـە بوونی دەوڵەت هەڵگری حاشای تەواوی ئازادییە. ئەو جۆرە کـە بـاکونین گوتوویـە «دەوڵەتەکان ناتوانن هیچ بوارێکی دیکە جگە لە بە دیل گرتنی خەڵکانێک بدۆزنەوە کـە بنەما و ئامانجی ئەوان پێکدێنن».[٥٤] بێجگەلەمە، لەوەی کە دەوڵەتەکان لەسەر بنـەمای سلسلەمەراتب و زاڵبوون فۆرمیان گرتووە، هەروەها پێویستانە هەڵگری حاشا کـردنی لە یەکسانی مرۆڤەکانن. زۆربەی ئانارشیـستەکان دەڵـێن کـە پێکهاتـەی دەوڵـەت لـە لایەن چین یان کەمی خوێندکاران، رۆحانیان و رۆشنبیرانەوە پشتگری لێکراوە. ئـەم

حوکمە یان داوەرییە، بڕێک لە ئانارشیستەکانی پڕ کردەوە لە باوەڕی دژایەتی کردن
ەگەڵ ڕۆشنبیری.

ئانارشیستە تاکخوازەکان، لە پلەی یەکەمدا سەرنجیان داوەتە حاشا کردن لە
عافەکان و ئازادییە تاکەکان بەتایبەت ئازادییەکانی بازاڕ و خاوەنداری لە لایەن
دەوڵەتەوە. ئەم خاڵە بەتایبەت دەربارەی زۆر لە تاکخوازە ئەمریکاییەکانەوە خۆ
دەنوێنێ. ئانارشیستە تاکخوازەکان هەموویان بە هەر شێوەیەکی وتە لەمەڕ
بنەماکانی کۆ و شەریکایەتی ڕەشبینن و دەوڵەت بە شەڕخوازترینی ئەم بنەما کۆیانە
دەزانن. ئەو جۆرە کە دیمان بە بۆچوونی گودوین، ئەستیرنر و ڕاتبارد، هەر چەشنە
کردەوەی هەرەوەزی و کۆ لەڕاستیدا هەڵگری باوەڕ نین و بۆ متمانە نابن. بە
بۆچوونی ئەستیرنر، بە بۆنەی لە پێشبوونی هەستیناسی کە ئەو بۆ (خۆی) گرتووەتە
بەرچاو، کۆمەڵگە بە شێوەیەکی حاشاهەڵنەگر (تارمایەکی ترسناک)ە.[55] گودوین
هەرەوەز و هاوکاری بەپێی قازانجەباوەڕی تاکخوازانەی خۆی ڕەتی دەکردەوە.
ڕاتباردیش بەپێی مافە سروشتییەکان، سەرقاڵی حاشای لە بوونی کۆمەڵگە بوو و
دەیگوت: «هیچ هەستییەکی بەرچاو بە ناوی کۆمەڵگە بوونی نییە، هەر تەنیا تاکەکان
لە کردەوەی بەرامبەر لەگەڵ یەکتر واقعییەتیان هەیە».[56] مرۆڤەکان لەڕاستیدا و لەبەر
جەوهەری خۆیان خۆخوازن. تەنیا کۆمەڵگە مومکینە بەرچەسپی پڕبەپێستی بۆ
تاکەکان لە حاڵی کردەوەی دوولایەنە بێ.

ئانارشیستە کۆخوازەکان، ڕووبەڕووخواز و کۆمۆنیستیش لەمەڕ ئەم بابەتە
ڕوانگە نائاساییەکانی خۆیان هەیە. پرۆدۆن و باکونین بوونی دەوڵەت بە قۆناخێکی
گرژ، بەڵام تێپەڕ لە بەدیهێنانی کۆمەڵگەیان دەزانی. بە بۆچوونی باکونین
ئەڵمانییەکان تاقانە دەوڵەتخوازانی ڕاستەقینەی ئەورووپا بوون. ئەم لەم بابەتەوە
ڕاستەوخۆی، هەرچەند پۆی تەنزی پێوە بوو، نێوان مارکس و بیسمارکی پێکەوە
بەرقەرار دەکرد. هەروەها ئەو بە هۆگری تەواوەوە بۆ فیدراڵیزمی ئەمریکایی
دەڕوانی و لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە بریتانیا بەڕاستی بە هیچ جۆرێک خاوەنی
سوننەتێکی دەوڵەتی نەبووە.[57]

کتێبی کروپۆتکین (و لەم سەدەدا کتێبی بوکچین) لە کتـێبی بـاکونین بـەربلاوتر و گەشبینانەترە. بە بۆچوونی کروپۆتکین، دەوڵەت خۆی لە خۆیدا تاکـەکان لاواز و لـە ناو نابا، بەڵکو زۆرتر بۆ بێهێزی و لە ناو بردنی جەماوەری سروشتی، هاوئاهـەنگ و ئۆرگانیکی تێدەکۆشێ کە تاکەکان لـە دەروونی ئەوانـدا گۆڕانکاریـان بەسـەردا بـێ بوکچین ئەم جەماوەرە سروشتییەی (گرووپی یـەکگرتوو) نـاودێر دەکـا. کروپـۆتکین وێنەی تەکامولی لە کۆمەڵگادا دەبینێ و دەڵێ کە «لە هـەر جێیەکـەوە جـۆری مـرۆڤ رێی تێکەوتووە کە بریتین لە کۆمەڵگەی هۆز، گوندی، جەماوەر، شارییە ئازادەکـان و دەوڵەت کە گۆڕان و تەکامولی هەرکام لەوانە لە قۆناغی پێشوو تێپـەڕیوە.[٥٨] دەوڵـەت بوونی هەیە هەتا هەمووی شێوەی سروشتی و یەکێتی فیدراتیڤ لەناو بەرێ. بە رای کروپۆتکین ئەم تەقینەوە، سیاسەت و هێڵی کـرداری پاپـەکان، پاشـاکانی کێـشوەری ئەورووپا، پەرلەمانکان و تەنانەت کۆنڤانـسیۆنی شۆڕشـی فەڕانـسا بـووە. ئەگـەرچی کروپۆتکین باوەڕی بوو کە لەژێر ئـەم کۆنترۆڵـە پـشووبڕەی دەوڵـەتە و، هەنووکـە یارمەتی بەرامبەر بە شێوەی «ئەنجوومەنی دۆستایەتی» زینوە.[٥٩] ئـەرکی ئانارشـی ئەمە بوو کە ئاوەدان کردنەوەی ئەم ئەنجوومەنە سروشتیانە هان بدا.

گرنگە پێبزانین کە لە بۆچـوونی زۆرینـەی ئانارشیـستەکاندا هـیچ شـتێک تۆڵـەی دەوڵەت ناکاتەوە. پرۆدۆن و باکونین دەربارەی ئەم خاڵە تایبەتین.[٦٠] دەکرێ بـوترێ هەموو رێبازەکانی ئانارشـی سـوننەتی مەشـرووتەی لیـبرالی، دەوڵـەتی ژاکـوبنی. دێموکراسی پەرلەمانی لیبرالی و بەتایبەت دەوڵەتی سۆسیالیستیان بەگومان لێکراو زانیوە. لەم رووەوە، باکونین خـووی وابـوو کـە دەوڵـەتی مارکسیـستی بـە «درۆی گەورەی سـەدە ـ بوروکراسـی سـوور» ناوبنـێ.[٦١] کروپـۆتکینیش هـەر بـەم قـین و بێزارییەوە گوتوویە: (رادیکاڵی مودێرن کۆکارێک، لایەنگرێکی دەوڵـەت، ژاکوبنێـک و سۆسیالیستییە کە لەسەر جێ پێکانی خۆیان هەنگاو هەڵدەگرن.[٦٢]

## ئازادی و یەکسانی

بە بۆچوونی زۆربەی ئانارشیستەکان هۆی بێزاری لە دەوڵەت ئەوەیە کە دەوڵەت ڕیشەی هەموو زۆرەکان و گوشارەکانە. بە وتەی بەرکەمن: «ئازادی واتە ژیانی بێ زۆر و گوشار». پێویستی ئانارشیستی بە بایەخی ئازادی لە بنەڕەتدا هەڵگری ڕەتکردنەوەی دەوڵەت بوو.[٦٣] لەم ڕوانگەوە، ئازادی ئامانجی یەکەمی فەلسەفە نەبوو، بەڵکو ئەو جۆرە کە رووکێر گوتوویە، «ئیمکانێکی دیاریکراوی حەیاتی بۆ هەر مرۆڤێک» بوو.[٦٤]

لەم خاڵە، دەبێ ئەگەر بکرێ کە سەرجەم ئانارشیستەکان بایەخی ئازادیان بە ئەستۆ گرتووە. لێرەدا دوو گرفت و مەسەلە پێش دێ کە یەک لە یەک پێچراوەترن.[٦٥] پێشتر مەسەلە ئاسانەکەیان دەگرینە بەرچاو: ئاشکرا نییە کە ئایا هەموو ئانارشیستەکان بۆ ئازادی بایەخ دان یان سەربەخۆیەکی زووتر لە هەموو بایەخەکان بوە یان نا. ئەستیرنر بۆ وێنە خاوەنداری یان (تایبەتی) یان Eigenheit سەرکەوتووتر لە ئازادی دەزانی. بە وتەیەکی دیکە، ئازادی هەمیشە پێڕەوی بایەخی (خۆ)یەتی. هەروەها بە بۆچوونی ئەستیرنر، زۆرتر بایەخی گریمانە و ناوەڕۆکی ئازادی شتێکی زیاتر لە هەودایەکی گومانی ناڕەسەن و (ئازادی، تووڕەیی تۆ دژی هەر چی لە تۆ نییە، دەیەژێنێ؛ خۆخوازی تۆ بە چێژ بردن لە زیاتر لە خۆت بانگهێشت دەکا؛ ئازادی ئارەزوو و حەسرەت، سکالای ڕۆمانتیک و هیوای مەسیحییە و هەرواش دەمێنێتەوە... خاوەنداری و تایبەتی ڕاستیە».[٦٦] تەنانەت کاتێک کە ئەستیرنر لەبارەی ئازادییەوە دەدوێ زۆر روون نییە کە ئایا ئەو هەڵوێستی پۆزەتیڤی قبووڵە یان هەڵوێستی نیگەتیڤی. جان لارک نووسەری ئانارشیستی ئەمریکایی دەڵێ: «ئانارشیزم یەکێک لە ڕوانگە مەزنەکانی سیاسییە کە دەیهەوێ بایەخە پۆزەتیڤ نیگەتیڤیەکانی ئازادی لە ڕوانگەی تاک و کۆ لە ئازادی مرۆڤدا بگونجێنێ و تێکەڵیان بکا».[٦٧]

بەم حاڵەوە، بێگومان زۆرینەی ئانارشیستەکان لەگەڵ تێکەڵ بوون تێکهەڵشیلانە دانین. ئەم خاڵە ئێمە بەرەو مەسەلەی دووەم ڕێنوێنی دەبا، واتە وەکو هێنەکەی لیبرالیزم، جیاوازیگەلێکی مەزن لە توێژینەوەی واتای ئازادی لە گۆڕێدا هەیە.

هەروەکو لیبرالیزم، ئەم واتای جیاواز لە ئازادی بە دەرەنجامی کۆمەلایەتی و ئابووری جیاواز دەگا. روانگەی ئانارشیستگەلی خاوەنپرەنسیپتر ئەوەی کە ئەوان وەکو زۆربەی لیبراله کلاسیکەکان واتایەکی نیگەتیڤیان لە ئازادی لە نەزەردا هەیە.[68] ئازادی لەم روانگەوە بە واتای کەمبوونەوەی زۆریان گوشاری ئەنقەسی لەشی لەسەر تاکە. ئەمە روانگەی تایبەتی ئانارشیزمی ئەمریکایە. راتبارد ئاشکرا ئەم کردارە زۆرانەی بە «دەمارگرژی فیزیکی دەستدرێژکەرانە سەبارەت بە تاک و خاوەنداری» ناودێر دەکا.[69] بەم چەشنە ئەو هەر وەک بەرکەمن «ئانارشیستی کۆمۆنیست» باوەڕی وایە کە وەلانان و پڕووزانی دەولەت بە واتای قرتان و پڕووزاندنی سەرچاوەی کرداری زۆرە و لەم رووەوە بە واتای زۆر بوون و پەرە سەندنی ئازادییە. رێنوێنی راتبارد لەگەل پرەنسیپی خاوەنداری لەسەرخۆیی و بنەڕەتی نەبوونی دەستدرێژی پێوەندی هەیە: واتە ئەمە کە تاکەکان مافی نەگۆڕیان بەسەر خاوەنداری لەشی خۆیانەوە هەیە. ئەو جۆرە کە هیچ کەس لەم بارەوە نابێ بە کردەوەی زۆر لەگەل ئەوان هەلسوکەوت و مامەلە بکات. لەبەر ئەمە هەرکەس «مافی نەگۆڕی بۆ ئازاد بوون لە دەستدرێژی و دەمارگرژی هەیە».[70]

لە لایەکی دیکەوە، هێندێ لە ئانارشیستە کۆمۆنیستەکان زۆرتر سەرنجیان لەسەر لایەنی پۆزەتیڤی ئازادییە. لەگەل ئەمە، ئەم تێگەیشتنە تایبەتییە لە ئازادی پۆزەتیڤ بینینێکی دلسۆزانەتری رێژە بە دەور یان کارکردی دەولەت ئاسان ناکاتەوە، ئەو جۆرە کە دەربارەی لیبرالیزمی کۆمەلایەتی ت. هـ. گرینیش هەروا بوو. ئەو ئانارشیستانەی کە تێبینییەکی پۆزەتیڤتریان لە ئازادی هەلسەنگاندووە، بە رادەی تاکخوازان لە دوورخستنەوەی دەولەت پڕ دەنگوباسن. پرەنسیپێکی زۆر لەم واتا پۆزەتیڤە لە ئازادیدا بوونی هەیە. یەکەم، ئازادی هەر تەنیا بە مانای لەناو بردنی زۆر و گوشار نەبوو. ئەگەرچی ئاشکرایە کە زۆر بە شێوەی هۆکارێکی گرنگ لە توێژینەوەی ئازادیدا قبوول دەکرا. لەم مانادا، ئازادی بریتی بوو لە رزگار بوون لە گوشار و زۆر بۆ درێژە پێدانی ئامانجی پۆزەتیڤ. ئازادی پۆزەتیڤ هەلگری سەربەخۆیی تاک، دیاریکردنی یاسا بۆ خۆی و هەلبژاردنی خودموختارانەی

ئامانجەکانی خۆیەتی. جۆرێک خاڵی تایبەت لەم ڕێنوێنییەدا لە کتێبی ر. پ. وولف بە ناوی پشتگری لە ئانارشیزم باس کراوە کە لە کۆڕ و کۆبوونەوەی ئاکادمیک تا ڕادەیەک لەگەڵ پێشوازی ڕووبەڕوو بۆتەوە. وولف بەپێچەوانەی ئەمە کە دەرکێکی زۆر کەمی لە ئەندێشە جۆراوجۆرەکانی ئانارشیستی لە خۆ نیشان دەدا، ڕێنوێنییەکی فەلسەفی بەهێز دەردەخا هەتا نیشان بدا کە چوونە ژێرباری دەسەڵات لەگەڵ ویستە زەرووریەکانی ئێمە لە کردەوەدا بە شێوەی تاکەکان و هۆکارە خودموختارەکان سازگاری نییە. هەر ئەرکێک لە فەرمانبەری کردن لە دەسەڵات بێ بەڕاستی هەڵگری وەلانانی بەڵگە و ڕێنوێنییە. لە ڕێنوێنییەکانی وولف لە بیست ساڵی ڕابردوودا تا ڕادەیەک پێشوازی لە نووسراوە فەلسەفییەکانی کراوە. بەم حاڵەوە، بەپێچەوانەی بەهرەمەند بوونی زاتی ئەو، لە پەراوێزی بزاوتی فیکری و بەکردەوە ئانارشیستی خۆی بینیوەتەوە.[٧١]

دووەم ئەمە کە ئازادی لەگەڵ هەڵبژاردنی ئەو ئامانجانەی کە لانیکەم هۆکاری بە هەرە وەرگرتنی خراپ لەم و لەو و چەوسانەوە یان بە کەمزانین و بە کەمبینینی ئەوان نەبێ، پێوەندی هەیە. بە وتەیەکی دیکە، ئامانجەکان دەبێ لایەنی ئەخلاقیان بێ. ئەم لایەنە ئەخلاقیە بەشێک لە واتای پێکهێنەری ئازادییە.[٧٢] سێیەم ئەمە کە، ئازادی لەگەڵ بەرەوپێشچوون و تەکامولی تاکی مرۆڤ، یان ئەو جۆرە کە ڕووکێر دەڵێ: (لەگەڵ پەرە گرتن و تەکامولی کاملی هەموو هێزەکان، لێهاتووییەکان و تواناییانەی کە سروشت بە مرۆڤی بەخشیوە)[٧٣] پێوەندی هەیە. لە ئاکامدا ئەمە کە، ئامانجە ئەخلاقییە پێکهێنەرەکان دەبێ لە کۆمەڵگەدا ڕیشە داکوتن. لە ڕاستیدا، ئامانجەکان و مەئواکان لە کۆمەڵگە یان لە غەریزەی گشتی سروشتی جەوهەری ئێمە سەرچاوە دەگرن. ئەم پێشمەرجە بنەمای ئانارشیزم پێکدێنێ.[٧٤]

باوەڕەکانی ئانارشیستی دەربارەی یەکسانی، بەپێی واتاگەلێک کە هەرکام لەمەڕ سروشتی مرۆڤ و تایبەتمەندی بایەخێک کە هەیانە، جیاوازیان هەیە. ئاستەنگترین ڕوانگە لەمەڕ یەکسانی ـ هەڵقوڵاوە لە خۆخوازی ئەستیرنری ـ هەر شتێک کە بالاتر لە (خۆی) بێ بە گومانی دەزانێ. لەبەر ئەمە، (خۆ)کان چ تایبەتی و چ بە کردەوە

دەبێ بەرامبەر ببینرێ. تاکی خۆخواز هەموو کێشەکانی لەمەڕ پلەبەندی یان پلەبەرزی دەبێ درۆ بدرێتە قەڵەم. گشت ئانارشیستە تاکخوازەکان دەربارەی جەوهەری بەرامبەری بێخەوشتر بڕیاریان داوە. بە بۆچوونی گودوین هەر مرۆڤێک بەرامبەرانە خاوەنی لێهاتوویی عەقڵانی و بڕیار لەمەڕ بەرژەوەندی و بەختەوەری خۆیەتی. هیچ پلەبەندییەک لەم بارەوە قبووڵ نییە و هەر تاکێک دەبێ بتوانی بەرامبەرانە بیر بکاتەوە. لە سوننەتی ئانارشیستی ئەمریکایی، یەکسانی جیاوازانە لە (خۆی) کە خوازیاری مافی سروشتی مالکییەت لەسەر لەشی خۆی، نەکەوێتە بەر هەڕەشەی دەستدرێژی و هەروەها دەسڕەسی ئازاد و بەرامبەر لە بازاڕ بوونە سەرچاوە دەگرێ. لێۆ تۆلستۆی یەکسانی لەسەر بنەمای پرەنسیپی یەهوودی - مەسیحی یەکسانی ڕۆحەکان لێکی دەداتەوە. بە بۆچوونی تۆلستۆی هەرێمی دەسەڵاتی خودا لە هەرکام لە ئێمەدا بوونی هەیە و هەڵگری ڕێزی بەرامبەری مەزەب بە کەسانی دیکەیە.[٧٥]

بۆچوونی شێوەی دیکە لە یەکسانی، لە تاکخوازیدا کە ڕەنگە دژایەتی لەگەڵ ڕوانگەی جەوهەریتر سەبارەت بە بەرامبەری بێ، بە لای ئانارشیستە کۆمۆنیستەکانەوە دەبینرێ. بە بۆچوونی ئانارشیستە کۆمۆنیستەکان و کۆخواز، یەکسانی سیاسی یاسایی یان ئابووری، یەکسانییەکی تەواو نەبوو. یەکسانی شتێک بوو کە پەیامگەلێکی گرنگ و بەربڵاوی بوو. بە بۆچوونی کروپۆتکین یەکسانی داڕژاو لەسەر نیاز بوو. هەر کەس بڕێک نیازی سەرەکی گیانی، دەروونی و کەلتووری هەیە کە دەبێ لە دەروونی کۆمەڵگەدا عادڵانە بەراورد بێ. ئەم نیازانە تەبا و ڕەبایی تاکی مرۆڤیان پێکدەهێنا بەتایبەت لە ڕوانگەی ئانارشیستە کۆمۆنیستەکانەوە، یەکسانی بە واتای کۆمەڵایەتی ئەو لەگەڵ گەیشتن بە ئازادی پۆزەتیڤ پێوەندی نزیکی بوو. بە باوەڕی تاکخوازەکان واتای شێوەیتری کردەوەی یەکسانی لەگەڵ ئازادی نیگەتیڤ - بە شێوەی مافی بەرامبەر بۆ ئازادی - پێوەندی بوو. بە بۆچوونی زۆرینەی تاکخوازەکان کۆشش بۆ نیازە سەرەکییەکانی تاک و ڕەزامەندی ئەوان لە لایەن کۆمەڵگەوە، لەگەڵ حاشا کردن لە ئازادی هاوتەریب بوو.

## یەکسانی، خاوەنداری و ئابووری

بایەخگەلێکی دیکە کە ئانارشیستەکان بەتەواوی خوازیاری بوون، عەدالەت بـوو. عەدالەتیان هەمیشە سەربەخۆ لە یاسادا دەبـینی. واتـای یاسـا لەگـەڵ کردارەکـانی حکوومەت، دەولەت و دەسەلات پێوەندی بوو.[٧٦] لەم رووەوە ئەگەر پێوەندییەک لـە نێوان ئەم دوانەدا بوونی بوو ئەمە بوو کە یەکسانی بە شێوەی پێوارێکی بـەراوردی دژی کردارە یاسایەکان بەرچاو دەگیرا. بەم جۆرە واتای کۆمەڵگە لەکەداردا سالم و عادل کاکڵ و ناوەڕۆکی ئەندێشەی ئانارشیستییە، بەلام پرسیار هێشتا لەسـەر جێـی خۆیەتی: یەکسانی چییە؟ دوو لایەنی جیاواز لە ئارادا هەیـە کـە واتـای عەدالـەت لـە ئەندێشەی ئانارشیستی لەواندا پەروەردە بـووە. وەکـو واتـای یەکـسانی، لایـەنێک لەگەڵ دەرکی بە کردەوەتر گرێ دراوە، لایەنێکی دیکە لەگەڵ جۆرێـک مـودێلی بـلاو کراوە و جەوهەریتر پێوەندی هەیە.

خالـە ناوبراوەکـان جەوهـەری روانگـە و بۆچوونـەکانی ئانارشیـستی لەمـەڕ ئابووریش ئاشکرا دەکـەن. بـە شـێوەی گـشتی، دەکـرێ بـلێین کـە هـەموو رێبـازە ئانارشیستییەکان لەگـەڵ واتـای سـەرمایەداری دەولـەتی و ئـابووری دەسـتووری پشت بەسـتن بـە دەولـەت نـاکۆکن. جگـە لـەم حوکمـە زەوت کـراوە، دۆزینـەوەی پوارێکی هاوبەشی دیکـە دژوار دەبـێ. بێگومـان هۆگرییـەکی نادیـار و شـاراوە بـە ئـابووری نـاکۆ بـوونی هەیـە. دەربـارەی تـاکخـوازانی ئـەمریکایی - بەتایبـەت ئانارکۆکاپیتالیستەکان - بـازاڕی تـەواو نارێـک دەکـەن بـە وێنـە و دەیدەنـە قەلـەم. تەولیـد مەسـەلەیەکی جیـاواز و هـاوێرکراو لەگـەڵ دابەشـکردنە. لـە ئانارشـی کۆمۆنیستیدا تەولید و بلاوکردنەوە هەر دوو بـە یەکـەوە تێکـەلاویان هەیـە و دەبـێ بکرێنـە کۆمەلایـەتی. شـێوەی بـازاڕی قـەراردادخوازی پـرۆدۆن و تـاکخوازی کۆمەلایەتی لە نێوان ئەم دوو دۆزەدا وەستاون. روانگەی پـرۆدۆن کـەم تـا کـورت هاوتەریبی شێوەی ئانارشیستی سۆسیالیزمی بازاڕە.

یەکەم ئانارشیستێک کە واتای عەدالەتی لیبراوانـە لـەدیالۆگی خۆیـدا دەربـارەی کۆمەلگە هێنایە ئاراوە، پرۆدۆن بوو. بەم حالەوە، دەبێ بـوترێ کـە شـعووری ئـەو

بەپێچەوانەی ناوبانگی ڕواڵەتەن ڕادیکاڵی خۆی، ئابووریخوازە و بە هێندێ شێوە لە لیبرالیزمی کلاسیک دەچێ. پرۆدۆن تا ڕادەیەک وەک سێر هێنری مین لەگەڵ «بارودۆخی گرێبەست» و ئەندیشەی ئەسپینسێر دەربارەی «خەبات لەگەڵ کۆمەڵگەی پیشەسازی» ڕێنوێنی دەکرد کە کۆمەڵگەکان لەگەڵ گەشە و تەنینەونە بەرەو ئانارشی، لە حکوومەتەوە وەکو جانلاک و ژان ژاک ڕۆسۆ بوو. بە بۆچوونی پرۆدۆن قەرارداد جێی حکوومەتی دەگرتەوە. بە باوەڕی ئەو گرێبەست دژی دەسەڵاتە و نیشاندەری یارمەتی بەرامبەرە.[٧٧] خەڵک لە لایەن گرێبەست و گۆڕینەوە لەگەڵ یەکدا پێوەندیان دەگرت و بەرپرسی ژیانی خۆیان دەگرتەئەستۆ. گرێبەست و خۆرازیبوونێکی تەواو پێویستە. لەبەر ئەمە، بە بۆچوونی پرۆدۆن گرێبەست ئامێرێکە بۆ بە کەمال گەیشتنی چەمکی ئانارشییە. تاقانە جیاوازی لەم ڕوانگە قەراردادخوازە بنەماڵە بوو کە پرۆدۆن هێشتا ئەوەی بە جۆرێکی توێژینەوەهەڵنەگر ڕێخراوی پلەبەندی و باوکسالارانەی دەزانی. بە شێوەی گشتی، پرۆدۆن لەسەر ئەوە سوور بوو کە لە قەرارداد دا دەبێ بەرامبەرییەکی سەرەکی لە ئارادا بێ و هەر ئەم بەرامبەریە بنەڕەتییە بوو کە جیاوازی نێوان ئەوی لەگەڵ ئانارشیستە تاکخوازەکانی دوایی بەدیهێنا.

بڕیارنامە دوو کاردانەوەی بوو: یەکەم هەڵگری دەستەبەر کردنی گۆڕینەوەی ئابووری هاوتەریبی نرخ بوو؛ دووەم قەرارداد و بڕیارنامە ئازادی دەستەبەر دەکرد چونکە پێوەندی لەودا بەتەواوی سەربەخۆ و دوور لە هەر چەشنە زۆر و گوشارێک بوون. گرێبەست خووی نوێی کۆمەڵگە ئەدرایە قەڵەم، شتێک کە پرۆدۆن ئەوەی «کۆمەڵگە دەستەبەر»یشی ناونابوو. پرۆدۆن لەم کۆمەڵگەدا تا ڕادەیەک بە وشەگەلی مەزەبی دەدوا.[٧٨] شتێک نەک سەرسووڕهێنەر، بەڵام وەک مەتەل، واتاکە کە پرۆدۆن لە عەداڵەتەوە بووی. یەکسانی پێوەندی بە گرێبەست بەرامبەرەکانەوە دەبێ. پرۆدۆن ئەمەی ناوناوە «یەکسانی ئاڵوگۆڕ» ئێمە لەم سەردەمەدا خۆمان گرتوە زۆرتر ئەندێشەکانی فۆن هایک و لایەنگرەکانی ئەو لە گۆی بگرین کە هۆی بەهێزکردنی جیلوەی بازارخوازی پرۆدۆنن، پرۆدۆن وەبیر دێنێتەوە: «یەکسانی

ئالوگۆڕی، فەرمانڕەوایی قەرارداد، سیستەمی پیشەسازی یان ئابووری، ئەمانە هاوتەریبە جۆراوجۆرەکانی ئەم دۆزەن». گرنگی لێرە دایە کە لەگەڵ ڕێنوێنی بەرەو دۆزە زانستی و گۆڕانکارییە، بەتوندی بە کەم جیلوەدانی واتای بلاوکردنەویە یەکسانییەوە دەپێچرێ کە تایبەتی سۆسیالیزمی ریفۆرمخواز و لیبرالیزمی کۆمەلایەتییە. بە بڕوای ئەو، یەکسانی بلاوکردنەوە گرێ بە سێ دەسەلات، یاسا و حکوومەتە و شێوەی دەروونی بەیانی دەکا کە بۆ هەموو بەرنامەڕێژی و وێنەسازی کراوە. پرۆدۆن وەک ئیسپێنسێر یەکسانی بلاوکاری بە خاوەنی خۆی دەرەبەگایەتی دەزانی. بەم حالەوە، گرنگە تێبگەین کە ئەگەرچی ئەو لە کۆمۆنیزم و یەکسانی دابەشکاری بێزار بووە، هۆگری بە دۆزی بازاڕی ڕێکخراویش نەبوو.[79]

نووسەرانی تاکخوازی دوایی، بەتایبەت لە سوننەتی ئەمریکایی، وەبیرهێنەری هێندێ لە دۆزەکانی پرۆدۆنن. بێگومان دژایەتی ئاشکرا لەگەڵ یەکسانی دابەشکاری و بلاوکردنەوە لە ئارادا هەیە. لە ڕوانگەی نووسەرانێکی وەکو ڕاتبارد، مافی سروشتی لەسەر لەش، سامان و ئازادی بایەخێکی لە ڕادەبەدەری هەیە. ڕاتبارد نیگەرانی بەرامبەری سەرەکی هەر دووک لایەنی گرێبەست نییە، بەلکو هەر تەنیا لەسەر ئەو باوەڕەیە کە نابێ بەرگری لە گرێبەستی نێوان تاکەکان بکرێ. نابێ هیچ شتێک بەرگری لە مافی خاوەندارییەکان لەسەر لەش و سەرمایە بکا و تاک نابێ بکەوێتە بەر هەڕەشەی زیان و دەمارگرژی. یەکسانی بە پایەداری «یاسای ئازادی» ویست پێوەند دەدرێ و ئاوڕ لە مافە ڕەسمییەکانی تاک دەداتەوە.[80] ڕاتبارد لە بەسەریەکدا کەوتووە بەربلاوەکانی خاوەنداری و کەم و کوڕیەکانی کۆمەلگە کە لەسەر لێهاتوویی و شایستەیی قەرارداد ئەسەری داناوە، غافلە. نە پرۆدۆن ئەستیرنر و نە گودوین، ئەم ڕێنوێنیەی دوایی بەتایبەت ئەو سفەتە پیرۆزەی کە ڕاتبارد بۆ خاوەندارێتی لەبەرچاوی گرتووە، نایسەلمێنن. هەرکام لەبەر بەلگەی جۆراوجۆری ئەم ڕێنوێنیەنەیان دەسەلماند. بەتایبەت پرۆدۆن مافی نەگۆڕی خاوەندارێتی بە شێوەی هۆکاری هاندەری کەلک وەرگرتنی خراپ ڕەتی

دەکردەوە. لەم رووەوە ئەم رستە بەناوبانگەی گوتووە کە «هەر خاوەندارییەک دزێکە».

بەم جۆرە، تاکخوازانی ئەمریکایی لەگەڵ دڵڕەقییەکی یەکجار زۆر راستی بازاڕی ئازاد دەسەلمێنن. جیاوازی نێوان ئانارشیستە تاکخوازەکان و لیبراڵە کلاسیکە کەمینەخوازەکان لەو بوارەدا زۆر کەمە، واتە لە لیبراڵە کلاسیکییەکان بڕوایان هەیە کە بوونەوەری مرۆڤی خۆخواز بە دووی بەرژەوەندی خۆیانەوەن و لە بازاڕێکی رێکنەخراودا ناکرێ باوەڕ بەوانە بکرێ. بێجگە لەمە، لەگەڵ ئەمەی کە هەر «خۆیان» ئەم کارە دەسەلمێنن.

مەنتقییە کە تاکەکان بە بوونی لانیکەم لە دەزگایەکی دەوڵەتی بۆ ئەنجامی هێندێ کارگەلی گشتی رەزامەندیان هەبێ. بێگومان ئەمە هەر ئەو رێگایەی نووسەرە هاوچەرخەکانی لیبراڵ وەکو رابێرت نوزیک و جیمز بوکانانە. لە لایەکی دیکەوە، تاکخوازانی ئانارکۆکاپیتالیست یان باوەڕیان هەیە کە مرۆڤەکان خۆیان لەگەڵ کەش و هەوای تەواو ناهەموار دەگونجێن یان تاکەکان خۆیان ئەنجامی خزمەتی بازاڕی ئازاد «کە لەوە بەر لە لایەن حکوومەتەوە بەڕێوەدەچوو» لەوانە کاری پۆلیسی و پارێزگاری و کارگەلی داد، بە ئەستووە دەگرن.

ئانارشیستە کۆمۆنیستەکان و کۆخواز، عەدالەتیان بە واتای دابەشکاری دەیانگرتە بەرچاو. بە بۆچوونی کروپۆتکین ئەم کارە پێوەندی لەگەڵ بەرین بوونەوەی تەکامولدا بوو. ئەو جۆرە کە دەڵێ: «هەستی یەکسانی کەم و زۆر لە هەموو بوونەوەرانی کۆژین [یان کۆمەڵایەتی]دا بوونی هەیە... بەم جۆرە کۆمەڵگە قبووڵی رادەیەک بۆ خەباتی جیهانی دیاری دەکا و رێگا بۆ بەرەوپێشچوونی روانگەی ئەخلاقی باشتر دەکاتەوە».[81] دەربارەی پێوارە بلاوکراوەکان کێشەی باوەڕی لە ئارادا بوو. باوەڕی باکونین دەربارەی بلاوکردنەوە لەسەر بنەمای ئەنجامی کار لە کۆمۆندا بوو. کروپۆتکین ئەم پرۆژەی بە نادروست دەزانی، چونکە تەواوکەری تۆوی نەبوونی یەکسانی بوو.[82] کروپۆتکین بەجێی کار یان خۆشاردنەوە لە کار، وتاری «نیاز»ی بە شێوەی پرەنسیپی دابەشکاری سەرەکی

ـنابوو. له ڕاستیدا بلاوکردنەوە وشەیەکی لە ڕێلابەرە چونکە هیچ کەس ئەرکی
ـلاوکردنەوەی لە ئەستۆ نییە، بەڵکو زۆرتر گۆڕان لە خوو و زاتی بەرهەمهێنان و
ـشیوەی بەکارهێنانی خەڵکە.

پێشمەرجی توێژینەوەی کروپۆتکین دارڕژاو لەسەر بنەمای ئەم ڕێنوێنیانە بوو کە
هیچ تەولیدێک تاک نییە. ئەمە تۆرمەی مرۆڤە کە سامان دەخوڵقێنێ. لەبەر ئەمە،
خاوەندارێتی تاک لەگەڵ جەوهەری تەولید و دروستکردنی سامان دژایەتی هەیە.
ـو ئەوەی کە بوونەوەری مرۆڤ بە شێوەی تەواو بچنەپێش و بە کەماڵ بگەن،
ـسامان دەبێ بۆ گشت مرۆڤایەتی سەرلەنوێ تایبەتمەند بکرێ و بلاو بێتەوە. بە
ـوتەی کروپۆتکین پرەنسیپ دەبێ ئەمە بێ: «هەموو شتێک بۆ هەموو کەس!...
ـئەوەی کە ئێمە دەمانەوێ مافی باش ژینە: باش ژیان بۆ هەمووان!»[83] هەمووکەس
مافی هەیە ژیان بکا. ژیان کردن واتە نیاز بوون و ئەم نیازانە کاتێک دێتەبەرهەم کە
ـسامان لەسەر بنەمای نیازە تایبەتمەندەکان سەرلەنوێ دابەشکاری نوێ بکرێتەوە.
نیازەکان هەم جەستەیین وەکو خواردەمەنی، بەرگ و جێی حەسانەوە و نیشتەجێ
بوون هەم کەلتووری، وەکو فێرکردن و پەروەردە. لەم بابەتەوە ڕوانگەی
ئانارشیستی کۆمۆنیستی دەربارەی ئابووری بەتەواوی لەگەڵ ڕوانگەی
ئانارشیستە تاکخوازەکان جیاوازە. بەرهەمهێنان و بلاوکردنەوە وەکو کارە
شەریکەکان یەکپارچە پرسینەوەیان لێکراوە و لێکدراوەتەوە، واتە کەرەسەکان بە
مەبەستی دابینکردنی نیازە گشتییەکان دروست دەکرێن. کروپۆتکین زانستی
ئابووری سیاسی «لێکدانەوەی نیازەکانی جۆری مرۆڤ و کەلوپەلی ڕەزامەندی
ئەوان لەگەڵ سەرفی لانیکەمی وزەی مرۆڤ» پێناسە دەکا و ئەوە «فیزیۆلۆژی
کۆمەڵگە» ناو دەنێن.[84]

## مەسەلەی ڕێکخراوەی سیاسی

یەکێک لە مەزنترین گرفتەکانی ئانارشی لە پەرەپێدانی هەر چەشنە ڕاپۆرتێک
لەمەڕ ڕێکخراوەی سیاسی ئەم تۆمەتەیە کە ئانارشی بیروباوەڕی ناواقعی،

ساكارانە و بیرخوازانەیە کە زۆر دژوارە بتوانێ بەڕاستی بگا. ئانارشی ئاخنراو لە ڕێنوێنیگەلێک بۆ کۆمەڵگەی ئۆتۆپیایی بووە. بێگومان تاقمێک لە نووسەرانی ئانارشیست لە پێشنیارەکانی خۆیان لە ڕادەبەدەر توندوتیژ و بێکردەوە بوون، بەلام کەسانی دیکە لە پێڕەوەکانی خۆیاندا هاوکێشتر، بەکردەوەتر و ڕاستبینتر بوون. کەسانێک کە ویستوویانە بە هۆی فێرکردن و پەروەردە ناوەڕۆکەکانی ئانارشیستی (ناوەرۆکە ئانارشیستییەکان) بخەنەگەڕ ئاشکرا ڕوانگەگەلی درێژخایەنتریان بووە.[85]

لەمەڕ بنەڕەتی ڕێکخراوەی کۆمەڵگە هێندێ باوەڕی هاوبەش لە ڕێبازی ئانارشیزمدا دەکەوێتە بەرچاو. زۆربەی ئانارشیستەکان لەسەر ئەو باوەڕەن کە کۆمەلگەی داهاتوو کۆمەلگەیەکی جیا لە پلەبەندی، بێ زۆر و گوشار و ئازادیخواز دەبێ. بێجگە لەمە، واتای دەولەت ـ نەتەوە لەگەل دیوانسالاری، دەزگای داد، پۆلیس و ئەرتەشی خۆی، دیاردەیەکی زووتێپەڕ لە پانتای مێژوودا گومان کراوە. پرەنسیپێک لە حکوومەت بە جێبمێنێ، لانی کەمی ئەو لەسەر بنەمای ڕەزامەندی دەبێ. ئەو جۆرە کە نووسەران دەبێژن، ئەگەریش وابێ، «حکوومەتی بێ سیاسەت» دەبێ.[86] لە هێندێ شوێندا، ئەوەی کە دەمێنێ فیدراسیونگەلێکی بێهێز و بێ تەوژم دەبێ کە «نەبوونی کۆ» دروشمی سەرەکی پێکدێنێ. لەو لای ئەم بەیەکگەینە لانی کەمە، ڕوانگەگەلێکی زیادە و زۆر جیاواز دێنە ئاراوە.

بە باوەڕی تاکخوازانی ئەمریکایی، و بەتایبەت ئانارکۆکاپیتالیستەکان، زۆربەی چالاکی پێشووی حکوومەت یان دەولەتی تاکەکان لە بازاڕی ئازاد بەڕێوە دەبەن. ئەو جۆرە کە ئانارشیستی ئەمریکایی بنجەمین توکار دەنووسێ: «ئانارشیزمی ڕەسەن لەگەل مەنچستێریزم هاوکێشە».[87] لە هەر کوێ کە «دەرفەتی زۆر و دەمارگرژی تاک یان خاوەندارێتی تاک» لە ئارادا نەبێ، ئانارشی لە ئاراد هەیە.[88] بە بۆچوونی ڕاتبارد، دژی دەولەت بوون پێویستانە بە واتای دژایەتی لەگەل ئەو خزمەتانەی کە دەولەت دەیخاتەڕوو، نییە. مەبەستی ڕاتبارد بارودۆخی تاکخوازی بەتەواوی ویست داخوازانەیە، تەنانەت وشەی «کۆمەلگە» بە گومانێکی گشتی

ـراوه. هـەتا کاتێـک کـە تاکـەکان داخوازانـە دەربـارەی حـاکم و داوەری پێکـدێن
ـتوانن تەنانەت بۆ بەڕێوەبردنی ئەرک لە دادگا دادییەکان و پۆلیس بـەڕێوە بـەرن.
ـتبارد دەڵێ: خەڵـک دەتـوانن بـۆ حـازر بـوون لـە دادگاکـان بانگهێـشت بکـرێن و
ـەرامبەر بە یاسا ئازادانە داوەری بکەن. هەڵبەت لە توێژینـەوەی ئـاخر، هـیچ شـتێک
ـتوانی تاک مەجبوور بە ئیتاعە بکا مەگەر ئەمەکە هەستی پێکهاتنی ئازادانە لە ئـارادا
ـی و هەموو تاکەکان مافە سروشتییەکان بسەلمێنن. جگە لەمە، دیاریکردنی ئەمە کە
ـدربـارەی تاوانکـاران، ئیفلیجـانی لەشـی یـان شـێتەکان بەرامبـەر بـە روانگـەی
ـکخوازانە چ کردارێک دەکرێ بەڕێوەبەرێ، دژوارە. هەروەها، هەر ئـەو جـۆرە کـە
ـوریان وەبیریان هێناینەوە، بەڵگەگەلێک کـە لەمـەڕ هێمنایـەتی تایبـەتی و شـەریکە
ـۆلیسییەکان یـان هـێمنی پێکبێـنن هـیچ شـتێک ناتوانـێ بـەرگری لـە جەنایـەت و
خراپەکاری بکا. لە کۆتاییدا سزا بە مامەڵەیەکی وەک خۆی دەبێ بە تۆڵە. ئەگەر هیچ
مەسلەتێک لە ئارادا نەبێ، لەو شێوەدا دەمارگرژی تاقە رێـی چارەسـەرە. لـە وەهـا
ـارودۆخێکـدا بـازاڕ نـەک هانـدەری سیـستەم، بەڵـکو هانـدەری بـێ سیـستەمـی و
کاولییەکی ترسهێنەر دەبێ.

ماکس ئەستیرنر لانیکەم هەتا ئەم رادە سەبارەت بە مەسلەتی ئازادانە گەشـبین
نەبوو. ئەو لە راتبارد لەمەڕ تاکخوازی راستتر و راستبینتر بوو. ئەسـتیرنر بـاوەڕی
وابوو کە دەکرێ مامەڵە بە وەکو خۆی نێوان «خۆکـان» جێگـری تۆڵـە بـێ. چونکـە
گشت «تارماییە» زێهنییەکانی بورژوایی ـ لەوانە مافە سروشتییەکان، خاوەنـداری و
بازارەکان ـ لەوانەیە کە بخرێتە پـشتگوێ و دوورخرێتـەوە، لانی زۆری شـتێک کـە
بتوانرێ پشتی پێ ببەسرێ «یەکێتی شـاراوەی خۆخـوازان» دەبـێ بـە جۆرێـک کـە
هەرکەس بە دووی رەزامەندی و دابینکردنی بەرژەوەندی تایبـەتی خۆیـەوە بـێ.[٨٩]
کۆمەڵگە ئیتر بوونی نابێ. بە گریمانەیەکی زۆر جێی ئەو جگە لە خودگەردانی خۆی
شتێک نایگرێتەوە. ئـەو جـۆرە کـە ئەسـتیرنر گوتوویـە «هـەر نـەتـەوەیـک و هـەر
دەولەتێک سەبارەت بە تاک خۆخواز و بێئینسافە».[٩٠] لـەم روانگـەوە سـەبارەت بـە

ژیانی کۆمەڵایەتی، بەو جۆرە کە ئەستیرنر ئامادەی قبووڵ کردنی ئەوە، تاوان بە رادەی سزایان قەساس باوەڕپێکراو دەبێ.

ئانارشیستە کۆمۆنیستەکان کێشەی بەهێزتر یان سەبارەت بە بایەخەکان و رێکخراوەی کۆمۆنی یان هاوبەشی هەیە. ئەم کارە بەش بە حاڵی خۆی مەسەلەی ئازادی یان سەربەخۆیی تاک پڕکێشەتر دەکا. ئانارشیستە کۆمۆنیستەکان لە وەڵام دەربارەی تاکخوازانەدا دەڵێن کە تاکخوازی دیاردەیەکی لەناوچوو و ناسازگار لەگەڵ سەردەم و ناتەواوە، گەین بە ئازادی یان یەکسانی بنەڕەتی دەبەستێ بە کەم کردن و زیادکردنی بازاڕەکانەوە، لە ئاخردا رووخانی دەوڵەتی سەرمایەداری بە دواوەیە. کۆمۆنیستەکان و کۆخوازەکان بیریان دەکردەوە کە مرۆڤەکان دەبێ لە جەماوەری شەریکەیی یان کۆمۆنە بچووکە دژەکۆکان، فدراڵیزە و دژی پلەبەندی کە وێچوو بە سوننەتی گوندی دێرینە بوو، ژیان بکەن.[91] بوکچین ئەمانەی بە «گروپە پێکەوە بەسراوەکان»ی ناو دەبرد.[92] کۆمۆنەکان ویستیار و خوازیارانە دەبن. بەڵام زۆرتر ئانارشیستەکانی ئەم تاقمە لەسەرئەو باوەڕە بوون کە ئەگەر خەڵک بەم جۆرە ژیان بکەن، بە شکۆفایی و پلەبەرزی و پێشکەوتن دەگەن و هۆگری ئەم ژیانە دەبن. کروپۆتکین بەم کێشە هاوڕێی لەگەڵ بۆچوونی خۆی، تام و چێژی بیولۆژیکیشی پێ دەدا. سەیر لێرە دایە کە کروپۆتکین لە هێندێ لە نووسراوەکانی خۆیدا لە کۆششە داخوازەکانی خاچی سوور و «ئەنجوومەنی گەمی فریاکەوتنی بریتانیا» ئیلهامی وەرگرتووە و تاریف لە مەدەنییەکان و شارەکانی سەدەکانی ناوەڕاست دەکا.[93] ئەم کۆمۆنانە دەبوو خۆی لە خۆیدا یەکگرتوو و مرۆڤدۆست یەکترخواز بان. لە روانگەی کۆمەڵێک ئەندامەوە، و تایبەتمەندی کاردانەوەی دەبوو بچووک بووبان و هەر تەنیا بەرهەمێنانیان بۆ دابینکردنی نیازە ناوخۆیەکانی خۆیان کردبا.[94] تەکنۆلۆژیش دەبوایە هەر بە رادەی ئەم نیازە بچووکانە ببوایە. لەبەر ئەمە، بوکچین لە کتێبەکەی خۆیدا لە «تەکنۆلۆژی خەڵک» دەدوێ.[95] کاری لەش و فیکری تێکەڵ بە یەک بکرێن و تەولید لە ئاستی مرۆڤایەتی و لە کارگە سەربەخۆکاندا بەڕێوەببرێ. زۆربەی ئانارشیستە

کۆمۆنیستەکان بەتایبەت حەزیان دەکرد بەسەر جیابوونەوەی نێوان کاری دەستی و کاری مێشکی، کاری زەینی و کار لەشیدا زاڵبن و ئەوە لەناو بەرن. زۆر بە دووی فۆرمی بنەماڵە و ژن و مێردییەوە بوون. کروپۆتکین سوور بوو لەسەر ئەوە کە شۆڕشی کۆمۆنیستی بە رزگاری راستەقینەی ژنان لە کاری قورس و دژوار لە بنەماڵەی باوکساڵاری و کاری ناوماڵ دەگەن. یەکێک لە کۆششەکانی ئەو هێنانی ئامێرەکان و دەزگا نێو ماڵییەکان بۆ یارمەتی ژنان لە بەڕێوەبردنی کاری ناوماڵ بوو.[٩٦]

دەربارەی پرۆدۆن لەگەڵ روانگەیەکی جیاواز رووبەڕوو دەبین کە پرەنسیپێکی لە تاکخوازی، کۆمۆنیزم و لیبرالیزم تێکەڵاو کردووە. لەم رووەوە پرۆدۆنیان «لیبرالی لە کۆمەڵگەی پرۆلتێری» باس دەکرد.[٩٧] ئەو لە ماوەی ژیانیدا باوەڕی گۆڕا، بەڵام تاکخوازانی کۆمەڵایەتی هەمیشە ئەویان بە خاوەنی جۆرێک باوەڕی فدراسیۆنی گرێبەستی نێوان خەڵک دەناسی. کۆمەڵگە لە پلەی یەکەمدا دەبێ لە لایەن قەراردادەکانی نێوان تاکەکان و گروپەکان کە جێی نیاز بە حکومەت و سیاسەتزانان دەگرن، فۆرم بگرێ، ئەم گروپە فدراڵیانە هەروەها دەبێ دەربارەی پشتگری میللی و داوەری لەمەڕ کێشەکان دانستان بکەن و پێکبێن. پشتگری لە دەوڵەتی فدراڵی دواتر سەرنجی پرۆدۆنی راکێشا کە هێندێ لە بۆچوونەکانی سەرەتایی ئەو دەچوو. واتای نیشاندراو لە لایەن ئەوەوە لەمەڕ بانکی ئیعتیباری رووبەڕوو کە دەوری حەیاتی لە کۆمەڵگەی فدراڵی داهاتوو بەڕێوە دەبرد، لە هەموویان بەناوبانگترە. ئەم بانکە دەبێ پارە تایبەتییەکان بڵاو بکاتەوە و بە بەخششی ئیعتیباری بێسوود دەستبەکار بێ هەتا تاکەکان بتوانن بەکار و کەسپەوە سەرقاڵ بن. ئەوەی کە پرۆدۆن لەو نارەزامەندە خاوەنداری تایبەتی و کەسپ و کاری تایبەتی نەبوو بەڵکو «بە دەستهێنانی دەسکەوت لە کار و زەحمەتی ئەم و ئەو لە هێندێ رێی وەک ئیجارە، سوود و چەوسانەوە بوو».[٩٨]

سەندیکالیزمی شۆڕشگێڕ و ئانارکۆسەندیکالیزم هەر دووکیان بزووتنەوەی دژی سیاسی و دژی دەوڵەتی بوون کە لەسەر «هێزی شاراوەی شۆڕشگێڕی

ڕێکخراوەی ئابووری چینی کرێکار، بەتایبەت یەکێتی مەدەنی و یەکێتی پیشەسازی تەئکیدیان دەکرد».[99] بە شێوەی گشتی سەندیکالیزم باوەڕی بە دیموکراسی پەرلەمانی نەبوو و هەمو جۆری ڕێکخراوەی دەولەت چ سۆسیالیستی و چ سەرمایەداری، ڕەتدەکردەوە. لە بریتانیا بە یەک ڕادە ڕقینی لە حزبی کرێکار و لیبرالیزم دیموکراتیکی کۆمەلایەتی و یەکێتییە مەدەنییەکان بوو. ئابووری بازاڕی بە ڕادەی ئابووری دەستووری کۆکراوە و پیشە خۆمالیکراوەکان جێی نارەزامەندی بوو.[100] سەندیکالیزمی بریتانیایی لە ناخەوە لەگەل واژەگەلی تەبا و ڕەبای لیبرالی نوێ لە ساڵەکانی ١٩١٤ـ١٩٠٦ دژایەتیان بوو. ئەو جۆرە کە نووسەرێک گوتوویە سەندیکالیستەکان ستوونی سەرەتایی دەولەتی تەبا هەر تەنیا گەلالە گیراوە بە مەبەستی بالاچوونی کارکردی پیشەسازی و سیستەمی کۆمەلایەتی» دەزانران.[101]

بە بۆچوونی سەندیکالیزم و ئانارکۆسەندیکالیزم، هۆکارانی سەرەکی ئابووری گروپە بەرهەمهێنەرەکانی چینی کرێکار بوون نەکبەکارهێنەرەکان. ئەم تەولیدکارانە دەبێ هەم دەولەت و هەم سیستەمی سەرمایەداری «بەهەولی ڕاستەوخۆ»ی شۆڕشگێڕی بڕووخێنن. بۆ ئەم دەستبەکاربوونە پالپشتی بە دەمارگرژی تەواو ڕەوا بوو. ژۆرژ سورل لە کتێبی تێڕامانێک لەمەڕ دەمارگرژی بەم ناوەڕۆکە تایبەتە، زۆر کاری لەسەر کردەوە. یەکێتییەکان نەک هەر وەک ئامێرەکانی ئەم دەسپێکە ڕاستەوخۆیە شۆڕشگێڕییە دەدرانە قەلەم، بەلکو لەگەل ئەوەدا، کاکلی کۆمەلگەی فدرالی دژە کۆکراوەی داهاتوو بوون. کرێکارانی هەر ئاقارێک دەبوو ببنە ئەندامی یەکێتییەک، ئەو دەم یەکێتییەکان دەبوو لە کارتێلێکی (گرێبەست ناوەندیدا یان بورس «جێی کڕین و فرۆشی ئەوراقی بەبایەخ» یەک بگرن. ئەم بوورسە ئەرکی پڕۆپاگەندە، فێرکردن و ئامادەکردنی کرێکاران بۆ بەدەستهێنانی کۆنترۆلی ژیانی خۆیان بە ئەستۆیانەوە بوو. کارتێلەکانی کرێکاری لە ئاقارێک بە شێوەی یەکێتی یان فدرالی کۆدەبوونەوە و پاشان جۆرێک فدراسیۆنی میللیان پێکدەهێنا. ئەم یەکێتییە مەزنە پیشەسازیانە نەک هەر بنەڕەتی ڕاپەڕین بەلکو بناخەی کۆمەلگەی داهاتوو دێننەدی. سەندیکالیستەکان ئەگەرچی لە ڕوانگەی لەبێخ

ـەهاتوو و رۆشنبیرخوازی بورژوایی بیزاربوون، بەلام لەسەر خۆ فێربـوونی چـینی کرێکار تەئکیدی زۆریان دەکرد. ئەمە تا رادەیەک وێچووی بووسی کاری پلۆتییە لـە ەرانـسا، ئەنجوومـەنی زانـستییەکان، ئەنجوومـەنی فێرکـردنی سەندیکالیـستی یشەسازی و کالجی مەرکەزی کار لە بریتانیا بوو.[102]

لـە روانگـەی ئانارشیـستییەوە ئاشـتکردنەوەی رێکخـراوەی دەسـەلات لەگـەڵ ـزادی سەربەخۆیی تاک گرفتێکـی گەورەیـە. ئەگـەر دەسـەلاتی سیاسـی هەلـگری ـافی دەسەلاتداریە و پێرەوانی ئەم دەسەلاتە مـافی هەلبژاردنی بەرێوەبـەرن یـان ـەرێوە نـەبردنیان نییـە، کەواتـە وادێتـە بـەرچاو کـە ئـازادی رەتکراوەتـەوە. ئـەم ـستەنگی و گرفتە تایبەتییە بۆ ئانارشیـستە کۆمۆنیـستەکان و کۆخـوازی بـووە کـە ـابەتی نیاز و حەز بە شێوەیەک لەگەڵ جەماوەر و دەسەلات رووبەڕووبوونەتـەوە. ـاکخواز لەگەڵ ئەم گرفتە بـەم جـۆرە راسـتەوخۆ رووبـەڕوو نابێتـەوە، بەلـکو بـە ـساکاری حاشا لە پێوەندی ئەو لەو دەکا و دوور دەکەوێتەوە.

رێگای هەلسوکەوت لەگەڵ ئەم گرفتە کەلـک وەرگـرتن لـە واتـای دێموکراسـییە، بریار دەربارەی سەربەخۆ بوون تـاک بـەرەو هـەرێمی گشتی رادەکێشێ. لەبـەر ئەمە، دەسەلات لە ویستی خەلکەوە هەلدەقولێ. بە بوونی ئەمـە لـەم رێنوێنیانەشـدا ـەسەلەیەک دێتە ئاراوە. پێشەکی ئەو جۆرە کە توێژەرێک لەم دواییانـەدا گوتوویـە: «پێوەندی نێـوان روانگـەی ئانارشـیزم و روانگـەی دێموکـراتیک هەمیـشە شـاراوە بوە».[103] بە بوونی هۆگری ئاشکرا سەبارەت بە مـودێلێکی هاوبەشـی دێموکراسـی، هەموو رێبازەکانی ئانارشیستی لە ناخەوە بە شێوەی گشتی بە هۆکار گـەلێکی زۆر سـەبارەت بـە دێموکراسـی رەخنـەیان بـوو. یەکـەم، زۆرینـەخوازی تەنانـەت بـۆ ئانارشیستە کۆمۆنیستەکانیش پڕمەترسی هاتوونە بەرچاو. زۆرینـە رەنگـە ئاشـکرا هەلوێستگەلێکی نائەخلاقیانە بگرێ. ئەوانـە دەتـوانن بـە شـێوەی نهـێنی و شـاراوە ئازادی تاک سەرکوت بکەن. بێجگەلەوە، حزبە دێموکراتیکەکان هەم دەسکاریکراو و هـم بێمـوداران، ئەوانـەی خـاوەن رەئـین لەبـەر هەڕەشـەی مەترسـی تایبـەت. بـە بۆچـوونی تـاکخـوازانی ئـەمریکایی، رەنگـە دێموکراسـی تەنانـەت خـاوەنداریتی

تایبەتیش بێهێز بکا یان لەناوی بەرێ. ئەو جۆرە کە پرۆدۆن لە بوارێکی دیکەدا گوتوویە، کەمێک ئیمکانی هەڵبژاردنی نێوان شایەکی خۆخواز و سەرەڕۆ و دەسەلاتی خەڵکی سەرەڕۆ بوونی هەیە. هەردووکیان بە شێوەیەکی سەرەڕۆیانە بەسەر تاکدا حکوومەت دەکەن.[١٠٤]

دیموکراسی پەرلەمانیش لەبەر هەڕەشەی ڕەخنەی تایبەتی دایە. بە بۆچوونی پرۆدۆن گۆڕینی هەڵبژاردن و راپرسی گشتی جیاوازیان لەگەڵ یەکدا نییە. هەردووکیان دەتوانن بۆ سەرپۆش لەسەر دانانی کردەوەکانی دەوڵەت بن، بە باوەڕی پرۆدۆن راپرسی گشتی بەواتای سەرەڕۆیی گشتییە. ئانارشیستەکان سیستەمی نوێنەرایەتیان هەمیشە بە درۆزن زانیوە. لەبەر ئەمە، باکونین بە «وێچووی دەسەلاتی ویستی دەستکرد و فێڵەبازانە خەڵک کە ئەگەر لەگەڵ وێچووی نوێنەرانی خەڵک لە پەرلەمانە بە هەڵەبراوەکانی خەڵکی خۆی دەنواند» رەخنەی دەگرت.[١٠٥] لە ئاخردا بە بۆچوون زۆربەی ئانارشیستەکان، دیموکراسی پەرلەمانی لەگەڵ سیاسەتەکانی حزبی و دەوڵەتخوازیدا پێوەندی بوو. دیموکراسی راستەوخۆی هاوبەشی بەتایبەت پەرلەمانی بوو. وێڕای ئەمە تەنانەت ئەمەش بە گومانەوە چاوی لێ دەکرا.[١٠٦] جارێکی دی ئەگەر و گریمانە ئەمە بوو کە ئازادی تاک بایەخی سەرەکی هەیە کە زۆرینە رەنگە ئەوە لە یەکێتییە هاوبەشییەکاندا بە ساکاری پێشێلی بکەن. بەم هۆیەوە دیموکراسی پێویستانە ئیزنی بە ئانارشیستەکان نەدەدا کە مەسەلەی دەسەلات و ئازادی بەرچاو نەگرن.

دوا مەسەلە لە روانگەی ئانارشیستییەوە پێوەندی بە میتۆدی گەیشتن بە رێکخراوەی سیاسی نوێوە دەبێ. بە کردەوە هەموو ئانارشیستەکان بۆ گەیشتن بەم ئامانجە خوازیاری شۆڕش بوون، چ بە شێوەی ئاشتیخوازانە و چ بە شێوەی دەمارگرژی و شەڕخوازانە بوون. جەوهەری شۆڕش هەمیشە گرێدراوە بە گۆڕینی کۆمەڵگەوە. شۆڕشی سیاسی یان ئابووری تەواوکەر نەبوو. دەبێ گۆڕانکارییەک لە شێوەی مامەڵەوە و بینینی کۆمەڵگەدا سەرهەڵدانی ببێ. پرۆدۆن و راتبارد بڕوایان بوو کە لە لایەن ئامێری ریفۆرمخوازانە و کار لە دەروونی پێکهاتەی دەوڵەت

ئانارشیزم دەیتوانی بە ئامانجی خۆی بگا. بە بیروبۆچوونی باکونین ئەم فیکرە مایەی بێزاری بوو؛ رووخانی پێکهاتەکانی دەولەت ئامانجی بالا و سەرەکی هەرچەشنە گۆڕانێکی پێکدەهێنا. لە لایەکی ترەوە گودوین باوەڕی بە دەسەلاتی بە قەناعەت گەیاندنی مەنتق بوو. ئەم ئەندیشە بە هیچ شێوەیەک لەناو نەچوە. لەراستیدا بە قەناعەت گەیاندنی ئەم و ئەو لە لایەن فێرکردن و پەروەردە و کتێب و چاپەمەنییەوە باشترین رێ بۆ ئانارشیستەکانی ئەمڕۆیە. دۆزی بەدیهێنانی سەرمەشق یان پشتگری و پالپشتی لە جەماوەری جێگریش کێشان و گیرایی هەمیشەیی هەیە. ئەمە تا رادەیەک بە میتۆدە ئاشتیخوازییەکانی ئانارشیستی تۆلستۆی و رێزلێگیراوی ئەو، گاندی وێچوویی هەیە.

لە لایەکی ترەوە ئەو جۆرە کە لە کاریکاتۆرە بەناوبانگەکانی ئانارشیستەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا دەردەکەوێ، رێی دەمارگرژیش گیرایی و کشانێکی لە رادەبەدەری بوو. چالاکی دەمارگرژی راستەوخۆی پێشنیاری، شێوەگەلی جۆراوجۆری بوو. لە لایەکی توندوتیژی ئەم بزاڤە خەون و خەیالە بە تەوژمەی بە واتای «پرۆپاگەندەی کردەوە» بوونی بوو کە هەمیشە لەسەر بنەمای بەرەوپێشچوونەکانی تاک بوو و باوەڕی بە بۆمبرێژی یان کوشت و کوشتار بوو. بە رووبەڕووبوونەی ئەم شێوە لە جەنایەت و رێگریش پشتگری دەکرا. توندوتیژترین لایەنگری گەرایشی دوایی سرگئی نچایف، هاوڕێی باکونین بوو کە تەمەنێکی کورتی بوو. نچایف «لەگەڵ، یان بێیارمەتی باکونین» بەشی بەناوبانگی بنەڕەتی شۆڕشگێڕی ئامادە کرد کە لایەنگری کردەوە ترۆریستەکان بە شێوەی رێی داهاتوو بوو. کەسانێکی دیکە لە راپەڕینی چەکدارانەی رێخراو لایەنگریان دەکرد، بەلام لەوەی کە بە قەولی بەناوبانگ، ئانارشیستەکان لە کاری رێکخستندا شارەزایەکی باش نین، ئەم فیکرە گرفتێکی زۆری لێکەوتەوە. ئانارشیستەکان هەروەها سەرنجیان دابووە چالاکی مانگرتن. ئەوان بە کردەوە لە مانگرتنەکان لایەنگرانە کەلکیان وەردەگرت، بەلام زۆرتر سەندیکالیستەکان و ئانارکۆسەندیکالیستەکان لایەنگری مانگرتنی گشتی بوون. ئەم کارە دەبووە هۆ کە

کار بـه گـشتی راوەسـتێ و لـه کۆتاییـدا لەگـەڵ رووخـانی سیـستەمـی سیاسـی و ئـابووری رووبـەڕوو بێتـەوە. ئانارشیـستەکان و ئانارکۆسەندیکالیـستەکات لـە دەروونی پێگەی کار لایەنگری نەفع و خراپکاری بە شێوەی شێوەگەلی بێهێزکردنی سیستەمیش بوون.

له کاکڵی ئانارشیستدا دەمارگرژی زۆرجار بە شێوەیەکی تەم لەسـەر و شـاراوە لە زۆر جیا کراوەتەوە و هاوێرکراوە. زۆر کردەوەی ناڕەوایە کە پۆلیس و دەوڵەت دەیسەپێنن، ئێستا کە دەمارگرژی بە هـۆی ئامانجگـەلێک کـە هەیـە کـردەوەی رەوا دەدرێتە قەڵەم؛ میتۆدێک بوو بۆ پاککردنەوەی کۆمەڵـگەی بـورژوایی. لەگـەڵ ئەمـە، ئەم پاککردنەوە لە بابەتی ئەمە کە لەغاو و هەوسـاری هێزگـەلێکی بـەردەدا کـە بـێ پێویست بە تەقینەوە و لـە مەترسـی خـستنی گیـانی بێتاوانـان کۆتـایی پێدەهات و دەیتوانی پڕمەترسی بێ.

## دەرەنجام

ئانارشی زۆرتر لە ئیدئۆلۆژییەکانی دیکە گیرۆدەی کێشە بۆچوونییە قووڵ و جۆراوجۆرە تاکتیکییەکانە. بەم حاڵەوە هێشتا کشانێکی راوەستاوی هەیە. هۆی ئەم کارە ئاشکرایە. نەک هەر تەنیا ئەم ئیدئۆلۆژییە هەمیشە خوازیاری ئازادی تاک لە بەرامبەر گشت شێوە پێداگر و سیستەمی وشک و کردەوەی زۆر بووە، شتێک کە لە ناخەوە سەرنجی ئەندێشەی ئەوروپایی لەسەردەمی ریفۆرماتی دینی و تافی رۆشنبیری بەرەو خۆی راکێشاوە، بەڵکو هەمیشە لەگەڵ ژیانی گروپی و بەتایبەت رێکخراوەی دەوڵەت دژایەتی کردووە. ئەم کار عەقڵەن ئانارشیزمی لەگەڵ مەسەلەگەلێکی پڕلەگرێکوێرە رووبەڕوو کردووەوتەوە. لە لایەکەوە ئانارشیزم رازی بە بایەخی تاکخوازیە. بەلام گێژەڵووکەی مەنتقی تاکخوازی ئەو دەگەیێنێتە سنوورەکانی پووچەڵی، رێبازی خۆخوازی دەروونناسی ئەستیرنر راستبینترین و بە بڕشترین لایەنی ئەم مەنتقییەیە. ئەگەر تاک بایەخی باڵا و تاقانە داورەی بایەخەکانە کەواتە هەر شت باڵاتر لە تاک پێویستانە جێی گومانە. ئانارشیستەکانی دیکە وەک راتبارد، گودوین یان تۆلستۆی هەرگیز مەنتقی بنەمایی تاکخوازیان هەتا دەرەنجامی کۆتایی بەدوویدا ناڕۆن. ئەوان بێپسانەوە بەدووی ئاشتییەوەن. یان بە هۆی عەقل، مافە سروشتییەکان و بازاڕەکان یان موعیزەی مەسیح لەسەر کێو.

لە لایەکی دیکەوە ئەو ئانارشیستانەی لایەنگری کۆمەڵگەی هاوبەشی کە لە دووی وردە ریشەی تاکباوەڕی دەگەڕێن لە بەرامبەر گرفتێکی دیکە بێسەبری لەخۆ نیشان دەدەن. هێزی شاراوەی بایەخەکان و ئامانجە هاوبەشەکان سەدێک لە رووبەڕووی ئازادییە تاکەکان دروست دەکەن. هەرکە جەماوەرێک فۆرم دەگرێ دێتە بەرچاو کە ئاستەنگیگەلێک لە بەرامبەر تاکەکان سەرهەڵدێنن. لە وەها بارودۆخێکدا ئازادی بەناچار کەم و ئاستەنگ دەبێ. هەڵبەت رێگایەک بۆ دەور لێدانی ئەم گرفتە هەیە. کروپۆتکین باوەڕی بوو کە سورشتی مرۆڤ لەراستیدا بۆ ئەم بارودۆخە کۆمەلایەتییە شوێنگەلێک دەدۆزێتەوە، بە وتەیەکی دی، ئیرادەی ئازاد ناچێتە ناو رێنوێنی و بەڵگەوە. کردەوەی تاک لە باری بیولۆژیکییەوە بەرتەسک و دیارییە.

کەسانێک باوەڕییان هەیە کە ئازادی راستەقینە لە ناخی کۆمەڵگە و بایەخەکانی ئەودا بە حەقیقەت دەگا. ئێستا بیولۆژی کروپۆتکین بە توندی لەرزۆک دێتەبەرچاو و رێنوێنییەکانی ئازادی پۆزەتیڤ ئانارشیستەکانی لایەنگری کۆمەڵگەی هاوبەش لە لایەنگرانی دەوڵەت کە دەوڵەتیان بە هەڵگری ئەم ئازادییە دەزانی، نزیک دەکاتەوە. لە روانگەی ئانارشیستەکانەوە، گرفتی تایبەتی ئازادی تاک لە کۆمەڵگە لە کۆششی ئەوان بۆ لێدوان دەربارەی (تاوان)، (سزا) تەوەزەلی و هەڵەی کۆمەلایەتی دەبینرێ. هێندێ وەلام بۆ ئەم مەسەلانە تا رادەیەک گەوجانەن. هێندێ لە ئانارشیستەکان باوەڕیان هەیە کە دەربارەی جۆرم و هەڵەی کۆمەلایەتی درۆکراوە و لەرادەبەدەر نرخ بەوانە دراوە. ئەم دیاردانە منداڵانی دەوڵەتخوازی، سەرمایەداری و سلسلەمەراتبەکانی کۆمەڵگەن. دەکرێ تاکەکان رازی بکرێن و فێر بکرێن، یان لە شێوەی تێکشکان ئەوان لەباری کۆمەلایەتییەوە چاوپۆشیان لێبکرێ یان لە کۆمەڵگە دەرکرێن. ئەگەرچی هێندێ لە رێچارە نشاندراوەکان عەقلانی دێنەبەرچاو، بەلام دژوارە کە باوەڕ بکرێ کە ئەوانە چارەسەری مەسەلە گرێدراوەکان بە جۆرم و هەڵەی کۆمەلایەتی بکا. هەروەها ئاشتکردنەوەی ئەم کردەوە ئانارشیستییە لەگەل بایەخی ئازادی دژوارە. وا نایەتە بەرچاو کە بارودۆخێکی جیاواز لە ئارادا هەبێ کە بتوانرێ لەژێر میتودی یاسای رەسمیدا ژیان بکرێ؛ لەڕاستیدا ئەوانە دەبوو خراپتر بووبان.

کاتێک ئانارشیستەکان لە کۆمەڵگە ئارمانجییەکانی خۆیان دەدوێن، مەگەر لەو کاتانەی کە باس لە جەماوەری گوندی سەرەتایی و لەناوچوو و نەگونجاو لەگەل سەردەم و لەباری زانستی مرۆڤناسییەوە بێهێز و لاواز لە ئارادا بێ، گشت راوێستەکانی ئەنوان جوان و لە بار، بەلام دوور لە زاستی و لەناخەوە وەک حەسرەت دێتە بەرچاو. جگە لە بێهوودە بینینگەلێکی وشکتر و سەیرتری ئانارشیستە تاکخوازەکان، ئانارشیستە کۆمۆنیستەکان، کۆخواز و بەرامبەرخواز دوورنوێنی هەزارەیەک دەکێشنەوە کە هەموو ئێمە لە باشترین کاتی ژیاندا بەڕاستی ئارەزووی ئەوەمان هەیە، بەلام دەزانین کە هیوایەک بۆ گەیشتن بەوە بوونی نییە.

وشەی فاشیزم یەکێک لـە بەرهەمـەکانی ئـەم سـەدەیە. تـوێژەرێکی پایەبـەرزی فاشیزم گوتوویە، تەنانەت لە ١٩٢٠ «وشەی فاشیزم بۆ هێنـدێ لـە خەڵـکی ئـەوروپا نامۆ بوو و تەنانەت موسولینی ئەوەی لـە گێڕانـەوەی واژەناسـیدا بـەکاربردبوو».[١] هێندێ کۆمەڵناسی سیاسی سەرهەڵدانی دوایی ئەوەیان لە پانتای سیاسی، بـە هـۆی خوو و ڕەوشتی ناهەمەلایەنەی بزووتنەوە، زۆر بە نادیار و شاراوەیان زانیوە.[٢]

وشەی فاشیزم لەباری ریشەناسییەوە لە واژەی لاتینی faces بە واتای دەستـە تەرک یان چێوی تەڕ [تەڕکە درەخت و داردەستی تەڕی بە یەکـەوە بەسـراو] بـە نیشانەی دەسەلاتی یەکگرتوو سەرچاوە دەگرێ کە لە بارەگای کۆنسۆنخانەکانی کوماری رۆم بە شێوەی سوننەتی دەیانپاراست و دەسەلاتداران ئەوانەیان نیـشان دەدا. روون نییـە کـە ئـەم وشـە بـە هـۆی چ پێوەندییکـەوە لەگـەڵ رۆمـی دێـرین هەڵبژاردبێ، هەرچەند دواتر فاشیستەکان لەسەر ئەم بابەتە تەئکیـدیان کـردووە.[٣] سەرەتا ئەم واژە وتای هەستبزوێنی بوو کە گروپە شۆڕشگێڕەکانی سیسیلی لـە ١٨٢٠ ناوی facci لەخۆیان نابوو. ئەم واژە واتای دەروونی سۆسیالیستی خـۆی هەتا سالی ١٩١٤ پاراسـت کـە لـەو سـەردەمەدا گروپـەکانی faceio سـەرجەم بـۆ بەشداری کردن لە جەنگی جیهـانی یەکـەم بانگهێـشت کـرد و خـۆی بـەناوی دژی بێلایەن پەسند کرد. گروپە پالپشتە میللییە کارامەکان بەر لـە تێـشکانی ئیتالیـا لـە کاپۆرتۆ، لە سالی ١٩١٧ش ناوی facei لەخۆ نابوو. بـەم جـۆرە ئـەم وشـە پێگـەی سۆسیالیستی بەهێزی بوو و دواتر چالاکی ناسیۆنالیستی نـاوبراوی پارلـەمانی و ناحزبیشی گرتەبەر. موسۆلینی سۆسیالیستی تازەپێگەییو کەوت بە کـۆچیلی ئـەم چالاکییەوە و پاشان لە سالی ١٩١٥ بوو بـە ئەنـدامی faceio مـیلان. پـاش جـەنگی جیهانی یەکەم، لە سالی ١٩١٩ موسۆلینی faceio میلان لەژێر ناونیشانی faceio di com bottimento سـەرلەنوێ رێکیخـستەوە. تەنانـەت موسـۆلینی نـەبوو کـە لـە سەرەتادا واژەی فاشیزمی داهێنا و پڕۆپاگەندەی بۆ کـرد. پـاش مـارش دیرۆکـی رۆم بوو کە فاشیزم خـۆی زانیـاری بەدەسـهێنا و بـە تالـوکە خـۆی کێـشایە نـاو

لێدوانە سیاسییەکانی ئەوروپا. لەم کەش و هەوا تایبەتییەی پاش ریشە داکوتانی سیستەمی فاشیستی لە ئیتالیا لە ١٩٢٢ـ١٩٢٣ روویدا.

لە توێژینەوەی فاشیزم کۆمەڵێک گرفت لە ئارادا هەیە. لەنێو گشت ئەو ئیدئۆلۆژیانەی کە دەربارەی لێدوانمان کردووە، فاشیزم تاقانە ئیدئۆلۆژییەکە کە بیچمی ناحەزی هەیە. پێچەوانەی ئەوە سەرجەم ئەورووپای ١٩٢٠، جگە لە کۆمۆنیستەکان، ئەوەیان بێزیان دەزانی، ئەم رێبازە زیندووکەرەوەی بیرەوەری قەومقڕان و تەقینەوەی بێسابقەی ئەوروپایە. لە دەیەی ١٩٥٠ بەدوا ئەم بیچمە نیگەتیڤییە بووە بە جنێوێکی ناحەزی سیاسی.

مەسەلەیەکی دیکەی بەسراوە بە پێوەندی نێوان «فاشیزم» و «ناسیۆنال سۆسیالیزم» بە شێوەی یەک ئیدئۆلۆژییە. هەرچەند جیاوازییەکی زۆر لە نێوان ئەم دوو بزاڤەدا هەیە، نزیکایەتی بەگوڕی ئەوان ئەوندەیەکە هەست دەکرێ هەڵقوڵاوەی سەرچاوەیەکن. مەسەلەیەکی سەرەکی دیکە بێپسانەوە لە لێکدانەوەکانی فاشیزم و ناسیۆناڵ سۆسیالیزمدا دووپات دەبێتەوە، ئەمە راستە کە ئەم ئیدئۆلۆژییە لەگەڵ ناسیۆنالیزمە تایبەتەکان هەم پێوەندی هەیە و هەم دژایەتی. ئەم تایبەتمەندییە میللییە بووەتە هۆی ئاستەنگی قەبووڵ کردنی سازشی جیهانی ئەو، ئەم گرفتە بۆ ئەوانەی کە دەیانویست لە ساڵی ١٩٣٥ «نێونەتەوایەتی فاشستی» پێکبێنن زۆر توندوتیژ بوو. ئەم گرفتە لە سەردەمی پاش ساڵی ١٩٤٥یش بۆ ئەو کەسانەی کە فاشیزمیان بە واژەیەکی تەوسیفی رەوا بۆ سووبردن لە زانستە سیاسییە هاوچەرخەکان یان کاری مێژوونووسی دەزانی. هێشتا لە ئارادا هەیە، دژوار دەتوانێ جیهانی بێ، چونکە ناسیۆنالیزمە تایبەتەکان لە دژایەتی لەگەڵ رووبەڕوو دەبنەوە.

مەسەلەی دیکە دەربارەی پێوەندی نێوان فاشیزم بە شێوەی ئیدئۆلۆژیەک، بزووتنەوە سیاسییەکانی بەسراو بەوەوە و چالاکی فاشیستگەلێک کە ئێستا دەسەلاتداری بوونی هەیە. ئەم مەسەلەیە لە ئیدئۆلۆژییەکانی دیکەشدا، روودەدا، بەلام لە فاشیزمدا پێچراوەیی و ئاڵۆزییەکی تایبەتی هەیە.ئەم ئیدئۆلۆژییە لەبارودۆخی خۆهۆشیارانەی خۆیدا دژی ئیدئۆلۆژییە و هەموو کۆششەکانی بۆ

...ره عەقلانییەکانی بێبایەخ دەداتە قەڵەم. لەبەر ئەمە، ئەو بزاڤانەی بەسراوە بەو ... ئەو حکوومەتانەی کە کێشەی فاشیستیان بوو، هەیانە لەباری عەقلانییەوە بە ...سانی بۆ بەیان و شیکردنەوە نابێ و نایەتە بەرچاو.

ئەو جۆرە کە توژەرێک گوتوویە: «هێندێ بینەران ئاوێنەی جادوویی ...دبیردێننەوە کە هەرکەس، چ لایەنگری حکوومەتێکی چەکداری، چ دیکتاتۆری و چ ...شتیخوازی توندوتیژی باڵی چەپ، دەتوانێ نزیکایەتی پێشووی خۆی لەودا ...بینێ».[٤] فاشیزم بواری مابەینی نێوان ئیدئۆلۆژی سیاسی عەقلانی لە لایەک و چەواشەکاری دەرفەتخوازانە لە لایەکی دیکەیە. ئامانجە سیاسییەکانی هەمیشە ...رادەی پێویست بەیانگەرنین. هەرچەند دەتوانین تیشک بخەینەسەر زانیارییەکی ...ۆر و ئاشکراکەر بن. ئەمە هەتا رادەیەک راستە کە فاشیزم لە سەرەتاوە زۆرتر میتۆد یان تکنیکی بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات بووە کە پاشان باوەڕی ئیدئۆلۆژیکی بۆ ئەو ئامادە کردووە. بەڵام لەگەڵ ئەمەدا، حاڵەتی لایەنبوونی ئیدئۆلۆژی، نابێ ببێتە هۆ کە ئێمە ئەو بە هەند نەگرین یان چاوی لێخافڵ کەین.

لە هەوڵ بۆ دیاریکردنی خوو و رەوشتی ئیدئۆلۆژی دەبێ لەگەڵ گیر و گرفت دەس و پەنجە نەرم کەین. فاشیزم رێبازێکی بەتەواوی وردبین و زۆرجار سەرنجراکێشە. زۆر لە بەیانەکانی ئەو ساویلکانە، سەرزارەکی شاراوە و پرۆپاگەندە دێنەبەرچاو. بەم حاڵە، ئایا ئێمە هەمیشە چاوەڕوانی لە ئیدئۆلۆژی دەکەین کە رێکوپێک و هاوتەریب و رەواکراو بێ؟ بە جۆرێکی دیکە، ئایا دەکرێ هەمیشە جیاوازی ئاشکرا و هاوکێش لە نێوان ئیدئۆلۆژی و پرۆپاگەندە دابنرێ؟[٥] ئیدئۆلۆژی رەنگە بەشێوەیەکی جۆراوجۆر، لە ساکارترین هەتا پێچراوەترین شێوە خۆبنوێنێ. ئێمە نابێ شتێک بە بۆنەی سەیر و سەمەرە بوون، سادەنوێنی بوون، وردبینبوون یان پرۆپاگەندە بوون بە هەندێ نەگرین.

گرفتی دیکە گرێخواردوو بە پێوەندی فاشیزم لەگەڵ ئیدئۆلۆژییەکانی دیکەیە. ئەمە پانتایەکی پێچراوەیە کە هەر تەنیا دەتوانی تا رادەیەک هەست بەوە بکەی، لە لایەکەوە، پێوەندییەکی سەیر ئاشکرا لە نێوان سۆسیالیزم، سەندیکالیزم و فاشیزمدا بوونی بووە. نێونانی «ناسیۆنال سۆسیالیزم» لەخۆڕا نەبوو. فاشیستە

سەرەتایەکان لە ئیتالیاش ناوی «سەندیکالیزمی میللی»یان لەخۆیان نابوو. نابێ لە بیری بکەین کە زۆر لە فاشیستەکان، هی وەک موسۆلینی لە ئیتالیا و موزلی لە بریتانیا لە سەرەتادا مەیل و دڵبەستییەیی گەلێکی سۆسیالیستیان بوو دڵپێوەبوونێکی بەهێزیش لەگەڵ شێوەی پارێزگاری لە فاشیزمدا هەیە. سەرجەم ئەمانە، ئەو جۆرە کە ژیاننامەنووس ئۆزۆلد موزلی نووسیویە: «بۆ مێژوونووس. فاشیزمی وەکو ژانووس دوو رووی هەیە: یەکیان دەروانێتە پێش و دل و دەروونی سەردەمی رۆشنبیری هەیە و هۆگری کۆنترۆلی عەقلانی و رێنوێنی ژیانی مرۆڤە؛ رووی دیکەی لە دواوە، دەروانێتە خولە ساکارترەکان و سەرەتاییترەکان، ژیانی سەردەمێک کە مرۆڤەکان بۆ زیندوومان لەگەڵ یەکتر شەڕیان دەکرد».[٦] لەباری ئیدئۆلۆژیکەوە فاشیزم نە بەتەواوی خۆی سۆسیالیستی بو و نە سروشتی پارێزگارانە. ئەم ئیلهامە، بەتایبەت لە ساڵەکانی یەکەم سەرهەڵدانی ئەو بووە هۆ کە زۆربەی رۆشنبیران ئەوە بسەلمێنن.

## پێگەکانی ئەندێشەی فاشیستی و ناسیۆنال سۆسیالیستی

لەمەڕ دوو بابەتی پرەنسیپی لەم بەشەدا لێدوان دەکەین. بابەتی یەکەم دەربارەی ریشە و مێژووی فاشیزم و ناسیۆنال سۆسیالیزمە. بابەتی دووەم لەسەر جۆراوجۆری پێڕەوە زانستییەکان لەمەڕ ئیدئۆلۆژی و بزاڤەوە دەدوێ. ئەم دوو بابەتە بێ پێوەندی لەگەڵ یەک نین، تا رادەیەک لەو رووە کە زۆربەی هەوڵەکان بۆ تیشک خستنەسەر سروشتی فاشیزم، دوورنوێنەکان و بینینە جۆراوجۆرەکانی لەمەڕ سەرچاوە و مێژوو ئەوەش لەخۆدەگرێ. بۆ ئەوەی کە لێدوان لە چوارچێوەی بەشە هاوپێوارەکان و عەقل بیسەلمێنێ، سەرچاوە و مێژوو هەر تەنیا بە شێوەی سەرەتای بابەتەکان تاوتوێ دەکرێ. سەرنجی سەرەکی ئێمە رووی لە دووەمین بابەتی پرەنسیپی واتە راستییە جۆراوجۆرەکانە.

چوار خاڵ یان بۆچوون لەمەڕ سەرچاوەی فاشیزم بوونی هەیە. یەکەمیان فاشیزم بە حاڵەتێکی غەریزی و زەینی دەزانێ کە لە هەموو شێوەکانی

ـيكخراوەی کۆمەڵایەتی لە سەرەتای شارستانییەتە بەرچاو دەکەوێ. ئەم خاڵە
ـەسەرنجێکی موسبەتترەوە لە لایەن بیرمەندانی فاشیزم خۆیەوە واتە لە لایەن
تویژەرانی ئاڵمانییەوە کە ناسیۆناڵ سۆسیالیزمیان لەگەڵ «زانیاری جەماوەری»
ـ مێژووی پڕەنسیپی باکووری پێکەوەگرێ داوە یان فاشیستە ئیتاڵیایەکان کە
ـوانگەی خۆیان بەستۆتەوە بە ئیمپراتۆری رۆمەوە هاتووەتە ئاراوە. بێجگەلەمە،
هێندێ شیکاری دەروونناسی ئەم سەدە فاشیزمی لەگەڵ جۆرێک لە پێکهاتەی
کەسایەتی تێکەڵیان کردووە، پێکهاتەیەک کە شاراوە و نادیار لە هەموو
ـرۆڤەکاندا بوونی هەیە. خاڵی دووەم لە بارەی پێگەوە کە بەتایبەت لە فاشیزمی
ـیتاڵیادا بەرچاو دەکەوێ، سەرهەڵدانی ئەوە دەبەستەوە بە بزووتنەوە
کەلتوورییەکانی ئەورووپاوە وەکو رێنیسانس یان سەردەمی رۆشنبیرییەوە. بۆ
ـوێنە ئالفرێد دووروکۆ فاشیستی ئیتاڵیایی، ماکیاڤێلی بە باوکی دامەزرێنەری
ـاشیزم دەزانی. روکۆ لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە «فاشیزم نەک هەر باوەڕکانی
خۆی بەڵکو کردارەکانیشی لە ماکیاڤێلی وەرگرتبوو».[٧] روکۆ ناوی ویکۆ و
ـاتزینیش وەکو کەسایەتییە پلەبەرزەکان دێنێ.

بیر و بۆچوونی سێیەم کە خاڵێکی موئەسیرتر، دەربارەی پێگەیە، فاشیزم و
ناسیۆناڵ سۆسیالیزمی بە لایەنگەلێکی بێتەوژمی خۆنواندنی پێچراوەی نیگەتیڤی
سەبارەت بە شۆڕشی فەڕانسا لە ئەندێشەی ئەورووپایی دەزانێ. وەڵامی توند و
ـیاری و رەخنەیەکی زۆری لە بیرمەندان و رژێمە ئەورووپاییەکان سەبارەت بە
گەشەی لیبڕالیزم، یەکسانخوازی، دێموکراسی، عەقڵخوازی، بەپیشەسازی بوون
و دواتر سۆسیالیزم لە ماوەی سەدەی نۆزدەیەم، بواری سەرهەڵدان و
جۆرجۆرەکانی فاشیزمی پێکهێنا. ئەو جۆرە کە توێژەرێک وەبیری هێناوەتەوە:
«گەشەکردنی فاشیزم... بەتەواوی هەڵگری شیکردنەوە نییە مەگەر ئەوەکە ئەو لە
بوار و بەستێنی فیکری، ئەخلاقی و کەلتووری رەواج لە ئەورووپا لە کۆتایی
سەدەی نۆزدەیەمدا چاوی لێ بکەین».[٨] لەم بوارەدا بزاوتە فیکرییە
رۆمانتیسیزمەکانی ئاڵمانی، ئەندێشەی Völkisch (نەتەوەخوازی)، داروینیزمی
کۆمەڵایەتی، روانگەی هەڵبژێراوان، سەندیکالیزم، جووڵانەوەی هەرەوەزی،

حەیاتخوازی و وەکو ئەوانە زۆریان بە شێوەی پرەنسیپی کۆکراوەی ئەم وەلامە کەوتووەتە بەر لێداون. ئاسەوارێکی وەکو مەسەلەکی فاشیزم نووسراوەی موسۆلینی یان نەبەردی من نووسراوەی هیتلێر دەتوانن لەم لایەنەوە بە ئاسەوارێکی ساویلکانە و دەرەکی لە سوننەتی فیکری و دێرینەتر بزانرێن. برێکی زۆر لە لێکدانەوەی زانستی دەوروبەری ئەم بوارەیە.[٩]

دواخاڵ لەمەڕ پێگە، دەیەی ١٩٢٠ە. ئەو چەشنە کە ف. ل. کارستن دەڵێ: «هەتا بەر لەوەی جەنگی جیهانی یەکەم کۆتایی پێبێ لە هیچ شوێنێکی ئەوروپا باسێک لە فاشیزم نەبوو».[١٠] ئەرنێست نولتە لە کتێبی سێ شێوە فاشیزم کەم تا کورت ئەم روانگەی سەلماندووە. یەکێک لە بەناوبانگترین توێژەرانی فاشیزم، هیوتروور راپر دەڵێ:

یەکێک لە روانگە گشتییەکانی فاشیزم بەناوی بەهێزی زاڵ بەسەر ئەوروپادا، دیاردەی تەمەن کورتی ئەوە. مێژوو دەتوانێ بەتەواوەتی ئەوە دیاری بکا. ئەم مێژووە لە ١٩٢٣ـ١٩٢٢ لەگەڵ سەرهەڵدانی حزبی فاشیستی ئیتالیا دەستی پێکرد... لە دەیەی ١٩٣٠ بە پلەی بالای خۆی گەیشت... و لە ١٩٤٥دا، لەگەڵ تێشکانی دوو دیکتاتۆر تەمەنی ئەو دوایی پێهات.

تروور راپر حاشا لەوە ناکا کە پێشڕەوانێک بۆ فاشیزم بوونیان بووە. بەلام لە بابەتی مێژووی گشتی فاشیزمەوە کەسایەتیگەلێکی بەرچاو نەبوون. فاشیزم «لە ئەزموونی تایبەتی بەرەیەک جیاوازی هەڵنەگر» بوو.[١٢] لەم روانگەوە، فاشیزم ئیدئۆلۆژییەکی نوێ و کەم تەمەن بوو کە جگە لە ساڵەکانی نێوان دوو جەنگ بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو یان کەم بایەخ بووە. ئەزموونەکان و میراتەکانی جەنگی جیهانی یەکەم، ئاسەواری بڕیارنامەی ڤێرسای، رووخانی ئابووری گەورەی جیهانی، رووخان و تێکڕمانی کۆماری وایمار تاقانە زنجیرەی کارەساتەکان دەدرێنە قەڵەم.

ئێستا بە دووەمین بابەتی ئەم بەشە واتە جۆراوجۆری شیکردنەوە و ئاشکرا کردنی زانستییەکانی فاشیزم دەگەین کە زۆربەی ئەم روونکردنەوانە سوودێکی کە ئەوتۆیان بۆ دۆزە سیاسیەکان نەبووە. لەراستیدا باشترە لێرەدا بوترێ کە

ـۆرینەی هەواڵە بەرەواجەکان لەمەڕ فاشیزم جیا لە ئیدئۆلۆژیکی بوون. هەر ئـەم ـڕوانگە جیا لە ئیدئۆلۆژیکیانە ئێستا تـاو تـوێ دەکـەین. لـە هێنـدێ شـوێندا روون کردنـــەوەی غەیرەئیـدئۆلۆژیکی شـارەزایانە پێـڕو دەکـرێ، چونکـە ئیـدئۆلۆژی یارمەتییەکی ئەوتۆ بە دەرکـی جەوهـەری فاشـیزم ناکـا. ئیـدئۆلۆژی بـە شـێوەی شتێکی پارچەپارچەکراو، چنینەوە و سەیر چاوی لێ دەکرێ یان وێچـووی شـتێک کە کەڵکی نەماوە. لەم بارەوە زۆرتـری لەســەر نـاڕۆین. هەرچەنـد پێویـستە ئـەم بۆچوونە غەیرەئیدئۆلۆژیکییە جیاوازانـە رابگـەیێنرێن هـەتا راپـۆرتێکی تـەواو لـە فاشیزم بخرێتە بەردەست، بەشی هەرە زۆری لێدوان لەم بەشەدا کەمتر لە خودی ئیدئۆلۆژی نییە. لەگەڵ ئەوەی کە رازی بووین فاشیزم لایەنی ئـابووری، سیاسـی و تەنانەت خەسارناسی هەیە. هێشتا لەسەر ئەو باوەڕەین کە ئـەم دۆزانـە و ئـەم بایەخانە دەبێ لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ. نابێ ئەوانەی وەکو شتگەلێکی پووچـەڵ و بێبایـەخ وەلابنـرێن، چونکـە زۆربـەیان بـە یەکـەوە دەسـتێوەردان دەکـەن و تێکەڵاوییـــەکی نزیکیـــان لەگـــەڵ گـــشت ئیدئۆلۆژیکانـــدا هەیـــە. راڤـــەکردنە غەیرەئیدئۆلۆژییەکان دەکرێ لە نێـو پێـنج وتـاری سـەرەکیدا بخرێتـە بـەرباس و لێدوان: مارکسیستی، دەروونناسی، ئایینی و ئەخلاقی، مێژوویی و کۆمەڵناسی لـە کۆتاییدا سیاسی.

بەبرەوترین و گشتی پەسندترین بەیان لەمەڕ سەردەمی دەیەی ١٩٣٠، بـەیانی مارکسیست بوو، لەگەڵ ئەمەدا لەم بەیانەدا هیچ شتێکی تاقانە و یەکپارچە بوونی نەبوو. بە بۆچوونی مارکسیسم بوونی فاشیزم لە لایەنی یاساکانی ئابووری یـان مەنتقی سەرمایەدارییەوە هەڵگری ئاشکرا کردن بوو. بە شێوەی گـشتی، فاشـیزم بەشێک لـە ئاڵـۆزی سـەرمایەداری تایبەتمەنـدخـواز دەدرایـە قەڵـەم.[١٣] هـەر ئـەو جۆرەکە هێربێرت مارکووزە رێنوێنی دەکـا: «ریـشەکانی فاشـیزم دەبـێ لـە نێـو نارەزامەندییەکانی نێـوان تایبەتمەنـدی پیـشەسازی رووبـە گەشـە و سیـستەمـی دێموکراتیک لـە دووی بگـەڕێ».[١٤] بەگـشتی رێنـوێنی ئەمـە بـوو: سـەرمایەداری تایبەتمەند بۆ ئەوەی کە دەرفەتی مانـەوە بـە دەسـتبێنێ ناچـارە دژایـەتی چـینی دێموکراتیک و کرێکار پووچەڵ کاتەوە. هەروەها نەهادە دێموکراتیکـەکانی حاڵـی

حازر ئیتر ناتوانن وەکو دەستە ئاونگێک لە خزمەتی سەرمایەداریدا بن؛ راستی ئەوەیە کە بە دیموکراتیک کردنی هەمەلایەنە هەرەشەیەک بوو بۆ سەرمایەداری. سەیر لێرە دایە کە لیبرال کلاسیکەکانی وەکو فۆن هایکیش هێستا هەر ئەو باوەڕەیان هەیە. بەم شێوە، بۆ ئەوەی بەرهەمهێنان بەردەوام بێ و بەرژەوەندی بپارێزێ، ترساندن و تیرۆری سەرەڕۆیانە دەبێ بنەمایی بکرێ. فاشیزم لە قۆناخی تایبەتی لە تەکامولی سەرمایەداری، ئامێری سەرمایەداری تایبەتخواز دەدرایە قەڵەم. لەم نەزمە بە سوودی پیشە و کارە مەزنەکان، بانکداران و سەرمایەدارانی مالی بۆ سەرکوتکردنی چینی کرێکار کەڵک وەردەگیرا. لەبەر ئەمە، فاشیزم لە بارەی پێوەندی عیللەت و مەعلوولییەوە گرێبەستی ئابوورییەکانی سەرمایەداری بوو.

هێندێ رێنوێنیان دەکرد کە فاشیزم هەر تەنیا هۆکاری تایبەتی سەرمایەداری مالیە نەک پێویستانە سەرمایەداری پیشەسازی و وەرزێڕی. ئەم روانگە ئەوەڵییە لەمەڕ فاشیزم لە پێناسەی ساڵی ١٩٢٣ کومینتێرن لە فاشیزمدا جێی کراوەتەوە و ئەوە «دیکتاتۆری و تیرۆریستی کۆنەپەرستانەترین، شۆڤینیستیترین و ئیمپریالیستیترین پرەنسیپی سەرمایەی مالی» دەداتە قەڵەم.[١٥] ئەم و ئەو فاشیستەکانیان بە گروپێکی زەربەتی سەرمایەداری پیشەسازی خاوەن کارخانەی دژی کومۆنیستەکان و یەکێتییە سنفییەکان دەزانی. هێندێ لە مارکسیستەکانیش رێنوێنییەکانی مارکسیسیان لە کتێبی هەژدەیەمین برومێردا لەم بارەوە بە راستیان زانیوە، فاشیزمیان بە شێوەی جۆرێک لە بناپارتیزم یان قەیسەریزم سەیر دەکرد کە بە بۆنەی ئەو گروپە ناوبراوە کێشەی پەرلەمانییە بەرژەوەندی نێوان سەرمایەی مالی و سەرمایەی پیشەسازی بەهرەمەند دەبوو و خۆی هەوساری دەوڵەتی بە دەستەوە دەگرت. فاشیزم لەم واتادا ئامێری دەستی چینێکی تایبەت نەبوو.

ئانتۆنیۆ گرامشی لەگەڵ ئەوەی کە هاودەنگیشە لەگەڵ روانگەی قەیسەریزم، یەکەم نووسەری مارکسیستی بوو کە وەبیری هێناوە ئیدئۆلۆژی فاشیزم هێزێکی ماددی بووە. بە بۆچوونی ئەو فاشیزم لەگەڵ زۆربەی ئیدەئالەکان و

-ـ ـەزووەکانی جەماوەر سازگاری بوو. لەبەر ئەمە ناکرێ بە ئاسـانی چاوپۆشـی
ـ ـێبەرایەتی ئیدئۆلۆژیکی فاشیزم بکرێ و ئەوە بخرێتە پشتگوێ. بـە بۆچـوونی
ـ ـمشی دەبوایە لەگەڵ فاشیزم بە شـێوەی کوێـەک لـە دۆزەکـان بێجگەلـەوە بـە
ـێوەی دەستپێکی ئابووری و سیاسی خەبات بکرابایە. قبووڵ نەکردن و بـەرچاو
ـەگرتنی فاشیزم بە ناوی دیاردەیەکی پووچەڵ زۆر سـاکار بـوو، بـەڵام دروسـت
ـەبوو. ئەمە لەخۆڕانەبوو کە گرامشی لە کتێبی یادداشتەکانی زینـدان بـە وردی و
ـەشبەشکردنێکی زۆر تاوتوێکراو سەرقاڵی کاری تەولید و پاراسـتنی ڕێبەرایـەتی
ـەبێ. پالمێر و تۆلیاتی دوو دۆستی گرامشی و لـە بناخـە دامەزرێنـەرانی حـزبی
کۆمۆنیستی ئیتالیاش بوون، دەسەڵاتی فاشیزمیان لە یەکگرتوویی، یەکپارچـەیی و
ـەسیجی سەرکەوتوی جەماوەریان وەبیردێناوە. لە راستیدا ئەم کـارە سـەلماندرا
ـوو کە فاشیزم لە کـاتی ئاڵـۆزیدا باشـتر لـە لیبـڕالیزم یـان سۆسـیالیزم دەتـوانن
جـەماوەر کۆکەنـەوە. تۆلمـاتی رەنگـە یەکـەم کەسـێک بووبـێ کـە لـە بایـەخی
ـوچـوونی گرامـشی لـەواتای ڕێبەرایـەتی گەیـشتبوو. لەگـەڵ ئەمەشـدا، بـزاوتی
ـرەنسیپی ڕێبازی مارکسیزم لە دەیەی ١٩٣٠دا نەیدەتوانی ئەم فیکرە قبـووڵ بکـا
کە بزاڤی سیاسـی باڵـی راسـتی تونـدوتیژ لـە دزەیـەکی زۆرتـر لەسـەر زانیـاری
جەماوەر بەهرە وەردەگرێ.

لە راوێستەی مارکسیزمدا گرفتگەلێکی زۆر لە ئـارادا هەیـە. جگـە لـە نـەبوونی
یەکگرتوویگەلێک کە لە دەروونی مارکسیزم خۆیدا لە شیکردنەوە ئەم یەکە هەیە،
ئـەم پرسـیارە بـێ وەڵام ماوەتـەوە کـە هەڵوێـستی دژی سـەرمایەداری فاشـیزم
ـەکوێ سەرچاوەی دەگرت و هۆی ئەوە چ بوو؟ بێجگەلەمە، زۆر لە کارەکـان کـە
ـە سـەردەمی فاشیـستەکان و لـە ئیتالـیا و لـە خـولی دەسـەڵاتداری ناسـیۆنال
سۆسیالیزم لە ئەڵمان بەڕێوەچوو هەر تەنیا پێوارەکـانی سـەرمایەداری هـاوکێش
نییە. بێجگەلەمەش، چۆنە کە فاشیزم هەم توانیویە لە وڵاتە دژەسـەرمایەدارییەکان
«یان لانیکـەم لەگـەڵ سـەرمایەداری ئاسـتی زۆر خـوارەوە» وەکـو ئیتالـیا یـان
مەجارستانی بە دەسەڵات بگا و هـەم لـە کۆمەڵـگە هـەرە پیـشەسازییەکانی وەک
ئالمان، بەڵام لـە وڵاتێکـی وەک بریتانیـا سـەری هەڵـنەداوە؟ ئەگـەر پێوەندییـەکی

چارەنووسساز و زۆرییەکی روون شەفاف لە نێوان سەرمایەداری و فاشیزم بوونی هەیە، چۆن دەکرێ ئەوە لەگەڵ شانۆی ناوبراو بەراورد بکرێ؟ هەروەها مەعلووم نییە کە سەرمایەدارانی خاوەن کارخانە و پیشەسازی و مالی بێپسانەوە مالییەوە فاشیزمیان پشتگری کردبێ.[16] جگە لەمە ئەو جۆرکە هێندێ لە نووسەرانی مارکسیست گوتویانە پێوەندییەکی نەگۆڕ لە نێوان فاشیزم و چینە تایبەتییەکان لە ئارادا نییە.[17] زۆرجار لەمەڕ پێوەندی ئامێری چینەکان و دەسەلاتی سیاسی، لکەیەکی کوێری بەلای هێندێ لە مارکسیستەکانەوە هەیە.

باسکردنی دژە ئیدئۆلۆژیکی دووەم لەمەڕ فاشیزم لەسەر دەروونناسی فاشیستەکان تەئکید دەکا. تێزی سەرەکی بەیانی دەروونناسی، بە کەم و زیاد کردنێکی زۆر وردبینانەوە، ئەمەیە کە فاشیزم بەپێی شێوەی تایبەت و بنەڕەتی کەسایەتی وە یان بۆشایی کەسایەتی پێویستی بە شیکردنەوە هەیە. هۆکارە چارەنووسسازەکانی ئیدئۆلۆژیکی یان مێژوویی فاشیزم سەبارەت بەتایبەتمەندییەکانی کەسایەتی لە پلەی دووەمی بایەخدا وەستاون. وەکو ڕێنوێنی مارکسیستی لێرەشدا جۆراوجۆرەکانی مومکین زۆر دێنەبەرچاو. هێندێ فاشیزم تەنیا سەرنج دەدەنە روانگە دەروونناسییەکانی فرۆید، یۆنگی و ڕێبازە دەروونناسەکانیتر، کەلک وەرگرتنی تایبەت لەم پێڕەوە لە ئەسەری مێژووە بووەتە هۆی سەرهەلدانی سیفەتی «دەروون ناسی مێژوویی». هێندێ کەس لەسەر تایبەتمەندی دەروونناسی هێندێ لە چینەکان، بەتایبەت بێ بەشبوانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم تەئکید دەکەن. دەرەنجام، کۆمەلێک لە مارکسیستەکانی ڕێبازی فرانکفۆرت وەکو ئێریش فرۆم، تێئۆدۆر، ئادۆرنۆ و ویلهێلم رایش تێدەکۆشن هەتا وێڕای پێکەوە گرێدانی مارکس و فرۆید لە نێوانی بەیانی ئابووری و دەروونناسی پردێک هەلبەستن.

لە روانگەی دەروونناسی مێژووییەوە، مندالی فاشیستەکانە کە پێکهاتەی ناخی باوەڕەکانی دوایی ئەوان پێکدێنێ. هێندێ لە شێوە گۆشەنشینی، ئاوارەیی و دوورکەوتەیی کە زۆربەیان دەگەڕێنەوە بۆ خولی مندالی، لە تایبەتمەندی تایبەتی کەسایەتییەکانی فاشیست زانراون. سەرکوت و گەڕانەوەی بەرەودوای هەستی

ڕەگەزی سەرەتایی لە بنەماڵە سەرەڕۆکان و خودڕەئی «سەرکوتی ڕەگەزی»، بیەش لە داهێنان، باوەڕی دواکەوتوانە، ترس لە یەختەیی لە تاکێ نێرینە، دەتوانێ سەر لە هەستێکی بێدەسەلاتی، تاوان و خۆبە کەمزانی دەربێنێ. ئەمە بەش بە حاڵی خۆی هی سەرهەڵدانی دەمارگرژی و دەم شڕی و سادومازوخیسم [یان ئازاردانی ئەم و ئەو - خۆئازاری] دەبێ کە دەتوانێ بە شێوەی سیاسی لە دنیای خەیاڵە سەیر و سەمەرەکانی فاشیستی سەرهەڵدا. ئەریک ئەریکسۆن دەروونناس دەربارەی منداڵی هیتلێر دەڵێ: «ئێستا و دیسان مێژوو ئیزنی بە پیاوێک داوە هەتا زیندەخەوەکانی نەتەوەیی لەگەڵ ڕۆئیای خۆماڵی و تایبەتییەکانی خۆی لە یەکدا بهۆنێتەوە».[18] ریچارد کۆنیگسبێرگ لە کتێبی ئیدئۆلۆژی هیتلێر موتالایەک لە کۆمەڵناسی دەروونناسانەش باس دەکا کە ئیدئۆلۆژی هیتلێر «ئامێرێکی خستەبەردەم هەتا زیندەخەوەکانیشی لەئاستێکی ڕاستەقینەی کۆمەلایەتیدا بەیان و خاڵی بکا».[19]

ویلهێلم رایش لە کتێبی دەروونناسی جەماوەری فاشیزم (١٩٧٥) هەروەها فاشیزم بە بەرهەمی سەرکوتی هەستە جینسییەکانی سەردەمی منداڵی و مێرمنداڵی دەزانی. لەم واتادا هەموو مرۆڤەکان بە شێوەی شاراوە فاشیزمن. فاشیزم ڕەنگدانەوەی سیاسی سروشتی مرۆڤی مامناوەندی بوو کە لە کەش و هەوایەکی دیاریکراوەدا خۆی نواند. لەگەڵ تۆرەمە، نەتەوە یان حزبەکانی نەیتوانی کردەوەیەک لە خۆی نیشان بدا. لە حاڵێکدا مارکس بۆ ئازادی، خەڵک بە شۆڕشی کۆمەلایەتی و ئابووری بانگهێشت دەکا، رایش بۆ شۆڕشی ڕەگەزی بانگەوازی دەکرد. لەم ڕووەوە ئەندێشەکانی ئەوبەرەو پلەگەلێکی ئازادی ڕەگەزی بۆ دووری کردن لە زینییەتی دەسەلاتخواز هێنائاراوە.[20] چینی مامناوەندی مایل بە خوارەوە کە لەگەڵ خۆبێگانە، لەخۆبێزار. لە دەسدانی هێمنایەتی لە خولی پێش جەنگی جیهانی یەکەمەوە ئازاری دەدا، تایبەتمەندییەکانی سروشتی کەس ئازاری و خۆئازاری لە خۆیدا پەروەردە کرد کە بەرهەمی ئەوە سەرهەڵدانی کەسایەتی سەرەڕۆی لێکەوتەوە. ئۆئێل ئوسولیان ئەم کەسایەتییە دەسەلاتخوازەی بەم جۆرە خولاسە کردووەتەوە:

بوونەوەرێکی غەزەبلێگیراو لە دەروونەوە سەر لە بەرددراوی بێبەشکراوی ڕەگەزی و لەدەرەوە گرفتار و گیرۆدەی سیستەمی بێبەزەیی ئابووری سەرمایەداری، هەمیشە لەبەر هەڕەشەی باری قورسی ئازادییەکدایە کە هیچ سوودێکی بەڕاستی ناتوانێ لەو بەرێ... لە هەوڵێکی نائومێدانە دایە بۆ دەرباز بوون لە نەهامەتی خۆی، لە توندوتیژیگەری سیاسی پێشوازی دەکا.

لاوازی ڕێڕەوی دەروونناسی لە کەمبوونی بەڵگە لەمەڕ منداڵی فاشیستە سەرەکییەکانی وەک هیتلێر سەرچاوە دەگرێ. بە وتەگەلێکی کەسێکی ناتەواو و دەست و پێشکاو و لە ڕادەبەدەر باوەڕی پێکراوە. هەروەها دەربارەی «زانستی»بوونی ڕێڕەوی لێکدانەوەی دەروونی گومان لە ئارادا هەیە. بێجگە لەمە دژوارە کە بزانین ئەم جۆرە موتالانە چەند دەتوانن بۆ ڕوونکردنەوەی پشتگری جەماوەر لە فاشیزم یان بە ئەندام بوونی کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵک لە گروپە فاشیستەکاندا کەلکیان لێ وەربگیرێ. و دەرەنجام، ئەگەر بینینی دەروونناسی ڕاستە، کەواتە هەموو ئێمەدەبێ ببین بە دەروونناس، چونکە گشت مێژوو و سیاسەت کە گریمانەیەکی بە قەناعەتگەیێنی تایبەت دەربارەی ئەوانە لە ئارادا نییە دەبێ بەیان بکرێ.

سێیەمین ڕوونکردنەوەی غەیرەئیدئۆلۆژیکیش پێوەند بە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٣٠وە بوو، هەرچەند هێندێ لە بەشەکانی ئەو ئێستاش بوونی هەیە. دۆزە سەرەکییەکان ئەمە بوو کە فاشیزم لایەنێک یان نیشانەگەلێکی نەخۆشی یان ئاڵۆزی ئەخلاقی و مەزەبی لە شارستانییەتی ڕۆژئاوایە.[٢٢] ئەم بینینە بۆ تاوتوێ کردنی ناوەڕۆکی ئیدئۆلۆژیکی زۆرتر ئامادە بوو، ئەگەرچی ئەم زەوقە لە ئارادا بوو کە کردەوەی فاشیزم هەڵقوڵاوە لە هۆکاری مەزەبی یان ئەخلاقی قووڵتر بزانێ. لە کۆتایی دەیەی ١٩٣٠ و سەرەتای دەیەی ١٩٤٠ فیلسووفانێکی وەکو بندتوو کرۆچە و ر. گ. کالینگ وود فاشیزمیان بە خۆنوێنی نیگەتیڤی و حاشاکەری ئازادی مرۆڤ دەزانی. بە بۆچوونی کرۆچە، فاشیزم هۆی گەندەڵی سوننەتی ئازادی لە ئیتالیا بوو. ئەو باوەڕی وابوو کە «دەسەلاتە سەرەڕۆکان هەر تەنیا لە نێو خەڵکانێکی دواکەوتوودا دەوام دێنن».[٢٣] لە بریتانیا، کالینگ

بوونیش فاشیزمی به شێوەیەکی نوێ لە وەحشی و هێمایەک لـە بێباوەڕی بـە ئازادی و ئازادیخوازی دەزانی. به بیر و بۆچوونی ئەو ئازادی «دەرمـانی ئیمـانی مەسیحییەت»بـووە. وەحشیگەری و کـوفر و نکـولی لـە دیـن کـردنی فاشـیزم و ناسیونال سۆسیالیزم گشت سوننەتی مەسیحی بۆ گۆڕەپانی خەبات دەخوازی.[٢٤] نووسەرەکانی دیکـەش بـاوەڕێکی ئـەوتۆیان راگەیانـدووە. یـەکێک لـە یەکـەمین شیکارانی رەخنەگری ئەڵمانی ناسیۆنال سۆسیالیزمی به شێوەیەک لـە نیهیلیزمـی ـخی کەلتووری و ئەخلاقی دەدایە قەڵەم.[٢٥]

فاشیزم هەروەها لایەنێک لە بزاڤی «مەرگی خـودا» لـە ئەندێشـەی ئـەوروپایی دناسـرا کـە مێـژووی ئـەوە دەگەڕایـەوە بـۆ ئاسـەوارەکانی فریـدریش نیچـە یهێزییەکی گـشتی بـاوەڕە مەزەبییـەکان و بایەخـە پلـە بـەرزەکان. نووسـەرانی کاتۆلیک وەکو ژاک مارتین لەم ڕێڕەوە پێڕەوی دەکرد و فاشیزمی به بیچمێک لـە یەکگرتوویی وجوودی شەیتانی» کافرانە ئەدایە قەڵەم.[٢٦] توێژەرانی دوایی وەکـو رابێرت پۆیس هـەر بـەم جـۆرە ڕێنوێنیـان کـردووە. پـۆیس لێکـی دەداتـەوە کـە نازیسم به برشتترین راپەڕین دژی سوننەتی جوولەکە و مەسیحی بـوو». و «لـە کۆششەکانیدا بۆ جێگرکردنی چاوکراوانە بەجێی شێوەکانی جوولەکە و مەسـیحی تاقانە بوو».[٢٧] هەموو نووسەران، وەکو گ. ل. مـووس، فـریتس ئەشـترن و پ. ج. پولزر فاشیزم و بەتایبەت ناسیۆنال سۆسیالیزمیان به خاوەنی ریشەگەلێکی قووڵ لە نەخۆشی کەلتووری زانیوە.[٢٨]

هێندێ لە توێژەران ئەم را و بۆچوونە ناسەلمێنن و لەسـەر ئـەو بـاوەڕەن کـە بەلگەیەکی کەم لە تەئید و سەلماندنی ئەو لەبەر دەسا هەیە و هەر تاقە هەودایەکی تاوتوێ گەلی گشت لایەنەکـراو و لەمـەڕ نزمبوونـەوەی ئـەخلاقی یـان ناهومێـدی کـەلتـووری بـوونی هەیـە.[٢٩] ئـەم جـۆرە حوکمانـە هێنـدە لێبڕاوانـە نییـە. ئێـستا لێکۆڵەڕانێکی فرە لەم شیکردنەوە زانستیانە پشتگری دەکەن کە لە زۆرتری ئەوانە راپۆرتگەلی مارکسیستی یان دەروونناسی هەستی پێکراوە.

چوارەمین روونکردنەوە و ئاشکرا کردن لەسەر بواری مێژوویی و کۆمەڵناسی تەئکید دەکـا. کێـشەی سـەرەکی ئەمـە بـوو کـە فاشـیزم بەرهـەمی پـەرەگرتنی

کوتوپڕی نوێسازی یان زۆرجار شێوەی تایبەتی بە پیشەسازی بوون لە هێندی کۆمەڵگە بووە. ئامانج لەم موتالاانە بە دەستهێنانی خاڵە بەرزەکانی ئاماری و ئابووری ئەزموونیتر لەمەڕ فاشیزم بوو. ئا. ف. ئۆرگانسکی و دواتر بارینگتۆن مور، لە سەرەتادا باوەڕیان بەم خەتتە فیکرییە بوو.[20] گشت کۆمەڵگە سوننەتییەکان لەسەرانسەری سەدەی نۆزدە و بیست لەبەر هەڕەشەی ئاڵوگۆڕی وەکو بە پیشەسازی بوونی بە تاڵووکە، ژیواری ژیاری، شەرعی بوون و عەقلانی بووندا بوون. ڕێوشوێنێکی جۆراوجۆر بۆ مودێرنیتە کردن گیراوەتەوە بەر و فاشیزم یەکێک لەو ڕێگا مومکینە بووە. لەگەڵ ئەمە، لە بەراورد کردن لەگەڵ ئەڵمانیا، بە پیشەسازی بوون و مودێرن بوون دێرتر هاتە سەر و کاری ئیتالیا. ئەم کارە گرفتێکی کوت و پڕی لێکەوتەوە. ئەگەر ئەڵمان لە دەیەی ۱۹۲۰ لە ئاستێکی بالای پیشەسازیدا بایە و ئیتالیا نەدەبوو، کەواتە لەسەر بنەمای پێوارەکانی مودێرنی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری، ئەو جۆرەکە نووسەرێک دەنووسێ: «فاشیزمی ئیتالیا و نازیسم هەردوو لە وتارێک کەوتوونەتەوە».[21] ئەگەر فاشیزم پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵ تازەبوونەوەی بە پەلە و بە پیشەسازی بوون هەیە، کەواتە ڕواڵەتەن ناکرێ ڕوون بێتەوە کە لە ئیتالیا و ئەڵمانیا چی ڕووی داوە. کەوایە ئەم جۆرە ڕاپۆرتانە لە ناخەوە دڵتەنگی بەدی دێنێ.[22]

سەرهەودایەک ئاشکرا کردنی کۆتایی، لەبنەڕەتدا «سیاسی»ن. لێرەدا وشەی «سیاسی» لەگەڵ ئاسانکاری و بێدیققەتی بەکاربراوە.[23] ئەم ئاشکرا کردنە تا ڕادەیەک بەرامبەر بواری بوونی ئاڵۆزی لە دێموکڕاسی پەرلەمانیدا هاتووەتە ئاراوە. یەکێک لە ڕێنوێنییە سەرەکییەکانی فاشیستەکان ئەمە بوو کە دێموکڕاسی پەرلەمانی تووشی تێکشکان بووە. سوننەتیترین بەیانی سیاسی لە فاشیزم ئەوەی بە سەرەڕۆیی دێرین دەزانی و بە مەزننمایی تایبەتی کەسایەتیگەلێکی وەکو هیتلێروە سەرقاڵ دەبوو. لەبەرئەمە، بەئەرکی خۆی دەزانی کە ژیاننامەی ئەم کەسایەتیانە بنووسێتەوە و کارکردەکان و ئەندێشەکانی سەرەڕۆکان ئاشکرا و تیشک بخاتەسەریان. کتێبی بێ وێنەی ئالێن بولووک بە ناوی موسۆلینی تا ڕادەیەکی کراوە بە دووی ئەم خەتتە فیکرییەدا دەڕوا. ئەم ڕێڕەوە تا ڕادەیەک لە

ـوسراوەكانی هیوترووور راپر و ئێرنێست نوولتەشدا بەرچاوە. بولووک هاوکات
ـەگەڵ لێدوان لەمەڕ روونكردنەوەی دژایەتی نێوان ناسیۆنال سۆسیالیستەكان
ـ دەبیردێنێتەوە كە: «بۆ ئیشتراسەر، ناسیۆنال سۆسیالیزم بزاڤێكی سیاسی
ـ ستەقینە بوو نەک وەک ئامێری پلە و پایەخوازی لە روانگەی هیتلێرەوە. ئەو
ـوزی خۆی زۆر توندتر لە هیتلێر دەگرت».[٣٤] هێندێ كەس لەسەرر ئەو باوەڕەن
كە تەئكیدی لە رادەبەدەر لەسەر كەسایەتییە دەسەلاتخوازەكان هەستێكی هەڵە لە
ـزووتنەوەی فاشیستی بەدی دێنێ. ئەم كارە نەک هەر تەنیا باری
ـەرپرسایەتییەكان لەسەر شانی كەسانێكی دیكە لادەبا، بەڵكو حزبە فاشیستەكان
ـەتەواوی یەک پارچە دەخاتە بەرچاو و سەرنج لەسەر رێبەرانی ئەوان كۆ
ـ دەكاتەوە؛ ئەم كارە هەروەها لە دژایەتی كردنی ناخی دەروونی بەربەرەكانی
ـوند و دەمارگرژی و خەبات بۆ دەسەلات كە لە نێوان گروپە فاشیستەكاندا هەیە،
ـەبیریان دەچێتەوە و غافل دەبن.[٣٥]

بەیانی بەبڕەوی سیاسی دیكە چاولێكەری فاشیزم و كۆمۆنیزم و ئیستالینیزم
ـەژێر ناونیشانی گشتی «سەرەڕۆیی»یان بە شێوەیەكی دیكە لەژێر ناونیشانی
سیاسەتە خەماوەرییەكانە. ئەم روانگانە بەتایبەت بۆچوونی دوایی، لە چەرخی
جەنگی سارد و دەیەی ١٩٥٠ پەروەردە كراون. لە سەرەتای سەرەڕۆیی بە
شێوەیەكی فەلسەفیتر لە ئاسەواری وەک پێگەكانی سەرەڕۆیی نووسراوەی هانا
ئارێنت و كۆمەڵگەی كراوە [ و دژمنانی] نووسراوەی كارل پووپێر تاوتوێ كرا.
لەگەڵ ئەمەدا، بە زوویی زمانی ئاكادمیكی دۆزییەوە بەتایبەت لە رشتەی
عولوومی سیاسی لە نووسراوەكانی ج. ل. تالموون، ك. ج. فریدریش و ز. ك.
برزنیسكی و زۆرتر بەیان كرا.[٣٦] خوو و سروشتی فاشیزم بە ناوی نەزمێكی
سەرەڕۆ بوونی حزبێكی یەک پارچە، نەبوونی جیایی نێوان دەوڵەت و كۆمەڵگە،
كۆنترۆڵی تەواوی پێكهاتەی دەوڵەت و ئابووری بەسیجی تەواوی جەماوەر و زاڵ
بوونی پێوەندییە گشتییەكان بوو. جەماوەر لەم جێیەدا بوو بە تاكە بێ‌ریشەكان،
گۆشەگیر و لەت و كوتی لێر و لەوێ و جیا لە یەک.[٣٧]

لاوازی ڕێڕەوی سەرەڕۆیی بینین ئەوەیە کە بە چەواشەکاری قووڵ. نەبوونی چاکسازی گشتی و ڕکەبەرایەتی دەروونی کە خوو و خسلەتی فاشیزم پێکدێنێ. سەرنج نادا. بە وتەیەکی تر بە لێهاتوویە سەرەڕۆخوازییەکان بەتایبەت لە ئەڵمانیا و ئیتاڵیا لە ڕادەبەدەر بایەخی پێدەدرێ. ئێستا کە ئەم گومانە لە ئارادا هەیە کە لایەنەکانی دیکەی سەرەڕۆیی بە کردەوە و بە شێوەی تەواو لە وڵاتەکانی دیکەش بوونیان هەبێ. ئەم ڕێڕەوە هەروەها بە دەوری پارێزگاری سەرەڕۆخوازی لە دەروونی فاشیزمیشدا پاکانەی بۆ ناکرێ. بێجگەلەوە جیاوازی نێوان کۆمۆنیزم و فاشیزم دواکەوتووە و ئەوانە بە وتارێکی هاوکێش دەداتە قەڵەم. بێجگەلەمە، لە دەروونناسیۆناڵ سۆسیالیزمیشدا تەواو ئاشکرا نییە کە چ هیتلێر و چ زۆر لە ڕێبەرانی بزووتنەوە بەڕاستی دەوڵەتی سەرەڕۆ بووبێتن.[٣٨]

دەرەنجام بە پێچەوانەی ئەم ڕاستییە کە زۆر لە توێژەران فاشیزمیان بەستۆتەوە بە چینی مامناوەندی ڕووبەخوارەوە، زۆری تر باوەڕیان وایە کە فاشیزم درەنگ پێیان نایە پانتای سیاسەتەوە و لە نێوان لایەنگرانی پێکهاتەی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە ناوبریان لێداوە.[٣٩] لەبەر ئەمە، فاشیزم «دیاردەیەکی تێکەڵاو» بوو چینە ناگشتییەکانی کۆمەڵگەی لەگەڵ یەک تێکەڵ کردووە. ئەم جۆرەکە خوان ب. لینز باوەڕی هەیە ئەم بابەتە حیکایەتی لە «تێکەڵاوی کۆمەڵگەی تەواو جیاوازی لەسەر کاکڵی دیکەی سەرەتایە».[٤٠] بە بۆچوونی لینز، گۆڕانکاری و زیاد کردن و کەمکردنەکانی شەڕ و یارمەتی دەرەوە بە فاشیزم یارمەتیدا کە لە خۆڕا دەورێکی سیاسی گرنگ بگێڕێ کە ئەم حاڵە تێکەڵییەکی مەسلەحەتخوازانە و ئیدئۆلۆژیکی بوو. لە ڕاستیدا حزبە فاشیستەکانی دوای ١٩٤٥ لە باری ئیدئۆلۆژیکییەوە لە بەشە سیاسییە تێکەڵەکانی ئەورووپای ڕۆژاوا فۆرمیان گرتووە. لینز دەڵێ: «پێکهاتەی کۆمەڵگەی زۆر بە تەوژمتر، وشک لە مامەڵەی ئیدئۆلۆژیکی، نیازگەلی دروستکردنەوەی نەتەوەیی لە ئەورووپای پاش فاشیزم بوونی حزبە ناگشتییە هەڵپێچراوەکانی لە بابەت پڕۆژەوە پێکهێنا».[٤١] بەم حاڵەوە لینز تەئکید دەکا کە موتاڵای گشتی فاشیزم دەبێ بواری یەکلایەنەی کۆمەڵناسی، سیاسی و مێژوویی هەر کۆمەڵگەیەک بگرێتە بەرچاو. لەم ڕووەوە

ـەڵێ کە تاقانە جۆری گشتی ئەزموونی باوەڕپێکراو ئەمەیە کە «فاشیزم وەڵامی نوێ بە ئاڵۆزی... پێکهاتەی کۆمەڵگەی بەر لە جەنگ و سیستەمی حزبی بووە».[42]
ـە راستیدا روانگەی لینز تایبەتمەندی کۆمەڵناسی دەهەکانی دوایی پێکدەهێنا.

## جەوهەری فاشیزم

لە تاوتوێکردنی جەوهەری فاشیزمدا گرفت و مەسەلەیەکی گرێدراو بوونی هەیە کە برێک لە نووسەران پێوەی سەرقاڵ بوون و برێکیش پێوەی سەرقاڵ نەبوون. هێندێ لەو توێژەرانە نووسەرانی فەڕانساوی، مۆریس بارس و شارل مۆران کە بە رێکخراوە فەڕانسەوییەکان «تێکۆشانی فەڕەنسا» دەسپێردرێن.[43] هێندێکی دیکە، ئەو گرووپە «راستانە» پێش فاشیستی، کۆنەپەرستی یان سەرەڕۆخواز، جیا فاشیزم دەزانن.[44] فالانژەکان لە ئیسپانیای بەر لە ١٩٣٣، بە پێچەوانەی ئەمەکە بزاڤی میللی دژی پەرلەمانی راست بوون، هێشتا بە گرووپە فاشیستەکان نادرێنە قەڵەم.[45] لە ئەڵمان لە حاڵێکداکە راستی سوننەتیتر پڕۆژەی کاری کەمیان هەیە، گرووپی ناسیۆناڵ سۆسیالیست پڕۆژەی تەواو روونیان هەیە.[46]

ئەم مەسەلە کە پایەی فاشیزم تا چ رادە دەتوانێ بەرین کاتەوە، پێوەند دەدرێ بەم لێدوانە گشتییەوە. ئایا دەتوانین ژان دگرل رکیست لە بلژیک، لژیۆن ئارخانگل میکائیل لە رۆمانی، پورتوگاڵ لە تافی حکوومەتی سالازار، ئارژانتین لە چاخی فەرمانڕەوایی پڕۆن یان دواتر خونتا، مەجارستانی ژێردەسەڵاتی ژنەڕاڵ گومبوس، ژاپۆن لە سەردەمی جەنگی جیهانی دووەم، یان فەڕەنسا لە خولی دەسەڵاتداری دوگولدا بە فاشیست بزانین؟[47] بە پێچەوانەی ئەمە کە ئەم بەشە زۆرتر باسەکەمان رووی لە ئیتاڵیا و ئەڵمانیا، نابێ وابیر بکەینەوە کە هەموو بزاڤە ناوبراوەکان خۆی لە خۆوە نافاشیستی یان پێش فاشیستی بوون. ئەم لێداونە بەرین و حەلنەشودەنییە کە هەر تەنیا دەکرێ بەکورتی ئاماژەیەکی پێ بکرێ. ئەڵمان و ئیتاڵیا بواری بەهێزتر و بابەتی ئاشکراتریان بووە.

زۆرتر توێژەرانی فاشیزم حازرن کە ئەم رێبازە گرووپەکان و بۆ چوونە جیاوازەکان بگرنەبەر. لە ئاستێکی گشتیتر، جیاوازی ئیدئۆلۆژیکی نێوان ناسیۆناڵ

سۆسیالیزمی ئەڵمان و فاشیزمەکانی ئەوروپایی لە ئیتالیا و فەڕەنسا، ئیسپانیا و بریتانیا بوونی هەیە. بۆ هێندێ کەس ئەم جیاوازیانە ئەوندە زۆرە کە ئەوانە زۆریان لەسەرە لەمە کە ناسیۆنال سۆسیالیزم لەگەڵ فاشیزمەکانی ئیتالیا و ئیسپانیا یەکسان بزانن.[48] قووڵترین جیاوازی تەئکیدی لەسەر نەژاد هەیە. هەروەها لە حاڵێکدا کە لە ئەڵمان لەسەر سوننەتی Volk [جەماوەر یان خەڵک] زۆر تەئکید کراوە لە شوێنەکانی دیکە وەها سوننەتێکی بەهێز لە ئارادا نییە. ئەم هۆکارە Volk ئەڵمانیە بە تەنیای فاشیستە فەڕەنسەوییەکانی وەکو برازیلاک و دریودور و شل، فاشیستە ئیسپانیاییەکانی وەکو پرێمودریوە و تەنانەت موسۆلینی ئیتالیایی یان لە سوننەتی ئەڵمانی جیا دەکاتەوە. موسۆلینی ئەڵمانی دەیەی ۱۹۳۰ بە «شێتخانەی نەژادپەرستی» ناو دەبا.[49] بێگومان لە زۆر دەقەرکانی ئیدئۆلۆژیکی لە ئیتالیا برگرە هەتا ئیسپانیا، فەڕەنسا و بریتانیا لە دەهەکانی ۱۹۲۰ و ۱۹۳۰ نە ئاماژەیەک بە مەسەلەی نژاد لە ئارادا بووە، نەک بە مەسەلەی دژی سامی «نەژادی سامی یەکێک لە باڵە مەزنەکانی سپییە، مەبەست لە تۆرەمەی دێرینە» کە ناسیۆنال سۆسیالیستەکانی ئەڵمان ئەوندە ددانە چیڕەیان لەسەر دەکرد؛ بایەخێکی ئەوتۆیان دەدایە. هەر تەنیا دواتر بوو کە هێورهێور گروپە ئیتالیایەکان و هەموو گروپە فاشیستەکان لە کۆتایی دەیەی ۱۹۳۰ زۆرتر هەڵوێستی دژی سامیان بەخۆوە گرت. بەم حاڵەوە هەڵوێستی ئەم گروپانە هیچ کات بە توندوتیژی و ژاراوی و دەمارگرژی ئەڵمان نەگەیشت. تەوژمی دەمارگرژی بەربەستکراو و ترس و تیرۆر مەسەلەیەکی مەزنیترە کە بێگومان ئەڵمان لە ئیتالیا هاوێر دەکا.[50] بێجگەلەمە، فاشیستە نائەڵمانییەکان سەرنجێکی ئەوتۆیان بە مەسەلەی Lebensraum [هەوای حەیاتی] نەبوو. ئەم مەسەلەسەرقاڵی فیکری تایبەتی هیتلێر بوو و بنەمای سیاسەتی دەرەوەی ئەو «کە لە فەسڵەکانی کتێبی نەبەردی من زۆر تەئکیدی لەسەر کردووە»، پەرەپێدان بەرەو رۆژهەڵاتی ئەڵمان بەرەو رووسیا و پاکتاو و کاتۆر کردنی خەڵکانی ئەسلام پێکیدەهێنا. لە ئیتالیا پەرەپێدان بە واتای سوننەتی ئەوروپایی دەرک دەکرا. لە ئەڵمان ئەم سیاسەتە لەسەر بنەمای مەسەلەی نژادی بوو.

دەرەنجام، لە حالێکدا کە فاشیزم لە ئیتالیا زۆرتر لەسەر سوننەتی عەقڵخوازی ڕۆژاوا پێداگری دەکرد، ئەڵمانی ناسیۆنال سۆسیالیست بە شێوەی چاوکراوانە ڕەوەستەی غەیرە عەقلانی بوو و هەموو شتێکی مرۆڤ لە پیشەسازییەکان و هونەرەکانەوە بگرە هەتا زانستییەکان، کۆمەڵگە و مێژوو لە بەرینبینی پلەبەرزی ڕژادەوە دەبینرا و چاوی لێدەکرا. هەروەها لە ئیتالیا زۆربەی هۆکاری تایبەتی، لە هێندێ نەک لە هەموو بەشەکانی بزووتنەوەی فاشیزم، سەبارەت بە نوێبوونە عەقلانی دەبینرا کە دەوڵەت دەبوایە لەودا دەوری دەسەڵاتی داهێنەری بووبایە. لە ئەڵمان، لانیکەم لە بەستێنی ئیدئۆلۆژیکی، مەسەلەی نەژاد ئەم کۆششەی لەخۆوە پێچابوو. لە ڕاستیدا دەوڵەتی ئەڵمان فەرمانبەری هەمیشەیی Volk و بابەتە نەژادییەکان بوو.

لە دەروونی گروپبەندیە میللییەکانی فاشیستدا، بە تایبەت ئەڵمان، دابەشکاری دەرەکی گرنگی دیکەش بوونی بوو. ڕێگایەکی زۆر بۆ بیرکردنەوەی ئەم دابەشکردنە دەرەکییە لە ئارادا هەیە. نولتە لە فاشیزمە سەرەتایەکان، فاشیزمی بە میتود و فاشیزمی رادیکال « و هەروەها وتاریشی لەمەڕ پێش فاشیزم» وتار دەبێژێ. ئەلکساندێر دووگران لە موتالایەک کە لەمەڕ فاشیزمی ئیتالیا بەڕێوەی بردوە لە بارەی فاشیزمی پارێزگار، میللی، دیوانسالاری (بوروکراسی) گوندی و ناسیۆنال سەندیکالیست دیالۆگ دێنێتە ئاراوە.[51] دابەشکارییەکی دەرەکی ئیدئۆلۆژیکی لە نێوان باڵە سۆسیالیستترەکان و سەرمایەدار دروست بوو. هێندێ لە دەروونی سیستەمی کۆمەڵگەی ڕێکوپێکتردا پەروەردە بووە بایەخیان بە سەرمایەداری دەدا. هێندێکی دیکە خوازیاری بەرتەسککردنەوەی بەڕاستی تەمەنی لە کۆماری سالۆ لەگەڵ لایەنگری سۆسیالیستەکان هەستی بە نزیکایەتی بە یەکەوە دەکرد. ئەو لە کۆتایی دەیەی ١٩٢٠ هەوڵی دا هەر دوو گەرایشەکە بە یەکەوە ئاشت بکاتەوە.[52] یەکێک لە نووسەرەکانی ئیتالیا بە ناوی نانجلوو ئولیوتی، فاشیزمی چەپی لیبراوانە خستە لیستی سوننەتی سۆسیالیزمی پرۆدۆنەوە.[53]

دابەشـکارییەکی ئـەوتۆ لـە بـاری بـیر و بـاوەڕەوە لـە نێـوان ناسـیۆنال سۆسیالیستەکانی ئەڵمان سەریهەڵدا. چالاکـانی حـزبی وەک گۆتفریـت فـدر و گێۆرک ئەشتراسەر زۆرتر لە میتۆدە سۆسیالیستەکان نزیکیان بوو. بۆ وێنـە فـدر بە خۆماڵی کردنی بەربلاوی پیشەسازییەکان و بازرگانی بە سیستەمـی بانکـداری کـۆکراوە و ژێـر چـاوەدێری دەوڵـەت، مودیریـەتی دەوڵـەتی دام و دەزگاکـانی سـوودی گـشتی، هێنـان و بـردن، بایـەخـدارەکـان، ڕاگـرتنی نرخـەکان و دەسڕەنجـەکان هـەمیشە و دەرهـەم لەگـەڵ دەسبەسـەرداگیراوانی دەوڵـەتی سوودە کەلانەکان بانگهێشتنی دەکرد. بیست و پێنج پـرۆژەی NSDAP لـە ١٩٢٣- ١٩٢٠ پـرۆژەی وەرزێـڕی ١٩٣٠ و پـرۆژەی دەسبـەکاربوون و سـەرگەرمی تەواوی ١٩٣٢ هەموو هەڵگری نـاوەڕۆکـی دژی سـەرمایەدارییەکی زۆربـوون.[٥٤] ڕواڵـەتەن ئاڵـفرێد ڕوزێنبێـرگ، هیتلێـر و گـوبلز شـەوق و زەوقێکـی زۆریـان سەبارەت بەم ڕێڕەوە نەبوو. ئەمە بەو مانایە نییە کە ئەوانە خوازیاری درێـژەدان بـە سیاسـەتی ئاشـکرای سـەرمایەداری بـوون. ڕوزێمبێـرگ خـۆی بایـەخی زۆر زیاتری بە بابەتی نژادی دەدا.

دەربارەی بە هێندنەگرتنی گشتی فاشیستەکان سەبارەت بـە ڕۆشـنبیران زۆر جار گرنگە کە ناوەڕۆک، پرۆژەکان و ئیدئۆلۆگە گرنگەکان بەدەستبێنێ. فاشـیزمی ئیتالیای لایـەنگران و خوازیـارانی پلەبـەرزی وەک جـوانی جنتیلـە یـان بـوو کـە زۆربەی مەقالەی موسۆلینی بە نـاوی «باوەڕەکـانی فاشـیزم» ئـەو نووسـی ئـەو جۆرەکـە ڕەسـالەی سیاسـی زۆر گرنگیـشی بـە نـاوی سـەرچاوە و پێکهاتـەی کۆمەڵگەی نووسییەوە. ڕەخنەگران لەمەڕ ئەمەکە چۆن جنتیلە بە نوێنەری فاشیزم دەدرێتـە قەڵـەم، هاودەنـگ نـین.[٥٥] بـەلام ناسـیۆنال سۆسیالیـستەکانی ئەڵـمان کەسایەتییەکی بەرچاوی وەک جنتیلە یان لەبەر دەسا نەبوو. کتێبی نەبەردی مـن. هیتلێـر کـە موسـۆلینی ئـەوەی «کتـێبی هەراسـهێنەر کـە هـەرگیز نـەمتوانی بیخوێنمەوە»ی باس دەکـا. بەڕاسـتی نـەیتوانی بـە نـاوی نـاوەڕۆکـی سـەرەکی خزمەت بکا ئەگەرچی بێگومان دۆزگەلێکی دزەکەر و تێپـەڕ لـەودا بـوونی بـوو.[٥٦] ڕوزێنبێرگ زۆرتر بە نووسینەوەی وڕێنـەی بێسەر و بـن لەمـەڕ نـژادی بـاکوور

ـەرقاڵ بوو. نووسراوەگەلێکیش لەگـەڵ ناوەڕۆکـە ناسـیۆناڵ سۆسیالیستەکان،
ـووسراوەی ئەشتراسـەر و فدر و گوبلیز لە ئارادا بوون. کەسایەتییە زانکۆیـە زۆر
ـەگومانەکانی وەک کارۆل ئەشمیت یان مارتین هایدگر لە پەراوێزدا بوون.[57]

لەگەڵ سەرنج دان بەو خاڵە ناوبراوانـە، دۆزینـەوەی بەسـتێنێکی هاوبـەش بـۆ
ـوان لەمەڕ فاشیزم یـان فاشـیزمەکان، دژوارە خاڵـی دەسـپێک دەکـرێ لایـەنی
ـێکەتی

ڤی ئیدئۆلۆژی فاشیزم واتە «دژایەتییەکانی» ئەو بێ. ئەو چەشنە کە لینز دەڵێ:
«شـتگەلێک کـە فاشـیزم لەگـەڵ ئەوانـە دژایـەتی بـوو دەیتـوانی لـە دیـاریکردنی
ێناسەی ئەو بەکەڵک بێ».[58] زۆرینەی فاشیـستەکان دژی لیبـڕاڵ دژی مارکسیـست،
ـژی پەرلەمان، دژی تاکخوازی و دژی بورژا بوون. بە بۆچوونی ئەوان سـەردەمی
ـورژوایی لە باری مەعنەوی بۆش، ریاکارانە و ماددەخوازانە، جیاکراوە لـە جیهـانی
ڕاسـتەقینە و دابـڕاوی هــەر چەشــنە واتــا بـۆ کۆمەڵـگە بـوو. ئەمانـە بێگومـان
ـاوەرۆککەلی هاوبەش بوون، بەڵام ناتوانن شتێکی زۆر بە ئێمە بڵێن. ئێستا لێدوان
بەرەو تێبینیگەلێک لەمەڕ بیر و بۆچوونی فاشیستی دەربـارەی سروشـتی مـرۆڤ،
ـۆزەکانی ناسیۆنالیزم، نژاد، دەوڵەت، ڕێبەری و ئابووری دەبەین.

## سروشتی مرۆڤ

دوا بــواری فیکــری دەرکــی فاشیــستی لــە سروشــتی مــرۆڤ تێکـەڵاوێکی
سەرســوورهێنەرە. دۆزە بەبــڕەوەکانی ئــەو مەڵــهەمێکی تایبــەتی بــوون لــە
داروینیزمی کۆمەڵایەتی، ڕوانگەی نژادی سەدەی نۆزدەیەم، فەلسەفە شـهوودی و
شاراوەکان و حەیاتخوازی، سەندیکالیزم، ڕوانگەی پاڵێوراوان، هەستخوازی یـان
ڕۆمانتیـسیزم، دەروونناســی جــەماوەر و دەروونناســی چاونــەکراوە. جگەلەمـە،
مەڵهەمی ناقودووسییە، هێندێ دووپاتکراوە و شێوەبیتر لەمەڕ خووی بوونەوەری
مرۆڤ دەکرێ لە یەک هاوێر بکرێن.

یەکەم ئەمەیە کە تایبەتمەندی خۆی مرۆڤ بەرز نرخانـدنی ئیرادە و کـردەوە
بوو. مرۆڤەکان لـە پلـەی یەکەمـدا خولـقێنراوی ئیرادە و کـردەوەی خۆیـانن. تـا

رادەیەک ئەندێشە دەکەوێتە دوای کردارەوە. ئەندێشەی سەڵت ئێمە لە کردەوەی به لاڕێ و کردار ئێمە گەندەڵ دەکا. ئێمە لەگەڵ بەکاربردنی ئیرادە و کرداری خۆمان لە جیهان خۆی راستەقینەی خۆمان دەخەینەڕوو. گوتراوە کە دەبێ بەپێی غەریزە و بوونی خۆمان عەمەل بکەین، نەک بەپێی ڕێنوێنی مەنتقی. ریشەگەلی فەلسەفی ئەم خەتتە فیکرییە سەرچاوەی زۆری هەیە کە بەتایبەت بە حەیاتخوازی هانری بێرگسۆن و فریدریش نیچە، کردەوەخوازی ویلیام جیمز و فەلسەفەی حەیاتی ئەڵمان دەکرێ ئاماژە بکەین.

گرنگ ئەوەیە کە بواری ئەم کردەوەخوازییە و حەیاتخوازییە و شێوەیەک لە فاشیستەکان بە لاڕێ و هەڵە دەستیان تێبردووە، لێی‌تێبگەین. ڕێژەیەکی زۆر لەو کەسانەی کە لەسەرەتاوە ببوونە ئەندامی گروپە فاشیستەکان لە جەنگی جیهانی یەکەمدا شەڕیان کردبوو «لەوانە هیتلێر و موسۆلینی و موزلی». دەربارەی ئیتالیا، فەرەنسا و ئەڵمانیا زۆر لە کەسانی گاردەکانی فاشیستی «گاردی ئیسکاردریستی، گاردی کاملۆدوورۆا، گاردی فرای کورپس، کراس قاوەییەکان و ئێس ئێسەکان». لە ئەرتەشیانی سابق بوون. بەرەی دوای سالی ١٩١٨ بەرەی دەمارگرژ و نیزامی بوو کە بە مەرگ و ئاستە توندوتیژییەکانی دەمارگرژی خووی گرتبوو. لە سەردەمی ئاشتیدا زۆریان لە کەش و هەوای ترسهێنەردا پەروەردە کرابوون و ئەمانە هەر ئەو کەسانە بوون کە ئالۆزی و چەواشەکاریان وەرێدەخست. لەم بارەوە دەمارگرژی و کردەوەخوازی فاشیستی پاساوی خۆی دەدۆزییەوە بەتایبەت لەو رووەوە کە رەقیبانی کۆمۆنیست، ئەوانیش هەر لەم شێوانە پێرەویان دەکرد. ئاسانکاری لیبرالی بەر لە جەنگ و تەنگ و چەڵەمەکانی کۆمەڵگای پاش جەنگ دەدرایە قەڵەم. ئەم بارودۆخە بۆ جیهانی نوی بە نامۆناسیبیان دەزانی. لێدان و دارکاری کردنی کۆمۆنیستەکان، جوولەکەکان، ئەندامی یەکێتییە سنفییەکان یان حەریفان و موخالیفانی (بەرهەڵستکارانی فاشیستەکان دەدرانە قەڵەم. پاک کردنەوەی خوێنی ئەرنێست و کراس‌قاوەییەکان بە فەرمانی هیتلێر و قەتلی ماتئوتی حەریف (نەیار)ی سیاسی موسۆلینی بە دەستی ئەو، لێدان کاری ماسیانۆ نوێنەری مەجلیس لە پەرلەمان و لێدان و

ـەرەنگاربوونەوەی شەقامەکان برەوی بەدەمارگرژیدا بوو بە حاڵەتی ئاسایی، ـەریزەخوازی و کردەوەخوازی فاشیستی لەگەڵ عەقڵخوازی لیبراڵی بێهوودە و ـەواز و بێرەمەق دژایەتی بوو. دیرۆک و هێماخوازی بزاڤە فاشیستییەکان لە چالاکییەکان و بەرەنگاربوونەوەکانی بەرخۆدان، لە ڕێپێوانە خیابانییەکان و ـبەرین و هەستانی سیاسی دەنگیان دەداوە.

ئەم توندوتیژییە ڕێخراوە سیاسییە لێکدانەوەی ڕۆشنبیرانەی لە شیعری کۆمەڵایەتی بەدیهێنابوو. توندوتیژی تەقریبەن کێششی جوانناسانە بەخۆوە گرتبوو.[٥٩] نووسەرانی وەک ژۆرژ سورل لە کتێبی تێڕاماتێک لەمەڕ توندوتیژی پیوەند دانی حەیاتخوازی فەلسەفی لەگەڵ توندوتیژی کۆمەڵایەتی دەورێکی کاریگەریان گرتە ئەستۆ لە ڕاستیدا حەیاتخوازی بە بۆنەی بنەمای غەریزی و ـلوڤانی خۆیەوە و دەیتوانی تەقریبەن بە جێگۆڕینێکی هەستپێنەکراوی مەنتقی، ـەگەڵ هەموو ئەزموونە هونەرییە خۆشڕوویەکان بە هۆی واتاگەلێکی وەک بوون و غەریزە یەک لایەنە بێتەوە. هەر بەم شێوەیە کە ئاشکرا کردنی رازی ئەزموونی دلوڤانی داهێنانی هونەری لە دەروونی ڕوانگەی توندوتیژی پاڵەوانانەی سیاسی دژوارە. توندوتیژی بە جۆرێک وەکو موعجیزەیەک دەبێ بە رازی جوانناسی.

لە لایەکەوە ئەم پێوەندی نێوان هونەر و توندوتیژی لە بڕێک نووسراوەکانی فوتوریستە ئیتالیاییەکاندا وەک جۆرێک جوانناسی کۆتایی سەدە بە شێوەی چاوکراوانە درێژەی پێدەدرا. زۆر لە هونەرمەندە بەتواناکان، بەتایبەت لە قۆناغی سەرەتایی و بەر لە کوشتنی ماتئوتی بەرەو لای فاشیزمی کێشران. مارگریتا سارفانی، عەشقەکەی موسۆلینی، بەتایبەت بۆ پشتگری کردن لە هونەرمەندان زۆر هۆگری بوو، هەرچەند کە ئەو خۆی زۆرتر لایەنگری پێوەندی نێوان فاشیزم و جۆرێک لە نئۆکلاسیزم بوو هەتا فۆتۆریزم. فۆتۆریزم خۆی هەر لەو قاڵبە فەرهەنگەیەی فاشیزمەوە هەڵدەقوڵا و لەسەر کاری ڕاستەوخۆ، ژیان، غەریزە و داهێنان تەئکیدی دەکرد هەتا لەسەر عەقڵ و سیستم.

فیلیپۆ مارینتی کۆکەری بەیانیەی فۆتۆریست فۆتۆریزمی بە هونەری فاشیزم دەزانی. بەلام مەعلووم نییە کە موسۆلینیش لەگەڵ باوەڕی ئەو هاودەنگ بووبێ.

مـارینتی لـە بەشـەکانی دەسـپێکی بەیانییەکـەی خۆیـدا کۆمەڵـێک لـە پرەنـسیپە سەرەکییەکانی مەرامی رادەگەیێنێ:

١- دەمانەوێ سروودی ئەوینی بە مەترسـی، عـادەت و خـووی جووڵانـەوە و پەلە بهۆنینەوە.

٢- پرەنسیپی بنەمای شیعری ئێمە نەترسی و دلێری و نافەرمانی دەبێ.

٣- ئەدەبیات لە پرسینەوەی نەبوونی جووڵانەوەی پیاوی خـاوەن ئەندیـشەی فرەویـژ دەدوێ... ئێمـە دەمانـەوێ بەشـان و بـاهۆی بزاڤـە شـەڕ و شـۆڕەکان، بێخەوی و لەرز و نۆبەتێ، رێی دوولایەنە، قەڵەمبـازی پـڕ مەترسـی، شـەقەزللە و مشت و سیخۆرمەدا هەڵبلێین.

٤- ئێمە مەزنی جیهانی دەولەمەندکراو و بە جوانی نـوێ، جـوانی تونـدرۆیین رادەگەیێنین. ئامێرێکی پێشبرکێ و کێبـەرکێ بـە کـاموتی رازاوە بـە لوولەگـەلی گەورە هەر وەک مارێک لەگەڵ پشووگەلی تەقینـەوەی... موتورێـک پـڕخرۆش و گەزارە هەروەکو موسەلسەلی ئاورین.[٦٠]

بەم شێوە، فاشیستە تازەپێشگەیشتوەکان هان و دنە دەدران کە بە تـەعبیراتی هەستبزوێن، خەباتخوازانە . دلێرانە بیر لە توندوتیژی بکەنـەوە. کاتێـک سـورل توندوتیژی لەگەڵ قەڵەمبازی حەیاتی بێرگستون گرێ دەدا «هێزی حـەیاتی خـۆی لە خۆوە کە جۆری مرۆڤی بەرەو ئاستێکی بالاتر لە کامـلبوون دەکێـشا» و ئـەم و ئەو ئـەوەیان لەگـەڵ رەسـالەتی بـاشنـژادی مێژوویـی پێوەنـد دەدا، تونـدوتیژی بایەخی جیهانی بەخۆوە دەگرت. ئەم توندوتیژییە هەر ئەو زۆر و گوشارە نـەبوو کە دەولەتە لیبراڵەکان بەکاریان دەبرد. توندوتیژی غەریزی بوو کـە تـاکی لەگـەڵ ناخی چاونەکراوەیی مەعنەوی ئەو پێکەوە گـرێ دەدان. ئـەم تونـدوتیژی رۆحیـە حەماسی پاڵەوان یان یەکەپیاوی دنە دەدا. ئەمە خاڵی کـردنی جـۆش و خـرۆش و ئاڵەبێژی رۆحی بوو. ئەو جۆرە کە جوانی پاپینی، فاشیستی ئیتالـیایی، گوتوویـە: «لە حاڵێکدا کە بێسەر و پێی دیموکـرات دژی جـەنگ هـاواری نارەزامەنـدی بـەرز دەکەنـەوە... ئێمـە جـەنگ بـە گـەورەترین هۆکـاری وزەبەخـشی مـومکین بـۆ

ـەدەستهێنانی هێز دەزانین، بە ئامێرێکی بە دەستوبرد و پاڵەوانانە بۆ بەدەسـهێنانی ـدەسـەڵات دەیدەینە قەڵەم».[٦١]

ئێمە دەبێ لێرەدا دروشمی کۆن، بەڵام لەم بارەوە پڕزەوق و تترووسکەدار تـازە ـەینەوە کە لەودا سروشتی مرۆڤ دەتوانێ ببێـت بـە حاڵـەتێک کـە تەنگوچەڵـەمەی ـرسناک و ترسهێنەر بە پیرییەوە بێ. ئەمە زۆرجار بە هـۆی کەسـانێکەوە ئـەوترێ ـە هەرگیز تەنگ و چەڵەمەی خوفناک و ترسهێنەریان نەدیوە و تامیان نەچێژتووە.

لە وەها شانۆیەکدا، نووسەرانی فاشیستی هەمیشە وەکو پڕۆژەیەکی رۆحی یان ـیوازێکی هەسـتی ئاماژەیـان بـە ئیـدئۆلۆژی کـردووە، پریمۆدریـوەرا، رێبـەری ـلانژەکـانی ئیـسپانیا گوتوویـەتی: «بزووتنـەوەی ئێمـە ئەگـەر تایبـەتن بـە نـاوی ـیوەی ئەندێـشە بناسـرێ لـە راسـتیدا بـاش هەسـتی پـێنـەکراوە، ئەمـە شـێوەی ـەندێشە نییە بەڵکو شێوەی هەستییە». پاپینیش گوتوویـە: «ئـەوەی ئێمـە پێشنیاری ـدەکەین نەک پڕۆژەکان بەڵکو بینینی مامەڵەی زێهنیـە هـەتاکو کۆتـایی بـە وشـەکان ـێنی و پـڕۆژەکان بگـۆڕێ بـە کـردەوە».[٦٢] هـەر بـەم رۆحییـە و ورەوە بـووە کـە ـزییەکان زۆرجار رایانگەیاندووە کە مرۆڤ دەبێ بیر لە «خوێن» بکاتەوە.

لەبەر ئەمە، سەیر نییە ئەگەر فاشیزم دژی رۆشنبیرانە بزانین، باوەڕی فەلـسەفی ـەو لەسەر بنەمای ئەم گریمانەیە کە ناخی بێخەبەری. ئیرادە، هەسـتی رووخۆشـی، غەریزە، بـوون، هـەوا و مـەیل. خـوێن و لـەو بابەتانـە لـە راسـتیدا خـووی مـرۆڤ پێکدێنێ. ئەمە لەگەڵ ئاسـتی فیکـری دەسـکری مـرۆڤ دژایـەتی هەیـە. ئـەم بینینـە بەشێک لە کێششی بە تـەوژمی فاشـیزمی بـۆ زۆر لـە هونەرمەنـدان، نووسـەران و رۆشنبیران بەتایبەت دوو گرووپی سەرەتا پێکدەهێنا. وەڵامـی جنتیلـە «بـە نیـشانەی وەڵامێکی هێگلـی و لەبـەر ئەمـە دژی وجـوودی» بـەم پرسـیارە کـە ئایـا هۆکـاری بوونەوەری مرۆڤ عەقڵانییە یان ناعەقڵانی و ئـیرادی، ئەمـە بـوو کـە نابـێ بگەینـە ئەنجام کە فاشیزم «کردەوەیەکی چاوبەسـراوانە یـان هـەر تـەنیا میتـۆدی غـەریزە بووە». بە بۆچوونی جنتیلە، فاشیزم دڵی راسـتی و «ئەندێشەی زینـدوو» بـوو، بـە جۆرێکی دیکە، ئەندێشەی دیـاریکراو بـوو لـە رووبـەڕوو لەگـەڵ ئەندێـشەی لـەبێخ هاتوو.[٦٣] بە وتەی جنتیلە فاشیزم لە شێوەیەکدا دژی فیکرە کە «شـعوور لـە ژیـان...

مێشک لە دڵ... ڕوانگە لە کردەوە» جیا بکەینەوە.[٦٤] بەم جۆرە فاشیزم، خۆی لە خۆیدا بە ڕاستەقینە دەناسرا.

لایەنێکی دیکە لەم حەیاتخوازیە، جەماوەری خەڵک بوون کە زۆر جار بە نیشانەی گەلە گاران کە بە دوای ڕازیبوونی غەریزەمانی خۆیانەوەن، چاویان لێدەکرا. کەسانێکی بڕێک لە پێشتر دەیانتوانی دەس لە غەریزەکانی ئەوان وەردەن. شێوازی کاڵی داروینیزمی کۆمەڵایەتی لە تێکەڵاوی لەگەڵ مەرامی نەتەوەی پلەبەرزتر بەم دەرەنجامە دەگەیشت کە وێنەگەلێکی ناشیاوتر یان پلەی لە دەستداوی مرۆڤ دەکرێ هەر بەو شێوازە کە پاتاڵی ماڵی هەڵدەبژێرێن و باریان دێنین، لە بەین بەرین یان پەروەردەیان بکەین. لەبەر ئەمە، مرۆڤەکان لەگەڵ بەکەمزانینی خێرخوازانە بە شێوەی گارانی و جەماوەری بەرچاو دەگیران. موسۆلینی بەڕاستی ڕوانگەیەکی شەرمهێنەری لەمەڕ بوونەوەری مرۆڤی بوو. گریمانەی گشتی ئەو ئەمە بوو کە هەر مرۆڤێکی تەواو خوخواز جێی باوەڕ و متمانە نییە. ئەمە وێچووی وێنەیەکی تەواوە کە بولووک لە هیتلێری کێشاوەتەوە کە لەودا «ڕەشبینی لەگەڵ خێرخوازی تێکەڵ بوو. [بە بۆچوونی هیتلێر] هۆکاری مرۆڤەکان ترس، تەماح، ئارەزووی دەسەڵات و بەرچاوتەنگی بوو کە لەگەڵ جووڵانەوەیەکی بە عاستەم دەکەوتەکار. سیاسەت... هونەر ئەوەیە کە بزانین چۆن لەم بێهێزیانە بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆمان کەڵک وەرگرین».[٦٥] ڕەخنەی گەورەی موسۆلینی بە سەلاحییەتی ماکیاڤێل بۆ ئەمە کە بناخە دامەزرێنەری فاشیزم بێ، ئەمە بوو کە ئەو بە ڕادەی پێویست خێرخواز نەبوو. بە کورتی، موسۆلینی لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە دەکرێ جەماوەر بە ئاسانی بە هەڵە ببرێن و زاڵبی بەسەریاندا. جەماوەر لە بنەڕەتەوە وەکو منداڵێک بوون کە دەبوایە بەینابەین سەرکۆنە و نەسیحەت یان وەڵامی باش بەوان بدرێتەوە. ئەو جۆرە کە ماک سمیت دەڵێ: «موسۆلینی لەمە خۆشحاڵ بوو کە دەیدی گارانی ـ پیتێک کە حەزی دەکرد بە کاری بەرێ ـ لەگەڵ دڵخۆشی نایەکسانی و نەزم دەسەلمێنێ».[٦٦]

زۆربەی فاشیستەکان لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە مرۆڤەکان لەبەر جەوهەری خۆیان کۆمەڵایەتین. هیچ فاشیستێک نکۆڵی لەم باوەڕە نەبوو، هەرچەند هەر کەس

ـیر و بۆچوونی تایبەتی خۆی بوو. یەکێک لە ئامانجە رەخنەیە هاوبەشەکانی ئەوان کـە لـە ئاسـەواری هـەر نووسـەرێکی فاشیـستیدا دەبینـرێ، تـاکخوازی لیبـرالیزمی کلاسیک بوو. بۆ وێنـە ئـالفردۆروکگۆ بـاوەڕی بـوو کـە بـە پێچەوانـەی تـاکخوازی لیبرالی، «بوونی مرۆڤ لە دەرەوەی کۆمەڵگە هیچ شتێک نییە و تەسـەور بـرێ پـێ ـکـا ـ لـە مـرۆڤ بـە دوورە. نـەوعی مـرۆڤ لـە بـوونی خۆیـەوە لـە گرووپـە کۆمەلایەتییەکاندا ژیان دەکەن». بە بۆچوونی روکگۆ فاشیزم «لەبەر ئەمـە، جێگـری ـروانگەی دێرینی ئەتۆمیزم و روانگەی میکانیکی دەبێ کە بناخەی مەسـلەکی لیبـرالی و دیموکـراتیکی پێکـدەهێنا».[٦٧] جیاوازییـەکی مـەزن لـە تێگەیـشتنی ئـەم سروشـتە کۆمەلایەتییە بەتایبەت لە نێوان نووسەرانی ئیتالیایی و ئەڵمانیدا لـە ئـارادا بـوو. لـە نووسـراوەکانی جنتیلـە، روکگـۆ و موسـۆلینی، لایـەنی «کۆمەلایـەتی» زۆرتـر بـە شێوەی قەراردادی و لە لایەن واتای نـەتـەوە، دەوڵـەتەوە دەرک دەکـرا. جنتیلـە لـە وتـارەکەیـدا بـە نـاو «بنـەڕەتی فەلـسەفی فاشـیزم» دەنووسـێ: «چونکـە دەوڵـەت پرەنسیپە، تـاک جـۆر و بەرهـەمی ئـەو دەدرێتـە قەڵـەم».[٦٨] ئـەو لـە دوا رەسـالەی سیستماتیکی خۆیدا دەڵێ: «ریشەی من لە ئێمە دایە. کۆمەڵـگەیەک تـاکی هـی ئـەوە، بناخەی هەستی مەعنەوی ئەو دەدرێتە قەڵەم.[٦٩] رۆحی کەلامی جنتیلە ئەوەیە کە بـۆ خەڵکی ئەورووپا ـ لە رازیبوونی سەرەکیترین نیازکانەوە هـەتا بـە حەقیقـەت گـەینی ئازادی و ئـەخلاق ـ پەرەپێـدان و تـەکامولی تـاک بەشـێکی جیانەبوونـەوەی لەشـی دەوڵەتە. لە راستیدا دەوڵـەت و تـاک هـەر جەوهـەرێکیان هەیـە. بـە وتـەی جنتیلـە: «دەوڵەت بیچمـی گـشتی تاکـە... دەوڵـەت پێـشمەرجی بـوونی تـاک نییـە... بەڵـکو واقعییەتی بوونی ئیرادەی ئەوە».[٧٠]

لێکدانـەوەی ناسـیۆنال سۆسیالیـستی واژەی (کۆمەڵـگە) لەگـەڵ لێکدانـەوەی فاشیـستە ئەورووپایـەکان جیـاوازی بـوو. ناسـیۆنال سۆسیالیـستەکان زۆرتـر سەرنجیان لەسەر لایەنی نژادی و Völkisch [نەتەوە] کـۆ دەکـردەوە هـەتا لەسـەر دەوڵەت، تاک لە لایەن کۆمەڵگەوە فۆرم دەگرێ، کۆمەڵگەش لەسەر بنەمای نژاد یـان رۆحی نەتەوە [volkseele] پێکدێ. واتایەکی هەست یاری و رۆمانتیک لە سروشت لە پشت ئەم کێشەوە شاراوەیە. سروشت وەکو مەلینەیەکی بێگیان و بەنـەزم نییـە کـە

بتوانـێ بـە سـاردی و بێهەسـت دەرک بکـرێ؛ بـە پێچەوانـەی سروشـت «وزەی حەیاتی»یە کە هەم بە مرۆڤەکان و هەم بە volk (قەوم یان نەتەوە)ی ئـەوان حـەیات و ئامانج دەبەخشێ.[71] ژیانی غەریزەیی و هەسـتی بوونـەوەری مـرۆڤ نـەک هـەر تەنیا ئەوان لەگەڵ قەومی خۆیان بەڵکو لەگەڵ «هێزی حەیاتی» زاتی سروشت گـری دەدران، لەبەر ئەمە، بوونـەوەری مـرۆڤ دەیـانتوانی لەبـەر تاقانـە بـوونی خۆیـان لەگەڵ سروشت جێی ڕێز و سوپاس بن نەک لەبەر زاڵبوون بەسەر ئەودا. ناسـیۆناڵ سۆسیالیستەکان بە پێچەوانەی فاشیستەکان، بە واتایەکی دروسـتکراو و ڕازدارانـە. سروشت چ دیمەنی سەوزی ئەو و چ ژیانی گوندی و وەرزێڕی ڕێزیان بـۆ دادەنـا. واتە ئەگەر دەکرا کە ڕۆحی خەڵک لەسەر زەوی ئەوان ڕەنگیداوەتـەوە. نابـێ لـەبیر بچێتەوە کـە ناسـیۆناڵ سۆسیالیـستەکان یەکـەم کەسـانێک بـوون کـە لـە ئـەورووپا مەسـەلەی کۆکردنـەوە و عـەمارکردنی سروشـتیان هێنـا ئـاراوە و پلانیـان بـۆ زیندووکرانـەوەی دارسـتانە خوڕسـکەکان لەبـەر هۆکارەکـانی پێگـەی ژیـن و بـە خۆمالیان پێناسە کرد.

خاڵێکی دیکە لێرەدا ئەمە بوو کە نایەکسانی نەگۆڕ و بێ لێپرسینەوە لـە بابـەتی ژینگەناسـییەوە ڕاسـتەقینە و حاشاهەڵـنەگر بـوو. هـەموو نازییـەکان نایەکـسانی نژادەکان و ڕۆحە نەتەویەتییەکانیان قبـوول بـوو. ئاریـایی بـە نێـوی نـژادی تاقانـە لەگەڵ سەرزەوی و خەڵکی خۆی، لـە هـەر نـەزەرەوە پلەبـەرزتر لـە یەهودییـەکان، ئەسلاوییەکان یان ڕەشپێستەکان بوون. هیتلێـر ئارییایـەکانی بـە «نـژادی ڕەسـەن» دەزانی. نایەکـسانی نـەگۆڕی خەڵـک بـەواتای نـەبوونی نایەکـسانی لـە نێـوان ئارییایەکاندا نەبوو بۆ وێنە لە نێوان ئارییایە بلیمەتەکان یان پاڵەوانێکدا بوونی بوو کـە پلەبەرزتر لە دایکببوون، کارە گەورەکان هەر تەنیا بـە کۆشـشی پیـاوانی مـەزن بـە ئەنجام دەگەیشت. ئەو جۆرە کە هیتلێـر دەڵـێ: «بـەرەوپێش چـوون و کـەلتووری مرۆڤایەتی بەرهەمی زۆرینە نییە بەڵکو هەر تەنیا پێوەنـدیی بـە بلیمەتـەکان و وزەی کەسایەتییەوە هەیە».[72]

دەربارەی کەسایەتییە بلیمەتەکان یان ڕێبەر، فاشیزمی ئیتاڵیاش ڕای دەربـڕیوە. دەربارەی ئاخری بە نزیکایەتیگەلێکی شاراوە لەمەڕ بلیمەتی نژادی یـان بیۆلـۆژیکی

تعناعـەت نـەدەکرا، بەڵـکو بـە لێکدانـەوەی نووسـراوە کۆمەڵناسـانەکانی ویلفێـر
ـووپارتۆ، گانتـانۆ موسـکا و روبێـرت مـیکلس دەربـارەی پـسپۆڕخوازی بەڵـگەیان
ـدهێناوە. نووسەرانی پسپۆڕخواز نەک هەر لە روانگەی رێبەرایەتیدا بەشـیان بـوو
ـەکو لە پێکهێنانی رەشـبینی سـەبارەت بـە دیموکراسـی پەرلـەمانی کـە لـە نێـوان
ـشیستەکاندا زۆر بەبرەو بوو، یارمەتیان کرد. دەبێ وەبیربێنینـەوە کـە هـەر تـەنیا
ـمیکلس لایـەنگری ئاشـکرای فاشـیزم بـوو. هەڵـبەت دەبـێ بـوترێ کـە ئـەم لایەنـە
ڕۆشنبیرانەترە لە فاشیزمی ئیتالیا هەمیشە ئاشکرا نـەبوو. پڕەنـسیپە خۆفریـودەرە
خۆخوازەکانی دەروون ئازاریش لەو «لایەنە بەهێزانـەی روانگـەکانی موسـۆلینی و
هیتلێر دەربارەی دەوری خۆیان دەدرایە قەڵەم.[٧٤]

گشت فاشیستەکان لەسەر ئەو براویـە بـوون کـە بـە هـۆی گەندەڵـی سروشـتی
مرۆڤەوە لە کۆمەڵـگە دیموکراتیکـە لیبراڵـەکان، دەبـێ گۆڕانکارییـەک بێتـە ئـاراوە.
دەربارەی ناسیۆنال سۆسـیالیزم ئـەم چالاکییـە، ئـەو جـۆرە کـە ئەرنێـست کریـک
گوتوویە لە پێناوی پێکهێنان «مرۆڤی ئەڵمان پێبەند بە قـەوم» بـوو.[٧٥] بـە بۆچـوونی
موسۆلینی ئیتالیای فاشیست دەبـوو شـتێکی وەک رێنیـسانس (زیندووکردنـەوە)ی
ئیتالیا پێکبێنێ. کۆشش بۆ خولقاندنی مرۆڤی فاشیـست لایەنگـەلێکی گاڵتەجاڕیـشی
بـــوو وەک چـــالاکی و ئۆردووکێـــشی دژی خواردەمـــەنی پاســـتا بـــە نـــاوی
خواردەمەنییـەکی دژی فاشیـستی و ئەمـە کـە ئیـسپاگیتی و ماکـارۆنی «خـوراکی
راستەقینەی شۆڕشگێڕان» نین.[٧٦] موسۆلینی چاوەڕوانی دەکرد کە مرۆڤی ئیتاڵیایی
دەبێ پاڵەوانتر و گەشبینتر بن، کەمتر بخەون و لەشی خۆیان ساخ رابگرن.[٧٧]

جیاوازی گەورەی نێوان روانگەکانی ئەڵـمانی و ئیتاڵـیایی دەربـارەی ریفـۆرمی
خووی مرۆڤ لەمەدا بوو کە بە بۆچوونی موسۆلینی مرۆڤی نوێ هەر ئێستا بوونی
بوو، بەڵام دەبوایە ئەوان لە گرفـت و گیرەکـان ئـازاد بکـرێن. بـە بـیر و بۆچـوونی
کۆمەڵێک لە نازییەکان وەکو روزەنبێرگیش ئاریـایی مـوو بـۆر بـوونی بـوو، بـەڵام
دەبوو لە ئاست تێکەڵاوی نژادی پشتگری لەو بکرایە. بـە بۆچـوونی هیتلێـر و ئـێس
ئێسی چەکدار دەبێ نژادی مرۆڤی نوێ وەک خۆی لێبێتەوە و باشترینی ئـەوان بـۆ
داهاتوو پەروەردە بکرێن و هەموو «بەشە نژادییەکان» لەناو ببرێ.

## نەتەوە، نەژاد و قەوم

ئەگەر بۆ تاوتوێکردنی مەسەلەکانی ناسیۆنالیزم، نژاد و volk [قەوم] زۆرتر لە ناخی راچین، ئەندێشەی فاشیستی لەمەڕ سروشتی مرۆڤ روونتر دەبێتەوە. بە جۆرێکیتر، بوونەوەری مرۆڤ لە پلەی یەکەمدا خولقێنراوی نەتەوەیەک، نژاد یان قەومێکن. لەبەر ئەمە مرۆڤی گشتی وەلانراو بوونی نییە بەڵکو مرۆڤی ئەڵمانی، فەرنسەوی، ئیتاڵیایی و... بوونی هەیە. ئەم دوزە راستەوخۆ دژی ئەندێشەی سەردەمی رۆشنبیری و دواتر لیبراڵی و ئینتێرناسیۆنالیزم سۆسیالیستی و جیهان وەتەنییە.

ناسیۆنالیزمی فاشیستی جیاوازی لەگەڵ ناسیۆنالیزمی لیبراڵی سەدەیی نۆزدەیەمدا بوو. کاتێک گوتفریت هەردێر بە تاوتوێکردنی خووی زمانناسی نەتەوایەتی سەرقاڵ دەبوو بە هیچ جۆر واتای پلەبەرزتر، دەسەڵاتخوازانە یان بێزاری بەرامبەر بەتەواویەتی باوەڕی نەبوو. لە سەدەی نۆزدەیەمدا شێوازی جۆراوجۆر، کارکردی بەرتەسکانەتر، بێگانە هەراسانە یان شەڕخوازانە لە ناسیۆنالیزم لە فیکری گروپە پارێزگارە سەرەڕۆکاندا بوونی بوو و فاشیزم هەر تەنیا ئەوەی سەلماند.

لایەنە هاوبەشەکانی ناسیۆنالیزمی فاشیستی بریتی بوون لە ئەولەن دژایەتی دێرینەی پارێزگاری لەگەڵ ناسیۆنالیزمی لیبراڵی یان سۆسیالیستی. ئەو جۆرە کە پاپینی گوتوویە؛ سۆسیالیزم «ئینتێرناسیۆنال واتە دژی حزبی نەتەوەییە» و «بۆ ئەمە کە لە ناخەوە هیچ شتێکی خۆش نەوێ دەبێ لە شتێکی دیکە بێزار بێ»، کەوایە ناسیۆنالیزمی راستەقینە ناتوانێ ئینتێرناسیۆنالیست بێ.[۷۸] دووەم، ناسیۆنالیزمی فاشیستی مایل بوو کۆمەڵگە بە کەماڵی ئارەزوو بگا. پێناسەی راستەقینە لە کۆی نەتەوەدا بوونی بوو و نەتەوە لە ژوور تاکەوە بوو. ئەو جۆرە کە «مەنشووری کار»ی فاشیستی ئیتالیا دەڵێ: «نەتەوەی ئیتالیا کۆیەکی زیندوو یان ئۆرگانیکێکە کە ژیان، ئامانجەکان و ئامێری کردەوەی گەین بەوانە لەسەرووی دەسەڵات و ماوەی تەمەنی تاکێکە... کە ئەوەیان پێکهێناوە».[۷۹] سێیەمین، لە ناسیۆنالیزم بە ناوی پارسەنگ یان هۆکاری هاوکێش بۆ خەباتی

جیـایەتی کەڵکی لێوەردەگیرا. نەتەوە باڵاتر لەم دابەشکارییە بوو. ئـەو جـۆرە کـە
ڕیمو دریوەدا گوتوویە: «خەباتی چینایەتی یەکگرتوویی سەرزەوی بـاو و بـاپیر
ـەخاتە پشتگۆی چونکە تاقانەیی واتای بەکارهێنانی نەتەوەیی و خوماڵی لـە بـەین
ـ پاکتـاو دەکـا».[80] بێجگـە لەمـە، ناسـیۆنالیزم لەگـەڵ واتـای بـوورژوا لیبـراڵی
ـەربارەی ژیان و دژایەتی بوو. ناسیۆنالیزم نەتەوەیی بـۆ کـردەوەی پاڵـەوانانە،
ـەخۆبوردن و فیـداکاری، بـەرخۆدان و لەکۆتاییـدا بـۆ جـەنگ ئامـادە دەکـرد.
ـورژوازی ئەم بەرەو لووتکە فرێنانەی بێهێز دەکرد کاتی بۆ ئـارەزووە مـاددی و
ـیاسەتە پەرلەمانییەکان بەفیرۆ دەدا. ئـەنریکۆ کـورادیتی پـاش جـەنگی جیهـانی
یەکەم بێزاری خۆی بەم جۆرە بەکورتی رادەگەیێنی و دەریدەبڕێ:

هەر نیشانەیەک لە کۆنەیی، پیری، یـاری بـە هەسـت، مەسـلەکخـوازی، ڕێـزی
ـەناوچوو بە ژیانی تێپەڕی مرۆڤ، بەزەیی لەناوچوو و کۆن سەبارەت بە بێهێزی
و پەستبوون، چکۆلە بوونەوە و کەمهۆشـی بـە چـاوی زانـا بـوون سـەیر کـردن،
خافڵبوون لە هێزە شاراوە پلەبەرزەکانی جۆری مرۆڤ، گاڵتەجاڕی پاڵەوانی، هەر
هێمایەکی ناحەزی بەساڵاچوویی بێزارکەری نەتەوەی کەوتوو دەتوانێ لـە ژیـانی
پیرانەی چینی حاکمی ئێمە، واتە بورژوازی ئیتالیا بدۆزێتەوە.[81]

سەرەنجام لە ناسیۆنالیزم بە نـاوی ئامێرێـک بـۆ ڕەوا بەخـشین بـە کۆمەڵـێک
واتای دیموکراسی و سۆسیالیزم کەڵک وەردەگیرا. زۆرجـار بـە نووسـراوەکانی
فاشیستی بە نیشانەی «دیموکراسی ڕەسەنتر» و «سۆسیالیزمی ڕەسەنتر» ئاماژە
دەکرا.[82] سۆسیالیزم و دیموکراسـی ئەگـەر لـە ڕێگایـەکی باشـتری نەتـەوە خـەرج
کرابان لە لایەکەوە، لە بەرامبەر دێموکراسی پەرلـەمانی بورژوازیـدا پێشکەوتووتر
دەبون و لە لایەکی دیکەوە بەسـەر سۆسـیالیزمی ئێنتێرناسیۆنالیـستدا زاڵـدەبوون.
خراپترین جیهانەکان بوو کە بە میکرۆبی رووبـەڕووی سۆسـیالیزم و دێموکراسـی
پـیس کرابـێ. لـەم بـارەوە باشـترین لایەنـەکانی سۆسـیالیزم و دێموکراسـی لـە
خۆبوردنی بـە جـەماوەری ئـەوان لـە ڕێـی نەتـەوە لـە تـەمی ئێنتێرناسـیۆنالیزم و
یەکسانی بە درۆ لە نێو نەتەوەکاندا بزر دەبوو.

جیاوازی گەورەی نێوان جۆرەکانی ناسیۆنالیزمی ئەڵمانی و ئیتالیایی لێرەشدا بابەتی نژادی بوو. لەسەرنجی فاشیزمی ئیتالیایی، ناسیۆنالیزم فۆرمی سوننەتیتری ئیمپراتۆرییەتی بێگانە دوژمن ولات پەرستی بەخۆوە گرت. بەلام لە روانگەی ناسیۆنالیزم سۆسیالیزمەوە، نەتەوەی ئەڵمانی جیلوەگەری رۆحی قەومی بوو کە بناخەی بۆچوونی ئەوە باوەری بیۆلۆژیکی بێخەوشی نژادی پێکیدەهێنا. ئەڵمانی بوون واتە لە نژادی تایبەتی پلەبەرزتر بوون. سەیر ئەمەیە کە بە بۆچوونی فاشیزمی ئیتالیایی، بەو جۆرە کە موسۆلینی گوتوویە: «ئەمە نەتەوە نییە کە دەولەت بەدیدێنێ... بەڵکو ئەمە دەولەتە کە نەتەوەی خولقاندووە».[83] بەلام بە پێچەوانە لە نازیسمی ئەڵمانیدا، ئەو چەشنە کە هیتلێر گوتوویە: «دەولەتە خۆی لە خۆیدا ئاستێکی کەلتووری تایبەت ناخولقێنێ، بەڵکو هەر دەتوانێ نژاد، کە ئەم ئاستە دەبەستێ بە شەرتەوە، بپارێزێ». و دەشلێ «ئێمە ئاریاییەکان هەر تەنیا دەتوانین دەولەت بە ئۆرگانیزمێکی زیندوو لەم نەتەوە بزانین».[84] ئاشکرایە کە لە پێشبوونگەلێکی ئیدئۆلۆژیکی دژبەیەک لە نێوان نازیسم و فاشیزمی ئیتالیادا بوونی بوو. سەرەنجام، ئەمە کە جیاوازی ئاشکرا لە تەئکید لەسەر بایەخدان بە نەتەوە دەکەوێتە بەرچاو. لە حالێکدا کە لە ناسیۆنالیزم سۆسیالیزمی ئەڵمانیدا میلەت لە تونی تەمێکی نیوەمەزەبیدا دادەپۆشرا، وەها بارودۆخێک لە فاشیزمی ئیتالیاییدا لە ئارادا نەبوو.

بەیانێک بۆ بوونی ئەم جیاوازیانە، میراتی فکری نائاسایی نازیسمە. گرنگترین پایەی ئەم میراتە بریتی بوون لە روانگە نژادییەکانی ئارتۆر دووگوبینوی فەرەنسەوی و هۆستۆن ستوارت چمبرلین، بەچکە سەرمایەداری ئەڵمانی دۆستی ئینگلیسی و هەروەها سوننەتی هەستیاری «قەوم» لە ئەڵمان کە لە نووسراوەگەلی کەسانی وەک پۆل دولاگارد، جۆلیوس لانگبن و مولێر وان دن برۆک لەسەر ئەوە تەئکید کراوە.[85] هەر ئەو جۆرە کە مارکس و ئینگلس بزوێنەری مێژوویان بە خەباتی چینایەتی دەزانی، کۆنت دووگوبینو و چمبرلین ئەم بزوێنەرەیان لە خەباتی نژادی و نەتەوەخوازیدا دەبینی. کتێبی بەناوبانگی گوبینو بە ناوی رەسالەیەک لەمەر نایەکسانی نژادەکانی مرۆڤ (١٨٥٥-١٨٥٣) شالاوێک بوو بۆ

ـــەر لیبـڕالیزمی ســەدەی نۆزدەیـەم و سۆسـیالیزم کـە هـەر دوو بـە یەکـەوە
میراتبەری پڕەنسیپی شۆڕشی کە بیری فەڕەنسە دەدرانە قەڵەم. بە بۆچوونی ئەو
واتاگـەلی درۆی ئـەخلاقی یەکـسانی مـرۆڤ دژایـەتی لەگـەڵ واقعـەی زانـستی
ڕاوەستاوی نایەکسانی نژادەکانـە. بـە بیروبۆچـوونی گوبینـو سـێ جـۆر نـژادی
سەرەکی لە سلسلەی مراتبی نژادەکاندا بوونی بوو کە هەر یەکـەیان تایبەتمەنـدی
تایبـەتی خـۆی بـوو: سـپی، زەرد و ڕەش. ئایـەخترین نـژادی ڕەش و شـازترین
نژادی سپی بوو. لە نێو نژادی سپی گروپێک بوو ـ ئاریایەکان ـ یەکـەم هەڵـبژاردە
دەدرایـە قەڵـەم و دەبـوو لـە تێکـەڵاو بـوون لەگـەڵ ئـەوانی دی خـۆ بپـارێزێ.
تراژیدییەکی مەزن کە لە نژادی مرۆڤدا ڕوویدا بـوو، تێکەڵاوییـەکی حاشاهەڵـنەگر
یان ژن و مێردایەتییەکی ناهاوتۆرەمەیی بوو. ئەم کـارە بـە فەسـاد و گەندەڵـی و
بێسامانی و... لە شارستانییەتدا بەڕێوەبرابوو.

لە ١٨٧٦دا، گوبینو لە کۆتایی تەمەنیدا کورتیلە یادداشتێکی بۆ دۆست و هەڤاڵی،
ریشارد واگنێری مۆسیقازان نووسیبوو. پاش مەرگی ئەو دوانـە لـە ساڵـی ١٨٨٢،
کۆزیمـالی خێـزانی لـە پـاش بـەجێماوی واگنێـر بـە هاوکـاری لوودویـگ شمـان
«ئەنجوومەنی گوبینو»یان لە ١٨٩٤ دروستکرد کە ئارشیـڤی تایبـەتی نـژادی ئـەو
لەوێدا پارێزگـای لێـدەکرا. یـەکێک لـە ئەندامـە بەناوبانگـەکانی ئـەم ئەنجوومەنـە
هۆستۆن ستوارت چمبرلین بوو کە بنەمای سەدەی نۆزدەیەم ئەو (١٨٩٩) درێـژەی
بە نـاوەڕۆکی تەسـەوراتی نـژادی دا و خـستییەگەڕ. ئـەو بـە پێـڕەوی لـە گوبینـو،
بایەخێکی لە ڕادەبـەدەری بـۆ نـژاد دانـابوو. لەگـەڵ ئەمـە، بـە پێچەوانـەی گوبینـو،
نەژەریاتی دژی سامی «پلەبەرزی» هاوڕێ بە باوەڕ و بە پلەبەرزی ئاریایی تووتنی
لە بنەمایە بوو بە هۆکاری زاڵی. هەروەها دیسان بەپێچەوانەی گوبینو، چمـبرلین بـە
گەشبینییەکی زۆرتر بە ڕۆڵی ئەڵمانییەکان لە پاراستنی بێخەوشی نژادی و بـەرگری
کردن لە ژن و مێردایەتی ناهاوتۆرەمە، یـان «چەواشـە کـردنی قـەومی» چـاوی بـە
ئەوروپادا دەگێڕا. چمبرلین کەمێک بەر مەرگی، لە ١٩٢٧، پێچرا بە حـزبی نازییـەوە.
هیتلێر و ئالفرێد ڕوزێنبێرگ کە بیرمەند حزبی نازی دەدرانە قەڵەم، ڕێزێکی قووڵـیان
سەبارەت بەو بوو.

دژەنژادییەکانی وێچووی زانستی ناوبراو نووسەرانی نازی لەگەڵ سوننەتە قەومی و ڕۆمانتیکە دێرینەترەکانی سەرەتا دەیەی ١٨٠٠یان پێکەوە گرێبەس کرد ڕۆمانتیسیزم شانازی بە بایەخی بوون، خۆشەویستی و هەستەوە دەکرد. ئەم هەستە بە جۆرێکی وردبینانە و زیرەکانە لەگەڵ ڕوانگەی ناسیۆنالیستییەکیان گرتووە. ئەم جۆرە کە پۆیس دەڵێ: «وا دێتەبەرچاو ئەوەی کە فیختە لە فەلسەفەدا کردبوویە پایە... شاعیرانی وەک ئارنێت و کورنێر و وڵات پەرستی وەک بابەگیان لە ئاستی فیکریدا دروستیان کرد، واتە: پاڵەوانی، لەخۆبوردوویی و فیداکاری تاکی قەوم».[٨٦] لە سەرەتای دەیەی ١٩٠٠ ئەم مەڵهەمە مەستیبەخشە لەگەڵ سوننەتەکانی دێرینی دژی سامی ئەوروپایی، حەیاتخوازی فەلسەفی و داروینیزمی کۆمەلایەتی و کاڵ و نەکوڵیو لەمەڕ نژادە شیاوترەکان تێکەڵاوبوون و ئەوکات دوابواری نەزەریاتی ناسیۆنال سۆسیالیستی دەیەی ١٩٢٠ فۆرمی گرت.

لەگەڵ سەرنجدان بەو خاڵانەی سەرەوە، سەرسوورهێنەر نەبوو کە ناسیۆنال سۆسیالیزم ڕوانگەی نائاسایی ناسیۆنالیزم پەروەردە بکا. پرەنسیپە پێکهێنەرەکانی ئەم ڕوانگە دەکرێ بە شێوەی خوارەوە کورت ببڕینەوە: یەکەم ئەمەکە ناسیۆنالیزم «قەوم»خواز بوو. تەسەوری گشتی volk یان قەوم، ئەو جۆرە کە مووسە گوتوویەتی: «بەواتای یەکگرتوو تاقمێک لە خەڵک لەگەڵ «جەوهەر» پایەبەرز بوو ئەم «جەوهەر»ە دەبوو ناوی «سروشت» یان «کەیهان (گەردوون)» یان «دیرۆک»ەی لێنرابایە، بەڵام لە هەر بابەتێک لەگەڵ دەروونیترین سروشتی مرۆڤ دەچەسپێ».[٨٧] مووسە و نووسەرانی تر هۆکاری دزەکردنی مەزنی دۆزە volkکان لە کەلتووری ئەڵمانیدا بون. کەلتووری «قەومی» لەگەڵ کەلتووری بورژوایی دژایەتی بوو. بەتایبەت ئالفرێد ڕوزێنبێرگ ئەو جۆرە کە لە کتێبی دیرۆکەی سەدەی بیستەمدا لەسەر ناوەندی بوونی volk تەئکیدی دەکرد، بە باوەڕی ڕوزێنبێرگ ئەرک ئاشکرا و ڕۆشن بوو:

پشتگری کردن لە بەرامبەر بە دزەکردنی مێگەلە ئافریقاییەکان؛ داخستنی سنوورەکان لەسەر بنەمای لێکدانەوەی مرۆڤناسی؛ پێکهێنان و دروستکردنی خوو

ـ ئولفەتی نژادی باکووری بۆ پاککردنەوەی سەرزەوی دایکی ئەورووپا لەبەرفراوان
بوونە و پەرەسەندنی ناوەندی نەخۆشی ئەفریقا و سوورییە.[88]

مێژووی گومانلێکراو، موتالای کلاسیک، مرۆڤناسی، کاسەسەرناسی، زمانناسی،
عیرفانی مەزهەبی مایسترکهارت و تەنانەت دیرۆکی نیبلونگن و دەدا هەموویان بۆ
پشتگری لە نژادی سەروەری Herrenvolk باکووری بە شێوەیەکی ئالۆز وەکو
تەوەی بە بەنێک بە یەکەوە گرێ درابوون. هیتلێر هەر لەم مێژووە دەسکردەی
نژادە بۆ پاساوی باوەڕی هەوای حەیاتی کەلکی وەرگرت. پاراستنی نژادی ئاریایی
هەلگری پشوودرێژی و بەرینکردنەوەی ولات بوو. لەم رووەوە، هیتلێر
گوتوویەتی: «هەر تەنیا بوونی هەوای بەتەواوی بەرفراوان لەسەر گۆی زەوی
نژادی وجوودی نەتەوە دەستەبەر دەکا».[89] ئەو جۆرە کە دەبێ چاوەڕوانی
بکرێ، ئەم روانگە «باکوور»یە پڕ لە باوەڕی مەزەبی بتپەرستانەی سێحراوی
بوو کە زۆربەیان لە دژایەتی لەگەڵ مەسیحییەت بەکاردەبرا. هیتلێر و نزیکانی
وەکو روزێنبێرگ و هیملێر لەناخەوە هۆگری ئەم باوەڕە بوون.

پێویستی پاککردنەوەی نژادی هاندەری پشتگری پۆزەتیڤ لە پرۆژە باش
دروستکردنەوەکانی نژادی بوو. ناسیۆنال ناسیۆنالیزم هەر لەسەرەتاوە بە
دژایەتی کردنی ئیزدیواج لەگەڵ نژادە جۆراوجۆرەکان هەستا و دواتریش ژن و
مێردایەتی کردنی لەگەڵ جوولەکانی لەرێی یاساوە قەدەغە کرد. بە بۆچوونی
هیتلێر، زانستی پزشکی ئەرکی خۆی بوو کە خۆی لە پێناو ئەم ئامانجە نژدیانە
دابنێ.[90] یەکێک لە نووسەرانی سیتماتیکی نازی لەم بوارەدا، زانستی وەرزێڕی
خوێندبوو. ریشارد والتێردارە لە ئاسەواری وەک وەرزێڕان وەها سەرچاوەیەکی
حەیاتی نژادی باکووری لە ئەڵمان پێشنیار دەکرد کە هەر وەک ئاژەڵداری یەکێک لە
پسپۆڕەکانی ئەو بوو.[91]

بینینی قەومی باکووری بە هۆی سروشتخوازی گوندی و پەرستنی
دیمەنخوازانی ئەو بوو کە لە جەماوەری گوندی و مەزرادار بوت دروست بکا.
لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە ژیار ژێر دەسەلاتی بورژوازی و جوولەکان
کەوتووە.[92] قەومی راستەقینە لە گوندەکان و لە دەرەوەی شارەکان بوون. دارە،

ژیانی گوندی بە پێگەیەکی زۆرباش بۆ باش عاملاندنی نژادی بە لایەنی پایەداری ...
دەوامی «قەومی باکووری» دەزانی. ئەم کارە بووەتە هۆی ئەوە کە ناسیونـ...
سۆسیالیستەکان سیاسەت گۆڕی موسبەت سەبارەت بە جەماوەری گوندی...
بگرنەبەر و بەم مەبەستە لە هۆکارە مالیاتییەکان و دانی یارانە کەلک وەربگرن...
هەروەها بۆ بە ئەنجام گەیاندنی لەم سیاسەتانە کەوتنە هاندانی خەلک بۆ مانەوە ...
گوندەکان و بالا بردنی رادەی تەولید.

لایەنی گرنگی دیکە لەم ناسیۆنالە ئەلمانیە، دژی سامی بوونی ئەو بوو. ...
راستیدا هێندێ ئەوەیان بەتایبەتمەندییەکی چارەنووسساز و بەبڕشت دەزانی. ئەم...
جۆرە گوتراوە، دژی سامیخوازی نەک هەر بەشێک لە سوننەتی ئەوروپایی، بەڵکو...
چالاکی جیاوازی هەڵنەگری بەشی زۆرینەی نووسەرانی ئەلمانی لەمەر «قەوم...
لەسەرانسەری سەدەی نۆزدەیەمدا بوو. ئەم باوەڕە رەنگدانەوەی جۆراوجۆری ...
حزبی نازیدا بوو. هێندێکیان جوولەکەبوونیان بە مەسەلەیەکی مەعنەوی یـ...
کەلتووری دەزانی، هێندێکی دیکە بە چاوی مەسەلەیەکی نژادی بۆی دەڕوانین...
جوولەکە بوون هەروەها لەگەڵ بۆلشێویزم و ژیاری و بورژوایی گرێی خوار...
بێگومان، بە رێبەرایەتی لاسارانە و شێتانەی نژادی هیتلێر، جوولەکان بوون بـ...
ناوەندی سەرەکی بێزاری نەتەوە و پێناسەی لە دایکبووی ریشەیی، چارەنووسی...
ئەوان لە ئۆردووگاکانی مەرگ لە جەنگی جیهانی دووەمدا بەناوبانگتر لەوەیە کە...
پێویستی بەشیکردنەوە و بەرینکردنەوە بێ و دەسەلاتی ترسناک و بەرپرسایەتی...
مەزنی ئەم جۆرە دۆزانە نیشان دەدا.

بەم حاڵەوە هێشتا دەبێ بوترێ کە ئەم جۆرە کارەساتە خراپ و دەردناکانە بە...
کردەوە زیاتر لە وزەی شعووری ئێمەیە. ئۆردووگاکانی مەرگی نازی هەروەکو...
زەردومای ترسهێنەر بەسەر شعووری ئەخلاقی و مەعنەوی ئێمەدا لە سەدەی...
بیستەمدا دەڕووخانە خوارێ. لەبەر هێندێ کۆششی دوایی بۆ لەبەرچاو نەگرتنی...
سووتانی مرۆڤەکان دەبێ هەمیشە ترسێک کە ئەم هەموو مرۆڤە بێتاوانە لەو...
رەنجیان دەبینی، لەبەرچاومان بێ.

## دەوڵەت و ڕێبەران

مەسەلەی ناسیۆنالیزم بە تێڕامانی مەسەلەی دەوڵەت لە فاشیزمدا ئەنجام دەگرێ. پێشەکی بوارێکی نێگەتیڤی هاوبەش لە ڕوانگەی فاشیستیدا سەبارەت بە دەوڵەتە مەوجوودەکان بوونی بوو. ڕەنگدانەوەی ئەم ڕوانگە، بێزاری لە دەوڵەتی دیموکراتیکی لیبڕال و بەتایبەت نیزامی چەند حزبی بوو. بوونی حزبەکان بەواتای پێویستی ئاشتی کردن و خوو بە یەکگرتن بوو کە بووە هۆی گەندەڵی بەرژەوەندی نەتەوەیی. ئەو چەشنە کە پریمۆد گوتوویە: «دەبێ چالاکی حزبە سیاسیەکان بوەستێنرێ. حزبە سیاسییەکان دەستکەوتی سیستەمی سیاسی هەڵە، واتە سیستەمی پەرلەمانی، بوون... خەڵک چ پێویستییەکی بەم دەلالە سیاسیانە هەیە؟»[٩٤]

کارل ئەشمیت، بیرمەندی ئاکادمیکی ئەڵمانی کە دواتر چووە ناو ناسیۆنال سۆسیالیستەکان، بیر و بۆچوونی دژی پەرلەمانی ئەوەڵییەی لە کتێبەکەی خۆیدا، بەناو ئاڵۆزی دیموکراسی پەرلەمانی، گونجاندبوو، هەرچەند پێشتر بیرمەندی ئیتالیایی، پارتو، لە دەیەی ١٨٩٠ بە تاوتوێکردنی ئەم جۆرە دۆزانەوە خەریک ببوو. مەسەلە بۆ ئەشمیت بەم شێوە بوو کە گریمانە لەسەر ئەوەیە کە حکوومەتی پەرلەمانی لەمەدا بوو کە هەر تەنیا شێوەیەکی ڕواڵەت دەدرایە قەڵەم. بە بۆچوونی ئەشمیت «کۆمیتەگەلی بچووک و تایبەتی حزبەکان یان پێکهاتەی حزبی دەبووە هۆ کە هەڵوێستەکان لە شێوەی شاراوەدا و بە نهێنی بگیرێن» کە هەمیشە لەگەڵ بەرژەوەندی بازرگانی و پیشەسازی سەریان لە ئاخورێکدا بوو.[٩٥] حزبە سیاسییەکان هەر تەنیا دەلالانی دەسەلات بوون کە لەگەڵ بە دەسهێنانی زۆرینە دەستیان بە ئاسانکاری و بەم ئامێرە هەڵوێستی خۆیان قایم دادەڕشت.

دیموکراسی جەماوەری خەڵکیش لەبەر هەڕەشەی ئاڵۆزی جۆراوجۆر، بەڵام ڕووبەڕووی زۆربوونەوە وەستابوو. ڕێنوێنی گشتی کە ئەشمیت ئەوەی [گۆڕینەوەی باوەڕەکان لەگەڵ ئامانجی ڕازیکردنی ڕەقیب بە هۆی ڕێنوێنییەکان] تەوسیف دەکرد» بەیان و بورهانی پووچەڵ بوو. سەرنج و باوەڕگەلی جەماوەرەکان بە پڕۆپاگەندە ڕادەکێشرا نەک بە لێداون و ڕێنوێنی و بەڵگە.[٩٦] خەڵک

شتێک بۆ وتن، یان مافی دەربڕینیان نەبوو، بەم حاڵەوە سەیر ئەوەیە کە ئیدئۆلۆژی پەرلەمانی گریمانەی لەسەر ئەمە دادەنا کە جۆرێک یەکبوونی بەرژەوەندی نێوـ حاکمان و مەحکوومان بوونی هەیە. حزبە لیبراڵەکان هەرکات کە بە دەسەڵات دەگەیشتن، دیموکراسییان وەلادەنا و دەکەوتنە دووی بەرژەوەندی خۆیان. بە وتەی ئەشمیت: «لە ڕێڕەوی لێدوانـدا لەگەڵ ڕوێنەرە سەربەخۆکان ناکری دژی ئیرادەی خەڵک و بە پێناسە کردنی کۆکراوە و لەمپەرێک بگەین. چونکە باوەر بە لێدوانی دیموکراتیکدا نییە بەڵکو قاعیدەتەن لیبرالییە».[97] حزبە لیبراڵە پەرلەمانییەکـ تەئکیدیان بوو کە سەربەخۆیی هەر ئەمەیە. لەبەر ئەمە دیموکراسی جەماوەری خەڵک لە نمایەک زیاتر نەبوو.

بیر و بۆچوونێکی دیکەش کە جێی قەبووڵی گشت فاشیستەکان بوو، ئەمە بوو کە دەوڵەتە پەرلەمانییە لیبرالییەکان نەک هەر تەنیا بەرپرسی ئاڵۆزییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی دەیەی ١٩٢٠ بە هۆی بەرچاوتەنگی و تەماح و پاراستنی بەرژەوەندی خۆخوازانەی خۆیانەوە بوون، بەڵکو لە بناخەوە نەیانویستووە گرێی گرفتەکان بکەنەوە. هێندێ کەسی وەکو ئۆزوالد موزلی، پاش جەنگی ١٩١٨ـ١٩١٤ دەیانزانی کە دەوڵەتەکان لە خولە ئاڵوزەکاندا دەتوانن چ کارێک ئەنجام بدەن. دەوڵەتەکان لە سەردەمی شەڕدا لێبڕاوانە و کۆمەڵخوازانە کردەوەیان لە خۆنیشـ دەدا، ئێستا ئەوە کە لە سەردەمی ئاشتیدا، دیموکراسی بێ‌ئیرادە و هەرودە کەرەسەی پێویست بۆ ئەنجامی کارێکی موسبەت بوو.[98]

واتای فاشیستی لە دەوڵەت تایبەتمەندییەکی زۆری هەیە کە زۆریش بە یەکەوە ناسازگارن. زۆر لە فاشیستەکان وەک موسۆلینی، جنتیلە و پریمۆد ریودی بەتەواوی قبووڵیان دەکرد کە روانگەی ئەوان لەمەڕ دەوڵەت (توتالیتێر ـ سەرەرۆیی کۆ)یە. هەرچەند کە واتای ئەم واژە تەنانەت لە دەهەکانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ زۆر روونـ نەبوو.[99] بەیان کردنی جنتیلە لە توتالیتێر لە بنەڕەتەوە ئەمە بوو کە هیچ جیاوازییەک لە نێوان تاک و دەوڵەتدا بوونی نییە.

ئەوانەی کە تاک لە دەوڵەت جیا دەکەنەوە ناتوانن لە فیکرە وەلانراوەکـ بەولاوەتر بڕۆن. ئەندێشەی ناسیاو ئەمەیە کە «هیچ شتێکی بەراستی تایبەتی

ـوونی نییه... و سنووریک بۆ کردەوەی دەولەت تەسەور ناکرێ» دەولـەت (لەگـەڵ ـهەنگێکی پلەبەرز لە خۆزانیاریدا لە دایک دەبێ».[100] لەو جێیەدا کـە دەولـەت تاقانـە ـەمای مافەکان و ئازادییەکانی تاکە، لەبەر ئەمە، خۆی «سـنوور و شـێوەی بـوونی حوی دیاری دەکا».[101]

دەولەتی فاشیستی هەمیشە لەگەڵ واتای «دەسەلات» پێوەندی بـوو. دەسـەلات خالی رووبەڕوو لەگەڵ «ماف» و «ئۆرگانیزم» خالی رووبەڕووی «میکـانیزم» بـوو. ـوزەکانی داروینیزمی کۆمەلایەتی کال لە پشت ئـەم واتایانـەوە شـاراوەتەوە. بـەم جورە، دەولـەت حاسلی «کێشەی مانـەوە» بـوو. ئـەو جـۆرە کـە ئالفرێد روکگـۆ ـووسـیویە: «دەولـەتی بـەهێزتر واتـە ژیـانی باشـتر و دەولـەمەندی زۆرتـر بـۆ ـانیشتوانی ئـەو». ئەمـە لـە راسـتیدا ئـەرکی دەولـەتە کـە بـەهێز بـێ. روکگـۆ بـە ئاهەنگێکی رەنجاوەوە دەلـێ: «ئـەم دۆزەی دەولـەت بـە نیشانەی دەسـەلات [کـە ـدەرەنجامی نەزانی گشتی بەردەوام لە دۆزی ئەلماندا بە پرۆسە زانـراوە] دۆزێکـی بەتەواو مانا لاتینی و ئیتالـیایی بـوو و راسـتەوخۆ لەگـەڵ سـوننەتی عـەقلانی رۆم پێوەنـدی هەیـە کـە لەگـەڵ فەلـسەفەی سیاسـی ماکیاڤـێل رەنـگ و رووی گـرت و پەسندکراو خرایەڕوو».[102]

لێرەدا بە شعووری فاشیستی دەبـێ سـەرنجی ئـازادیش بـدەین. بـۆ زۆرینـەی فاشیستەکان ئازادی لەگەڵ ئامانجە تاقانە سەربەخۆترەکانی وەک نەتـەوە، دەولـەت یان قەوم سازگار بـوو. ئـازادی هـەرگیز تەسـەوری گشتی تـاکخوازانـەی نـەگۆڕ نەبوو، بەلکو لایـەنی کۆمەلایـەتی لەمـسکراوی بـوو. ئـازادی هـەرگیز نەیـدەتوانی لەگەڵ دەولەت یان نەتەوە لە دژایەتیدا بێ. هەرچەند دەولەت یان نەتەوە بەهێزتر بێ مەدەنی زۆرتر لە ئازادی و دەولەمەندی بەهرەمەند دەبـێ. ئـەم واتـا زاتییـە لەگـەڵ ئازادی لیبرالی «کـە مـافی سروشـتی بـەرفراوانی تـاک» دەدرایـە قەلـەم، دژایـەتی بوو.[103] ئەو چەشنە کە روزێنبێرگ گوتوویەتی، ئەم جەزمـە تـاکخوازانـەی لیـبرالی خۆخوازانە لە ئـازادی، دەبـێ «لـە تێبـینی بـەردەوام هـەلاوێردرێ».[104] ئـازادی بـە دۆزێکی مەعنەوی چاوی لێدەکرا کـە لەگـەڵ «ماتریـالیزمی ناپـاک» ئـازادی لیـبرالی دژایەتی بوو. دەبێ سـەرنج بـە بـارودۆخی ئـەم رێنوێنییـە کـە دەربـارەی ئـازادی

ئابوورییــه، بــدرێ. ئــازادی ئــابووری هــەتا ئــەو جێیــە قبــووڵ دەکــرا کــە لەگــەڵ بەرژەوەندی میللی سازگار بێ. لەبەر ئەمــە، ئــازادی راســتەقینە شــەرتی زاتی تــاک بوو لە شێوەیەکدا لەگەڵ ئامانجی پلەبەرزی میللی سازگاری بێ.

لێرەشــدا زانیاریگــەلی جۆراوجــۆر ســەبارەت بــە واتــای «زاتی» و «دەروونی بوونی بوو. لە فاشیزمی ئیتاڵیادا، ئەو جــۆرە کــە موســۆلینی گوتوویــەتی: «تاقانە ئازادییەک کە دەتوانــێ راســتەقینە بــێ، ئــازادی دەوڵــەت و ئــازادی تــاکی دەروونی دەوڵەتە. لەبەر ئەمە، بۆ فاشیستەکان هــەموو شــتێک لــە دەروونی دەوڵــەتدا مانــای هەیە و هــیچ شــتێکی مرۆڤــایەتی یــان مەعنــەوی... لــە دەرەوەی دەوڵــەت بــوونی نییە».[105] ئازادی بۆ تاک لە پێناوی ئامانجەکانی دەوڵەتە، ئەندێشەیەک کە زۆرتــر بــە واتای «دەوڵەتی ئــەخلاقی» ســەرچاوەی گرتــووە. بــەڵام بــە بۆچــوونی ناســیۆنال سۆسیالیــستەکان لەوانــە روزێنبێرگــە، بــارودۆخ فــەرقی دەکــرد. جەوهــەری تــاک volkstaum [قەوم یان مەوجوودییــەتی نــەتــەوە] بــوو. بــەم جــۆرە ئــەو شــێوە کــە روزێنبێرگ گوتوویــە: «ئــازادی بــە واتــای ئەڵــمانی لەگــەڵ ســەربەخۆیی دەروونی تێکەڵە... ئەمڕۆ هەموو باس لە «ئــازادی» بێــروونی دەکــەن، شــتێک کــە هــەر تــەنیا دەتوانێ ئێمە لە ئاڵۆزی نژادی رزگار بکا. ئازادی بــە واتــای پێــڕەوی لــە نــژادە». لەبەرئەمە، ئازادی لەگەڵ ئامانجە تاقانەکانی نژادی هاوپێناسە بوو.

بەپێچەوانەی دۆزە هاوبەشەکان کە لە نێوان فاشیــستەکانی ئیتالــیایی هێگلخــواز لەگەڵ ناسیۆنال سۆسیالیــستەکان لەمــەڕ مافــەکان، دەســەڵات و ئۆرگــانیزمخوازی بــوونی بــوو، ناســیۆنال سۆسیالیــستەکان ئەندێــشەی دەوڵــەتی توتــالیتێری رەت دەکردەوە. یەکەم جار نکوڵی دەکرا کــە هێگــل لەگــەڵ ســوننەتی دەوڵــەتی لیبرالی راست هاوبیر و بڕوا بووە. دووەم، هەر ئەو جۆرە کــە لەوەبــەر تەئکیــد دەکــرا. بە بۆچوونی ناسیۆناڵ سۆسیالیستەکان دەوڵەت لە پلەی یەکەمدا نەبوو، بەڵکو نەتــەوە و قەوم لە بەرەوڕوو بوون، روزێنبێرگ رێنوێنی دەکرد:

بزاڤی ناسیۆنال سۆسیالیــستی... بــۆ دابینکــردنی هێمنایــەتی گــشتی نــەتــەوە و قەومی ئەڵمان و خوێن و خووی ئەو فۆرمی گرتووە. دەوڵەت بە شێوەی بەهێزتری

ـمێر، له ئیختیاری بزاڤ دایه... هەر تەنیا لـەم پێوەندییـه دایـه کـه واتـای دەوڵـەتی ـسیۆنال سۆسیالیستی راستی زیندوو دەمێنێ.[107]

به بۆچوونی روزێنبێرگ «به سوودی ناسیۆنال سۆسیالیـستەکان بـوو کـه زۆر ـەسەر دەوڵەتی سـەرەڕۆ نـەڕۆن بەڵکو لـه جیهـانبینی حـزبی نـازی بـه شـێوەی ـــەرچاوە و بیرکردنـەوەی جیهـانبینی ئاخـاوتن بکـەن».[108] سـەرەنجام، بـەدووی ـامەزراندنی لەپێشبوونی پرەنسیپی پێشەوایی، دەوڵەت نەیدەتوانی بۆ نازییەکان له پێش یان کامیـل بـێ. پێـشەوا سـەرچاوەی دەسـەڵاتداری حاکمییـەتی رایـش بـوو. ـەسەڵاتداری دەوڵەت بەڕاستی هـەر ئـەو دەسـەڵاتدارییەی پێشەوا بووبـوو. هـەتا ـادەیەک دەکرێ ئەمە جۆرێک واتـای قەیـسەریزم یـان بێناپـارتیزم نـاودێر بکـرێ. ـەسەڵاتداری دەوڵەتی تاقانه لەم بوارەدا بێمانـا بـوو. هـەر ئـەو جـۆرە کـه واتـای ـووچە [پێشەوا] له ئیتاڵیا لـه دەیـەی ۱۹۳۰ سەرییهەڵـدا و نـاوی دەرکـرد، دژایـەتی ئاشکرا، بەڵام زیرەکانه له فاشیزمی ئیتاڵـیاییدا دەسـتی بـه بـەرەو پێشچوون کـرد کاربری بایەخی ئەو له دەوڵەت فراوانتر بوو. چۆن دەیانتوانی هـەم دووچـە و هـەم ـەوڵەتی میللی هەر دوو پلەبەرز و پێشکەوتوو بن؟

واباشه لێرەدا سەرنج بدەینه کارکردی رێکخراوەی ئەگـەرلێکراو و یـەکگرتوویی دەوڵەتی نازی. ئەو جۆرە کـه پێـشەکی وتـرا، ئێـستا بەتـەواوی قبـووڵ کـراوە کـه جۆرێک بێسیستەمی دەروونی له دەوڵەتی نازیدا بوو له راستیدا هـیچ حکوومـەتێک لەسەرتاپایدا به شێوەی ئاشکرا بوونی نەبوو.

نازییەکان لەگەڵ دەزگای بورۆکراسی مەوجوودی دەوڵەتی کاریـان دەکـرد کـه زۆرینەی کەسانی ئەو، بەپێچەوانەی گوشار، تەنانـەت هـەتا ساڵـی ۱۹۳۹ تێکـەڵاوی حزبی ناز نەببوون. رێکخراوەی ئێس‌ئێـسی نـازی و بـاقی پرەنـسیپه نیزامییـەکانی ئەو، له پاڵ ئوردووگاکـانی کـاری ئیجبـاری لـه پـەراوێزی سـنووری چوارچێـوەی دەوڵەتی رەسمیدا کاریان دەکرد. دەسەڵاتی پێشەوا لەگەڵ یەکێتییـه لەرزۆکـەکانی دەروونی پێکهاتەی شێواوی حزبی نازی، کارمەندانی دەوڵەتی، نیزامیانی بـەهێز و ساحەبانی گەورە پیشەسازییەکان رکەبەرایەتی دەکرد. مارتین بروزا نیزامی نـازی به «جەنگەڵێکی سازماندراوی» شوبهاندووە.[109]

ئەو خالانەی سەرەوە تا رادەیەک واتای پێشەوا ـ فووهێرپان دووچە ـ لە دەروونی فاشیستیدا ئاشکرا دەکا. بوارگەلی بۆچوونی و مێژوویی پێشوو دەربارەی دۆزی پێشەوایی بوونیان بوو. سوولۆن، پریکلێس، ئەسکەندەر، سزار بناپارت دەورگەلێکی وێنەیی بۆ هێندێ لە فاشیستەکان بوون. بەو جۆرە کە جنتێلە دەڵێ: «هەمیشە کەم پیاوانێک هەڵدەکەوێ کە پێناسەی زانیاری خۆی و ئیرادەی خولی خۆی دەدرێنە قەڵەم».[110] موزلی تاقە جارێک فاشیزمی بە «کۆی سزاریزم» پێناسە کردووە.[111] ئەم واتایە بەتایبەت لە ئاسەواری فەلسەفەی سیاسی هێگل و رۆسۆشدا پاساوی بۆچوونی خۆی بوو. لە ئیتالیا و ئەڵمان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بستەم سەلماندنی کۆمەڵناسی روانگەی شارەزایان لە لایەن مووسکا، پارتۆ، میکلێس، دەروونناسی توودە گوستاو لوبۆن و روانگەی دەسەڵاتداری پرشکۆی ماکس وێبێر ئەنجامی گرتبوو. تەنینەوە راستبینی، بیر و تێرامان هەڵوێست گرتنی موئەسر لە لایەن رێبەرایەتییەوە لەگەڵ هەدەردانی کاتە سیاسییەکانی پێکهاتە پارلەمانییەکان دژایەتی بوو. پێشەوا ببوو بە ناوەندی بەرژەوەندی میللی، ئیتر نازی بە دێموکراسی هەست نەدەکرا.

مەسەلەیەکی زۆر دەربارەی واتای رێبەری لە ئارادا بوو. لە سەرەتای دەیەی ۱۹۲۰ ئەم مەسەلە لە روالەتدا بۆ سەرجەم بیرمەندانی ناسیۆنال سۆسیالیزم سەرەکی مامەڵەی لەگەڵ نەکراوە. لە ئیتالیا ئەم رووداوە دێرتر هاتە ئاراوە و بەرفراوان بووەوە. روانگەی بیرمەندان هەرچەند کە لە لایەن فاشیستەکانەوە پەسند کرا، بەلام زۆرجار بە شێوەی کەرەسەی رێبەری کۆ راڤە دەکرا. لە سەرەتای دەیەی ۱۹۲۰ هیتلێر و موسۆلینی هێشتا خۆشەویستییەکی ئەوتۆیان نەبوو. ئەوان هەر تەنیا لە ئاستی کەسایەتییەکی گرنگ لە رێبەرایەتی گشتیدا مامەڵەیان لەگەڵ دەکردن، بەلام واقعیەتە رابەرایەتییەکان لەگەڵ روانگەکان جیاوازی بوو. ئەو جۆرە کە هانس مومسن وەبیری هێناوەتەوە، هەم لە ئەڵمان و هەم لە ئیتالیا ریشەی داکوتراوی سوننەتی و یەکێتییە لەرزۆکەکانی دەرونی حزبە فاشیستەکان، حکوومەتەکانی هیتلێرو موسۆلینی ناچار بە سازش ئاستەنگ کردنەوە دەکرد.[112] پاشان تێرامانێکی بەتەوژم لەسەر کاری رێبەری و شەخسی

ـیەران هەستێکی درۆی لە نەزم و یەکگرتوویی نیزامەکان دروستکرد و بوە هۆ کـە ـەرپرسایەتی لە پلەی یەکەمدا بکەوێتە ئەستۆی ڕێبەران. هەروەها چۆنیەتی شـانۆ، ـێوچەڵ و بێ ناوەڕۆک و پەنـدارە گـەورەکان و لاسـاییکردنەوە و گاڵـتەجاڕەکانی ـیبەرایەتی موسۆلینی کەوتە بەرچاونەکراوەیی و خافڵ بوون.[113]

ســەرەنجام ئەمەکــە، ڕوانگــەی دەوڵــەتی فاشیــستی پێوەندییــەکی ســەیر و ـیچراوەیی لەگەڵ ڕوانگەکانی «ســەندیکالیزم» و «ســنفـخـوازی»دا بــوو. ئـەم دوو ـاوەڕە لــە فاشـیزمی ئیتاڵـیایدا لــە خــوو و خدەیــەکی تایــەتیتر لــەچاو ناسـیۆنال ـۆسیالیزمی ئەڵمان بەهرەمەند بوو. بە شێوەی گشتی بەتایبەت پاش سالـی ۱۹۳۳، ـسـیۆنال سۆسیالیـستەکان، چ لــە ڕوانگــە و چ لــە کـردار، ســەرنج و پێوەندییــەکی کەمیان بە سنفخوازی لــە خـۆ نیـشان داوە. هیتلێـر خـۆی لــە ســەرەتادا ماوەیــەکی کــورت لــە پێوەنــدی بــەم دۆزە نیـشاندا، پاشــان بــە شـێوەی جۆرێــک دروشمــی پروپاگەندە کەلکی وەرگرت. ئەمە بەو مانا نییە کە ڕوانگەی سنفـخوازی لــە ئەڵـمان ـــەری هەڵــنەدا. ناســیۆنال سۆسیالیــستەکانی وەک گوتفریــت فــدر، گوگــور ئەشتراسەر، والتێر دارە و تا ڕادەیەکیش ڕوزێنبێرگ بەتوندی لایەنگری ڕێکخراوەی سنفی بوون. تەئکیدی نووسەرانی نازی زۆرتر مایل بە خوێندنەوەی نوێ سەدەکان ناوەڕاست لەسەر ئەسـناف بـوو.[114] ئەسـناف وەکـو بەشـێک لــە نــەتــەوەی دێـرین هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکـرا. ئـەم ســوننەتە دەگــەڕاوە بـۆ بیرمەنـدانی پاریزگـاری ڕۆمانتکتری وەک مـولێر وان دن بـروک و دواتـر ئۆتوگیرکـە. لـە لایــەکی دیکــەوە، فاشیستە ئیتاڵیایەکان مامەڵەی نوێ قوڕوون وەستاییان لە ئەسـنافدا قبـووڵ نــەبوو. ئەوان ڕێڕەوی عەقلانیتر و نوێتریـان ســەبارەت بــە ئەسـناف بـوو و ئەوانــەیان بــە «شێوەیەکی نوێ» بە بریکاری واتاگـەلی لیـبرالی و سۆسیالیـستی لــە ڕێکخـراوەی کۆمەڵایەتی دەزانی.[115]

لــە فاشـیزمی ئیتاڵـیایدا، دۆزی ســنفی پێوەندییــەکی نزیکـی لەگـەڵ ســوننەتی سەندیکالیستیدا بوو کە دەربارەی ناسیۆنال سۆسیالیزم بـەو چەشـنە نـەبوو. جگـە لەمە شـایانی باسـە کـە ســوننەتی کـاتۆلیکی لـە ئیتاڵـیا هـەمیشە خـاوەنی بینـینی بەتەوژمی ئۆرگـانیزمخوازی و سـنفخوازی بـوو. سـەندیکالیزم لـە ئیتاڵـیا، هاوکـات

لەگەڵ فەرەنسا، ئیسپانیا و بریتانیا لە سەرەتای دەیەی ١٩٠٠ بە سەرهەڵدا گەیشت. ئەمە زۆرتر خۆنیشاندانێک بوو لە بەرامبەر مارکسیزم و سۆسیالیزمی ریفۆرمخواز هەتا لیبرالیزم و سەرمایەداری. جنتیله بەتایبەت ئاماژە بە دزەکردنی سورل لە سەندیکالیزمی ئیتالیا دەکا.[116] زۆرینەی فاشیستە ئیتالیایەکان بە هۆی تایبەتمەندی دژی پارلەمانی و دژی دێموکراتیکی سەندیکالیزم و ئاهەنگی بەراستی ئەخلاقی ئەو لەمەڕ توندوتیژی و بێزاری ئەو لە سازش یان هاوکاری لەگەڵ بورژوازی، سەناگۆی سەندیکالیزم بوو.[117] بۆ فاشیستە ئیتالیایەکان، سەندیکالیزم پێناسەی دیاردەیەکی سروشتی و گرنگ بوو لە بە کەمال گەیشتنی کۆمەڵگەدا و رۆڵێکی بەرچاوی لە خۆراگری لە بەرامبەر لیبرالیزم و سەرمایەداری و تاکخوازی دەگێڕا. بەم حاڵەوە، بە بۆچوونی ئالفرێد روکگۆ کاتی ئەوە هاتبوو کە دەوڵەت سەندیکاکان خۆماڵی بکا. ئەو رێنوێنی دەکرد کە ئەوانە دەبێ لێبڕاوانە لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتدا بن هەتا ئەو ئەرکانەی کە دەیهەوێ بەڕێوەیان بەری. سەندیکالیزمی خۆماڵیکراوی ژێردەسەڵاتی دەوڵەت لە ئەنجوومەنگەلی دەروونی هەیئەتی سیاسیدا رێکدەخرا. دەوڵەت ئەنجوومەنەکان لەرێی ئامانجەکانی نەتەوەوە رێنوێنی دەکرد. سەندیکاکان دەبوایە لێزانی پێویست بۆ دەوڵەت فێرکردنی پیشەیی، یارمەتی گشتی و هەمەلایەنە پێکبێنن، لە مشت و مڕدا بکەوێتە ناوجێی و لەمپەر بێ بۆ مانگرتن و وەستانی کارخانەکان. ئەو جۆرە کە روکگۆ نەزەری داوە: «دەوڵەت لە لایەنی ئەم سەندیکا دروستکراونەوە دەتوانێ خاوەنی هەیئەت (شاند، نێردە)گەلی فەنی بێ کە توانایی بەو ببخشێ کە بەڕێوەبردنی ئەرکە جۆراوجۆرەکان لە ئابووریدا لەگەڵ دەسەلاتی پێویست بگرێتەئەستۆ».[119]

لێرەدایە کە دەتوانین پێوەندی راستەوخۆی نێوان سەندیکالیزم و سنفخوازی ببینین. دەوڵەت ئەنجوومەنی ئەنجوومەنەکان یان سنفی سنفەکان بوو. هەر ئەو چەشنە کە جنتیله گوتوویە: «فاشیزم... لە سێنفەکان دۆزی بوونی سەندیکاکانی بە شێوەی وزەیەکی ئەخلاقی فێرکاری بەدەسهێناوە، بەڵام چونکە دژایەتی رەسالەی نێوان دەوڵەت و سەندیکا دەبێ لەناو بچێ، هەوڵ دەدرێ کە سیستمێک بێتە ئاراوە کە لە لایەن ئەوەوە ئەم ئەرکە بخرێتە ئەستۆی گروپە سەندیکاکان لەپەنای ئەسناف

ی کە خۆیان لەژێر چاودێری دەولەتدان و بەڕاستی لە دەروونی خۆیاندا هەر ئەو
ڕێکخراوە دەولەتیان هەیە».
لە فاشیزمدا دەبینین کە کۆما کۆمەلی سەندیکاکان بۆ دابینکردنی بەرژەوەندی
میلی دەسەلاتیان هەیە. ئەگەر بڕیارە شێوەیەک لە پێکهاتەی پەرلەمانی بمێنێتەوە،
پەرلەمانی ئابووری و کۆمەلایەتییە کە لە تەولیدکارە ئابوورییەکان پێکهاتووە و
حزبە لەمپەرە کات بە فێرۆدەرەکان لەودا جیا نابێتەوە. سەندیکاکان یان
ئەنجوومەنگەلی «کارمەندان و کرێکاران» دەبێ لە ئەنجوومەنێکی تاقانەی ئەوتۆ لە
یەک کۆببنەوە. ئەوکات دەتوانن بەجێی ئەوە کە هەیئەتگەلێکی شەڕخوازیان
بەرگری بن، لە گرووپە یارمەتیدەرەکاندا یەکگرتوو بن. بەتایبەت لە نێوان سالەکانی
١٩٢٩ هەتا ١٩٣٢ و لە سەردەمی دەسەلاتداری جۆزپە بوتایی هەول دەدرا هەتا لە
ئیتالیادا وەها پێکهاتەگەلێک فۆرم بگرێ. بەلام دەرەنجامی کار زۆر عەیبدار لە ئاو
دەرهات. لە مارسی ١٩٣٠ «شۆڕای میللی ئەسناف» (ئەنجوومەنی نیشتمانی یان
نەتەوەیی ئەسناف)، مەجلیسی نوێنەرانی ئەنجوومەنگەلی ئابووری و کۆمەلایەتی و
بوروکراسی دەولەتی، لە ئاخریدا «کۆمیتەی ناوەندی ئەسناف» بە وەزیرانەوە،
بەرپرسانی کۆنفدراسیۆنەکانی کارمەندان و کرێکاران و کاربەدەستانی پایەبەرز.
کۆماکۆی ئەمانە لەژێر چاوەدێری ڕێبەرایەتی موسۆلینیدا بوون.[121]
هیچ کام لەم جۆرە ڕێکخراوانە لە ئەلمان بەدی نەهات. بێجگە لەمە هەموو
فاشیستەکان ئەم هۆریەیان بە سنفخوازییەوە نەبوو. پریمو دریوەرا لە
بلاوکردنەوەی وتارێکدا رووی وتە دەکاتە فاشیستەکانی ئیسپانیا، لە ئاوریلی
١٩٣٥، دەلێ: «ئەم قۆڕیاتانە لەمەڕ دەولەتی سنفی فرەبێژییەکی دیکەیە». ئەو لە
نووسراوەکانی خۆیدا هەمیشەش بەم رادە سەبارەت بە سنفخوازی بێزار نەبوو.[122]
بابەتێکی گرنگی دیکە لەمەڕ سنفخوازی، لایەنی گومانی و تێڕامان ئەوە بوو.
زۆربەی بیرمەندان، بەتایبەت لە ئیتالیا، دەیسەلمێنن کە سنفخوازی شێوەی
ڕوالەتی بوو و لە کردەوەدا هیچ کات بە ئارەزوو نەگەیشت. بە قەولی نووسەرێک،
سنف «سەرپۆشێک بوو بۆ چەوسانەوەی بێبەزەییانە لە کار و عەمبارێک لە

پیشەکان بۆ قەڵەم بەدەستانی حزبی».[١٢٣] سنف ئەرکی باشی پڕۆپاگەندەیەی بە ئەستۆ بوو و هەروەها بە کێشان و خەساندنی ڕۆشنبیران یارمەتی دەکرد.

## ئابووری

ئێمە لەمەڕ دەستکەوتی فاشیزم لە ئابووری لەگەڵ ناوەڕۆکگەلی زۆر ڕووبەڕوو دەبینەوە کە پێشەکی دەربارەی ئەوانە لێدوانمان کردووە. چوار خاڵ بۆ تەئکید بوونی هەیە: یەکەم ئەمەکە سیاسەت لە پێشترو بالاتر لە ئابووری بوو؛ دووەم ئەمەکە کاکڵی سیاسەت میللەت و قەوم volk [قەوم] بوو و لەبەر ئەمە، لە بناخەوە ئامانجەکانی میللی بوون کە بۆ ئابووری هۆکاری چارەنووسساز دەدرانە قەڵەم؛ سێیەم ئەمە کە کاردانەوەی ئابووری جێی پەسندی تێکەڵاوی لە ڕێ و ڕەوشی سۆسیالیستی و لیبرالی بوون؛ وە سەرنجام، وەکو گشت پانتاگەلی ئیدئۆلۆژی فاشیستی تەنینەوەی نێوان ئابووری ڕەوای فاشیستی لەگەڵ ڕاستیە حاشاهەڵنەگرەکانی ئابووری دەبینرا.

جنتیله بە ئاهەنگ و شێوەی هێگلی دەینووسی: «دەوڵەت ئیرادەی جیهاتی بەرچاوە، ئێستا ئەوەکە ئابووری بە ژیانی بندەستبوونی مرۆڤایەتی دەبەسرێتەوە، واتە بە ژیانی لەمسکراوی ئەو... دەرەنجام ئەمەکە پرەنسیپی ئابووری لە ئیرادە، و لەم ڕووەوە لە دەوڵەت بوونی هەیە؛ بەلام لە تریفەی ئازادی بەرز بووەتەوە و خونچەی کردووە».[١٢٤] بە بۆچوونی جنتیله لە بناخەوە سیاسەت هەرێمی ئیرادە و ئازادی بوو و شێوەی بالاتر لە سازوکاری ئابووری لە ژیاندا ئەدرایە قەڵەم. لەبەر دەمە، دەرەنجامەکەی ئەمە دەبوو کە سیاسەت لەگەڵ چۆنیەتی ڕەنگدانەوەی خۆی لە نەتەوە ـ دەوڵەت لە باری مەعنەوی و ئەخلاقییەوە بەرزتر لە ئابوورییە. دەربارەی ناسیۆنال سۆسیالیزم، نژاد و قەوم ئەم هەڵوێستەیان بوو.

سنفخوازی و خۆخوازی وێنەی جۆری ئەم لە بەرەوەبوونی سیاسەت بەسەر ئابووریدا بوون. دەربارەی یەکەمیان لەوەبەر لەسەری دواوین. دەوڵەتی سنفخواز کارمەندان خاوەنکاران لە خۆیدا کۆ دەکردەوە، هەر ئەنجوومەنێک

ئەندامی خۆی و جەوهەری بەرهەمێنانی ڕێک دەکرد. خەبات و کێشە و هەرای پیشەسازی لە بەرژەوەندی نەتەوەدا کەم دەبوو. ئەمە «ڕێی سێیەمی» نێوان سەرمایەداری و سۆسیالیزم بوو. نوێنەرانی ئۆرگانیک و ئابووری لە پەرلەمانی تەولیدکارەکاندا کە لە لایەن ئامانجە میللییەکانەوە ڕێنوێنی دەکرا، دەیتوانی جێگری پەرلەمانی سیاسی دیموکراتیک بێ کە لە باری جوغرافییەوە دەستەبەندی کرابوو. هەر بەو شێوە کە ئالفرێد روکگۆ دەڵێ:

ئابووری فاشیستی نە ئەنجوومەنی ئابوورییە نە تایبەتمەندانە ئابووری ئیدارە و کۆنترۆڵ دەکا، بەڵکو بالاتر لە هەموو ئەنجوومەنێک ڕێکوپێکترە. ئەم کۆششانە تەولیدکارەکان هی خۆیانە کە ڕێکی دەخەن و دەوڵەتیش لەسەرەوە ئەو ئیدارە و کۆنترۆڵ دەکا.[125]

هێندێ لە گرنگترین دۆزە کارکردییەکانی فاشیزم لەم پانتادا دەردەکەوێ. موزلی، لەگەڵ لەسەر ڕۆیینی ئەم واتایانە و تەسەوری گشتی سنفی لە بریتانیا، یەکەم سیاسەتزان بوو کە بە شێوەی جیدی هەوڵیدا دۆزە ئابوورییەکانی کینزی تێبگا و لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی بریتانیای کەبیرتر، لەوانە سوود بەرێ.[126]

دەربارەی خۆخوازی کە لە ٢٣ی مارسی ١٩٣٦ موسۆلینی خۆی ئەوەی دەسپێک و کردەوە، و هەر لەو خولەدا لە ئەڵمانیش بە شێوەیەکی بەرفراوان پێڕەو کرا، مەبەستی خۆکیفایەتی ئابووری بۆ سامان بەخشین بە بەرژەوەندی ئابووری لە ڕێگای ئامانجە میللییەکانەوە بوو. ئەم دۆزە لە سەدەی پێشوو لە نووسراوەکانی ی. گ. فیختە و فریدریش لیست بەیان کرابوو. دەربارەی ئیتالیا و ئەڵمان، ئەم بابەتە لەگەڵ بارودۆخی جەنگی ئەم وڵاتانە لە کۆتایی دەیەی ١٩٣٠ پێوەندی بوو. لە ئەڵمان لە ساڵی ١٩٣٦ بە دوائامانج بریتی بوو لە خوکیفایەتی ئابووری بۆ ئامادە بوون لە بەربەرەکانی نێونەتەوەیی.[127]

پرسیارێکی وەک مەتەڵ دەربارەی ئابووری فاشیستی، هەڵوێستی دەقیق ئەوەیە. بە بۆنەی ڕەخنەی سەرەتای مارکسیستەکان لە فاشیزم کە ئەوەیان بە ئامێری تایبەتی سەرمایەداری دەزانی، سەیرەکە لانی کەم هەموو نووسراوەکانی فاشیستی لە شێوەی وتاری دژی سەرمایەداری کەڵک وەرگیراوە. ئەگەر چاو لە

بەرهەمی نازییەکان بکەین، وەک ئاسەواری گوتفریت فەدر، دیتریش ئەکهارت و گرگور ئەشتراسەر و هەروەها بە ٢٥ خاڵی NSDAP کتێبی ڕێنوێنییەکان فالانژ پریمود ریوەرا کتێبی بریتانیای کەبیرتری موزلی، نووسراوەکانی دریوەدو و رووشل یان پێشنیارە جۆراوجۆرەکانی سەندیکالیستی میللی هێندێ فاشیستە ئیتالیایەکان، هەستی گشتی کە لە مرۆڤدا بەدی دێنێ، بوونی ڕێنوێنییە دژەسەرمایەدارییەکانە.[128]

پریمود ریوەرا لە ڕێنوێنییەکانی ساڵی ١٩٣٥ی خۆیدا نووسیویە: «ئێمە سیستەمی سەرمایەداری کە سەرنج ناداتە پێداویستییەکانی خەڵک، خاوەنداریتی (خاوەنداریتی)تاکی نامرۆڤانە و چەرخێنەری کاری بە جەماوەرێکی بێ ناوەرۆک و فەقیری گۆڕیوە و تەعبیری کردووە، رەت و وەلادەنێین». هەروەها گرگور ئەشتراوسەر، نووسەری نازی، لە «ئەندێشەگەلێکدا لەمەڕ ئەرکەکانی داهاتوو دەڵێ: «ئێمە سۆسیالیستەکان، دوژمنی خوێنی سیستمی ئابووری سەرمایەداری ئێستەین کە بێ هێز و هەزاران دەچەوسێنێتەوە، هەقدەستەکانیان ناعادلانەیە. تاکەکان بە شێوەی نائەخلاقی، بەپێی سەروەت و پارەیان تاوتوێ دەکەن. سوورین لەسەر ئەوەکە بە هەر شێوەیەک کە بلوێ ئەم سیستمە پاکتاو و کاتور بکەین!»[129] ئەشتراسەر لە ئابووری دارژاو و لەسەر بنەمای «نیاز»ی مرۆڤ بەجێی «سوود» لایەنگری دەکا. لەگەڵ ئەمە، پێناسە کردنی «مرۆڤایەتی» بایەخی حەیاتی بوو. ئەشتراسەر بوونەوەری مرۆڤی بە ئەندامی نەتەوەیەک یان قەومێک دەزانێ نەک ئەندامی چینێک. لەبەر ئەمە، نیازەکانی نەتەوە و ئەندامی ئەم بووکە پلەی یەکەمی بوو نەک چینێک. بەم جۆرە ئەشتراسەر ئابووری فاشیستی ناوی «ئابووری میللی» لێدەنێ. ئەو دەڵێ «ئێمە دەبێ فێر بین کە دۆزەکانی «توجارەتی جیهانی»، «هاوکێشی بازرگانی»، «بایەخی زۆربوونی ناردن» دۆزگەلێکن پێوەندیان بە خولی ئاوابوونەوە هەیە... و لە دایکبووی خەون و خەیاڵن. نەک لە زەرووڕەت و نەک لە خاک!»[130] پڕۆژەگەلی ئەم تاقمانە و تاکەکانی فاشیست بەش بە حاڵی پێشنیارە بەربلاوەکانی ئاسانکاری ژیان بۆ گۆڕینی خەسلەتی نیزامی ئابووری لە پێناوی ئامانجگەلی میللی لەوانە پڕۆژە

ـشەیەکان، خۆماڵی کردن، بەشە سوود، دەستبەسەر راگرتنی سوودە نارەواکـان
، زیادەڕەوی، لەناوبردنی دەستکەوتە رەنج پێوەنەکێشراوەکان و کـاری ئـارەق
ـێوەنەڕێژراو و موداخلە لەسەرمایە و بەرژەوەندی قەرزی بوو.

واتـای سۆسیالیـستی ئـابووری کـە لەگـەڵ میللییـەکان پێوەنـدی نـەبوو لـە
چوارچێوەی فاشیستیدا نەدەگونجا. سۆسیالیزمی مارکسیـستی و بورژواییـان لـە
ـاری مەعنەوییـەوە بـە تێـشکاوی دەزانی کـە ریـشەیان لـە نـاخی ئەندێـشەی
ـەرمایەداریدا بوو، واتە لە وتاردا ماددی پارە و سـوود بـە شـێوەی ئامانجـەکان
خۆی لە خۆیدا بـەولاتر نـاڕوا، لەبـەر ئەمـە، توانـایی دابینکـردنی ئامانجـە بـەرزە
ـەعنەوییەکانی میللی نەبوو. لەگەڵ ئەم هـەمووە، کۆمـاکۆی فاشیـستەکان لەگـەڵ
ئەم بۆچوونەدا نەبوون. زۆر لەوان رایان دەگەیاند کـە هـەتا کاتێـک خۆخـوازی و
بەرژەوەندی تاکی، خاوەندارێتی تایبەتی و کۆی سـەرمایە هۆکـاری لاواز بـوونی
ئامانجە میللییەکان نەبووبێ، دەبێ ئابووری سەرمایەی لیبرالی قبـووڵ بکـرێ. لـە
راستیدا دەبێ هەوڵ بۆ بەیەکدادانی ئەو بدەین.[131] ئەو جۆرە کە هیتلێر رایگەیاند:

ئێمە نابێ... پیاوی کەسپ و کار خۆشەویست و توجـارەت لـە شـێوەیەکدا کـە
کاسـپکارێکی بـاش بـێ وەلای بنـێن و بیخەینـە پـشتگۆی هەرچەنـد کـە هێشتا بـە
ناسیۆناڵ سۆسیالیستیش نەبووبێ، بەتایبەت ناسـیۆناڵ سۆسیالیـستی بـەجێی ئـەو
دابنێین کە هیچ شتێک لەمەڕ کەسپ و کـارەوە نازانـێ. کەسـپ و کـار، لێهـاتووی و
توانایی دەبێ تاکە پێـواری حـاکم بـێ... لـە درێژخایەنـدا دەسـەلاتی سیاسـی ئێمـە
سـەرکەوتوو دەبـێ و دابـین دەکـرێ ئەگـەر ئـەوە لـە بـاری ئابوورییـەوە بـەهێز
بکەین.[132]

بە گشتی پاساو شاراوەی سـەرەکی هـەر دوو سیـستمی فاشیـستی ئەڵمان و
ئیتالیا لەمـەدا بـوو کـە ئەوانـە لـە «کۆمـاکۆی کۆنتڕۆڵـی ئـابووری دەوڵـەتە باڵـە
چەپەکان، بێجگەلە یەکێتی سۆڤیەت» بۆ بەرژەوەندی خۆیان کەڵکیان وەردەگـرت.
بەم حاڵەوە، سوود وەرگران لەم پێشنیارانە ئـەو گروپانـە بـوون کـە «حزبـە باڵـە
راستەکانیان زۆرتر پشتگری دەکرد».[133]

بابەتی کۆتایی بۆ لێدوان پێوەندی بە گومـان و راسـتی ئـابووری فاشیـستەوە دەبێ. ئێمە لە پێشدا لەمەڕ بۆچوونی جێکەوتووی گومانی دەوڵەتی سنفخوازاموە دواین. هـەروەها واتـای خۆخـوازی بەتایبـەت لـە ئیتالـیا، خەیالێکی خالـی بـوو. ئەنجامی بەراوردگـەلێکی ئاشـکرای نێـوان ئەڵـمان و ئیتاڵـیا لـە بـواری ئابووریـ دژوارە، چونکە ئەم دوو وڵاتە لە سەرەتای سەدەدا لە قۆناخگەلێکی زۆر جیاوازی پەرەسەندنی ئابووریـدا بـوون. لـە سـەرەتای دەیـەی ١٩٢٠ ڕێـژەی جـەماوەری چالاکی ئابووری ئیتالیا لە بەشی پیشەسازی ٢١% بوو، ئێستا ئەوە لە ئەڵـمان ئـەم ڕێژە بە ٤٢/٢% دەگا. بێجگەلەمە، ئاستی نیسبی بـەرهـەمێنـانی ناخالیـسی میلـی [GNP] لە ساڵی ١٩٢٠ لە بەشی پیشەسازی لە ئیتالیا بە رادەیەک بوو کە ئەڵمان لە ساڵی ١٨٧٠ بەوە گەیی بوو.[١٣٤] جگە لەوە، بەپێچەوانەی پرۆپاگەندە، مەعلووم نیـە کـە ناسـیۆنال سۆسیالیـستەکانی ئەڵـمان و فاشیـستەکانی ئیتاڵـیا چاوکراوانـە توانیبێتیـان گەشـە لـە بـارودۆخی ئابووریـیـەکانی خۆیـان بـەدیبێنن. گەشـەی زۆرکردنی مەزنی چەک و تەقەمەنی، کەش و هەوای ئابووری لە پێناوی گەشـەی پاش وەسـتانەوەی دەیـەی ١٩٢٠، پرۆژەگـەلی سـزادان و سیـستەمـی دەوڵـەتی دەستتێوەردانی توند لە ئامارەکان و پرۆپاگەندەی بەرفراوان، کۆی ئەم هەسـتەی پێکدەهێنا کە موعجزەی ئابووری رووی داوە. لە ڕاستیدا زۆر کەس بڕوایان بـوو کە لە هیچ ئابوورییەکدا بە ئەنـدازەی فاشـیزم تـا ئـەو رادە سـەرکەوتن بـە دەس نەهاتووە. بێگومان هیتلێر و موسۆلینی هەتا کاتێک پلەخوازی میللی و نەتەوەیی و ئیمپێریالیستیان دەیتوانی لە باری مالییەوە دابینبکرێ، هۆگری یان عۆدەدارییـەکی ئەوتۆیان بە روانگە ئابوورییەکان نەبوو. بەم جۆرە کە مووسـە لەمـەڕ ناسـیونـ سۆسیالیزم گوتوویە: «کاتێک دەیویست خۆماڵـی بکـا، خۆماڵـی دەکـرد... کاتێـک دەیویست لەگەڵ کەسپ و کارە مەزنەکانی یەک بگرێ، یـەکی دەگـرت». بەگـشتی هیچ عۆدەداری یان بەرپرسایەتی ئابوورییەکی تایبەت لە ئارادا نەبوو.[١٣٥]

## دەرەنجام

هەر ئەو چەشنە کە هەتا ئێستا بۆ خوێنەران ئاشکرا بووە، گرفتە سەرەکییەکان ـە لێدوان لەمەڕ فاشیزم بوونیان هەیە. بە هۆی ئەزموونی جەنگی جیهانی ـووەمەوە سەرکۆنە و بەسەرداهاتنی زۆر و زەرووری لەباری ئەخلاقییەوە ـەسەر ئەم ئیدئۆلۆژیەدا هاتووە. فاشیزم هەروەها پێوەندییەکی شاراوەی لەگەڵ ـ تای ئیدئۆلۆژی بووە. فاشیستەکان نەک هەر تەنیا هەڵوێستی نائەخلاقی و دژی ـیدئۆلۆژیکی یان پەروەردە کردووە کە لێدوان لەمەڕ ئەوانە بە شێوەی باوەڕی هاوئاست لەگەڵ کۆی ئیدئۆلۆژییەکان ئاستەنگ دەکا، بەڵکو هێشتا ئەم پرسیارە لە ئارادایە کە چۆن ئیدئۆلۆژی توانی فاشیستەکان بەرەو دەسەڵات ڕێنوێنی بکات؟! سەرەڕای ئەمە، ئەم ئیدئۆلۆژی هەڵگر و هاوڕێی پرەنسیپی سازدەری بەتەواوی سەرسووڕهێنەر، کاڵ و نەکوڵیو و سەیر و سەمەرەیە. باشترین و ـێبوردووترین ڕوانگە سەبارەت بەو ئەمەیە کە پرەنسیپی سازدەری ئەو بەشە ـیتراوەکان و توندڕۆیین لە سوننەتە ئەندێشەیەکانی جێی قبووڵ کردنی ئەورووپایی لەمەڕ نژاد دەوڵەت یان سروشتی مرۆڤ بزانین. بێچاوپۆشیترین ڕوانگەی فاشیزم بە شێوەی وڕێنە و قۆڕیات وەک نەخۆشی دەم یاو و تاوتێ وەلای دەنێ. گرفتێک کە بیرمەندان لەگەڵ ئەم ئیدئۆلۆژیە بوویانە، زۆر لەوانی بەرەو دۆزینەوەی ڕاپۆرتگەلێکی نائیدئۆلۆژیکی بریکارێک بۆ بەیانی خووی ئەم بزاڤە لەباری دەروونناسی ئابووری و کۆمەڵناسی پاڵ پێوەناوە کە لە سەرەتای ئەم بەشە ئاماژەیان پێکرا.

گەرایشی دوایی تاقە ڕێگایە کە بۆ بەرچاو نەگرتنی ئەم ڕاستییە ئاستەنگە کە بینینێکی نزیکتر سەبارەت بە دۆزەکانی فاشیزم و ناسیۆنال سۆسیالیزم دەخاتەڕوو کە پێوەندییەکان و تێکەڵاوییەکانی نێوان ئەوان لەگەڵ ئیدئۆلۆژییە مەعقوولەکانی وەک لیبرالیزم، پارێزگاری، سەندیکالیزم و سۆسیالیزم بوونیان بوو. واتاگەلێکی وەک دەوڵەتی ئاسانکاریخوازی دەستێوەردەر سنفخواز و ئابووری بازاڕی و کۆمەڵایەتی‌تر؛ پەرلەمانی ئابووری لە تەولیدکاران ئابووری؛

نگەرانی پێگەی ژین و ئەکۆلۆژیکی لەمەڕ لەناوچوون و رووخاندنی سروشت. مەسەلەی لایەنی چاونەکراوەیی، دلۆڤانی و ناهەمواری سروشتی مرۆڤ. نیگەرانی لەمەڕ واتای لەخۆبێگانەبوون و پووچەڵی و بێ ناوەرۆک بوونی مەعنەوی شارستانییەتی بورژوازی نوێ، هەموو ئەمانە ئەندێشەگەلێکن کە لەگەڵ کۆماکۆی سوننەتەکانی ئیدئۆلۆژیکی بێگانە نین. ئەم نزیکەی وەبیرهێنەرەوەیەکە بۆ ئێمە کە تووشی خراپ تێگەیشتن نەبێین. ئەو ئەندێشە باسکراوانە لەگەڵ ئەندێشەکانی ناسیۆنالیستی زۆر ئێحساسی و بێگانەخوو و عەیبدار؛ لەگەڵ نژادپەرستی وێچووی زانستی شاراوە، بەکەڵکی بێ سامان و شێواو لە روانگە ئاکادیمیکەکانی وەک نوخبەخوازی، حەیاتخوازی، کردەوەخوازی و داروینیزمی کۆمەلایەتی، لەگەڵ ئیدعاگەلی سەیر و سەمەرە و زۆر گەشبینانەی رێبەران تێکەلاو بوون مەعجوونێکی سەرسوورهێنەری پێکهێناوە.

بەڕاستی ئێمە لە فاشیزمدا لەگەڵ رووداوگەلێکی زۆر دژبەیەک رووبەڕوو دەبینەوە. دوو لایەنی بنەڕەتی نێوان تایبەتمەدی تایبەت و نزمبینانەی ناسیونالیزمەکان لەراستیدا و کێشەگەلی جیهانی ئەوان بوونی هەیە. تەنینەوە گرێ نەکراوە قووڵەکانی نێوان واتاکانی نژاد، نەتەوە و دەوڵەت چ لە فاشیزم و چ لە ناسیۆنال سۆسیالیزمدا دەکەونە بەرچاو. هەروەها دژایەتی نێوان خەڵکی بە باوەڕی کێشە هەڵایسێنی چاوکراوە و بینەری ئەو لە لایەک و تاکخوازی نوێی فاشیستی و نوخبەخوازی توندوتیژ و بچووکردن و بە کەمزانینی دوژمنانە سەبارەت بە جەماوەر لە لایەکی دیکەوە بوونی هەیە. فاشیزم ئیدئۆلۆژیەکی بە قەناعەتگەیێنی بە واتای رۆشنبیری نییە، بەلام بەو ماناش نییە کە ناوەڕۆکی ئیدئۆلۆژیکی ئەو نەگرینەبەرچاو. لەگەڵ ئەمە، ئاڵۆزی فیکری و نەبوونی پێوەندی مەنتقی و کردەوە ترسهێنەرەکانی ئەو لە کاتی دەسەلات لە دەستدا بوون خاڵگەلێکن کە پێویستیان بە سەرنجی دایمی و تایبەت نییە.

ـە سێ دەیەی دوابیدا پانتـایی نـاوەرۆکی فـەمینیزم هـەتا رادەی دیاردەیـەک ـەـڕێ بووەتـەوە. ئـەم رێبـازە هـەمیـشە لەگـەڵ ئـەکولۆژی، پێـدەچێ خێراتـرین ـەشـەی لـە نێـوان کۆمـاکۆی ئیدئۆلۆژییەکانـدا بـووە. واژەی فـەمینیزم خـۆی، ـەپێچەوانەی هێندێ ئیدئۆلۆژییەکانی دی. وەکو پارێزگاری یـان لیبرالیـزم، بـڕێک ـەسـەلەی ریـشەناسی هێناوەتـە ئـاراوە، چونکـە مانـای روالـەتی ئـەو بەتـەواوی ـنکرایە. پیت لە ساکارترین فۆرمی ئەو دەلالەت لەسەر تۆژینـەوە لەمـەڕ سـتەم ـکراوی ژنان و شعوور و بالاچوونی ژنان لە هـەموو بوارەکـانی هەیـە، تەنانـەت هەر ئەم دۆزە هۆکاری لێدوان و رەخنەگەلێکی زۆر بووە. بەم حالـەوە کۆمەلـێک ـە مەسەلەکان بە فەمینیزم خۆی، بە جەوهەری خۆزانیاری بزاڤ خـۆی، پێوەنـدی ـدبێ. ئەم مەسەلانە، کە لە لاپەڕەکانی داهاتوودا لەمەڕ ئەوانەوە دەبێـژین، هـەتا ـ دەیەک هەلقولاوە لەم راستییەن کە فەمینیزم لە بەراورد لەگەڵ ئیدئۆلۆژیگـەلێکی ـوەک لیبرالیزم، هێشتا قۆنـاخی سـەرەتایی فـۆرمگیری فیکری و سیاسـی خـۆی ـدەپێوێ.

بۆ بەیانێکی تیشکدار و تاوتوێکردنی ئیدئۆلۆژی فەمینیزم لەگـەڵ مەسـەلەیەکی ـیکەش رووبەڕووین و ئەوە ئەمەیە کە ئەم رێبازە هـەر ئێـستا لەبـەر هەڕەشـەی ێدوانە تونـد و بەتەوژمەکانـدا وەسـتاوە. لەگـەڵ ئـەوەدا، لـە حالـی ئێـستادا ئـەم ئیدئۆلۆژییـە زۆر چـالاک و بەکردەوەیـە. ئـەم چـالاکی و کردەوەخوازییـە یـان رەخنەیەک کە فەمینیزم ئەنجامی دەدا لانی کەم تاقانەیە چونکـە خـەباتخـوازی و کرداری ئەو هـەر تـەنیا لـە ئاسـتی ئاکـادمیکی یـان سیاسـیدا نییـە بەلـکو هێنـدێ باوەڕەکانی ناخی ئێمە لەمەڕ خووی کۆمەلـگە، وێنـەگـەلی ئەندێـشەیی ئێمـە یـان پێوەنـدی تایبـەتی و زۆر و بێخەوشـانە ئێمـەی کردووەتـە ئامـانج. هـەموو ئـەو کەسانەی کە لەوەبەر ئیدئۆلۆژییەکانیان موتالا کردووە یان لەمەڕ ئەوانە بابـەتیان نووسیوە، لەگەڵ ئیدئۆلۆژی فـەمینیزم هەسـت بـە ئاسـوودەیی ناکـەن. رەخنـەی دەروونی فـەمینیزم کۆمـاکۆی بەسـتێنەکان دەگرێتـەخۆ: بەگـشتی لایەنگـەلی داهێنانی هونەری، زانیـاری کۆمەلایـەتی، زانیـاری مرۆڤـایەتی، لـەم دواییانەشـدا

زانیاری سروشتیش لەخۆدەگرێ. لە راستیدا هێندێ کەس دەڵێن کە ئەم ڕێبازە بنەماکانی کەلتووری رۆژاوای لەرزۆک کردووە. پەرەی گەشەی راقەی فەمینیستی بە رادەیەک زۆر بوو کە موتالا و تۆژینەوە لەمەڕ ئەو لە تاقەتی توێژەرانی بەکارو دەستهەڵنەگریش بەدەرە.

مەسەلەیەک کە کێشەکان ئاستەنگتر دەکاتەوە و تایەتمەندی کەمبینانەی زۆر لە بیرمەندەکانە. زۆرینەی نووسەرانی فەمینیست، رۆژنامەکان، چاپەمەنی و وانەکانی ئاکادمیک، لە رواڵەتدا خیتابیان رووی لە فەمینیستەکانی دیکە، ئەو ژنانەی کە نووسراوەکانی فەمینیستی دەخوێننەوە یان هەر تەنیا ژنان بە شێوەی گشتییە. هەرچەند کە بەڵگەیەکی تەواو لە دەروونی ئەم کەمبینییە رواڵەتییە بوونی هەیە. بەکورتی ئەمە کە ئەگەر پیاوانی مەسەلە هەن و ئەمە ئەوانەن کە لەسەرکوت کردنی ژنان سوود دەبەن، بۆچی سەبارەت بەوان هیچ شتێک نانووسرێ یان هەر تەنیا بە چاوی دوژمنانەوە سەیری نووسراوەکانی ئەوان دەکرێ؟ ئەوانە چ چاوکراوانە و چ چاونەکراوانە، یان نایان هەوێ لە بابەتەکە بگەن یان تێدەکۆشن کە ژنان بێهێز و لەرزۆک بکەن. ئەگەر زمانی ئێستای ئێمە (لەوانە زمانگەلی فەنی رشتە جۆراوجۆرەکانی زانکۆیی) خاوەنی فۆرمە وردبینییەکانی دەسەلات و زاڵبوونی رەگەزیە، چۆن دەکرێ رووی زار لە پیاوان بێ؟ ئەگەر ژنی فەمینیست تێدەکۆشێ روانگەی خۆی بە زمانێکی ئەوتۆ بەیان بکا، کەواتە لەسەر پێڕەوی خۆی سحەی داناوە و لە یەکەم برگە پێت، بەڵگە و رێنوێنی خۆی لە دەستداوە.[1] ئەمە وێچووی وەزعی زۆربەی ئانارکۆسەندیکالیستەکان، ئانارشیستەکان و رۆشنبیرانی لایەنگری گرامشییە. رێنوێنی و بەڵگەی گشتیتری ئەم گروپانەی دوایی ئەمە بوو کە کرێکاران و وەرزێران پێویستیان نییە کە پرۆژە فێرکارییە تایبەتییەکانی خۆیان و شێوەی ئەندێشەی خۆیان بەرفراوان بکەنەوە هەرکە وێنەگەلی رێکوپێکی فیکری بورژوایی دەسەڵما، بەڵگە و شۆرش لەگەڵ نابوودی رووبەڕوودەبوونەوە. بە بڕوای گرامشی، پرۆلیتاریا دەبوو تەنانەت لە دەروونی پرەنسیپ و میتۆدی زمانی و عەقڵی سەلیمەوە بە دووی پلەبەرزی دەسەلاتی خۆیەوە بێ؛ هەر بەم جۆرە ژنانیش دەبێ لە دەروونی زمان و عەقڵی

ـەنیمی مەوجوود لە بەرامبەری ناوەڕۆکگەلی لەپێش بوونی باوکساڵارانەدا
ـ وەستان لە خۆ نیشان بدەن. لە بوارگەلێکیشدا بۆ بەرینکردنەوەی شێوەی نوێ
ـە وتاری فەمینیستیدا بوونی هەیە کە ئاوڕ دەدەینەوە سەر ئەو. بابەتێک لێرەدا
ـە بۆ برێک لە فەمینیستەکان گرنگە ئەم راستییەیەکە زۆر لە کێشەکان و
گرفتگەلێک کە ژنان هەیانە، وەکو عادەتی مانگانە، بابەتی تایبەتی ژنانن. پیاوان
ـەتەواوی توانای تێگەیشتنی ئەوانەیان نییە و لەراستیدا ئەم جۆرە مەسەلانە بۆ
ـەوان بەشێک مەرەمات دەدرێتە قەڵەم. لەگەڵ بەشێک لە ئەزموونی تایبەتی
ژنانەن و هەر ژنانی دیکە دەتوانن ئەزموونی بکەن. لەگەڵ ئەمەشدا لە پشتی ئەم
ـەڵگە و ڕێنوێنیانەوە ئەم باوەڕە لە ئارا دایە کە ژنان بێوێنەن و سروشتێکی
ـەرەکی و گشتیان هەیە. نووسەرانی تازەی فەمینیست لە راستیدا لەگەڵ ئەم
خاڵەدا نین و لەسەر بوونی جیاوازییەکانی نێوان ژنان تەئکید دەکەن.

گرفتێکی دیکە دەربارەی کێشەی بنەماخواز لەمەڕ ژنان (بەتایبەت فەمینیزمی پرەنسیپی) ئەمەیە کە زۆرجار وا دەنوێنێ کە لەمەڕ فەمینیزم بێبواری بەربڵاوی مێژوویی، سیاسی یان فەلسەفی لێدوان کراوە. دەڵێن کە جیهان لە چاوەڕوانی فەمینیزمدا بووە کە ئێستا بە باشی دەردەکەوێ و راستی داهاتووی مێژوو هی ئەم ڕێبازەیە. فەمینیزمی رادیکاڵ لەم خاڵەدا تەنیا نییە: رادیکاڵترین ئیدئۆلۆژییەکانیش هەر ئەم باوەڕ بە ئامانجی کوتاییان بووە. هەروەها لەگەڵ ئەمەی کە ئەمە پیاوان بوون کە لە پلەی بەراورد بەشی زۆری هەرەوەزی مێژوو و فەلسەفەیان نووسیوە، فەمینیزمە رادیکاڵەکان لەگەڵ بۆچوونێکی پڕ لە گومان دەڕواننە ئەم کردارە. هەرچەند بەڵگەی پشت ئەم بابەتە دەکرێ بە ئاسانی لێیتێبگەین، ئەم ئەمرە وێچوو و لفە و دوانەی کێشەی کۆنی کۆمۆنیستەکان لە خولی «نێونەتەوایەتی دووەم»ە و لەسەر ئەم بنەمایە کە گشت ئەندێشەی جیا لە مارکسیستی ئیدئۆلۆژی بورژوایی و زانیاری درۆیە و بە ئاسانی دەکرێ چاوپۆشیان لێبکرێ. بەپێچەوانەی دژەی ئەم جۆرە داوەریانە دەکرێ وای لێتێبگەین کە ئەمەش هەر ڕێی ڕوانگەی مارکسیست دەپێوێ.

لەگەڵ ئەوەی کە شرۆڤەیەکی تا رادەیەک گشتی کە لەسەرەوە لە فەمینیزم خرایە بەرچاو، تاوتوێکردنی سەرکوت و دەرک و پلەبەرز بوونەوەی ژنان ـ زۆر ئاستەمە کە پێناسەیەکی سەرەکیتر لە واژە بدرێ بە دەستەوە.دەبێ لێرەدا وەبیر بێنینەوە کە رەنگە هێندێ لە فەمینیستەکان، بەتایبەت کەسانێک کە دەربارەی خووی عەقڵانی ژنان بکەونە پرسیار، بێ وەستان خوازیاری پێناسەیەک بن و لەمەڕ روانگەی تێکدەرانە یان دواساختارخوازی، یان لە رێیەکی دیکەوە، بە هۆی هەموو لایەنە مەعریفەتییەکانەوە کە زۆرتر پێناسەی وێچووی وەک وێنەی ئەندێشەی ژنانەن هەتا وێچووی واتای عەقڵانی، بکەونە پرسیار کردن. رەنگە زۆر لە فەمینیستەکان بە ئیلهام لە پۆست مودێرنیزم بەڵگە بێننەوە کە تەنانەت رووبەڕووی دوو بەرامبەر دوولایەنی واژەگەلێکی وەک «مێ» و «نێر»، چونکە واتاگەلی گشتی دەخەنەڕوو کە لە راستیدا پێکهاتەکانی کەلتووری و زمانی تایبەتیان هەیە، جێی گومانە بەدوای شالاوی فۆکۆ بە (بۆسەر) وتارگەلی ئەندێشەی سەردەمی رۆشنبیری، ئەو جۆرێکە نووسەرێک نووسیویە «شیکردنەوەی فەمینیستی دەیهەوێ بە دژبەیەک بوونی رۆژئاوایی نێوان چاو و فام، لەش و گیان، عەقڵ و هەست... هەموویان بە مانای رەگەزایەتی و بەراوردی گومان لێکراو بە دابەشکردنی پلەبەندی مێ و نێر چاوی لێ بکا... واسیتەگەل و ئامێرگەلی دەسەلاتن.[٢]

ئەگەر ئێستا ئەم بابەتە وەلابنێین، دیسان ئاشکرایە کە ئەگەر مێژووی فەمینیزم بە شێوەی بزاڤ تاوتوێ بکرێ، ئەم رێبازە دۆزگەلێکی زۆر جیاواز و تەنانەت بەتەواوی دژ بەیەکتری هێناوەتە ئاراوە. شێوەی فەمینیزمیش لەگەڵ وەسەر پێکەوتن و بالا کردنی حەیا و داوێنپاکی گرێی خواردووە و هەم لەگەڵ دروست بوونی پێوەندی رەگەزی ئازاد کە کەرەسەی بەرگری لە ئاوس بوونی ئازادانە و سەربەخۆ لە ئیختیاری هەموو کەسدا بێ. بڕێک لە فەمینیستەکان خوازیاری پێوەندی رەگەزی ئازادانەتر بوون و هێندێکیتر هاوجنسخوازی سیاسی ژنانیان باس کردووە. تاقمێکی دیکە بە شان و باهۆی جیاوازی ژنان و بێهاوتای ئەوانیاند هەڵگوتووە. کۆمەڵێکی دیکە هەتا ئەو رادە چوونەتەپێشێ کە بە لایەنگری لە

ـوورەگـەزایـەتـی (لانی کـەم دوورەگـەز خـوازی تـەکامولی) هەسـتاون. وێـڕای ڕاپۆرتگەلێک کە لەمـەڕ کۆمـاکۆی ئیدئۆلۆژییـەکان داومانـە، بـوونی ئـەم بـاوەڕە جۆربەجۆرانـە نابـێ ببێتـە هـۆی سەرسـوورمانی خوێنـەران. فـەمینیزمیش وەک زۆربەی ئیدئۆلۆژییەکان تێکەڵ بوون و ناهاوئاهەنگیگـەلێک لـە بایەخـە بنـەماکانی خۆیدا هەیە.

ئەم نەبوونی دیاریکردنە لە پێناسەگەلێک کە هێندێ نووسەران لەم ئیدئۆلۆژییە بە دەسیانەوە داوە، ڕەنگدەداتەوە. ڕەنگە بەرفراوانترین پێناسە لە فەمینیزم ئەمـە بێ: «هەر گرووپێک تێدەکۆشێ هەتا کـەش و هـەوای ژنـان یـان دۆزگـەلێک لەمـەڕ ژنـان بگـۆڕێ»[3] ئـەم پێناسـە لـە ڕادەبـەدەر بـەربلاوە، چونکـە دەتوانـێ دژی فەمینیستەکانیش لە خۆبگرێ. پێناسەکانی دیکـە میزانتـرە و جەوهـەری فـەمینیزم «بە دەس‌هێنانی بایەخی یەکسان لەگەڵ پیاوان لـە بابـەتی دارا بـوونی سروشـتی هاوبەش بە شێوەی تایبەتی ئازاد» بۆ ژنان ناوزەد دەکـا.[4] ئـەم پێناسـە بەسـراوە بەم دۆزەوەیە کە ئامانجی فەمینیزم لە نەهایەتا دامەزراندنی عەدالەتی ڕەگـەزیـە. لەم خوێندنەوەدا فەمینیزم بوونی هەیە هەتا نایەکسانگەلێکی بەنەزم کـە ژنـان بـە هۆی ژن بوونەوە ئەزموونی دەکەن؛ ڕیفۆرمی دەکا.[5] زۆر کەس ئەم پێناسـە زۆر بە ئاستەنگی دەزانن کە بە واتای یاسایی ڕەسمی سەرنجی زۆرتری پێ‌بەخشیوە. بە بۆچوونی کۆمەڵێکی دیکە، فەمینیزم «ڕەخنەی گشتی لە پێوەنـدی کۆمەلایـەتی گرێدراو بە دەسەلاتخوازی و دەسەلات قبوول کـردنی ڕەگـەزی» یـان «دژایـەتی کردن لەگەڵ هەرچەشنە جیاوازییەکی کۆمەلایەتی، تایبەتی یان ئابوورییەکە ژنـان بە هۆی ڕەگەزایەتی خۆیانەوە لەوە ئازار و ڕەنج دەبینن».[6] ئـەم پێناسـە کردنانـە ڕەنگە پایەی تاوتوێکردنەکە بەرینتر بکاتەوە. بە بۆچوونی زۆر لـە فەمینیسـتەکان بەئازارترین چەوسانەوە و زاڵی بەسـەر ژنانـدا لـە بەسـتێنگەلێک دایـە کـە لـەژێر ئاستی پێوەندی سیاسی و ئابووری ڕەسمـی لـە کۆمەڵـگەدا بوونیـان هەیـە. بـەم حاڵەوە، فەمینیـستە پۆسـتمودێرنیـستەکان لـە بەرامبـەر ئـەم پێناسـە گشتیانەدا ڕادەوەستن و ئەوە بە کۆششێک بۆ داکوتانی ڕیشەی سیستەمی فیکری دەزانن. لایەنی تایبەت و دیاریکراوی پاش پێکهاتەخوازی و پۆسـتمودێـرنیزم لـەم وتەیـە

توریل مـوادا هـاتووه کـه «کۆمـاکۆی ڕێبـازەکـانی ئەوپـەڕی ڕەوایـەتی، لەوانـە فیمینیزم، هەڵقوڵاوە لـە کـردەوە سـەرکوتکەرانەکانی دەسـەڵاتداری متـافیزیکی» ناودێر دەکەن.[٧] بەم جۆرە گشت باوەڕکان بە گومان دێتەبەرچاو. لەبەر ئەمە هیچ بوارێکی نەگۆڕ یان ڕاست و دەقیقێک بۆ پێناسە کردن بوونیان نییە.

له ڕاستیدا زۆر لە پێناسەکانی سـەرەوە پێناسـەی ڕووداوگـەلێکی جیـاواز لـە گشت بزاڤەکانن. بەپێچەوانەی ئەو ڕاستەقینە کە هۆکارگـەلێکی گـشتیتر لـە پـشت فیمینیزمـەوە شـاراوەتەوە کـە دڵـنگەرانی بـاش بـوونی بـارودۆخی ژنانـە و لـە ڕووبـەڕووی زوڵـم و سـەرکوتدا ڕاوەسـتان لـە خـۆ نیـشان دەدا، ڕێبـازە جۆراوجۆرەکان لە ئەندیـشەی فەمینیـستیدا بوونیـان هەیـە کـە شـیکارییەکی زۆر جیاواز لەم پرۆژە دەخەنەدەڕێ.

## پێگەکانی ئەندیشەی فەمینیستی

لێدوانەکان لەمەڕ پێگەکانی فەمینیزم پێوەنـدی لەگـەڵ لێدوانـە سـەرەکییەکانی ئیدئۆلۆژی خۆی هەیە. هەڵـچوونێکی زۆر لەمـەڕ پێگـە مێژوویـەکانی بزاڤـبوونی هەیە. یەکەم لەو ڕووەوە کە پیاوان هەتا ئەم دوایانە هەمیـشە بەسـەر نووسـراوە مێژوویەکاندا زاڵبوون، بەوەلانانی ژنان یان لە پـەراوێز دانـانی ئـەوان لـە مێـژوو ڕەخنە گیراوە. لەم بوارەدا گـوتراوە کـە هەمیـشە پیـاوان لەمـەڕ ژنـان شـتێکیان نووسیوە و پیاوان، چاوکراوانە یان چاونەکراوانە، لەبابەت ڕەگەزیـەوە لایـەنگرن. لەم ڕووەوە، ژنان خۆیان دەبێ مێژووی لەگەڵ ئەم ڕاسـتییە کـە ڕیـشەی مێـژوو خۆی بەشێک لە سیستەمی باوکسالارانەی نێرینەیە، دوو بەرامبەر دەبـێ و ژنـان لەمەڕ ڕاپۆرتی بزاڤی فەمینیستی ئاستەنگتردەکا. ویل ئەسپدر وێڕای ڕاڤە کـردنی وەلانانی هێندێ ژنان زەق لە نووسراوە گشتیەکانی مێژوویی، بـاوەڕی وایـە کـە «ئەمـە وێنـەیەکـە لانی کـەم لـە هەمـەجۆرەی میتۆدێـک کـە پیـاوان لـەوە بـۆ بەرژەوەندی، وەلانان و سڕینەوەی ژنان، سوودیان بردووە.[٨] ئەم کـارە هـەر لـە سەرەتاوە نووسراوەکان پیاوان لەمەڕ مێژووی ژنان گومـان لێکـراو دەکـا. هـەتا

ـادەیەک دەکرێ بوترێ لە کاتێکدا کە ژنێک نووسـراوەیەک دەخوێنێتـەوە، ئەگـەر نووسەرەکەی پیاو بێ، خوێنەر بە چاوی گومان و دوودڵییەوە بۆی دەڕوانێ.

گرفتێکی دیکە لەم پانتادا پەرەدەسـتێنێ ئـەم مەسـەلەیە کـە ئایـا نیگـەرانی لـە بابـەت ژنانـەوە هـەر هـەمان نیگـەرانی ئیـدئۆلۆژی فەمینیـستییە؟ ئەمـە خاڵـێکی بچووکە بەلام ئەمڕۆ گەورە بووەتەوە. زۆر لە ژنـان و پیـاوان هـەن و بـوون کـە سەبارەت رەفتاری ژنان لـە بنەماڵـە، فێرکـردن و پـەروەردە و شـوێنی کـار نیگـەران بوون و لایەنگری وەک یەکبوون و بەرامبەر لەم پانتادا هـەن، بـەلام ئەگـەر نـاوی فەمینیست لەوانە بنێین، سەرسوور دەمێنن. بابەتەکە هێنـدە روون نییـە، بـەلام لـە باری داد لەمـەڕ مێـژووی ژنانـەوە بایـەخی هەیـە. ژنانێـک بـوون کـە لـە هێنـدێ گۆڕانکارییەکی بە کردەوە بوون کە مەسلەلەن لـە کۆتـایی سـەدەی نۆزدەهـەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بـە ژنـانێکی وەکـو هـەمفری وارد، ئۆکتاویـا هیـل یـان بئاتریس دەکرێ ئاماژە بکەین. ئەگەر کەسێک بێهەوێ بەم دەرەنجامە بگا کە ئـەم کەسانە پێویستانە فەمینیست بوون لە باری مێژووییەوە ناسازگارن لەگەڵ زەمەن کردەوەیـان لـە خۆنیـشان داوە، باڵـێکی پڕمەترسـی کێـشاوە. دوو کەسـی ئاماژەپێکراوی دوایی، تەنانەت مەیلێکی ئەوتۆیان بە بەشداری ژنان لـە ڕاپرسـی و هەڵبژاردن لەخۆنیشان نەداوە.

بە شـێوەی گـشتی، لێدوانـەکان گرێـدراوە بـە پێگـەکانی ئەندێـشە و کـرداری فەمینیستییەوە، هەڵگری چوار وتاری دابەشکراوە. لە سێ وتـاری یەکـەم گریمانـە لەسەر ئەمەیە کە واتای پێشکەوتوو لەسەر وشـەیەک بـووە. لـە وتـاری یەکەمـدا ڕێنوێنی کراوە کە مێژووی فەمینیزم لە سپێدەی زانیـاری مرۆڤـەوە دەسـتپێدەکا. «بۆ وێنە ژن» هەمیشە لەگەڵ ئێمە بووە. لەراستیدا هێندێ دەڵـێن رەگـەزی نێرینـە بـوونی لـە بابـەتی توانـایی ئـەکۆلۆژیکی زاتییـەوە لەگـەڵ ئێمـە بـووە و مێـژوو جۆرەکانی مرۆڤی بە بۆنەی زاڵبوونی پیاوانەوە هەتا رادەی کۆسپێکی گەورە بـە لاڕێدا کێشاوە. خانمی سوزان گریفین لـە روانگـەی ئێکـۆفەمینیـستییەوە بـاوەڕی وایە کە ژنان زیاتر لـە پیـاوان پێوەنـدیان بـە سروشـتەوە هەیـە. ئـەو بانگەشـەی سەرەکی کتێبەکەی بەناوی ژنان و سروشـت، هـاوار و بـانگی بەکۆمەڵـی مـەزنی

ژنان و سروشت که لەگەڵ زەمان و سەردەم رادەپەڕێ» دەزانێ.[9] ئـەم بەرهەمـە غەیرەمێژوویی‌ترە کە لە تەنینەوەی گومانی بیولـۆژیکی، دەروونناسـی تێـڕامانی دینی و وێنەکان و وێچووی وێنەگەلی سەرەتایی یۆنگی سەرچاوە دەگـرێ، نابـێ ئێمە بە لای خۆیەوە راگرێ.[10] هـۆگری ئێستا زۆرتـر سـەرنجی لەسـەر زانیـاری سیاسی راستەوخۆیە. دواتر دەچینە سەروکاری ناوەرۆکی دەروونناسی.

بەپێچەوانەی ئەمە کـە هێنـدێ کـەس چـاو لـە دووی فـەمینیزمی ئـەفلاتوونین دووەمین خاڵی بەبـڕەوتر دەربـارەی پێگـە دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەرەتای سـەدەی نۆزدەهەم. لێرەدا بیچمی کریستینا دووپیزان هـەمیـشە خـۆ دەنوێنـێ. ئەگـەرچی دەبـێ سـەرنج بدەینـە تێبینییەکـەی دیـل ئەسـپندر کـە «بـەکردەوە هـەر ژنێکـی هەڵبژێراو بە شێوەی «دەستپێکەر» دەتوانێ پێش هـەنگاوانێکی ببـێ».[11] کریـستین دووپیزان کتێبێکـی نووووسـی بـە نـاوی، کتـێبی سـاری بـانوان، کـە لەمـەڕ ئـەوە لێکۆڵەرانی فەمینیستی بابەتێکی زۆریان نووسی. لێرەدا لێدوانێکی زۆر بە ئاڵـۆزی و پـڕ لـە گرێکـوێرە ماوەتـەوە کـە ئایـا پیـزان دڵـگەرمی شـتێک بـوو کـە بـەپێی رەسەنایەتی بکرێ ئەوە ناوی فەمینیستی لـێبنـرێ؛ بـە بـارێکی دیکـە، ئایـا ئەمـە کردەوەیــەکی نــامێژوویی و ناســازگار لەگــەڵ ســەردەم نییــە کــە تێبکۆشــین فۆرمبەندی فیکری ئەمڕۆیی بەسەر رابردوودا بسەپێنین؟[12] پرسـیارێکی ئـەوتۆش دەتوانرێ لەمەڕ کەسایەتی بەناوبانگ کە دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەدەی حەڤـدەهەم و بەناوی سێیەمین خاڵی پێگە باسێکی زۆر لەو کراوە واتە دەربارە خـانمی ئـافرابن (١٦٤٠ـ١٦٨٠) بێتە ئاراوە. ئەم خانمە لە هەر بابەتـەوە کەسـایەتییەکی پـڕجۆش و خرۆش بوو کە ژیـانی تـا رادەیـەک کـورتی خـۆی لەگـەڵ ئـەزموونی بەبایـەخی بردەسەر. ئەو لە راپەڕینێکدا لە جەزایری هێندی رۆژئاوا تێوەچوو، بۆ دەربـارەی چارلیزی دووەم دژی هولەند جاسووسی دەکرد و نووسەرێکی بەکار و توانا بـوو کە حەڤدە شانۆنامە و سێزدە کورتە چیرۆکی نووسی. ئەو هەروەها چالاکانـە بـۆ بەرەوپێش بردنی دۆزی یەکسانی بۆ ژنان چالاکی کرد.[13]

لە کۆتاییـدا هەمەلایەنـە پەسـندترن ـ رەنگـە دروسـتترین خاڵـی دەسـپێک بـۆ تێـڕامان و ســەرنجی فــەمینیزمی کۆتایــەکانی ســەدەی هەژدەهــەم بەتایبــەت

ـیسانەوە خولی پاش شۆڕشی کە بیری فەڕەنسەیە. فـەمینیزمی ڕۆژئـاوا وەکـو ـزربەی ئیدئۆلۆژییەکانی دیکە، پێگـەکانی خـۆی لێـرەدا بەدەسـتدێنێ، ئەگـەرچی ـڕیک لە بزووتنەوە فیکرییەکان پێوەندیان بە بەرلـە شۆڕشـەوە هەیـە. گرنگتـرین ـڕووداو بۆ مێژووی ئەندێشەی فەمینیـستی لـە قۆنـاخی شۆڕشـدا بلاوکردنـەوەی کتێبی ماری ولسۆن کرافت لە ساڵی ١٧٩٢ بەناوی ئیسپاتی مافـەکانی ژنـان بـوو. میریام کرام نیک دەڵێ: «ماری ولسۆن کرافت بە یەکەمین فەمینیستی مەزن بـوو و کتـێبی ئیـسپاتی مافــەکانی ژن... وەکــو ڕاگــەیێنراوێکی ســەربەخۆیی فەمینیستیە».[١٤] ئەم لـە پـێش بوونـەوەی مـاری ـ یەکـەمین بـەیانی سیـستماتیکی ڕوانگە فەمینیستی دەدرێتە قەڵەم ـ لە ئەندێـشەی فـەمینیزمی سـەدەی بیـستەمەدا جێی گرتووە.

ئەگەر سـەرنج بدەینـە ئـەم خولـەی دوایـی کـە لـە بـاری نووسـراوەی زۆری فەمینیستی پڕکارترین دەورە و خـولی ڕاپـەڕینی سیاسـی و خۆزانیاریـیە، دەبـێ سەرنج بدەینە دابەشکارییەکانیش. دابەشکاری قەراردادیتر لە نێـوان دوو شـەپۆل دایە: یەکەم شەپۆلی خولی ١٩٢٠ــ١٨٣٠ و دووەم شـەپۆل لـە ١٩٦٠ هـەتا ئێـستا دەگەڕێتەبەر. ئەم دەورەیی کردنە هەمیشە هەڵگری مـاوەی زەمـەنی ١٩٢٠ هـەتا ١٩٦٠ە کە خولی وەستان دەدرێتە قەڵەم. هەڵـبەت هـەموو فەمینیـستەکان ڕاسـت ئەم دابەشکارییە دەورەیەیان قبوول نییە. شەپۆلی دووەم خۆی بە دوو هەتا پێنج قۆنــاخ دابــەش دەکــرێ. هێنــدێ نووســەرانی دواکــەوتوو دەڵــێن فــەمینیزمی پۆستمودێرنیست شەپۆلی سێیەمە.[١٥]

ئەگەر وەدووی شەپۆلی گرێبەستی بکەوین، بواری شەپۆلی یەکەم لە ڕوانگەی مافەکانەوە لیبرالی کلاسیک بوونی هەیە کە زمانی جان لاک لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا بە شێوەی بەربلاو لەودا بمێنێ و بەدەست و بردترین کاردانەویە ئەم ڕوانگە لە ئەمریکا بوو.

پلانی گشتی ئەو بریتی بوو لە بەخشینی مافی دەنگدانی بە ژنان و تەنینـەوەی مافە مەدەنییەکان و سیاسی سروشتی ئەوان. لە ولاتە یەککگرتووەکانی ئـەمریکادا بواری وەها پرۆژەگەلێک لە بزووتنەوە بـەهێزە مەزەبییـەکانی جیـا لـە پارێزگـار

شاراوەیە کە زۆربەیان لە چینی مامناوەندی بوون و ژنانیان دنە دەدا کە لە چالاکییەکانی وەک میانەڕەوی لە خواردنەوەی مەشرووبە ئەلکولییەکان و کۆنترۆلی کاری نەگونجاو و ناشایست لەبەرچاوی کۆمەلگە چالاک بن. ئەم جۆرە ژنانە ناچار بە هاوکارییە فیکرییە موسبەتەکانی خۆیان لە لێدوانە کۆمەلایەتییەکاندا بەرفراوان کردەوە. لەگەل ئەوەدا، گەشەی پیشەسازی و داهێنان بوو بە هۆ کە ژنانێکی زۆرتر بێنە بەشی وزەی کاری کۆمەلگە. ئەم کارە بە تەنیایی سەربەخۆییەکی زۆری بە ژنان بەخشی.

گرنگترین دیاردە لە ئەمریکا تێهەلچوونی ژنان لە بزاڤەکانی دژی کۆیلایەتی و مافی دەنگدانی لە سەدەی نۆزدەهەم بوو. وتارەکانی ئەم بزاڤانە دژی مافە دەستنیشان کراوەکان لە یاسای بنەڕەتی ئەمریکا کە لە راگەیەنراوی سەربەخۆیی وەرگیرابوو، پێکدەهات. زمانی ئەم شکایەتانە لە بەلگەناوکانی یاسای بنەرەتی ئەمریکا بوونی بوون. ئەم لێدوانانە یەکەم جار لە «بڕیارنامەی سەنکافالس» ١٨٤٨ کە ئەلیزابێت کوی، ئەستنتۆ و لوکر سیاموت رێکیان خستبوو، باسیکرا. ئەوان جێگریان بۆ خەبەرنامەی سەربەخۆیی بلاو کردەوە کە خەبەرنامەی یەکەمی دێر بە دێر لێکدەداوە، بەلام ژنانی لە بەلگەنامەدا گونجاندبوو. بەرهەمی کار رشتەیەک داخوازی بۆ بەرامبەری خاوەنداریتی و سامان، دەرفەتگەلی فێرکردن و والا بوونی رێگای پیشە بۆ ژنان بوو کە هەموویان بە زمانی مافە سروشتییەکان بەیان کرابوون.[16] دوای کارەساتە مەزنەکەی جەنگی ناوخۆیی ئەمریکا، پیاوانی رەشپێست لە سالی ١٨٦٦ بوونە خاوەن مافی دەنگدان. ئەم رووداوە لەسەر زۆربەی چالاکانی ژن کە بەر لەو لە ماوەی شەری ناوخۆ و پاش ئەو لە رێی مافی دەنگدانی رەشەکان و دژی کۆیلەتی کاریان کردبوو کاردانەوەی بوو و تێگەیشتن کە خەباتی سەرکەوتوانەی ئەوان بۆ مافە سیاسییە سەرەکییەکانی پیاوانی رەش کە لە ژنان بێبەش کرابوو بە راستی کارێکی ناسازگار بووە. بۆ زۆر لەوان دژایەتی کارێکی بەتەواوی ئاشکرا بوو. لە سالی ١٨٧٨ بە دوا هەموو سال «سامان بەخشین یان تەواوکەری نۆزدەهەمین ئانتۆنی» بە کۆنگرەی ئەمریکا پێشکەش دەکرا هەتا ئەوە کە لە سالی ١٩٢٠ قبوول و چەسپێنرا.[17]

شاراوەیە کە زۆربەیان لە چینی مامناوەندی بوون و ژنانیان دنە دەدا کە ـ
چالاکییەکانی وەک میانەڕەوی لە خواردنەوەی مەشرووبە ئەلکولییەکان ـ
کۆنترۆڵی کاری نەگونجاو و ناشایست لەبەرچاوی کۆمەڵگە چالاک بن. ئەم جو ـ
ژنانە ناچار بە هاوکارییە فیکرییە موسەبەتەکانی خۆیان لە لیدوانـ
کۆمەڵایەتییەکاندا بەرفراوان کردەوە. لەگەڵ ئەوەدا، گەشەی پیشەسازی ـ
داهێنان بوو بە هۆ کە ژنانێکی زۆرتر ببنە بەشی وزەی کاری کۆمەڵگە. ئەم کـ ـ
بە تەنیایی سەربەخۆییەکی زۆری بە ژنان بەخشی.

گرنگترین دیاردە لە ئەمریکا تێهەڵچوونی ژنان لە بزاڤەکانی دژی کۆیلایەتی ـ
مافی دەنگدانی لە سەدەی نۆزدەهەم بوو. وتارەکانی ئەم بزاڤانە دژی ـ
دەستنیشان کراوەکان لە یاسای بنەڕەتی ئەمریکا کە لە ڕاگەیەنراوی سەربەخۆی ـ
وەرگیرابوو، پێکدەهات. زمانی ئەم شکایەتانە لە بەڵگەناوکانی یاسای بنەڕەتی
ئەمریکا بوونی بوون. ئەم لێدوانانە یەکەم جار لە «بڕیارنامەی سەنکافالس» ١٨٤٨
کە ئەلیزابێت کوی، ئەستنتۆ و لوکر سیاموت ڕێکیان خستبوو، باسیکرا. ئەو ـ
جێگریان بۆ خەبەرنامەی سەربەخۆیی بلاو کردەوە کە خەبەرنامەی یەکەمی ـ
بە دێڕ لێکدەداوە، بەڵام ژنانی لە بەڵگەنامەدا گونجاندبوو. بەرهەمی کار ڕشتەیەکـ
داخوازی بۆ بەرامبەری خاوەنداریتی و سامان، دەرفەتگەلی فێرکردن و ـ
بوونی ڕێگای پیشە بۆ ژنان بوو کە هەموویان بە زمانی مافە سروشتییەکـ
بەیان کرابوون.[١٦] دوای کارەساتە مەزنەکەی جەنگی ناوخۆیی ئەمریکا، پیاو ـ
ڕەشپێست لە سالی ١٨٦٦ بوونە خاوەن مافی دەنگدان. ئەم ڕووداوە لەسە ـ
زۆربەی چالاکانی ژن کە بەر لەو لە ماوەی شەڕی ناوخۆ و پاش ئەو لە ڕێی
مافی دەنگدانی ڕەشەکان و دژی کۆیلەتی کاریان کردبوو کاردانەوەی بوو ـ
تێگەیشتن کە خەباتی سەرکەوتوانەی ئەوان بۆ مافە سیاسییە سەرەکییەکانی
پیاوانی ڕەش کە لە ژنان بێبەش کرابوو بە ڕاستی کارێکی ناسازگار بووە. بـ
زۆر لەوان دژایەتی کارێکی بەتەواوی ئاشکرا بوو. لە سالی ١٨٧٨ بە دوا هەمو ـ
سال «سامان بەخشین یان تەواوکەری نۆزدەهەمین ئانتونی» بە کۆنگرەی
ئەمریکا پێشکەش دەکرا هەتا ئەوە کە لە سالی ١٩٢٠ قبوول و چەسپێنرا.

پــرۆژەی بەدەســـتهێنانی مـــافی دەنگـــدان لـــە لایـــەن ڕێکخراوەکـــانی وەک ئەنجوومەنی میللی مافی دەنگدانی ژنانی ئەمریکا» کە لە سالی ۱۸۹۰ بۆ چالاکی ە پێناوی بەدەستهێنانی مافی دەنگدان *لە ئاستی فدرالدا پێکهاتبوو*، پشتگری و یارمەتی دەدرا.

لـە دەیـەی ۱۸۳۰ لـە بریتانیـا و فەڕەنـسا، سۆسیالیـستە خەیالـییەکان لـە ڕێبازەکانی سێن سیمۆن و ئەوون مەسەلەی بەرامبەری تەواو و کەمالـی ژنانیـان هێنایـە ئـاراوە. هەڵـبەت ئـەم دۆزە پێـشەکی مـاری ولـستۆن کرافـت باسـی نیوەکردبوو. هەریت تیلور و جان ئەستورات میل هەمیشە لە لێدوانـە گـشتییەکاندا ئەم بابەتەیان دەهێنایە ئاراوە.[18] ژنـان لـە بزاڤـگەلێکی وەک «جـەماوەری یاسـای دژی تایبەتی دانەوێلە»، خەبات بـۆ ریفـۆرمی یاسـای خـاوەنـدارێتی، چـالاکی بـۆ دەستدانی هەلە پیشەییەکان، فێرکردن و پیشە بۆ ژنان سەرقالـی چـالاکی ببـوون. هــەروەها وەکـو ئـەمریکا، چالاکیگـەلی بـەرفراوان لـەکار خێرخوازانـە، کارگـەلی کۆمەلایەتی و چاکسازی ئەخلاقیان لەسەرانسەری سـەدەی نۆزدەهەمـدا ئـەنجام داوە. جگە لە کۆششەکانی هەریت تیلـور و جـان ئیـستورات میـل لـە ناوەڕاسـتی سەدەی نۆزدە، یەکەمین چالاکی مۆئەسیر بۆ ریفۆرمی مـافی دەنگـدانی لـە لایـەن «یەکێتی کۆمەلایەتی و سیاسی ژنان» کە دامەزرێنەری ئەو خانمی پانکورست بوو لە سالی ۱۹۰۳ ئەنجامی گرت.

بەم حالەوە، لەگەل گەیشتنی ژنان بە مافی دەنگدانی لـە دەیـەی ۱۹۲۰، زۆر لـە نووسەرە فەمینیستییەکان، بێجگەلە چـالاکی بـۆ ئاشـتیخوازی، خـولێکی بێـدەنگی وەستانیان بردەسەر. «وەستانی مەزن» و خولـەکانی دوو جـەنگی جیهـانی زۆر لەسەرنج و وزەی ژنانی بەرەوخۆی راکێشا. مەسـەلەگەلێک کـە لـەم خولـەدا لـە ئارادا بوون مەسەلەگەلی ئاسـانکاری ژیـان بـەکردەوە و زوو بـە زوو بـوون کـە بەتایبـەت پـشتگری لـــە تـــاکی بنەمالـــەی دەگرتـــەخۆ. دۆزگـــەلێک لەمـــەڕ بەهرەمەندییـەکانی بنەمالـە، چـاوەدێری تـەواوی پـاک و خـاوێنی و دەرمـانی، خواردەمەنی قوتابخانـەکان و بەرژەوەنـدی بـوونی باخچـەی منـالان لـە دەیـەی ۱۹۳۰ بە تام و چێـژەوە پێـڕەو دەکـران و ڕەنگـە بەشـێک لـە سیاسـەتی گـشتی

ڕێکوپێک لــە بریتانیــای پــاش ١٩٤٥ و لانیکــەم تــا دەیــەی ١٩٨٠ پێکیــان‌هێنــ
سەردەمی پاش جەنگ و بەتایبــەت دەیــەی ١٩٥٠ هــەروەها شــایەدی گەشــەی تــ
ڕادەیەک خێرای ئابوورییەکانی بریتانیا و ئەمریکا بوو. دەرسەدێکی بەرفراوان لـە
جەماوەری هەر دوو وڵات زیـادبوونی ئاسـانکاری ژیانیـان دی. خۆشەویـستی و
یەکترخوازی و یەکێتی سیاسی، هەرەوەزی بەکۆمەڵ لەمەڕ بایەخگەلی لیبرالیزمی
بەکردەوە، لێدوانی «کۆتایی ئیدئۆلۆژی» و بەهێند نەگرتنی سیاسی کارگەلێک بوو
کە لە تایبەتمەندی ئەم دەهە دەدرێنە قەڵەم. مەسەلەکانی پێوەند بە ژنانــەوە هــەتا
ماوەیــەک لــەژێر ڕەنگدانــەوەی مەســەلەگەلی ئاســانکاری ژیــان و ئازادییــەک
وسامانی ماددیدا بوو.

لەسەر بنــەمای زۆربــەی بــەراوردەکان، شــەپۆلی دووەم لــە دەیــەی ١٩٦٠وە
دەستی‌پێکرد. بەڵگەیەکی زۆر بە تەنینەوەی ئەم شەپۆلە فەمینیستییە بوونی هەیە
فێرکردن و پــەروەردەی ژنــان لەسەرانــسەری ئــەورووپا و ئــەمریکا، بەتایبــەت لــە
دەیەی ١٩٤٠ بە شێوەیەکی بەربڵاو گەشەی کـرد. ژنــان بــە جــۆرێکی بــەرفراو
لێهاتوویی چوونە ناو پیشەکان کە لەوەبەر تایبــەت بــە پیــاوان بــوو، بــە دەســتی
هێنا. بێجگەلەمە، هێندێ دەست بە کــار بــوون لــە دەیــەی ١٩٦٠ ـ یاســایی بــوونی
لەبار بردنی منداڵ، دانی هەقدەستی یەکسان بە ژنان و مافی مــەدەنی بەرامبــەر
بەرێنکردنەوە دەرفەتی کۆنترۆڵی لودای کبوونی منــاڵ بەتایبــەت دەرمــان حــەبی
بەرگری لە زگ کردن ـ بە ئازادی هەڵبژاردنی ژنــان لــە پانتــای گــشتی و تایبــەتی
ژیانیان زیاد و بەرین کرد.

نووسراوەکان و ئەدەبیاتێک کە لە بابەتی ژنــان دەدوان، هێــدی هێــدی مــاوەی
ئەم خولە بەرەو بەرفراوانی چوون. کتێبی ڕەگەزی دووەمی سیمۆن دووبوار (کە
لە ١٩٥٢دا بڵاوکرایەوە و پاشان لە ١٩٦١دا بوو بە کتێبێکی بەبرەو) و کتێبی ڕاز و
ڕەمزی ژنانە نووسراوەی بێتی فریدن (١٩٦٥) هەر تەنیا ڕچەشکێنی ئەم ڕووداوە
بــوون. لــە بریتانیــا ئاســەواری ژرمــن گریــر و جولیــت میچــل (بەتایبــەت یەکــەم
فــەمینیزمی گــۆڕی بــە واژەیــەکی بەبــرەو.[١٩] بێجگەلــە بینینــەکان لەمــەڕ ژن و
مێردایەتی، تەڵاق و کاری ژنان لە حاڵی گۆڕانکاریــدا بــوو. هەنووکــە ژنــان پلەپلــە

ـەری مالی، کۆمەلایەتی و ئـەخلاقی لـە پێکهاتـەکانی وەک بنەمالـە سـەربەخۆتر ـوون. لە کۆتاییدا کۆمەڵێک لە ژنان دەسـتیان بـە دابینکـردنی سـەرمایە بـۆ ئـەم گۆرانکاریانە کرد. بەتایبـەت لـە ئـەمریکا، بێجگەلـە ئەنجوومەنـە بەناوبانگـەکان و ـێکهاتەتری وەکو «رێکخراوەی میللی ژنان» تەقینەوەی راستەقینە لـە گروپـەکانی ژنان لە کۆتایی دەیەی ١٩٦٠ و سەرەتای ١٩٧٠ روویدا.

سەرەتای دەیەی ١٩٧٠ بێجگەلە کێشەگەلی مافە رەواکـانی لیـبرالی، شـاهیدی رووداوگەلێکی گرنگتریش بوو. بە رووبەڕووبوونەوەی ئـەزموونی خـەباتی دژی کۆیلـەتی ژنـان لـە سـەدەی نـۆزدەم، کۆمەلـێک لـە ژنـان کـە لـە چالاکییـە مافـە مەدەنییەکان، بزافە دژەجەنگییەکانی ڤیەتنام و ئاشـتی دەیـەی ١٩٦٠ بەشـداریان ـوو، بەرەبـەرە هۆگریـان بـە بۆنەگـەلی جۆراوجـۆر سـەرنجیان دایـە بابەتـە فەمینیستەکان. بەلـگەی لەبـەرتر بـۆ ئـەم گـۆڕینی سـەرنجە، سـەرکوتکراوی لـە «رەگەزخوازی» گروپە مارکسیستییە ـ سۆسیالیستەکان بوو. ژنان لەم گروپانـەدا زۆرجـار هەسـتیان دەکـرد کـە پیـاوان بـێبایـەخیان کـردوون و دەوری ئـەوان بەکارگەلی پشتگری و پالپشتی کەم و بێرەونەق بووەتەوە. لە ئەمریکا پرەنسیپی ئازادیخوازانەی رادیکال شێوەی زیندووتر و بەشـەوقتری بـە خۆیـەوە بـینی. لـە ئەوروپا پێکهێنەری سۆسیالیستی نمایەکی بەرچاوتری بەخۆوە بینی.

لە دوو دەیەی دوایدا نەک هـەر تـەنیا بزافـی فەمینیـستی بـە شـێوەی بـەربلاو گەشـەی کـردووە، بەلـکو ئـەدەبیاتی بەسـراو بەویشەوە گەشـە و بـەرفراوانی بالاکردنی هەیە. هێندێ لە رۆژنامەکان و بلاوکراوەی ژنانی هاتوونەتە بـازارەوە. بەم حالەوە، بەپێچەوانە پایەداری فیکری و بەکردەوە ئەم بزافـە دەیـەی ١٩٨٠ بـۆ بزووتنەوەی فەمینیزم دەیەیەکی دژوار دەدرێتـە قەلـەم. هەلـبەت ئـەو جـۆرە کـە وترا، ئەدەبیاتی گرێدراو بەوانەوە، گەشەی کردووە، رشتەگەلی موتـالاتی بەشـی ژنـان لـە فێرکـردنی بـالا پـشکوتووە و زانیـاری بـە بابـەتی ژنـان بێپـسانەوە رووبەڕووی زیادبوونە. بەم حالەوە، دەیـەی ١٩٨٠ شـاهیدی هەسـتانی «راسـتی نـوێ» لـە ئـەوروپا و ئـەمریکا و تەئکیـدی دووبـارە لەسـەر بایـەخی بنەمالـەی بـاوکسـالاری سـوننەتی، هێـرش بـە یاسـای لـە بـاربردنی منـدال و مافـە

مەدەنییەکانیش کراوە. بێجگەلەمە، لەم دەیەدا بێکاری روو لە زیادبوونە. ئەم کارە زۆرتر لەسەر ژنان رەنگدانەوەی بووە. راستی نوێ هۆگرییەکی ئەوتۆی بە بزاڤی فەمینیستی نییە. ئیمکانی هۆگرییەکی ئەوتۆ لە باڵی بازارخوازی راستی نوێ بوونی هەیە، بەڵام گەرایشە سۆسیالیستی و لیبراڵە چەپەکانی بزاڤی فەمینیستی ئەم کردەوە رەتدەکەنەوە. سەرەنجام ئەمە کە کۆتایی دەیەی ١٩٨٠ و سەرەتای ١٩٩٠ شاهیدی گۆڕینی لیبراوانی هۆگری فیکری لە بزاڤی فەمینیستی لە بابەتە سیاسی و ئابوورییەکانەوە بەرەو کەلتووری، دەروونناسی و زمانناسی بووە بیرمەندێک لەمەڕ ئەم بابەتە لەم ساڵانەی دوایدا بەتایبەت لەگەڵ نشاندانی هۆگری لە نووسراوەکانی فەمینیستی فەرەنسەوی پۆست پێکهاتەخوازی و روانگەی رووخاندن، زۆر گەشەی کردوە. بەڵام ئەم برە زۆرەی روانگەی ئاکادیمیکە بە شێوەیەکی دژبەیەک لە سەرەتای دەیەی ١٩٩٠ لەگەڵ زیاد بوونی مەسەلەگەی کۆمەڵایەتی و ئابووری بۆ هەژاران، کەمینە قەومییەکان و بۆ ژنان جیهانی سێیەم یەکی گرتووە.

## جەوهەری فەمینیزم

فەمینیزم، وەکو هەموو ئەو ئیدئۆلۆژیانەی کە هەتا ئێستە تاوتوێمان کردووە لەژێر کاریگەری هێندێ سوننەتگەلی مێژوویدا بووە و لەگەڵ برێک لە ئیدئۆلۆژییەکانی دیکە تێکەڵی و هاوکات لێکدراوە. تەئکیدی سەردەمی رۆشنبیری لەسەر زمانی عەقڵ، هێرش بە پڕوپووچ، شتگەلی حەرامکراو و پێشداوەری و باوەڕخوازی، لەژێر کاریگەری ناوەڕۆکی دزەکردندا بوون. ئەزموونی شۆڕشی فەرەنسا و وتاری بەتوانا لەمەڕ مافە دێموکراتیکەکانیش بۆ قۆناخە سەرەتایەکانی باوەڕی فەمینیستی حەیاتی بووە. کاریگەرییەتی پرۆتێستانیزم بۆ هاندانی زۆر لە ژنان بەرەو چالاکی کۆمەڵایەتی و تێهەڵچوون بە بابەتە کۆمەڵایەتی سیاسەکان زۆر گرنگ بووە. خوداپەرستان بەتایبەت رۆڵی ژنانیان لە باوەڕەکانی خۆیاندا ئاماژەیان پێداوە. کاریگەریەتی سۆسیالیستە خەیاڵییەکانی سەرەتایش گرنگ بوو، بەتایبەت پێڕەوانی سێن سیمۆن، شارل

ۆریە و رابێرت ئەوون، کە هەموو ئەوانە هەرکام بە میتۆدی خۆیان هێرشیان بە یکهێنانی بنەماڵەی کاکڵەیی بورژوای دەکرد، خوازیاری پێشکەوتی بەرامبەری ژنان بوون و لایەنگریان لە پێوەندی رەگەزی ئازادتر و پارێزگاری کۆمەڵگە لە مندالان دەکرد.

جیا کردنەوە و هاوێرکردنی کۆمەڵێک لە پرەنسیپی پایەدا، بێجگە لەوەی بە مانای زۆر ئاسایی، لە بزاڤی فەمینیستیدا دژوارە. زۆر لە پرەنسیپە دوولایەنەکان، و زۆرجار دژی یەکتر کە دەتوانین لە ئیدئۆلۆژییەکانی وەک سۆسیالیزمدا ببینین، ە فەمینیزمیشدا هەڵگری بینینە. فەمینیزم بە رێبازە فیکرییە جیاوازەکان بەشکراوە کە زۆرجار رەنگدانەوەی تەئکیدەکان و باوەرگەلی زۆر جیاوازن. هێندێ لە فەمینیستەکان ناخۆشحاڵی خۆیان لەم بەربلاویە دەربڕیوە. هەرچەند ئەم ناڕەزامەندییە بێسوود دێتەبەرچاو. بۆ وێنە رۆزالیند دلمار دەڵێ ئەمە وەک « هێماگەلێکی نەخۆشی سەختی [ئەسکلروز] لە بزاڤ دایە».[21] ئەم ئەسکلروزە ئەگەر بەڕاستی ئەسکلروز بێ، بەشێک لە سەختی ئیدئۆلۆژی سەدەکانی نۆزدە و بیست دەدرێتە قەڵەم.

رێبازە سەرەکییەکانی فەمینیزم تا رادەیەک پێگەی سوننەتیان بە دەستهێناوە. فەمینیزمی لیبرال، فەمینیزم مارکسیست ـ سۆسیالیست و فەمینیزم رادیکاڵ سێ رێبازی بنەڕەتین کە هەمیشە زۆرتر لە هەموو باس لەوانە دەکرێ. هەنووکە عاقلانە ئەوەیە کە روانگەگەلێکی نوێتری فەمینیستە پۆستمودێرنەکان بە شێوەی مەقوولەیەکی جیاوازانە بگرینە بەرچاو، هۆی ئەم کارە تا رادەیەک ئەمەیە کە ئەوانە لە دەیەی رابردوودا هۆگرییەکی زۆریان بەرەو خۆیان راکێشاوە.

بەپێچەوانەی لەبەر بوونی ئاستی ئەم رێبازانە، لە پەراوێزی بزاڤدا بەتەواوی رێنوێنی کراوە کە دەبێ پرەنسیپێکی دیکەش بەرچاو بگیرێ. فەمینیستە رەشپێستەکان سەبارەت بە رێبازەکانی دیکە کێشەی سەربەخۆییان هەیە و بەڵگەی ئەوان ئەمەیە کە کۆماکۆی ئەوان «نژادکوێر» بوونیانە. فەمینیستە ئانارشیستەکانیش جیاوازی تاقە بوونی خۆیان پاراستووە و بەڵگەیەکی قابیلی قبوولی ئانارشیزمی دژی دەسەلاتداریان کردووەتە پالپشتی خۆیان. پرەنسیپی

زۆر نزیک بە ئانارشیزم، مەکتەبی ئێکۆفەمینیزمە بەتایبەت لە ئەمریکا کە لە ئاسەواری نووسەرانێکی وەک کارۆلین مەرچانت و دوولورس لاشاپل رەنگی داوەتەوە.[٢٢] بە بۆچوونی ئەوان سیستەمی پیاوسالاری هاوکات لەگەڵ تەقینەوەی پیسبوونی زەوی بووە، ئێستە ئەوە کە ژنان سەبارەت بە سروشت و زەوی هەستیان بە نگەرانی و بەرپرسایەتی دەکرد. سەرەنجام لێدوانە نوێکان لەمە «ئەندێشەی دایکایەتی» و «ئەخلاقی ئاگا لێبوون لە منداڵ» هاتووەتە ئاراوە کە دابەشکاری و وتار هەڵبەستن لەوانە دژوارە. کەسانێکیش هەن کە «فەمینیزمی مەدەنی» لە رووبەرووی «فەمینیزمی دایکانە» دادەنێن. هێندێ لایەنی فەمینیزمی دایکانە شێوەی «فەمینیزمی پارێزگاری لایەنگری بنەماڵە»ی بە دەس هێناوە. لەو بارەوە، لە کۆتایی ئەم بەشەدا بەکۆمەڵ ئاخاوتنیان لەسەر دەکەین.

هەنووکە لەگەڵ برێک جیا کردنەوە دەست بە تاوتوێ کردنی رێبازە جۆراوجۆرەکان دەکەین. فەمینیزمی لیبرال بەکردەوە کاریگەرترین و «لە ئاستی خاوەن بەڵگەترین شێوەی فەمینیزم، ئەگەرچی رەخنەیەک کە لێرەدا دێتە ئاراوە ئەوەیە کە لەم رێبازە بە جۆراوجۆری ئەندێشەی لیبرالی سەرنجی تەواو نەدراوە زۆرجار یەکگرتوویەکی گریمانە لەباری باوەڕی لەمەڕ لیبرالیزم بوونی هەیە.

زمانی لیبرالیزم چەور و شیرینییەکی هەمیشەیی بۆ فەمینیستەکان هەیە بەتایبەت زمانی گرێبەستی و مافەکان کە چەکێکی بەهێزە بۆ کەلک وەرگرتن لە بە سوننەتەکانی پیاوسالاری دەدرێتە قەڵەم. لیبرالەکان بەهەر حاڵ لایەنگری بایەخە عەقڵخوازییەکان، یەکسانی، ئازادی، تاکخوازی، لەگەڵ ئەوانە برێک باوەڕی بەبڕشت لەمەڕ بایەخی خاوەنداریێتی تاک، دەسەلاتی فێر کردن و پەروەردە دیموکراسی پەرلەمانی و ئیمکانی ریفۆرماتی یاسایی عەقلانی هەن. هەروەها ئەگەر کەسێک سەرنج بداتە باوەڕە سەرەکییەکانی دیکەی ئەندیشەی لیبرالی کلاسیک کە ئابووری ئازادە، ئاشکرایە کە هەموو (چاوپۆشی لە رەگەزیەتی) دەبی لە دەرفەتی پێشبڕکێی بەرامبەر لە بازاڕ بەهرەمەند بن. ئینحسادەکان، چ ئەهلی، چ گشتی و چ رەگەزی، لەبنەڕەتدا گومانلێکراون. ئینحسادی ناپەسندی پیاو وەکو هەر چەشنە کارتێلێکی ئابووری لەگەڵ نەبوونی سەلماندنی مەنتقی

ـڕ نگـەی بـازاڕ ڕووبـەڕوو دەبێتـەوە. بـازاڕە ئازادەکـان هەڵـگری بـوونی تاکـە ـ ـ ادەکـان لەگـەڵ ئەوانـە ژنـانن کـە دەتـوانن بـۆ بەرامبـەری پێشبڕکێ بکـەن.
ـــوەرۆکی ســەرمایەداری ئاشــکرای فەمینیــستی بەڕاســتی لــەم ئیدئۆلۆژییــەدا پەروەردە نەکراوە، بەتایبەت و بێگومان نە بە رادەی ئەوەی کـە لەسـەرمایەدار و ـ ـڕیزگار، سۆسیالیزمی بازاڕ، سەرمایەداری سەوز لـە دەیـەی دوایـدا پـەروەردە کراوە. مەسەلەی سـەرەوە هـەتا رادەیـەک هەڵقولاوە لـەم راسـتییە کـە زۆر لـە ەمینیـستەکان لــە چۆنیەتییــەکانی بــازاڕی پێــشبڕکێ، تــاکخوازی و پاراســتنی ـەرژەوەندی لەگەڵ پیاوان هاوبەشیان کردووە.

نووسەرانی فەمینیـست سۆسیالیـست، فەمینیـست رادیکـاڵ لەمـەڕ داهـاتووی ـەمینیزم لیـبرال کـەمتر گەشـبینن و ناڕەزامەنـدیان لـەوە هەیـە کـە ئـەو جـۆرە یبرالیزم لە ناخی ئێمەدا ریشەی داکوتاوە کە بەکردەوە نایێتە بەرچاو. هێنـدێ لـە ووسەران، لیبرالیزمیان بە «ئیدئۆلۆژی تایبەتی پێڕەوی پـشتگری و بـەهێزکردنی پیوەندی پیاوسالاری و کۆمەڵگەی سەرمایەداریان» زانیوە.[23]

سوننەتی لیبرالی، لە شێوەیەکەدا سەرنج بدرێتە سەرەتای ئەو، رێ بو هێنـدێ ڕەخنەگەلی فەمینیستی، بەتایبەت لە قاڵبی قەراردادی کۆمەڵایەتی، خـۆش دەکـا.[24] سوننەتی قەراردادی کۆمەڵایەتی بۆ وێنە لە تامس هابز، بوونـەوەری مرۆڤـایەتی هۆکارە سەرکێیەکانی ئەوان بێبەش دەکا هەتا تەسـویرێک لـە نـەتـەوە یـان وڵات پێکبێنێ. تەسویری مرۆڤی نەخولقاو لەئەسڵدا «بـێ‌ڕەگـەزییـەت» یـان بـێ‌جنسە. ئاماژەی دوایی هابز بە بنەماڵە، دەسەڵاتداری بـاوک و فەرمانـڕەوایی پیـاوان، بـۆ زۆر لە تۆژەرانی فەمینیست وتراوەیەکی ناپەسند بە بەڵگە دەدرێتە قەڵەم. بەڵگەی قەراردادی کۆمەڵایەتی مەگەر ئەوە کە داب و نەریت لـەودا درزە بکـا، ئامێرێـک بـۆ وتووێژ لەمەڕ یەکسانی مرۆڤایەتی پێکبێنێ. نووسەرانی گرێبەستی کۆمەڵایـەتی، وەک لاک، هێرش دەکاتەسەر هەقی ئیلاهی و روانگەی پیاوسالاری. بە شێوەیەکی شاراوە تەنینەوەیەکی مەنتقی ڕەخنە لە پیاوسـالاری لـە دەسـەڵاتـداری سیاسـی، ڕەخنــە گــرتن لــە دەروونی بنەماڵــەدا بــوونی هەیــە.[25] جـان لاک هــەرگیز ئــەم هەنگاوەی هەڵنەهێناوە، ئەگەرچی ئەم چەمکە بـە شـێوەی دەروونی لـە ڕێنـوێنی

ئەودا بوونی بوو. باوەڕە گرێبەستکراوەکانی بە قەراردادی کۆمەڵایەتییەوە ڕێگە بۆ دۆزی ئازادی جیاوازانە و تاکە بەرامبەرەکان، بێ ئاوڕ دانەوە لە ژن یان پیاو بوونی ئەوان، خۆش دەکا. سەرەنجام ئەمە کە ئەندیشەی سیاسی ڕوانگەی قەرارداد لەسەر بنەماکانی عەقڵ دروستکراوە نەک لەسەر داب و نەریت و سوننەت. دیسان ئەم پێناسە لار و لەنجەیەکی شاراوەیە بۆ «سیستەمی سروشت گریمانە یان پیاوسالارییە. جگە لە برێک لە تایبەتمەندیەکان، زۆربەی بیرمەندانی لیبرال ئەم کارە شاراوەیان لە سەرەتاوە بە هێند نەگرتووە.[٢٦]

دیل ئەسپێندر لە کتێبی ژنانی دۆزەکان ناو لە ژنانی نووسەر دەبا کە سەدەی نۆزدەهەم ڕێیان بۆ لیبرالیزم کردووەتەوە و لە بواری لیبرالیدا گەڕو ئەگەرچی کاری ئەوان بە رادەی ماری وولسۆن کرافت ڕێکوپێک نەبووە دەکرێ لەگەڵ فەمینیستە لیبراڵەکان بە هەریت تایلۆر، جان ستوارت میل، مارگارێت فولێر، هەریت مارتینۆ ـ لەگەڵ چالاکانی ئەمریکا، وەکو لوکر سیاموت و ئەلیزابێت کدی ئەستنتۆن ـ ئاماژە بەوانیش بکرێ. لە دەیەکانی پاش ١٩٤٥ یەکێ لەو کتێبانەی کە زۆرترین هۆگری بە لای لیبراڵەکانەوە لە ماوەی قۆناخی دەستپێکی شەپۆلی دووەم پێکهێنا، کتێبی ڕەمز و ڕازی ژنانە، نووسراوەی بێتی فریدن بوو.

بەر لەوە کە لە بارەی کۆماکۆی ڕێبازەکانی فەمینیزمەوە بدوێین، گرنگە سەرنج بۆ ئەم ڕاستییە ڕابکێشین کە جیاوازی و جۆراوجۆرێکی زۆر لە دەروونی باوەڕی لیبرالدا بوونی بووە. گرنگترینی ئەوانە لە فەمینیزمی لیبرالی سەرەتایی جیاوازی نێوان مافە سروشتییەکان و باوەڕی فایدە (بەرژەوەند)باوەڕانە بوو کە لە هێندێ لایەنەوە هەڵگری ئاشتی نەبوون. ئەم خاڵە باوەڕە لیبرالییەکانی جۆن ستوارت میل و ماری ولستۆن کرافت لە یەک هاوێر دەکا. ئەو جۆرە کە لە بەشی دووەمدا گوتمان، نووسەرانی فەمینیست لە پێوەندی لەگەڵ جۆراوجۆرەکی دوای لیبرالیزم لە سەدەی بیستەمدا بە شێوەی لێبڕاوانە توێژینەوەیان لەسەر نەکردووە. لیبرالیزمی کۆمەڵایەتی ئیلهام گرتوو لە ڕوالیز کە بە لای فەمینیستە لیبراڵە نوێکانەوە وەکو جانت ڕادکلیف ڕیچاردز و سوزان مولێر ئوکین دەبینین،

ههمان راده لهگهڵ مافه سروشتییهکان و لیبرالیزمی سوودخوازی ولستۆن کرافت و جان ستوارت میل جیاوازی ههیه که لهگهڵ لیبرالیزمی فۆن هایک ههیهتی.[٢٨]

گهوره ڕێبازی دووهم، فهمینیزم سۆسیالیسته. لهگهڵ بوونی جیاوازیگهلێک که جاروبار له کاکڵهی نێوان فهمینیزم سۆسیالیستی و فهمینیزم مارکسیستی دانراوه، مارکسیزم وهکو جۆرێک له سۆسیالیزم مامهڵهی لهگهڵ کراوه. ئهو جۆره کـه لـه بهشی چوارهمدا بهیان کرا، مارکسیزم لهسهر داهاتوو یـان بهرهـهمی سۆسـیالیزم ییه. نـاوهڕۆکێکی فهمینیـستی بـههێز لـه زۆر لـه نووسـراوهکانی سۆسیالیـسته سهرهتاییهکاندا بـۆ وێنـه فهوریـه، سـێن سـیمۆنهکان «نـهک سـێن سـیمۆن خـۆی ڕاستهوخۆ». رابێرت ئوون، ویلیام تامسۆن و. ئان هیلر بـوونی ههیـه. لـه کۆتـایی سهدهی نۆزدهههم و سهرهتای سهدهی بیستهمدا، فریـدریش ئیـنگلس، ئاوگوست بێل، ئهلکساندرا کولونتاری و کلارا زتکینیش لهم بوارهدا بهشداری را و بۆچوونی گرنگیان بووه.

ههم فهوریه و ههم سێن سیمۆنهکان گهیشتن بـه سۆسـیالیزم هاوکـات لهگـهڵ بهرامبهری وئازادی ژنان به ئاسانیان دهزانی. دهربـارهی سـێن سـیمۆنهکان ئـهم خالـه لهگـهڵ پهرسـتنی «دایهگـهوره» پێوهنـدی بـوو کـه بـه چـاوی نهجاتـدهری بهڵێنپێداوی مرۆڤایهتی سهیر دهکرا.[٢٩]

بهلای فهوریهوه، دهبێ ژنان له شاری خهیالی ئهو یان فالانستری له مافه تهواو و کهمالـهکانی بهرامبـهری پیـاوان بههرهمهنـد بـن. هـهم فهوریـه و هـهم سـێن سیمۆنهکان ئێزدیواجیان به کۆنه و له باوکهوتوو دهزانی. بهتایبـهت لـه روانگـهی فهورییهوه، عهشقی ئازاد، دوورهگهزخوازی، هاورهرهگـهز خـوازی ژنـان و چهنـد هاوسهری له ناکوێ ئـاوای ئـهو دنـه دهدرا. ئـهو هـهروهها لایـهنگری چێشتخانه گشتیهکان، ماڵداری شـهریکی و پهروهردهی شهریکایهتی منداڵان بوو.

ئوون، ئهگهرچی هۆگری تاقیکردنهوهی ئاشقانهی فهوریه نـهبوو، لـه رووداوی رهخنهیهک که له پێوهندی ههڵوهشـانهوهی ژن و مێردایـهتی بـوو. بـه بۆچـوونی ئوون، ئیزدیواج دیاری دهستکردی لهسهر ههستی سروشتی بوو که هۆی بههاتنی گوناهکـاری و تـاوان و حـهرام بـوو و نایهکـسانی کۆمهلایـهتی و هـهژاری

لێدەکەوتەوە. لەراستیدا هەر سێ نەهامەتی لە زێهنی ئەودا بە یەکەوە گرێبەست
کرابوون. مەزەب هۆکار بوو بۆ پایەداری ئیزدیواج و ئەم کارەش بەش بە حەقی
خۆی پێشبڕکێی ئابووری هان دەدا کە سەری لە هەژاری دەردەهێنا. لەراستیدا
ئوون بۆ ئەوەی ژنان بەسەر پیاواندا لە بەباری تواناییەوە، زاڵبن، بە باوەڕی
دڵسۆزی بۆ دەکرد. ئەو هەروەها وەک فەوریە بە فێرکردن و پەروەردەی
هاوبەش، خواردن و پارێزگاری لە منداڵان لە دەروونی پێکهاتە هاوبەشی
بەرهەمهێنانی هاوبەش لە باوەڕی خۆیدا رەنگدانەوەی بوو.

یەکێک لە ستایشگەرانی ئوون بە ناوی ویلیام تامسۆن (١٨٣٥ــ١٧٨٥) پاش
خوێندنەوەی چەند دێڕ لە کتێبی رەسالەیەک لەمەڕ حکوومەت نووسراوەی جیمز
میل، دنە درا کە راستەوخۆ لەمەڕ ژنان چەمکێک بنووسێ. میل لەمەڕ مافی رەنی
بەرژەوەندی ژنانی لە بەرژەوەندی پیاواندا گونجاندبوو. تامسۆن تێکۆشا تاکو
کارگەلێکی وەکو بانگهێشت لە نیوە لە نژادی مرۆڤایەتی واتە ژنان، دژی
کێشەکانی نیوەکەی تری، واتە پیاوان دەستنیشان بکا کە ژنان دەبێ مافەکانی
لەگەڵ پیاوان یەکسان بێ. کۆماکۆی مرۆڤەکان بە جۆرێکی بەرامبەر شێوەی
بەختەوەری بوون لە کۆمەڵگەی سۆسیالیستی هەرەوەزی داهاتوویان بوو. ئەو
هەروەها بنەماڵەی تاکهاوسەری و کاری دابەشکراوی مەوجوودی بۆ بەردەنگ
بوونەوە خواست. ناوەرۆکگەلێکی ئەوتۆ لە نووسراوەکانی ئان هیلێردا باسی
ئەگەرچی ئەم خانمە راستەوخۆ لەژێر کارتێکەری لایەنگرانی سێن سیمۆندا بوو.

مارکس ئینگلس لە ئاسەوارە سەرەتایەکانی خۆیاندا کەمتر لەمەڕ ژنان
ئاخاوتنیان بووە. بەرواڵەت مارکس وای دادەنا کە ژنان لە سیستەمی
سۆسیالیستیدا ئازاد دەبن. ئەو لە بابەتێکی خۆیدا بە ناوی «لەمەڕ مەسەلەی
جوولەکە» ئازادی ژنانی بە بەشێک لە رزگاری مرۆڤایەتی دەزانی.

لە راستیدا زۆر لە دۆزەکانی مارکس و ئینگلس لەمەڕ ژنان لە سۆسیالیستە
خەیاڵییەکان جیا کرابوونەوە. بە ئاسەواری ئینگلس، بەتایبەت واتای ماتریالیستی
مێژوویی زیاد کراوە، ئەو جەوهەری مرۆڤ بە کار دەزانێ. ئینگلس هەروەها
باوەڕی هەیە کە بنەماڵە تاقانەی کۆمەڵگەیە و کاری ناوماڵ و بارودۆخی ژنان لە

ـەروونی بنەماڵەدا لە بناخەوە بەشێک لە سروشت نییە بەڵکو زۆرتر هەڵقولاوە لە کەش و هەوای گۆڕانکار، مێژوویی و ماددی، کار و جەوهەری ماڵکییتە. باوەڕ و بیری سەرەکی ئەمە بوو کە زوڵم لەسەر ژنان ریشەی لە مەنتقی دژی سەرمایەداری و خاوەندارێتی تایبەتیدا بوو، هەرچەند کە ئینگلس ئەگەر و گریمانی چارەنووسی دابەشکردنی کاری سروشتی هێنا ئاراوە کە زۆربەی فەمینیستەکانی دوایی سەرنجیان لەسەر ئەوە بوو. ئینگلس بە پێچەوانەی مارکس ئەم دۆزانەی لە ئاسەوارە بەناوبانگەکەی خۆیدا بە ناوی سەرچاوەی بنەماڵە، خاوەندارێتی تایبەتی و دەوڵەتی بەرفراوان کردەوە.

ئاگوست ببل (١٩١٣ـ١٨٤٠)، کەسایەتی بەرچاو و لە دامەزرێنەرانی حزبی سۆسیال دێموکراتی ئەڵمان، تەقریبەن هەر ئەو شوێنەی ئینگلسی رەچاو کرد، بەلام کتێبی ئەو بەناوی ژنان لە سیستەمی سۆسیالیزم، لە کاتی بلاوبوونەوەیدا لەگەڵ پێشوازی بەگوڕیگشتی رووبەڕوو بۆوە.[21] ببل، بەپێچەوانەی هۆگرییەک کە بە جان ستوارت و ماری ولستۆن کرافتی بوو، رێنوێنی دەکرد کە چاکسازی لیبرالی بورژوایی لە کۆتایدا بێکاردانەوە دەبێ.[22] ببل هەوڵی دا بیخاتەڕوو کە هۆکارە ئابوورییەکانی بەردی بناخەی نابەرامبەری کۆمەڵگە و یاسایی.. لە ژن و مێردایەتی بورژوایی، خاوەندارێتی تایبەتی کارێکی سەرەکییە. بە بۆچوونی ببل، ژنان خەیاڵیان بو کە هەم لە خاوەندارێتی بورژوایی و هەم لە لفە و دوانەکەی واتە کۆیلەتی ماڵەوە رزگاریان بێ. بێجگەلەمە، ئەوان بۆ بە دەستهێنانی ئازادی راستەقینە دەبوایە خۆ بە خەبات و بەرخودانی مێژوویی پرۆلیتاریا بسپێرن. هەر ئەو جۆرە کە کۆمەڵێک توێژەران گوتوویانە، دەستکەوتی تیرامانی کۆتایی ببل خەیالیتر لە ئینگلسە. لەراستیدا ببل هەر ئەو فەورییەیە، ببێ لایەنە هەوەس بازیەکانی ئەو. ببل لە ناخەوە لەژێر کاریگەری پێشانگای ساڵی ١٨٩٢ی شیکاگۆ، بەتایبەت دەزگاگەلی کارەبایی چێشتخانە و ئامێرە ناوماڵییەکاندا بوو کە لە کاتیان دەگێڕاوە و پاشەکەوتەیان کرد. باشترین ئارەزووی ئەو پێکهێنانی کۆمەڵگە لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی بوو کە لە کاتی بێکاری زۆردا، هونەر و زانست، خواردەمەنی هەرزان، سەفەری هەوایی و ئامێرە فراوانە کارەبایەکان بەهرەمەند

بێ. پەروەردەی منداڵان دەبێ بە ئەستۆی کۆمەڵگە بێ. لەگەڵ ئەمەدا، پێوەندی تاکهاوسەری ئەگەر لەسەر بنەمای هەڵبژاردنی ئازاد و عەشق ئەنجامی دەگرت دەیتوانی هەر بمێنێ.

ئەلکساندرا کولونتای، کلارا زتکین و شارلوت پرکینز گیلمەن لە سەدەی بیستەمدا هەر ئەو چوارچێوە فیکرییە مارکسیستییەیان بەرین کردەوە، بەتایبەت کولونتای کە لەناو جەرگەی شۆڕشی رووسیەدا کاری دەکرد. پلەپلە لێکدانەوەی سوننەتی سۆسیالیستی لەمەڕ رۆڵی ژنان، لە ١٩٢٠ هەتا کۆتایی دەیەی ١٩٥٠ لە دەروونی پلانی سۆسیالیزمی خەیاڵی یان مارکسیستدا جێیان کردەوە. کۆتایی دەیەی ١٩٦٠ و سەرەتای دەیەی ١٩٧٠ هەتا رادەیەک شاهیدی نکولی ئەم قالبە کەونە، بەتایبەت نکولی روانگەکانی ئینگلس بوو و زۆرتر دەیهەویست فەمینیزمی سۆسیالیستی نوێ دامەزرێنێ. هەڵوێستی دێرینی مارکس و ئینگلس وا دەهاتە بەرچاو کە دووچاری «کوێررەگەزی» بووە. بەم حاڵەوە ئەم بزاڤە زۆر لە قۆناخی بۆچوونی رەتکردنەوەی سوننەتی مارکسیستی دوورنەکەوتەوە. ئالیسۆن جاگار لەم بارەوە دەڵێ: «فەمینیزمی سۆسیالیستی گەرایشێکی زۆر تازەیە هێشتا بەتەواوی چ لەباری کردەوە و چ بۆچوونییەوە پەرەی نەگرتووە. بەم هۆیە کەس ناتوانێ بۆ کوێی روانگەی سیستماتیکی مەوجوود بگەڕێتەوە.... بەجێی ئەو دەبێ هەوڵ بدرێ هەتا لەم لەت و کوتی و کوتوپچڕی لێرە و لەوێ روانگەیەکی سستماتیک جیا بکرێتەوە.[٣٣]

مەکتەبی فەمینیزمی رادیکاڵ بێگومان زۆرتر لە ئەمریکا پەرەی گرتووە. ئەم رێبازە هێرشگەلێکی کردووەتە سەر فەمینیزمی ئەورووپایی. ئەگەرچی هێندێ کەس هێشتا تێدەکۆشن ئەوە بە دروستکراوەیەکی گەورەی «شەپۆلی دووەم» بزانن، فەمینیزمی رادیکاڵ لە کۆتایی دەیەی ١٩٦٠ و سەرەتای دەیەی ١٩٧٠ فۆرمی گرت. وشەکە خۆی مانای ناپەیەداری بوو. هێندێ ئەوەیان بەهیوای گەورە فەمینیزم و برێکی دیکەی وەک بتی فریدن، ئەوەیان بە پاژنەی ئاشێل دەزانی. توندڕۆکانی بەرواڵەت رادیکاڵیزم بە شێوەی خۆنیشاندان لە بەرامبەری ئەندێشەی سیاسی باڵی راست لە دەیەی ١٩٨٠ مامەڵەیان لەگەڵ دەکرا، هەرچەند

ڕیشەگەلی رادیکالیزم لە راستیدا بۆ سەرهەلدانی دیاردەی «چەپی نوێ» دەگەڕاوە.

فەمینیزمی رادیکال تەقریبەن بزاڤێکی نوخبەخوازە کە بە وتە ئالیسۆن جاگار «لە ئەزموونە تایبەتییەکانی گروپێکی تا رادەیەک بچووکی ژنانی سپیپێستی ئەمریکایی، چینی مام ناوەندی زانکۆدیدە» ترووسکەی داوەتەوە.[٣٤] ئەم نوخبەخوازییە سەرسووڕهێنەرە فیکرییە جارجارێک، زۆر لە ژنانی لەگەڵ دۆزەکانی فەمینیزمی رادیکال بێگانە کردووە. لە سەرەتادا رادیکالیزم لە رەخنەی چزوەداری پێوەندی لەگەڵ مارکسیزم لە کۆتایی دەیەی ١٩٦٠ سەرچاوەی گرت. بە مانایەک، ئەم رێبازە بە پێناسی نەفی چەپی نوێی مارکسیستی رادیکالەکان بەتوندوتیژییەکی زۆرترەوە لە فەمینیستە سۆسیالیستەکانی دەیەی ١٩٧٠، بەلگەیان دەهێناوە کە مارکسیزم «کوێررەگەز» بووە. بەم حالەوە بەلگەکانی ئەوانەش هەم لەسەر بنەمای دەروون توێژی رادیکالیزەی فرۆیدی بوو و هەم لە شێوەی روانگەی کۆمەلایەتی کە لە نووسەرانی «چەپی نوێ» وەکو ویلهێلم رایش و هێربێرت مارکووزە، بوونی بوو، کەکلی وەردەگرت.[٣٥]

بەیان کردنی ئەمە کە ئایا روانگەی راشکاو و روون لە رێبازی رادیکالدا بوونی هەیە یان نا، دژوارە. جاگار دەلێ: فەمینیزمە رادیکالەکان «بە هۆی روانگەی سیاسی، سیستماتیک و ئاشکرا ناس ناکرێن».[٣٦] خوێنەرانی ئەدەبیاتی رادیکالی لە ماوەی دوو دەیەی رابردوودا لەگەل هەموو شتێک لە گومانی بووداکیشەوە بگرە هەتا ئەستێرەبێژان رووبەڕوو دەبنەوە. لە وەها کەش و هەوایەکدا دۆزینەوەی جەمسەری مەنتقی دۆزەکان ئەستەمە. دوو بەلگەی سەرەکی بۆ ئەم کارە بوونی هەیە. لە ناخی ئەندێشەی فەمینیزمی رادیکالدا یەکگرتوویی عەقلانی خۆی لەبەر هەڕەشەی لێداونە رەخنەیەکان دایە. گوتراوە کە عەقلانییەتی دکارتی رەنگە لایەنی دیکەی لە زالی پیاوانەیە.[٣٧] گومانە کە بتوانین بایەخەکانی ناوەندی فەمینیزمی رادیکال پێناسە بکەین؛ روانگەگەلی بەتەواو مانا جیاواز و قوولە ناوهاوکێشەکانی دەروونی ئەم رێبازە بەیان کراوە.

بەپێچەوانەی ئەم شاراوەیە هێندێ تایبەتمەندی هەن کە کەوتنە بەر سەرنجی چاودێران، دژەکان و رەخنەگران لە فەمینیزمی رادیکال. زۆر لە رادیکاڵەکان، بەپێچەوانەی فەمینیستە سۆسیالیستەکان، دۆزەکانی خۆی بە شێوەی نامێژوویی یان بەرەو مێژوویی و جیهانبینی بەیانیان کردووە کە زۆربە لە ئەندێشەکانی ئەوان ریشەی لە ئیدئۆلۆژی و دەروونناسیدا هەیە. ئەوان زۆرجار دەڵێن کە تایبەتمەندییەکانی «بنەمایی» بۆ هەموو ژنان بوونیان هەیە. جگەلەمە، دەربارەی رەگەزییەکان و چینایەتییە نگەران و دڵ لە دوای فەمینیستە سۆسیالیستەکان نین. ئەم خاڵە بە کردەوە لە نووسراوەکانی ئەواندا شاراوەیە. ئەم گروپە لە چاو قەوارەی گچکەی خۆی، بە هۆی بیێچانەوە و راستبێژییەکانی خۆی لەوانەیە ناوبانگی زۆرتری لە رێبازەکانی دیکەی فەمینیستی بەدەستهێنابێ. هێندێ دۆزە هەمەلایەنگیرەکان هەمیشە دژ بەتایبەتمەندییەکانی بزاڤ دەدرێنە قەڵەم: بۆ وێنە بە کۆی شێوەی پیاوسالاری و رەگەزییەتخوازی، هاوجنسخوازی ژنانەی سیاسی، ماددی، موتالا لەمەڕ خووی دەستدرێژی رەگەزی و روانگەی رادیکال لەمەڕ داهاتووی بنەماڵە.

پێشکەوتنێکی نوێتری دیکە کە لە کۆتایی دەیەی ۱۹۷۰ و سەرەتای ساڵی ۱۹۸۰ جێی لێدوان بووە، پێوەندی نێوان فەمینیزمی سۆسیالیست و رادیکاڵە. کێشەگەلێک لە ئارا دایە کە رەخنە لە نوێ فەمینیزم سۆسیالیست خۆی (جیا لە شێوەی کەونی مارکسیستی) هەڵی پێکهێنانی روانگەی سیستماتیک و یەکپارچەی لەگەڵ رادیکالیزم رەخساندووە. کەسانێکی دیکە لەسەر ئەو باوەڕەن کە «سیستمێکی دوولایەنە» لە نێوان ئەم دوانەدا لە حاڵی پەرەسەندن دایە. بەم حاڵەوە، حاشا لەوە دەکەن کە دەبێ پێوەندیەک لەنێوان رادیکالیزم و سۆسیالیزمدا بوونی بێ.

کۆتایی دەیەی ۱۹۸۰ هەروەها شاهیدی گەشەی بێوچانی هۆگری فەمینیستی بە پاش پێکهاتەخوازی، روانگەی پێکهاتە شکێنی و پۆستمودێرنیزم. لە سەرەتادا رەخنەی ئەدەبی کەلتووری بووە. دریدا، لیوتار و فۆکۆ و رورتی کەسایەتیگەلێکی کارتێکەر و گرنگی ئەم بزاوتانەن. یەکێک لە یەکەمین گۆڕانکاری ئەم شێوە بیرمەندییە، بزاوتی پەساپێکهاتەخوازی دەروونتوێژانەی فەمینیزمی

فەرەنسەوی، بەتایبەت نووسـراوەکانی ژۆلیـا کریـستوڤا، هـێلن سیکـسۆ و لـوس ئیریگاری بـوو.[38] لـە ئـەمریکاش سـەبارەت بـەم نووسـراوانە گەشـە و نەشـەیان دەربڕی.

بابـەتی سـەرەکی ئەمەیـە کـە زمـان بـوونی راسـتەقینەی ئێمـە پێکـدێنێ. سەرچاوەی ئەندێشە فێردینان سۆسۆرە. وتار لە حوکمی کۆمەڵێک لـە هێماکـانی بناخەی زمان دەدرێتە قەڵەم، کـە بـە شـێوەی سیـستەمـی جـۆری قـەراردادەکان دەرک دەکرێ. یاساکانی زمان پێکهاتەی قووڵی وتار دروست دەکا و ئەم پێکهاتـە بنەماییانە دەکرێ بە شـێوازی زانستی موتـالا بکـرێ. ئـەم دۆزە پێکهاتەخوازانـە لەسـەر هێنـدێ لـە بیرمەنـدان، وەکـو کلـۆد لێـڤی شـتراوس و رولان بـارت، کاریگەرییەتی بوو. کاکڵی سەرەکی ئەمە بوو کە دەبێ واتا راستەقینەکانی پێکهاتە لـە یادکراوەکـان ئاشـکرا و روون بێتـەوە. ئـەم واتـا قووڵانـە لـە رووبـەڕوو دوولایەنەکان و ئاوەڵ دوانەیی وەکـو کـاڵ ـ کـوڵاو یـان پیـاو ـ ژن پێکهـاتبوون. هێماکان خۆیان لە خۆیاندا کارێک ناگەیێننـە ئـەنجام بەڵـکو زۆرتـر لـە نـاوەرۆکی رەهەنـدێک لـە دژایەتییـەکان و رووبـەڕووەکان و جیاوازییـەکان کـە پێکهێنـەری زمـانن، مانـا بـە خـۆوە دەگـرن. دۆزی پێکهاتـەی بنەماڵـەی زمـان، بیرمەنـدی دەروونتوێژی فەرەنسەوی، ژاک لاکان پەرەیپێدا [لە ئەندێشەی لاکان]دا هاوکێشی نێوان، لە لایەک ئاستی وتار و پێکهاتەی قووڵی بنیادی قەراردادەکان و لـە لایـەکی دیکەوە، واتای دەروونتوێژینەوەی خۆزانیاری و ناخۆزانیـاری بایـەخی سـەرەکی هەیە. بە بۆچوونی لاکان، پێکهاتەگەلی ناخۆزانیـاری هۆویـەت و کەسـایەتی ئێمـە پێکـدێنن. ئاشـکرا کـردنی زمـان بـە هـۆی زمانـەوە، مەڵـهەم و کاکڵی سـەرەکی دەروونـدەرمانیـە. ئەمـە بـە یـەکێک لـە دایکـانی تێگـەیێنی خـووی روانگـەگـەلی فەمینیستی فەڕانسەوی دەدرێتە قەڵەم.

وێـڕای ئەمـە، پەسـاپێکهاتەخوازی فۆکـۆ و پێکهاتـەشـکێنی دریـدا، رووبەڕووبوونەوەی دوولایەنەی سەرەکی کە پێکهاتەخوازان پەیان بەوە بردبوو، خوازیـاری بەربـەرەکانی بـوون. فۆکـۆ پێکهاتـەی دەشـکاند هـەتا «دەسـەڵاتی» بنـەڕەتی زانیـاری و زمـانی ئێمـە نیـشان بـدا. کۆمـاکۆی گریمانـە فیکرییـەکانی

رواڵەتی ئەندێشەی رۆژئاوایی پلەی زانیاری خۆیان بێبەشکراون، ئەمە واتاگەلی عەقڵانی و دزە و یارمەتی مرۆڤایەتی دەگرێتەخۆ. فۆکۆ لێرەدا لە واتای تۆرەمە(رەچەڵەک)ناسی نیچە کەڵک وەردەگرێ هەتا ئەم رووبەڕووانە لە نێو لابا.

تۆرەمەناسی هۆکارەکان، گوشارەکان و دەسەڵاتی بنەمایی عەقڵانی گریمانەکانی ئێمە نیشان دەدا. هەموو زانستییەکان و ریشەکان (ئەوەی فوکۆ «شێوەی رێنوێنی» ئێمە ناودەنێ) بۆ بەستنی کۆمەڵێک پرەنسیپی گومانلێکراوی پێشوو و ناعەقڵانی ئێمە کە سیستەمێکی راستەقینە پێکدەهێنن، نیشان دراون.

ئەندێشەی پێکهاتەشکێنی دریدا، ئەو جۆرە کە لەناوی کتێبەکەی، پەراوێزەکانی فەلسەفە، دەردەکەوێ، بە شێوازێکی کەمتر سیاسی کار دەکا. ئەو نیگەرانی «نیشاندان»ی دەسەڵاتی بنەمای زانیاری یان شێوەی رێنوێنی نییە. ئەو زۆرتر تێدەکۆشا هەتا لەگەڵ خوێندنەوەی نزیکتر و ئاستەنگتر بەناخی تاوتوێکردنی قەراردادە سەرەکییەکان و زۆرتر ناخۆزانیاری باوەڕەکان و دژایەتی دەروونی ناوەڕۆکدا بچێتەخوارێ هەتا دڵخواز بوون یان شاراوەکانی ئەوان بخاتەروو. بە بۆچوونی دریدا، ئیستعارە تەسادفییەکان و نادەستکرد، پاوەرەقەکان یە پەراوێزگەلی ناوەڕۆکن کە بۆ ئەم پێشمەرج و گریمانانە بنەمایەکی ئاشکراکەرن ئەو جۆرە کە نووسەر گوتوویە:

«پێکهاتەشکێنی لە ساکارترین حاڵەتی خۆیدا دارێژاوە لەسەر وەها خوێندنەوەیەکی نزیک لە ناوەڕۆک کە جیاوازی واتایی، کە ناوەڕۆک ئەوانەی کردەوە بە پاڵپشت بۆ ناکامی لە کارکردی ناسازگار و دژایەتی ئەم واتایانە دەروونی ناوەڕۆک بە شێوەی کۆیەک نیشان بدرێن. بەم جۆرە دەبینری کە ناوەڕۆک لەگەڵ پێوارەکانی خۆی تێکدەقرمێنرێ».[39]

بە بۆچوونی دریدا، بەردەوامی و دەستنیشانکردنی مانا لە رادەبەدەر دژوار و ئاستەنگ دەبێ. هەرگیز لە هیچ نووسراوەیەکدا پێناسەکردنی مانا ئاسان نییە مانا هەڵواسراوە دەمێنێ و وەرگرتنی ئەو دژوارە و بە جۆرێکی دوایی پێنەهاتوو لە رایەڵەی تێکەوەپێچراوی زمان و ئەزموونداا یاری دەکا. هیچ مانایەکی بێخەوش

کە شتێکی بەرچاو و لە جیهاندا ئاشکرا بکا، بوونی نییە. لە دەرەوەی «هێما»شدا شتێک بوونی نییە و مانایەکی دیاریکراو بۆ هێما لە دەستدا نییە. ئەمە هەمان جەوهەری جیاوازی وشەسازی دریدایە. مانای هێمایەک لەسەرانسەری کۆماکۆی هێماکاندا بڵاوبووەتەوە. بەم جۆرە، مانای سەری ئەوسەر هەمیشە دەبێتە مخابن و ساختشکێنی پێناسەی ئۆپێراتۆری دروستکردنی بۆ دارشتنی مانای دیاریکراو کە دریدا ئەوەی «وتەبێژی» ناوناوە، مەحکوومە بە شکان.

حاڵیبوون و تێگەیێنی پۆستمودێرنیزمیش لە رادەبەدەر دژوارە. ئەم رێبازە بە پێناسەی شتگەلێکی زۆر جیاوازە. دزەی سەرەتایی ئەو لە بوارەکانی وەک مێعماری و هونەرە جوانەکاندا بوو. لە جیهانی هونەردا هەمیشە لەسەر تێکەڵاوی شێوازە سوننەتییەکان و پێدا هەڵگوتن و رێزلێنان و یاری لەگەڵ جیاوازییەکان ئەوان رێنوێنی هەیە. لەم بارەوە هێندێ ئەوە بە خۆنیشاندان لە بەرامبەر شێوازی ئاستەنگی مودێرنیتە دەزانن (ئەگەرچی کۆمەڵێکی دیکە ئەوەیان بە تەنینەوەی مودێرنیزم زانیوە) لە کۆمای وشەناسی پۆستمودێرن، بەیان و راڤەی ئەدەبیات و روانگەی کۆمەڵایەتی و سیاسی دژوارترە. بۆ وێنە ئایا ئولیس ئاسەواری جیمز جۆیس، سەرزەوی بێکارە [ناکوێ‌ئاوا] ت. س. ئەلیوت یاکانتوس ئەزرا پاوند مودێرنیست یان پۆستمودێرنیستە؟ ئەوانە رادەی بالای دەسکەوتی مودێرنیزم زانراون. هەرچەند کە هەڵگری شێوازگەلێکی زۆری سوننەتی و «ماناگەلی بەیان» لە تایبەتمەندییەکانی پۆستمودێرنیزمیش هەن.

لە روانگەی کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە، پۆستمودێرنیزم پێناسەی کاریکاتۆرێک لە پەساپێکهاتەخوازی و پێکهاتە شکێنییە. بودریار و لیوتار زۆرتر پەساپێکهاتەخواز تەوسیفکراون هەتا دریدا و فۆکۆ. پۆستمودێرنیستەکان بە شێوەی گشتی دەڵێن سەرچاوەی پایەبەرزی بوونی نییە و پۆستمودێرنیزمیش شێوازی نوێ نییە. بۆ وێنە لیوتار وەزعی پۆستمودێرن بەم جۆرە شرۆڤە دەکا: «ناباوەری بە فەرارەوایەت»[٤] هەموو ئەو شتانەی کە لە لەبەردەستی ئێمە دایە وتارگەلێکی زۆری خەیاڵیە کە لەباری کۆمەڵایەتیەوە دروستکراون. بیرمەندانی پۆستمودێرن لەنێو ئەم پرەنسیپە خەیاڵیانەدا بە یاری و گاڵتەجارەوە سەرقاڵن و

له پێکهاتن یان فۆرم دان بەوانە حاشا دەکەن. لەبەر ئەمە، ئەوان لەگەڵ هەرچەشنە گرێدان و دوایی پێهێنان بە وتار و لە بەین بردنی جیاوازییەکان دژایەتی دەکەن. ئەوان بەڕاستی، عەقڵانی، زانیاری یان هەر چەشنە لە دووگەڕانێک بۆ شوناسناسییەکی ڕێکوپێک باوەڕیان نییە. مرۆڤ خۆی دەبێ بە ڕشتەیەک هێماگەلی دەرەکی تەنک. دژایەتی، جیاوازی و ناڕێکوپێکی پێشوازیان لێدەکرێ. لەبەر ئەمە، ئەرک و وەزیفەی پۆستمودێرن دروستکردنی نابەسامانی و بێبایەخ کردنی کۆماکۆی کۆششەکان لایەنی پێکهێنا. یەقین، بەستن و تێکەڵ کردنی یان دریدا گوتەنی «وتەبێژی»یە. هیچ ڕاپۆرتێکی بەرچاو لە ڕاستی و هیچ یەقینێک لە ئارادا نییە بەڵکو هەموو بێیەقینییە.

فەمینیستە فەرەنسەوییەکان هێندێ لەم پرەنسیپانەیان قبوول کردووە و پێکهاتەخوازی دەروونتوێژانەی لاکان بە چاوی پەساپێکهاتەخوازی دەبینن. ئەوان دەڵێن هیچ شتێک لە دەرەوەی زماندا بوونی نییە. ئەو جۆرە سیشو دەڵێ: «هەموو شتێک وشەیە، هەموو شتێک هەر تەنیا وشەیەکە... ئێمە دەبێ فەرهەنگ بە وشە، ئەو جۆرە کە ئەو فەرهەنگە ئێمەی لە وشەکان و لە زمانی خۆیدا دەبەستێتەوە، بە دەستی بێنین و وەری بگرین».[41] جیهان ناوەڕۆکێک یان ڕشتەگەلێک لە ناوەڕۆکەکانە کە هەڵگری نەزمگەلی نمادین داڕژاوە لەسەر رووبەڕووە لفە و دوانەکانی چاو و شعوور، عەقڵ و هەست و ڕاستی و درۆ. فەمینیستە فەرەنسەوییەکان بە کەڵک وەرگرتن و گۆڕینی پەساپێکهاتەخوازی فۆکۆ تێدەکۆشن بیخەنەڕوو کە دەسەڵاتی پیاوانە بناخەی ئەم رووبەڕووانە لە زمان پێکدێنێ. ئەو جۆرە کە ماری هاوکس وورس وەبیرماندێنێتەوە:

«تایبەتمەندی کاکڵەی دەرکی زمانی تاک و سەرچاوەی هەموو فەرهەنگ و ژیانی کۆمەڵایەتی، یەک لایەن بوونی ئەو لە بەراورد لەگەڵ «هاوجنسخوازی»یە... لەوێدا ئەمە زمانە کە بە ڕەگەزییەت لە بەستێنی واژەکانی پیاوانە و دەروونی نەزمگەلی زانیاری پێکهاتە دەبەخشێ، مەسەلە بەدیهێنەرەکانی گرفتی زمان و بەدیهێنەری گرفتی ڕەگەزییەت دەبێ بە مەسەلەگەلێکی هاوسنوور بۆ ژنان».[42]

به دوای شرۆڤەی دریدا لە بێهێزی بـە شـێوەی «وتـەبێژی»، لـوس ئیریگـاری ئەسەر ئەو باوەڕەیـە کـە ئـەم بێهێزییـەی بناخـەی پیاوانـە لـە زمـان هەڵـخولانی پەلەدارێکە کە پێناسەی بیچمێک لە پیاوسالاری ناخی زماننانسییە. ئەمە شـێوەیەک لە زوڵمە کە جاران بەوەیان نەزانیبوو. ئەوەی کە ئێمە فیکر دەکەین کە بە شێوەی ڕاستی دەرکی دەکەین، لە ڕاستیدا سامان وێنەیەکە کە لە لایەن پیاوانەوە دروست کراوە.

شتگەلێکی زۆر لە ئارادایە کە دەکرێ لێرەدا بە کردەوە نیشان بـدرێن. یەکـەم، ئیریگاری لایەنگری رووخان یان پێکهاتەشکێنی ئەم وتارە پیاوانەیە بۆ وەستان لە بەرامبـەر هـەموو کۆشـشەکانی پیاوانـە لـە نەزمبەخـشین و دەرەنجـام لەگـەڵ شێوازی ساختشکێن، لێـکـکـۆوە بـوون لەسـەر ئیـستیعارەکان، پـەراوێزەکان و رەمزەکانی وتاری پیاوانە.[٤٣] فەمینیستە فەڕانسەوییەکان، وەکـو دەروونـدەرمانی زماننناسانەی لاکان، زمان بە پانتایەک بـۆ نوێـسازی دەرمـانی دەزانـن. لـە وەهـا بوارێکدا پێڕەوی دووەم پێـشنیارکراوە کـە بریتییـە لـە دروسـتکردنی زمانێـک و نووسـراوەی ژنانـە. ژنـان خۆیـان دەبـێ بنووسـن و قـسە بکـەن. لـەم رووەوە ئیریگاری لە واژەی Le parler femme (وتەی ژنان) و سیشو لە واژەی ectriture femenine (نووسراوەی ژنانە) کەڵک وەردەگرن. ئەم کـارە دەرفـەت بـەوان دەدا کە تایبەتمەندی تاقانە یان «قاڵبی رەگەزی» خۆیـان بخەنـەڕوو و دەربـبڕن. هـەر ئەوە دەبێتە هۆ کە ئەوان لە زماننناسی چێو هەڵخولێنانەی پیاوسالارانە رزگار بن.

دۆزە باسکراوەکان راست لەگەڵ زەمـەنـی پۆسـتمودێـڕنیزم بەرامبـەر نییـە، ئەگـەرچی زۆر تێکەڵـی و وێچوویـیـان هەیـە. زۆر لـەو کەسـانەی کـە خۆیـان بـە فەمینیـستە پۆسـتمودێڕنـەکان دەزانـن لـە ڕاسـتیدا پێـڕەوی بیرمەنـدانی فەڕەنسەوین. پۆستمودێڕنیزمی تەواو عـەیار لـە رووبـەڕووی هـەر لاوازییەکـدا رادەوەستن. بە درەفەتدانی دەرچوونی ئەجێنەی پێکهاتـەشـکێنی لـە بتـری، هـەر وتارێک نەک هـەر تـەنیا وتـاری پیاوانـە، دووچـاری پەرێـشانی و چەواشـەکاری دەبێ. واتە سامانی عەقڵ بەتەواوی تێک دەئالۆزێ و هەرچەشنە یـەقین یـان پلـە، بەتایبەت نووسراوەی ژنانە، لە یاری و گەمەی خەیاڵی زماندا بزر دەبێ. کەسانێک

کـە، وەکـو جـین فلاکـس یـان کریـستین سیلوسـتێر، خۆیـان بـە فەمینیـستی پۆستمودێرنیزم دادەنا، زۆرتر بە دیهێنەری گرفتن هەتا کردنەوەی گرێکـوێرەی ئەو. هەڵبەت فەمینیزم خۆی لەم بوارەدا دەبێ بە یەقینێکی گومانلێکراوی دیکە کـە پێویستی بە هەڵوەشانەوە هەیە. لەم رووەوەیە کە توریل موا پرسیار دەکا: «ئایـ فـەمینیزمی پۆسـتمودێـرن هـەر تـەنیا گێژاوەیـەکی نـوێ لـە دژایـەتی نییـە کـە فەمینیستەکان لە ناخی ئەودا نوقم دەبن؟».[٤٤]

سەرسوورهێنەر نییە کە فەمینیـستە فەرەنـسەوییەکان «کـە چاوێکیـان لەسـەر پێکهاتە شکێنی هەیە» لە بابەتی عینوانەوە «فەمینیست» گومانلێکراو دێتەبـەرچاو مەسەلەگەلێکی زۆر مەزن لەگەڵ فەمینیزمی فەرەنسەوی لە ئارادا هەیە (کە دواتـر لە روانگەگەلی زۆربەی فەمینیستەکانی دیکەوە باسیان لێوە دەکەین). بۆ ئەوە کە جارێکی دیکە سـەرنجیان بـۆ جیـاوازی ژنانـە و بـە سـەرەکی کـردنی دیـاردەی ژنانەیی راکێشاوە. لەمەڕ ژنان بـە بایـەخی نگرانیگـەلی کۆمەڵایـەتی، ئـابووری و سیاسـی، نوخبـەخوازی فیکـری قووڵـیش بـوونی هەیـە و لەمـەڕ ئـەم مەسـەلانە کەوتوونەتە توێژینەوە و تێـرامان. واتـای پۆسـتمودێرنیـستی فـەمینیزمی تـەواو هەروەها لە توێی گومان دایە. دژوارە کە لەوە بە شێوەی شـاخس یـان نیـشانگەر کەلکی لێ وەربگیرێ. تەنانەت هێندێ رەخنەگران ئەوەیان بە نیهیلیزمی دەرەکی و ئـەفیونی «شـیلەی تریـاک» رۆشـنبیران دانـاوە. بێجگەلەمـە، پێوەنـدی پەساپێکهاتەخوازی و پێکهاتە شکێنی لەگەڵ پۆستمودێرنیزم بابەتی لێدوانەکان و موناقشەگەلی تونـد بـووە. کۆمەڵـێک لـە بیرمەنـدان سـەرجەم ئەوانـە بـە چـاوی پۆسـتمودێـرن سـەیر دەکـەن، بـڕێکی دیکـە بـە پاسـاودانەوەی پەسـند. پەساپێکهاتەخوازی، پێکهاتە شکێنی و پۆستمودێرنیزم لە یەک هاوێر دەکەن و بە کۆششگەلێکی جیا لە یەکی دەدەنە قەڵەم. ئەم خاڵە و خاڵەکانی دیکـە، وەرگـرتنی واتای فەمینیزمی پۆستمودێرنی ئاستەنگ کردووە.

سەرەنجام ئەمەکە، لێدوانە تازەکان لەمەڕ فەمینیزم لە دەوری ناوەندی فیکری دایکایـەتی و پارێزگـاری لـە منـداڵان کۆبووەتـەوە. ئاسـەواری دەروونتوژانـەی نانسی کوردوو و دواتر کارول گیلیکان لە سەرەتای دەیـەی ١٩٨٠ لەمـەڕ بـوونی

ـیفاتی جیاوازی تـاکی هـۆگر ئـەم گریمانـەی هێنـا ئـاراوە کـە چونکـە ژنـان لـە
کۆمەڵگەدا لەسەر بنەمای رەگەزییەت پەروەردەکراون (کە ژنان ئەرکی پارێزگاری
ـە منداڵیان بە ئەستۆیە) دەرەنجام خاوەنی روانگە ئەخلاقی جیاواز لەمەڕ جیهانن.
ـەتایبەت بە بۆچوونی گیلیگان، ژنان رێڕەوی «پارێزگارانە و ئاگالێبوانەیان» هەیە:
ئەوانە کەسانخوازتر، مرۆڤدۆستتر، پەروەردەخوازتر و فیداکارترن. گیلیگان ئـەم
هەڵوێستەی لەگەڵ «ئەخلاقی پارێزگارانە» گرێبەست دەکـا کـە لەگـەڵ «ئـەخلاقی
عەدالەتخوازانە»ی پیاوانـە پێکـەوە دەبەسـتێ.[٤٥] لەبـەر ئەمـە، ئـەخلاق بـۆ ژنـان
زۆرتـر دەبەسـترێتەوە بـە ئاگـالێبوون لـە منـداڵان و بەشـداربوون لـە
بەرپرسایەتییەکان و پێوەندییەکانـەوە تـا ئـەوەی کـە وەدووی مـافی و باشـترین
پرەنسیپ کەوتن، پێڕەوی لـە میتـۆد و سـەرنجدان بـە مافـەکان عەدالـەت کـە لـە
تایبەتمەندییەکانی زانستی ئەخلاقی عەدالەتخوازانەن. نووسـەرانی دیکـە، وەکـو
سارا روودیک و. ی. ب. ئەشتاین لەسەر ئەو باوەڕەن کە ژنان لـە پلـەی یەکەمـدا
بەرەنگار و. دەستەویەخەی پەروەردە و پاراستنی ژیانی منداڵنن؛ لەگەڵ ئەمـەش،
بەپێچەوانەی گیلیگان، وابیردەکەنەوە کە دۆزێکی ئەوتۆ دەتوانـێ کاردانەوەیـەکی
مـەزنی لەسـەر تێهەڵـچوونەوەی پێکهاتـەی ژیـانی گـشتی هـەبێت. روودیـک و
بەتایبـەت ئەشـتاین تەسـەور دەکـەن کـە «دایکـانێکی خـاوەن ئەندێـشە کـە
بەرپرسایەتی منداڵان و بنەماڵەکان رەزامەندی سەرەکی ئـەوان پێکـدێنێ دەتـوانن
بایەخە گشتییەکان لە بنەڕەتەوە بگۆڕن، تەنانەت دەتـوانن «دەسـەڵاتی ئـەخلاقی»
بە دیبێنن کە لە پێناوی سیاسەتی سیلەی رۆحم و دڵسۆزیدا بێ».[٤٦] ئەوانە لەسـەر
ئەو باوەڕەن کـە ئـەم کـارە بـە شـێوەی گـشتی کاریگەرییـەتی فـراوانی لەسـەر
ئەندێشەی سیاسی هەیە.

ئەم لێدوانە تایبەتییـە بـووە هـۆی دوو گۆڕانکـاری. یەکـەم رێنـوێنی «فیکـری
دایکانە» بەتوندی بووە جێی ناڕەزامەندی روانگەی «فەمینیزمی مـەدەنی». کتـێبی
ماری دیتیس لەوانەیە سیستماتیکترین ئاسەوار لەم بـوارەدا بـێ. ئـەو هەڵوێـستی
سوننەتیتر و بە کردەوە هەڵوێستی فەمینیستی لیبرال پەسند دەکا و رێنوێنی دەکا
کە ژنان و پیاوان بە شێوەی مەدەنی «دەتوانن دەست بکەن بـە هاوکـاری لەگـەڵ

یەکتر... و بەناوی تاکە یەکسانەکان بە دادوەری لەمەڕ کار و گرفتەکان دەست بە کار بن کە بایەخی هاوبەشیان هەیە. لەو بابەتانەوە کە نیگەرانی هاوبەشی ئەوان دنە دەدا، بیر و را بگۆڕنەوە و بە شێوەی هاوئاهەنگ و هاوکاری لەگەڵ یەکتر هەنگاو هەڵگرن.[47] دییتس ئەندێشەی فەمینیستی لیبرالی کۆمەڵایەتی سەرلەنوێ بەهێز دەکا و بە مەبەستی بەرامبەری دەیهێنێتە ئاراوە و دەرنجام نکوڵی لە جیاوازی ژن و پیاو دەکا. دووەمین بەرەو پێشچوونی هەڵوێستی فیکری دایکانەیە کە لە لایەن ئەشتاین و روودیکەوە هەڵبژێرا، «هەرچەند کە نە پێویستانە لە لایەن گیلیگان» کە جارجار ئەمڕۆکە ئەو «بە فەمینیزمی پارێزگاری لایەنگری بنەماڵە» ناودێر دەکەن.[48] گروپەکانی تری بزاڤی فەمینیستی لەو گروپەی دوایی بە جۆرێکی پێویست داوای لێبووردنیان نەکرد، ئەوەیان بە رەوتێکی بەرەو دوا و بەرەو کلیشە دێرینەکان لەمەڕ جیاوازی ژنان لە بابەت دەورە رەگەزییەتەکانەوە دەزانن.[49]

لەگەڵ جۆراوجۆری و زۆر بوونی ئەندیشەی فەمینیستی ناسینی تەواو و کەمالی هۆکارەکانی بزووتنەوەی فەمینیستی دژوارە. لەگەڵ ئەمەدا، تێگەیشتن و هەڵاواردنی بڕێک ناوەڕۆکی رەسمی بەربڵاو کە کاکڵی هاوبەشی زۆرتری ئەندێشەکانی فەمینیستی پێکدێنێ، ئیمکانی هەیە. بەڵام وەڵام بەم ناوەڕۆکانەش خۆی بەتەواوی جۆراوجۆرە. ناوەڕۆکگەلێک کە لە پاشماوەی ئەم بەشەدا لەمەڕ ئەوانە لێدوان دەکەین بریتین لە: جنس و رەگەزییەت، جەوهەری زوڵم و پێڕەوی بابەتی بەرامبەری جیاوازی، تایبەتی بە شێوەی سیاسی.

## رەگەز و رەگەزایەتی

ئەم بەشە باس لە سوننەتیترین بابەتی سروشتی مرۆڤ دەکا. دەربارەی فەمینیزم. سروشتی مرۆڤ پێوەندی لەگەڵ یەکێک لە بابەتە سەرەکییەکانی باسی ئیدئۆلۆژی هەیە و لەبەر ئەمە، دەبێ بە شێوەی ناڕاستەوخۆ لەو نزیک بینەوە زۆرجار گوتراوە کە فەمینیزم «هەڵگری هیچ روانگەیەکی تایبەتی سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ نییە».[50] بەپێچەوانەی ئەم خاڵە، هێندێ لە نووسەرانی فەمینیست

ـ ێرتگەلێکیان لەمەڕ سروشتی مرۆڤ خستووەتەڕوو کە لەگەڵ ئیدئۆلۆییەکانی ـیکەی وەک لیبرالیزم هاوبەشی هەیە. کەسانی دیکە زۆرتر نیگەرانی مەسەلەی ێوەندی نزیکایەتی رەگەزی و رەگەزییەت لەگەڵ سروشتی مرۆڤن. لەم بوارەدا ـەتی سروشت و خووی مرۆڤ شاراوە نییە، بەلام برێک پێچراوەترە و تەئکید ـەسەر ئەوە دژوارتر دەبێ.

مەسەلەی کارە رەگەزەکان و رەگەزایەتی وەکو لێدوانەکان لەمەڕ سروشت و ـرهێنانە. بابەتی سەرەکی لێرەدا ئەوەیە کە ئایا سروشتی ژنان لە باری ێولۆژیکییەوە دیاریکراوە یان بە شێوەی کۆمەلایەتی فۆرمی گرتووە. وەلامی ـسایی بەم پرسیارە ئەوەیە کە رەگەزایەتی بە شێوەی کۆمەلایەتی و دەستکردی ـروستکراوە ئێستا ئەوە کە کاری رەگەزی کارێکی بیولۆژیکییە. رۆلگەلێکی ـیاریکراو بۆ ژنان دەستنیشانکراوە، ئەو جۆرە کە دەلێی ئەو رۆلانە بە جۆری ـروشتی و بیولۆژیکی پڕبەپێستی ئەوان بووە و بە بالایان بڕاوە. بەلام لە ڕاستیدا هیچ کام لەم رۆلانە سروشتی نەبوون. دەروونناسی ژنان و پیاوان ـدەستنیشانیان کردووە. لەبەر ئەمە، ئەرکی فەمینیزم بە ئاگاکردنەوەی ژنان لەم ڕاستەقینەیە.

ئەم ڕێنوێنییە تایبەتیانە دەکرێ بە شێوەی جیاواز لەلای فەمینیستە لیبرالەکانی وەکو ماری ولستۆن کرافت بە دەسبێ. یەکێک لە کێشە سەرەتاکانی ئەو ئەمە بوو کە نابێ بە شێوەی بوونەوەری رەگەزی بۆ ژنان بڕوانین بەلکو زۆرتر دەبێ وەک بوونەوەری مرۆڤ بۆ ئەوان بڕوانن. واژەناسی لێرەدا برێک واژەگەلی رەگەزی و رەگەزایەتی جیاوازە، بەلام بۆ هێندێ لە بەراوردەکان پێوەندی تەواو هەیە. ولستۆن کرافت واتای «جنس» بەکردەوە هاوکێش لەگەڵ رەگەزییەت بەکار دەبا، ئەگەرچی ئەمەشی گوتبوو کە تەنانەت لایەنی بیولۆژیکی ژنان بەڕاستی خالێکی گرنگ نییە بۆ جیاوازی. ئەو گوتوویە: «یەکەمین ئامانجی وەسفکردنی پیشەی نووسەری بە شێوەی بوونەوەری مرۆڤایەتی، چاوپۆشی لە جیاوازی رەگەزی»یە.[٥١] خالی گرنگ ئەوە بوو کە وێنەی بەرچاو و نیشانەی جیاوازی مرۆڤەکان لە یەکتر، بەپێچەوانەی «خولقێنەری گیانەوەری» شعووری مرۆڤایەتی

ئەوانە. لێرەدا رەگەزییەت بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو. عەقل بە رادەی «وزەی باش بوون و باش مانەوە؛ یان بە جۆرێکی سەرراستتر، وزەی تێگەیشتنی راستەقینە بوو»[52] ئەو جۆرە کە ولستۆن کرافت دەیگوت: «کامڵبوون و تەکامولی سروشتی و توانایی ئێمە بۆ بەختەوەری دەبێ بە پێوارەی عەقڵی ئێمە بپێورێ».[53] لەبەر ئەمە، یەکەمین ئەرکی ژن بەدەستهێنانی شعور بوو. لە راستیدا کامڵبوونی عەقل لە سەرووی هەموو ئەرکەکانەوە بوو؛ چونکە «چۆن ژن دەیتوانی چاوەڕوان بێ کە لە کارەکاندا هاوبەشی پێبدرێ مەگەر ئەوەی کە بزانێ بۆ دەبێ داوێنپاک بێ؟»[54] لە راستیدا زۆرتر ئامانجی رێنوێنییەکانی ولستۆن کرافت، ژان ژاک رۆسو بوو. ئەو زۆرجار لە کتێبەکەی خۆیدا ئاماژە بە رۆسۆ دەکا. رۆسۆ لە ئاسەواری خۆیدا، کتێبی ئیمیل، لەسەر سروشتی رەگەزی ژنان تەئکیدی کردووە. ئەو لەمەر پێرەوی پێوەند و هۆکاری هەوەسی ژنان بۆ پیاوان شی و پەرەی پێداوە. بێجگەلەمە، رۆسۆ لەگەڵ بەرامبەری ژنان لە باری سیستەمی سروشتی بنەماڵەوە دژایەتی کردووە و لەسەر جیاوازی رەگەزی پێی داگرتبوو. ژنان لەبەر سروشتی خۆیان لەبەرچاو و دەمی گشتیدا بە جۆرێکی نەگونجاو دەکەونەڕوو. بە بۆچوونی ولستۆن کرافت ئەم دۆزەی رۆسۆ لەمەڕ جیاوازی رەگەزی داهێنانێکی رووخێنەر و پڕمەترسی بوو.

ولستۆن کرافت هەروەها لەسەر بنەمای بوونی خودایەکی بەهۆش بۆ پشتگری لە باوەڕی خۆی دەربارەی سروشتی مرۆڤ دەست بە رێنوێنی دەکا. بەکورتی ئەوە کە ئەو دەڵێ خودایەکی بەهۆش بەپێی کردەوەی خۆی نابێ بەشێک لە تورەمەی مرۆڤی بێعەقل خوڵقاندبێ. ریچارد پرایس، رێنوێنی دینی ئەو، گوتبووی هەموو مرۆڤەکان لە بەرامبەری خودادا یەکسان و بەرپرسن. لەبەر ئەمە، چۆن دەکرێ ژنان وەلابنرێ؟ بەپێی وتەی ولستۆن کرافت:

«بۆچی دەبێ سەرچاوەی پڕ بەرەکەتی حەیات هەر تەنیا بۆ تاڵکردنی ژیان هەوەسگەل و گەندەڵکاری و توانای فیکرکردنەوە بە ئێمە ببەخشێ و واتاگەلێکی لەڕێ لابەر ئیلهام لە پلە و پایە بە ئێمە بدا؟»[55]

ئەم ڕێنوێنییە، جگە لە ناوەڕۆکی خوداناسانەی ئەو، لە ناوەڕۆکی جۆراوجۆری
ـ ستوارت میلدا ڕەنگدانەوەی بووە. سروشتی ڕەگەزی ژنان مەکر و فێڵی
ـەڵایەتییە. میل دەڵێ: «من ئەوە ڕەت دەکەمەوە کە هەرکەس سروشتی
ـرەجنس بزانێ یان بتوانێ بزانێ... ئەوەی کە ئێستا سروشتی ژن ناودێر دەکرێ
ـ و کەماڵ ڕواڵەتی و بەرهەمی زوڵمی زۆردارییە».[56] بە بۆچوونی میل، ئێمە
ـەواوی سەبارەت بە بارودۆخێک کە سروشتی مرۆڤایەتی لەودا فۆرم دەگرێ،
ـزانین، لەڕاستیدا زۆرینەی پیاوان سەبارەت بە ژنان بەتەواوی ناشارەزان.[57]
ـی دەڵێ؛ ناکرێ بڵێین کە ژنان کۆیلەتی خۆیان بە شێوەی کارێکی سروشتی
ـوڵ دەکەن. ئەوان بۆ بەدەست هێنانی مافی دەنگدان، بەهرەمەندی لە فێرکردن
ـ پەروەردە و شتگەلی دیکە خەبات و چالاکی دەکەن. هەمیشە ئەمە خووی
ـپەسندی پیاوانە کە ژنانی لە وەها ئەسارەتێکدا ڕاگرتووە. ئەگەر ژنان بتوانن
ـەشە و پێشکەوتنیان ببێ، ئیتر هیچ بوارێک بۆ بە کەمزانینتری ئەوان لە ئارادا
ـێنێ. بە بۆچوونی میل، بەم جۆرە ئازادی ژنان هەر تەنیا پێوەندی بە ماوەی
ـدمانەوە هەیە. هەر ئەو جۆرە کە کۆیلەکان، نۆکەرەکان و ڕەشپێستەکان ئازاد
ـوون ژنانیش ئازاد دەبن. بە وتەی ئەو «بەم جۆرە پێڕەوی و ئاڵقەلەگوێی
کۆمەڵایەتی ژنان ڕاستییەکە جیا لە ڕێخراوگەلی کۆمەڵایەتی نوێیە».[58]

بەپێی نووسراوە سەرەتاکانی مارکسیستی سروشتەکانی ژنان و پیاوان لەژێر کاریگەری کەش و هەوای مێژوویی و ئابووریدا فۆرم دەگرێ، ئەگەرچی کەش‌وهەوای تایبەتی دەتوانێ ڕۆڵگەلێکی جیاواز بەسەر دوورەگەزدا بسەپێنێ. ئەو جۆرە کە مارکس و ئینگلس لە کتێبی ئیدئۆلۆژی ئەڵمانیدا گوتوویانە: «یەکەمین بەشکردنی کاری نێوان ژنان و پیاوان بۆ پەروەردەی منداڵ ئەنجامی گرتووە».[59] ئینگلس لە نووسراوەکانی دوایی خۆیدا ئەم باوەڕەی بەرفراوان کردەوە. بە بۆچوونی ئەو ریشەی ژنان و بنەماڵە لە بارودۆخی ئابووری ژیان دایە. هاوسەرێتی و مێرد کردن زۆرینەی ژنانی لە ڕاوەستەی کۆیلایەتی ناوماڵدا ڕاگیر کردووە. پیاو لە دەرەوەی ناوماڵ کار دەکا و هەقدەست وەردەگرێ و

خێزانەکەی لـە ماڵـەوە بـە کـارەوە سەرقاڵـە. بـەپێی نووسـراوەی ئیـنگلس: «لـە بنەماڵەدا، پیاو بورژوایە و ژن و پێناسەی پرۆلیتاریایە».[٦٠]

دژواری قسە کردن لەمەڕ سروشتی مرۆڤ لە روانگەی مارکسیزمەوە، گـۆڕان خوازی ئەوە. بەیانی سیفاتی گشتی و گۆڕان ناپەزێری خووی مرۆڤ لە رێنـوێنی مارکسیستدا دژوارە. لە روانگەی مارکسیزمدا خووی مرۆڤەکان پایەدار بـوو نییـە بەڵـکو لەگـەڵ کـەش و هـەوای مێـژوویـی دەگـۆڕدرێ. لـەم رووەوە فەمینیـستی مارکسیستی بنەڕەتێکی بۆچوونی قـایم بـۆ ئـەم ئیدعایـە پەیـدا دەکـا کـە زۆرتـر سروشتی رەگەزی/ رەگەزایەتی ژنان دەسـتکەوتی کـەش و هـەوای مێـژوویـی و ئابووری تایبەتی ژیانە. ئەم کارە پلـە و پایـە بـەم ئیدعایـە دەبەخـشێ کـە فـێڵ و فەرەجێک لە ئارادا بووە. لە لێکدانەوەی کۆتایدا دەبێ بەم دەرەنجامـە بگـەین کـە جیاوازیگەلێکی گرنگ لە نێوانی ژنان و پیاواندا بـوونی نییـە. لانی کـەم هـەر دوو رەگەز دەتوانن هەر دەورێک کە مەیلیان بێنێ، بیگێڕن.

بەپێچەوانەی دەرەنجامی بۆچوونی ناوبراو، زۆر لـە نووسـەرانی سـەرەتایی نێرینەی مارکسیست بەڕواڵەت دەوری زۆربـەی ژنانیـان لـە کـارە ناوماڵـییەکاندا قبووڵ کردووە. فەمینیستە سۆسیالیستەکان لـە کۆتـایی دەیـەی ١٩٦٠ رەخنـەیان لەم روانگەیە دەگرت. دەرەنجام، ئەوان لێکدانەوەی خۆیان دەربارەی بەشـکردنی کار، کێشایانە پانتای بنەماڵەوە. ئەوان هێندێ لە لایەنگەلی لێکدانـەوەی رادیکاڵـیان قبـووڵ کـردووە، واتــە ئەمــە کــە بێجگەلــە بــارودۆخی مێـژوویـی و ئـابووری، لایەنگەلێکی بیولۆژیکی و دەروونیش لە سوود وەرگرتن لە ژنان بوونی هەیە. ئەو جۆرە کە نووسەرێک بەڵگەی هێناوەتەوە، مارکسیزمی سوننەتی بـە بۆچـوونێکی مامناوەندی گەیوە کە لەودا «جیاوازییە ناتایبەتییەکانی بیولـۆژیکی نێـوان ژنـان و پیاوان بەو مانایە کە هەرگیز ناتوانرێ دابەشکردنی رەگەزی کار بە شێوەی تەواو پاکتاو بکرێ».[٦١]

داهاتووی سروشتی مرۆڤ لە فەمینیزمی سۆسیالیستی نوێتردا کەم و زۆر بێ جیاوازی رەگـەز و رەگـەزایـەتی. ئەمـە لـە راسـتیدا نـاوەرۆکی مـەنتقی بەڵـگەی سەرەکی مارکسیستییە. لەبەر ئەمە، هەڵبژاردەی زۆربەی فەمینیستە سۆسیالیستە

نوێکان ئەمەیە کە «ژن و (پیاو) ئیتر بە ناوی بوونەوەرێک مامەڵەیان لەگەڵ نەکرێ کە لە باری کۆمەڵایەتییەوە فۆرمی گرتووە و دروستکراوە»[٦٢] ئەگەر تەکنۆلۆژی هەتا ئەو جێیە بچێتەپێش کە ژنان بتوانن لە زگ کردن و منداڵبوون بێخەیاڵ بن، ئەم پرۆژە دەچێتەسەر.

زۆر لە پرەنسیپە جۆراوجۆرەکانی رادیکالیزم کە لە رێنێونی رەگەز/ رەگەزایەتی لێبڕاوانە و بەتەواوی کەڵک وەردەگرن، هەم بەتوندی دەکەونە بەر پەلاماری رەخنەی مارکسیستە سۆسیالیستەکان و هەم لیبرالەکان. ئەو جۆرە کە نووسەرێک بەناوی کاترین مەکینوون گوتوویە:

رادیکالیزم بەسەر مارکسیزمدا سوارە نەو ئەو جۆرە کە مارکسیزم بەسەر ئابووری سیاسی کلاسیکدا سوارە: چ دەرەنجامی کۆتایی ئەو و چ رەخنە لەو. لە بەراورد لەگەڵ مارکسیزمدا، پێگەی ئەندێشە و شتەکان لە میتۆد و لە راستی سەر و بن کەوتوون و ئەمە لەسەر مەسەلەی چاو و شعوور و روانگە کردار ریشەی داکوتاوە. فەمینیزم، لە جووڵانەوەیەکی دوو لایەن، مارکسیزم سەراوبن دەکا و ئەو لەسەر سەری رادەگرێ.[٦٣]

سۆسیالیزمی مارکسیستی لە تۆژینەوەی خۆیدا هەمیشە لەسەر جۆرێک میتۆد راوەستەی کردووە کە مەکینوون ئەوەی بە ماتریالیزمی دیالکتیک زانیوە. فەمینیزمی رەسەن «کە مەبەستی مەکینوون لێرەدا فەمینیزمی رادیکاڵە» بە نۆرەی خۆی، ئاکارگەلێکی زۆر جیاواز لە باری پێکهێنانەوە زانیاری بووە کە ئەم خانمە ئەوە بە «تاوتوێکردنی کۆی دروستکراوەی مانای ئەزموونی کۆمەڵایەتی ژن» وەسف دەکا.[٦٤] لەبەر ئەمە دەڵێ ئەم دوو ئاکارە لە بنەڕەتەوە ئاشتی هەڵنەگر و ناسازگارن.

برێک پایەداری دەربارەی مەسەلەی سروشتی مرۆڤ و بابەتی رەگەز و رەگەزایەتی لە ئارادا هەیە هەتا ببێتە هۆکارێکی زۆرتر بۆ متمانە کردن بە لێکدانەوەی رادیکاڵ. یەکەم بەیان لەم بوارەدا لە نووسراوەکانی سیمۆن دوبووواردا باسکراوە.[٦٥] ئەو زۆر لە راپۆرتەکانی بیولۆژیکی و ماتریالیستی مێژوویی قبووڵ نییە. بە بۆچوونی بووار، ژنان لە بنەڕەتەوە سروشتێکی

یەکسانیان لەگەڵ پیاوان هەیە. بەڵام راستییەکی گرنگ، واتە لەشی ئەوان، بووەتە لەمپەر و ئەوانی کێشاوەتەوە ژێر باری کۆیلایەتییەوە. لەش چارەنووسسازی جەوهەری راستەقینەی ژنان نییە، بەڵکو زۆرتر دەربڕی ئاشکراکردنی مێژووی ئەوانە. بووار سەرەڕای ئەمە کە هۆگرییەکی ئەوتۆی بە بزاڤی فەمینیستی نییە. زۆر گەشبینانە لە داهاتووی ژنان دەڕوانێ. لەگەڵ زۆر بوونی کەرەسەی لەبار بردن، کۆنترۆڵی کارتێکەر زاین و زۆر بوون و پەرە گرتنی تاکهاوسەری، ژنان پلەپلە کۆنتڕۆڵی لەشی خۆیان بە دەستەوە دەگرن و تێکەڵ بە پلانە کەلتوورییەکانی پیاوان دەبن. دایکایەتی دەسەڵاتی خۆی بەسەر چارەنووسی ژناندا لە کیس دەدا. ئەو جۆرە کە بووار دەنووسێ: «ئەمە راستییەکە کە هەموو ئێمە بوونەوەری مرۆڤایەتین، لە رادەبەدەر گرنگتر لە گشت تایبەتمەندییەکانە کە بوونەوەری مرۆڤایەتی لە یەکتر جیا دەکاتەوە».[٦٦] بڕێک لە رادیکاڵە دواکەوتووەکان لێکدانەوەی بووار یان بێ ناوەڕۆک لە زانیاری سەبارەت بە ناخی پیاوسالاری و جەوهەری زوڵمێک دەزانن کە بەسەر ژنان دێ.

هەڵوێستی بووار، لێکچوونی لەگەڵ هەندێ لە رێنوێنیگەلی لیبرالی سەرەتایی هەیە (ئەگەرچی لە باری قاڵبی فەلسەفییەوە بەتەواوی جیاوازە، کە هەڵقولاوە لە پێویستی ئەو بە فەلسەفەی ئەگزیستانسیالیستی سارترە) باشترە لەگەڵ یەکێک لە رادیکاڵەکانی سەرەتایی واتە خانمی شولامیت فایرستۆن بەراورد بکرێ. فایرستون لە کتێبی دیالکتیکی رەگەزایەتی وەکو بووار بەڵگە دێنێتەوە کە پیاوان و ژنان بەڕاستی جیاوازیان زۆرە بەپێی بۆچوونی فایرستون، وەکو بووار بە بەیانی هاوڕێ لەگەڵ واژەگەلی بەهێزتر، ئەمە بیولۆژی ژنان کە «چینی رەگەزایەتی» ئەوان دەستێنیشان دەکا (فایرستون واژەی نوێی «چینی رەگەزی» بە ئیلهام لە لێکدانەوەی مارکسیستی بەکاربردووە)[٦٧] چینی رەگەزی ریشەی لە بنەماڵەدا هەیە کە ژنان و منداڵان لە یەدی دەسەڵاتی پیاوان دان. جیاوازیگەلێکی پەیوەندی بە زاینەوە لە باری بیولۆژیکییەوە سەر لە دابەشکردنی کاری رەگەزی دەردێنێ. فایرستون تکنۆلۆژیگەلی نوێ بە هۆکاری ئازادی ژنان دەزانێ. ئەم داهێنانانە زۆر بەرفراوانتر لەوەن کە بووار پێشبینی کردبوو. پێوەندی دەستکرد،

ندا‌ڵە ئەزموونخانەکان، سیرنتیکی ناوماڵ، ژنان و منداڵان لە بەندی بیولۆژیکی ڕزگار دەبن. فایرستۆن دەڵێ بە بەرەو پێشچوونی زانستی پزیشکی لەوانەیە ئەمە کە جنین لە منداڵدانە دەستکردەکانی پیاواندا هەڵبگیرێ و ئیمکانی شیرایی ئەوان پێکدێ؛ لەبەر ئەمە، لە داهاتوویەکی نزیکدا کە دوو ڕەگەزایەتی هەم بۆ پیاوان و ژنان یەکسان دەبێ ڕەگەز و ڕەگەزایەتی واتای ئەمڕۆی خۆی لە دەس دەدا.[68]

بینینەکان و ڕوانگەگەلی دەروونی ڕادیکالیزم جێی ئەم قۆناخە سەرەتاییەیان گرتووەتەوە. ئامانجێکی دووڕەگەزایەتی مومکین بوو دۆزێکی بەبایەخ بۆ چالاکی و خەبات بێ. بەڵام ڕەگەزییەت سەرچاوەی مەسەلەگەلێکی زۆرە کە دەبێ سەرنجی بدرێتێ بەتایبەت مەسەلەی چەوساندنەوەی باوکساڵارانە و پیاوساڵارانە. بێجگەلە، لایەنگەلێک لە سروشتی نێرینە بوونی هەیە کە بۆ ڕادیکاڵەکانی قێزەونە. بۆ وێنە مایل بوونی زیادەڕەوی بە تێکەڵی ڕەگەزی، توندوتیژی و ئامادە بوون بۆ دەستدرێژی ڕەگەزی. لەڕاستیدا هێندێ لە ڕادیکاڵەکان دەستدرێژی ڕەگەزی بە لایەنی پێناسەکەر و دیاریکەری نێرینە بوون و پیاوساڵاری دەزانن.[69] ئەو جۆرە کە ڕووبین مورگان دەڵێ: «دەستدرێژی بە تاکی ژن دزە کردنێکە بۆ ئەمە کە پیاوان بە زۆر خۆیان بە جێی هەموو نەتەوە دابنێن.[70] ڕێنوێنی کراوە کە ژنان نابێ لە ئارەزووی تێکەڵبوون لەگەڵ ئەم لایەنە پیاوانانە لە داهاتووی دووڕەگەزایەتیدا بن.

بەم جۆرە فەمینیستە ڕادیکاڵەکان هێورهێور لە دووڕەگەزایەتیەوە بەرەو ڕەخنەگرتن لە «سروشتی پیاوانە» و شێوەیەک کە پیاوان تێدەکۆشن ڕەگەزی مێوینە پێناسە بکەن، کێشراون. ئەم ڕەخنە هەم لایەنی نیگەتیڤی بوو و هەم لایەنی موسبەت. لایەنی نیگەتیڤی هەڵگری ڕەخنە لە سروشتی نێرینە و پیاوانە بە شێوەی سەرچاوەی زۆربەی گرفتە کۆمەڵایەتی، سیاسی و نێونەتەوایەتییەکانە. بە بۆچوونی ئاندرا دووکین، نێرینە بوون خۆی لە خۆیدا پێناسەی مەرگ، توندوتیژی و وێرانگەرییە.[71] لەم خوێندنەوەدا، ژنان هەمیشە قوربانین. خەبەرنامەی پرۆپاگەندەیی بەرفراوان لەمەڕ دەستدرێژی ڕەگەزی، جەوهەر و

بینینی ئاسەواری بێبایەخ، خراپ کەڵک وەرگرتن لە ژنان لە ژن و مێردایەتیدا، بە نما و بیچمی ئەم خاڵە زۆر بووە، ئەگەرچی دیسان لەم دواییانەدا لەم جۆرە بینینە لەبەر «بنەمایی کردن»ی سروشتی ژنان رەخنە گیراوە.[72] لە لایەنی موسبەتەوە سروشت و سیفاتی ژنانە لە باری ئاکار و مەعنەوییەوە پلەبەرزتر تەسەور کراوە و دەرەنجام بە «لێکدانەوەی ژنمەداری» تەواو دەبێ.

لێکدانەوەی ژنداری مومکینە شێوەی جیاوازی ببێ. بڕێک نووسەر بە لایەنگەلێک لە تایبەتمەندی رەگەزی مێوینە ئاماژە دەکەن کە پێشەکی بەشی رازەکان یان لەمپەرەکانی ژیانی ژنان بەدرایە قەڵەم، وەکو نەریتی مانگانەی ژنان «حەیز» هەستی دایکایەتی و بیری دایکانە.

دواتر «بیری دایکانە» لە نووسراوەکانی ئەلشتاین، سارا روودیک و کارول گیلیگان لایەنی پلەبەرزی بەدەستهێناوە، ئەگەرچی بیرمەندی ئاخر لەسەر کاریگەرییەتی بیری دایکانە لەسەر هەرێمی گشتی تەئکیدی نەکردووە. روانگەکانی روودیک و ئەلشتاین تاوانبارکراون کە بینینی لایەنگری بنەماڵەی پارێزگاریان بەرز نرخاندووە کە ژنان بە قار و دەروونی ناوماڵدا دەباتە خواری. لە لێدوانەکانی دواییدا، رێنوێنی لەمەڕ بیری دایکانە، لە حوکمی شێوازی رەخنەیی بە جۆری بیری پیاوانە، هەتا رادەیەک چزووی ژاری خۆی لە دەستداوە. بە دۆزی ژنان بایەخی حەیاتی پێ دراوە، بەڵام ئەوەیان راستەوخۆ بە جێنشینی پیاوانە نەزانیوە. ئەگەرچی ئەلشتاین دەڵێ ئەم سیفاتی پەروەردەی ژنانە هەر ئەو جۆرە کە لە بنەماڵەدا رەنگدەداتەوە دەبێ لە پانتای گشتیشدا رەنگ بداتەوە.

نووسەرانی دیکە لەم بینینە بە شێوەی ئامێر و دروشمی کەلتووری رادیکاڵی سوودیان بردووە؛ ئەو جۆرە کە جین ئالپرێت دەنووسی:

کەلتووری ژنانە داڕژاو لەسەر باشترین و بەهێزترین سیفاتێکە کە لە ژناندا بوونی هەیە، هەر کە بمانەوێ دەستپێبکەین و خۆمان لە پلەی ژن پێناسە بکەین، سیفاتی ناوبراو سیفاتێکن کە دایکێک لە باشترین جۆری پێوەندی پەروەردەیی لەگەڵ منداڵێک لە خۆی نیشان دەدا: هاودڵی، هەستی دەروونی و بەرچاوی، هەستی پشتگری کردن لەم و لەو، توانایی وەڵامی دلۆڤانانە و عەقڵانی.[73]

مـری دیلـی، بـەم فەمینیزمـە رادیکالـە کـەلتوورییـە تەئکیـد دەکـا کـە ژنـان و کەلتووری ئەوان هەم جیاوازن لەگەڵ پیاوان لە باری کـەلتوورییـەوە لەسـەرووی ئەوانـەوەن. ئـەم جیاوازییـە لەگـشت سـەبکی ژیـان و ئەندیـشەی ژنانـدا رەنـگ دەداتەوە. فەمینیستە پۆستمودێرنیستەکان و پەساپێکهاتەخواز دەیانـەوێ لەگـەڵ ڕووبـەڕووە خەیالـییەکان واژەگـەلی زمانناسـی وەک نێرینـە و مێوینـە دژایـەتی بکەن. سیفاتێک کە ئێمە بەوانی پەیوەند دەدەین، رەنگە لە راستیدا لـە لایـەن هـەر دوو رەگەزەوە قبـووڵ بکـرێن. بـەم شـێوە، گـشت لێداونـەکان رەنگـە خەیالـێکی پەیوەندیدار بە مانای بەیان بێ.

رادیکالە نوێیەکانی دیکە، جگـە لـە پۆسـتمودێرنیـستەکان، بەدڵـنیاییەوە دەڵـێن «بیری فەمینیستی» دەبـێ بـە شـێوەی نـوێ لـە شوناسناسـیدا لەبـەر و زانستییە سروشتییەکان بەرین و بەرفراوان بکرێتەوە. ئەم لایەنە لـە رادیکالـیزم زەمانێـک بـە شێوەی مەکتەبێکی جیاواز بە ناوی «فەمینیزمی رادیکالی روانگـەیـی» هەڵـبژێراوە و خوێنراوەتـــەوە.[٧٤] بۆچـــوونی روانگـــەیـــی وەکـــو پۆســـتمودێـــڕنیزم یـــان پەسـاپێکهاتەخوازی، بـە واتاگـەلی بـەرچاو لـە زانـستەکان، عـەقڵانی و مـەنتق لـە ئەندێشەی رۆژاوا هێرش دەبا. ئەم شێوە ئەم پرسـیارەی لـێ دەکەوێتـەوە کـە ئایـا «گشت پرۆژەی وتارێکی مەنتقی و عەقڵی و زانستی لەبنەڕەتدا نابێ بەشێکی پیاوانـە بزانرێ»[٧٥] گوتوویانە کە ئەندێشەی پیاوانە و بە میتۆدگەلێکی دیـاریکراو کـار دەکـا: بۆ وێنـە جیاکردنـەوەی واتایـەکی زێهـنی و مـادە، خـۆ و کەسـێکی دیکـە، عـەقڵ و هەست. دەرەنجام نووسەرانێکی وەکو ئاردین رایـک، کـاترین مـەکینون جـودایی و دوورکەوتنەوەیە کە کە لەگەڵ مەیلی پیاوانە بە سەربەخۆیی بەرامبەری هەیە.[٧٦] بـەم حاڵەوە بەپێچەوانەی پۆسـتمودێـڕنیزم و پەسـاپێکهاتەخوازی جارێـک، بۆچـوونی روانگـەیـی نیـسبەتخوازی رەت دەکاتـەوە و شوناسناسـی بـەناوی شوناسناسـی ژنانەیی بەرچاوی لە پێشتر پێناسە دەکـا. لـە راسـتیدا هێنـدێ رێنـوێنی دەکـەن کـە کەلتووری رۆژئاوا داماوە و بە وەها شێوازێکی بیری نوێ نیازی هەیە.[٧٧]

## جەوهەری زوڵم و پێڕەوی

لێکدانەوەی زوڵم پێڕەوی هەمان پلانی ڕێنوێنییەیە کە لە بەشی پێشووی ئەم فەسڵە باسیکرا. ڕوانگەی فەمینیستی لیبراڵ سەرنجی خۆی خستووەتە سەر عەداڵەت، بەرامبەر و مافەکان. بە بۆچوونی ماری ولستۆن کرافت سەرچاوەی زوڵم ئاشکرا بوو. ئەو گوتوویە:

ژنان لە هەموو جێیەک... لە بارودۆخێکی ئاستەنگدا ژیان بەسەر دەبەن. چونکە حەقیقەت بۆ پاراستنی بێتاوانی و بێدەسەڵاتی خۆی، لە دوای ئەوانەوە خۆی حەشار داوە و ئەوان وا دروستکراون کە خووی خۆنواندن لە بەرامبەر تواناییەکانی خۆیاندا و هەر چەشنە دەسەڵاتێک کە بە دەستیان هێناوە، بیانبی. هەر لە منداڵییەوە ئەوان بەوە فێرکراون کە جوانی تاقانە چەک و گورزی ئاسنینی پاشایی ژنە، فام و شعووری ئەو لە وزەی بازنەیی جسمی ئەودا فۆرم دەگری و لە نێو رکەی زێڕینی خۆیدا بێوچان دەخولێتەوە و ئەو بەندە رووگەیە بۆ ئەو دەیپەرستێ.[78]

ژنان لە کەرەسەی پەرەگرتن و بەرەو پێشچوونی عەقڵی خۆیان بێبەش و تەریککراون. رەگەزایەتی و خووی ژنان بەرهەمی فێرکردن و پەروەردەی ئەوان بوو. پیاوان چاوەڕوانیان لە ژنان کە منداڵیان ببێ، کابانی ماڵ بن و داوێنپاکانە رەفتار بکەن، بەڵام ئەم کارانە تەنیا کاتێک دەتوانرێ ئەنجام بدرێ کە عەقل پەروەردە کرابێ. ولستۆن کرافت سکاڵای لەوە هەیە کە پیاوان لەم بوارەدا بەتەواوی گەوجانە کردەوەیان نیشان داوە. ئەوان خوازیاری ئەوە بوون کە ژنان بوونەوەرێکی خاوەن شەرەف و نەجیب بن، بەڵام تێکۆشاون تاکو ئەوان لە مافی بەرەو پێشچوون و پەروەردەی مەنتقی و عاقڵانە دوورەپەرێز رابگرن. پیاوان بەڵگە دێننەوە کە ژنان بەپێی سروشتی خۆیان توانایی بەهرەمەندبوونیان لە فێرکردن و پەروەردەدا نییە و هەوڵ دەدەن تاکو ئەوان لەم بەخششە بێبەش بکەن. ژنانی نەخوێندەوار وەکو سەربازانێک وان کە لە ئارتەشێکی قەتیس لە نەزانی کوێردا راگیر بکرێن و هەر تەنیا داوای فەرمانبەریان لێ بکرێ. وەها زێهنییەتێک هەر تەنیا بۆ سەرەڕۆیەک کێشش و گیرایی هەیە.[79] بەم شێوە

سەرچاوەی زوڵم لەسەر ژنان، بنیەشکردنی ئەوان لە مافەکان و بەتایبەت مافی خوێندەواری و پەروەردەی عەقڵ بوو.

لە کۆتاییدا وەها پەروەردەیەک دەیتوانی کۆمەڵێک لە ژنان بە بەشداربوونیان لە کاری پیشەیی و بازرگانی لە خۆ بگرێ. لەبەر ئەمە، ئامانجی کتێبی ولستۆن کرافت بۆ قەناعەت گەیاندنی مەنتقی پیاوان بوو کە تێبگەن و مافەکانی ژنان پێشکەش بەوان بکەن.

بە بۆچوونی جان ستوارت میل ریشەگەلی زوڵم لەسەر ژنان، کۆمەڵێک هۆکاری گەندەڵ و قێزەون لە پیاوان دایە. میل، وەکو بێنتام، روانگەی مافە سروشتییەکانی رەتدەکردەوە، ئەگەرچی لەگەڵ مافە یاساییەکانی ژنان دژایەتی نەبوو. پیاوان لە نەزانییەکی تەواودا کێشەیان لەسەر ئەوە بوو کە ژنان بەپێی سروشت لە پیاوان نەویترن. بەم حاڵەوە، میل وەکو ولستۆن کرافت دەیگوت: «ئەوەی کە ژنان بەپێی سروشت ناتوانن بەڕێوەی بەرن، بێسوودە کە بۆ ئەوان قەدەغە بێ».[80] پیاوان بۆ پاساو دانەوەی زوڵمی خۆیان هانا دەبەنە بەر داب و نەریت، بەڵام سەڵتەنەتی نەگۆڕی و کۆیلایەتی رەشپێستەکانیش چنگیان هەر لەم دۆزە گیر کردبوو. لەبەر ئەمە، ئێمە دەبێ لە بەرامبەر وەها واتاگەلێک و تەسەوراتێکی گشتیدا، بە گومان و رەشبین بین. ژنان توانایی خوێندەواری و بەرەو پێشبردنی پرۆژەگەلی ژیانی خۆیان هەیە، دیسان ستوارت میل بە رەتکردنەوە برێک لە ئاستەنگییە یاساییەکان و فێرکردنی بۆ ژنان تێهەڵدەچنەوە تاکو رێگا بۆ بەرەو پێشچوونی مرۆڤایەتی هەموار بێ. ئەو جۆرە کە گوتوویەتی:

پرەنسیپێک کە میزانکردنی پێوەندی کۆمەڵگەی ئێستەی نێوان رەگەزی بە ئەستۆیە ـ پێڕەوی یاسای رەگەزێک لە رەگەزێکی دیکە ـ خۆی لە خۆیدا نادروستەو هەنووکە یەکێک لە لەمپەرە سەرەکییە پێشکەوتووەکانی مرۆڤایەتی دەدرێتە قەڵەم، ئەم پرەنسیپە دەبێ جێی خۆی بدا بە پرەنسیپی تەواو یەکسانی ئەو جۆرە کە نە رەگەزێک تەواو خاوەن دەسەڵات بێ و نە رەگەزێکی دیکە بێدەسەڵات.[81]

مارکس له یەکێک له مقاله سەرەتاییەکانی خۆیدا بە ناو «دەربارەی مەسەلەی جوولەکە»، وەکو ستوارت میل، روانگەی مافە سروشتییەکانی بە رەتکراوە دەزانی. لەگەڵ ئەمەدا، ئەم کاری بۆ داپۆشینی بەرژەوەندی خاوەنداریتی بورژوایی دەدایە قەڵەم. زوڵم دەستکەوتی بوونی چین و پێوەندی ئابووری ناخی سیستەمی سەرمایەدارییە. ریشەی لەسەر ژنان، مەنتقی نامرۆڤانەی دژی سەرمایەدارییە. بنەماڵە، خاوەنداریتی تایبەتی، دابەشکردنی کار، کار لە ناوماڵ و دۆخی ژنان بەرهەمی کەش و هەوای مێژوویی و ئابوورین کە بەردی بناخەی بێعەدالەتی یاسایی و سیاسی پێکدێنێ. ئینگلیز لەمەڕ سەرچاوەی هاوسەرگیری تاکهاوسەری دەنووسێ:

«ئەمە یەکەم بیچمی بنەماڵە بوو کە نەک بەپێی بارودۆخی سروشتی بەڵکو لەسەر بنەمای بارودۆخی ئابووری، واتە زاڵبوونی خاوەنداریتی تایبەتی بەسەر خاوەنداریتی رەسەن و سروشتی هاوبەشیدا بۆو».[82] بە بۆچوونی ئینگلیس یەکەم شێوەی چەوسانەوە دەکرێ لە بنەماڵەدا ببینرێ، واتە خۆشگوزەرانی پیاوان بە زوڵم لەسەر ژنان دابین دەکرێ. زۆرینەی ژنان نەک لەبەر عەشق، بەڵکو بە دەلیلی پاڵپشتی ئابووری لەگەڵ پیاوان ژنان دەکەن. شەوقەی بەناوبانگی ئینگلیس لە هاوسەرگیری بورژوایی کە ئەوە ناو دەنێ گەندەڵکاری یاسایی، هەر لێرەوە سەرچاوە دەگرێ.[83]

لە روانگەی گەلێک لە فەمینیستە رادیکاڵەکان و سۆسیالیستەوە، بنەڕەتی شعووری زوڵم لە واژەی باوکساڵاریدا شاراوەتەوە. ئەم واژە «پێکهاتەی سیاسی جێی پشتگری پیاوانە».[84] بناخەی ئەم زوڵمە لەسەر ژنان لە مافە یاساییەکان و کۆمەڵگەیان جەبری ئابووریدا نابینێ، بەڵکو زۆرتر ئەوە بە خاوەنی ریشەگەلی دەروونییەکی قووڵ لە دەروونناسی، بیرکردنەوە و زمانی پیاوانەدا گومان دەکرێ. باوکساڵاری لەسەر جۆری کرداری نێرینە پێدادەگرێ.

لەم رووەوە، ئەم مەیلە دەکرێ بە دەروونناسی، زمانناسی و بیولۆژیکی بزانرێ. دەکرێ ئەم شێوە رەفتارە نێرینانە تەواو و کەماڵ لەگەڵ رەگەزی پیاوانە

ـه تـه‌رازوو بخـرێ؛ هـه‌روه‌ها مومکینـه لـه‌و سـیفاته‌وه هاتبـێ کـه لـه بـاری
ـچوونییه‌وه له هه‌ر دوو ره‌گه‌ز ره‌نگ بداته‌وه.

ێره‌دا فه‌مینیسته سۆسیالیسته نوێکان خۆیـان لـه دۆخێکـی نالـه‌باردا ده‌بیـنن.
ـئوان له‌گه‌ڵ راڤه‌کردنی باوکسالاری تێکۆشـاون و لـه لایه‌کـه‌وه له‌سـه‌ر لایـه‌نی
ـبووری که له‌باری مێژووییـه‌وه هه‌ڵـگری گۆڕانکارییـه، سـه‌رپۆش دابنـێین و لـه
ـیـه‌کی دیکـه‌وه، له‌سـه‌ر کۆمـاکۆی کێـشه گـشتییه‌کانی رادیکالـی بیولـۆژیکی،
ـانناسی و ده‌روونناسی ته‌ئکید ده‌که‌ن. به بۆچـوونی سۆسیالیـسته‌کان «ئه‌مـڕۆ
ـه پێشبوونی پیاوانه و سه‌رمایه‌داری، پێوه‌ندی سه‌ره‌کی چاره‌نووسـسازی زوڵـم
ـه‌سه‌ر ژنـان پێکـدێنن».[85] مارکـسیزمی سـوننه‌تی «کـوێرجنس» ناسـراوه، بـه‌لام
ـ دیکالـه‌کانیش تووشـی تـاوانێکی ئـه‌وتۆ بـوون و تاوانبـارکراون بـه «کـوێری
مێژوویی». واته ئه‌مه که له بناخه‌ی مێژووی و ماددی باوکسالاری خافڵ ماون.[86]
ـارکسیزمی سوننه‌تی له شوناسـی شـێوازه‌کانی زوڵـمێک کـه ژنـان لـه‌وه ئـازار
ـده‌بینن، تێکشکا. له راستیدا ئه‌م زوڵمه بـه‌ر له‌سـه‌رمایه‌داری بـوونی بـوو و پـاش
ـئه‌ویش هـه‌ر به‌رده‌وامـه و ده‌سـتکه‌وتی زاینـه‌وه ژنـان بنه‌مالـه‌یه. مارکسیـسته
ـسوننه‌تییه‌کان له‌گه‌ڵ سه‌رنج و تێڕامانی له‌راده‌بـه‌ده‌ر له‌سـه‌ر پیشه‌سازی مـه‌زن
پیواره له لێکدانه‌وه‌ی ئه‌م مه‌سه‌له که ژنان کرێکاری ناوماڵن. ناکام مانه‌وه (چونکه
پرۆلیتاریایان هه‌ر له ده‌روونی پیشه‌سازیدا ده‌دی). ئه‌وان هه‌روه‌ها له‌سـه‌رنجدان
به به‌رژه‌وه‌ندییه‌ک که له‌م کاره ناوماڵیه به ده‌ستدێ، ناکام بوون.

له‌به‌ر ئه‌مه، فه‌مینیسته سۆسیالیسته‌کان تێکۆشاون زانیاری ئێمه سـه‌باره‌ت بـه
به‌شکردنی کار و زوڵم له‌سه‌ر ژنان به‌رفراوانتر بکه‌نه‌وه و سه‌رنجی ئێمـه بـه‌ره‌و
پێوه‌ندگه‌لی حه‌یاتی نێوان زاینه‌وه دروستکردن، و له‌به‌ر ئه‌مه به رۆڵی بنه‌مالـه لـه
سیسته‌می سه‌رمایه‌داریدا، رابکێشن. له‌م باره‌وه فام له خۆبێگانـه بـوونی ژنـان و
زوڵمێک که قبووڵی ده‌که‌ن، قووڵتر بۆوه. بـاوکسـالاری تێکـه‌لاوێک لـه هۆکـاری
ئابووری ره‌گه‌زیه. سه‌رمایه‌داری لـه نـاخی بـاوکسـالاری و له‌پـه‌نای ئـه‌ودا کـار
ده‌کا. به‌م جۆره زوڵـم له‌سـه‌ر ژنـان قووڵـتر له‌وه‌یـه کـه مارکـسیزمی سـوننه‌تی
هێناویه‌ته ئاراوه. باوکسالاری بناخه‌ی ماددی هه‌یه.

واکونـشێکی زۆر لـە رادیکالـەکان لـە بەرامبـەری ئـەم لێکدانـەوەدا هەڵـگری پێشبینییە. زوڵم لەسەر ژنان لە بیولۆژی و دەروونناسی پیاوانـەدا ریـشەی هەیـە هێندێ ئەم زوڵمە بە دیاری واتای نێرینە بوون دەزانن کە ریشەی لە توندوتیژی و دەمشـرێدا هەیـە کۆمەڵـێکی دیکـە، ریـشەی توندوتیژی و زاڵـبوو لـە زمـان، بـیر کردنەوە و کرداری پیاوانە دەبینن. فەمینیزمی فەڕانسەوی سـەرنجی خـۆی بـەد پانتایەی دوایی کە دەبێتە «داربەدەست و کوتـەکهەڵـسوورێن» دابـوو. رێـرەوی دەروون تۆژانەتر، لـە ئاسـەواری نووسـەرانێکی وەکـو کیـت میلـت، لەسـەر ئـەد باوەڕەیە کە دەوری رەگەزایەتی لە لایەن بنەماڵەوە لە منداڵاندا پەروەردە دەدرێ و زۆر جار مەزەب دیرۆک و فێرکردن و پەروەردە گورِ و تین بەوان دەبەخشی ئەم کارە لانیکەم ئەم هیوایەی بەدیهێناوە کە پیاوانیش زۆر جار لەم بابەتەوە بار بـێن و لـە داهـاتوودا بینینگـەلێکی شـیاوی پەسـندتر بـەدەس بێـنن. لـە روانگـەی ئاریگاری، سیشوو و کریستۆڤا ژنانیش لەگەڵ پەروەردەی شێوازەکانی زمـانی و نووسراوەیی خۆ دەرمان دەبن.

## بەرامبەری و جیاوازی

دۆزی بەرامبـەریـش لەسـەرجەم بزاڤـەکانی فەمینیـستی تەنینەوەگـەلێکی سەرەکی بەدیهێناوە. بەپێچەوانەی ئەمە کە وەک یەکبوون لـە روانگـە فەمینیـستی لیبراڵـەوە بایـەخێکی زۆر بـاڵای هەیـە، فەمینیـستی مارکسیـستەکان بـە چـاوێکی گوماناوییەوە سەیری دەکەن. برێک لە رادیکاڵەکانیش لەمـەڕ یەکسانی بـەش بـە حالیخۆیان گومانگەلێکیان هەیە و ئەوە بە میتۆدێک بو گۆڕینی حاڵـەتە ژنانـەکانی لە حاڵەتە پیاوانەکاندا دەزانن. هەڵبەتە مومکینـە ئەمـە جیـاواز یـان بەرامبـەر بـێ. بەڵام لە هێندێ شوێندا فەمینیستەکان بەڵگەیان هێناوەتەوە کـە مایـل بـە بەرامبـەر بوون لەگەڵ پیاو نین چونکە ژنان بەپێی سروشتی خۆیان پلەبەرزتر لە پیاوانن کە دەرەنجام هێندێ لە فەمینیستە ئەمریکاییەکانی وەکو بـتی فریـدن ئـەم رووداوەی بە «تەعەسوبی رەگـەزیـەت پەرستی ژنانـە» نـاو نـاوە. لەبـەر ئەمـە، مەسـەلەی سەرەکی باوەڕی بەرامبەری و جیاوازی سـەر لـەم پرسـیارە دەردێنـێ کـە: ئایـا

ـەنجی فەمینیزم دەبێ یەکسانی مەدەنی، سیاسی و کۆمەڵایەتی بێ، یان ئەمە کە ژ‌ن یەکسان بوون لەگەڵ پیاوان ڕەت دەکەنەوە و لەسەر جیاوازییەکانی خۆیان پێداگرن؟ لە ساڵەکانی دوایی‌دا مەسەلەگەلێکی زۆر لەمەڕ شاراوەی واتای حیاواز» و ئایا ئەمە کە بەڕاستی شتێک «لەبنەڕەتدا» پیاوانە یان ژنانە بوونی هەیە، پێش هاتووە؟ بابەتی دوایی لەگەڵ لەبەر دەرچوونی پۆستمودێرنیستەکان ـە گۆڕین و ریفۆرمی وتەگەلێکی «وەکو ڕەگەزایەتی» پێوەندی هەیە.

هۆکار و بەڵگەی یەکسانی لە لایەنگری و پاڵپشتی زۆر توندی باڵی لیبراڵی ـەمینیزم بەهرەمەند بوو. ولستۆن کرافت یەکسانی لەگەڵ بینینی مافە ـەرامبەرییەکان لە ئازادییە مەدەنییەکان سەرەکی لێکی ئەداوە و بەراوردی ـەکرد. ئامانجی ولستۆن کرافت بە هەمان رادەی ئیمتیازی پیاوانەی ـەرمایەداری بوو، واتە میراتی بوورکین کە مافە یەکسانییەکانی رەتدەکردەوە و ـەسەر بوونی پلەبەندی یاسایەکان و سیاسی پێی دادەگرت. ئەم خانمە لە ـاخەوە بیری لە مافەکانی ژیان، ئازادی، سەربەخۆیی ئابووری، فێرکردن و پەروەردە و گەیشتن بە پیشەکان دەکردەوە.[88] بە بۆچوونی ئەو، خودا ئەم ـافانەی بە شێوەی یەکسان لە رۆحی کۆماکۆی مرۆڤەکان بە ئەمانەت داناوە. بە باوەڕی ئەو، جگە لە دەسەڵاتی جسمی ئاشکرا، جیاوازیگەلێکی زۆر کەم لە نێوانی ژنان و پیاواندا بوونی هەیە. لە راستیدا دەبێ ژنان لە داهاتوودا بتوانن کە هەم ـەش و هەم رۆحی خۆیان بەهێز بکەن.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا باوەڕگەلی گرێبەستکراو بە یەکسانی لیبراڵی سەرنجی خۆی بەسەرداخوازی مافە سیاسییەکاندا بۆ بە دەستهێنانی مافی دەنگدان شۆڕەوە کردبوو، جان ستوارت میل لە نووسراوەکانی خۆیدا دەیگوت ئازادی مەزنترین ویستی مرۆڤە. هەر تاڵێک ئەگەر بەخت و ئیقباڵی دروستکردنی پرۆژەی ژیانی خۆی نەبێ لە گەشەکردن دوادەکەوێ.[89] لانیزۆرینەی ئازادی هەڵگری لای زۆرینەی سوودمەندی بوو. بە بۆچوونی میل، ئازادی پێویستانە سەری لە یەکسانی دەردەهێنا. بە بڕوای ئەو قەراردادەکان، یاسای

هاوسەرگیری، یاسای خاوەنداریتی، فێر کردن و پەروەردە و مافی رەئی دەبێ بۆ هەمووان یەکسان بێ.[90]

لە سەدەی بیستەمدا فەمینیستە لیبرالەکان بۆ بە دەستهێنای بەرامبەری سەرنجیان دابووە مافە خوشگوزەرانییەکانی کۆمەلگە.لە هێندێ شوێندا ئەم داخوازییە هەلگر و هێنەری زۆربوونی پشتگریکردن لە بنەمالە و مندالان دەبوو: لە هێندێ ناحیەی دیکەوە دەرفەتگەلی بەرامبەری تەواو لە باری فێرکردن و پەروەردە، پیشە، هەقدەس، هاوسەرگەری، خاوەنداریتی، هاوبەشی سیاسی و مەدەنیتی دەگرتەخۆ.[91] ئەم جۆرە داخوازیانە لە بریتانیا و ئەمریکا لە دەیەکانی ١٩٦٠ و ١٩٧٠ بە سەرکەوتنگەلێک گەیشت.

مارکسیزم، بەپێچەوانە راستی کە لەسەر ناوەڕۆکەکانی یەکسانخوازانە لە مێژوویی سۆسیالیزمدا تەئکیدی دەکرد، کاتێک بەسەر بزاڤدا زالبوو، یەکسانی هەر تەنیا بە گومانێکی دیکەی بورژوایی زانی. مارکسیستەکان یەکسانیش، وەکو عەدالەت و مافەکان، بە شێوەی بەشێک لە خووی سەرمایەداری لیبرال چاویان لێ کرد. بە بۆچوونی ئەوان نایەکسانییەکان بێگومان بوونیان بوو و دەبوو لەگەل سیستەمی کۆمۆنیستی لەناو پاک ببنەوە و ریفۆرم دەکران؛ نایەکسانی خۆی لە خۆیدا شەڕ نییە بەلکو هێمایەکی نەخۆشی قوولترە. نایەکسانی لایەنێک لە کۆمەلگەیە کە بە هۆی خەباتی چینایەتیەوە لەبەریەک بلاوبووەتەوە. پێگەی ژنان لە سیستەمی سەرمایەداریدا مەعلوولی کرداری نایەکسانی لەگەل ئەوان نییە. کرداری نایەکسانی خۆی مەعلوولی سیستەمی سەرمایەدارییە.

واژەگەلی یاسایی، سیاسی یان کۆمەلایەتی هەر تەنیا دەتوانن دلخۆشکەری گەلێک بن. ئەم جۆرە واژەگەلە هیچ گرێکوێرەیەک ناکەنەوە. بەم شێوەیە، ناوەڕۆک و کاکلەی یەکسانی لەگەل مارکسیزمی سوننەتی و فەمینیزمی سۆسیالیستی نوێدا پێشچوونێکی ئەوتۆیان نەکردوە.

بەلام لە روانگەی رادیکالەکانەوە، ناوەڕۆکی یەکسانی و جیاوازی کارێکی ناوجەرگە و سەرەکییە. لەسەرەتادا ناوەڕۆکە یەکسانیخوازەکان لە ناخی فەمینیزمی رادیکالدا بوونی بوو. بۆ وێنە رێنوێنییە سەرەتایەکان دەربارەی

-ووره‌گه‌زایه‌تی دارڕژاو له‌سه‌ر شێوه‌یه‌ک له‌ یه‌کسانیخوازییه‌کی سه‌یر بوو که‌ له‌ هێندێ شوێندا له‌سه‌ر به‌ره‌و پێشچوونگه‌لی ته‌کنۆلۆژیکی له‌ بیۆلۆژیدا پێی ـاده‌گرت. ره‌تکردنه‌وه‌ی دووره‌گه‌زایه‌تی دوایی، ئه‌و جۆره‌ که‌ پێشتر گوترا، سه‌ری بینینی ره‌خنه‌یی سه‌باره‌ت به‌ یه‌کسانی و هه‌م به‌ شێوه‌ی بایه‌خ و هه‌م به‌ شێوه‌ی ئامانجی سیاسی، ده‌رهێنا. ئه‌مه‌ قۆناخێکه‌ که‌ جیاوازی ژنان له‌گه‌ڵ پیاوانیان ده‌په‌رست و ڕێزیان بۆ داده‌نا. به‌شکردنی نێوان نێرینه‌کان و مێوینه‌کان له‌ نووسراوه‌کانی رادیکاڵدا به‌ «درزی ره‌گه‌زی» ناوبانگی ده‌رکرد.[٩٢]

به‌ڵگه‌ و ده‌لیلگه‌ل و باوه‌ڕه‌کانی وزه‌ی بازنه‌ی روانگه‌ی جیاوازی زۆر جۆراوجۆرن و مێژووی په‌ره‌گرتنی ئه‌وانه‌ له‌ ده‌یه‌ی ١٩٦٠ زۆر پێچراوه‌ و چه‌واشه‌ بووه‌. یه‌که‌مین دۆزه‌کان له‌مه‌ڕ جیاوازی پێوه‌ندی به‌ بیرمه‌ندانێکی وه‌کو کیت میلته‌وه‌ بووه‌ که‌ جیاوازی نێر ـ مێی به‌ به‌شێک له‌ چه‌وسانه‌وه‌ی پیاوسالارانه‌ی ده‌زانی. هه‌تا راده‌یه‌کی به‌ربلاو ئه‌م جیاوازیانه‌ی به‌ درۆ و فێڵ و ده‌ستکرده‌ رواڵه‌تییه‌کانی کۆمه‌لایه‌تی بۆیان ده‌ڕوانین که‌ ده‌یویست ژنان له‌ ده‌روونی هێندێ له‌ ده‌ور و رۆڵه‌کاندا به‌ستراوه‌ رابگرێ. به‌و بۆنه‌وه‌ نووسه‌رانێکی وه‌کو شولامیت فایرستۆن مه‌سه‌له‌ی جیاوازیان شل‌شل کوتا. ئه‌و ده‌یویست له‌گه‌ڵ هێنانه‌وه‌نه‌ی به‌ڵگه‌ بۆ به‌رژه‌وه‌ندی به‌رامبه‌ری دووره‌گه‌زایه‌تی، کارکرده‌ سیاسییه‌کانی جیاوازی پاکتاو بکا. به‌م حاڵه‌وه‌، له‌ ده‌یه‌ی ١٩٧٠ جیاوازی هه‌میسان به‌ حوسن و جه‌ماڵه‌وه‌ سه‌ریهه‌ڵداوه‌. له‌ سه‌ره‌تادا، به‌لای فه‌مینیسته‌ که‌لتوورییه‌ رادیکاڵه‌کانه‌وه‌، جیاوازی هاوته‌ریب بوو له‌گه‌ڵ پله‌به‌رزی ره‌گه‌زی مێوینه‌، له‌ پێشبوونی ئه‌خلاقی ژنان، بایه‌خی خوشکایه‌تی، هاوره‌گه‌زخوازی سیاسی و جیا بوونه‌وه‌ له‌ پیاوان. هه‌روه‌ها ده‌یانگوت ژنان بینینێکی زۆر جیاوازیان سه‌باره‌ت به‌ پیاوان له‌مه‌ڕ جسمی خۆیان هه‌یه‌. توانایی جسمانی بۆ په‌روه‌رده‌ کردنی منداڵان، بینینی زۆر پۆزه‌تیف و بالا به‌ ژنان ده‌به‌خشی، ئێستا ئه‌وه‌ که‌ گومان ده‌کرا که‌ پیاوان خاوه‌نی سیفاتی نیگه‌تیفی ده‌مشڕی، پله‌به‌رزی و وێرانگه‌رین. ناوه‌ڕۆکی تایبه‌تی دوایی سه‌رله‌نوێ له‌ لایه‌ن ئێکۆفه‌مینیسته‌کانه‌وه‌

دەستی پێکردووە کە ئالۆزیگەلی بەستراوە بە پێگەی ژینی بەبایەخە نیگەتیڤەکانی پیاوانە و بینینی پیاوان لەمەڕ سروشت پێکەوە گرێبەست دەکەن.

لە دەیەی ١٩٨٠ مایلبوون بە جیابوونەوەی کەلتووری سەرزی لە بەردو پێشچوونێکی نوێ وەدەرنا. یەکەم بە هۆی بایەخی کەلتووری ـ ئەزموونی جیاوازی ژنان، موتالای ئاکادمیک دەربارەی زانین لە باری جیاوازی ژنانە پەرەی گرت و ناوی «لێکدانەوەی ژنداری» بە دەستهێنا. جیاوازییەکانی ژنان بە مانای شێوازی ژیان و ئەندێشەی جیاواز بوو. ئەم کارە بە گەشەکردنی ریشەگەلی موتالایی و ئەدەبیات لەمەڕ ژنان، بە کۆتایی گەیشت. دووەم، بە ئەزموونی زیاتر لە نەهادی پیاوسالارانە، دایکایەتی بەتایبەت لە نووسراوەکانی ئادرین رایکدا سەرلەنوێ ڕێزی لێگیراوە. سێیەم، بایەخەکانی جیاوازی، بەلام بە تەنیا بیری دایکانە گەیشتە لووتکەی بایەخەکان. لەمەڕ کەسایەتییەکان و ورەی جیاوازی ژنان لە نووسراوەکانی نانسی کودوورو تۆژینەوە و لێکۆلینەوەیان کرد. ئەوانی دیکە لەسەر ئەم باوەڕە بوون کە ژنان ورەی پەروەردەکردن و ئاشتیخوازانەیان هەیە کارول گیلیگان لەمەڕ (ئەخلاقی ئاگالێبوون و چاوەدێری) لە ژناندا لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ «ئەخلاقی عەدالەت» لە پیاواندا پەرەی بە دۆزەکانی خۆیدا. ئەو جۆرە کە لە پێشدا گوتمان ڕوودیک و ئەشتیان باوەڕیان وابوو کە ئەم بایەخ و بیری دایکانە دەتوانێ لە پانتای گشتی سیاسەتیشدا زۆر سوودمەند بێ. ئەمە بە دۆزی وەجوولە خستنی لێدوانی «فەمینیزمی لایەنگری بنەماڵە» بە کۆتایی گەیشت.

کۆتایی دەیەی ١٩٨٠ شاهیدی گەشە کردنی فراوانی دزەی فەمینیزمی فەڕانسەوی بوو کە بوونی جیاوازی لە ژناندا نسبەت بە پیاوانی ستایش دەکرد واتاگەل بەرامبەری و تەنانەت واژەی فەمینیزم بە شێوەی هاوکێشی گومان لەگەڵ ریفۆرمخوازی بورژوایی کەوتنە بەر شەپۆلی گومان. فەمینیستە فەڕانسەوییەکان ئەگەرچی لەژێر کاریگەری ناوەڕۆکەکانی پێکهاتەشکێنی و گومان دەربارەی واتاگەلی بیولۆژیکی دۆزگەلێکی جیاوازیان بوو، زالبوونی زمانی «کوتەکداری» پیاوانەی ڕەتدەکردەوە و سەرنجیان دابووە نووسراوەی جیاوازی تاقانەی ژنان و بڕوایان بوو کە دەبێ لە زمانی ئەو ڕەمزگوشایی بکرێ. لەم باوەڕەدا جیاوازی

ـەیی زمان باسی دەکرا. بابەتی دوایی لەگەڵ «رەئی روانگەی رادیکاڵ» تێکەڵی ھەیە کە ئەویش بە زەروورەتی بوونی شوناسناسی ژنان و زانستباوەڕی ھەیە.

لەم دواییانەدا فەمینیستە فەڕانسەوییەکان لە سێ دیمەنەوە جیاوازیان ئاڵەبێژ کردووە. یەکەم: فەمینیستە بەزەوقترەکانی پۆستمودێرنیست و ـەساپێکهاتەخواز لە رەخنەگەلی لفە و دوانەی رەگەزایەتی «نێر و مێ» خۆیان بە ـێیەنی رووبەڕوو بوونەوەی نەزەر داناوە.[93] بە جۆرێکی دیکە، رێنوێنی گرێدراو ـە جیاوازی دارڕژاوە لەسەر هێندێ بەرامبەریە سەرەکییەکان کە خۆیان پێویان بە ـساختشکێنی هەیە. مانای «نێر» و «مێ» دەبێ دواکەوتوانە دابنرێ.

بنەماخوازی ساکار دەربارەی مێی زۆر راڤەگەلێکی مومکینی لە مژێکی شاراوەدا نوقم دەکا. دووەم، رەخنەی پێوەندیدار، بەلام بەکردەوەتر دەربارەی ئەندێشەی جیاوازی مەترسی بنەمایی کردنی زمان ئەمەیە کە ئەوانە جارێکیتر ناچار دەبن لە بنەماڵەوە بەرەو پێگەی «سروشتی»یان دایکانە راوبنرێن. لەم بارەوە جیاوازی «بۆشایی رەگەزایەتی» بنەماخوازی دەکرێ ئامێرەکان لە جانتای ئامێری پیاوسالارانە بخرێن.[94] سێیەم، جیاوازییە واجبەکانی نێوان ژنان و پیاوان لە جیاوازییەکانی نێوان ژنان خۆیان لە باری تەمەن، نژاد، چین، فەرهەنگ، قەومییەت، نەتەوە، پلەبەخشینی رەگەزی و ژن و مێردایەتی غافل دەمێنێ. لەراستیدا ئەم جیاوازیانە مومکینە بەرینتر و بەربلاوتر لە هەر چەشنە جیاوازی ئەگەر و گریمانەکانی رەگەزی بێ. کۆشش بۆ راونانی ژنان بۆ ناو دەستەیەک و پیاوان بۆ دەستەیەکی دیکە، جۆرێک تەواوخوازی و وتاری سەرکوتگەرانەیە. لەم بوارەدا هەروەها گوتراوە کە هیچ سیفەتێکی گشتی و سەرەکی بۆ ژنان بوونی نییە. جەوهەری رەگەزایەتی راستەقینەی ماددی بە پێکهاتەکانی کۆمەڵگە دەبەخشێ. لە راستیدا سیفاتێک کە بە بوونەوەری نێر و مێوی دەلکێنن، لە لایەکەوە هەر دوو جنس بەرداری کارن. بۆ وێنە پیاوانیش دەکرێ رۆحی هاوکاری و هەرەوەز و پەروەردەیان تێدا بخولقێ.

## ئەهلی بە شێوەی سیاسی

ناوی ئەم بەشە لە لایەنێکەوە گۆڕاوە بە دروشمی سەرەکی فەمینیستی ـ
زۆر ساکارە، هەرچەند کە برگە و شەقکراوی زۆر و فراوانی هەیە. لەسەر ئەو ـ
کە ئەوەی کە پێشەکی بە بەشێک لە پێکهاتە تایبەتییەکان و گشتی دەزانن ـ
راستیدا ئامێرگەلێکی ناخی ئیدئۆلۆژیکی و دەستێوەردان کە بەرژەوەند
پیاوسالارانە لەودا رەنگدەداتەوە. بەم جۆرە جیاوازی دێرینەی «گشتی
«تایبەتی» کارێکی نوقسانە و هێندێ مەسەلەگەلی بەتەواو مانا سیـ
دەشارێتەوە.

پێگەکانی رەخنە «تایبەتی بە شێوەی سیاسی» لە هەڵوێستی فەمینیـ
لیبرالدا جێی گرتووە. لیبرالەکان بە شێوەی سوننەتی ژیانی تایبەتی تاک، بنە
و ئابووری مامەڵەی خوسووسیان دەکرد. فەمینیستە لیبرالەکان بەتایبەت زۆر
رەخنەی خۆیان دەکردە دوو هەرێمی یەکەم. بۆ بۆچوونی فەمینیستە لیبـ ـ
سەرەتایەکانی وەکو ولستۆن کرافت، فیکری ئەمە کە ژنان لە ماڵەوە پێگـ
سروشتی خۆیان هەیە و ئەرکی یەکەمی ئەوان لە ماڵەوەیە، لە گومان بەولاو ـ
نییە. یەکەم ئەرکی ژن هۆش و بیرکردنەوەیە. لە راستیدا ئەم هۆش ـ
پێشەکییەکی مەنتقی پێویستە بۆ هەر ئەرکێک، تەنانەت دەروونی بنەماڵە دەد
قەڵەم. بە وتەی ولستۆن کرافت: «هۆش بە شێوەی سروشتی لە کاتێکدا بەسـ
بێ بە دەسەڵاتێکەوە، بێهێز دەبێ و ناتوانێ دەسەڵاتەکانی خۆی بخاتەگەر ـ
رووەوە هاوسەری فرمانبەر دەبێ بە دایکێکی تەمبەڵ و تەوەزەل».[٩٥] مەبەسـ
ئەمە کە سروشتی رەگەزی ژن ناوەندی سروشتی و تایبەتییە یان ئەمە کە بنەـ
هەوای تایبەتییە لە روانگەی ولستۆنەوە بێبایەخ و نادروست بوو. تەو
ویستی ئەو پێکهێنانی وەک وێنە کۆماری مەدەنی بۆ بنەماڵە بوو ئەو جۆرە ـ
بواری فێرکردن و کار فێربوون بۆ سەرهەڵدانی رۆحی گشتی لە هاوو ـ
دروست بێ نەک ئەمە کە پانتای هەڵسوکەوتەکان و دڵۆڤانییەکان وەک هەـ
هەوەس مامەڵەی لەگەڵ بکرێ. پێوەندی نێوان ژن و مێرد دەبێ زۆرتر بە ـ
شعووری هاوبەش و رفێقایەتی و دۆستی بێ هەتا جێوبانێکی راخراو ـ

هەلسوکەوتەکان و هەوا و هەوەس.[96] هەوا و هەوەس بۆشایی دەخاتە شعووری ت‌کەکانەوەنە و پێکهاتەی کۆمەڵگە لاواز دەکا.

جان ئەستوات میل و لانی زۆرتری سونەتی فەمینیستی لیبرال لە زۆربەی ئەو باوەڕانەی باسیان لێوە کرا، بەشداربوون. لە دەیەی ۱۹٦۰ ئەم بابەتە بە شێوەی خالێکی گرنگ لە کتێبی بتی فریدن، بەناوی راز و رەمزی ژنانەن، هاتە ئاراوە. ئەو ئەم شێوە بەیانەی داهێنا کە «مەسئەلەیەک کە هیچ ناوێکی نییە» هەتا ئەم راستییە باسبکا کە زۆر لە ژنان خۆیان لە ناوەڕۆکی بنەماڵەیەکدا دەبیننەوە کە تایبەتی و شەخسییە و لەسەر ئەو گریمانەیە کە بۆ رازیبوونی ئەوان پێکهاتووە. بەلام لەودا دووچاری وەها ئەزموونێکی قوول سەر لە بەرد دان و ناهومێدی ناڕەزامەندی دەبن کە زۆر جار ناتاوون ناوێکی شیاوی بۆ بدۆزنەوە. باوەڕی فریدن لە بنەڕەتەوە ئەمەیە کە بەگشتی ژنان لە بناخەوە لەگەل پیاوان لە بابەتی پێگە، مافەکان و دەرفەتەکان هەست بە نابەرامبەری دەکەن. پێکهاتەی بنەماڵەی تایبەتی بەرژەوەندی باوکسالارانەی پیاوان لە پاراستنی ئەم نابەرامبەرییەی دەشارێتەوە. بەگشتی، رەخنەی لیبرالی لە بابەتی شەخسی ـ سیاسی بۆ ناسینی هێندێ لە مافەکانە کە لە ژنان درێغ کراوە. ئەم مافانە رەنگە لە بنەڕەتەوە لەگەل ریفۆرماتی یاسایی، کۆمەلایەتی، سیاسی و فێرکردن راست بکرێنەوە. ئەم راستکردنەوە بنەماڵە کاول ناکا. لە راستیدا لیبراڵەکان هێشتا چاوەڕوانن کە ژنان دەورێکی چالاکیان لە ژیانی بنەماڵەدا ببێ، ئەگەرچی چاوەڕوانیش لە پیاوان دەکرێ کە سەهمی بەرامبەر لە کاری ناومال و پەروەردەی منداڵدا بگرنە ئەستۆ. لەبەر ئەمە، هەر ئەو جۆرە کە ولستۆن کرافتیش باوەڕی بوو، بنەماڵە هێشتا دەوری گرنگی سوننەتی بە ئەستووە هەیە. ئەم واتا یەکسانخوازانەترەی بنەماڵە تا رادەیەک لە لایەن لایەنگرانی «بیری دایکانە» و «ئەخلاقی چاوەدێری» بەتایبەت فەمینیستەکانی «لایەنگری بنەماڵە» تەئکید کراوە. دۆزی نوێی فەمینیستەکانی لایەنگری بنەماڵە ئەمەیە کە ئەم بیرە دایکایەتیانە «لە لایەنی هەر دوو جنسەوە» کە پێشەکی بۆ بنەماڵە چارەنووسساز بوو، دەبێ لە داهاتوودا بکێشرێتە پانتای

گشتییەوە. ئەم کارە شێوەگەلی دێرینی داشی گشتی ـ تایبەتی بە شێوازێکی جیاواز و رەسەن لەناو دەبا.

فەمینیستە مارکسیست و سۆسیالیستەکان مەسەلەی «تایبەتی و سیاسی» بە بەشی قەڵەمڕەوی ئابووری دەزانن، ئەگەرچی مارکسیزم لە سەرەتاوە لەگەڵ جودایی هەر چەشنە کارێکی گشتی لە تایبەتی دژایەتی بوو. ئەم جیاوازییە بە چاوی ئامێری رەشبینانەی ئیدئۆلۆژی لیبرالی سەرمایەداری سەیری دەکرا کە واتای «تایبەتی» لە راستیدا بە مانای «خاوەنداریتی تایبەتی»یە. بە بۆچوونی ئینگلیس بنەماڵە لە باری مێژووییەوە نەهادێکە لە حاڵی گۆڕینە. کۆمەڵگە پێشوەکان بەپێی شێوازە جیاوازە بەرهەمهێنانی و خاوەندارییەکان، دارای سیستەمێکی جۆراوجۆری ژن و مێردایەتی وەکو چەندهاوسەری بوون. بنەماڵەی نوێی تاکهاوسەری پیاوسالار لە پێوەندی عاشقانە بێبەشە و «ئەمە یەکەم بیچمی بنەماڵە لەسەر بنەمای پیشەسازی ئابووری دارژابوو نەک پێوەندی سروشتی. واتە لەسەر بنەمای سەرکەوتنی خاوەنداریتی تایبەتی بەسەر خاوەنداریتی سروشتی و رەسەن کە خاوەنداریتی هاوبەش بێ، دارژاو بووە».[97] یەکەم دژایەتی چینایەتی لە بنەماڵەوە سەریهەڵدا چونکە بنەماڵە شوێنێک بووە کە لەودا «خۆشگوزەرانی کۆمایەک بە نرخی نەهامەتی و سەرکوتکردنی کۆمایەکی دیکە دابین و دەستەبەر دەکرا».[98] بە بۆچوونی ئینگیلس دوارۆژی دایمی ژن و مێردایەتی بورژوایی گەندەڵکاری و قورمساخییە.

ئەگەرچی ئینگلیس بۆ پاکتاو کردنی زاڵبوونی پیاو و پیشەی بەرامبەری ژن، رزگاری ژنانی لە لایەن تەلاقەوە دەیهێنێتە ئاراوە، کەم و زۆر بە پەرەسەندنی ئیزدواجی تاکهاوسەری و ئیمکانی ئەمە کە سروشتی تر ئەوەیە کە ژنان بە پەروەردە کردنی منداڵەوە سەرقاڵ بن، باوەڕی هەیە. بەم شێوە دیاری دەستی مارکسیستی، دابەشکردنی رەگەزی کار لە کارخانە بوو. خانمی ئەلکساندرا کولۆنتای لەگەڵ ئەم دۆزە تایبەتییەدا نییە. فەمینیستە سۆسیالیستەکانی دوایش رەخنەیان لە مارکسیزم گرت. ئەم رەخنەگرانە گوتوویانە مارکسیزمی سوننەتی ئاشکرای نەکردووە کە بۆچی بۆ ژنان سروشتی تر ئەوە بووە کە ئەم رۆڵە قبوول

بکەن.[99] بێجگەلەمە، مارکسیزم لە ریشەگەلی قووڵتری زاڵبوونی پیاوسالارانە غافڵ ماوە. شێوەی زوڵمێکی دیکەش بێجگەلە خاوەنداریێتی تایبەتی و چین، بوونی هەیە. ئەم زوڵمە هەم بەر لەسەرمایەداری بوونی بووە و هەم دوای ئەویش. لەبەر ئەمە، مارکسیزم خەیاڵی هەیە خەریکی شیکردنەوە و کار و ناوماڵی ژنان بێ. خەیاڵی هەیە ئەم پرسیارە بێنێتە ئاراوە کە کار لە ماڵەوە چ سوودێکی هەیە. بەم جۆرە، زاڵبوونی پیاوسالارانە جگە لە ریشەگەلی ماددی و مێژوویی، ریشەگەلی قووڵتری لەوەیکە لەوە پێش پێشبینی دەکرا، هەیەتی. ژنان لە لایەن ئەم بەشکردنە کار رەگەزییەوە هەم خزمەت بە پیاو دەکەن و هەم بە سەرمایەداری. فەرمانبەری و پێڕەوی ژنان لە بنەماڵەدا بەشێک لە بناخەی ئابووری کۆمەڵگەیە. لەم خوێندنەوەدا تایبەتی و گشتی لە یەکتردان و دژەی بەرامبەریان هەیە. «تایبەتی بە شێوەی سیاسی» ریشەگەلێکی قووڵی لە باری بیولۆژیکی، دەروونناسی، مێژوویی و راستەقینەی ئابووری هەیە.[100] ئەم تێڕامانە سەرنجە لەسەر بنەماڵە سەری لە لێدوانگەلێکی زۆر دەرهێنا کە لەمەر مەسەلەی شیکردنەوەی مارکسیستی کارگەلی وەکو کار لە کارخانە دژەی کردە نێو رێکخراوەی «چەپی نوێ»شەوە.[101]

دەرباری رادیکاڵەکان، مەیل ئەمە بوو کە رەخنە لە پیاوسالاری لە ژیانی تایبەتی روانگەگەلی ئیدئۆلۆژیکی، دەروونناسی و زمانناسیش دەگرێتەبەر. لە راستیدا فەمینیستە رادیکاڵەکان لەم رەخنە تایبەتی بە شێوەی سیاسی زۆرترین سوودیان برد. ئەوان تێکۆشان هەتا مەسەلەی پیاوسالاری لەسەرووی مەسەلەکانی دیکەوە دابنێن. ئەوان دەیانەوێ سەرجەم بابەتی دەسەلات بگوازانەوە بۆ ناوەندی تایبەتی و بەشێوەی گشتی باوەڕیان بە دابەشکاری خوسووسی ـ گشتی نییە. بە بۆچوونی برێک لە رادیکاڵەکان دەسەلاتی پیاوانە لە ناحیەی تایبەتی لەسەرانسەری جیهان و سەرانسەر مێژوو لە کەلتووری جۆراوجۆر، لە ئایینگەلێکی وەکو سووتاندنی ژنان لەگەڵ جەسەدی شوو [لە هیند]، بەستنی پاگەلی کچام بە نەوار [لە چین]، دەسدرێژی رەگەزی، بە چاوی سووک تەماشا کردن، بڕینی ئەندامی شەرم، سووتاندنی ژنان بە حیسابی

جادووگەر و تەنانەت زاڵبوونی پیاوان لە پزیشکی ژناندا ڕەنگیداوەتەوە. بۆ وێنە مری دیلی ئەم ئاینانە بە ڕەنگدانەوەی دیکەی زادی ـ خۆئازادی پیاوانە دەبینێ کە بۆ زاڵبوو بەسەر ژناندا و گرتنە ژێر کۆنترۆڵی ئەوان بەدی هاتووە.[۱۰۲] بە بۆچوونی هێندێ لە رادیکاڵەکان کەلتووری ئێستای ڕۆژاوا و کۆمەڵگەکانی دیکە خاوەنی شتێکن کە ئەوان بە «فاشیزمی ڕەگەزی» ناودێر کردووە. لەم بارەوە تایبەتی و سیاسی یەکتر لە ریشەوە وشک دەکەن. بیرمەندانی ڕوانگەی ڕادیکاڵی هەروەها لەسەر ئەم باوەڕەن کە تەنانەت زمان، بیرکردنەوەی فیکری، زانست و فەلسەفەی پیاوانە هەڵگر شێوەیەکی ریشەداری قووڵ و وردبینی لە زاڵبوونی پیاوسالارانەیە. بەم چەشنە ئەگەر ژنێک تەسەور بکا کە کاتێک لە تەنیایی خۆیدا و بەشێوەیەکی تایبەتی بیر دەکاتەوە لە دەستێوەردان و دەخاڵەتی سیاسی ئازادە، لە بنەڕەتەوە بە هەڵە چووە. شوناسناسی پیاوسالارانە دەتوانێ تەنانەت بەسەر زۆربەی ئەندێشە تایبەتییەکانی ئەودا زاڵبێ. لێرەشدا جارێکی دیکە ڕێنوێنی ڕوانگەیی لەگەڵ فەمینیستە فەڕانسەوییەکان تێکەڵی پەیدا دەکا کە دەڵێ ناوەڕۆکە ناوبراوەکان «بەتایبەت ڕووبەڕووە لفە و دوانەکانی وەک گشتی و تایبەتی» بەسەر زمان و پێکهاتەی نەوسدا زاڵە. بەتەواوی ئاشکرا نییە کە مەبەستی فەمینیستە پۆستمودێرنەکان لەم ڕێنوێنییە چییە جگە لەمە کە دیسان بە ڕەتکردنەوەی ڕووبەڕووی نێوان گشتی و تایبەتی دەست پێدەکاتەوە. بێجگەلەمە، تاوتوێیەکانی پۆستمودێرنی بە جیهانی کردن و گشتی کردن و بنەماسازی ژنان لە لایەن فەرهەنگەکانەوە بەتەواوی بە ناپەسندی دەزانن.

ئەم جۆرە باوەڕانە لەمەڕ تایبەتی بە شێوەی سیاسی زۆربەی فەمینیستە ڕادیکاڵەکانی بەرەو پێشنیاری خەتتی فیکری توندڕەوی وەک جیابوونەوە «ژیانی جیاواز لە پیاوان» و کۆکردنەوەی شێوەگەلی مێی بەرەو جیاوازی ئەندێشەی کێشاوە. ئەمە بەش بە حاڵی خۆی بووە بە هاوردەی تۆمەتگەلێکی زۆر ناشیرین و ناڕەوا بەسەر بنەماڵەدا و لە زۆر شوێندا وەسیەت بۆ وەلانانی بنەماڵە و پێکهێنانی شێوازێکی نوێی ژیانی کۆ و هاوبەش کراوە و کۆتایی پێهاتووە.

# دەرەنجام

مەبەستی سەرەتا و سەرەکی فەمینیستە لیبرالەکان بەخشینی مافە تەواو مەدەنییە دیموکراتیکەکان بە ژنانە. ئەوان داهاتوویەک پێشبینی دەکەن کە مافە یاسایەکان، سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری ژنان بەشێوەی تەواو و کەماڵ دابین و دەستەبەر بکرێ. لەم داهاتووەدا ژنان لە هەموو بوارەکاندا لە پلەی یەکسان لەگەڵ پیاوان بەرامبەر دەبن. ئەم ئامانجە لەگەڵ وزەی عەقڵ و هۆش، بە قەناعەت گەیاندن و چاکسازی یاسای بنەڕەتی بە حەقیقەت دەگا. بنەماڵە پاڵێوراو دەمێنێتەوە، بەڵام پیاوان لەودا دەوری یەکسانی لە وەفاداری ئەرکەکانی ناوماڵیان بە ئەستۆوە دەبێ و ژیانی ژنان بە هیچ جۆرێک لەگەڵ بەرەنگارە دەستکردەکانی پەروەردەی منداڵ بۆشایی تێناکەوێ. بەم جۆرە، بنەڕەتی بنەماڵە پەرە و دەوری گرنگی دەبێ، بەڵام لە پشتگری ماڵی و کۆمەڵایەتی بۆ بەرگری کردن لە پەرەساندنی نایەکسانی بەهرەمەند دەبێ. مایلبوون بە رەگەزی دژ لە پێوەندی دامەزراو هێشتا بە شێوەی ڕێی راستی کۆمەڵگە مامەڵەی لە تەکا دەکرێ. بەم ڕێژە فەمینیزمی لیبرال داهاتوو لەگەڵ عەدالەتی رەگەزی تەواو پێشبینی دەکا. ئەمە دەکرێ بە ئامانجی «فەمینیزمی مەدەنی» بزانرێ.[١٠٣] بیرمەندانی دایکایەتی وەکو ئەشتاین بە ئەگەرێکی زۆرەوە ئەم وێنە لیبرالە بسەلمێنێ، بەڵام بڕوایان هەیە کە بایەخەکان و دەربڕینی حەز و مەیلی ژنان دەبێ بەشێوەی یەکسان لە پانتای گشتیشدا بە راستەقینە بگا.

مارکسیزمی سوننەتی خەیاڵی دەکرد ژنان لە پیشەسازییە مەزنەکان دەچنەپاڵ وزەی کارەوە. بە نووسراوەی ئینگلیس «رزگاری ژنان کاتێ مسۆگەر دەبێ کە ژنان بتوانن لە پێوارێکی بەرفراوانی کۆمەڵگەدا لە کاری تەولیددا بەشداری بکەن و ئەرکەکانی ناوماڵ پێویستی لانیکەمی سەرنج لە لایەن ئەوانەوە بێ».[١٠٤] ئینگلس هەروەها لەگەڵ رزگاربوونی ئاسان و سەربەخۆی ئابووری ژنانە. خانمی کولۆنتای لە قۆناخە سەرەتایەکانی شۆڕشی رووسییە بەرپرسی دەرخستنی پێشنیارەکان و یاساگەلێک دەربارەی ژنان بوو، بەڵام دواتر بە فەرمانی ستالین هاتە کوشتن. بۆ وێنە بەرپرسایەتی خزمەتگوزاری لە پێوەندی لەگەڵ پاک و

خاوێنی کۆکردنـەوەی ماڵـەکان، پەرسـتاری و ئاگـاداری لـە منـداڵان، چێشتخانە گشتییەکان و کار لە بواری ئیمکانی پێکهێنانی کارگـەلی ناوماڵـی و هاوبەشـی لـە داهاتوودا، فێرکردن و پەروەردەی جەماوەری بـە بـەلاش و لـە بـاربردنی منـداڵ لەشێوەی داخوازدا، بە ئەستۆی ئەو بوو. ئەو هەروەها (وەکـو ولـستۆن کرافـت بڕوای بوو کە پێوەندی تاکهاوسەری باشـترە هـان نـەدرێ و تەنانـەت هـەل بـۆ موڵغا کردنی بڕەخسێ چونکـە ئـەم کـارە لـە بەرامبـەر پیاوانـدا زیـانی بـە ژنـان دەگەیاند و (بەپێچەوانەی ولستۆن کرافت) لەسـەر ئـەو بـاوەڕە بـوو کـە گـۆڕینی هاوسەر بۆ سلامەتی و تەندروستی باشترە. ئەم باوەڕە، ئەگەرچی لـە دەرەوەی نووسراوە، باسکراوە، بەم باوەڕە گەییوە کە پێوەنـدی ڕەگـەزی وەکـو تونیـەتی وایە و هەر تەنیا دەبێ ڕازی بێ. بە بۆچوونی کولۆنتای پێوەنـدی ڕەگـەزی نابـێ زۆر بایەخی پێبدرێ؛ لە ڕاستیدا باوەڕی ئـەو وابـوو کـە هەسـتی خـاوەنـداریتی ڕەگەزی لە حوکمی دوا نیشانەگەلی بەردەوامی زێهنییەتی خاوەنـداریتی تایبـەتی، دەبێ لە لایەن دەوڵەتەوە قەدەغە بکرێ.[105]

فەمینیـستە سۆسیالیـستە دواکـەوتووەکان، لەگـەڵ بەرفراوانترکردنـــەوەی ڕوانگـــەی خۆیـــان دەربـــارەی چەوســـانەوە، وەکـــو کولۆنتـــای خوازیـــاری بەرینکردنەوەی کۆنترۆلی زاینەوە و لە دایکبوونی بەلاش، لەباربردن، چـاوەدێری دەرمانی و بێهداشت بۆ ژنان، ناوەندی چـاوەدێری لـە منـداڵان و بـە ڕەسمییـەت ناسینی کار لە ناوماڵ لە لایـەن دەوڵـەتەوە ببـوون. لەگـەڵ بـوونی ئەمـە، لەمـەڕ دەوری بنەماڵە لەم کۆمایەدا ناهاوئاهـەنگی و ناسـازگاری بـوونی هەیـە. ئاشـکرا پیاوان دەبێ بەشی گرنگیان لە پەروەردەی منداڵاندا هەبێت، هەرچەند باوەڕگەلێک بوونی هەیە (کە نیشانەی دزەکردنی ڕادیکاڵەکانە) کـە مـایلبوون بـە ڕەگـەزی دژ پێویستانە هەموار نادرێتە قەڵەم. بە بۆچوونی فەمینیستە سۆسیالیستە نوێیـەکان «ناهاورەگەزخوازی هەمواری ئاسایی دەبێ جێـی خـۆی بـە بارودۆخێـک بـدا کـە ڕەگەزایەتی یەکێک لە لایەنەکان لە باری کۆمەڵایەتییەوە بێبایەخ بێ».[106]

فەمینیزمی ڕادیکاڵی هەڵگری پێشنیارگەلی جۆراوجۆرە. بووار بـە دەسـهێنانی بەلاش بۆ کۆنترۆلی زاینەوە لەباربردن و کەمتر بایەخدانان بۆ تاکهاوسەری پێـی

دادەگرت هەتا چوونی ژنان بۆ جیهانی فەرهەنگێکی بە یەکسانگەیو لەگەڵ پیاوان ساکار و ئاسان بێ. لەگەڵ فایرستۆن دەچینە جیهانێکی سیبرنتیکی کۆمۆنیستەوە کە تاکەکانی ئەو لە بابەتی کۆمەڵایەتییەوە دوورەگەزایەتی مامەڵەیان لە تەکا بکرێ و هەموو مرۆڤەکان لە بارهێنان و پەروەردە و چاوەدێری منداڵدا بەشدار بن. رادیکاڵەکانی‌تر ئەم دوورەگەزییەی داهاتوو رەت دەکەنەوەو مەسەلەی گەورە بە کەلتووری پیاوسالارانە دەزانن. ئەگەرپیاوان مەسەلەی سەرەکی بن، چ ڕێڕەوێک دەکرێ قبوول بکرێ و بگیرێتە بەر؟ توندڕۆترین و کەم ژمارترین خەیاڵ باوەڕیان بە کوشتای بەکۆمەڵی پیاوان هەیە. لەو ئاستانەدا کە کەمتر لە هەمووان توندڕۆترن، لایەنگری لە هاوجنسخوازی ژنانە یان جودایی دوورەگەزی دەکەن. مری دیل کەلتووری بێ‌کەموکورتی جیاوانی و خەیاڵی ژنانەی پێشنیار کردووە. کارکردی واژەی هاوجنسخوازی ژنانە لێرەدا وێکچوونێکی هەیە. ژنی هاورەگەز خواز هەمیشە بە کەسێک دەڵێن کە «حاشاکەری پێناسە قەراردادییەکان دەربارەی مێ بوون» بێ.[107] ئەگەرچی هێندێ کەس لایەنگریان لە هاورەگەزبازی ژنانە لەباری رەگەزییەوە کردووە، بەڵام زۆرینەی رادیکاڵە پێشنیاردەرەکانی ئەم ڕێڕەوە بیر لە لایەنی سیاسیتر و فەلسەفیتری مەسەلەکە دەکەنەوە. ئەگەر ژنان چاوکراوانە سەرنج بدەن بە فەرهەنگ و ئەزموونی خۆیان، ئەو کات سەربەخۆیەکی دیاریکراو لە پیاوسالاری بەدەستدێنن. ئەندێشەی روانگەیی رادیکاڵی ئەم خاڵەی بە واتای شوناسناسییەکی فەمینیستی بەربڵاوی پێ‌داوە. هەروەها هێندێ لە رادیکاڵەکان گوتوویانە هەر تەنیا ژنان هەستێکی لە خۆبوون بەم و بەو دەدەن. ژنان لە بەرامبەر دڵۆڤانی و ڕێزگرتن لەم و لەو هەستیارن.

ئەوان نایانهەوێ و هەوڵ نادەن ئەم و ئەو پێناسە و تاوتوێ کەن. بیر وباوەڕی هاورەگەز خوازی و جوداییخوازی بە دروستکردنی کۆمۆنگەلێک کۆتایی پێهاتووە کە هەر تەنیا ژنان ئیزنی ژیان کردنیان لەواندا هەیە. رادیکاڵەکان لە بەرامبەر واتای پێوەندی تاکە ناهاورەگەزییەکان، یان تەنانەت بنەماڵەدا راوەستانیان لە خۆ نیشان نەداوە. بەڵام ناهاوجنسخوازی نابێ ببێ بە هەموارێک

و وەکو رابردوو نەریتێک بێ و بنەماڵە واباشە گۆڕانکارییەکی بەسەردا بێ کە
چیدی باری قورسی پەروەردەی منداڵان، یان کاری ناوماڵیان بە شانەوە نەبێ.
فەمینیزمی پۆستمودێرن و پەساپێکهاتەخواز سەرنجیان زۆر لەسەر لووتکەی
زمانە. دڵنیگەرانی ئەو لە پلەی یەکەمدا ساختشکێنی زمانی ئێستایە. زمانێ
چەکێکی بەهێزە بۆ کەمکردنەوە لە کاردانەوەی دەسەڵاتی ژنان مامەڵەی لە تەکا
ئەکرێ و پیاوسالاری بەسەر هەموو هەرێمەکانی فەرهەنگ و ئەدەبیاتا زاڵ
کردووە. بێجگەلەمە، فەمینیزمی فەڕانسەوی لەسەر شێوازی تاقانە تەئکید دەکا کە
ژنان لەودا بەشداریان هەیە و دەتوانن لە داهاتوودا لە ئەدەبیات و کەلتووری
خەیاڵیدا بەشداری بکەن. گەشبینترینی ئەم توێژەرانە دەڵێن ئەگەر ژنان بتوانن
رەمزگوشایەکی ئەوتۆ بن کە رووبەڕووەکان و بەرهەڵسکارە سەرەکییەکان
گومانە بەرواڵەت لێبڕاوەکان نیشان بدا، ئەو کات لەوانەیە وێنەکانی کەلتووری
ئێمە دەتوانن سەرلەنێو ببنە رەمزساز و لەگەڵ گۆڕانکار لە لایەن زمانەوە
جیهانی واتایی و زانیاری ئێمە هەڵگێڕنەوە. ئەوانەی کەمتر گەشبینیان هەیە
حەشایان خووی سەرەکی نێر و مێ بوون کردووە و ئەوانە بە پێکهاتەگەی
کۆمەلایەتی دەزانن کە پێویستیان بە پێکهاتەشکێنی هەیە. زانینی ئەمە کە ئێمە
فەمینیزم بە مانای شتێک زۆرتر لە بواری دوایی بێ، دژوارە.
لە ئێستادا بەشی هەرە زۆری رەخنەی چاوکراوانە لە فەمینیزم لە نێو بزاڤی
فەمینیستی لە ئارادایە. بۆ وێنە هەم سۆسیالیستەکان و هەم رێبازە رادیکالەکان
رەخنەیان لە فەمینیستە لیبراڵەکان گرتووە. بەڵگەیان هێناوەتەوە کە لەوە دەچێ
لیبرالەکان لە پێکهاتەی بنەماڵە رازیبن و میتۆدی لاواز و نامۆئەسیر لەمە
بەرامبەری فۆرمی قبووڵ کردووە و لەسەری دەڕۆن. هەروەها ئەوان لە
نایەکسانییە مادییەکان و ریشەداری ناخی سەرمایەداری و پیاوسالاری و
زۆربەی پێویستیە زەرووریترەکانی ژنان غافڵ ماون. لە لایەکی ترەوە
فەمینیستە مارکسیستەکان تەنانەت لە لایەن فەمینیستە سۆسیالیستەکانەوە
تۆمەتی کوێررەگەزییان لێدراوە و بەهۆی لایەنگری لە بۆچوونی نارەخنەیی
سەبارەت بە پێگەی سروشتی ژنان و بنەماڵە مەحکووم بوون. تەنانەت توێژەرێ

رادیکـاڵ ڕەخنـەیان لـە فەمینیـستە سۆسیالیـستەکان گرتـووە کـە تووشـی کوێرەگەزی بوون و چوارچوێـوەی ناپێویـستی مێـژوویـی و ماتریالیـستی بـەر نادەن. لیبراڵەکان ئاساییترین هێرش دەبەنە مارکسیستەکان و لەسەر ماتریـالیزمی جەزمی ئەوان و دەسبەردان لە بایەخە گرنگەکانی وەکـو ئـازادی تـاک ڕەخنـەیان هەیە.

دەربـارەی رادیکاڵـەکان دەبـێ بـوترێ کـە بـەرچاوتـرین ڕەخنـە لـەوان پێشنیارگەلی سەیر و نالایەقی ئەوانە. لیبراڵەکان دەڵێن لە حاڵێکدا کـە رادیکاڵـەکان لایـەنگری هاوجنسخوازی سیاسـی ژنـان، دوورەگـەزایـەتی و جیـا کردنـەوەن، فـەمینیزم هـیچ کـات بەڕاسـتی چـاوی لـێنـاکرێ. تـوێژەرانی مارکسیـست و سۆسیالیست رادیکاڵەکان تاوانبـار دەکـەن کـە لـە بناخـە و بنـەڕەتی مێـژوویـی، ئـابووری و مـاددی پیاوسـالاری غـافڵ مـاوە و کەوتوونەتـە داوی بیۆلـۆژیکی گومانـاوی و نـامێژوویـی، یـان دەروونناسـیخوازییـەوە، لیبراڵـەکانیش ڕەنگـە رادیکاڵەکان هەر بـە هـەمان ناکـامی و عـەیب مارکسیزم و سۆسـیالیزم تاوانبـار بکەن. توندڕۆترین کارگـەلێک کـە رادیکاڵـەکان پێـشنیاری دەکـەن زۆر پێویـستی هێرشی توندە بە ئازادییە تاکەکان بێ، بۆ زۆر کەس قبووڵ ناکرێ.

توێژەرانی پۆستمودێرن ویستوویانە ساختی خووی کوتەکهەڵسووڕێنەری ژنـان لـە هـەموو بزاڤـەکانی ئیـدئۆلۆژی تێکبـشکێنن. فەمینیـستە لیبراڵـەکان، سۆسیالیست و رادیکاڵیش بە فرەبێژیگـەلێکی درزدار و چـڕژاو تـاوان بـارکراون. پۆسـتمودێرنـەکان واتـای هـەر چەشـنە هەڵوێـستێکی بـالاتر و لەبـەرتر ڕەت دەکەنەوە. وشەگەل و شتەکانی ئەم توێژینەوە بەتەواوی تێکشکاون. لـە راسـتیدا فەمینیـستە فەڕانسەوییەکان نایەتەبـەرچاو لـە مـەنتقی زاتی راوێـستەی تایبـەتی خۆیان گەیشتبێتن، هیچ بەڵگەیەک بۆ بەربەستکردن و راگرتنی کوتەک سووڕان لە ئارادا نییە، «مێوینەداری»یش پێویستی بـە پێکهاتـەشـکێنی هەیـە. ئـەو جـۆرە کـە توێژەرێکی وردبین گوتوویـەتی: «ئەگـەرچی [فەمینیستەکان] لـە گومـانی گـشتی پۆستمودێرنیستی پشتگری دەکەن، نایەتـە بـەرچاو بـەهۆی ئەوانـەوە گومانیـان لێکرا بێ. ئەوان بەڵگەکانی خۆیان ساخ و سەلیم شک دەبەن».[109] ئەوەی کـە ئێمـە

وەلای دەنێین ریشەگەلێکی دیکە لە گومان و دوودلییەکانە. ئەو جۆرە کە تۆژد...
وردبینی دواکەوتوویی گوتوویەتی ئەوەی کە دەکرێ بە لانیزۆرەوە چاوەڕو...
لە فەمینیزم بکرێ، سەرکەوتنێکی بەرامبەر و هاوکێشی دیکە لە بواری «ب...
گومان، یان لانیکەم گومانە کە زەمانباوەڕی بە ئێمە ببێت». کۆمەڵێک...
نووسەرانی دواکەوتووی فەمینیست هەستیان کردووە کە ڕێگاک...
پۆستمودێرنیزمیش و پەساپێکهاتەخوازی لە کۆتاییدا فەمینیزم قەڵاچۆ و لەناو ...
دەکەنەوە. ئەو جۆرە کە یەکێک لە نووسەرانی دژبەیەک باسیکرێ ـ دوو و...
بەتەواوی ناسازگار».[110] لەم مانادا سەخت و دژوارە کە ڕێی پۆستمودێر...
رووبەمەرگ بزانرێ.

لە تاوتوێکردنی بزووتنەوەی فەمینیستی، مەسەلەیەکی ناوەندی سەرەت...
بینەر بەرەوخۆی ڕادەکێشێ. زۆر لە باوەڕەکانی فەمینیزم لە دەوری باز...
پرسیاری وێچوو و بەرامبەری یان جیاوازی دەخولێتەوە. کەسانێک کە باوەڕ...
جیاوازی نێوان نێر و مێ ڕەت دەکەنەوە، زۆرتر وەک ئەوانە دەچن کە ...
هەقدەس بۆ کار و کارخانە ڕەت دەکەنەوە، لە ڕاستیدا باوەڕیان وایە کە ...
کردەوە دەتوانێ ژنان بەشێوەی نووسراوەیەکی هەڵکەنراو و نەویتر دەربینێ ...
برێک لە دەورگەلی ئەوان بچەسپێنێ. بەڵام کێشەی ئەمە کە هەر جیاوازیی...
بەشێوەی کۆمەڵایەتی یان زمانناسی پێکهاتووە دەتوانێ سەر لەم باوەڕە...
دەربێنێ کە هیچ جیاوازییەکی ڕاستی لە نێوانی ژنان و پیاواندا بوونی نیی...
باوەڕی ناوبراو بۆ پیاوان و ژنانی ئاسای زۆر سەرسووڕهێنەرە. تەنانەت ...
باوەڕەی فەمینیستە نوێیەکان کە جیاوازیگەلێکی زۆر لە نێوان ژنان (وە هەروەها
نێوان پیاوان)دا بوونی هەیە، سەرسووڕهێنەرترە. لەراستیدا زۆر گوتوویانە ژ...
یان پیاوان هیچ گەوهەرێکی زاتیان نییە. سووربوونی هێندێ لە فەمینیستەک...
(هەم رادیکاڵ و هەم پارێزکار) لەسەر منداڵبوون و زێوەزوو، دایکایەتی
پەروەردەی منداڵان ڕەنگدانەوەیەکە لەم خاڵە. گرنگە کە بزانین ئەم ڕو...
جۆراوجۆرانە لە تایبەتمەندی سەرەکی گشت بزاڤی فەمینیستی و ئیدئۆلۆژی
دەدرێتە قەڵەم، دەتوانین ئاشتی لە خۆ بگرن.

ئەکولۆژی لە هاتک و بـرتکینی لیدوانـە گـشتییەکانی بیـست سالـی رابـردوودا گەیشتە ترۆپکی خۆی. ئەگەرچی، وەکو هەموو ئەو ئیدئۆلۆژیانەی کـە تاوتوێمـان کردن، خوازیارێکی لە بنچـەی دێـرین هەیـە. بـەم حالـەوە، لێـدوانێکی بـە راسـتی دەربارەی پێگەکانی بزووتنەوە لە ئارادایە کە زایەڵەکانی ئەو هەنووکە دەبیـنین. ئەم لیدوانگەلە لە بەشی داهاتوودا تاوتوێی دەکەین.

مەسەلەگەلێکی بە تالووکە دەربارەی وشەی ئەکۆلۆژیزم خۆ بوونیان هەیە کـە لە زانیاری و زاتی بزووتنەوەی ئەکۆلۆژیـدا خـاوەن بایـەخ و مانـای دەروونییـە. یەکەم ئەو جۆرە کە جاناتان پاریت دەڵێ وشـەی ئـەکۆلۆژیزم شـتێکی دڵـتەزێن و تاقەتپڕووکێن لە خۆیدا شک دەبا کە هێشتا خووی زانستی و پسپۆری کـارکردی سـەرەتایی و پێناسەی دوارۆژی ئەو لەگەڵ خۆی بە کێش دەکا.[1] جگە لەو، لایـەنی زانـستی ئـەزموونیتری واژە، شایـستەیـی ئـەو بـۆ گەیانـدن و گەیانـدنی مانـای دەروونی و زۆرجار لە ناخەوە تایبەتی و سیاسیشی بۆ کەسانێک ئاستەنگ دەکـا کە لەم بزاڤەدا سەرقاڵن. دەرەنجام، زۆر لەو کەسانە کـە لەمـەڕ ئـەم ئیدئۆلۆژییـە بابەت دەنووسن، تـا رادەیـەک بـە شـێوەی پێویـست ئـەوە «ئەندێشەی سـەوز» ناودەنێن. تەنانەت واژەی «سەوز» یش چەرمە سەری خـۆی هەیـە.[2] لـەم لێدوانـە تایبەتـە، لەگـەڵ گـشت بەڵـگەو دەلیلـە پێچـەڵاو پـووچ و گـرێ و گۆڵـەکانی ئـەو، رەنگدانەوەیەکە لـە گـۆڕینی نـاو بـزاڤ لـە بریتانیـا بـە «حـزبی سـەوز» (پێـشتر ئەکۆلۆژی). بە پێچەوانەی ئەمە کە خۆم هۆگرییەکی زۆرم بە ناوی «سەوز» هەیە، ئەوەم بەو دەلیلە قبـووڵ نـەکردووە کـە هـەموو بابەتـەکان کـە دەمـەوی لێـرەدا باسیان بکـەم، بـوار نـادا. نـاوی «سـەوز» بەتـەواوی لەگـەڵ هەنـدێک لـە لێدوانـە سیاسییەکان (و هەندێک بایەخە پێوەندیدارەکان بەوەوە) گرێدراوە کە بـە راسـتی لە ئامانجی منەوە دوور. لەم بابەتەوە دەبێ بڵێم لەم بەشە ئێستا نسبەت بە بزاڤـی ناوبراو روانگەیەکی جیا لە سوننەتیم هەیە.

بزووتنەوەی ئەکۆلۆژ لە پانتای گشتی لە دەیەی ١٩٧٠ هاتووەتە ئار ...
بەرفراوان بووەتەوە. لە بەر ئەمە، لە روالەتا ئەم بزاڤە لە باری مێژووییەوە
پێوەندی بە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەمەوە دەبێ. هەڵبەت نژادی مرۆڤ ...
دێرینەوە لە سروشتا تەداخولی کردووە. لەگەڵ ئەمەدا، گەشەی پیشەسازی ...
دووسەت ساڵی رابردوودا ئەم پرۆژەی دەستێوەردانی تا ئاستێکی دڵ نیگەر ...
پەرەی پێداوە. خولی دوای ١٩٤٥ واتە دوای جەنگی جیهانی دووەم لە بابەتی
گەشەی پیشەسازی بەتایبەت سەر سوورهێنەر بووە. ئەم جۆرە کە لەیەکێک ...
راپۆرتەکانی پێگەی ژینی دەیەی ١٩٧٠ هاتووە «لە ٢٥ ساڵی رابردوو...
دەسەلات، بەرین و قوولی تەداخولاتی مرۆڤ لە سیستەمی سروشت شاهیدێکی
شووم لەسەر شۆڕشگێڕترین گۆڕانکاری بووە کە شعوور دەتوانێ تەسەوری
بکا».[3] بەراورد و خێرایی گەشەکردن لە ٤٠ ساڵی رابردوو رادەیەک بووە کە زۆ...
کەس وەک بە ئاگا کردنەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکەن.

ئەکۆلۆژی لە حوکمی بینینێکی زانستی سەرنج بۆیەکێک لە ساکارترین، بەڵام
گرنگترین خاڵ کە کاردانەوەگەلێکی مەزنی بووە، رادەکێشێ واتە ئەمە کە
ئەکۆسفێر یان ژین مەئوا سیستمێکی بە یەکەوە گرێدراوە. ئەوەی کە ئێمە ناوی
دەنێین پێگەی ژین لە راستیدا «سیستمێکە کە هەموو بوونەوەری زیندوو و ئاو و
هەوا و خاک و ژینگەی ئەوانە دەگرێتەخۆ».[4] بە شێوەیەکی‌تر، جۆرەکانی مرۆڤ
بەشێکن لە پێکهاتەی زۆر پێچراوە، جۆرا و جۆر و بەیەکەوە گرێدراون. ئەوەی
کە لە باری پیسکردنی پیشەسازییەوە دەیچێنین، بە ناوی ناپایەداری ئەکۆسفێر
دەیدووینەو. ئێمە ناتوانین خۆمان لە ئەکۆسیستم جیا بکەینەوە. ئەم خاڵە توانایی
تاقانەی ئەکۆلۆژیزمە. بەر لەوەی لەم خاڵە تێپەڕێین باشترە بێ‌پسانەوە بڵێین کە
هۆکاری سەرەکی و بایەخ و زانیاری گشتی کە لە پشت ئەکۆلۆژی شاراوەتەوە ...
پاڵپشتی زانستی و بەڵگەکانی ئەوەوە سەرچاوە دەگرێ نەک هەڵوێستی ئەخلاقی
یان سیاسی ئەو.[5] لە لایەکی دیکەوە، ئەکۆلۆژی تایبەتەن لایەنی شەخسی هەیە
ئەو جۆرە کە ئیدئۆلۆژییەکانی دیکە «بێجگە لە فەمینیزم» لەوە بێبرین. زۆر لە
ئەکۆلۆژیستەکان ئەوەی کە لە ژیانی رۆژانەی خۆیاندا ئەنجامی ئەدەن ـ لە کڕینی

ێغەرە هەتا بەنزینی بێ سرب ـ گرێیان داوە بە ئالۆزی جیهانەوە کە ێردانەوەکانی ئەسەر لەسەر بەرەکانی داهاتوو دادەنێ.[٦] ئەم بینینە جیهانییە، ێک، لە بابەتێکەوە بێ کەم و زیاد لە نێوان ئیدئۆلۆژییەکاندا کارێکی تاقانەیە.

وشەی ئەکۆلۆژی یان مەئوا ناسی لە وشەگەلی یۆنانی oikos (بە مانای مال ـێ ژینگە) و logos (بە مانای زانیاری یان زانست بە شتێک) تێکەلاو بووە. لەم ـەتەوە پێوەندی نزیک لەگەڵ واژەی «ئەکۆنۆمی economy» (ئابووری) هەیە کە ێکی سەرەکی و سەرەتایی ئەو دەگەڕێتەوە بۆ ئەرەستوو کە بە مانای «راوێژ ێ مال» ئەوەی بەکاردەهێنا. ئەکۆلۆژی لە سەرەتاوە زانستی بوو لەمەڕ پێوەندی ـیستماتێک لە نێوان گیاکان و گیانەوەران و پێگەی ژینی ئەوان لێدوانی دەکرد.[٧] ێم زانستە هەتا ئەمڕۆ ئەم سروشتەی خۆی بە ناوی زانستی جیاواز پاراستووە کە نەک بە تەنیا بالی بۆ ژینگەناسان بەلکو بۆ فیزیۆلۆیستەکان، گیانەوەر ناسان، ـیرکاری زانان، بیۆلۆژیستەکان، فیزیکزانان، جوگرافیا زانان، ئابووری زانان و ڕۆژە دارێژەرانی شاری بە کەلکە. ئەم رشتە لە سەرەتای حەیاتی خۆیدا بە ێوی زانست، مانایەکی دەروونی بەهێزی سەمەر بەخشی بوو. ئەکۆلۆژیزم لە ـەرتاوە بە هۆی ئەزموون خوازی بەهێز و سوننەتی زانستی خۆیەوە خووی تایبەتی پەیدا کرد. کارکردی ئاساییتری واژە لە باری ئەخلاق، سیاسەت و ئابووری دواتر هێور هێور لەگەڵ میزانکردن و بەرامبەرکردنی زیرەکانە هاتە ئاراوە. تەنانەت لە دەیەی ١٩٩٠ پێوەندییەکی ئالۆز و دژوار لە نێوان کەسانێک کە وەک زانستێکی پایەدار لەگەڵ ئەکۆلۆژی مامەلەیاندەکرد و کەسانێک کە دەستکەوتەکانی ئەویان بە رادەیەکی یەکجار زۆر لەگەڵ ئەندێشەی ئەزموونی و دەستووری گرێبەست دەکرد، بوونی بوو.

## پێگەی سەرهەڵدانی ئەندێشەی ئەکۆلۆژیکی

ئەو جۆرە کە لە بەشی پێشوودا باسکرا، لێدوان لەمەڕ پێگەی سەرهەڵدانی ئەکۆلۆژی پێوەندی بە خووی بزاڤی حالی حازرەوە دەبێ. ئەم خالە هەمیشە بە تالووکە لە نوسراوەیەکدا کە لەمەڕ ئەکۆلۆژی دەنووسرێ، ئاشکرا نابێ. برێک لە

قولف و بەندەکان لە گەنجینەی ئەکۆلۆژیدا بوونیان هەیە کە زۆرکەس حەز دەکەن بە دلتەنگییەوە بە لایدا تێپەڕن. زۆربەی ئەم قولف و بەندانە کە هەندێکیان تا رادەیەک بێ زیانن، پێوەندی دێرینەتری بە پێگەی سەرهەلدانی ئەندێشەی ئەکۆلۆژییەوە دەبێ. لەم بەشەدا گوتراوە کە ئێمە نابێ بە پەنای ئەم ریشە دێرینانەدا بێدەنگ تێپەڕین، چونکە رۆشنگەری پێچراوەیی ئەکۆلۆژیکی و بوونی جۆراوجۆریەک لە بینینی ئەکۆلۆژیکیدا هەن، پێچراوەیەک کە تەنیا بە ناودانانێکی سەرلەنوێی «سەوز» حاشاهەلگر نییە.

ئاماژەیەکی کورت بە یەکەم کارکردی وشەی «ئەکۆلۆژی» دەکەم. ئەم وشە گیانەوەر ناسە و فیلیووفی ئەلمانی، ئەرنست هاینریش هەکێل لە کۆتایی دەیەی ۱۸٦۰ دا کردوویەتە کار،[8] هەکێل لە ئاسەوارێکی وەکو بیچم ناسی گشتیدا ئەم واژەی بەم چەشنە پێناسە دەکا: «زانستی پێوەندی نێوان ئۆرگانیزمەکان و پێگەی ژینی ئەوان».[9] لەگەل ئەمەدا، بەلگەگەلێک لەمەڕ گرنکی دۆزی هەکێل بوونی هەیە کە بە تێر و تەسەلی لەمەڕ ئەو لێدوان دەکەین. بە کورتی، سێ بابەتی بناخەیی (لە دەروونی بزاڤی ئەکۆلۆژی) لەمەڕ مەسەلەی پێگەکانی سەرهەلدان بوونی هەیە. گەشەکردنێکی نوێش لە بەیانە زانستییەکانی بزاوتە ئەکۆلۆژییەکاندا دەبینرێ کە دواتر لەم بەشەدا باسی لێوە دەکەین.

لەسەر یەکەمین توژینەوەی پێگەکان هەندە راڕوێن چونکە هی وەکو ئەوە لە هەموو ئیدئۆلۆژییەکاندا هەیە، و ئەوە بریتییە لە کۆشش بۆ دۆزینەوەی شوێنی پێی بۆچوونەکانی ئەکۆلۆژی لە سەرەتای خولقانی مرۆڤ، و لانیکەم خولەکانی پارینە سەنگ (چاخی بەردین) نوێ سەنگی، کۆمەلگەلێکی جۆراوجۆر، وەکو تایەفە سەلتەکان، بوو بە فیکر و زیکری دایمی نووسەرانی ئەکۆلۆژیک. خالی سەرەکی کە زۆرجار، و تەنانەت لە زۆربەی لێدوانەکانی ئەم سەردەمە لەمەڕ تایەفەکانی «سەرەتایی» یان چۆلگە گەڕ و عەشیرەتی دەهاتە ئاراوە، ئەمەیە کە ئەوان «بە شێوەی سروشتی» لە باری ئەکۆلۆژیکییەوە لە ئێمە چاوکراوەتر بوون یان هەن. مرۆڤە سەرەتایەکان (کە هەندێک دەلێن مرۆڤەکانی بەر لە عەسری پیشەسازی) هەستیاری و هەستی بەرپرسایەتی و چاوەدێری زۆریان سەبارەت بە جیهانی

دەوروبەری خۆیان بووە. وەها هەست پێدەکرێ کە مرۆڤەکانی بەر لە پیشەسازی یان تایەفە سەرەتایەکان رێزیان بۆ سروشت داناوە و هەر تەنیا ئەوەی پێویستیان پێی بووە، لەویان هەلگرتووە. چ تایەفەی راوچی و چ ئەوانەی کە خواردەمەنیان کۆدەکردەوە و باخەوانەکان، بینینی جیهان پەرستانەی ئەوان، ئەوانی پتر بۆ چاوەدێری کردن لە سروشت هانداوە. هەندێک کەس لێرەدا لەسەر تایفەکانی بەر لە مەسیحییەت زۆرتر لە تایەفەکانی بەر لە پیشەسازی تەئکید دەکەن.[10] بەم شێوە، خەلکانی سەرەتایی خاوەنی جۆرێک شعووری دێرینی سروشتی بوون کە ئێمە دەبێ سەرلەنوێ دایان بێنینەوە. لەم رووەوە. نووسراوەی ئەکۆلۆژیکی زۆرجار پڕن لە نەقل و پەندگەلێک لە شەمەنەکان، عارفەکان. رێبەرانی هیندی و شێوە جۆراوجۆرەکانی رێبەرانی مەزهەبی هیندووەکان.

لەمەڕ ئەم جۆرە ئەندێشە شتێکی گومانلێکراو و شاراوەبوونی هەیە. هەر ئیدئۆلۆژییەک لەم بوارەدا کێشەیەکی هەیە، بەلام براڤی ئەکۆلۆژیکی لەم دۆزینەوەی ریشەگەلی گشتی خۆی، لەسەر ئەم خالە زۆرتر لەم و لەو تەکییە و ئاماژە دەکا. لە حالی حازردا ئەگەر بمانەوەی بە شوور و شەوقی ناپەسند (وەکو برێک لە ئانارشیستەکان) لە قەومە سەرەتایەکان و وەرگێرانی دیرۆکەکانی ئەوان نیگەرانیگەلێکی پێگەی ژین و کۆمەلگە خومان بدۆزینەوە لەگەل مەترسی رووبەڕوو دەبینەوە. هەروەها لەم راستییە غافلین کە زێهنییەتی «بکوژ و ببڕ» و بێ سەرنجدان بە پیسکردن تەقینەوەی پێگەی ژین بە هەمان رادە بەشێکە لە خووەکانی مرۆڤایەتی سەردەمی نوێ سەنگ بوو کە هەنووکە بەشێک لە خووەکانی مرۆڤایەتییەکە جەنگەلە ئستواییەکانی برزیل پاکتاو دەکەن. دیمەنی ئەوروپا تەنیا بە پیشەسازی فۆرمی نەگرتووە. لە خولەکانی سەرەتایدا، جەماوەری مرۆڤەکان، تەکنۆلۆژی و پێگەی ژینی کۆمەلایەتی و ئابووری ئەوان ئاستەنگ بوو. بەم حالەوە، ئەگەر مرۆڤگەلی نوێ سەنگی رێگای زنجیری یان مەکینەیان داهێنابا بێگومان ئازادانە سوودیان لەوە دەبرد.[11]

دووەم راپۆرت لەمەڕ پێگەی سەرهەلدانەکان کە بەبڕەوتر بووە و بە بەرفراوانی کەلکیان لێوەرگیراوە بزووتنەوەی ئەکۆلۆژیکیان بە هی دەیەکانی

١٩٦٠ و ١٩٧٠ دەزانی و داناوە. زۆر کەس سەرەتای ئەم رەوەندی زانیاری ئەکۆلۆژیکییە بە دەیەی ١٩٦٠ دەزانن. ئەو جۆرە کە براین توکار دەڵێ: «پێگەی راستەقینەی بزووتنەوەی سەوز هەستان و راپەرینە مەزنەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسییەکە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و سەرانسەر جیهانی رۆژئاوای لە ماوەی دەیەی ١٩٦٠ تەنییەوە و گرتیەبەر».[١٢] هەندێک کەس بە برێک نووسراوەگەلی دەورانسازی ئەم دەیەییە سەرنجیان هەیە. یەکەمی ئەوانە کتێبی بەهاری خامۆش، نووسراوەی راشێل کارسۆن بوو. نزیک بە کۆتایی دەیە، کتێبی پل ئەرلیش بە ناوی بۆمی جەماوەر و تراژیدیای چەمنزارەکان، نووسراوەی گارت هاردین، نەک تەنیا مۆتەکەی رووخاندنی پێگەی ژین بەڵکو پێوەندی لەگەڵ زۆربوونی ترسناکی جەماوەریان هێنا ئاراوە.[١٣] هێندێکی دیکە سەرەتای دەیەی ١٩٧٠ بە قەناعەتگەیێنتر دەزانن بەتایبەت لە باری خۆنیشاندانی بەرفراوانی گشتی بە کارەساتەکانی وەک ئاڵۆزی نەوت و راپۆرتگەلێکی زۆر پڕ دەنگدانەوەی وەکو راپۆرتی جیهانی ٢٠٠٠ لە لایەن دەوڵەتی جیمی کارتر، راپۆرتی نارەسمی رێکخراوەی نەتەوە یەکگەرتووەکان بە ناوی هەر تەنیا زەمینێک، راپورتی کلوپی رۆم بە ناوی بەرتەسکی گەشە، راپۆرتی تایبەتی رۆژنامەی ئەکۆلۆژیست بە ناو پلانی مان و مانەوە؛ و راپۆرتی زۆر نوێتری برونت لەند بە ناوی داهاتووی هاوبەشی ئێمە ئاماژە دەکەن.[١٤] ئاستەنگییەک کە لەم راپۆرتانەدا ئاماژەی پێکراوە و جێی نیگەرانییە سەرنجدان بە کەمبوونەوەی بەر فراوانی پێگەی ژینە. کۆتایی دەیەی ١٩٧٠ هەروەها شاهیدی گەشەکردن و بەرینبوونەوەی نوێی «حزبە سەوزەکان» بوو کە بە شێوەی سەرکەوتوانە لە خەباتی سیاسیدا بەشداریان دەکرد کە بە ناوبانگترینی ئەوانە «سەوزەکانی ئەڵمانی روژئاوا» لە ساڵی ١٩٧٩یە. گومانێک لەم راستییەدا نییە کە لە دەیەی ١٩٧٠ دا هەم گەشەی بەرفراوانی نووسراوە و ئاسەواری هەستیار بە مەسەلەگەلی ئەکۆلۆژیکی بوونی بووە و هەم زاینەوە و لێکەوتنەوەی رێکخراوەگەلی بە سیاسی بووی سەوز.

لەمەڕ بینینی دووهەم لەم بابەتەوە کە بزاڤی ئەکۆلۆژیکی لیبروانە لە دوو دەیەی رابردوودا خۆی لە سەفی یەکەمی سیاسەتدا بینیوەتەوە، دەکری زۆر

ـخاوتنی لەسەر بكرێ. ئەگەرچی دەبێ تەک بدەین بە تەک بینینی هەمووەوە. ـەم روانینە سێیەمەدا لایەنگەلێکی نێگەتیڤ و پۆزەتیڤ بوونی هەیە کە ریشەگەلی ـەندێشەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا هاوێر دەکا؛ هەرچەند لەمەڕ زەمەنی دەقیقی ـەو هێشتا لێدانگەلێک بوونی هەیە. خاڵێک کە زۆر لە نووسەران، تەنانەت ئەوانەی کەدەنگی خۆیان خستووەتە پاڵ راپۆرتەکانی دەیەی ١٩٧٠ وە و ئەویان قبوول کردووە ئەمەیە کە ئەکۆلۆژیزم تا رادەیەک بەرهەمی خۆنیشاندانی رەخنە لە سوننەتی رۆشنبیری ئەورووپایە.[١٥] ئەکۆلۆژیزم بایەخی باڵای عەقڵ بە چاوی گو ـانەوە سەیر دەکا. هەروەها پلەی ناوەندی مرۆڤایەتی لە جیهان و ئەمە کە سروشت بێ بایەخە و مرۆڤەکان دەتوانن دەستێتێوەردەن، رەتی دەکاتەوە. لەم خوێندنەوەدا، رێبازی ئەکۆلۆژیزم لە پەنای بەشێک لە خۆنیشاندانی بزاڤی رۆمانتیک لە بەرامبەر سەردەمی رۆشنبیری لە سەرەتای سەدی نۆزدەهەمدا رایگرتووە. لاوازی ئەم راپۆرتە رۆڵێکی گرنگە کە عەقلانییەت و زانستی ئەزموونی لە پێناسەی بزاڤی ئەکۆلۆژیکی وەفاداری و ئەمەگ ناسی لە خۆنیشان دەدا. بێجگە لەمە، بیر و باوەڕی گرێدراو و بە بەرامبەری جیهانی مرۆڤەکان و جۆرەکان کە لە پانتاگەلی بەرفراوان لە ئەکۆلۆژیدا بوونی هەیە، لەگەڵ خووی سوننەتخواز، شوێن هەڵگر و زۆرجار زنجیرەییتری بزووتنەوەی رۆمانتیک بەراورد ناکا.

ئەگەر لە سەدەی نۆزدەهەمەوە بەرەو دواتر بگەڕێینەوە و کاریگەرییەتی مالتوسیانیزم و داروینیزم ببینین، لەگەڵ خاڵێکی بە تەواو مانا جیاواز رووبەڕوو دەبینەوە. فەلسەفە گەلێک بەرفراوان بوونەتەوە کە کۆششیان دەکرد بینینی ماتریالیستی و زانستی لەگەڵ ئەدراکی زاتی و سروشتخوازی دینی و ئەخلاقی بە یەکەوەی بچسپێنن. بە جۆرێکیتر، سروشت و تەکامول پڕ لە گرنگی مەعنەوی بوون. لە لایەک، ئەم جۆرە فەلسەفانە پێشکەوتگەلێکی زانستی تەکامولی و ئاوا بوونی مەزهەبی ئۆرتۆدۆکس تریان قبوول دەکرد. لە لایەکی دیکەوە، فەلسەفە زانیارییەکانی وەکو ئیدەئالیزمیان بە چاوێکی لە رادەبەدەر گومانەوییەوە بۆی دەڕوانین. مرۆڤەکان پیرەوی یاساگەلی تەکامولی سروشتی بوون. لەم شانۆیەدا،

گرنگی بنەمایی یان وەک وێنەیەک بۆ تەکامول و سروشت دەچوو. ئەم حەز و مەیلە ئاشکرا لە زۆربەی نووسەراندا دەبینین کە بەر لەمە لەمەڕ ئەوانەوە دواوین. پیتر کرۆپوتکین، ل. ت. هابهاوس، ج. ئا. هابسۆن و هێربێرت سپێنسێر. لە نەبوونی خودا، یان خودایان «سروشت» و ڕێنوێنییە بنەڕەتەکانی هەستی ناسانەی ئەو گرنگییەکی بالای هەیە. زانستییەکان مومکینە چ چاوکراوانە و چ چاونەکراوانە ئەم وێنەگەل و پێکهاتە بنەڕەتیانە دابنێن و وەکو خەرمانەی مانگ لە دەوری سەری خۆیانی هالێنن. تەکامول لایەنی مەعنەوی بەدەسهێنا. یەکێک لە ئاشکراترین نموونگەلی ئەم کارە لە سەدەی بیستەمدا ئاسەواری تیلهارت دوو شاردنە کە لەسەر هەندێک لە بەشەکانی براقی ئەکۆلۆژیکی هاوچەرخ کاردانەوەی بووە.[16]

شتێک کە لێرەدا جێی سەرنجە ئەوەیە کە یەکەم نووسەر کە واژەی نوێی «ئەکۆلۆژی» کردووەتە کار بەتەواوی بینینی سەرەوەی بوو. ئەرنست هەکێل کەسایەتییەکی بەناوبانگ و لە دلی خەلکدا بوو کە ئەندێشەکانی ئەو نەک هەر تەنیا لەسەر نەهادە زانستییەکان بەلکو لەسەر نەهادە ئەدەبی و دینییەکانی پێش جەنگی جیهانی یەکەم کاریگەرییەتیان بوو. ئەو بەرهەمی شەپۆلی ماتریالیزمی تەکامول خوازی ئەلمان بوو کە لە دەهەکانی ئاخری سەدەی نۆزدەهەمدا لەژێر کاریگەرییەتی داروینیزمدا بوو. هەکێل لە ئاسەواری ئاکادمیکی کۆشاری خۆی و نووسراوە گشتی فامتری وەک مەتەلی جیهانی هەستی کۆششی کرد هەتا تەوحید (مونیزم) فەلسەفەی (دارێژراو لەسەر حەیاتخوازی لە ڕووبەڕوو لەگەل بیولۆژی، مکانیک) پەرەی پێبدا و دەیخوازی ئەم فەلسەفە لە ئاخردا بریکارێکی بەمتمانە بێ بۆ دین. هەکێل وەکو هێربێرت سپێنسێر (کە لە ناخەوە جێی ڕێزی ئەو بوو) و دواتر هانری بەرستۆن، وزەی تەکامول دۆزینەوە یان جەوهەری لە دەروونی جیهانی سروشتی ماددی قبوول بوو کە یاسای بنەڕەتی ـ کە ئەوەی بە «یاسای جەوهەر» ناو دەبرد ـ بەسەر ئەودا زاڵە.[18] هەروەها سپێنسێر سروشتی بە تەکامول گەیشتووی بە بێ حەیات نەدەزانی. ئەو خودانەناسی ڕەتدەکردەوە و باوەڕی بە «یەکگرووپی وجوود» بوو. بە بۆچوونی هەکێل خودا بێکەم و کورتی زاتی سروشت بوو، یان ئەو جۆرە کە خۆی ئەیوت «خودا، بە شێوەی

هەستییەک ئەو بەری هێزێک لە هەر جێیەک هاوجەوهەر لەگەڵ سروشتە».[19]
ـەگەڵ مەرگی خودایانی دێرین، هەکێل گەش بینانە دەیگوت «هەتاوی تەوحید و تاقانەبینی راستەقینەی ئێمە... رووگەی سەر سوورهێنەری سروشت لەگەڵ کۆما جوانییەکانی بۆ ئێمەی ئاشکرا دەکا». بەم چەشنە دینی سروشت جێگری «ئیدەئالەکانی مرۆڤ‌ویستانە لە خودا، ئازادی و هەتاهەتایی» بوو.[20] هەکێل سروشتی بە ئۆرگانیزمێکی تاقانە و یەکگرتوو و هاوکێش دەبینی کە مرۆڤەکان بەشێک لەوە بوون، ئۆرگانیزمێک کە مانا و گرنگی دینی بوو. ئەم ئۆرگانیزمە تاقانەخوازی، سروشتی و هاوئاهەنگ، دەربارەی یەکخستنی کۆمەڵگە و هەروەها پێوەندی ئێمە لەگەڵ سروشت، دەرسگەلێکی بۆ فێربوونی ئێمە پێ بوو.

ئەکۆلۆژیزم لە سەرەتای خۆی لە دەیەی ١٨٧٠دا دۆزگەلێکی زانستی و تەکامولی پێ بوو. ئەم ئەندێشانە زۆر لە مەعنەوییەتی وردبینی یەکگرتوویی وجوودی و گشت بینانە سازگار ببوون. سروشت خۆی پلە و پایەیەکی بە بایەخ و ئەخلاقی بوو و لەگەڵ چارەنووسی ئێمە بە شێوەی یەکێک لە گیانەوەران گرێی خوارد. سروشت هەڵگری دەرئەنجام ناسییەکی بەرفراوان بوو کە ئێمە بە زیانی خۆمان لێی غافڵ ما بووین. کەسانێک کە بە موتالای ئەکۆلۆژییەوە خەریک دەبوون و تێدەکۆشان هەتا بێ خەوشییەکانی هۆکاری زانستی رابگرن، پێویستیان بوو هەتا خولێک وەحەسێن بە موتالای مێژووی رشتەی خۆیانەوە سەر قاڵ بن. لە سەردەمی هەکێل بەدوا، ئەکۆلۆژی گرنگی ئەخلاقی و مەزهەبی بۆ مرۆڤایەتی بە دەست هێنا. شێوازێک کە لەگەڵ ئەو بۆ رێکوپێککردنی کۆمەڵگەی خۆ، ئابووری خۆ و ژیانی تایبەتی خۆمان دەستبەکاربووین، خاوەنی هەمان مەنتقی سروشتی و فەرجام ناسانەی سروشت بوو. ئەم روانگە ئیتر بە سەرنجی بە تاقانە مرۆڤ رازی نەدەبوو بەڵکو زۆرتر غەیرەمرۆڤ‌خوازانە بوو. بێجگە لەمە، سروشت و «سروشتی» بوون بە ستایشی باڵا. ژیان کردن بە شێوازی سروشتی باشترین ژیان بوو. ئەم باوەڕانە کاریگەرییەکی مەزنیان لەسەر سەدەی بیستەم بینینەکانی ئێمە سەبارەت بە ناحییە گوندەیەکان، پەتیخوازی، سوننەتی خەڵکی، مۆسیقای خەڵکی، خواردەمەنی سروشتی، گەشە و

بالاکردنی گیایی، ئەدەبیاتی رۆژهەلاتی، پاشەکەوتی سروشتی، تەندروستی و تبی هۆمیوپاتی و وەکو ئەمانەی بوو ـ کۆمەڵێکی بەرفراوان لە باوەڕەکان کە لێرەدا بۆ تاوتوێ کردن نابن بەلام گشت ئەوانە بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم لە ئارادا بوون.[21]

لایەنی مەترسیداری کێشەگەلی سەرەوە بۆ زۆربەی تاکەکان لە بزاڤی ئەکۆلۆژیکی، دوو بەرامبەر و دوو لایەنە. یەکەم ئاشکرایە کە بینینی ئەکۆلۆژیکی لە سەرەتای خۆیدا جار جار لایەنگرانی نێوان پارێزگاران (بەتایبەت خودا نەناسان) و ناسیۆنالیستەکان بەتایبەت بزاڤە نەتەوەیەکان لەسەرانسەر ئەورووپا لە دەهەکانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ بوویەتی ئەمە کارێکی پیرۆزە کە سۆسیالیستە نارازییەکان و ئانارشیستەکانیش لە دەیەی ١٩٧٠ ئەندامی سەرەکی بزاڤی ئەکۆلۆژیکیان پێکهێناوە. باوەڕ و پێوەندی ئەوان لەگەڵ دید و بینینی ئاشتیخوازانە و دژی دەولەت، ئەم رەسەن نامە جۆربەجۆرەی شاراوەتر کردووە. مەسەلە لێرەدا ئەوەیە کە زۆرینەی کەسانێک کە لەمەڕ مێژووی ئەکۆلۆژی لە بیست سالی رابردوودا بابەتیان نووسیوە لەسەر باوەڕی رادیکالیزمی ئانارشیستی یان سۆسیالیستی سەوز بوون.

مەترسی دووەم شێوازێکە کە ئەم دۆزانەی مەئوا ناسی بەبرە و بەرفراوان بوونەتەوە، بەتایبەت بینینی ئەکۆلۆژیکی توندی زۆر لە بزاڤەکانی فاشیستی و نازی، رایشی سێیەم بە توندی دەربارەی تەکنۆلۆژیا، گازی مێتان و باقی سەرچاوە جێگرەکانی وزە جستوجۆی دەکرد. ئەلمانییەکان یەکەم کەسانێک بوون کە مەسەلەی پاشەکەوتەی سروشتیان لە ئەورووپادا هێنا ئاراوە و بە کردەوە دەربارەی ئەوە دەست بەکاربوون و پرۆژەگەلێکی بەربلاویان بۆ جەنگەلکاری و زیندووکردنەوەی جەنگەلەکان بەرێوەبرد. جگە لەمە، ئەوان بە ئەزموونگەلێکی بەرفراوان لە بواری وەرزێڕی بیۆدینامیک و ئۆرگانیکەوە سەرقالبوون. زۆر لەوان، وەکو هیتلێر خۆی، گیاخۆرێکی بە راستیبوون و هیملر فەرماندەری ئێس ئێس خۆی یەکێک بوو لە دژە هەرە کەللەڕەقەکانی زیندوو دڕی

یان بڵێن (کالبد شکافی) گیانلەبەرانی زیندوو.[٢٢] ئەم وردبینییە هۆکاری لێدوانە پرجەنجالییەکان لە دەروونی بزاڤی ئەکۆلۆژی لەمەڕ بوونی «ئەکۆفاشیزم» بووە.

بێجگە لە نەزەریاتی ناوبراو کۆشش گلێکیش لە نووسرای کۆمەڵناسی و ئابووری بۆ لێدوان لەمەڕ مێژووی بزاڤی ئەکۆلۆژی بەڕێوە براوە کە هەندێک لەوانە دید و بۆچوونگەلی دێرینەی سەدەی نۆزدەهەم وەبیر دێننەوە. بۆ وێنە لووە و گویدر لە موتالای خۆیاندا لەمەڕ گروپە ژین پێگەیکان لە سیاسەت، «شەپۆل گەلێک» لە پێوەندی لەگەڵ مەسەلەکانی ئەکۆلۆژی هاوێرییان کردووە: لە دەیەی ١٨٨٠ هەتا ١٩٠٠، ١٩١٨ هەتا ١٩٣٩ و دەیەکانی ١٩٥٠ و ١٩٧٠.[٢٣] نووسەران لەسەر ئەو باوەڕەن کە «رەنگە لە خۆرانەبێ کە هەر کام لە خولەکانی گەشەکردنی کوتوپڕی گروپە نوێیەکانی لایەنگری پێگەی ژین لە دەیەی ١٨٩٠کۆتایی دەیەی ١٩٢٠، کۆتایی دەیەی ١٩٥٠ و سەرەتای ١٩٧٠ لە قۆناخگەلی وێچوو لەگەڵ خولی جیهانی کەسپ و کار سەریان هەڵداوە. واتە لە کۆتایی خولەکانی پەرەگرتن».[٢٤] هەرکات پێویستییە ماددییەکان بۆ بەشی تایبەتی لە لایەن گوزەرانی ئابوورییەوە بەقەناعەت دەگەیشت، خەڵک دەستیان دەکرد بە دەربڕینی نیگەرانی لەمەڕ «خەرجەکان» ی گوزەران و هەروەها لەمەڕ پێگەی «سروشتی» کە کاتی بێکاری و رابواردنی خۆیان بەوە دەبردە سەر. ئەوان دەرفەت و کات و هێمنایەتی فێرکردنی و ماڵیان بووە کە بتوانن سەرنج بدەن بە ئاگا کردنەوەگەلێک دەربارەی پێگەی ژین.[٢٥]

لێکۆڵەرانی بەناوبانگی کۆمەڵایەتی گوتوویانە کەسانێک کە نیگەرانیگەلی ئەکۆلۆژیکیان هەیە زۆریان ئەندامی چینێکی کۆمەڵگەن کە لە پەراوێزی پیشەسازیدا وەستاون و هەمیشە لە بەشی خزمەتگوزاری پیشەیی کۆمەڵگە «خوێندکاران، مامۆستایان، هونەرمەندان، هونەرپیشە، رۆحانی، یاریدە دەرانی کۆمەڵایەتی و...» کار دەکەن.[٢٦] ئابوورییەکانی پیشەسازی پێشکەوتوو گەشەی بەرچاوی ئەم پیشانەی بەشی خزمەتگوزاری دەخەنەڕوو. بەم چەشنە، راگواستنی بایەخەکان بەرەو ئەکۆلۆژی لەگەڵ وێنەگەلی ئاڵوگۆڕ کردنی پیشەی ئابوورییەکانی پیشەساز پێشکەوتوو پێوەندیان هەیە. هەڵبەتە دژایەتی تێکەڵ بە تەنزی سەرەکی ئەوەیە کە گەشەی ئابووری هاوکات لەگەڵ کاردانەوەکانی ژین پێگەیی ئەم (ئەکۆلۆژیستەکان

رەخنە لەو دەگرن) پەرەگرتنی بەشی خزمەتگوزاری خۆشگوزەرانی و فێرکردنیان ئاسان کردووە و ئەم کارە بەش بە حاڵی خۆی هۆکاری بەرفراوانی توانایی چێژبردن و کەڵک وەرگرتن لە پێگەی ژین دەبێ کە ئەم گەشەکردنە زیانی بەوە گەیاندووە. خاڵی سەرنجڕاکێش لەم نەزەریاتە کۆمەڵناسی و ئابوورییە ئەوەیە کە ئەوان نیگەرانییەکی ئەوتۆیان لەمەڕ ئەکۆلۆژی خۆی دەری نابڕێ. لە ڕوانگەی کۆمەڵناسی ئەکۆلۆژی ئابووری، ڕاگواستنی بایەخەکان و ئەکۆلۆژی خۆی لە خۆیدا شتێکی ئەوتۆ بە ئێمە ناڵێن، ئابووری، چین و گۆڕینی پیشە لە کۆمەڵگە پیشەسازییە پێشکەوتووەکاندا کە جەوهەری ڕاستەقینەی ئەکۆلۆژیکی ئاشکرا دەکا. ئێمە ناڵێن، ئابووری، چین و گۆڕینی پیشە لە کومەڵگە پیشەسازییە پێشکەوتووەکاندایە کە جەوهەری ڕاستەقینەی ئەکۆلۆژیکی ئاشکرا دەکا.

دەرەنجام، گوتراوە کە دید و بینینی ئێمە لە بابەتی ئەکۆلۆژیکەوە تازەنین. ئەوانە کوتوپڕ لە دەیەی ١٩٧٠ لەگەڵ موتمانە و باوەڕی ڕادیکالی بێخەوش سەریان هەڵنداوە، بەڵکو پێوەندییەکی زیرکانە و بەهێزیان لەگەڵ بینینگەلێک لەمەڕ سروشت هەیانە کە لە ئەندێشەی ئەورووپایدا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا هاتوونە ئاراوە. ئەم ئەنێشانە بە پێچەوانەی سەرکەوتنی بەربڵاوی خۆی بە هۆی کۆما کۆمەڵانی سیاسی جۆراوجۆر لە سەرانسەری سەدەی بیستەمدا، یەک کەوتنی ڕاستەوخۆی بارودۆخ، تاکەکان و ڕووداوگەلی دەیەی ١٩٧٠ بووەتە هۆ کە سەرنجی بەربڵاو بە مەسەلەگەلی ئەکۆلۆژیکی سەرلەنوێ ببەخشرێ. ئەم کردەوە سەرنجێکی نوێیە بۆ وەلانانی کۆششگەلی لایەنگرانی سەرەتا بەرێوە براوە. بە پێچەوانەی ئەم ڕاستەقینە کە ئەم بەشە زۆرتر بە دیاردەی دەیەی ١٩٧٠وە خۆ خەریک دەکا، تیۆری ئەکۆلۆژیکی بە کردەوە بە چەشنێک بەرین بوەتەوە تاکو ڕیزی بەرفراوانتری دید و بینینە سیاسییەکانیش بگرێتە بەر. ئەکۆلۆژی ڕەنگە شێوەیەکی نوێ لە زانیاری ئیدئۆلۆژیکی بێ، بەڵام لە عەینی حاڵدا، شێوەیەکی پێچراوەیە کە وەکو گشت ئیدئۆلۆژییەکان هەموو جۆرە مەیلگەلێکی دژ بە یەک دەگرێتەبەر.

## جەوهەری ئەکۆلۆژی

لە لێدواندا ئەکۆلۆژی بە شێوەی ئیدئۆلۆژییەکی سیاسی، مەسەلەگەلێکی زۆر
ـە ئارادا هەیە کە لەگەڵ نوێ بوونی نسبی ئەم بزاڤە پێوەندیان هەیە. ئەم بزاڤە
هێشتا لە حاڵی فۆرم گیریدایە. یەکەم ئەم مەسەلە بوونی هەیە کە زۆر لەو
کەسانەی کە لە ناخی ئەم بزاڤەدان لەسەر ئەو باوەڕەن کە ئەکۆلۆژی ئیدئۆلۆژی
ـیە. ئەکۆلۆژی شتێک بالاتر لە ئیدئۆلۆژی زانراوە. دووەم پێوەندی دژوار و
ئاستەنگی نێوان ئەکۆفیلۆزۆفی یان فەلسەفەی ئەکۆلۆژیکی هاوچەرخ و ئیدئۆلۆژی
سیاسی و بزووتنەوەی بە کردەوەی ئەکۆلۆژیکی بوونی هەیە. و سەرەنجام
بابەتێکی زۆر و جۆراوجۆر لە دەروونی بزووتنەوەدا لە ئارادایە کە دابەشکردنی
ڕێبازە فیکرییەکانی ئەکۆلۆژیکی ئاستەنگ دەکا. لەم بەشەدا چاو بە سەر ئەم سێ
مەسەلەدا دەخشێنین و پاشان دەچینە سەر تەبەقەبەندی بە کردەوەی
ئەکۆلۆژیزم.

یەکێک لە دروشمە سەوزەکانی بریتانیا و ئەڵمان کە پەیتا پەیتا دووپات
دەکراوە، ئەمە بوو: «نە چەپ، نە ڕاست، بەڵکو بۆ پێشەوە». ئەوەی کە بەراستی
لەم دروشمەدا شاراوەتەوە ئیدئۆلۆژی نوێ نییە، بەڵکو شتێکە کە لە هەموو
ئیدئۆلۆژییەکان بالاتر دەڕوا. بە بۆچوونی زۆر کەس، ئیدئۆلۆژییەکان بەشێک لە
بەستەبەندی ئەندێشە و بایەخگەلێکن کە تایبەتمەندی سەردەمێک یان خولێک
پێکدەهێنن، دەربارەی ئەکۆلۆژی هۆی ریشەیی ئەم ئالۆزییەی پێگەی ژین بووە.
هەر ئەو جۆرە کە نووسەرێک دەنووسێ: «سیاسەتێک کە ئێمە دەیناسین ناتوانێ
ماوەیەکی زۆر بە لێدوان لەمەڕ بابەتەکانی (پێگەی ژین) بەردەوام بێ، بۆ ئەوەی کە
لە زێهنیەتێک کە ئەم بابەتانە لەوەوە هەڵقولاون، بەشدارە» بیروبۆچوونێک کە زۆر
کەس لە بزاڤی هاوچەرخدا لەودا بەشیان هەیە.[27] ئیدئۆلۆژی هەموو ڕێبازەکان هەر
تەنیا (سیستمگەلێکی ئینتزاعی (سەڵت)، کۆمەڵێک لە ئارمانجگەلی هەمیشەیی
مەنتقی... کە بەسەر کرداری ئێمەدا حکومەت دەکەن، و لەمەڕ کۆمەڵگە
راستەقینەیەک بەیان دەکەن». ئەودەم نووسەر دەڵێ: «ئەوانە لە مەترسییەکی

فیزیکی بۆ جیهان کوشەندەترین چونکە مەنتقی ئەوانە دەتوانێ ئێمە بکا بە کۆیلەی خۆیان».[28] بەم جۆرە، ئەرکی ئێمە ئەوەیە کە بالاتر لە ئیدئۆلۆژی هەنگاو بنێین.

بۆچوونی سەرەوە ئاشکرا ئیلهام بەخشی زۆربەی تاکەکانی بزووتنەوەیە ئەم دیارەیە دەکرێ لە زۆربەی ئیدئۆلۆژییەکاندا ببینرێ، هەرچەند بۆ قبوولکردن نابێ. ئەمە ئەهرۆمێکی پڕ بە پێست و ئاشکرایە بۆ دامەزرانی راستەقینەیە. و «من باس لە هەرێمی راستەقینەی بەرچاو دەکەم، توئیدئۆلۆژیزانێکی» بۆ راڤەکردنی سەرلەنوێی باوەڕ و ڕێنوێنییەکان، زۆرتر ئەوەی کە ئێمە چاودروی دەکەین لە ئیدئۆلۆژییەکدا بیدۆزینەوە بە ڕوشنی لە ئەکۆلۆژیدا هەیە ڕاپۆرتگەلێکی متافیزیکێک لەمەڕ جەوهەری راستەقینە، خووی مرۆڤ و ڕوڵی مرۆڤەکان لە جیهان، تاوتوێکردنێک لەمەڕ هۆکاری سازندەی باشترین ژیانی سیاسی، ئابووری و کۆمەلایەتی، و ڕاسپێری و وەسیەتەکان و ڕێنوێنیگەلی ڕازیکەر لەمەڕ ئەوەی کە دەبێ لەم پانتایانەدا بێتە ئەنجام، بوونیان هەیە لە ڕاستیدا زۆرتر لە سەدەیەک لەمەو بەرتر لایەنگرانی ئەکۆلۆژی بە شێوەی جۆراوجۆر لەگەڵ ئێمە بوون. بەم جۆرە، لەم کتێبەدا دەردەکەوێ، ئەکۆلۆژی ئیدئۆلۆژیەکە.

گرفتێکی دڵ نیگەرانکەری دیکە بە پێوەندی فەلسەفەی پێگەی ژینگە (ئەکۆفیلوزوفی) لەگەڵ ئیدئۆلۆژی و کردەوەی سیاسی ئەکۆلۆژیەوەگرێبەستی دەکرێ. ئەندرو دابسۆن سەرنجی داوەتە ئەم خاڵە و دڵێ: «سیاسەتی ئەکۆلۆژیکی هەر لەو پرەنسیپانەی بوارێکی فەلسەفەی ئەو پێڕوی ناکا».[29] ئەگەر بە تاوتوێکردنی نووسراوەی ئەکۆلۆژیکی لە دوو دەیەی رابردوو خەریکین لەگەڵ تایەفەگەلێکی زۆر و جیاواز ڕووبەڕوو دەبینەوە کە هەر کام چالاکی دەکەن و زۆرجار بە شێوەیەکی شاراوە و نهێنی لە بوونی یەکتر خەبەریان هەیە ئەمە دەربارەی هەموو ئەو ئیدئۆلۆژیانەی کە لەمەو بەر موتالامان کرد نائاسایییە و لەوانەدا هاوکێشییەکی زۆرتری نێوان ئەندێشەی پێچراوەی فەلسەفی و نەزەریاتی ئیدئۆلۆژیکی و کردەوەیی بوونی هەیە.

بــڕێکی زۆر لـــه فه‌لـسه‌فه‌گه‌لی پێگـه‌ی ژیـنی و بلاوکـراوه‌ی پێچـراوه و پێشکه‌وتووی وه‌ک زانـستی داهێنـانی ژینگـه، و هـه‌روه‌ها کتێبگـه‌لی فێرکـاری و ـدلیلخـوازی له‌مـه‌ڕ ئـه‌خلاقی پێگـه‌ی ژیـن، و لـه لایـه‌کیتر کۆمه‌لـێکی مـه‌زن لـه ـبیاچه‌کان، کتێبه‌کان، ئه‌نجوومه‌نه‌کان و ئه‌زموونه جۆراوجۆره‌کانی ئیدئۆلۆژیکی، ئابووری، سه‌ردەمی و به کرده‌وه بوونیان هه‌یه. هیچ کام له‌م مه‌یلانـه هۆگرییـه‌ک به یه‌کتر نیشان ناده‌ن. ده‌رباره‌ی فه‌یلسووفان ئه‌م کاره سه‌به‌بی تێکه‌لاویـه‌ک لـه هۆکارگه‌لێکـه کـه هه‌لـقولاو لـه‌م راسـته‌قینه‌ن کـه فه‌یلـسووفان زۆر دل لـه‌دوا و نیگه‌رانی کرده‌وه نین. له ده‌سدانی ئه‌م لێکخـشانه بـه‌ئازاره.[٣٠] مه‌سـه‌له‌ی زیـادی دیکه له پێوه‌ندی له‌گه‌ل ئه‌کۆلۆژی کـرده‌وه خـوازتر، دژایـه‌تی ده‌روونی ئـه‌و لـه لایه‌ک، له زۆربه‌ی نووسراوه‌ی «کـارکردی» دوایـی مـایلبوون بـۆ وه‌ک یـه‌کبینی ئاشکرا (به شێوه‌ی ده‌ره‌کـی) له‌گـه‌ل یـه‌کێک لـه لایه‌نـه لێـدوان هورووژێنـه‌کانی فه‌لسه‌فه‌ی لاینگری پێگه‌ی ژین ـ ئه‌کۆلۆژیکی قـوول ـ بـوونی هه‌یـه.[٣١] لـه لایـه‌کی دیکه‌وه، له نووسراوه‌یه‌کی وه‌ک ئه‌و، و له‌کاری ئێستا، باوه‌ڕه سه‌ره‌کییه‌کان جێی که‌لـک وه‌رگـرتنی زۆربـه‌ی ئه‌کۆلۆژیـسته‌کان، زۆرجـار دۆز و ڕێنوێنیگـه‌لی «مه‌عقوولانه‌ی مرۆڤایه‌تی»ن که سه‌رنجێکی که‌می و له راستیدا دژایه‌تی ئاشکرای ته‌نانه‌ت له‌گه‌ل شێوه‌ی راسته‌وخۆتری فه‌لسه‌فه‌ی پێگه‌ی ژین هه‌یـه. بـه جـۆرێکی دی، ئه‌کۆلۆژی هه‌ر ته‌نیا له بواری ژینی مرۆڤدا جارجار ده‌که‌وێته پاکانه کردن بۆ خۆی. دواتر ده‌گه‌ڕێنه‌وه سه‌ر ئه‌م خاله‌و مه‌سه‌له‌ی سێیه‌م، ژمـاره و زۆرییـه. لـه حالی حازردا زۆربه‌ی ئه‌کۆلۆژیسته‌کان بایه‌خی زۆری و جۆراوجۆر له ئه‌کۆسفێر یان قبوول نییه، له بوونی رواڵـه‌تی ئـه‌وه لـه خـودی ئه‌کۆلۆژیـدا زۆر هه‌سـت بـه شادی ناکه‌ن. مایلبوونێکی بـه‌هێز لـه بزاڤـدا لـه بـاری بێخه‌وشـی و نـوێ بـوونی ئه‌کۆلۆژی و گه‌نده‌ل نه‌بوونی ئه‌و بـه هـۆی لێکخـشان له‌گـه‌ل پلانـه کۆنـه‌کان لـه ئارادایه. به‌لام ئاشکرایه که «هه‌ر ئه‌و جۆره کـه سۆسـیالیزمه‌کان و لیبرالیزمێکـی زۆر بوونیان هه‌یه، ئـه‌کۆلۆژیزمێکی زۆریـش بوونیـان هه‌یـه».[٣٢] جگـه له‌مـه، ئـه‌م ڕێبازه جۆراوجۆرانه ئه‌کۆلۆژیکی یان له پلانه فیکرییه‌کانی دیکه‌وه سـه‌رچاوه‌یان گرتووه یان له‌گـه‌ل ئـه‌وان تێکه‌لـیان هه‌یـه. ته‌شـه‌نه‌ترین و گومانـاویترین ڕێـڕه‌و

ئەمەیە کە ئەوەی کە بە ناوی ئەکۆلۆژی بوونی هەیە. ساکاری یەکەنەوە و هەندێک لە وتارەکانی دیکە قبوول نەکەین. دابەشکردنی و وتارسازی من زۆرتر خاڵگەلێک دەگرێتەخۆ کە توێژەرانی دیکە ئەوەیان نەسەلماندووە.[33]

بزووتنەوەی ئەکۆلۆژیکی چ لە باری سیاسی و چ لە فەلسەفی خاوەنی دوو مەیلی بەربڵاو لەگەڵ کۆکراوەگەلی ناوە ناوەی بەرفراوانە. یەکەم دەچینە سەر و کاری تیپۆلۆژی فەلسەفی: دتوانین لەرازێکی خەیاڵی و زیندەخەودا ئەوەی کە لایەنی «مرۆڤداری» ناودەنرێ، هاوێری بکەین کە ڕێنوێنی گەلی هەرە مەزنی ئەوانە لەسەر ئەمە تەئکیدی هەیە کە بوونەوەری مرۆڤایەتی تاقانە پێوارێکە بۆ ئەوەی کە بە بایەخە و ئەوەی کە دەتوانێ بە بایەخ بێ، دەدرێتە قەڵەم.[34] لە روانگەی ئەم لایەنەوە، بایەخی سروشت هەمیشە خووی ئامێری هەیە، واتە جیهانی سروشتی «لە وانە گیانەوەران» تەنیا بۆ مرۆڤەکان و لە بەر ئەوانە کە کار دەکەن و بایەخی هەیە یان هەتا جێیەک کە مرۆڤ بایەخ بۆ ئەوان دادەنێ، گرنگی هەیە. هەڵبەت لێرەدا سروشت هێشتا دەتوانێ بایەخێکی زۆری ببێت: دەتوانی سیستمی بە ئاگا کردنەوەی سەرەتای بۆ ئێمە لە باری نزیکبوونە کارەساتی ئەکۆلۆژیکی و پێگەی ژین بێ؛ ئێمە پشتگری و بەخێوکا؛ دەتوانین لەوە ئەزموونگەلێکی بە بایەخ بە ئەنجام بگەێنین؛ دەتوانین لەودا کردەوە و خۆبارهێنان و خۆ تاقیکردنەوە بکەین، دەتوانین ستایشی ئەو بکەین و لەودا بحەسێینەوە. دەتوانین لەباری دەروونییەوە لەودا سەرلەنوێ گوڕ بگرینەوە و بگەشێینەوە و جوانی ئەو هەستی جوانیناسی ئێمە دنەبدا.[35] لەگەڵ ئەمە، هەموو ئەم بەخششانە و ئیمتیازاتانە لەسەر مەداری مرۆڤ دەخولێتەوە و حاڵەتی ئامێریان بۆ مرۆڤ هەیە. سروشت بێ بوونی مرۆڤ بێبایەخە.

لە کۆتایی دیکەی ئەم زیندەخەوە فەلسەفییە، لایەنێکی ئەکۆلۆژی قوول هەیە ئەم لایەنە نزیک بە شتێکە کە جاری وایە ئەوە روانگەی «گشت بین» ناو دەنێن ناوەندی سەرەکی بایەخ، تاکی مرۆڤ نییە، بەڵکو ئەکۆسفێر بە شێوەی گشتییە لەم رووەوە، ئەم رێبازە لە رووبەڕوو لەگەڵ مەکتەبی مرۆڤمەدار مەکتەبی «مەئو مەدار» مامەڵە دەکرێ. لێرەدا بایەخ هەمیشە زاتی گشت ئەکۆسفێرە؛ مرۆڤەکان

ئەم بایەخەیان بەو نەداوە و لە بەر ئەمە. ناتوانن وەکو ئامێرێک بۆ ئامانجەکانی مرۆڤ کەلک لە ئەکۆسفێر وەربگرن. ئەمە لێدوان هورۆژترین لایەنی فەلسەفەی ئەکۆلۆژیکی یان پێگەی ژینە کە ئێلهام بەخشی سەرەتایی ئەو ئالدۆ لئۆپۆلد نووسەری ئەمریکای باکووری لەگەل سالنامەی ناوچەی زیخی خۆی و پاشان ئارن نسی فەیلسووف بوون.[٣٦] ئەم ڕێبازە، لەگەل بوونی ئەم ڕاستیە کە هێشتا لە حالی فۆرمگیریدایە. حەز و مەیلێکی زۆر لە خۆ دەگرێ: تەئکیدی ژ.ر. رودمن لەسەر حەساسییەتی ئەکۆلۆژیکی. دەوروبەری نووسراوە سەرەتاییەکانی نس کە لەسەر بایەخی زاتی جستوجۆی قوول تەئکید دەکەن، کەسانێک کە لە ئەکۆلۆژی قوول مانا قوولەدینییەکان «هەمیشە بوودایی» پەیدا دەکەن. و سەرەنجام کەسانێک ـ بەتایبەت وارویک فاکس ـ کە تێدەکۆشن سەرنجی فەلسەفی متافیزیکی نوێ و قوولیان بە گوێرەی پێویست بە گۆڕینی بناخەیی لە زانیاری ئەکۆلۆژیکی مرۆڤدا ببێت.[٣٧] بەم حالەوە، لە هەموو مەیلەکاندا مرۆڤەکان بە شێوەی لایەنێک و بەشێک لە ئەکۆسفێر سەیر دەکرێن.

لە نێوان ئەم کۆمادا، دەستەیەکی بەرفراوانی مامناوەندی بوونی هەیە کە بەشکردنی دەرەکی ئەوان دەتوانێ بە سوودی هەر دوو مەیل بێ. هەلوێستی سەرەکی دید و بینینی مامناوەندی، نە جێی پەسندی ئایینی مرۆڤدارییەی بێ خەوشە و نە ئەکۆمەداری خالیسە. بەشی هەرە زۆری فەلسەفەی پێگەی ژینی ئەخلاقی لەم دەستەیەدا جێدەگرێ. دوو مەیل و ئارەزووی دەرەکی هەلوێستی مامناوەندی دەکرێ «بەرینخوازی ئەخلاقی» و «گشتیخوازی ناڕازی» ناو بنرێ.[٣٨] جیاوازی سەرەهەمبەندی نێوان ئەم دوو ئارەزووە دەرەکییە ئەمەیە کە یەکەمیان زۆرتر بە ئایینی مرۆڤمەداری نزیکی هەیە و دووەمیان لەم بارەوە کەمتر نزیکی هەیە.

لە نێوان دەستەی «بەرینخوازانی ئەخلاقی» دا باشترین وێنە کەسایەتیگەلێکی وەک پیتێر سینگر یان تام ڕیگان هەن کە باوەڕیان بە ئازادی و لە بەرچاوگرتن مافەکانی گیانەوەران هەیە کە هەمیشە بە وانە دەلێن«هەستخوازی ئەخلاقی». سینگر باوەڕی هەیە کە «هەست» ناوەندی بایەخە.[٣٩] گیانەوەران هەستیان هەیە و

لە بەر ئەمە، خاوەنی بایەخن. ئەمە بەو مانایە کە حەیاتی بێ هەست بێ بایەخە. ئێمە مەسەلەی بایەخ لە نێو گیانلەبەران وا بەربلاو دەکەینەوە چونکە دەتوانین بە مەنتق ببینین کە ئەوانە وزەی هەستیان هەیە. بەم جۆرە، گیاکان، بەردەکان یان چەم و رووبارەکان لە وتاری لێدوانی ئێمە بەدەرن. سینگر دەڵێ: «دەرکی ئەم خاڵە زۆر ئەستەمە کە چۆن برینی درەختێک دەتوانێ بۆ درەخت گرنگی ببێت ئەگەر بێ هەست بێ؟[٤٠]

لایەنی «گشتیخوازی ناڕازی» بەڵگەگەلی لە پێوەندی لەگەڵ بایەخدا، لە هەستی تێدەدەپەڕێنن و دیگەێننە رادەی واتاگەلی جۆراوجۆر. بە جۆرێکی دیکە، زۆربەی گشتیخوازە ناڕازییەکان لە بەرینخوازانی ئەخلاقی توندتر دەڕۆن و بایەخ لەسەرووی مرۆڤ و گیانەوەرانەوە دادەنێن. ئەم لایەنە پێناسەکەر و ناسنامەی گشتیخوازی ناڕازییە. رەنگە هەندێکیش بڵێن «تاقانە گشتییەکان» وەکو کۆمەڵگەی بیۆتیک بایەخی نییە.[٤١] بەم حاڵەوە، ئەم تاقانە گشتیانە هەمیشە کێوەکان و رووبارەکان لە خۆ ناگرن. زۆربەی رێنوێنییەکان و باوەڕە دەروونییەکانی گشتیخوازی ناڕازی فۆرمێک لە کێشەی بایەخی زاتین، بەڵام بارەو، زۆربەی نووسەران، لەوانە ج. بردکالیکات، هلمز روستۆن سوم و پول تایلۆر، هێشتا دەیانەوێ مابەینی رەخنەی خۆیان لەگەڵ گشتیخوازی موتڵەقی بیرمەندانی ئەکۆلۆژیکی قووڵ، وەکو ئارن نس و وارویک فاکس بپارێزن.[٤٢]

بەر لەوەی کە تیپۆلۆژی سیاسی بگەێنینە ئەنجام، بەیانی خاڵی کۆتایی لەمەڕ واتای بایەخی زاتی زەروورەتی هەیە. جیاوازی نێوان ئەکۆلۆژی قووڵ و باقی جۆرەکانی فەلسەفەی پێگەی ژین ئەمەیە کە دەستەی یەکەم باوەڕی زۆر بە بایەخی زاتی هەیە. بایەخی زاتی دەکرێ بە شێوەی رواڵەتی بە شێوەی هەڵواسراو بە شتێک کە خۆی لە خۆوە بایەخی هەیە و هەڵواسراوەی ئەو وەک ئامێر نییە پێناسە بکرێ.[٤٣] لێرەدا بە شێوەی زووتێپەڕ ئاماژە بە دووخاڵ دەکەین. یەکەم باوەڕ یان کێشەی بایەخی تاقانە بوونی نییە. لە راستیدا کێشەگەلی بایەخی بوونیان نییە کە رووبەڕوو لەگەڵ یەکدا دوژمنایەتی دەکەن. فەیلسووفانێک هەن کە بایەخی زاتی لە شتە مەوجوودەکانی جیهاندا دەبینن. کەسانێکی دیکە بایەخی

ـە بـارودۆخ و چالاکییـەکانی شـتەکان، بەتایبـەت «بارودوخەکاریـەکان» هەسـت
ـێدەکەن کـە لـە گەشـەکردنی شـتێکدا بەشـیان هەیـە.[٤٤] سـێیەم لـە باوەڕەکـانی
گرێدراو بە ڕێنوێنییە بە بایەخیەکاندا زیندەخـەوی فەلـسەفەی پێگـەی ژیـن کەلـک
ـوەردەگیرێ. ئەوانە تەنیا لە پـەنای ئـەکۆلۆژیکی قوولـدا دەمێنێـەوە. لـە راسـتیدا
ـەیلسووفانی ئەکۆلۆژیکی قوول، وەکـو وارویـک فـاکس، لـە ئاسـەواری نـوێتری
خۆیدا روالەتەن پێوەندی کەمی بۆ ئەوانە لە بەرچاو گرتووە.[٤٦] لە لایـەکی دیکـەوە
ـەندێشەی بایەخی زاتی دتوانێ لـە دەروونی ئـەخلاقی مـرۆڤ مەدارانـە بکەوێتـە
گەڕ و لە بایەخی زاتی تاکی مرۆڤ بە شێوەی بوونەوەرانی جیاواز لـە سروشـت
ـدوێ.لەم کارەدا لە پرەنسیپە جۆربەجۆرەکان هەلویستی فەلسەفی پێگـەی ژیـنی
ـامناوەندی بە شێوەی زۆر جۆربەجۆر لە ئاسەواری فەیلسووفانێکی وەک هەلمز
ـرۆستۆن و رابین ئالفید کەلک وەرگیراوە.

هەنووکە مەسەلەی پێوەندی تەبەقەبەندی نێوان نەزەریاتی فەلسەفی ناوبراو و
زیندەخەوی باوەڕە سیاسییەکان دەبێ بە کورتی تـاوتوێ بکـرێ. دەسـتەبەندییە
بەرفراوانەکان دەکرێ بە ناوی بنەماناسی فەلسەفی هاوێر بکرێن. خالێک کە دەبێ
باس بکرێ ئەوەیە کە پلانێکی سیاسی کە ئەو کۆمایانە بەم شێوە سەر هەلـدەدەن
لە کۆماگەلێکی گوشارەوە هـەتا حزبـە سیاسـییەکان دەگرێتەبـەر و دەگـۆڕدرێ.
یەکگرتوویی یەک بە یـەکی دەقیـق لـە نێـوان هـیچ کـام لـەم دەسـتانە و شـێوەی
سیاسی ونی نییە. لە بەر ئەمـە، ئەکۆلۆژیـستە قوولـەکان یـان بـوون بـە ئەنـدامی
حزبەکان یان تێکەلـی کۆمـا گوشـارەکان بـوون. بـەم شـێوە،،لـە لایـەک لایـەنێک
«شێواز» و ریفۆرم خوازتر لە ئەکۆلۆژیدا بوونی هەیە، ئەم لایەنە لە گـشت دیـد و
بۆچوونی ئـەکۆلۆژی دوور دەکەوێتـەوە و خـۆ جیـا دەکاتـەوە.[٤٧] لـە نـاخی ئـەم
تاقمەدا جاری وایە لەگەل سوننەتیترین کۆماگەلی پێگەی ژین، بۆ وێنـە کۆماگـەلی
پارێزگاری لە پێگـەی ژیـن و کۆماگـەلی سـەرلەنوێ دروسـتکردنەوە رووبـەڕوو
دەبینـەوە. لـە راسـتیدا بەشـی هـەرەزۆری گرووپـە سـەرکەوتووە سیاسـییەکانی
لایـەنگی پێگـە ژیـن مـایلن لـەم دەسـتەدابن. سەرنجراکێشیان هەمیشە لـە بـەر
گرنگیدان بە بایەخ و پاراستنی پێگەی ژین بۆ بەرژەوەندی یان ژیـنی بوونـەوەری

مرۆڤە. بە شێوەیەکی دیکە. بنەڕەتی سەرنجڕاکێشیان دەولەمەندبوونی باوەڕی مرۆڤ مەدارانەیە. لایەنی ریفۆرمخواز لە بنەڕەتەوە لە ناخی چوارچێوەگەی پایەدارڕژاوی مەوجوود و ڕێکخراوە سیاسییەکاندا کار دەکا، ئەگەرچی بۆ سابت کردنی حەقانییەتی خۆی، خۆ بە برێک ڕێپێوانی گشتییەوە هەڵدەواسێ.

لەو سەری ئاخری زیندەخەو، لایەنی ئەکۆلۆژی قووڵ وەستاوە سەرنجڕاکێشی و دڵڕفێنی ئەوان، دانلد وورستر گوتەنی،[48] لە گەڕێوی زێهنییەتی ئارکادی (گوندخوازی) ئەواندایە. ئەکۆلۆژیستە قووڵەکان هەمیشە خوازیاری گۆڕینی گشتی بایەخەکان لە کۆمەڵگەدان. ئەمە کە سەردەمێکی نوێ سەرهەڵدا کە لەودا گۆڕانێکی گشتی لە جیهان و سروشتدا بەدی بێنێ. لەم مانادا برێک لەودی کە «ئەکو توپیا» ناونراوە، لە باوەڕی ئەم لایەنەدا بوونی هەیە.[49]

ئەم جۆرە کە دەربارەی تیپۆلۆژی فەلسەفی لەسەرەوە بەیانکرا، هەموو جۆرە مەیلەکان لەم بوارەدا بوونیان هەیە. کەسانێک هەن کە بە دروستکردنی کۆمەڵگە بریکارەکان لەسەر بنەمای پرەنسیپی مەزهەبی و نامەزهەبی و کەلک وەرگرتن لە ئەکۆلۆژیکە جێنشینەکان باوەڕیان هەیە. ئەوانە خاوەنی فەلسەفەی کۆمەڵایەتی زۆر جیاوازن کە لەسەر بنەمای ڤاوەڕۆک گەلی وەک «ناوچە گەرایی ژیانی»یە کە دواتر لەمەڕ ئەوە لێدوان دەکەین. ئەم پانتایە پشتیوانی گرووپی بچووک، بەڵام پڕ دەنگوباسی ئەکۆفەمینیستەکانیشی کێش کردووە کە کۆمەڵگەی قووڵ بە کۆمەڵگەیەک دەزانن کە پیاوسالاری لەودا لە ناوچووبێ. لێدوان هەڵایسێنتر ئەوەیە کە ناسیۆنالیستەکان و نەتەوەخوازەکان لە بیر چوونەتەوە کە لەسەرەتای سەدەی بیستەم گەشە و نەشەی زۆریان بەرەو خۆیان کێشا بوو. فەلسەفەی تەوەحود (مونیزم) هەکێل (و کەسانێک کە لە جۆرە جیاوازەکانی ئەو کەلک وەردەگرن) زۆر لەگەڵ مۆدێلە قووڵەکانی ئەو نزیکە. باوەڕەکانی فاشیزم و ناسیۆنال سۆسیالیزم دەربارەی پێوەندی قایمی مرۆڤەکان بە زەمین مەکانەوە تەنینەوە یەک لەم بینینەیە کە لە فەسڵی شەشەمدا تاوتوێمان کرد.[50]

سەرەنجام و لێدوان هورووژێنتر لە هەموو، لایەنی توندڕۆ و توندوتیژتری دیکە بوونی هەیە کە دەتوانین ئەوە لە ئەکۆلۆژیستە قووڵەکاندا بدۆزینەوە. ئەم

ێیەنە بزاڤە «یەکەم زەمینە» کە پێگەی سەرهەڵدانی ئەو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، بەڵام لق و پەلەکانی لە زۆربەی وڵاتەکانی دیکەش هەیە کە وەرگەلێکی قوولیان هەیە کە لەوانە ئەنجامگەلێکی بەرواڵەت مەنتقی دەگەیێننە دەرەنجام. سروشت گرنگتر لە بوونەوەری مرۆڤە. سروشتی وەحشی جێی بایەخی موتڵەق دەگرێتەوە. بە پیشەسازی بوون بووەتە هۆی لە ناوچوونی گۆی زەوی. زۆربەی پیرەوانی «سەرەتای زەمین» لەگەڵ گەشبینی و ئاسان گرتنی بابەتی بەدل بە سەرهەڵدانی بەهێزی نەخۆشی ئیدز، گرانی و برسییەتی و ئیمکانی هەمەلایەنەگیری سەرلەنوێی نەخۆشی هاولە سەیر دەکەن و لەسەر ئەو باوەڕەن کە ئەم دیاردانە دەبنە هۆی ئەوە کە ئەکوسفێر پشوویەکی تازە هەڵکێشێ و سروشت هاوکێشی خۆی لەسەر گۆی زەوی بە دەس بێنێتەوە. هەندێک لەوانە لایەنگری نەزۆک کردنی زۆرداری جەماوەری مرۆڤن. هەندێک پێرەوانی «سەرەتای زەمین» تووشی کاری راستەوخۆش بوونەتەوە (کە لەم رووەوە لە زمانی عامدا ئەوانە بە «ئەکۆتاژ» باو دەبەن) بۆ وێنە درەختانێک هەڵدەبژێرن و بزمارگەلێکی درێژ بەواندا دادەکوتن هەتا بەم هۆیەوە بەرگری لە برینیدارە جەنگەلییەکان بە هۆی مشاری کارەباییەوە کرێ (کە پێشەکی کاری ئەوان سەرکەوتوانە بووە). مەنتقزانی ئەم مەیلە، تەنانەت لە دەروونی خودی بزاڤی ئەکۆلۆژی، بەرچەسپی ئەکۆفاشیزم و ئەکۆ توندوتیژخوازیان بەم جۆرە کەسانەدا چەسپاندووە.

هەڵوێستی مامناوەندی هێشتا بیروبۆچوونی سیاسی جۆراوجۆرە و خۆی دەکێشێ. هەروەها بۆشایی نێوان لایەنی ریفۆرمخوازی مرۆڤمەدار ئارام و لایەنی مامناوەندی زۆر کەمە (تەنانەت ئەکۆلۆژیستە قوولەکان جارجار پاڵ دەدەن بە باوەڕی مرۆڤمەدارانی خۆ پارێزەوە) خاڵێکی دیکە کە دەبێ لێرەدا بوترێ ئەمەیە کە هەڵوێستی مامناوەندی نەهێندە لە باری رێژەوی بەڵکو لە باری مولزەم بوونی بەهێزی ئیدئۆلۆژیکی و فەلسەفی بۆ هاوکێش و بەرامبەرکردنی غەیرەمرۆڤمەداران لەگەڵ لایەنی ریفۆرمخواز جیاوازی هەیە. جگە لەم، «هاوکێشی» راستی نێوان نەزەریاتی ئیدئۆلۆژیکی، سیاسی مامناوەندی و بیربۆ

چوونی فەلسەفی مامناوەندی بوونیان هەیە، لە حالێکدا کە یەکگرتوویی نزیکی نێوان فەیلسووفانی قووڵ و کردەوەخوازانی قووڵ بوونی هەیە.

بۆشایی نێوان بیروبۆچوونەکان لە بوعدی سیاسییەوە بە سەرهەڵدانی باوەڕگەلی ئیدئۆلۆژیکی پایەدار گەیوە. بۆ وێنە هۆگرییەکی زۆر بەوەی کە بە «ئەکۆکاپیتالیزم» ناو بانگی دەرکردووە (وەژەی دیکەی ئەو دەبێ «لیبرال کاپیتالیزم» بێ) دێتە بەرچاو. ئەم رووداوە، بازار بە باشترین ئامێری کۆنترۆڵی مەسەلەی پێگەی ژین دەزانێ. بێجگە لەمە، بەدوا بلاوبوونەوەی کتێبی رودولف بارودا، لێدوانێکی توند لەمەڕ ئەکۆ سۆسیالیزم هاتە ئاراوە. ئەکۆ سۆسیالیستەکان دوو بۆچوونی عومدەیان لەمەڕ ئەکۆلۆژی هەیە کە دید و بینینی سۆسیالیستی لە لیبرالیزم نزیک دەکاتەوە. لە لایەک، ئەکۆسۆسیالیزم دەیەوێ ئەکۆلۆژی بورژوایی وێران بکا (و ئەوە بە دیاردەی ریفۆرم خوازی چینی مامناوەندی خەیاڵی دەزانێ).[51] بۆچوونی دیکە ئەوەیە کە ئەکۆ سۆسیالیزم دەیەوی چارەنووسی ئەکۆلۆژی ماتریالیستی رادیکال تەواو راست بکاتەوە یان بەرهەمی بێنێ. ئەکۆ سۆسیالیزم دەربارەی داهاتووی کۆمەڵگە، واتە ئەمەکە ئایا کۆمەڵگە بەرەو دەوڵەتێکی ئەکۆ سۆسیالیستی رۆشنبین دەڕوا یان بەرەو کۆمۆنێکی پلۆرالیستی سۆسیالیستی، دووپەڵ بووە.

ئەکۆلۆژی کۆمەلایەتی «هەڵوێستی سیاسی مامناوەندی» دیکەیە کە لە کتێبی مورای بوکچین، ئانارشیست کومۆنیست ئیلهامی وەرگرتووە. ئەو جۆرە کە لە فەسلی پێنجەمدا گوترا، ئەم هەڵوێستە تێدەکۆشێ هەتا نگەرانیگەلی ئەکۆلۆژیکی لەگەڵ ئانارشیزمی کومۆنیستی سوننەتی پێکەوە گرێ بدا. سوننەتێک کە بە پتر کرۆپوتکین بە شێوەی باوەگەورەی سەر بەرز و بەناوبانگی شانازی دەکا. بە بۆچوونی بوکچین، پێکهاتەی ئارەزووی باڵا ئەو جۆرە کە چاوەڕوان دەکرێ لەسەر بنەمای دۆزی کومۆنی دیموکراتیکی سوننەتیە.

هەڵوێستی ئەکۆلۆژیکی کۆمەلایەتی بە رواڵەت دەیەوێ بە شێوەیەکی وردبینانە زۆربەی گرفتەکانی حەیات «ئێستا» و رێکخراوەی ئێستای دەروونی ئەندێشەی ئەکۆلۆژیکی لەگەڵ سوننەتی جێکەوتووی فیکری خۆی رێکبخا. بەم

جۆره، زۆرجار سەرنجی سەرەکی لەسەر ئەم لێدوانانەیە کە ئەکۆلۆژی بەکردەوە هەڵگری چ واژەگەلێکی سیاسییە. سەیر و گاڵتەجاڕ ئەوەیە کە بە پێچەوانەی بەیانی راشکاو و بە کەم زانینی بێ بەزەییانەی بوکچین سەبارەت بە ئەکۆلۆژی قووڵ (کە ئەو زۆر جار ئەوەی بە ئەکۆشیزم یان بە جۆرێکی رەمزاوی «ئەکۆلالا» ناو دەنێ)، کومۆنی دێموکراتیک ئانارشیستی ئارامگرتوو لە باوەشی ناوچەیەکی ژیانیش مۆدێلی رێکخراوەیی لە دەروونی و تارێکی قووڵ دەدرێتە قەڵەم. لەگەڵ پلانی دەسەڵاتخوازی هەرەکەم (کە بۆ ئانارشیزم نامۆ بوو) کومۆن بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕ ببووە وێنە بۆ ئەکۆلۆژیستە ناسیۆنالترەکان.[52]

هەندێک ناوەڕۆک لە ئارادا هەیە کە هەموو جۆرەکانی ئەکۆلۆژیستی فەلسەفی و سیاسی ئەوە دەسەلمێنن. زۆربەی ئەوانە بە شێوەیەک لەسەر سەربەخۆبوونی سیستماتیکی جۆرەکان و پێگەی ژین سوورن. ئەگەرچی زۆر لەوان سەرنجێکی تایبەتیان هەیە، بەڵام زۆر ئاسایی هەموویان ئەکۆسیستم بە شێوەی گشتی دەرگرنە بەرچاو. هەروەها لە بەراورد لەگەڵ باقی ئیدئۆلۆژییەکان، بینینی کەم زیادتر و پوزەتیڤتر سەبارەت بە سروشت بوونی هەیە. بێجگە لەمە، مەیلی گوماناوی لەمەڕ پێگەی بالاتری مرۆڤ لە گۆی زەوی لە ئارادایە. بێجگە لە نیگەرانی گشتی هابەش لەمەڕ ئەوەی کە بوونەوەری مرۆڤ بە هۆی شارسانییەتی پیشەساز خۆیانەوە بە کردەوە لەسەر گۆی زەوی ئەنجامی دەدەن، بوونی هەیە. من وەکو فەسڵەکانی پێشوو بە لێدوان لەمەڕ زۆر لەم ناوەڕۆکانە لەگەڵ عینوانەکانی سروشت یان خووی مرۆڤ، سیاسەت و ئابووری بە ئەنجام دەگەینم لەگەڵ ئەوە، تێدەکۆشم هەتا وەڵامە جۆراوجۆرەکانی ئەکۆلۆژیکی بێنمە ئاراوە.

## خووی مرۆڤ و سروشت

لەمەڕ واتای خووی مرۆڤ لە ئەکۆلۆژیزمدا ناکرێ بە شێوەی گشتی جیا لە واتای سروشت لێدوانی لە بارەوە بکرێ، چونکە کۆکراوەی فەلسەفی لێدوانەکان بەشی هەرە زۆری پێچراوە بە مرۆڤمەداری و نامرۆڤمەدارییەوەیە. گومانی

گشتی سروشــت لــە ئەندێشەی ڕۆژاوا لــە نێوان پاڵــەوان و دژی پاڵــەوان یــان شەڕوور و بەینابەینی بووە. دۆزی شــەڕوور و شــەڕ یان دژی پاڵەوان یەکێک لــەو ئەندێشانەیە کە ئەکۆلۆژیستەکان بەوە بەتایبەتی ئەندێشەی مرۆڤمداری بێخــەوش دەزانن. لەم خوێندنەوەدا، سروشــت بێبایــەخ، بــەڵام هێشتا شــاراوە سەرکێش و نافەرمان دەبینرێ کە دەبێ ئەوە دەفع بکرێ، بێتە ژێــر کــۆنترۆڵ، دەســتی تێــوەر بــدرێ و بــە هــۆی ئامانجــەکانی مرۆڤــەوە کەڵــکیان لێــوەربگیرێ. زۆربــەی ئەکۆلۆژیستەکان ئەم بینینە پڕ لــە کینەیــە ســەبارەت بــە سروشــت و بیرمەنــدانی سەردەمی ڕۆشنبیری لە نووسراوەکانی ئەکۆلۆژیکیدا وەکو تاوانباران مامەڵــەیان لە تەکا دەکرێ.

ئەندێشەی سروشتی پاڵەوان یان لانیکەم دلۆڤان، کە ســەرچاوەی لــە کۆتــایی سەدەی نۆزدەهەم گرتووە دوولایەنی هەیە. دەرەوەیان زەمینی و دەروونی یان زاتی. «ئەندێشەی ئــەرزی» لەســەر ئــەو باوەڕەیــە کــە بــە موتمانــە و ئیعیتبــاری بایەخێک کە بۆ ئێمە هەیە بە بایەخە و ئەمە ئێمەین کە دەیخەینــە بــوار و ناوچــەی ئەخلاقی خۆمانەوە. ڕەنگە سروشت تەنانەت دەتوانێ زاتەن بــە بایــەخ بــێ، بــەڵام ئەم بایەخە هەر تەنیا لــە پێوەنــدی لەگــەڵ بوونــەوەری مرۆڤدا مانــا بــە خۆیــەوە دەگرێ. بەم جۆرە سروشت لەم ڕووەوە دەبێ بــە پاڵــەوان کــە ئێمــە بــۆ ژیــان و گەشە کردنی خۆمان بایەخ دادەنێین. لەم خوێندنەوەدا، سروشت بە هۆی بایــەخی زاتی مرۆڤــەوە شــیاوی بایــەخ دەبــێ. زۆربــەی گرووپــە ڕیفۆرمخوازەکــان و لایەنگری پێگەی ژین ئەم بۆچوونەیان هەیە.

ئەندێشەی دووەم یان «ئەندێشەی زاتی» (کە لایەنگەلی مامناوەندی سیاســی و ئەکۆلۆژیکی قووڵی لایــەنگری ئــەوەن) ئەوەیــە کــە سروشــت گرنگــی دەروونی و زاتی هەیە. بە بۆچوونی زۆربەی ئەکۆلۆژیستە سیاسییەکان ئەم ڕینوێنییە زاتییــە، پێوەندی نەپچڕاوەی لەگەڵ ئەم کێشە هەیــە کــە مرۆڤــایەتی بەشــێک لــە هــەموو سروشــتە. بــەم شــێوە، خوویــان سروشــتی مــرۆڤ بــە جێوبــانی شــەش دانگــی سروشتدا شیاوی دەرکــە. لــە بــەر ئەمــە، مرۆڤــەکان دەبــێ «ژیــان کــردن لەگــەڵ سروشت فێربن» نەک دژی ئــەو.[٥٣] گــشتی پەســندترین دۆزێــک کــە بــۆ بــڕێک لــە

ئەکۆلۆژیستە سیاسییەکان لەم بوارەدا بوونی هەیە گریمانەی گایا پێوەندی بە جیمز لاولۆکەوەیە.[54] لاولۆک بە شێوەی بیرمەندێکی کارامە ئەم گریمانەی هێنا ئاراوە کە گۆی زەوی دەبێ بە شێوەی سوپێر ئۆرگانیزمێک تایبەتەن بەرێککراوەی خۆی چاوی لێ بکرێ. بە بۆچوونی لاولۆک بوونی ئەتوسفر بوونەوەری زیندووی نەخولقاندووە. بەڵکو ئەم بوونەوەرە زیندوانە لە باکتری «زەرە» وە بگرە هەتا بالاترین کە ئەتمۆسفێری زەوی تایبەتەن لەگەڵ حەیاتی خۆی بەدی هێناون. ئاوس بوونی خاک، گەرمای ئەتمۆسفێر، برە ئۆکسیژنێک کە هەڵی دەمژین، هەموویان پێوەندیان بە تێکەڵی پێچراوەی ئۆرگانیزمەوە هەیە. ئەم گریمانەیە بە پێچەوانەی گومانگەلێکی زۆری زانستییەیەوە لەمەڕ ئەو ـ لە راستیدا هەر تەنیا دەبوایە لە حوکمی باوەڕێکی بەسراو بە گرنگییەوە شایانی سەرنجی ئۆرگانیزمەکان یان ئەکۆسیستمگەلی هاوکێشی گۆی زەوی راڤە کرابا ـ بووە بە تەلەسمێکی راستەقینە بۆ بزاڤی ئەکۆلۆژیکی سیاسی.

هەنووکە گایا، تەنانەت لە بەرامبەر سەر سوود ماوی لاولۆک، لایەنێکی بێ کەم و کورتی مەعنەوی گرتووەتە بەر. ئەم گریمانە نەک هەر تەنیا لەسەر سەلماندنی پێوەندی رووبەڕووی ئێمە بە بنەمای ئەکۆسفێرەوە دارژاوە بەڵکو کاکڵی مرۆڤایەتی شەفاف دەکا و بەرامبەری ئەکۆلۆژیکی ئێمە لەگەڵ گشت ئۆرگانیزمەکان تەئکید دەکا و دەتوانێ دید و بینینی ئێمە سەبارەت بە سروشت بگۆڕێ. بە جۆرێکی ساکارتر، ئەو جۆرە کە لەم دواییانەدا نووسەرێک گوتوویە: «دەسەلاتی زانستی گریمانەی گایا ئەمەیە کە زانستی پێگەی ژینی لەگەڵ ئەخلاق پێکەوە تێکەلاو دەکا. بەم چەشنە بە رواڵەت جۆرێک دەسەلاتداری بەدی دێنێ... کە پێوەندی ئاسایتر بە زانست لەودا سست و ناتوانایە».[55]

خوێندنەوەیەک کە لە ئەندێشەی زاتی ناوبراو، هەندێک لە بایەخەکان دەروونی خودی سروشت دەبینێ. ئەگەر مرۆڤەکان هەر تەنیا بەشێک لە سروشتن، کەواتە لەگەڵ جۆرەکانی دیکە بەرامبەرن. ئەم باوەڕە بە پرەنسیپێکی بازنەیی لە ئەکۆلۆژیکی قوول، واتە «یەکسانی جەویی ژیان کردنی گۆیی» دەگوردرێ.[56] سەلماندنی زیادی ئەم خالە بۆ برێک لە نووسەران ئەمەیە کە. جگە لە مرۆڤەکان،

سروشت پلەبەندی لە دەستداوە یان توێژبەندیگەلی دەسەلاتدارانەیە. ئەکۆسفێری پایەدار هەلگر و لە راستیدا پەروەردە دەری بەرامبەری بیولۆژیکی جۆراوجۆری جۆرەکانە. هەندێک لە نووسەرانی ئەکۆلۆژیست ئەم هاوئاهەنگەیە پایەدارە. بەرامبەری و ئاسانکردنەوە جۆراوجۆری جۆرەکان زۆرجار بە شێوەی ئەخلاقی سروشتی بۆی روانیون. بە بارێکیتردا، سیفاتی هاوئاهەنگی و ئاسان کردن لە حوکمی بایەخەکانی سروشت بۆ جۆرەکانی مرۆڤ ناسراون کە دەبێ پەروەردە بکرێن. هێندێ کەسان کۆمەلگەی سەرەتاییان بە پەروەردە دەری ئەم ئەخلاقە سروشتییە داوەتە قەلەم. ئەو جۆرە کە برایان توکار دەلێ: «شارسانییەتی نوی سیفاتی ژیان بەشێکی فەرهەنگە سەرەتایەکانی وەلاناوە و شێوازە ژیانێکی بەدی هێناوە کە بێپسانەوە سامانی مەرگە.[٥٧]

مەسەلەگەلێکی پێچراوەی زۆر لە ئەندیشەی زاتی و پێوەندی ئەو لەگەل ئەندیشەی گایا بوونی هەیە. زۆر لە ئەکۆلۆژیستەکان زمانیان بە سکالا کردووەتەوە کە واتاکانی سروشت، پێگەی ژین و سروشتی مرۆڤ لەرادە بەدەر بەرچاو تەنگایە. مایکێل ردکلیف دەلێ: «کاتێک ئێمە ئاماژە بە پێگەی ژین دەکەین ئاماژەمان بە شتێک کردووە کە لەگەل مێژوو و بە هۆی خەبات و چەوسانەوە بەدی هاتووە».[٥٨] زۆرتر پێگەی ژینی ئێمە و سروشتی ئێمە «لەوانە سروشتی مرۆڤ» پێوەندی کەم لەگەل هەژاری، نەخۆشی، کار لە خۆ بێگانە کردن و هەر تەنێ پێویست بە ژیان لە سیستەمی زالمانەدا هەیە. لەبەر ئەمە، برێک لە ئەکۆلۆژیستەکان گەوە نیشاندانی سروشت و گرێدانی هەموو مەسەلەکان بە بایەخە تایبەتییەکانەوە بە پرمەترسیان زانیوە. ئێمە بەشێکین لە سروشت، بەلام سروشت زایەلەی مێژووەکان و وێرانیگەلی نەزمە کۆمەلایەتی و ئابوورییەکانی ئێمەیە. لە بەر ئەمە، مەسەلەکانی پێگەی ژین زۆرتر لە هەرشت مەعلوولی مەسەلەگەل و کێشەگەلی سیاسی و ئابووری بە هۆی سەرمایەدارییەوە سەریان هەلداوە.

مەسەلەی دیکە گرێ ئەدرێ بە تەوسیفی لاولوک لە گایا بە شێوەی ئۆرگانیزمێکی خۆهاوکێشکەر. ئەگەر مرۆڤەکان ئەتمۆسفێر پیس بکەن و حالی خۆیان تێک بدەن، لە دوای ئەوە گایا لە ماوەی هەزاران سال خۆی سازگار دەکا

مەسەلە ئەمە نییە کە ئایا مرۆڤەکان بە شێوەی بارسایەکی زۆر گەورە زەوی پیس دەکەن، خۆیان بە شێوەی جۆرێک لە بەین ناچن، یان سەرچاوەی ژیان رێنوێنی ناکەن، سوپێرئۆرگانیزم سەرنج بەوانە نادا. لەم بابەتە رێنوێنیانە نە بە ئەکۆلۆژی بۆ کەلک وەرگرتن دژی پیسکەرەکان خزمەت دەکا نە بۆ ژیان کردنی جۆرەکانی مرۆڤ گرنگی هەیە. لە بەر ئەمە، هیچ گرنگییەکی ئەخلاق لێرەدا بوونی نییە؛ ئەندێشەی گایا هەر تەنیا دیتنی پرۆژەی سروشتە.

راستتر لە هەموو بینینی ئەم خاڵە دژوارە کە کام واتا لە سروشتی مرۆڤ لە ئەندێشەی زاتی و پێوەندی ئەو لەگەڵ ئەندێشەی گایا سەرچاوە دەگرێ. ئەگەر مرۆڤەکان هەر تەنیا بەشێک لە سروشتن، لە هەڵوێستەی «بێ سەرنج» تری گایا، ئێمەش وەکو هەموو گیانەوەران ئازادین کە لە جیهانی دەوروبەری خۆمان سوود بەرین. ئەگەر لە خووی ئێمەدایە کە دەست بکەین بە بەهرە بردن و چەوساندنەوە، لەبەرئەوە، ئەگەر خۆمان گەندەڵ و بێ نموود بکەین، جیهان تەنانەت چاوێکیش داناگرێ. بەم حاڵەوە، زۆر لە ئەکۆلۆژیستە سیاسییەکان ئەم بۆچوونە پەسند ناکەن. وەک هەمیشە وتارێکی ئەخلاقی دێتە ئاراوە و مەسەلەی ژیانی ئێمە وەک جۆرێک دێتە پێشێ، بەلام زۆرجار پەیام ئەوەیە کە ئێمە، وەک جۆرێک، دەتوانین بە هۆی خۆ زانیاری خۆمانەوە وەستان لە خۆ نیشان بدەین و چالاکییەکانی خۆمان هاوکێش بکەین. ئێمە وەکو جۆرێک لەبەر هەرەشەی کارکردی ئاسایی تەکامولی بیۆلۆژیکی داین.[59] ئێمە دەبێ لەم بارەوە زۆرتر لەگەڵ بۆچوونی ئەکۆلۆژیستی بکەوینە پرسیار لە خۆمان نەک ئەوە کە پێگەی ژینی خۆمان تالان و لە بەرین بەرین. ئەگەر و گریمانەیەک کە لە پشتی ئەم هەڵوێستەی دواییەوە شاراوەتەوە، ئەوەیە کە ئێمە بە شێوەی چۆنیەتی تەواو و کەماڵ بەشێک لە سوشت نین. ئێمە وەک جۆرێک تاقانە و جیاوازین، هەرچەند گایا بخوازی ئەمە رەتکاتەوە. مەگەر ئەوە کە گایا بە ئامانج و هەستیناسی مەعنەوی بئاخنین کە لەو شێوەدا لە چنگی بێ سەرنجی ئەو گیرۆدە دەبین. ئەگەر چاوپۆشی لەو بکەین، یان راستەوخۆ بایەخی ژیانی جۆری خۆمان سەلماندووە یان تەماشای شێوازێک دەکەین کە لە لایەن ئەوەوە بتوانین وەلامێکی ئەخلاقی بە

سروشت بدەینەوە. هەر دوو راوێستە لەسەر ئەم ئەگەرە راوەستاون کە جۆری مرۆڤ بە شێوەی چۆنیەتی لەگەڵ سروشت جیاوازی هەیە. یەکێک لە مانا دەروونییەکانی ئەم لێدوانە ئەوەیە کە بە شێوەی شاراوە راپۆرتگەلی جیاوازی هەم دەربارەی سروشت و هەم لەمەڕ خووی مرۆڤ لە ئەکۆلۆژیدا بوونیان هەیە. لێدوانگەلێک بە ئالۆزی و بێ ئەوەی گرێی کرابێتەوە، ماونەتەوە.

## لایەنی سیاسی ئەکۆلۆژیزم

یەکێک لە کێشەگەلی سەرەکی ئەکۆلۆژیزم بوونی جۆرەکانی روانگە سیاسییەکان لە بزاڤییە. دیسان مرۆڤ دەکەوێتە گومانەوە کە موتالا ئاستەنگ کاتەوە و بە تاوتوێکردنی مەیلی سەرەکی تایبەت، بۆ وێنە کومۆنی ئەکۆلۆژیستە کۆمەلایەتییەکان بگەیێنیتە ئەنجام. هەروەها مەسەلەیەک لەمەڕ لایەنگەلی تایبەتی و گشتی ئەکۆلۆژی لە ئارادایە، واتە سەلماندنی باوەڕەکان و کۆششە گشتییەکان کە رواڵەتەن لەگەڵ ئەوانە جیاوازی هەیە. ئەڵبەتە لەم بارەوە ئەکۆلۆژی تەنیا نییە. گرفت هەتا رادەیەک گرێبەست بە کارکردی شتێکە کە مارتین سلیگر ناوی تەنینەوەی نێوان لایەنە بنەمایەکان و کردەوەی ئیدئۆلۆژی بۆ داناوە.[٦٠] هەرچەند لە ئیدئۆلۆژیدا ئەم خاڵە توند و بە ئازارە.

یەکێک لە مەسەلەکان کە لەسەر دادپرسی لایەنی سیاسی ئەکۆلۆژیزم لە دەیەی ١٩٧٠ کاریگەرییەتی بووە پێوەندی نزیکی ئەو بەشی زۆری لەگەڵ سۆسیالیزم و تا رادەیەک لەگەڵ ئانارشیزمە. ئەم پێوەندییە لەگەڵ هەر دوو گەرایش ئاوی جۆگەلەی باوەڕە سیاسییەکانی لێل کردووە. مەسەلە، بەتایبەت لە پێوەندی لەگەڵ سۆسیالیزم، لەگەڵ ئەم راستییە تازە دەبێتەوە کە ئێمە لەگەڵ برێک مەکتەب جیاواز و زۆرجار لەگەڵ باوەڕگەلێکی دژ بە یەک رووبەڕوو دەبینەوە، لە یەکێک لە تۆژینەوەکانی سۆسیالیستی باوەڕدا دەڵێ رۆژئاوای بە پیشەسازی کراو و کۆمەڵگەی لەسەر بنەمای دەوڵەت، بەشێکن لە مەسەلەی پێگەی ژین. ئەو تەئکیدە دەکا کە مرۆڤایەتی بە خاڵێک گەیوە کە ناچارە شێوەیەک ژیانی یەکدەست و نوێ «بدۆزێتەوە»؛ ئەم تەوسیفە بە شێوەی «نوێسازی خودا»

ـریژه پێدەدا، بە جۆرێکیتر، جۆرێک سامان بەندی کە تەنیا لە ئافەرینشدا دووبارە ـەرامبەری مەعنەوی هەڵدەقولینەوە کە مارکس لەم ئاستە لە سروشت لەو غافڵ ـاوە. پاشان دەڵێ: «رێی چارەی مەسەلە باشترە لە گروپە بچووکەکاندا ـدۆزرێتەوە» تایەفەی بندیکتین باس لە قەشەکان دەکا.[61] هەموو ئەکۆسۆسیالیستەکان ئەو جۆرە کە چاوەڕوان دەکرا ئەم واتایەیان بە زار تاڵ و بە خەیاڵیان دایە قەڵەم. بەم جۆرە، مارتین رایل جیاوازییەکی توندی لە نێوان دەوڵەت دوژمنی کۆکراوە رەوێنی «سەوزەکان» و دەوڵەتخوازی ئەکۆسۆسیالیستەکان داناوە. ئەکۆلۆژی بۆ بە پیشەکردنی رەفتاری شایستە و پێویست لەگەڵ شەریکە چەند نەتەوەیەکان و تەمێ کردنی ئەوانەی پێگەی ژین پیس دەگەن و هی وەکو ئەوانە پێویستی بە «دەوڵەتێکی بەهێزی پێشڕەو لە بابەتی ئەکۆلۆژیکەوە هەیە... هەتا لەگەڵ ناوەندی دەسەلاتێک کە چارەنووسی ئابووری کۆمەڵگەی بە دەستەوە گرتووە، خەبات بکا.[62]

ئەو جۆرە کە بەر لەمە گوترا، نووسراوەکانی بوکچین زۆرتر لەسەر سوننەتەکانی ئانارشیزمی کومۆنیستی پێی داگرتووە. بوکچین لە کتێبی ئەکۆلۆژی ئازادی، وەکو پێش هەنگاوی فیکری خودی کرۆپوتکین، تەئکیدەکانی ئەکۆفاشیستی خۆی لە واتای سروشتی دلۆڤانی دەگرێتە پێش و دیدۆزێتەوە. سروشت بەرامبەرخواز بە ناسلسلەمەراتب دەزانرێ. بوکچین ئەم دۆزانە راستەوخۆ لەگەڵ بینینی ئانارشیستی کومۆنیستی پێکەوە گرێ دەدا کە خۆی پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵ سۆسیالیزمی کومۆن پلۆرالیستی کەسایەتیگەلێکی وەکو بارو دا هەیە.[63]

دەرەنجامی ئەم ئەندێشە ئەکۆسۆسیالیستی و ئەکۆئانارشیستییە هەر تەنیا ئاڵوزی و چەواشەبوونی نادیاری ئەو شتەیە کە ئەکۆلۆژیزمی بە شێوەی بینینێکی سیاسی پێناسەی دەکا. ئەم بیچمە لەگەڵ تۆمەتە رووبەڕووەکان تاریکتر و تەمگرتووتر دەبێ. ئەکۆلۆژیستە کۆمەلایەتییەکان هێرش دەکەنە سەر ئەکۆلۆژیستە قووڵەکان کە لە نەترسی سوفیانەدا نوقمبوون. ئەکۆلۆژیستە قووڵەکان هێرش دەکەنە سەر ئەکۆسۆسیالیستەکان کە خۆی ریشەی گەشە

کردنی پیشەسازییە و لە بەر ئەم، بەشێک لە بۆ وێنە. پێگەی ژین خوازانی ریفۆر-
خواز هێرش دەکاتە سەر ئەکۆلۆژیستە کۆمەلایەتییەکان کە داخ و حەسرەتی بێ
هومێدی ناکوێ ئاواکانی ئانارشی سەدەی نۆزدەهەم لە خەو و خەیالی خۆی
پەروەردە دەکا.

بەر لەوەی کە دەس بکەین بە پێناسە کردنی سیستماتیکتری روانگە
سیاسییەکانی دەروونی ئەکۆلۆژیکی، باشترە ئاماژە بکەین کە هێشتا بڕێ
نیگەرانی سیاسی بە روالەت هاوبەشی لە دەروونی بزووتنەوەی ئەکۆلۆژیکی
بوونی هەیە، ئەگەرچی وەلامدانەوە بەوانە بە قوولی لەگەل یەک جیاوازە.

روانگەیەکی بەهێزبوونی هەیە کە لەودا زۆربەی ئەکۆلۆژیستەکان رەنگە هە-
بە هەمان رادە لەمەڕ بایەخەکان و چالاکییە تاکەکان نیگەرانن کە دەربارەی
سیاسەت بە شێوەی گشتی نیگەرانیان هەیە. تاکە خاوەن ئاستە جۆراوجۆردک-
بەرپرسایەتی خەیالیان پێدەسپێردرێ، بەلام بایەخگەلی تاک هێشتا لە زۆ-
بابەتەوە گرنگ دەدرێتە قەلەم. تەئکید و سوور بوون لەسەر بایەخەکان و سەر-
خۆ بوونی تاک لە لایەنێکەوەیە کە ببێتە هۆی ئەکۆلۆژی سیاسی راپۆرت-
ماتریالیستییەکان کەمتر قبوول بکا، ئەگەرچی بیۆلۆژی و ماتریالیزمی تەکامو-
جێ پێی قورسو قایمیان لە ئەکۆلۆژیدا هەیە. دید و بینینی ئەکۆلۆژیکی هەروەه
مایلن کە حورمەت بە سەربەخۆیی خۆمالی لە جەماوەردا و پەیامی جیهانی لەگە-
یەک تێکەل بکەن. بێجگە لەمە، گشت رێبازە ئەکۆلۆژیکەکان دل نیگەر-
تەنینەوەی مەسەلەگەلێک لەمەڕ رادەی گەشە کردنی ئابووری لە کۆمەلگەی
پیشەسازین. ئەم کارە بەش بە حالی خۆی بە ئەندێشەی رەخنەیی لەمە-
وێنەگەلی بەکارهێنان، بەرهەمهێنانی پیشەسازی و وەرزێری، وزەی بە کەنت-
هاتوو و جەوهەری ئەکۆلۆژی واتای کار، و سەرەنجام وێنەگەلی جەماوەر ناس-
و گەشە کردنی جەماوەر دەگا. هەموو ئەکۆلۆژیستەکان لەم نیگەرانیان-
بیروبۆچوونی هاوبەشیان هەیە. هەموو ئەوانە سەرەنجیان داوەتە ناوەرۆکی
بنەرەتی کۆمەلگەی پایەدار، کۆمەلگەیەک لە وێرانی و خەسار لەودا نەبێ بەلکو

هاوئاهەنگ لەگەڵ ئەکۆسیستم ژیان بکا. وەڵامدانەوە بەم ناوەڕۆکە بەرفراوان و بەرینە.

لەم قۆناخەی مێژوو لە بزاڤی ئەکۆلۆژیکی، پێکهێنانی تیپۆلۆژییەکی بە بڕشت دژوارە، بەڵام وا دێتە بەرچاو کە لە حاڵی ئێستادا سێ روانگەی جیاوازی دەروونی ئیدئۆلۆژی بوونی هەیە. ئەگەر واژە داهێنراوەکانی ویلیام ئۆفولس قبووڵ بکەین، ئەم سێ روانگە دەکرێ کۆمەڵگەی پایەداری لانیزۆر، کۆمەڵگەی پایەداری پاشەکەوتە و کۆمۆنی ئەکۆئانارشیستی ناو بنرێ.[٦٤] روانگەی دوایی لە پلەی یەکەمدا پێوەندی لەگەڵ کتێبی بوکچین و ئانارشیزمی کۆمۆنیستی هەیە. ئێمە لەم بارەوە نادوێین چونکە دووپاتکردنەوەی ئەوە دەبێ بەوشتەی کە لە بەشی پێنجەمدا تاوتوێمان کرد؛ زۆر لە دۆزەکانی لە بازنە دەرچووی ئەکۆلۆژی کۆمەڵایەتی لە روانگەی دووەمەوە سەر هەڵدەدەن لە بەر ئەمە، لێدوان لەمەڕ جۆری یەکەم دەبێ.

کۆمەڵگەی پایەداری لانیزۆر بە بۆچوونی ئۆفولس «کۆمەڵگەیەکە کە ئامانجی لە هاوکێش لەگەڵ پێگەی خۆیدا بێ، بەڵام هێشتا دارڕژاوەیە لەسەر بایەخەکانی «مۆدێرن»ی ریشەیی وەکو زاڵ بوونی مرۆڤ بەسەر سروشتدا، باڵا بوونی ویستە ماددییەکان و باقی ویستی چێژخوازانە و...»[٦٥] کارکردی من خۆم لەم واژە لەگەڵ ئۆفولس جیاوازی هەیە و ئەندێشەگەلێکی وەکو زاڵبوون بەسەر سروشتدا و ویستە چێژخوازانەکان لە پرەنسیپە سەرەکی و زەرورییەکانی ئەم روانگەوە نازانم. ئەوەی من لەم دۆزە وەرمگرتوە، کۆمەڵێک باوەڕی گروپە ئەکۆلۆژیکی و پێگە ژینەکانە کە لەسەر ئەم باوەڕە پێدا دەگرن کە دەوڵەت میللی ئێستا و پێکهاتەی یاسایی ئەوە کە بە هۆی زانیاری ئەکۆلۆژیکییەوە کەم تا کورت بووەتە گاڵتەجاڕی گۆڕان، بیچمی تەواو و لە راستیدا زەرووری بۆ ئەمەگداری ئەرکێکە کە ویستەکانی ئیدئۆلۆژی ئەکۆلۆژیکی چاوەڕوانی لەو هەیە. یەکێک لە هێماکانی هیوادارترکردن لێرەدا وەرگرتنی ئەم خاڵەیە کە نیگەرانییەکانی ئەکۆلۆژیکی لەگەڵ مەسەلەگەلی سیاسی و یاسای بنەڕەتی پێوەندیان هەیە.[٦٦] لە راستیدا رێکوپێک کردنی ئەکۆلۆژیکی زۆرتر لەوەی کە زۆر کەس زانیویانە دەبێ پێوەندی

لەگەڵ گۆڕانی یاسای بنەڕەتی لە دەروونی دەوڵەتە هاوچەرخەکاندا بێ، گۆڕ
کە نەک هەر تەنیا تەواوکەری بەرفراوانی بەرپرسایەتی لەمەڕ ئاستەنگییەک
بەکاربردنی دەسەڵاتی بەڕێوەبەرییە، بەڵکو تاوتوێکردنی پێوەندییەکانی
حکومەتەکان و پیشەسازی هاوکێش و میزان دەکا.

ئەم ڕوانگە هەم گروپە گوشارەکان و هەم حزبە سیاسییەکان دەگرێتە
سەیر لێرەدایە کە هەروەها لایەنی جۆراوجۆری سیاسی و فەلسەفی ئیدئۆلۆژ
لە خۆ دەگرێ. دەتوانێ بە واتایەکی دیکە لە مرۆڤمەدارێ لاواز و نامرۆڤمە
بەهێزدا بوون ببێت. ناکرێ چاوەڕوانی ئەوەبێ کە ئەکۆلۆژیستە کۆمەڵایەتی
(ئەکۆئانارشیستەکان) سەر هەڵبدا، ئەگەرچی ئاشکرا بە هۆکارێکی گرنگ
دەروونی باوەڕە ریفۆرمخوازەکان و بۆ برێک لە ئەکۆسۆسیالیستەکان دە
قەڵەم. هەروەها ئەم ڕوانگە بوارێک بۆ ئەکۆکاپیتالیزم پێکدێنی. بە وتەیەکی
چێژ و کێشێکی بە تەواو مانا بەرفراوانی بووە. جوناتان پوریت لەگەڵ ئەوە کە
هەندێک لە نووسراوەکانیدا لایەنگری هەڵوێستەی بایەخی ئەکۆلۆژیکی قووڵ
هۆی هەلاتنی ئەکۆئانارشیستەکان لە «ژێر ڕاستی دێرین» ڕەخنەی
گرتووە. بە بۆچوونی ئەو، بەشی زۆری ڕوانگەی ئەم خەڵکە «نوخبە خوازی
و ئەکراهی ئەوان لەمەکە نەکا دەستی خۆیان لە سیاسەتی پیس و ترس
هاوچەرخ پیس بکەن، جێی داخە».[٦٧] ئەو بە پێچەوانەی ئەمە کە هێشتا لایەن
واتای ئەکۆلۆژیکی قووڵ لەمەڕ ئەم سیستەم سیاسییەی ئێستادا کار بکرێ. پێ
ئاشکرا پێکهێنانی سیاسەتی هەڵبژاردن دەگرێتە ئەستۆ. ئەوجۆرە کە دەڵێ:

من سەبارەت بە جەوهەری دەوڵەت بە شێوەی پارێزگاری بەرژەوە
گشتی خەڵک لە وڵاتێکدا نارەزامەندی فەلسەفیم نییە. سەوزی ئانارشیستیش
کە ڕێ کاری من سەبارەت بە ژیان بە شێوەی بزەهێنەرێکی حەسرەت بار
ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمە زێڕینەکان یان ئەندێشەیەک لەمەڕ جەماوە
مرۆڤ کە پێوەندەیەکی کەمیان پێکەوە هەیە و تەنیایی یارمەتییەک بە خە
ناگەێنێ کە لە جێگاگەلی ناواقع بینانەیەک کە ئێمە هێناومانەتە ئاراوە، ڕزگار
بێ. من ئەوەی کە ناوی بچووک خوازی وەک لە دەستدان عەقلم لێ ناوە، ڕدح

هەیە... دەخوازم دەوڵەت ئەرکەکانی ئێستەی خۆی بە باشترین شێوە دەربارەی خزمەتی سەرەکی وەک فێر کردن و پەروەردە، پاک و خاوێنی و دەرمان و بڵاوکردنەوەی دەرامەد ئەنجام بدا... هەمیشە دەخوازم کە پێویست بە کەرەسە و کاری بڵاوکردنەوە بۆ هێمنایەتی عادڵانەی هەموو ناوچەکان بسەلمێنم.[68]

لە بەر ئەمە، خەونی بە حەقیقەت گەیشتووی کوتوپڕی کۆمەڵگەی بێ دەوڵەتی بچووک، ژیان کردن لە جیهانی خەونەکان، ئاسوودە و تایبەتییە. نووسەرانی دیکە، بەتایبەت ئەکوسۆسیالیستگەلێکی وەکو مارتین رایل، زۆرتر لە پوریت باوەڕیان بە دەوڵەتی بەهێز و پێشڕەوی پێگەی ژین هەیە. هەموو دەوڵەتێک نەک هەر تەنیا پێویستی بە چارەسەرکردنی مەسەلەی گەورەی هەژاری هەیە «کە لە روانگەی سۆسیالیستەکانەوە لە کۆتاییدا گرێ دەدرێ بە مەسەلەی ئەکۆلۆژییەوە». بەڵکو دەبێ پێکهاتەیەکی زۆر بەهێزی بۆ شەریکە چەند میللیەتییەکانی ببێت.

گرووپی ئاخر، و بە شێوەی بەشێک لە روانگەی ناوبراو، گرووپی ئەکۆکاپیتالیستەکانە.[69] ئەم روانگەش دەوڵەت بە پێکهێنەری حکوومەتی یاسای لانیکەمخوازی دەزانێ کە جێگای پێویستی بۆ کارە سەرەکییەکان لەمەڕ بازاڕ و پەسند کردنی کڕیار بۆ پشتگری کردن لە پێگەی ژین ئامادە بکا. بەپێی پێناسەی ئەم روانگە، دەوڵەت دەوری گرنگ، بەڵام زۆر ئاستەنگی هەیە. ئەکۆکاپیتالیزم، ئەو جۆرە کە لە فەسڵی دووەم باسکرا، لە روانگەی لیبرالی کلاسیکترەوە لەمەڕ دەوڵەت بەهرە وەردەگرێ.

روانگەی سیاسی دووەم ـ لەمەڕ کۆمەڵگەی پایەداری بە پاشەکەوتە ـ زۆرتر تایبەتمەندی بە ئەکۆلۆژیستە قووڵەکانەوە هەیە. کۆمەڵگەیەکە کە خۆی لە پێناوی ئەوەی کە ئەریش فرۆم ـ لە کتێبێکی بچووکی رەواندا لەمەڕ بزاڤی ئەکۆلۆژیکی ـ کۆمەڵگەی «بوون» لە رووبەڕوو لەگەڵ کۆمەڵگەی «دارابوون» ناو دەنێ، کردوویە.[70] ئەوانەی کە ئەم روانگەی «بوون»ە دێننە ئاراوە کێشەیان هەیە کە لەسەر بنەمای جێبەجێکردنی تەواو و کەماڵی بایەخ، تازەزایی نوێ یان گۆڕینی وێنەیی لە گشت مرۆڤایەتیدایە.[71]

ئوفولس ئەمە بە کۆمەڵگەیەکی شیاوی قبوولی تارادەیەکی خوارەوەی و...
تەوسیف دەکا. رەنگە ئەمە لەگەڵ کۆمەڵگەیەکی ئابووری کاراتربی لەگە...
تەئکیدێکی کەمتر لەسەر بەکارهێنانی ماددی و هاندانی خۆبژیوی تایبەتی...
پاشەکەوتەی تایبەتی داوتەڵەبانە. ئەم روانگە لە بنەڕەتەوە تەئکیدێکی زۆرتری
لەسەر پلە بەرزی یان بەرپرسایەتی ئەخلاقی تایبەتی تام دەکاتەوە.[72] ئوفو...
لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ئەم ناسنامەیە گەڕانەوەیەکە بۆ جۆرێک کلاسیکی
سیاسەتە. بە نووسراوەی ئەو «بیچمی کۆمەڵگەی سوودخواز تا رادەیەک
دەچێتەوە سەر شێوەی دەوڵەت، شار، لە دروستکردنی تەکنۆلۆژیکی بالاتر
پێچراوەتردا شەباهەتی هەیە».[73] جیاوازی ئەو لەگەڵ «شار» (polis) کلاسیک
ئەوەیە کە ئوفولس قبوولی دەکا کە لێرەدا دەسەلاتدارییەکی کەلان بۆ بەرگری
کردن لە ئالۆزی و دژایەتی کردن لەگەڵ یەک پێویستە. بەم جۆرە «دەبێ سیاسەت
ناوخۆیەکان لە دەروونی جۆرێک ئیمپراتۆری ناوچەیی یان جیهانیدا بن».[74] ئاشکرا
نییە کە ئەکۆلۆژیستە قووڵەکان لەگەڵ واتای ئیمپراتۆرییەکی پێگەی ژینگەدا هاودەنگ
بن. لە راستیدا ئەم خاڵە ئاشکرا ئوفولس لە ئەکۆلۆژی قووڵ جیا دەکاتەوە. وادیارە
برێک لە ئەکۆلۆژیستە قووڵەکان دڵیان بە دۆزی پێکهێنانی سەرلەنوێی فەرهەنگ
عەشیرەیەکان زیاتر خۆش کردبێ. لەم رووەوە، بڕایان تۆکار لە واتەی
مەنتقەگەرایی سوود وەرد دەگرێ و باوەڕی هەیە کە باشترە «ملەل تێک بڕووخێ
بە کۆمەڵگەی خۆتەواو، خۆ لەسەر پێ، خاوەنی پێوەندی هەرەوەزی و میزان کراو
لە باری ئەکۆلۆژیکییەوە بەش بکرێن.[75] تەسەوری گشتی سوودخوازی و دەست
پێوەگرتن و قەناعەت، خودگەردانی و ساکار ژیان کردنی داوتەڵەبانە هەڵگری
واتایەکی زۆری دەروونییە. لە زانستی ئابووریدا بانگهێشت لە لایەن نامەبارانی
کرەوە بەرێوە دەچێ کە باوەڕی بە سیستەمی بوودایی هەیە کە لەسەر بنەمای
دابینکردنی نیازی مرۆڤ و پارێزگاری لە پێگەی ژینە.[76] لەم کۆمەڵگە گریمانە و...
لە سەرچاوەیەکی قابلی گۆڕان و تازەکردنەوەی وەک هەتاو و با دابین دەبێ و
دەکرێ سەرچاوەی نەگۆڕی وبپارێزرێ و بخرێتە سەر ئەو دەستکەوتنە
تەکنۆلۆژییەکان رەنگە مناسب و بێ زیان بن. بە بۆچوونی تاقمێک، ئەم کۆمەڵگە

سوودخواز و دەس پێوەگرە خاوەنی لایەنێکی مەعنەوی بەهێز، چ بە شێوەی بودا
-وەری چ یەکگرتووی وجوودی دەبێ کە تەواوکەری سەرنج بە ئەکۆسفێرە.
یرەشدا پرەنسیپی نەبوونی توندوتیژی زۆرجار بە شێوەی پەیوەستێک بۆ بینینی
بوودا باوەڕی دێتە بەرچاو.[٧٧] هەروەها تاوتوێکردنی سەرلەنوێی چالاکی تایبەتی
ڕۆژانەی ئێمە لە خۆ دەگرێ. و. شوارتس و د.شوارتس لەسەر ئەو باوەڕەن کە
ساکار ژیان کردن هەر تەنیا ئاگاداری کیسە کاغەزییەکان و کود دروستکردن
ئەوان مەسەلە نییە، بەڵکو تەواوکەری زانیاری لەم کارەیە کە چ بەرهەمێک بەکار
بێنین. چ خواردەمەنییەک دەخوێن ، ئەوانە چۆن دروست دەکرێن و ئەم شێوە کەڵک
وەرگرتنەی ئێمە یارمەتی بە چ کەسانێک دەکا و چ کەسانێک دەچەوسێنێتەوە».[٧٨]
ئەمە واتای گۆڕانێک لە کارە کە بەرەو ئەوە دەڕوا کە جیمز رابێرتسۆن «کۆمەڵگەی
خۆراگر» ی ناولێناوە، هەنگاو هەڵدەگرێ.[٧٩]

لەم ڕوانگەوە نووسەرانێکی وەکو ئەدوارد گلداسمیت و کرک پاتریک سیل
لەمەڕ ڕادە و بارودوخی جفرای شەرت و شروتێکی زۆریان هێناوتە ئاراوە. بە
کەڵک وەرگرتن لە واژەگەلێکی ئاسایی دەگوترێ: هەر کۆمەڵگەیەک پێویستی هەیە
کە «توانایی ئەکۆلۆژیکی» خۆی لەبەر چاوبگرێ و ڕێز بۆ ئەوە دابنێ، خەڵک
پێویستیان هەیە کە «لە شوێنێک سوکنا بێ» و ئەم شوێنە دەبێ «بەراوردی
مرۆڤی» ببێت. گلد سمیت کوتەنی: «پیاو یان ژن ڕەنگە هەر تەنیا لە کۆمەڵگەیەکی
بچووکدا دەتوانێ تاکێک بێ. لە جەماوەرێکی زۆری ئەمرۆدا ئەوانە هەر تەنیا
بوونەوەرێکی تەنیا و تەریک مانەوتەوە». گلد سمیت لەسەر ئەو باوەڕەیە کە
دراوسێکان نابێ لە ٥٠٠ کەس زیاتر بن لە دەروونی جەماوەرێکی ٥٠ هەزار
کەسی و ناوچەیەکی ٥٠٠ هەزار کەسیدا ماونەتەوە.[٨٠]

لەمەڕ بارودۆخێکی جغرای، گرنگترین واتایەک کە هاتووەتە ئاراوە واتای
ناوچەی ژیانییە. مەڵبەندەکانی ژیانی تاکە نەتەوەیەکان، قەومی، ئیداری یان
سیاسی نین بەڵکو زۆرتر واحیدگەلێکی ئەکۆلۆژیکی و بیۆلۆژکی پایەدارن. توکار
ناوچەی بیولۆژیکی بەم جۆرە پێناسە دەکا: «ناحیەیەک لەسەر زەمینێک کە نەک
لەگەڵ ڕەمزە سیاسییەکان... بەڵکو لەگەڵ بارودۆخی سروشتی، بیۆلۆژیکی

زەمینناسی کە ناسنامەی راستەقینەی شوێن دەستنیشان دەکا، دیاریکراوبی
رشتە کێوەکان، رووبارەکان، روینی گیایی، وێنەگەلی ئاو و هەوار، خاک، گیاک
و کۆمەڵی گیایی (گیا) تایبەتمەندی ناوچەیەکی ژیانی دەسنیشان دەکەن و دەبێ
جێگری رەمزە سیاسییە دەوڵەتییەکان.[81] لە دەروونی ئەم مەڵبەندە بیۆلۆژیکیە
ئەکۆسیستمی پایەداریبوونی هەیە کە مرۆڤەکان دەتوانن بێ خەسار گەیاندن ب
پێگەی ژین هەتا کاتێک کە «تێدەکۆشن شێوەگەلی خۆبژێوی ژیانێکیان ببینن ک
هاتوچوون و گەڕی سروشتی کە لەوەو بەر لەوێدا بوونی بووە، بپارێزن
لەوێدا وچان بگرن و ژیان بکەن.[82] نەک هەر تەنیا ئەندێشەی ناوچەیی بیۆلۆژیکی
بە دروستکردنی پێوەندی نێوان ژیانی کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسی ئێ
لەگەڵ سروشتی خۆراگری دەوروبەر بە سوودە بەڵکو لە نێوان مرۆڤ ب
سروشتیش پێوەندی دروست دەکا. هەندێک نووسەرانی وەک توکار دابەشکاری
دەرەکی زۆرتر لە نێوان دەستە ناوخۆیەکان و رشتە کێوەکاندا دروست دەکە
کرک پاتریک سیل دەستە دابەشکاریەکی پێچراوەتر دێنێتە ئاراوە کە کۆکەردوەی
ناوچە ئەکۆلۆژیکەکان، ناوچە زەمین ناسییەکان و ناوچە بیچم ناسییەکانە.[83] وەه
جەماوەرێک بە بۆچوونی لایەنگرانی ئەوان، هاندەری جۆربەجۆری و سە
بەخۆیی کەلتوورین.

مانایەکی زۆری دەروونی لە دۆزی ناوبراوەوە سەرچاوە دەگرن. باوەڕێکی
بەهێز بوونی هەیە کە ئەم جەماوەرە بچووکە بەراوردی خووی سەرەکی
هاوبەشی گشتی و جەماوەری خەڵکە کە لە رووبەڕوو لەگەڵ دێموکراسی
پەرلەمانی وەستاوە.[84] دۆزی شوێنی کۆبوونەوەی هاوبەشی جەماوەری
نایەککگرتوو لە دەروونی ناوچە بیۆلۆژیکییەکان بۆ بڕیار دەربڕینە سیاسییەک
لایەنی کاکڵی ئەم دۆزە دەدرێتە قەڵەم. هەروەها ئەم مانا دەروونییە بەهێزە
ئارادایە کە ئەم جەماورە لە راستیدا کۆمەڵگەی بێکەم و کورتی یەکسان خو
«پەساپیاوسالاری» بە دواوە دەبێ.[85]

جگە لەم روانگە دێموکراتیکە، هەندێک جار لایەنگەلێکی شاراوەترو تاریک
بوونی هەیە. یەکێک لە باوەڕەکان «کارناسی ژین ناوچەیی» خۆبژێوی ئابووری

خۆتەواوی ناوچەییە. ئەم کارە پێویست بە هەر چەشنە توجارەت، جگە لە بڕە جارێکی زۆر زەرووری، لە ناو دەبا. تەجارەت هاندەری ڕازی بوونی ویستە نازەرووریيەکان يان زینەتی لە ڕووبەڕوو لەگەڵ ویستە ڕاستەقینەکانە و هۆکاری بەستنەوەی هەر ناوچەیەکی ژیان لە خۆ بەدەر دەبێ و کات و سەرچاوەی سووتەمەنی بە فیڕۆ دەدا. دەربارەی مەسەلەی سەرچاوەی کەم وێنە هەندێک کەسانی وەک بارو و ئوفولس لەسەر ئەو باوەڕەن کە ئێمە لە ڕادەبەدەر بۆ هەموو شوێنێک سەفەر دەکەین. بە بۆچوونی بڕێک لە لایەنگرانی کۆمەڵگەی ناوچە ژیانی، ئەم کۆمەڵگە لە ناوچوونی سەرچاوە کەم وێنەکان بە هۆی ئەنجامی هاتوچۆی ڕابواردنەوە قبووڵی ناکا. فڕۆکەکان بە هۆی هێنان و بردنی ڕێبوار کە زۆرجار جگە لە چێژبردنی تایبەتی ئامانجێکیان نییە، بڕێکی زۆر سووتەمەنی کە هەرگیز جێی پڕنابێتە، بە فیڕۆی دەدەن. بەم شێوە، کۆمەڵگەی دەس پێوەگر دەبێ کۆمەڵگەیەک بێ کە هاتوچۆ بەرتەسک بکاتەوە و خەڵک ژیانی خۆیان لە شوێنێک بە سەربەرن و هۆگری جەماوەری ناوچەی ژینی خۆیان پەروەردە بکەن.

مانای دەروونی ڕای ناوبراوی سەرەوە ئەوەیە کە میزانی جەماوەری مرۆڤیش دەبێ لەژێر چاوەدێری کۆنترۆڵی توند دابێ و بێ هۆ نییە کە بە لایەنگرانی ئەم باوەڕە شێوەی «نومالتوسی» یەکانیان پێ دراوە. ئەم جۆرە کە گلد سمیت دەنووسێ: «ئاشکرایە کە دەبێ پڕۆژەی تەنزیمی بنەماڵە (بە شێوەی مامناوەندی بەرتەسک دوو منداڵ بۆ هەر ژن و مێردیک) لەسەرانسەری جیهان هەتا کۆتایی سەدەی بیستەم بە توندی بەڕێوەی بەرین».[٨٦] ئەو لەسەر ئەم باوەڕەیە کە دەربارەی میزانی جەماوەر دەبێ پڕوپاگەندە و چالاکیگەلێکی بەرفراوان لە باری خواردەمەنی و چۆنیەتی ژیانەوە بەڕێوە ببرێ. لە پەنای ئەم چالاکیانەدا، دەرمانی دژی زگ پڕ بوون و شێوەگەلی بەرگری کردن لە ئاوس بوون، نەزۆک کردن و لە بارببردنی دەبێ بەلاش بکرێ. سەرەنجام لە گشت بوارەکانی لە پێوەندی لەگەڵ جەماوەرناسی و کۆنترۆڵی جەماوەر دەبێ نەهادە لێکۆڵەرەکان دابمەزرێن.[٨٧] کەسانی دیکە دەربارەی ئاستەنگ کردنەوەی یاسایی ڕادەی منداڵ لە بنامەلە بە شێوەی «بەڵگەنامەی بوونی ساوا» و دامەزرانی مالیات

بۆ ئەمە کە بنەماڵەکان منداڵی کەمتریان ببێ، رایان دەر بڕیوە.[88] گرووپی «سەرەتای زەوی!» ئەو جۆرە کە لەوەبەر باسکرا، بۆ ئەم مەسەلانە رێی چارەی خۆیان هەیە. سەرەنجام دەربارەی کۆنترۆڵی کۆچەریش باوەڕگەلێک لە ئارادا هەیە کە دابسۆن لە موتالاتی دوایی خۆیدا لەمەڕ بەرینبوونەوەی ئەو نیگەرانی خۆی دەربڕیوە.[89]

روانگەکانی سەرەوە لەمەڕ کۆمەڵگەی سوودخواز و دەست پێوەگر رەنگدانەوەیەکی زۆری هەیە. هەستێک کە لە پلەی یەکەمدا سەرهەڵدەدا ئەوەیە کە ئەم روانگە دێموکراتیک و یەکسانیخوازە. لێرەدا دەکرێ پێوەندی بەهێز بە ئانارشیزمی کومۆنیستییەوە ببینری. بەم حاڵەوە، ئاشکرایە کە سەرجەم لایەنگرانی ئەو لەگەڵ دێموکراسی و ئازادی هاودەنگن. دۆزەکانی گلد سمیت رەنگە بکرێ بە شێوە شیاو بە شێوەی دۆزگەلێکی پەروەردە دەری کۆمەڵگەیەکی دەسەلاتدار و نەک دێموکراتیک باس بکرێ. خولی راگواستنەوەی کردنەوەی زۆر لە ئازادییەکانە. گلد سمیت دەڵێ: «دامەزرانی یاسا و ئۆپەراسوێنی هێزەکانی پۆلیس و دادەکان بۆ بە حاکم کردنی ئەم ئاستەنگییە پێویست دەبێ».[90] بێجگە لەمە، باوەڕی لایەنی نومالتوسی لەمەڕ کۆنترۆڵی جەماوەر بێگومان ئاشتی لەگەڵ سەربەخۆیی و یەکسانی دژوار دەکا. رەنگە گلد سمیت خۆراکی فیکری خۆی لە ئەکۆلۆژی ناسیۆنالیستی سوننەتی لەگەڵ ریشەگەلێک کە لە سەرەتای سەدە بوویەتی، بە دەستی هێناوە.

پەروەردەی رۆحی جۆرخوازی و پلۆرالیزم بێگومان ناوچەکانی ژینی لایەنگری کۆیلایەتی، منداڵ کوژی یان مرۆڤ خۆریان پێ قبووڵ ناکرێ. بە شێوەیەکی دیکە، بە پێچەوانەی بەڵێنی ئاشکرا بە جۆرخوازی قبووڵ کراو. داخوازیەکی شاراوە بۆ ویست و هاوبەڵێنی بوونی هەیە. لە بەر ئەمە، پێوەندی زەرووری ئاشکرا لەم روانگەی نێوان ژین خوازی ناوچەی کومۆنە کۆنەخوازەکان لەلایەک، دێموکراسی و یەکسانی لە لایەکی دیکە، بوونیان هەیە لەباری ئەکۆلۆژیکەوە تەواو مەعقوڵ و ئیمکانی ئەوەی هەیە کە کومۆنە دەسەلاتخوازەکان و هاوکات لەگەڵ ئەوە بەرامبەرخوازانە بوونیان ببێت.

گرفتی چارەسەرنەکراوی گەورەی کۆمەڵگەی سوودخواز و دەس پێوەگر کە لە هەموو شێوە ئەو دێتە بەرچاو، مەسەلەی بوونی دەسەلاتداری هەمەلایانە و بەرفراوان، وەکو دەولەت، بۆ چارەسەری گفتوگۆکان شاراوەیە. ئوفولس، ئەو جۆرە کە پێشتر باسکرا، بیر لە ئیمپراتورییەکی ژیانی دەکاتەوە. کەسانی دیکە لەمەڕ هەر چەشنە پێکهاتەیەکی بەرفراوان و تەنینەوە لە ناخەوە نیگەرانی دەردەبڕن. نووسەرێک دەنووسێ «ڕێنوێنی سیاسەتی «سەوز» ژیانی خۆماڵی لەگەڵ یەک و پێچەوانە ئامانجی دەولەتی میللی ئەو جۆرە کە ئێمە دەمانزانی وایە». درێژەی پێ دەدا: «دەولەتی میللی ڕەنگدانەوەی سیاسی ڕواڵەتێکی زێهنی دوو لایەنەیە، و هەموو بەربلاوییەکانی ئەو بۆ ئەکولۆژی پڕزیانن».[91] بە بۆچوونی گلد سمیت تاکخوازی خۆ زانیاریانە خۆی لە خۆیدا و دەولەتخوازی کۆکراوە دەس بە دەس جوولە دەکەن. هەر دوو دەبنە هۆی بێهێزبوونی جەماوەری بچووکی ئەکولۆژیکی. هەندێک لە ئەکۆسۆسیالیستەکانی وەکو بارو لە بەر ئەم خاڵە تەئکیدیان کردووە و یەکسانخوازانی رادیکالتری وەک توکار، ئەسپرتناک و کاپرا و رابرتستونیش لە نووسراوەکانی خۆیدا لەسەر ئەم خاڵە پایان داگرتووە.[92] سەرەڕای ئەمە، لە هەموو باوەڕەکانی لایەنی ئەکۆسۆسیالیست و هەروەها لە لایەن نووسەرانێکی وەک پوریتەوە ئاشکرایە کە بە پێچەوانەی زۆر کەس حەز دەکەن ڕوانگەی سوودخوازانەتر لەگەڵ دەولەتێکی هەستیار لە بابەتی ئەکولۆژیکییەوە پێکەوە گرێ بدەن.

ئەم مەسەلە چارەسەر نەکراوەی دەولەت لە ئەندێشەی ئەکولۆژیکیدا، مەسەلەگەلێکی دژواری لە بواری بایەخە سیاسی و ئەخلاقییەکانی لێ دەکەویتەوە. چۆن سیاسەتی جەماوەرێکی بەرپرسی یەکسانخواز، عەدالەتی کۆمەلایەتی و ئازادی لە شێوەیەکدا کە دەولەتێک لە ئارادا نەبێ، دەتوانێ دەستەبەر بکرێ؟[93] کارناسانی ئەکولۆژیستی دژی دەولەت، لە ڕواڵەتا تووشی هەمان سەرەداوی گرفتی ئانارشیستەکان و لەم دواییانەی ئانارکۆکاپیتالیستەکان هاتوون: واتە ئەمە کە چۆن بایەخە گرنگەکان بێ ئەوەی دەس بکرێ بە توندوتیژی یان هەڕەشەگەلێکی تایبەتی بۆ جێی باوەڕ و دەستەبەرکردنە؟

هەندێک لە تەئکیدەکان لە ڕواڵەتا بەرەو گۆڕانکارییەک لـە سروشـتی مـرۆڤ یـ ـ لەسەر ڕێنوێنییەکی بە قەناعەتگەیێن کاردانەوەی دەبێ. ئەگەرچی بێگومـان دەبـی بە شێوەی ڕەوا ڕێنوێنی بکرێ کە دەوڵەتی یاسایی زۆر لە کارکردەکانی و ئەرکە سوودمەندەکانی ئەکۆلۆژیکی پێویست باشتر بەڕێوەی بەرێ هـەتا لەسەرۆیشتن و چەناکە شلبوونی کۆبوونەوە بەربڵاوەکانی ناوچەکانی ژین.

## سەرهەودای ئابووری نوێ

یەکێک لە ناوەڕۆکـە سـەرەکییەکان کـە لـە بزاڤـی ئەکۆلۆژیکیـدا سـووربوو ـ لەسەر ئەم خاڵەیە کە مەسەلەی گەورەی ئابووری کە ئێمـە لەگەڵـی ڕووبـەڕوویـ نە سەرمایەدارییە و نە ئابووری دەستوورییە، بەڵکو بـە پیـشەسازی بوونـە. ئـەو جۆرە کە پوریت دەڵێ:

مەبەستی من لـە وشـەی «پیشەسازیخـوازی» لایـەنگری لـەم بارەوەیـە کـە پێویستەکانی مرۆڤ هەر تـەنیا لـە لایـەن پەرەپێدانی دایمـی پرۆژەی تەولیـد ـ مەسرەف ـ چاوپۆشی لە خەسـارێک کـە لـە گـۆی زەوی و لـە مافـەکانی بـەرەی داهاتوو دەکەوێ ـ دەکرێ بـەراورد بکـرێ... بایەخـە زۆرجـار باسـنەکراوەکانی پیشەسازیخوازی لەسەر بنـەمای ئـەم گریمانەیـەن کـە سـوودی مـاددی زۆرتـ گرنگتر لە خەڵک و هەر شتێکی دیکەیە.[٩٤]

لەبەر ئەمە، شەڕ دژی پیشەسازیخـوازی شـەڕێکە دژی «ئیدئۆلۆژییـەک» کـە مەسەلەی ئەو لە هەموو ئیدئۆلۆژییە گرنگەکانی دیکـە لـە ئارادایـە. بـە بۆچـوونی پوریت و کەسانی وەک ئەو، خەبات دژی ئـەم بـاڵا ئیدئۆلۆژییـە پیـشەسازیخوازە هەمان ڕادە لە هەرێمی بایەخەکاندا هەیە کە لە مەسەلە فەنییەکانی گرێبەستکراو بە ئابووری. بەم حاڵە، ئەم شێوە لێکدانەوە بە جۆری ڕاستەقینە سۆسیالیستەکان تاوتوێیـان کـردووە کـە، چ لەگـەڵ هەڵوێـستە کۆمـۆنی بـارو و چ هەڵوێـستەی دەوڵەتخوازی ڕایل، حاشا لەوە دەکەن کە سۆسـیالیزم بـە شـێوەی خودکـار بـە پیشەسازی بـوونی بـە ئەسـتۆیە. بێجگـە لەمـە، نووسـەرانی وەک وێـستۆن پێ

لەسەر ئەو باوەڕەن کە مەسەلەی راستەقینە سەرمایەدارییە نەک پیشەسازیخوازی، و ئەمە کە لێدوان لەمەڕ بایەخەکان زۆر و کەم نادروستە.[95]

زۆربەی نووسەرانی ئەکۆلۆژیکی هاو باوەڕیان هەیە کە پیشەسازیخوازی و سەرمایەداری هەر دوو عۆدەداری گەشەی دۆزی ئابوورین. گەشەی نۆش داروویی مەسەلەی کۆمەلایەتی و ئابوورییە. بەلام بە بۆچوونی ئەکۆلۆژیستەکان گەشەی بنەمایی مەسەلەگەلی تەقینەوەی پێگەی ژین، حەسارگەیاندن بە کۆمەلگە و لە خۆ بێگانە بوونی کۆمەلگە دەدرێتە قەلەم. لەسەرانسەری سەدەی نۆزدەهەمدا، لە ئابوورییە بە پیشەسازی کراوەکاندا، گەشە هەلی رەخساند و بۆ برێک کومەلگە بوو بە سەرچاوەی پڕ لە بەرژەوەندی قەرەبووەکان. لەگەل ئەمەدا، ئەو جۆرە کە ئەسپرتناک و کاپرا گوتویانە، چونکە گەشە بۆ ماوەیەکی کورت سوودی لەگەڵ بووە، ئەمە بەو مانایە نییە کە گەشە هەمیشە پێویست بێ.[96] زۆربەی رەنگدانەوەی سیستماتیک «گەشە» و غافل بوون لە مەسەلەگەلی ئەکۆلۆژیکی دەکرێ لە زۆرینەی ئەندیشە کلاسیکە سوننەتییەکانی ئابووریدا ببینرێ.[97]

ئەندیشەگەلی پیشەسازیخوازی و ئابووری کلاسیک بۆ زۆرینەی ئەکۆلۆژیستەکان «نەک هەموو ئەوان» هەلگری واتایەکی درۆ و بەرچاو تەنگانە لەمەڕ بوونەوەری مرۆڤ ـ مرۆڤی خاوەن فامی ئابووری ـ یە کە لەسەر بنەمای ئەو، پوول و پارە، لانیزۆری رازیبوونی بەرژەوەندی و بە دەس هێنانی سوود، تەرازوو و پێواری هەموو شتەکان دەدرایە قەلەم. لە ئەندیشەی ئابووری کلاسیکدا مایە و سوود هەتا ئەم دواییە مەسەلەی سوودمەندی ئاوی پاکردە، ئەتموسفێری پایەدار و ئاووهەوا و هەرێمی هەلگری پێشبینیان لە بەرچاو نەدەگرت. ئەم جۆرە کارانە بایەخی ئابووری نەدەدرانە قەلەم. ئەو چەشنە لە کتێبی نوێدا گوتراوە: «نایەتە بەرچاو کە بە فیکری ئابووری زانان گەیبێ کە ئەگەر چالاکیەکانی ئێمە لە بنەڕەتەوە هاو بەشی لە شێوازی کاری سروشتە، کەواتە سروشت هەتا ماوەیەکی درێژ ناتوانێ بەرژەوەندییەک کە چاوەڕوانیمان لەوە و ژیانی ئێمە بەوەوە گرێدراوە، بەراوردە بکات و بیهێنێتە دی».[98] نووسەر ئەمە چەپڕوانین بە جیهان» تەوسیف دەکا.

پێچەوانە، «زانستی ئابووری نوێ»، ئەو جۆرە کە لە نووسراوەی ئەکۆلۆژیکید زۆرجار ئاماژە بەوە دەکرێ، «لەسەر بنەمای تێگەینی جیاوازی لە خودی راستەقینەیە و لە بینینی ئەو گۆڕینێکی وەکو شۆڕشی کۆپەرنیکی لە ئەستێرەناسید رووی داوە».[٩٩]

یەکێک لە بەڵگە پرەنسیپییەکان لە زانستی ئابووری نوێ ئەمەیە کە لەسەر بنەمای ئەندێشەی ئابوورییە کلاسیکەکان رەنگە گەشە هەتا بێ کۆتایی بەردەوام بێ. بەلام لە جیهانێکدا کە بەرژەوەندی ئەو، وەکو سوتەمەنییە بێجێگان، ئاستەنگ و بە کۆتایی دەگەن، گەشە چۆن مومکینە نائاستەنگ و بێ کۆتایی بێ؟ سووتەمەنییە فسیلییەکان ئاستەنگن و لەوانەیە بەم زووانە تەواو بن. ئەو جۆرە کە پیژار دەڵێ: «بە روالەت هەموو هاوبڕوان کە نەوت و گازی سروشتی بەم زووانە و کەمێک دوای سالی ٢٠١٠ روو لە کەمی دەکا».[١٠٠] ئەو دەڵێ زۆرینەی جیهانی پیشەسازی لەگەل تەواوبوونی سووتەمەنییە بێ جێگرە هەرزانەکان رووبەڕووبوونەتەوە. بەم حاڵەوە، بە بۆچوونی پیژار، نوێسازی زۆرینەی کۆمەڵگەکان، بەتایبەت ولاتەکانی جیهانی سێیەم، هێشتا لەگەل مەنتقی نادروست و درۆ گەشەی ئابووری پێوار دەکرێ. ئەم ولاتانە بە جیی ئەوە کە زگی خەڵکی زۆری خۆیان تێر بکەن، لە تەک هاندانی سندووقی پاردی نێونەتەوایەتی خەریکی پەرەپێدانی ناردنی کالای خۆیان بۆ دەرەوەن. پێویستەکانی ناوخۆ، پێگەی ژینی خاوێن، مەدەنییەتی تەندروست، هەموو لە هاوکێش کردنی ئابووریدا کەوتوونە زبلدانی فەرامۆشییەوە. ئەم جۆرەکارانە لە حوکمی پلە بالاکانی سەرکەوتنی ئابووری بەرچاو ناگیرێن.

بە کورتی ئەمە کە ئابوورییە گەشەخوازەکان ناتوانن بە کەڵک وەرگرتن لەو سەرچاوانەی کە دێتە کۆتایی درێژە بدن. داهێنەرە تەکنۆلۆژییەکان ناتوانن مەسەلەکان بە شێوەی ئاستەنگ چارەسەر بکەن، ئەگەرچی تکنۆلۆژییە هاوقەرارد بچووکەکان یەکێک لە رێی چارەکان دەدرێتە قەڵەم. بەرەو پێشچوونە فەنییەکان هە تەنیا دەتوانن مەسەلەگەل وەدواخەن.[١٠١] حکومەتەکان و دیوان سالارییەکانی ئەو زۆرجار لەم بوارەدا هاوراز و هاوهەنگاو لەگەل پیشەسازیدان، و لە لایەن فێل و فەنە زۆرەکانی رازداری و پێچ و پەناوە، بالابردن و هێنانەوە زانستی و چالاکییەکانی

پێوەندی گشتی تێدەکۆشن هەتا بە شێوەی کاریگەر بۆ کۆنترۆڵی هەواڵەکان لەمەڕ رووخانی پێگەی ژین دەس بەکاربن.[١٠٢] بە بۆچوونی زۆربەی ئەکۆلۆژیستەکان، گۆڕینی سەرەکی لەرای گشتی ئێمە لە جیهانی ئابووری پێویستە. هەر ئەم کارە ریشەی پێکهاتووی TOES (کۆبوونەوەکان لەمەڕ ئابووری دیکە) بووە کە خۆی لە پێناوی ئاشکرا کردن و برەودان بە رێگایەکی ئابووری داناوە. لە کۆی ئەماندا دەبێ سامانێکی ئابووری پایەدار بخرێتە جێی سامانی ئابووری گەشە خوازەوە.

روانگەکان دەربارەی ئەمە کە چ شتێک سامانی پایەدار پێکدێنێ، جیاوازیان هەیە. ئەمانە بە دوو شێوە لە کۆمەڵگەی پیشەسازیدا دەوریان بە ئەستۆوەیە. روانگەیەکی بالا سامانی ناکۆ، کومۆنی، وەرزێڕی و بێ بوونی دەوڵەتە. روانگەیەکی دیکە چاوی بڕیوەتە سامانی دەوڵەتی ئەکۆلۆژیکی دەوڵەمەند و لە باری ئەکۆلۆژیکەوە پێچراوە.

وەڵامی ئەکۆ سۆسیالیستی بەپێی وابەستە بوونی سۆسیالیستی جیاوازی هەیە. بارو بە ژیانی کومۆنی سەرفەجووی ناکۆ کە لەودا، ویستەکان و خوازیارەکان بە لانیکەمی کەمی بگا، باوەڕی هەیە. لە لایەکیترەوە، مارتین رایل بە پێچەوانە جوستوجۆ لە کاری گەشەدا بە شێوەی تەواو قەراردادی، باوەڕی هەیە کە زانستی ئابووری نوێ گرووپی TOES مومکین نییە بە رادەی پێویست لە بینینی خۆی سەبارەت بە شەریکە گەورەکان بچێتەپێشێ. ئەو جۆرەکە رایل دەڵێ، ئەگەر ئێمە دۆزە گرێدراوەکان بە کردەوەی ئابووری دێرین بە دەست بێنین «دەبێ خۆمان ئامادەی رووبەڕووبوونە لەگەڵ نەهادگەلێک بکەین کە ئەوانە دەگرێتەوەبەر و بەهێزیان دەکا».[١٠٣] بۆچوونی رایل ئەمەیە کە دەوڵەتی لایەنگری پێگەی ژین دەبێ ئەم ئەرکە بەرێوەبەرێ. ئەم بۆچوونە نووسەرانێکی دیکەی وەک ویستۆن و پیر بە جۆرێکیتر رەواجیان پێداوە. پیر و ویستۆن ئەگەرچی زۆرتر لە رایل لە رەخنەی خۆیان سەبارەت بە رووداوی گەورەی «سەوزەکان» زمانی توندوتیژیان هەیە، ئەوانە تاوان باردەکەن کە «پەردەیان» کێشاوە بەسەر سەرمایەداری بازاڕدا.[١٠٤]

لە راستیدا رووداوی گەورەی نوێگەرەکان دەربارەی سەرمایەداری لەغاوی ولامەکانیان بە دەستەوە گرتووە. ئەکلینگتۆ و بورکە بەتایبەت دەڵێن ئەگەرچی سەرمایەداری بازاڕ مومکینە بەشێک لە مەسەلە بێ، بە یارمەتی سەرمایەدارانی

«سەوز» دەتوانێ بەشێک لە ڕێچارەش بێ.[105] نووسەران پێشبینی دەکەن کە دەیەی ١٩٩٠ دەیەی سەوز دەبێ کە مەسرەفکارەکان خوازیاری داهاتێک دەبن کە بە شێوەی دۆستانە لەگەڵ پێگەی ژین دورست کرابێتن. بەم جۆرە، پێگەی ژین دەبێ بە «پانتایەکی بەرفراوانی نوێ بۆ بەر بەرەکانێی کەسپ و کار».[106] ئەم نووسەرانە بەلگە دێننەوە کە بەجێی ئیحساسات خوازی تەکنۆلۆژیکی سەبارەت بە پیشەسازی، دەبێ چاوکراوانە نەک نێوانی ئابوورییەکی پایەدار و ئابووری گەشەی پیشەساز، بەلکو دەبێ نێوان گەشەی پایەدار و گەشەی ناپایەدار جیاوازی دابنێن. گەشەی پایەدار گەشەیەکە کە لە لایەن بازاڕ لەگەڵ کاردانەوەی مادەکان، تەکنۆلۆژیگەلێکی پاکردەتر. دانانی سەرمایەداری ژێرخانی و وەزی دانراو لە جێی ـ کە هەموو ئەمانە لەگەڵ داخوازییەکانی مەسرەفکارەکان «سەوز» دروست دەبن ـ خۆی سازگار دەکا. نووسەران ئەمە «سەردەمی نوێی سەرمایەداری» ناودێر دەکەن.[107]

وەلام بەم بۆچوونە لە لایەن ئەکۆ سۆسیالیستەکانەوە، ئەو جۆرە کە چاوەڕوان دەکرێ، ڕەخنەیە. بەلام ڕای ئەکۆکاپیتالیستەکانیش کە لەلایەن پوریت و وینرەود بەیانکراوە تێکەل بە ڕەگی چزودار و ژاراوەیە. ئەوانە رادەر دەبرن کە «گشت ئەوشتانەی کە لەو ڕووداوانە کەوتووەتەوە کە... شەریکەکان بەهۆی پیسیانەوە پەرەیەکی کەلان لە جانتا دەنێن و ئەوکات بە پاککردنەوەی برێک لە گەندەل کارییەکانی خۆیان دیسان پارەیەکی زۆرتریان بە نەسیب دەبێ».[108]

بەم شێوە، ئەکۆکاپیتالیزم بە ناوی جۆرێک کلاسیکی لە پێوارە دوو لایەنەکانی دەبینرێ کە هیچ وەلامێکی بۆ تەقینەوەی پێگەی ژین لە لایەن پیشەکانەوە پێ نییە ناچار دیسان دەبێ ئەم خالە وەبیر بێنینەوە کە پۆریت، کە لە لایەنگرە بێ مەیلەکانی ئەکۆلۆژی قوولە، هێشتا نایەوێ لە دەولەت هەلبوێرێ و ئەوە شاراوە بە هۆکاری گرنگ لە لێدوانە ئەکۆلۆژییەکانی دەزانێ.

لایەنی دیکەی ڕوانگەی پەساپیشەسازی و ئابووری ڕوانگە کومۆنی ناکۆیە ـ واتە کۆمەلگەی سەرفەخوازتر. جیمز ڕابێرتسۆن ئەمە بە ئابووری مێ SHE (عاقلانە Sane مرۆڤایەتی Humane ئەکۆلۆژیکی Ecoloyical) تەوسیف دەکا و ئەوە لە ڕووبەڕوو لەگەل ئابووری نێر He (زۆر بەرین خواز Hyper-Expansionist) هەلدەسەنگێنێ.[109] ئەم

ڕوانگە مێیە SHE پرەنسیپیگەلێکی زۆری هەیە. تێدەکۆشی هەتا زۆرتر واتاگەلی گەورەی ئابووری وەکو ویست، داوا، بەرهەمهێنان، بەکارهێنان مەسرەف و ئابوورییە بەراوردەکان لەگەڵ واژەکانی ئەکۆلۆژیکی سەرلەنوێ پێناسە بکا. بۆ وێنە لە حاڵێکدا کە لە ئەندێشەی ئابووری کلاسیکدا مرۆڤەکان بە شێوەی بەکارهێنەران تەولیدات بەرچاو دەگیرێن، زانستی ئابووری نوێی مرۆڤەکان و ئاسوودەیی تەواوی جسمانی، ئەخلاقی و مەعنەوی ئەوان لە پلەی یەکەمدا دادەنێ.[110] ئابووری زانانی نوێ بە سەرمەشق گرتن لە ئاسەواری شوماخر و ئەریش فروم، ئەخلاقی بە بەشێکی جودایی هەڵنگەری زانستی ئابووری دەزانن. ئامانجگەلی چۆنیەتی رازیبوون و مانادارکردنی ژیان، گرنگتر لە بایەخەکانی کەمییەت دەزانرێن. بە جێی گەشەی ئابووری، پەرەسەندن و بەرەوپێشچوونی مرۆڤایەتی و رازیکردنی پێویستیە رەگەزییەکان، کومەلایەتی، ئابووری و کەلتووری ئەو گرنگتر تاوتوێ دەکرێن. پێویستەکان «گرنگییەکی سەربەستانەی ناوەندێک لە زانستی ئابووری نوێیان هەیە».[111] واتای پێویست ئەو پەڕی مانەوەی جسمانی بووە، گوزەران و باشتر ژیانی کەلتووریش دەگرێتەبەر.

پێوەندی گرێبەستی ڕواڵەتی و ڕەسمی جێی خۆیان بە مەسەلەگەلی ئەخلاقی ڕووبەڕووی نێوان خەلک دەسپێرن. مەسەلەی هاو دلی و هاو دەردی بەرچاو جێی نێوانی فیکری و عەقلانی دەگرن. پیشەگەلێک کە پێویستیان بە پسپۆڕی بالا هەیە جێی خۆیان بە سەلاحییەتی هەمە لایەنە و کۆ و خودگەردانی هاوولاتیان دەدەن. تکنۆلۆژیگەلێک لەگەڵ بەراوردی مرۆڤایەتی بێ‌زیان و بەسوود جێی تەکنۆلۆژییە ڕووخێنەرەکان دەگرنەوە.

لەم ڕوانگەدا واتای کار لە بناخەوە دەگۆڕدرێ. واتاگەلێکی نوێ لە پیشەکاندا پەروەردە دەکرێن. نووسەرانێکی وەک جیمز رابرتستۆن و گی‌دونسی بڕوایان هەیە کە «کاری نارەسمی بۆ خۆی» پەرە دەگرێ و جێگری واتای پیشەیی ڕەسمی ببێت کە لە جیهانی سێیەمدا زۆرتر لە کۆمەلگەی پیشەسازی بەڕێوەدەچێ.[112] بە پێوارەی ئەم باوەڕە، ئێمە نابێ کار لەگەڵ پیشە تێکەلاو بکەین. لە واتای کاردا دەبێ رابگۆڕدرێ و لەگەڵ زۆربەی پیشەکان لە وانە مالداری و کەیبانووگەری،

سـەوزەکاری لـە مالـدا، پیـشەی هاوبـەش یـان خـودیێ ئـەنجام دان پێوەنـد بـەرێ

رابرتستۆن گوتەنی: «کار لە خۆیدا بە مانای چالاکییەکی ئامانجدار و گرنگە کە خەڵ

کار بۆ خۆیان دەکەن و خۆیان بۆ ڕێکوپێک کردن و کۆنترۆلی دەس بـە کـار دەبـ

ئەم کارە ڕەنگە لە ڕووبەڕووی هەقدەس یـان بێهـەق دەس بـەڕێوە بچـێ».[113]

ڕوانگە لێرەدا بـە مانـای گۆڕانکـاری تـەواو و ڕیـشەیی لـە شـێوازی بینـینی گـشـ

کۆمەڵگەدا بە واتای کارە. هەروەها ڕوانگەیەکە لەمەڕ خۆ پاڵپشتی یـان پاڵـدانەوە ـ

نەفسەوە، خۆپایەداری، ئابووری کار، کاری جێبەجێیی و خۆمالی و بچووک لە بەبەڕی

بەراوردی تکنۆلۆژییەوە.[114] بە بۆچوونی زۆرینەی نووسەرانی لەم بوارەوە، بەمە ـ

مانای پەرەسەندنی هەرەوەزەکانی کرێکارییە.

ڕێکارێکی دیکە کە سێبەری بەسەر زۆربەی گەلالـەکانی ڕوانگـەی سـەرفەخۆ ـ

کشاوە جێگیرکردنی بەرژەوەندی و هۆگری ئاسوودەیی لەگـەڵ ئـەو شـتەیە کـە ـ

شێوەی گشتی «پلانی دەسکەوتی پایە» یان هەر نەبێ ڕوالەتێک لە پلانی دەسکەوتی

لانیکەم دادەنرێ. ئەم دۆزە دەگەڕێتـەوە بـۆ دەیـەی ١٩٢٠ و میجـر س. ە. داگـلا

ئەگەرچی وادێتە بەرچاو کە ئەندێشەکانی هێنری جۆرجیش بۆ بـڕێک لـە نووسـە ـ

ئێلهامبەخش بووە.[115] لەسەردەمی پاش جـەنگی جیهـانی ئـەم دۆزە جێـی سـەرنجی

تۆژەرانی سیاسەتی کۆمەلایەتی لە دەرەوەی بزاڤی ئەکۆلۆژیکی بوو. لەسەر بنەڕی

دۆزەکـانی دەسـکەوتی پایـەی هەقدەسـتی میللـی دەبـێ جـێگیری بەرژەوەنـدی

ئاسوودەیی بێ ـ دابین و دەستەبەر کردنی مالی ئەو بەهۆی پاشەکەوتەکانی داریی

و مالیاتی بالا بەتایبەت «لە ڕوانگەی ئەکۆلۆژیستەکان» لـە کەسـانێک کـە پێگـە پێـ

دەکەن کەلک لەو سەرچاوانە وەردەگرن کە تازە نابنەوە، بەڕێوە ببرێ ـ و بە هەمـو

هاوولاتیەکی بالاتر لـە تەمـەنی تایبـەت، چاوپۆشـی لـە کارێـک کـە دەیکـەن، بدرێ

دەستکەوتی پایە ڕەنگە هەستێک لەسەربەخۆی بۆ زۆرینەی هاوولاتیان بـەدی بێنـێ

دەکرێ کاری «بە کۆمەڵ» لە هاوولاتیان چاوەڕوان بکرێ. بە گۆڕینێک کـە لـە واتـی

کار پێکدێ، ئەم خالە لەگەڵ پلانەکانی بانکداری خۆمالی (و گەرانی پوول جارجارێک

و گۆڕانی زۆر بەرچاوی مالیاتبەندی کە هۆکاری بلاوکردنەوەی تونـدی سـەرلەنوێ

سامان دەبێ، پێوەندی هەیە.[116]

لەم ئەندێشەدا، ساسامان هـەر تـەنیا لەگـەڵ بایەخـە پارەیـەکان یـان بەرژەوەنـدی سەرمایەیی بەراورد ناکرێ بەڵکو لەگەڵ تەندروستی و ئاسـوودەیی خەڵـک بـەراورد دەکرێ. ئەو جۆرە کە رابرتستۆن دەڵێ:

ئەم ئەندێشە کە پێشکەوت و بەربڵاوی خەڵک تەندروستتر، و پێکهێنانی پێگەیـەکی کۆمەڵایەتی فیزیکی کە دەسەڵات بە خەڵک بدا سلامەت بن، دەبـێ بـەراوردی دانـانی سەرمایەی بەرهەمێنانی لە کۆمەڵگە و لە حوکمی بەرینکردنەوەی گرنگترین سەرچاوە (وخەڵک) مامەڵەی لەگەڵ بکرێ لەگەڵ زانستی ئابووری قەراردادی گـرێ دەدرێ. بـە عەکسەوە، «زانستی ئابووری نوێ» خولقێنەری سامان سەرلەنوێ پێناسە دەکا، ئـەو جۆرە کە خولقێنەری سلامەت لە خۆ بگرێ.[117]

بـەم شـێوە، تەندروسـتی و پێویـست جێـی سـامانی پـارەیی و گەشـە دەگـرن. بێچگەلەمە، پلە بەرزییەکانی ئـابووری نـوێش هاتوونـە ئـاراوە. پلـە بالاکـانی دێـرین «ناتـەواو و نامۆناسـب» زانـراون.[118] ئـەکینس و زۆری وەک ئـەو لـە گرووپـی TOES باوەڕیان هەیە کە پلە بالاکانی سەردەم دەبـێ بـەرانبـەری کۆمەڵایـەتی، رازیکـردنی سەرجەم پێویستەکانی مرۆڤـایەتی؛ گـەینی هاوولاتیـان بـە ئارەزووەکـانی خۆیـان، بڵاوکردنەوەی عادڵانـەتری دەسـکەوت و کـار؛ بـاوەڕ بـە خـۆ و گـەورەی دەروون زۆرتر؛ و کارایی زۆرتر لە سوود بردن لە سەرچاوەکانی لە خۆ گرتبێ. گشت ئەمانـە ئەواوکـەری ئـەوەن کـە «بـەرهـەمهێنـانی میللـی بەرامبـەر کـراوە» (ANP) جێـی (بەرهەمێنانی ناخالیسی میللی) (GNP) بگرێ. ANP بـە پێچەوانـەی GNP خەرجگـەلی تـەواو و کەمالـی پێگـەیی و کۆمەڵایـەتیش دەگرێتـە بـەرچاو. ANP تەندروسـتی و پلەبالاکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری نارەسمی لەگەڵ وێنە نوێکان دەربـارەی کـار لـە خۆ دەگرێ.[119] سیستماتیکترین بەیانی ئەم روانگە سەرفەخوازە ئەندێشەی «ئابووری پایە»یە کە بەر لە هەموو لە کتێبی هێرمەن دیلیدا هاتووەتە ئـاراوە.[120] جێـی پێـی ئـەم دۆزە دەکرێ لە نووسراوە ئابوورییەکانی جان ستوارت میل لە سەدەی نۆزدەهەمـدا بدۆزرێتەوە. بە بۆچوونی دیلی خاڵی سەرەکی ئەوەیە کە ئابوورییە پیشەسازییەکان دەبێ لە دەهەکانی داهاتوودا بگۆڕدرێن. بەرای ئەو، کە رەگێک لە دۆزی نومالتوسـی هەیە، بە کەرەسەی جیاوازەوە دەکرێ بەم ئامانجە بگەی. سامان دەبـێ بـە شـێوەی

بەرامبەرتر بلاو بکرێتەوە. جگە لە برێک کەلوپەلی دروست کراوی زەخیرەکراو دەبێ بەلانی‌زۆری توانای قبوول سابت بکرێن. کەمالی پێویست ئەوەیە کە هەموو مادەخاوەکان بۆ هێورکردنەوەی رەوەندی رووبە کەم بوونەوەی سەرچاوەگەلی کۆتایی هەلگر دەبێ سەرلەنوێ بە دەس بێنەوە. بە وتەی دیلی، بەپێی بەلگەیەک کە هەنووکە قبوول کراوە: «لە جیهانێکی بەرتەسک و کۆتایی هەلگر هیچ شتێکی فیزیکی ناتوانێ بۆ هەمیشە گەشە بکات».[١٢١] گەشە هێشتا دەتوانێ لە وەها ئابوورییەکدا جێی بێتەوە، بەلام دەبێ هاورێ لەگەل شوناس و تکنولۆژی کەم زیانتر بێ. سەرەرای ئەمە، نابێ ئامانجی چالاکی ئابووری پێک بێنێ. ئابووریگەلێک کە هەر تەنیا توانایی وەرگرتن بەلانی‌زۆر دەگەیێنن و هەول و کۆشش بۆ پاراستنی وزە نادەن، ئەو سەرچاوانەی کە کۆتاییان پێدێ وزەی گۆی زەوی کەم دەکەنەوە و دەبنە هۆی پیسکردنی. ئەم کارە بەش بە حالی خۆی تەواوکەری خەرجی وزەی زۆرتر بۆ ژیان بوون بەسەر لە رادەبەدەرو ئیسرافە. ئەم ئابوورییە ئیسرافکارانە «بەرهەمی ناخالیسی میللی» لەگەل توانایی وەرگرتنی رووبە گەشە بەراورد دەکرێ کە بە مانای مەنتق خۆ کوژی بۆ «ئابوورییە پایە»کانە.

دیلی بە ئاووری لەسەر بنەمای توانایی وەرگرتنی هێور، جەماوەری یەکدەست پاراستنی وزە، کەلک وەرگرتن لەو سەرچاوانەی نوێ دەبنەوە، وەکو هەتاو، عایقی کاری (جیر، قایش)، سوود و کەلک وەرگرتنی بەرفراوان لە وەسیلەی هێنان و بردنی گشتی و دووچەرخە باوەڕی هەیە. بە بۆچوون دیلی ئەم کارە هەر تەنیا لەباری پایەی ئابووری و زانستییەوە پێویست نییە بەلکو دەلیلی ئەخلاقی بە هێزی بۆ ئەم گۆرانکارییە. ئەو کێشەی لەسەر ئەوەیە کە ئێمە پێویستمان بە بەرفراوانکردنەوەی دۆزی سەرپەرشتی و خۆ بە کەم زانینێکی زۆرتر سەبارەت گۆی زەوی و سەرچاوەکانی ئەو هەیە.[١٢٢]

گومانگەلێکی راستی دەربارەی پلانەکانی سەرەوە بوونی هەیە. جگە لە نیگەرانیگەلێک کە زۆر کەس دەربارەی کۆنترۆلی جەماوەری نومالتوسییەوە گوتوویانە (کە لە بەشی پێشوودا لێدوانمان لەسەر کرد) دەوری پایەبەرزانی گشتی و دەولەتیش بەتایبەت زۆر ئاشکرا نییە.

سەرهەودای راشکاوی دژی بێ عەدالەتی کۆمەلایەتی و نایەکسانیگەلی توند رۆین لە سامان و نەبوونی هۆگری توند بە پرۆپاگەندەی بازرگانی بوونی هەیە. هەروەها دەربارەی گۆڕانکاری مالیاتی، «پلانەکانی دەسکەوتی پایە»، نەبوونی وەرگرتنی زەروورەتی تەجارەت و بالابردنی پشتگری خوازی و خوکەفایی لە ئابووری، باوەرگەلێک هاتووەتە ئاراوە. سەرەڕای ئەمە، هەموو ئەمانە لەگەل هاندانی خودمختاری ناوچەیی و حاشا و رەتی پێوەندی لەگەل دەولەت پێکەوە گرێ دراون. دیتنی ئەمە کە چۆن ئەم سەر و سامان بخشینە دەتوانێ بێ بوونی روالەتێک لە دەسەلاتداری بەر استی بگا، دژوارە.

بە هەرکام لەو پێشنیارە باسکراوانە، کۆمەلێک رەخنەیان لەسەرەو بۆ وێنە «پلانی دەستکەوتی پایە» بە رەخنەی دەقیقەوە تاوتوێ کراوە. ئایا ئەم پلانە پێوارێ شیاوی بۆ ژیان پێکدێنێ؟ بێگومان نابێ لەگەل مەسەلەی بەربلاویگەلی هەمەلایانە لە دەستکەوت هەلسوکەوت بکرێ، لە راستیدا مەترسی لکەدارکردنی چینێکی پاینی نوێ لە ئارادایە. بێجگە لەمە، ئەگەر خەلک کار نەکەن چی روو دەدا؟ دەربارەی کردەوەی ئەوان چۆن دەکرێ لێدوان بکرێ؟ مەگەر ئەوە کە «بارودۆخی پایەدار» ی کۆمەلگەی سەرفەخواز بە خێرایی بە حەقیقەت بگا و لەو شێوەدا «دەستکەوتی پایە» رەنگە لەگەل بالا چوونی نرخ رێبلەوێ، و ئەمە تەواوکەری گەشەی ئابووری زۆرترە و لەگەل رێنوێنی گشتی سەرفەخوازی جیاوازی هەیە.

## دەرەنجام

دەرەنجامی خێرا ئەوەیە کە بزاڤی ئـەکۆلۆژیکی و ئیـدئۆلۆژی ئـەو هێشتا ــ ڕەوەنـدی خولـقاندندان. لـەم بـارەوە، ئـەم بەشـە ناسـنامەی پێچەوانەیـەک ـــ دیارەدەیەک لە حالی جوولەیە. سەرەڕای ئەمە، ئەکۆلۆژی سەرنجی ئێمـە بـەرەو بەرپرسایەتییەکانی جیهانی خـۆی رادەکێشێ و دەستنیـشانی دەکـا کـە پێکـەوە بەسراوەیەکی ڕووبەڕوومان لەگەڵ ئەکۆسفێر هەیە. لەگەڵ ئەمەدا، جێی خۆیـەتی ئەگەر برێک لە لێک هەڵوەشانەوەکانی دەروونیی زیان هێنـەری ئـەم ئیدئۆلۆژیـە دەستنیشان بکەین و وەبیر بێنینەوە. لەمەڕ مێژووی بۆشایی و لـەت بوونێـک کـە فەلسەفە لە کاری سیاسی ئەکۆلۆژیزم جیا دەکاتەوە زانیارییەکی بچـووک بـووـی هەیە. لە ناحیەیەکەوە فەیلسووفان لە ڕێگەلی دەرەکی و کەونی فەلسەفەی پێگەی ژین سەرگەردانن و سوودخوازی یان ئەکۆمـەداری بـەرەوا دەزانـن و پێشنیازی دەکەن. ئێستا ئەوە کە لە ناحیەیەکی دیکەوە، بە کردەوەکان زۆرتر بە هەمەلایـە ساکارە دەرەنجامەکانەوە سەر قالن کە بـە ڕوالـەت خۆشـیان لەمـەڕ ئەوانـە زۆر دڵـنیا نـین. ســەرەڕای ئەمــە، لێدوانگــەلێکی مــەربووت بــە مرۆڤــمەداری و نامرۆڤمەداری کە ئێستا لە ناوەندی لێدوانی فەلسەفیدا هەیـە. وادێتـە بـەرچاو کـە هیچ معلووم نییە کە لە خەتتی کردار و ڕەفتارەکان و سیاسەتگەلی پێگەی ژین ـــ کردەوەدا بۆ پاکانە ببێت و ئەمە سەرسووڕهێنەرە.

لێک هەڵوەشان و لەبەریەک ترازانێکی سـەیری دیکـە لـە بزووتنـەوە، جـۆری مامەڵـەی ئـەو سـەبارەت بـە زانـستییە سروشـتییەکان و سـەرهەودای زانـستی ئەکۆلۆژییە. ئەو جۆرە کە لە سەرەتای ئـەم بەشـەدا بـەیانکرا، دەسـەڵاتی بزاڤـی ئەکۆلۆژیکی سیاسی هەتا ڕادەیەکی زۆر لە هەڵوێـستەی زانـستی لێکدانـەوەکـانی ئەو سەرچاوە دەگرێ. بەم حاڵەوە، ئـەم دەسـەڵاتە لەگـەڵ ڕەخنـەی بـەردەوامی ئەخلاقی و فەلسەفی دەربارەی خوو و خسلەتی مکانیکی زانستە سروشتییەکانی و یەکدەستی و ڕاوەستاوی ئەو لەگەڵ بە پیشەسازی بوون تێکەڵاوە. هەرچەنـد کـە نووسەرانێکی وەک کاپرا لەسـەر جیـاوازی نێـوان «مکـانیکی بـوون» ی کـەونی «سیستمەکانی» نوێی واتای زانستە سروشتییەکان پێیان داگرتـووە، بـەڵام نایەت

بەرچاو کە خودی کۆڕ و کۆبوونەوە زانستییەکان جیاوازییەکی راستەقینەیان ..انابێ و هەڵوێستێکی نەتەویستانەیان سەبارەت بە ئەکۆلۆژیستە سیاسییەکان هەیە.[123] ئەم تەنینەوەش هەمیشە سەرسووڕهێنەر دەمێنێتەوە.

سەرەڕای ئەمە، ئیدئۆلۆژی ئەکۆلۆژیکی، لە زەمەنی سەرهەڵدانی خۆیەوە بەتایبەت لە دوو دەیەی رابردوودا، لە تەنینەوەی نێوان دوو حەرەکەی فیکری ..ەنجی بینیوە. دەیەی ١٩٧٠ هەم شاهیدی سەرهەڵدانی کوتوپڕی هۆگری پێگەی ژین بوو و هەم لە زۆر شوێنەوە سەرەتای تووشی زیان لە سۆسیالیزم. بزاڤی ئەکۆلۆژیکی /سەوز/ بوو بە سەرپەنا و دالدەیەکی ئارمانجی بۆ سۆسیالیستەکان و ئانارشیستە زیان دیتوەکان. بەم حاڵەوە، هەر لەم قۆناخەدا بوو کە کۆششگەلێک بۆ عام پەسند کردن و سیستمی کردنی دۆزەکانی بزاڤ دەستی پێ کرد. دەرەنجام، واژەگەلی سۆسیالیستی و ئانارشیستی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم، لەگەڵ هەموو زاین و تۆشەی خۆی لە مانای جۆراوجۆر و زۆرجار دژ بە یەک، بە شێوەی تەواو بەکار دەبرێ.

بەم حاڵەوە، هەر لەو سەردەمەدا سۆسیالیستەکان و ئانارشیستەکان و تێکەڵاوانی ئەوان تێگەیشتن کە جۆرێکی دیکە لە واژەگەل بوونەتە هاوراوێژ و دۆستی نزیکی ئەوان، واژەگەلێک کە بە بایەخە قووڵەکەونەکانەوە هەڵدەواسران، رێز و حورمەتی مەعنەوی لە سروشت، جیهانبینی متافیزیکی، قەناعەت، دەسپێوەگرتن و ساکار ژیان کردن، شعووری قەومە دێرینەکان و سەرەتایی، ژیان لە هاوئاهەنگی لەگەڵ زەوی و بەسەرهاتی قەومی ئەو. نووسەرانی سۆسیالیست بێکەموکورتی بە شێوەی مەنتقی بە توندی لە بەرامبەر ئەم جۆرە وتارانەدا وەستان و ئەوەیان بە پیشەی سۆفیگەری و وەک رازداری، نژاد پەرستی، مەزهەبی بوونی ترسناک و دڵسافانە، کڕنۆش کردن لە بەرامبەر سەرمایەداری، و خەیاڵ خوازی وردە سەرمایەداری خۆشگوزەران تۆمەت بارکردن کە هیچ زانیارییەکیان لە راستییە سیاسییەکان و ئابووری نییە.

نیگەرانی و رەخنەی سۆسیالیستی دەرک دەکرێ چونکە ریشەی ئەکۆلۆژیکی لە راستیدا لە ئەکۆلۆژیکی قووڵ و بزاڤی سەرفەخوازی و قەناعەت و مەعنەوییەتدا

شاراوەتەوە. باوباپیری ئەم ئەندیشانە دەکرێ لە تێکچوونی باوەڕ
فەلسەفییەکان لەمەڕ سروشت و بوونی کۆمەلایەتی بە نیوەی دووەمی سەدەی
نۆزدەهەمدا ببینییەوە. ئەم باوەڕانە بە جۆرێک بەیان دەکران کە هەنووکەش
بزووتنەوەی ئەکۆلۆژیکیدا قابیلی قبوولن. ئەو جۆرە کە ئێستا دەزانین. زۆر لە
ئەندێشانە لە لایەن بزاڤە سیاسییەکانی وەک ناسیۆنالیزمی قەومی و ناسیونا
سۆسیالیزم لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا کەلکیان لێوەرگیراوە. سەرنجی ئێمە
بەم بزاڤانە لەگەڵ گومانی زۆر و دوودلی هاورێیە. سەرەڕای ئەمە. باشترە بێژین
کە ئەم واژانە و جۆری بەیان لە خاوەنداریێتی تایبەتی ئەم بزاڤانەدا نییە. هیچ
بەلگەیەک نییە کە بۆ نابێ ئەوە بە جۆرێکی هەستیار و ئاشکرا سەرلەنوێ
تۆژینەوەی لەسەر بکەین. بەم حالەوە، باوباپیرانی ئەم واژانە زۆرجار کەوتنەتە
بەر رەخنەی کەسانێک کە کەلک لەوانە وەردەگرن. دوو بەلگە بۆ ئەم کارە بوونی
هەیە. یەکەم ئەوانە حەز دەکەن کە بە شێوەیەکی قابیلی دەرک مابەینی خۆیان
لەگەڵ هەر چەشنە ئەکۆفاشیزمێک رابگرن. دووەم تا رادەیەک باوەڕێکی سەک
بوونی هەیە کە ئێمە بە سەردەمی نوێ، پلە بالا، یان حەیاتی سەرلەنوێ دەگەین
یان نزیک بە گەیشتنین کە هەموو ئیدئۆلۆژییەکان بە لە ناوبراو دێنە بەرچاو. ئەم
هەزارەخوازییەی دوایی یان باوەڕ بە سەردەمی بەختەوەری، رواڵەتەن سەر
لێشێوێن و نادروستە.

وشەی nation [نەتەوە] لە واژەگەلی لاتینیدا nasci (لەدایکبوون) و natio (وزەی شعووری رووبەڕوو لە باری زاین و زێد) شەقکراوە. هاوریشەی بێپسانەوەی ئەو لە زمانی ئینگلیسیدا وشەگەلێکی وەکو natal (زێدی) و naturc (سروشت)ن کە بەشێوەی دەروونی لە وتاری ناسیۆنالیستیدا بەکاری دەبەن. بەپێی ئەمە، مانای هاوبەشی سەرەتایی natio بە خەلک لە باری زاین و زێدی ئەوان پێوەندی دەبێ. مانای دەروونی ئەمەیە کە زێد بناخەی بیچمی «سروشتی» کۆبوونەوەی مرۆڤ دیاری و پێکدێنێ. لە پلەی یەکەمدا رەنگە کەسێک بە پەلە بکەوێتە تۆژینەوەی گرفتە دەستەبەندییەکانی نەتەوەکان (nations) بە شێوەی دەسکەوتگەلێکی خۆڕادان بە مرۆڤەوە (چونکە لە بابەتی ریشەناسییەوە [زانستی دابڕین] پێوەندی بە سروشتی (nature) یان سروشتی (natural) دەبێ. رەخنەیەک کە پێوەندی بەخۆهەلکێشان خۆڕادان بوونی نەتەوەکانەوە هەیە، دەبێ نەک هەر تەنیا لە بابەتی ماناناسی و یاریکردن بە وشەکان، بەلکو لە بوار و بەرەگەلێکی زۆردا خەبات بکا. وشەی nation بە شێوەی ناو لە باری رێزمانەوە لە زمانی ئینگلیسی و فەرانسەیدا لانی کەم لە سەدەی چواردەهەمدا سەریهەلدا.[1] بەم حالەوە، هەر ئەو چەشنە کە زۆربەی تۆژەران گوتویانە، ئەم واژە لە سەرەتای ماناکانی سیاسی بێپسانەوە نەبوو. وشەگەلی ناسیۆن و ناسیۆنالیزم کە راستەوخۆ رێنوێنی سیاسییان هەیە، بەرەبەرە لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا رێیان بردە ناو واژەگەلی زمانە ئوروپاییەکانەوە.[2]

لە سەدەی رابراوودا کۆششێکی زۆر بۆ پێناسەکردنی ناسیۆنالیزم بەڕێوەبرا.[3] بەم حالەوە، ئەم رێیە شوێنێکی زۆر هەموار و سوودمەند نایەتە بەرچاو. ئەو جۆرەکە زۆر لە تۆژەران گوتویانە، دۆزینەوەی مانایەکی بەرفراوان و هەمەلایەنە کە بە شەفافی هەموو کێشە جۆراوجۆرەکانی ناسیۆنالیزم لەخۆ

بگرێ، کارێکی دژوار و ئاستەمە.[٤] رێ و شوێنی من هەر ئەو نموودە گشتییەیە کە لە گشت بەشەکانی ئەم کتێبەدا پێڕەویم لەوە کردووە واتە یەکەم ڕێبازە جۆراوجۆرەکانی ناسیۆنالیزم تاوتوێ دەکەم و پاشان دەکەومە تاوتوێکردنی ئەو ناوەڕۆکە بەرفراوانانەی کە ڕێبازەکان هەموو ڕوویان لەوە.

لە زۆربەی نووسراوەی بیرمەندانەدا لەمەڕ ناسیۆنالیزم سەرنجیان بە وشەگەلی هاوڕیشە لەگەڵ ئەم واژە داوە؛ واتە وشەگەلێک کە لە باری ریشەناسی ریشەی هاوبەشی لەگەڵ ناسیۆنالیزم هەیە. وشەگەلێکی وەک نەتەوە، خووی میللی، خودموختاری میللی و بەرژەوەندی میللی بە بەرفراوانی سەری هەڵداوە و جارجار راستەوخۆ هاوبەشیان لە یەکدا بووە. وەها هاوبەشییەک تەواوکەری ئەوەیە کە لە هەمان سەرەتاوە جیایان کەینەوە، ئەگەرچی ڕێگایەکی هەمەلایەنەی پەسندکراو لە واژەگەلی بەکاربراو و دروستکراو بوونی نییە. سەرەڕای ئەمە دێتە بەرچاو کە تا رادەیەک دەکرێ هەوڵی بۆ بدرێ ئەم جیاوازییە میانەڕەوانە و مامناوەندیانە بپارێزێ، بەم هۆیەکە ئەم وشانەی کارکردگەلێکی جۆراوجۆریان هەیە. بێجگەلە لێدوانی سەدەی بیستەم، ئەم واژانە گەشەیان کردووە و زۆریان لە نێو ڕێکخراوەکاندا ریشەیان داکوتاوە. ئێمە واژەگەلێکی وەک «ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان» شەریکەگەلی گەورە نەتەوە و فرەنەتەوە، هێزە بەرگرییەکانی گەورە نەتەوە و فرەنەتەوە و پیشە خۆماڵیکراوەکانمان هەیە هەرکام لە نزیکایەتی و خزمایەتی ئەم واژانە بەیان دەکەین.

واژەی نەتەوە هەمیشە ڕێنوێنی لەسەر کۆمەڵێک لە خەڵکی خاوەن باو و باپیر، مێژوو، فەرهەنگ و زمانی هاوبەشدا هەیە کە بە ئەمەگی و دڵۆڤانییەکی دەهەژێنێ ئەم واژە دەکرێ بۆ پێناسەی قەومییەتیش بەکارببرێ؛ بەم حالەوە لە حالێکدا کە نەتەوە دەتوانێ قەومییەتیش لەخۆ بگرێ، پێویستانە هەمیشە وانییە. بۆ وێنە لە شوێنێک کە نەتەوە بەشێوەی رەسمی لەگەڵ دەوڵەتێک هاوکێشی هەیە، رەنگە کۆمەڵە قەومییە جۆراوجۆرەکان لە دەروونی ئەودا بوونیان ببێت کە ئەمەگداری

خۆیان لە ئاست ئەو دەوڵەتە میللی و رەسمییە دەرببڕن، هاوکات لەگەڵ ئـەوە کـە ئەمەگناسی قەومی خۆشیان جیاوازانـە ببێـت. خودموختـاری میللـی پێوەندییـەکی نزیکی لەگەڵ ئەندێشەی دەسەڵاتداریێتی و دەوڵەت هەیـە، کـە سـەربەخۆیی (دوای جودایی یان پێکەوە بوون) لە کۆنترۆڵی هەموو دەوڵـەتەکاندا دەبـێ و دەرەنجـام، لێهاتوویی خەڵک بۆ دامەزراندنی یاساکان و بەکاربردنی دەسەڵاتیدادی دەروونی کیانێـک دیـاری دەکـرێ. نـەتـەوە لـە واژەی یاسـایدا، رێنیـشاندەری حـەقووقی هاووڵاتی دەوڵەتی تایبەتە، ئەگەرچی هێشتا بە شێوەی هۆکارێکی کاریگەر لەسەر نەتەوە، وەکو پێگە، زێد یان بنەماڵە دێتە ئەژمار.[٥] کارکردێکی بەرفراوان لە نەتـەوە نیـشانەی هەیـە لەسـەر گروپێکـی کۆمەڵایـەتی کـە حـەز دەکـەن بـە شـێوەی جەماوەرێکی موختار جێی رێـز و حورمـەت بـن، بـەڵام خوازیـاری سـەربەخۆیی میللی نین.[٦] خووی میللی واژەیەکە دێرین کە بەر لەسەردەمی رۆشنبیری (و دواتر رۆمانتیک) دڵنگەرانی کۆمەڵناسی دەربـارەی هـەڵاواردن و هـاوێرکردنی ئاکـاری تایبەت «جۆرەکانی میللی» هاندا. ئەم واژە ئەگەرچی پلەپلە لە لێدوانی راستەقینەدا وەلانرا و پالێورا، هێشتا لە وتاری خەڵکی هاوچەرخدا تا رادەیـەک گرنگـی هەیـە.[٧] سـەرچاوە میللییـەکان واژەیەکـە کـە زۆرتـر لـە سیاسـەتی دەرەوە و پێوەنـدی دیپلۆماتیکدا کارکردی هەیە و بەکردەوە یان پێوار «ئیرادەی ئەمیر» یـان بچـووک دەوڵەت» لە پێوەندی لەگـەڵ چالاکییـەکانی دەرەوەی دەوڵـەتەکانە. بـە جـۆرێکی دیکـە، پێوەندییـەکی نزیکـی لەگـەڵ مێـژوو و تـەکامولی دەوڵـەت و بوارگـەلی بەرژەوەندی ئەو هەیە.[٨]

ناسیۆنالیزم زۆرجار وەکو ئیدئۆلۆژی (یان بیچمێک لە ئاکار) چاوی لێکـراوە کـە لەخۆزانیاری میللی، ناسنامەی قەومی یان زمانێک لە بازنەگەلی سـەرەکی چـالاکی و دەربڕینی سیاسی کەڵک وەردەگرێ. لەم بەشەدا سـەرنجی بنـەڕەتی مـن لـە پلـەی یەکەمدا لەسەر ئـەم واتـا دوایـەی ناسیۆنالیستە. بـەم حاڵـەوە ئـەم کـارە بـە هـیچ

کولۆنجێک راپـۆرتی ئێمـە بەرتەسـک ناکاتـەوە، چونکـە زۆر لـە واژە خـزە و
هاوڕیشەکانی سەرەتایی کە لەسەرەوە باسمکرد، پێوەندی بە لێدانی منەوە دەبێ.
خالێکی بچـووکی شـیاوی بـاس، بـەڵام گرنـگ لەمـەڕ ئـەم واژە هاوڕیـشانەی
سەرەتایی ئەوە کە زۆرجار ئاکادمیکە جیاوازەکان دەهەژێنێ. برێک لە بیرمەنـد ـ
سەبارەت بـە گەشـە کـردنی نەتـەوەکان و کۆمەڵـە قەومییـەکان هـۆگری خۆیـ ـ
نیشان داوە، بەڵام هۆگرییەکی ئەوتۆیان سەبارەت بە «ئیدئۆلۆژی» ناسیۆنالیزم ـ
کۆتایی سەدەی هەژدەهەم و سەدەی نۆزدەهەم نییە. هەروەها رەنگە موتالایـەک
لەمەڕ بەرژەوەندی میللی یـان یاسـا میللییـەکان بـەڕێوە برابـێ کـە پێوەندییـەکی
زۆری بە نەتەوەکان یان ناسیۆنالیزمەوە نییـە یـان پێوەندییـەکی کـەمیان هەیـە
لێکۆڵەران برێک لە ئەنقەست، بەڵام بە بەڵگەوە هۆی مەنتقی رەنگە بە سەرهەڵدانی
ناسیۆنالیزم لە باری مێژوویـی، ئـابووری یـان کۆمەڵناسـی هۆگریـان ببـێ، بـەڵام
سەبارەت بە ئیدئۆلۆژی سیاسی ئەو هۆگرییەکی ئەوتۆیان نەبێ. ئێمە لەم بەشـە
برێک لەم دۆزانە تاوتوێ دەکەین.
هەروەها برێک هاوڕیشەیی دووەم بوونی هەیە کە لە باری ریـشەناسیەوە لـە
واژەگەلی نەتەوە یان نەتەوەخوازی و ناسیۆنالیزم سەرچاوەیان نەگرتووە، بـەڵام
زۆریـان بـە پلـەی جیـاوازەوە نزیکیـان لەتـەک ناسـیۆنالیزمدا هەیـە. واتـ
سەرەکییەکانی بە روانینی ئێمـە لێـرەدا واژەگـەلی وەتەنپەرسـتی، قەومییـەت و
نژادپەرستین. پێوەندی لە نێوان ئەم واژانەدا لەتـەک ناسـیۆنالیزم جێـی لێـدوان و
مشتومڕە و ئەو گرێیە هێـشتا نەکراوەتـەوە. بـۆ وێنـە لـە هێنـدێ نووسـراوەـ
ولاتپەرستی بەرامبەرە بە ئەمـەگناسـی، شـانازی و عەشـق بـە ولاتێـک دەزانـ
کـارکردی ئـەم وشـەی ولات پەرستییە هەمیشە مێژووەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ
سـەردەمی کۆمـاری رۆم.[9] لەڕاسـتیدا لـەم بـارەوە دەکـرێ وەتەنپەرسـتی
بەشێوەیەکی شیاو و قابیلی قبوولتری ئەمەگناسی بدرێتە قەڵەم، هەتا ناسیۆنالیزم

گشت راڤەکاران گەشبینییەکی کەمتریان هەیە و هەر دوو واژەی وەتەنپەرستی و ناسیۆنالیزم بە هاوکێشی یەک دەزانن.[10]

وشەی «قەومی» دیاردەیەکە کە زۆرتر لە ولاتپەرستی تیشک خراوەتەسەر ئەو. قەومییەت هەمیشە بۆ هۆکاری زاتی وەک خزمایەتی ئاماژەی هەیە کە لەباری بیۆلۆژیکی یان ژنیتیکی شیاوی فامن. کۆمەلانی قەومی هەندێ جار کۆمەلگەلێک یان کۆمایەکی بچووکتر، هەمەلایەنەتر و بەبڕەوتر، تایبەتیتر لە باری ئەندامییەت و دێرینتر لە نەتەوەکان ناسراون و هاوێرکراون. پێوەندییەکان لەگەل ناسیۆنالیزم زۆر پێچراوەن. هێندێ ناسیۆنالیزمی قەومی بە جەوهەری ناسیۆنالیزم دەزانن یان بەعەکسەوە وتارێکی گرنگ لە دەروونی ناسیۆنالیزم تەسەور دەکەن. ئانتۆنی سمیت لە نووسراوە جۆراوجۆرەکانی خۆیدا ئاماژەی تایبەتی بە پێگەگەلی قەومی نەتەوەکان کردووە.[11]

پاش سەرهەلدانی کاریگەر و بەهێزی ناسیۆنال سۆسیالیزم، بەتایبەت لەم سەدەدا «نژاد» پێوەندییەکی لەرادەبەدەر بەئازار و ژانی لەگەل ناسیۆنالیزم پێکهێناوە. واتای نژاد لەباری مێژوویەکەوە لە واژەگەلی ئوروپایدا لە سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم، زۆرجار بە شێوەی وتەیەکی بیۆلۆژیکی یان ژنیتیک دەرک کراوە.[12] مومکینە سەبارەت بە ناسیۆنالیزم بە پەلەپەل و هەلەهەلی جارنەجارەی سروشتی خۆی، بە چاویلکەی نژادەوە بڕوانێ، بێگومان ناسیۆنال سۆسیالیستەکان لەو کەسانە بوون کە بە یاساکان و باوەڕە ئالۆزاوەکانی خۆیان ئەم روانینەیان بەهێزکردووە. سەرەڕای ئەمانە، زۆر لە بیرمەندانی دۆزی ناسیۆنالیستی باوەڕیان وایە کە ناسیۆنال سۆسیالیزم حەرەکەیەکی لادەر دێنەئەژمار و نابێ لە ئەندێشەی ناسیۆنالیستیدا وەک هەموارێک مامەلەی لە تەکا بکرێ. بەم حالەوە، بەپێی رووداوەکانی ئەم سەدە وتاری ناسیۆنالیستی بە ئاسانی دەخزێنە دەروونی نژادپەرستی،[13] ئەمە واتایەکی کەم نییە کە نەیگرینە بەرچاو.

ناسیۆنالیزم خوێندکاری داهاتوو لەگەڵ کۆمەڵێک گرفت رووبەڕوو دەکاتەوە یەکەم ئەمەکە پارادۆکسگەلێکی زۆر لە بەشی هەرە مەزنی لێدوانە ناسیۆنالیستەکاندا بوونی هەیە لە باری مێژووەوە، ناسیۆنالیزم لە حوکمی ئیدئۆلۆژی و بزاڤی سیاسی، دیاردەیەکی تەقریبەن نوێ لە ئوروپایە کە تەنێ لەگەڵ پەیدابوونی دیموکراسی، بە پیشەسازیبوون و ئەندێشەی دەسەڵاتداری خەڵک سەریهەڵداوە. لەگەڵ ئەمە، یەکێک لە کێشە بنەڕەتییەکانی ئەو دێرینە بوونییەتی. راست ئەوەیە کە ناسیۆنالیستەکان زۆربەی ریشەکانی ناسیۆنالیزم بە سروشت دەبینن. ئەو جۆرە کە لەوەبەر گوترا ئەم کارە لە هاوڕیشەیی nationalism و nature سەرچاوە دەگرێ. بەم حاڵەوە تەنانەت بەپێی کورتترین موتاڵای بابەت، بڕێکی زۆر لە ئیدئۆلۆژی ناسیۆنالیزم، دەسکردی مرۆڤی ئەمرۆیە. سەرەڕای ئەمە، هەر ئەو چەشنە کە لە سەرەتای بەشی شەشەمدا لە لێدوانەکانی «فاشیزم»دا گوترا، ناسیۆنالیزم لە کێشەی جیهانی بوونی رەسەنی دۆزەکانی خۆیدا هەڵوێستەی تایبەتی هەیە، بەڵام ئیدئۆلۆژی هەر تەنیا بەپێی تایبەتمەندی و ناوچەیی بوونی خۆی مانا بە خۆوە دەگرێ. گرفتی بەکردەوەی ئەم خاڵەی دوایی لە مەسەلە تەجرەبەکراوەکانی، لە دەیەی ۱۹۳۰، لە پێکهاتنی فاشیزمی نێونەتەوایەتی پەرەی گرت. بەم حاڵەوە، ئەمەش ئاشکرایە کە بڕێک لە رووداوەکانی ئەندێشەی ناسیۆنالیستی، بەتایبەت ناسیۆنالیزمی لیبرال، خۆی لە شوێنی تایبەتمەند یان لۆکالیزم [ناوچەگەری] بەرتەسک ناکاتەوە بەڵکو بۆچوونەکانی خۆی جیهان وەتەنانە و جیهانخوازانە دەخاتەڕوو. بەم شێوە سازگاری ئەم ئەندێشە لەگەڵ هەموو نەتەوەکان ئاسان دەبینێ. سەرەنجام گرنگتر ئەمە کە، مەسەلەی ئیفلیجکەر بریتییە لە لایەک دەسەڵاتی مەزنی ناسیۆنالیزم لەم سەدە و سەدەی رابردوو، لە لایەکی ترەوە دڵسافی وەک ناسیۆنالیزم و نەبوونی یەکگرتوویی فەلسەفی ئەو. خاڵی سەیر و دژبەیەک

ئەوەیە کە ناسیۆنالیزم وانەیە بە دەلیلی هەر ئەم نەبوونی یەکگرتووییە زاتییەی باوەڕەکانی خۆی سەرکەوتوو بووە.

مەسەلەی ئاخر هاوبەشی راستەوخۆی نێوان ناسیۆنالیزم و هەموو ئیدئۆلۆژییەکانە. ناسیۆنالیزم ئاشکرا لە مێژووی پێچەلاوپێچ پرگەوەی خۆیدا بەرادەی پێویست لەسەر کەوڵ و خوانی زۆربەی ئیدئۆلۆژییەکان خۆی تەسەل کردووە. ئێمە ناسیۆنالیستە لیبرالەکان، سۆسیالیستی، پارێزگار، فاشیستی و تەنانەت ئانارشیستیشمان بووە و ئێستاش هەمانە.[١٤] ناکرێ هێڵێکی جیاوازکەرەوە و بڕینەوەی لە نێوان ئەم ئیدئۆلۆژیانەدا بکێشین و سەیر نییە کە لەگەڵ دووڕەگە بوونی ئیدئۆلۆژیکی رووبەڕوو بینەوە. دەستێوەردانێکی زۆر راستەوخۆ و ئاشکرا لە نێوان ئیدئۆلۆژییەکان، تەنانەت دەربارەی ناسیۆنالیزم، بوونی هەیە کە بووە بە بۆشایەکی فیکری ئاستەنگ و توند کە دەبێ بە جەوهەری شتێک پڕ بکرێتەوە. لە پێوەندی لەگەڵ خاڵی ناوبراو، هەروەها ئاشکرایە کە جیاوازیگەلێکی بەرچاو و چاوەڕێ‌لێ‌کراو لە دەروونی ناسیۆنالیزم خۆیدا بوونی هەیە کە لەگەڵ پێکەوە بەسراوەکانی ئیدئۆلۆژیکی جیاواز بەرامبەری دەکا. مەسەلەگەلێکی ناسیۆنالیستی بوونی نییە بەڵکو زۆرتر لەگەڵ ناسیۆنالیستەکان رووبەڕووین.

## پێگەی سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزم

رێک لە وێچووەکانی نزیک بە نێوانی فاشیزم و ناسیۆنالیزم بەتایبەت لە شێوازێک کە ئەدەبیات بە لێدوان لەمەڕ ئەم ئیدئۆلۆژیانە دەدوێ، بوونی هەیە. لە چەشنی فاشیزم، زۆر لە لێدوانەکانی ناسیۆنالیزم گرێدراوە بە پێشمەرجگەلی بەیان و ئاشکرا کردنی ناسیۆنالیزمەوەیە ـ بۆ سەری هەڵداوە و بۆ وەها کاریگەریەتییەکی بووە؟ ئەم خاڵە لەبەر باریکی فیکری دۆزەکان لە بەراورد لەگەڵ دەسەلاتی مەزن و خۆنیشاندانی بزووتنەوە لە کردەوەی مێژوویی و کۆمەڵناسی

ئەو، شایانی باسە. لەم رووەوە، بڕێکی زۆر لەو چەمکانەی کە لەمەڕ ناسیۆنالیزم نووسراوە لە لایەن مێژووزانان، بیرمەندانی سیاسی و کۆمەڵناسانی سیاسییەوە بووە و لە پلەی بەراورد، ئەندێشمەندانی سیاسی بەتایەت لە چوار دەیەی رابردوو کەمتر لەمەڕ ئەو چەمکە نووسیویانە.[15] ئەم راستییە کە ناسیۆنالیزم لە لێدوانی فاشیستی و ناسیۆنال سۆسیالیستیدا بازنەی سەرەکی پێکهێناوە، ئەو هەر تەنێ قورسایەکی زۆرتر دەخاتە سەر ئەم روانین و گریمانە. بە بۆچوونی زۆر لە تۆژەران هەر دوو مەسەلەک لە باری ئیدئۆلۆژیکییەوە بزاڤگەلێکی کاڵ و سەرەتایین کە هەڵگری شیکردنەوەی باڵای شرۆڤەکردنین. لەبەر ئەمە، وەکو بەشی شەشەم واتە «فاشیزم» ئەم بەشە بە دوو فەسڵ دابەش دەکرێ.[16] لە بەشی یەکەمدا پێداچوونەوەیەکمان لەسەر پێگەی سەرهەڵدان و مێژووی ناسیۆنالیزم دەبێ و لە بەشی دووەمدا بڕێک رێچارە جۆراوجۆرەکانی تۆژەران لەمەڕ ناسیۆنالیزم تاوتوێ دەکەین.

هەروەکو ئیدئۆلۆژییەکانی دیکە کە لەمەڕ ئەوان لێدوانمان کردووە، لە بارەی پێگەی سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزم باوەڕەکان بەتەواوی جیاواز و تەنانەت پێچەوانەی یەک بوونیان هەیە. یەکەم راپۆرت لەمەڕ ناسیۆنالیزم ئەو بە گرووپەکان یان عەشیرەی قەومی یان بە دێرینەوە دەبەستێتەوە. لەبەر ئەمە، نەتەوە وەکو واتایەکی دێرینە چاوی لێدەکرێ کە بەکردەونە بەشێوەی میراتگر لەسەر بنەمای غەریزەی کۆمەڵایەتی بوونەوەری مرۆڤ فۆرمی گرتوە. نووسەرانێک کە لەژێر کاریگەری بیۆلۆژی کۆمەڵایەتیدان لەگەڵ ئەم جۆرە راڤەدا هاودەنگن و ناسیۆنالیزم زۆرتر بە وتراوەیەکی بیۆلۆژیکی تەسەور دەکەن هەتا میتۆدێک.[17] دەرەنجام، ناسیۆنالیزم وەکو دۆزێکی پێشمۆدێرن هەست پێدەکرێ کە یان بەیانگەری رواڵەتێک لە قەومییەتە یان لازمەی کوتوپڕی میتۆدێک بە مافی سروشتی زیندێکی هاوبەش.[18] لەم جۆرە لێدوانە زۆربەی چەمک بەم خاڵەوە بەسراوەتەوە کە ئایا باسکردنێک لەمەڕ پێکهاتی میللی پێشمۆدێرن یان بیچمی پێشمیللی ئەمەکناسی خرابێتە ڕوو یان نا؟ یەکەمیان ناسیۆنالیزم بە دۆزێکی

پێش‌مودێرن دەزانێ، دووەمیان ناسیۆنالیزم لەگەڵ مودێرنیتە پێکەوە گرێ دەدا. بەلام دەڵێ کە شێوەی پێش‌میللی ئەمەگناسی وەکو ئەمەگناسی عەشیرەتی و تایەفەیی کە بوونیان بووە نابێ لەگەڵ واتای نوێی ناسیۆنالیزم تێکەڵ بکرێن. کتێبی ئانتۆنی سمیت لە مابەینی کێشەگەلی پێش‌مودێرنو مودێرن هەڵوێستەی مامناوەندی دەگرێتەبەر، بەکورتی باوەڕی وایە کە قەومییەت بە جۆرێکی وردبینانە و زیرەکانە لە ناسیۆنالیزمی نوێدا تواوەتەوە. سمیت لەسەر ئەو باوەڕەیە کە قەومییەت بەرایی سەرەکی پشکوتنی ناسیۆنالیزمی نوێ دێتە ئەژمار. بەپێی نووسراوەی ئەو «نەتەوەە نوێکان هەر تەنیا بەو شێوازانەی کە ئەندامی قەوم لەگەڵ یەکدا دەستیان بە هاوکاری و پێوەندی بەرامبەر کرد، پەرەیان پێداوە، بەهێزیان کردووە و کارامەیان بار هێناوە».[19] سمیت بەپێچەوانەی تەئکیدی ئەرنێست گلێنێر و بەندیکت ئاندێرسۆن لەسەر نوێ بوونی ناسیۆنالیزم، لەسەر دایمی و بەردەوامی ئەو لەگەڵ رابردوو پێدا دەگرێ، ئەگەرچی دەیسەلمێنێ کە برێک گۆڕانکاری قەومییەتی کردووە بە ناسیۆنالیزم. بەم حالەوە، هێشتا دەڵێ دەولەتە میللییەکان ئەوەیکە «قەومخوازەکانی پێش‌مودێرن تێدەکۆشان بەڕێوەی بەرن، واتە پەسند کردنی دووری لە بێگانە و زایەلەی سوننەتەکان و دیرۆکەکانی باو و باپیرانی خۆیان لەلایەن خزمانی پیاوەوە، لەگەڵ سوود وەرگرتن لە سیستەمی فێرکردنی نوێ» بەشێوەیەکی کاریگەرتر بەڕێوەی دەبەن.[20]

لە بۆچوونی تایبەتیتردا دەربارەی پێگەی سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزم تیشک خراوەتەسەر ئوروپای سەدەکانی ناوەڕاست، ئەگەرچی ئەم تیشک و سەرنجە هەمیشە پێوەندی بە ریشەناسی وشەی نەتەوەوە دەبێ.[21] نیل مەک کورمیک فەیلسووفی هاوچەرخ، دەس بە تاوتوێکردنی واتای ناسنامەی میللی لە سەدەی شازدەهەم لە بریتانیا و بەتایبەت لە ئەسکاتلەند دەکات. مەک کورمیک باوەڕی وایە کە «جیاوازی نەتەوەکان زۆر بەر لە سالی ١٧٨٩ روویدا و بە شێوەی بەلگەی ئەمە کە بۆ ئەوان دەبێ لەژێر فەرمانی شاکانی خۆیاندا ژیان بکەن و پێڕەوی

یاساکانی خۆیان بن، پەرەی گرت». لەبەر ئەمە «ئەمەکە واژەی ناسیۆنالیزم نـ
حوکمی واژەیەکی تایبەت بە ئەندیشەی سیاسی هەر تەنیا لە سەدەی نۆزدەهەمـ
کارکردی گشتی پەیدا کردووە، بەتەواوی بێرەبتە».[22] هانس کوهەن، گەورە
تۆژەری ناسیۆنالیزم لە پاش ١٩٤٥، کۆتاییەکانی دەیەی ١٦٠٠ بە شوێن
شوێنەواری گەشە و بالا کردنی دۆزەکانی ناسیۆنالیستی دەزانێ ئەگەرچی ئە
شێوەیەکی چاونەکراوانەتری چاوکراوەیی میللی دەداتە قەلەم.[23] لۆرد ئالتو
بەشکردنی لە هێستان لە ١٧٧٢ بە پێشەکی سەرهەلدانی ناسیۆنالیزمی لەهێستانی
و ئەوروپایی دەشوبهاند.[24] سەردەمی رۆشنبیری سەدەی هەژدەهەمیش خالێکی
دیکە بۆ سەرچاوە گرتنی ناسیۆنالیزم دەهاتە ئەژمار.[25] هاوکات لەگەل ئەمە
کۆمەلێک بیرمەندی وەک دەلێ کروری لێبراوانە شوێنی پێی ناسیۆنالیزمیان لە
شۆڕشە فەلسەفییەکانی ئەلمانی سەدەی هەژدەهەم، بەتایبەت لە ئاسەواری
بیرمەندانی وەک کانت، فیختە، ئەشلگل، ئەشلایر ماخر و ئارنێت دەبینییەوە
سەرەرای ئەمە، پرلایەنگرترین زەمانی سەرهەلدان و هەلقولانی ناسیۆنالیزم
خولێکە کە بێپسانەوە و پاشان شۆڕشی کەبیری فەرانسا دەگرێتەبەر
سەرەنجام برێک لە بیرمەندان گوتویانە ناسیۆنالیزم بەرهەم و دەستکەوتی
سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمە بۆ وێنە هابس باون کێشەی لەسەر ئەوەیە کە
کارکردی مودێرنی واژەی ناسیۆنالیزم لە حوکمی واتایەکی جیاوازانە و جیا لە
قەومییەت، تا رادەیەک نوێیە. دۆزی مودێرن لەوانەیە بگەرێتەوە بۆ دەیەی ١٨٣٠
ئەگەرچی برێک لە لایەنە عامفامترەکانی ئەو لە شۆڕشەکانی ئەمریکا و فەرانسـ
شیاوی شوێنهەلگرتنە. خالی دوایی کەم تا کورتێک لەگەل بۆچوونی گلنیر
هاوکێشی هەیە کە ئەویش ناسیۆنالیزم بە واژەیەکی نوێ دەزانێ کە لەگەل گەشە
و نوێبوونەوەی دەولەتەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا هاوقەتار بووە.[27] باوەری من
زۆرتر لەگەل ئەو تۆژەرانە دایە کە ناسیۆنالیزم بە بزاڤێکی جیاواز دەزانن کە
سەرچاوەکەی شۆڕشی مەزنی فەرانسەیە. ئەمە بە مانای رەتکردنەوەی ئەوە نییە
کە روالەتی سەرەتاییتری ئەمەگناسی و نۆکەری تاقمێک بوونی بووە. سەرەرای

ئەمە، ئەوانە بە مانایەک کە ئێمە لە واژەی ناسیۆنالیزم لە سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم تێدەگەین، ناسیۆنالیزم نەبوون.

زۆر لە گەرایشەکانی سەرەوە قۆناخگەلێکی جۆراوجۆریان بۆ ئالوگۆڕی ناسیۆنالیزم لەبەرچاوە. یەکێک لە ئەندێشە هەمەلایەنە پەسندتر کە لە نووسراوەی خۆیدا نەقلی قەول لەوە دەکرێ، ئەندێشەی میروسلاو هەروکە. ئەو باوەڕی بە سێ قۆناخی جیاواز هەیە. یەکەم ناسیۆنالیزم لە سەدە نۆزدەهەم بەشێوەی کەلتووری عامیانە، داب و نەریت و سیستەمی ئەو هاتووەتە ئاراوە. ئەمە لە بنەڕەتەوە ڕوزێکی کەلتوورییە کە چینە مامناوەندییەکان و بالایان لەخۆگرتووە کە یان باری سیاسی ئەندێشە یان کەمێکی بووە. دووهەم سەرهەلدانی ناسیۆنالیزم بە کێش و پێواری چالاکی سیاسییە. ئەمە هەمیشە پێوەندی بە حزبە سیاسییەکانەونەوە دەبێ و لە لایەن ئەوانەوە هاتووەتە ئاراوە. سێیەم، قۆناخێکە کە ناسیۆنالیزم لە پشتگری و پالپشتی جەماوەر بەهرەمەند دەبێ و بەشێوەی بزاڤێکی خەلکی دێتە گۆڕەپانەوە. هەروەک هەریک ئەم قۆناخانە لەگەل گۆڕانکاری ئابووری و کەلتووری پێکەوە گرێبەست دەکا.[28] هابس باونیش سێ قۆناخ یان خول هاوێر دەکا: یەکەم، خولی ١٨٨٠-١٨٣٠ کە ناسیۆنالیزمی لیبرال دەسەلاتدار بووە، پاشان ١٩١٤-١٨٨٠ کە بزووتنەوە توند و ئاشکرا لە باری مافی پارێزگارەکانەوە لە ئەندێشەی ناسیۆنالیستییەوە دەردەکەوێ و سەرەنجام لووتکەی ناسیۆنالیزم لە خولی ١٩٥٠- ١٩١٨یە.[29] ئەگەرچی هێندێ لە بیرمەندان لایان وایە ناسیۆنالیزم لە خولی ١٩٨٠-١٩٥٠وە روو لە ئاوا بوونە، ئاشکرایە کە ئەو ئیدئۆلۆژییە لە دەیەی ١٩٩٠وە لە ئوروپای رۆژهەلات و شوێنەکانیتر سەرلەنوێ سەریان هەلێناوەتەوە.

هەنووکە بە دووەم بەشی ئەم فەسلە واتە لێدوان لەمەڕ روالەت شێوەی بەیانی ناسیۆنالیزم دەکەین: لە سەدەی نۆزدەهەمدا نووسەرانێکی وەک جان ستوارت میل، لۆرد ئاکتور و ئەرنێست رۆنان بە نووسراوە سەرەتایەکان لەمەڕ ناسیۆنالیزم خووی ئەخلاقی یان فەلسەفیان پێ‌بەخشی. تاقانە تایبەتمەند لەم بارەوە نووسراوەکانی مارکس و ئینگلیس و سوننەتی هەلقولاوە لەوانەوەیە.

هۆگری مارکسیستی بە ناسیۆنالیزم لە پلەی یەکەمدا لەسەرنجدان بە ئابووری سیاسییەوە سەرچاوەی دەگرت. ناسیۆنالیزم بە دیاردەیەک لە قۆناخی پەرە گرتنی ئابووری دەناسرا. بەم حالەوە پێچراوەگەلێک لە بەیانی مارکسیستی بوونی هەیە کە دەبێتە لەمپەرێک بۆ تێگەیشتنی ناسیۆنالیزم لەو پاشان دەگەڕێینەوە سەر ئەو بابەتە. لە خولی ۱۹۲۰ هەتا ۱۹۵۰ ئاسەوار لەمەڕ ناسیۆنالیزم کەمتر هەلوێستی ئەخلاقی و زۆرتر تایبەتمەندی مێژوویی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هۆگری تایبەتی بە ناوەڕۆکی مەسلەکی ناسیۆنالیزم نیشان دەدا. نووسەرانێکی وەکو هانس کوهەن، هێوستۆن، کارلتۆن هایس، ئالفرێد کوبان و لۆئیس ئەستایدر لەم خولەدا حاکمیەتیان هەیە. لە کۆتایەکانی دەیەی ۱۹۵۰ زانستە سیاسییەکانی ئەمریکا ئاسەواری پێشوویان لەخۆوە پێچا و ناوەڕۆکی سەرەکی لێکۆلینەوەی ئەو بەسەر واجبی قەومی بە لێکۆلینەوەی تەجربی مەحکەم بوو و دەیویست تەسەورە بالاکانی بناخەی ناسیۆنالیزم تێبگا. میتودە بنەڕەتییەکانی لێکۆلینەوە بریتی بوون لە ئەندێشە نوێسازی، کارکردخوازی و ئەندێشەی پەرەپێدان. بێجگەلە تایبەتمەندیگەلێکی نایاب، هەمەجۆر ئەندێشەی نوێسازی هەتا ئەم دواییانە بەشی هەرە مەزنی لێکۆلینەوەی پێکدەهێنا. نووسەرانی بەناوبانگی دەیەی ۱۹٦۰ و سەرەتای دەیەی ۱۹۷۰ زانکۆییانی وەک دەیڤید ئاپتر، کارل دۆچ، بوسین پای و کلیفۆرد گیرتس بوون. ئەم جۆرە لێکۆلینەوە تەجرەبەخوازییە لەمەڕ نوێسازی لەسەر ئاسەواری نووسەرانی نوێتری وەک ئەرنێست گێلنێر، ئانتۆنی سمیت و پیتر ئالتێریش کاردانەوەی ئەسەری گرنگی دانا.

ئەندێشەی نوێسازی لە نووسراوەیەک کە لەمەڕ ناسیۆنالیزم نووسراوە ڕەنگدانەوەی و دەسەلاتی هەمەلایەنەی هەیە. ئەم ئەندێشە لەمەڕ پێشمەرجگەلی ئابووری و کۆمەلایەتی بوونی دەولەتە میللییەکان لێدوان دەکا. کۆکراوە سەرەتایەکانی ئەو ئەندێشانە کارکردخوازی و پەرەپێدانن. کارکردخوازی لەمەڕ دەورە کارکردییەکانی دەولەتە میللییەکان لە لێدوان لە پرۆژەی نوێسازی دەکا

ـدلـەتە میللییـەکان وەک نەهادگـەلێکی پـسپۆڕ چاویـان لێـدەکرێ کـە لەگـەڵ
ـبـەشـکردنی کـار لـە کۆمەڵـگە پیـشەسازیە پێشکەوتووەکان پێوەنـدیان هەیـە.
کارکرد یان ئـەرکی دەوڵـەتە میللییـەکان نێـوجێیی و کەمکردنـەوەی موناقەشـە و
تەنینەوەی نێوان بەشـەکانی کۆمەڵـگەیە. دەوڵـەتەکان هـەر تـەنیا کاتێـک بـوونی
خۆیان بە دەس دێنن کە سەرچاوەگەلی تـەواویان بـۆ توانـایی دەسـەڵات بەسـەر
ئۆرگانیزمی دەوروبەری کۆمەڵگە ببێـت. ئەندێـشەی پەرەپێـدان بـە قۆناخگـەلێکی
دیـاریکراو لـە گەشـەی دەوڵـەتە میللییەکانـدا رازییـە. وابـیر دەکـرێ کـە گەشـە
بەشـێوەی پلەپلـە، عاقڵانـە، بـەردەوام یەکپارچـە و زاینـەوەی دەروونی پێکـدێ.
دەوڵـەتی میللـی لـە قۆنـاخێکی تایبەتیـدا لـە پـەرەگرتنی ئـابووری کۆمەڵـگەدا
سەرهەڵـدەدا. بنـەمای نوێـسازی لـە پێوەنـدی لەگـەڵ ناسـیۆنالیزم ئەمەیـە کـە
کومەڵگەکان بۆ زیندوومان و گیانبەدەر بـردن لـە ئاڵـۆزیە بـە ئـۆف و ئازارەکـان
ناچارن بە بنەما کردنی شێوەگەلی نوێی بەڕێوەبردنی پڕەنسیپ و بـەڕێوەبردنی
کارکردگەلێک مل بدەن کە پێکهاتە پێشوەکان توانای وەئەستۆ گرتنی ئەنجامـدانی
ئەوانەیان بـۆ ماوەیـەکی درێژخایـەن نـەبوو... پیـشە و کارگـەلی یەکپارچـەیی و
سازگاری سـەرلەنوێ و بـەردەوامی دەتوانـێ قۆنـاخی راگواسـتن و گۆڕانکـاری
ئاسان بکا». گرنگترینی ئەم پیشە و کارانە ناسـیۆنالیزمە.[30] نوێـسازی بریتییـە لـە
لێهاتوویی کۆمەڵگە بۆ گەشەی «خۆڕاگری» و قۆزینەوە و کێششی گۆڕانکارییـەک
کە بە هۆی پیشە و کاری یەکپارچـەیی و سـازگاری سـەرلەنوێ دروسـت دەبـن.
شکست لە نوێسازیدا هۆکاری سەرهەڵدانی نەبوونی هاوکێش و ناسـازگاریگەلێک
لە کۆماکان و بەشـە دەروونییـەکانی کۆمەڵـگەدا دەبـێ. بـە پیـشەسازی بـوون و
نوێسازی خێرا تەواوکەری بوونی سیـستەمـی سیاسـی بادانـەوە و ئیـدئۆلۆژیکی
وەکو ناسیۆنالیزمە کە تاک لەگەڵ دەوڵەت بە مەبەستی پاراستنی یەکێتی گرێدەدا.
بـەو رادەیـە ناسـیۆنالیزم یارمـەتی دەدا لەسـەر بۆشـایی نێـوان جـەماوەری
سـوننەتیتـر (Gemeinschaft) و ئەنجوومەنـە نوێکـانی (Geselschaft) پردێـک
هەڵبەسرێ.

به نووسراوەی ئانتۆنی سمیت: بۆ پاراستنی یەکێتی هاوبەش و ڕەوابوونی نەزم، دیرۆکێکی نوێ لە دەوری لە دایکبوونێکی سەرلەنوێ نەتەوەیەکی بێخەوش بۆ دامەزراندنی سەردەمێکی زێڕین سەرهەڵدێنێ».[31] لەبەر ئەمە ناسیۆنالیزم لە حوکمی شەرتێکی پێویستی پەرەپێدانی ئابووری، بە پیشەسازی بوون و نوێسازی دەزانرێ. لەم ڕووەوە، بە وتەیەکی گشتی، ئەندێشەی نوێسازی زۆرتر بەهێزی مێژوویی، کۆمەڵناسی و ئابوورییەک کە لە ناسیۆنالیزم گیانیان وەبەر دێتەوە، هۆگری هەیە هەتا بە ئیدئۆلۆژی ناسیۆنالیزم خۆی. ئەم ئەندێشە سەرنجی داوەتە پرۆژەگەلێکی وەک بە پیشەسازی بوون و شارستانییەت هەتا ڕۆڵ و کارکردی خۆی ئاشکرا بکا.

لە پێوەندی لەگەڵ ناسیۆنالیزم ئەندێشەیەک زۆر بوونی هەیە. بە بۆچوونی کارل دویچ، ناسیۆنالیزم کەلتووری هاوبەشی و «هاوبەشی پێوەندییەکان» ئاسان دەکا. ئەندێشەی پێوەندییەکان ڕوویەکی دیکە لە نوێسازیە کە جارێکی دیکە لەسەر لایەنی کارکردی ناسیۆنالیزم تەئکید دەکا. دویچ نەتەوە بە بۆچوونێک لە بەڕێوەبەری پێوەندییەکانی کارکرد دەزانی، نوێسازی لەگەڵ کاردانەوەی ئەم جۆرە بەڕێوەبردنانە بەراورد دەکرێ. لەبەر ئەمە ئەوەی کە بۆ نوێسازی تەواو پێویستە بوونی شێوەگەلی کافی و کاریگەری پێوەندییەکانە. بەم جۆرە نەتەوە دەبێ بە مەڵهەمێکی گیراوە لە تاکەکان کە بە هۆی بەڕێوەبەرانی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و ئابوورییەوە لەگەڵ ناوچەکان و کۆماکان پێوەندی دەگری. دویچ دەیەوێ پرەنسیپەکانی میللییەت بەهۆی ئەو پرۆژە پێوەندیانەوە کەمییەت هەڵسەنگێنێ.[32] هاوکات لەگەڵ ئەمە، بە بۆچوونی ئەرنێست گێلنێر، ناسیۆنالیزم «لە خالی بڕینەوەی سیاسەت، تێکنۆلۆژی و گۆڕانی کۆمەڵگە» مەوجوودییەت بە دەستدێنێ.[33] ئەندێشەی «نوێسازی لەسەرەوە» بەلای ئەوەوە باشترە و باوەڕی وایە کە ناسیۆنالیزم «لەبنەڕەتەوە تەحمیلێکی گشتی فەرهەنگێکی باڵا لەسەر کۆمەڵگەیە، کۆمەڵگەیەک کە لەوەبەر فەرهەنگە لاوازەکانی ژیانی زۆرینەی لەخۆگرتبوو».[34] ئەو هەروەها لەسەر کاریگەری بارودۆخی ماددی لە بەدیهێنانی

ئەندێشەی میللی تەئکید دەکا، و بوارەکان و شوێنە ئابوورییەکان بۆ ناسیۆنالیزم و دووری و پارێزی چاوکراوانە لە مەسەلەی ئیدئۆلۆژی پێشنیار دەکا. بە بۆچوونی گێلنێر، شێوەی تایبەتی حکوومەت و کۆمەڵگەی مەدەنی تەواوکەری راستەقینەی گەشەی پیشەسازین. بەپیشەسازی بوونیش تەواوکەری گۆڕانکاری سەرلەنوێیە. بەم جۆرە پێویست بە هەمەلایەنەی کۆمەڵایەتی زۆرتر بوونی هەیە کە بەهۆی یەکپارچە بوونی زمان و سیستەمی فێرکردن و پەروەردەی میللییەوە بە راستەقینە دەگا. بەبڕوای گێلنێر، پێش هەنگاوی نوێسازی رۆشنبیرانن کە پێوەندییەکی نزیکیان لەگەڵ فێرکردن و پەروەردە و پڕۆژەکانی پێوەندییەکان هەیە. بە باوەڕی ئەو، پێشمەرجی هاووڵاتی تەواو و کاریگەر، خوێندەوارییە. پرەنسیپی میللی دەبێ گشت رواڵەتە بەناوبانگەکانی ئەمەگناسی و فەرمانبەری لەخۆبگرن بەپێی وتەی گێلنێر کۆمەڵگەی ناسیۆنالیست لەسەر بنەمای «کورێکی زانیاری زمانناسی کە بەسەر زماندا سەرپەرشتی ببێ و زەروورەتی پێوەندییەکانی مەنتقی دیوانسالارانە و تێکنۆلۆژیکی کۆ بکاتەوە».[٣٥]

باوەڕی نوێسازی بەشێوەی گشتی تێگەیشتنی زیرەکانە و وردبینی لە ئیدئۆلۆژی ناسیۆنالیزم دەخاتەڕوو و بە بەرفراوانی دەیەوێ کە ئەم ئیدئۆلۆژییە یان نەگرێتە بەرچاو یان وەلابنرێ، ئەم باوەڕە لەوێدا کە تەئکیدی لە رادەبەدەر لەسەر هۆکاری ئابووری و کۆمەڵناسی لەسەرهەڵدانی ناسیۆنالیزم دەکاتەوە، لە بەیانی بە تەوژمی کێششی و جۆش و خرۆشی دۆزە ناسیۆنالیستییەکانیش ناکام دەمێنێتەوە. بۆ وێنە وا دێتە بەرچاو کە گێلنێر لەگەڵ گریمانەی بوونی شتێک کە نەتەوەی ناودەنێ، دیاردەگەلێک بەشێوەی مەکینەیی لەپاڵ یەکەوە دادەنێ و دەرەنجام لە تێگەیاندنی تەواو و کەماڵی ئیدئۆلۆژی ناسیۆنالیزمدا دەمێنێتەوە. بێجگەلەمە، ئەندێشەی گێلنێر بەتایبەت روانگەکانی تاکزمانی لە کەلتووری سیاسی و مەدەنیدا دەخاتەڕوو. ئەو بۆ دیاردەگەلێکی وەک زۆر بوونی فەرهەنگەکان و زۆر بوونی ناسیۆنالیستەکان لە دەروونی دەوڵەتەکاندا جێی برێک دێڵێتەوە. دێتە بەرچاو کە پلەیەک لە هەمەلایەنەی کەلتووری بۆ واتای ئەو

له دەوڵەتی میللیدا گرنگی هەیە کە لە باری گۆڕانکاری مێژوویی سەردەم زۆربەی دەوڵەتەکان مەسەلەسازن.[٣٦]

مارکسیزم لە باری مێژووییەوە لەگەڵ دیاردەی ناسیۆنالیزم پێوەندییەکی زۆر تەنراوەی بووە. تام نارین ئەم کارە بە «ناکامی مێژوویی» مارکسیزم وەسف دەکا.[٣٧] مارکسیستەکان بەپێچەوانەی ئەم راستییە کە زۆربەی بزاڤە شۆڕشگێرە گرنگەکان لە مارکسیزمدا لە سەدەی بیستەمدا خووی ناسیۆنالیزمیشان بووە. بەتایبەت بزووتنەوە دژە داگیرکەرەکانی بۆ وێنە لە ڤێتنام و ئەلجەزایر. بەشێوەی گشتی ناسیۆنالیزمیان بە جۆربەجۆرەکانی بورژوایی دەزانی.[٣٨] بە بۆچوونی مارکس و ئینگلیس، ناسیۆنالیزم هەر تەنیا دەوری ئامێری و تێپەڕ لە خزمەت بە بەرژەوەندی مێژوویی پرۆلیتاریای هەیە؛ دڵگەرمییەکانی ناسیۆنالیستی گرنگی پایەدار و قوولیان نەبوو و دیاردەگەلی رووبە ئاوا بوون و سیس هەلاتن بوون. هەڵبەت تەنانەت لنین ناسیۆنالیزمی جوداییخوازانە و دوزە خودموختاریخوازەکانی قبوول دەکرد، بەلام هەر تەنیا لە شێوەیەکدا کە لە پەرە پێدانی باشتر کردنی سەرمایەداری لە دەروونی دەوڵەتە بورژواییەکاندا بەشداریان ببێت و دەرەنجام لە کۆتاییدا یارمەتی بە رووخانی سەرمایەداری دەکرد. بەکورتی، خەباتی چینایەتی لە پلەی یەکەمی گرنگی و خەباتی نەتەوایەتی لە پلەی دووەمدا بوو.

زۆربەی راپۆرتە سەرەتاییەکانی مارکسیستی لەگەڵ وێنە بەرزەکانی ناخی رێنوێنیە تایبەتەکانی خۆیان ئاستەنگ بوونەتەوە یەکەم گریمانەیەکی بڕڕا لە مارکسیزمدا بوونی بوو لەسەر بنەمای باوەڕ بە یاسای گشتی تەکامول بەرەو کۆمەڵگەیەکی بێتەبەقە و یەکسان لەو پێناوەدا تایبەتمەندی یان مەکانخوازی ناسیۆنالیزم لە دژایەتی لەگەڵ ئەم ئامانجە مێژوویی جیهانیدا هەڵدەسەنگێندرا. دووەم لە دەروونی مارکسیزمی ئۆرتۆدۆکس، حەز و مەیلێکی بەهێز لە پێناوی ئاشکرا کردنی هەموو کارەکان لەگەڵ دیاردە ئابوورییەکاندا بوونی بوو. ناسیۆنالیزم لەگەڵ مەنتقی ئابووری سەرمایەداری هەڵگری وەسف بوو. سێیەم

مارکسیزم کێشەی بوو کە ئەندێشەی جیهانوەتەنی هەیە و دیاردە میللییەکان لە هەر لایەک ڕوویدا لەگەڵ ئەم یاسایە بەیانی دەرکرد. سەرەڕای ئەمە، ڕاستییە جیاوازەکانی ناسیۆنالیزمەکان لە بەرامبەر ئەم بەیانە تاکە هۆیە رادەوەستن. بێجگەلەمە، هەم مارکس و هەم ئینگلیس لە ناخەوە ئوروپاگەرا و ئوروپامەدار بوون و لە «ڕەسالەتی شارستانییەتسازی» دەولەتە داگیرکەرەکانی ئوروپا پشتیوانیان دەکرد.[٣٩] ئەوان دەیانگوت ئەو کۆما میللیانەی کە توانای دروست کردنی دەولەتێکی باوەڕپێکراویان نییە ئیزن بدەن لە دەستەگەلێکی مەزندا بتوێنەوە. بۆ وێنە مارکس لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە کرۆواسی و بۆ هەم دەبێ لە دەستە سیاسییە گەورەترەکاندا بتوێنەوە.

بە بۆچوونی مارکس و ئینگلیس دەولەتی میللی مودێرن بەرهەمی پرۆژەیەک بوو کە لەودا بەدیهاتنی سەرمایەداری بوو بە جێنشینی فیئۆدالیزم. جێگۆڕکێ بە ئابووری بازاڕ دەولەتەکانی ناچار دەکرد کە بکەونە سەروکاری بەرفراوان کردنەوەی زمانە تاقانەکان و پەرەپێدانی نەهادگەلی کۆکراوە و قرتاندنی جیاوازییە ناوخۆیەکان. زمانە میللییەکان گوتنگەلێک بۆ بازرگانان و سەوداگەران و مەرجی سەرکەوتنی ئابوورییەکانی بازاڕ دەهاتنە ئەژمار. لە ئاسەواری مارکس و ئینگلسدا ئەم ئیستاندارد کردنەی زمانەکان و کۆکراوەی سیاسی هاوکات یان هاوڕێ لەگەڵ ئەو، لە ڕووداوەکانی شۆڕشی کە بیری فەڕانسا و بەتایبەت دۆزەکانی ژاکوبنەکاندا وێنەبەرداری کرابوو. سەرەڕای ئەمە، نەتەوە هەر تەنیا قۆناخێک لە تەکامولی کۆمەڵگە بوو. ناسیۆنالیزم بە میتۆدی پەرەپێدانی ئابوورییەوە دەبەسراوە. ناسیۆنالیزم ساتەخولی زەرووری تەکامولی ئابووری دەدرایە قەڵەم. بەم حاڵەوە ڕزگاری و شۆڕش هەر تەنیا بۆچوونێکی هاوبەش بوو کە لە یەکەمین و دووەمین «نێونەتەوایەتی» [کۆمۆنیستەکان] گیرا.

تاقانە کەمکردنەوەکان لە بۆچوونە سەرەوە دۆزەکانی ئانتۆنیۆ گرامشی و بەتایبەت مارکسیستی ئەوتریشی ئەوتو بوئر کە تاقە کەسێک بوو کە لە سوننەتی مارکسیستدا بەرولەت لەسەر ناهاوئاهەنگی پێچراوە و گرنگی بزاڤە

ناسیۆنالیستییەکان بایەخی دانا.[40] بوئر لە ئاسەوارەکەیدا رەخنەی —
ئابووریخوازی و ساکارسازی مارکسیزمی سوننەتیتر گرت. لە راستیدا —
باوەڕی وابوو کە نەتەوەکان لەگەڵ نابوودی چین لە ناو ناچن. بە بڕوای ئەو پە-
سەندنی سۆسیالیزم تەواوکەری حورمەتی جیاوازی جەماوەری میللی بوو.
باوەڕی بوو کە «تاقانەیی هەموو خەڵک لە جەماوەری کەلتووری میللی خۆی
گەیشتنی تەواو بە خودموختاری نێونەتەوە، گەشەی جیاوازییە مەعنەوییەکی
نێونەتەوە، ئەمانە سەرجەم بەمانای سۆسیالیزمە».[41] لە راستیدا بوئر فیکری
دەکرد کە سۆسیالیستەکان نابێ خووی میللی و نەتەوایەتی وەک شتێکی ناپە—
مامەڵەی لە تەکا بکەن. بەم حاڵەوە ئەو لە کۆتایدا تەواو وکۆمەڵ لە ئابووریخوازی
مارکسیستی جیا نەبۆوە، ئەو جۆرە کە تۆژەرێک دەڵێ: «وا دێتە بەرچاو کە
ئاسەواری بوئردا تەقریبەن تەنینەوەیەکی ناپەیەداری نێوان لێکۆڵینەوەی خەیاڵی
نەتەوە لە حوکمی جەماوەری تەقدیر، روانگەی کورتبینانەی یەکلایەنە
دەربارەی ساویلکەسازی چینایەتی بوونی نییە.[42]

## جەوهەری ناسیۆنالیزم

تیپۆلۆژیگەلێکی زۆر لە نووسراوەدا بوونیان هەیە کە لەمەڕ ناسیۆنالیزم
نووسراون. لەم تیپۆلۆژیانەدا بەشتێکی هەرە مەزنی بە رێڕەوی قبوولکراوی
تایبەتییەوە گرێدەدرێ. بۆ وێنە ئانتۆنی سمیت لە یەکێک لە کتێبە سەرەتایەکی
خۆیدا باوەڕی هەیە کە ناسیۆنالیزم «سوودمەندترین واتای مەقوولە هەڵگری
هێنەری دابەشکاری دەرەکی، جنسەکان و جۆرەکانە».[43] ئەوەی کە ئەم بابەتە
زانیاری ئێمە لەمەڕ ناسیۆنالیزم زیاد دەکا، جێی باس و گفتوگۆیە(مشتومڕ
رێیەکی دیکە ئەوەیە کە تیپۆلۆژی بەپێی رێباز و ئامانجەکانی ناسیۆنالیستی
دابمەزرێ. لەم بارەوە دەبێ یەکێتیخوازی لە ناسیۆنالیزمە جوداییخوازەکان جیا
بکرێتەوە، ئەگەرچی رواڵەتی ئیدئۆلۆژیکی دوو ناسیۆنالیزمی جیاوازیخواز دەبێ

بەتـەواوی جیـاواز لەگـەڵ یـەک بزانـرێ. یـان دەکـرێ سـەرنج بدرێتـە قۆناخـە مێـژووییـەکان لـە گەشـەی ناسـیۆنالیزم، یـان لـە دۆزە تایبەتییـەکانی دەروونی لایەنگرە جۆراوجۆرەکان، بەڵام کاڵ، بڕوانی. مەکۆی سەرنجی ئەم فەسڵە زۆرتـر لەسەر تایبەتمەندی دۆزەکانە. ئەگەرچی لێرەشدا رواڵەتی بەرفراوانبوونی هەیـە. بەرفراوانی تیپۆلۆژییەکان لە دەستەبەندییە دوولایەنەکانـەوە هـەتا پێـنج لایەنـەی ناسیۆنالیزم دەگرێتەبەر.[٤٤]

تیپۆلۆژییەکانی ناسیۆنالیزم کەمتر لە ئیدئۆلۆژییـەکانی دیکـە کـە لـەم کتێبـەدا لەمـەڕ ئـەوان لێـدوان کـراوە، بـەلای گـشتییەوە پەسـند کـراون. لـەم رووەوە، دەسنیشانکردنی تیپۆلۆژییەکی تایبەت کارێکی پڕمەترسییە. تیپۆلۆژی پەسندکراو لەم بەشەدا رەنگدانەوەی چۆنیەتی نزیکایەتی ناسـیۆنالیزم لـە سـنووری هـەموو ئیدئۆلۆژییەکانە. جۆر، یان رێبازی یەکەم «ناسیۆنالیزمی لیبراڵ»ە.[٤٥] شێوازێک کە بـڕێک لـە سۆسیالیـستە نوێیـە رێفـراوم خوازەکـان یـان لایـەنگری بـازاڕ زمـانی ناسیۆنالیستیان قبووڵ کردووە. رەنگدانـەوەی جـۆرێکی دیکـە لـە ناسـیۆنالیزمی لیبراڵ دێنـە ئـەژمار.[٤٦] دووەم، ناسـیۆنالیزمی پارێزگـاری سـوننەتیتریش بـوونی هەیە. سێیەم، ناسیۆنالیزمی تەواوعەیار و کامڵەکە شێوەی نزیکتر لەگـەڵ فاشـیزم و ناسیۆنال سۆسیالیست دەدرێتە قەڵەم (کە لە فەسلی شەشـەم «فاشـیزم» لەمـەڕ ئـەو بـەوردی باسـکرا)[٤٧] جـۆرە مومکینـەکانی دیکـەی وەکـو ناسـیۆنالیزمی سۆسیالیـستی و ناسـیۆنالیزمی دژی داگیرکـەریش بـوونی هەیـە. ناسـیۆنالیزمی ئحساساتی لە نێو هەموو ئەم جۆرانەدا سەری لێشێواوە. بەم حاڵەوە، هەموو ئـەم جۆرانـە یـان هاوپۆشـشیان نییـە یـان لایەنگـەلێکی دەرەکـی لـە مـەقوولات و دەستەگەلێکی گشتی کە لەسەرەوە هاوێرمان کردن، دێنەئەژمار.

ناسـیۆنالیزم لیـبراڵ لـە زۆربـەی بایەخـەکان و پلەسـەرەکییەکانی لیـبراڵی پـشتگری دەکـا. ریـشەکانی ئـەم ناسـیۆنالیزمە بـەلانیزۆرەوە لـە سـەردەمی رۆشنبیریدا شاراوەتەوە. نووسەرانێک کـە لایـەنگری بیچمێـک لـە ناسـیۆنالیزمی

لیبرالین به هیچ جۆره ئەو ناسازگار لەگەڵ جیهانوەتەنی یان ئاشتیخوازی نازانن

له زۆر بارەوە، «چوارده بنەڕەت»ی پریزدێنت ویلسۆن که له پاش جەنگی جیهانی یەکەم بلاوکرایەوە، ئەگەرچی بەشێوەی رواڵەتی، پێناسەی خاڵی بالای ناسیۆنالیزمی لیبرالی دەدرێتە قەڵەم ئەو جۆرە که لەسەر «دەسەڵاتداریتی سەربەخۆی دەوڵەتی میللی پێدادەگرێ، بەڵام دەخوازێ مانای دەروونی ئەم پرەنسیپە لەگەڵ تەئکید لەسەر ئازادییەکانی تاک ـ سیاسی، ئابووری و مەزەبی ـ له دەروونی هەر دەوڵەتێکی میللی» بەرتەسک بکاتەوە.[48] بەشێوەی رەسمی، لەم چوارده مادەدا هەر نەتەوە و نەتەوەیەک دەبێ دەوڵەتی تایبەتی هەبێت، بەڵام حکوومەتی ئەو دەبێ لەسەر یاسای بنەڕەتی، دیموکراسی و مافەکان و ئازادی تاکەکان دامەزرا بێ. بەناوبانگترین پڕۆپاگەندەبێژی سەرەتای ئەم دۆزە گشتیە جۆزێپە ماتزینی (١٨٧٢ــ١٨٠٥) بوو. ئەگەرچی رەنگە برێک کەس لە دەستەبەندییەکانی ئەو له پلەی ئەندیشمەندێکدا سیستماتیک گومان بکەن. بەڵام ئەو به بەرفراوانی دزەی کردووه ناوی دۆزی ناسیۆنالیستی لیبرالەوە. ماتزینی لە ئاسەواری تیشکدار و پرشەوق و خاوەن نەسر رەوانی خۆیدا وەک رەسالەیەک لەمەڕ ئەرکەکانی مرۆڤ، باوەری سازگاری کامڵی نەتەوەپەرستی لەگەڵ مرۆڤایەتی هێنائاراوه.[49] ماتزینی بەئاشکرا مرۆڤدۆستی ئەنترناسیۆنالیست بوو. بزاڤی «ئیتالیای لاو»ی ئەو بوو به شەپۆلێکی خرۆشانی لاساییکردنەوە لەسەرانسەری ئوروپا سەریهەڵدا کە به بزاڤی «ئوروپای لاو» ( Giovane Europa) لەگەڵ پەلەکان له ئیتالیا، لەهێستان و ئەڵمان هاته ئەنجام. ئەم کاره بەشی بەحای خۆی بوو به سەرهەڵدانی ئەنجوومەنگەلێکی وەکو رفیقانی دیموکراتیکی هەموو نێونەتەوه برا دیموکراتەکان و ئەنجوومەنی نێونەتەوایەتی خەڵک.

پلەی بالای ویستەکانی ماتزینی لە دەیەی ١٨٥٠ پێکهاتنی ئوروپایەکی لە لانیزۆری یازده نەتەوه بوو. ئەو هەستی دەکرد کە رادەی وڵات بەرتەسکییە و بۆ وێنە قبووڵی بوو که ئیرلەند بەرادەی پێویست بەرین بێ کە بتوانێ دەوڵەتی

میللی پێکبێنێ. بە بۆچوونی ماتزینی لەمپەری ناسیۆنالیزم بریتی بوون لە کۆماگەلی چەند نەتەوەیی و دەولەتە ئیمپراتۆرییە چەند نەتەوەکانی وەک ئیمپراتۆرییەتی هابسبۆرگ. بنەمای گریمانەی ناسیۆنال لیبرال ئەوە بوو کە هەر نەتەوەیەک (کە بە رادەی پێویست گەورە بێ) دەبێ سەربەخۆ بێ، بەلام حکوومەتی دیموکراتیک لەسەر بنەمای یاسای بنەڕەتی بێ. جۆش و خرۆشی گشتی لە ئوروپا لەمەڕ خەبات و بەرخۆدانی یۆنان لەگەڵ ئیمپراتۆری عوسمانی و خەباتی لەهێستان دژی ئیمپراتۆری تیزاری رووس لە دەیەی ١٨٣٠ گەشە و نەشەی ناسیۆنالیستە لیبرالەکانی بەرەو خۆی رادەکێشا. بەم شێوە، خولی گەشە کردن و لووتکەی ئەم فۆرمە رەسەنەی ناسیۆنالیزم لیبرال لە کۆنگرەی ڤیەن (١٨١٤ـ١٨١٥) هەتا سەردەمی پەیماننامەی ڤێرسای و چواردە مادەی ویلسۆن بوو. ناوەڕۆکی سەرەکی ئەم ناسیۆنالیزمە، مافی خودموختاری نێونەتەوە بوو. مەسەلەی گەورەی ئەم شێوە ناسیۆنالیزمە ئەمە بوو کە لەگەل بلاوبوونەوەی دۆزی خودموختاری نەتەوە مەعلووم نەبوو لە کوێ دەکرێ ئەوە رابگیرێ. ئەو جۆرە کە پریزیدێنت ویلسۆن زۆر زوو بەم مەسەلەی زانی کە چۆن دەکرێ بەرگری لەوە بکرێ کە هەر کۆمەلگەیەکی بچووک خۆی بە نەتەوەیەکی گەورە و لەبەر ئەمە وەک دەولەتێک مامەلەی لە تەکا نەکرێ؟ بێجگەلەمە، مناقشاتی نێوان دەولەتە میللییە لیبرالەکان و بزووتنەوە جیاوازیخوازەکان لە دەروونی دەولەتە میللییە لیبرالەکان چۆن چارەسەرهەلگر بوو.[٥٠]

باشترە بلێین کە لەم دواییانەدا هۆگری بە ناسیۆنالیزمی لیبرال سەرلەنوێ زیندوو بووەتەوە. بۆ وێنە کتێبی جان پلامناتیز بە کەلک وەرگرتن لە دۆزەکانی سەرەتایی کەون، لە نێوان ناسیۆنالیزمی مامناوەندی رۆژئاوا قابلی قەبوول لە ریشەوە ناسیۆنالیزم لیبرال و ناسیۆنالیزمی کەلتووری شەڕخوازی ئوروپای رۆژهەلات جیاوازی داناوە. لەم جیاوازییەدا، هێندێ بیرمەندی نوێ (کە زایەلەی هەمان روانگەی ماتزینی بوون، بەلام بێ‌ورەی پڕزەوقی ئەو) سەرلەنوێ کەلک

وەردەگرن و تێدەکۆشن هەستی ڕاست و ناسک لەگەڵ ڕواڵەتێک لە ناسیۆنالیزمی جیهانوەتەنی مامناوەندی ئاشت بکەنەوە. واتای ناسیۆنالیزم لیبرالی ڕاست یان مامناوەندی لە سەردەمی پاش ١٩٤٥ لەگەڵ باوەڕێکی دیکە ڕووبەڕوو دەبێتەوە کە سوورە لەسەر ئەوە لیبرالیزم بەگشتی لەتەک ناسیۆنالیزم ناکۆکە. لەم مانادا لیبرالیزم هاوکێشە لەگەڵ جیهانوەتەنی تەواوعەییار و حاشای لە پێوەندی لەگەڵ ناسیۆنالیزمە. سەرەڕای ئەمە، لەم ساڵانەی دوایدا کێشە بۆچوونییەکان و مشتومڕگەلێک دەربارەی ئەم مەسەلەسەری هەڵداوە. ئەو جۆرە کە یەکێک لە ناسیۆنالیستە لیبراڵە نوێکان دەنووسی: «بناخەی ناسیۆنالیزم ڕیشەی تێگەیشتنەکانی دەربارەی کەشوهەوای مرۆڤ، ئەم خاڵەیە کە چ شتێک ژیانی مرۆڤ مانادار و داهێنەر دەکا... لیبراڵەکان تێکۆشاون هەتاکو ئەم پرەنسیپە لێهاتوانە پێکەوە سازگار بکەن».[51]

جۆر یان ڕێبازی دووەم «ناسیۆنالیزمی پارێزگاری سوننەتخواز»ە کە ئەمەش لە پرەنسیپەکانی ناسیۆنالیزمی کەلتووری هەستناسکدا کاریگەرییەتی زۆر بەهێزی بووە. ئەو جۆرە کە بەر لەمە باسکرا، ناسیۆنالیزمی کەلتووری هەستناسک یان ڕۆمانتیک هەم لەسەر هەموو جۆرەکانی ناسیۆنالیزم لیبرال و هەم ناسیۆنالیزمی تەواوعەییار تەئسیری دانا؛ لەبەر ئەمە، بە هیچ جۆرێک تایبەتمەندانە سوننەتخواز نییە. لەسەر بنەمای پلانە کەونەکان، پلامناتێز و فریدریش ماینکە کە ناسیۆنالیزمی سوننەتخواز بوو، پێوەندی نزیکیشی لەگەڵ واتای کەلتووری و ڕۆژهەڵاتی ناسیۆنالیزمدا هەیە. ناسیۆنالیزمی سوننەتی هۆکارە سەرەتایەکانی خۆی لە کردەوەیەکدا کە سەبارەت بە شۆڕشی فەرانسا لە خۆی نیشاندا، بەدەستی هێناوە. ئیستمراری مێژوویی و سوننەت لە ڕووبەڕووی عەقڵ و شۆڕشدا وەستاون. نەتەوە لایەنگری ئیستمرار و بەردەوامی بوون و چارەنووس تاقانە ئیستمراری ئۆرگانیکی سوننەتی لە ژیانی یاسایی. سیاسی و کۆمەلایەتیدا خۆی دەنواند. لە ئاسەواری نووسەرانێکی وەک ئێدمۆند

بەرەک و ژووزێف دوومستر، نەتەوە و نەتەوە سلسلەمەراتبێکی ڕێک و میزان لە جەماوەرێکی ئۆرگانیکدا هەست پێدەکرا نەک بیچمێک لە هاوولاتیانی بەرامبەر. بە جۆرێکی دیکە، ناسیۆنالیزم بووە بە پارێزگاری سوننەتخواز.

لە بۆچوونەکانی ئالمانیدا باوەڕی بالا، بەتایبەت لە ئاسەواری نووسەرانێکی وەکو فریدریش ئەشلگل، ئادام مولێر و فریدریش نووالیس هاتە ئاراوە کە زۆربەی ئەندێشەکانی ئەو لە تۆژینەوەی تایبەتی هەردوو و فیختە سەرچاوەی گرتبوو. ئەشلگل و نووالیس بەتایبەت واتای نەتەوەیان بەرامبەر لەگەڵ بێخەوشی و پاکی زمان، دیرۆکی قەومی و فەرهەنگ هەڵدەسەنگاند. ئەوان ویستیان ئەوەی کە بە سوننەتی کۆمەڵگەی دەزانن سەرلەنوێ بێژێننەوە. نەتەوەکان لە پلەی یەکەمدا لە کەلتووری هاوبەش، لەگەڵ ڕۆح و ئیرادەی تاقانە لە دایک دەبوون کە لە زمان، دیرۆکە، یاساکان، ئایینەکان و داب و نەریت و مێژوودا ڕەنگیان دابوو. بەم شێوە، وەرگرتنێکی ئاشکرا لە زەروورەتی مەعنەوی جۆربەجۆری کەلتووری بوونی بوو. زمانەکان گرنگییەکی فراوانی تایبەتی لەم خوێندنەوەدا بە دەست دێنا (کە دوایی بە بنەوەش لەمەڕ ئەوانە لێداون دەکەین) بێجگەلە هونەر، شیعر و مۆسیقای عامیانە لە ناوەڕاست و کۆتایی سەدەی نۆزدەدا ڕیشەی لەم ناوەڕۆکانەدا بوو. ئەم ناوەڕۆکانە هەروەها لە ناخەوە چوە ناو پرۆژەگەلی وانەی مەکتەب و زانکۆکان، بۆنەکان و بەتایبەت مێعماری و بەناکانی بڕێک دەوڵەتگەلی سەدەی نۆزدە.[52] هۆکاری سەرەکی ئەم کارە لە هاوبەشی لەگەڵ ئەندێشەی پارێزگاری سوننەتخواز، تەئکید لەسەر دژایەتی لەتەک سەردەمی ڕۆشنبیری بوو. ئەندێشەی ڕۆشنبینی هەم وەک ماددە و هەم مکانیکی مامەڵەیان لە تەکا دەکرد. بەم حاڵەوە، نەتەوە بەشێوەی ئۆرگانیسمێکی مەعنەوی هەڵدەسەنگێندرا و دەناسرا کە مێژوو فۆرمی بەو دابوو نەک تاکەکان، و تاقانەیی تایبەتی خۆی بوو. زۆر لە لێکۆڵەرانی دەوان لەگەڵ ڕازی بوون بەم دۆزانەی دوایی خۆیان لە پێناوی ئەرکی ئاشکرا کردنی دێرینە بوونی ئەم ئۆرگانیزمە مەعنەوییە لە زمانی و کەلتووری گشتی دانا. فەلسەفەگەلی زمان کە هێردەر

گریم، فیختە، ئەشلگل و هومبولت بەرفراوانی کردبۆوە، بواری فیکری سەرەتایی دڵپێوەبوونە بوو.

لەو سەردەمەدا زۆر لە ئەندێشمەندانی ناوبراو لە رووبەڕووی کێشەی سەرکردایەتی و رێبەرایەتی سیاسی و کەلتووری فەرانسا لە دەروونی دەولەتەکانی ئەلمانیشدا کردەوەیان لەخۆ نیشاندا. کتێبی فیختە بەناوی خیتاب بە نەتەوەی ئەڵمان لە بە ناوبانگترین ئەم رەنگدانەوە بوو. بیچمی سیاسی ئەم بزاڤە بەباشی لە دۆزی «کەلتووری میللی» فریدریش ماینکەدا بەیان کرابوو. فەرهەنگ بەشێوەی تاقانە رەنگدانەوەی ناسنامەی خەلک، لە پێش بوو و لە «حالەتی جوانی ناسنامەیەک» بەیان دەکرا. دەولەت بۆ ئەو رۆمانتیکانە دەوری پیرۆزی بوو و ئەوان لە راستیدا دۆزەکانی رۆسۆ و هێگلیان بەفراوان و فۆرمیان گۆڕیبوون. بە واژەگەلی ئەو رۆژێک نەتەوەی خاوەن فەرهەنگ و هاوێرکراو، هەم خوازیاری مافی خودموختاری بوو و هەم فێرکردن و تەعلیم ـ راستەقینەی جوانی لە خوێند بەلایی فیختەوە، ناوەرۆکەکانی دیکە، بەتایبەت دۆزی پلەبەرزی و پایینتری جۆرەکانی نەتەوەکان، هاتە ئاراوە. لەگەڵ ئەم حالەدا، روانگەی رۆمانتیک لەم دۆزە سلسلە مراتبە پێویستانە پێرەوی نەکرد. سەرەڕای ئەمە، پلە بەندی تێگەیشتنی مومکینی لە جۆری هەلسوکەوتی تایبەتی لەگەڵ زمان بوو. بەلام لە بیروبۆچوونی زۆربەی رۆمانیتکە سەرەتاییەکاندا باوەڕێکی بەهێزیان بە هاوئاهەنگی نهایی نەتەوەکان بوونی بوو. بۆ وێنە نوالیس بە ئەندێشەی دامەزراندنی سەرلەنوێی کۆمارێکی مەسیحی لە لایەن کاتولیکخوازی و زیندوو کردنەوەی ئوروپای سەدەکانی ناوەڕاست باوەڕی بوو. رۆمانتیکەکان پێوەندی تایبەت و تا رادەیەک پڕبانگەشەیان لەگەڵ دیموکراسیدا بوو. دۆزی خودموختاری، دەتوانێ بەشێوەی یەکدەست لە ناسیۆنالە سوننەتییەکان تەواوعەییار یان لە لیبرالەکاندا بوونی ببێت، ئەگەرچی لە یەکەمدا وەها نایەتە بەرچاو کە لەتەک ناسیۆنالیزم لیبرال پێوەندی نزیکتری هەیە. لەگەل بوونی

رواڵەتی ئەمر، تەنانەت بڕێک لە باوەڕەکانی فیختە دەکرێ وێنەگەلێک لە بایەخ و گرنگی خودموختاری دێموکڕاتیک تەسەور بکرێ. زۆرجار لە بیر دەچێتەوە کە فیختە یەکێک لە ستایشکارانی توندوتیژی دێموکڕاسی بە جەماوەری ژاکۆبنەکان بوو، و بە بۆچوونی بڕێک کەس هەتا ئاخریش ئەم هەڵوێستەی پاراست. لەبەر ئەمە، رۆمانتیسیزم دوو بیچمی پارێزگاری سوننەتخواز و لیبرالی بوو. ئەو هەم دەیتوانی پشتیوانی قایمی گەرایشە دێموکڕاتیکەکان و پێداچوونەوە خواز بێ و هەم قەڵای سوننەت لە بەرامبەر گۆڕانکاری بپارێزێ.

وا باشە لێرەدا بەکورتی ئاماژە بکەین کە نووسەرانی وەک لۆرد ئاکتۆن و لەم سەدەیەدا دەڵێ کدوری ناسیۆنالیزمی رۆمانتیکەکان بە کاکڵی ناوەندی ناسیۆنالیزم زانیوە، بەبۆچوونی ئەم نووسەرانە، ناسیۆنالیزم بەشێوەی گشتی ئامانجی وێران کردنێک بوو کە لە سەدەی بیستەمدا ببووە بەڵای گیانی مرۆڤایەتی. بە بۆچوونی کدوری، ئەم رێبازە وزە و هۆکاری سەرەکی لە فەلسەفەی ئەڵمان، بەتایبەت فیختە و باڵە دەرەکییەکانی دۆزگەلی کانت لەمەڕ ئازادی بەدەس هێنابوو.[٥٣] بەم حاڵەوە زۆربەی بیرمەندانی دیکە چوارچێوەیەکی بەرفراوانتریان بۆ ناسیۆنالیزم دارشتووە.

سێیەمین رێباز یان جۆری ناسیۆنالیزم «ناسیۆنالیزمی تەواو عەییار»ە کە ئێمە لە فەسڵی شەشەم واتە «فاشیزم» لەگەڵ ئەو رووبەڕوو بووین. دەربارەی ناسیۆنالیزم سۆسیالیزم لە ئەڵمان بابەتی پلەبەرزی نژاد بەشێوەی زەق و بەرچاو لە پلەی یەکەمی گرنگی دابوو، هەرچەند کە کاکڵەی ئەم لێدوانە ناسیۆنالیستییە لە سوننەتی قەومی [volk]، داروینیزمی کۆمەڵایەتی، رەسەنایەتی حەیاتی فەلسەفی و تێکەڵاوێک لە سەرچاوەکانی دیکەش هاتبووە ئاراوە. دەربارەی فاشیزمی ئیتالیا تێرامانی بنەڕەتی دەوڵەتخوازانە و بەشێوەی تاقانە سواری گۆڕەپان و گشتیخواز ئەو بوو. سەرەڕای ئەمە، هەم فاشیزمی ئیتالیا و هەم ناسیۆنال سۆسیالیزمی ئەڵمان واتای شەڕفرۆشانە، شەڕخوازانە، تاقانە شەڕانی و

ناعەقلانیان دەکردە زایەڵە و دەنگیان پێدەداوە کە دوژمنایەتی قووڵیان هەم لەگەڵ ئەنترناسیۆنال و هەم لەتەک ناسیۆنال لیبرالیان پێدەردەبڕی. بڕێک لە تۆژەرانی ژاکوبینیزمیان بە پێشەکی و پێش ئاهەنگی ناسیۆنالیزمی تەواوعەییار دەزانی. سەیر لێرە دایە کە پێوەندییەکانی نێوان ناسیۆنالیزمی تەواوعەییار و جۆرەکانی دیکەی ناسیۆنالیزم بوونی هەیە. ناسیۆنالیزم لیبرال، ناسیۆنالیزمە سوننەتخوازەکان و هەروەها تەواو عەییار هەموویان لەبەر هێندێ هۆ تا رادەیەکی جیاواز بە مەسەلەی خودموختاری دەوڵەتی میللی سەرنجی سەرەکیان پێبەخشیوە. بێ بوونی دەوڵەتە سەربەخۆکان، ناسیۆنالیزم نەیدەتوانی بوونی ببێت.[55] بە جۆرێکی دیکە، سەرکەوتنی ناسیۆنالیزم لیبرال لە سەدەی نۆزدەهەمدا هەم ڕێی بۆ ناسیۆنالیزمی تەواو عەییار خۆشکرد و گوڕ و تینی بە کێشەکانی ئەو بۆ خودموختاری بەخشی، و هەم جەوهەر و ماددەی ڕەسمی بۆ ڕێنوێنییە گشتییەکان لەمەڕ خودموختاری بەدیهێنا. سەرەڕای گشت ئەمانە، ناسیۆنالیزمی تەواو عەییار بەپێچەوانەی ناسیۆنالیزم لیبرال چاوکراوانە ئەمپریالیستی نالیبرال. ناعەقلانە و لایەنگری نیزامیگەری بوو و زۆرجار لەسەر لە پێشبوونی قەومەکان و نێونەتەوەی تایبەتی تەئکیدی بوو. بەوتەیەکی تر، ناسیۆنالیزمی تەواو عەییار زانیاری پلەبەندی لە نەتەوەکان بوو.

هەروەکو زۆربەی ئیدئۆلۆژییەکان، هێندێ دۆزگەلی ڕێکخستن ڕەسمی دەکرێ لە دەروونی ناسیۆنالیزم هەڵاوێردرێ. ڕێبازە جۆراوجۆرەکانی ناسیۆنالیزم ئەم دۆزانە بەشێوەیەکی جیاواز ڕاڤە دەکەن. ناسیۆنالیزم ئاشکرا باوەڕی هەیە کە جیهان لە نێوانی نێونەتەوەی جیاوازدا دابەشکراوە کە هەر کام خاوەنی بەردەوامی مێژوویی خۆی، زمان و چارەنووسی تایبەتی خۆیانن. ڕیشەی قووڵی نەتەوە لە ڕابردووی دایە. نەتەوە سەرچاوەی دەسەڵاتی سیاسی و کۆمەڵایەتییە و هەر تەنیا لەگەڵ بوونی دەوڵەتێک دەتوانێ بەشێوەی کامل و ڕاستەقینە بە خۆی ببەخشێ. وەتەنیش بریتییە لە کیانێک لەگەڵ سنوورە

دیاریکراوەکانی. هەر نەتەوەیەک داب و نەریت، ئایینەکان، سوننەتگەل، کەلتووری گشتی و عامیانە و نمادگەلێکی تایبەت بە خۆی هەیە کە ژێرخان و بناخەی یەکگرتوویی ئەو پێکدێنن. مەزهەبیش دەتوانێ لە ناسیۆنالیزمدا وزەیەکی بە حەرەکە دەرهێنان بێ. بەلام بە هیچ کولۆنجێک پرەنسیپی خولقێنەری زەرووری نییە. بزووتنەوەکانی لەهێستان، ئیرلەند و ئێران گران دەکرێ بێمەقوولاتی مەزەبی ببرێتە ناو مامەڵەی میللییەوە، بەم حالەوە، ئەمانە تایبەتمەندین، و هەمیشە وانییە.[٥٦] نەتەوە هەروەها خاوەنی حاکمییەتی سیاسی و ئەخلاقی و لەبەر ئەمە، شوێنی نهایی رەوا بوون و ئەمەگناسییە. ئەمەگناسی سەبارەت بە نەتەوە هەموو ئەمەگناسەکان دەگرێتە ژێر تەنینەوەی خۆی، ئەگەرچی ئەم کارە راستەقینە بە بوونی خۆیان ببەخشێ دەبێ، لە دەروونی نەتەوەیەکدا بن و لەگەل ئەو خۆیان بە هاوزات بشوبهێنن. دۆزی ناسیۆنالیزم لەوانەیە هۆکاری سەرهەلدانی دۆزگەلی بەرامبەری و برایەتی لە نێوان نێونەتەوە بێ، ئەگەرچی ئەم دۆزانە زۆرتر لە ناسیۆنالیزم لیبرالدا بەبرەوەن. سەرەنجام ئەمەکە ئەگەر سولح و عەدالەت لە سیستەمی جیهانیدا حاکم بێ، نەتەوەکان دەبێ ئازاد، سەربەخۆ و بەدوور لە هەرەشەی دەرەوە بن.

ناوەرۆکە سەرەکییەکانی کە ماوە لەم فەسلە بریتی دەبن لە سروشتی مرۆڤ، زمان، دەولەتی میللی و ئابووری میللی. ئەم ناوەرۆکانە هەلگری زۆربەی دۆزە تەنزیمکراوەکانی سەرەوە دەبن.

## سروشتی مرۆڤ

زۆرجار گوتراوە کە ناسیۆنالیزم ئەندێشەی لەمەر سروشتی مرۆڤ نییە.[٥٧] روالەتەن بۆ ئەم کارە پێنج هۆی مەزن بوونی هەیە. یەکەم ئەمەکە لایەنگرانی ناسیۆنالیزم لەمەر سروشتی مرۆڤ زۆر بابەتیان نەنووسیوە. لەم رووەوە، ئەم خالە بابەتی سەرقالی بۆچوونی یان بە کردەوە رووبەروو نەبووە. دووەم

ئەمەکە لە هێندێ شوێندا کە ناسیۆنالیستەکان بەم بابەتەوە سەرقاڵ دەبن، ئەم بابەتە لە دەروونی ڕوانگەکانی ناسیۆنالیستە جۆراوجۆرەکان یان ڕێبازگەلێکدا دەیگونجێنن کە بەر لەمە ئاماژەمان بەوان کردووە. بۆ وێنە لای بروک، موار، باریس یان ترایتچک ڕوانگەی پارێزکارانە و سوننەتخوازانەی جیاوازتر و شوناس پەزێرتر بوونی هەیە، ئێستە ئەوەکە ماتزینی و جان ستوارت میل ئاشکرا لەگەڵ ناوەڕۆکگەلی لیبرالی ڕووبەڕوو دەبینەوە. خوێندنەوەی جیاوازتر و تەنیاتر لەمەڕ سروشتی مرۆڤ دەکرێ لە ناسیۆنالیزمی تەواو عەییار، بەتایبەت لە ناسیۆناڵ سۆسیالیزم، ببیندرێ کە بابەتی نژاد لە ڕاڤەی سروشتی ڕاستەقینەی بوونەوەری مرۆڤایەتیدا گرنگی حەیاتی بە خۆوە دێنێ. سێیەم ئەمەکە ، هۆکاری شاراوەی بە لەمپەرکراو لە ڕێنوێنی ناسیۆنالیستیدا بوونی هەیە. ئەگەر مرۆڤەکان بەدیهێنەری نەتەوەی خۆیانن، کەوایە دەکرێ بەو ئاکامە بگەین کە سروشتی هاوبەشی قابیلی هاوێربوونی نییە، چونکە ناسنامەی مرۆڤ لە دەروونی تاقمە نەتەوە جۆربەجۆرەکاندا فۆرم دەگرێ، بەرتەسکی کامڵ بۆ ئەم باوەڕە بوونی نییە. بۆ وێنە هەردر ئەگەرچی بەڕاستی لایەنگری جۆربەجۆری نەتەوەی مرۆڤ بوو، دەیگوت مرۆڤایەتییەکی هاوبەشبوونی هەیە کە لە جیاوازی نەتەوایەتی کاریگەری وەرناگری. چوارەم ئەمەکە، بەهۆی تەئکیدی مێژوویی توندی برێک لە ناسیۆنالیستەکان، مانایەکمان هەیە کە لەبەر ئەوە سروشتی مرۆڤ هەمیشە لە جووڵانە. ئەگەر ئەم سروشتە جووڵانێکی دایمی بێ کەوابێ چۆن دەکرێ ئەوە بە شێوەی کامڵ وەسف بکرێ؟ کاکڵ و ناوەڕۆکی سابت یان ئیستمرار قابیلی شوناس بوونی نییە. پێنجەم ئەمەکە، تەئکیدی ڕۆمانتیکی برێک ئەندیشەگەلی ناسیۆنالیستی لەسەر خۆخولقاندن و فۆرم دان بەخۆ (Bildung) مانای گۆڕانپەزێری و جووڵان لە سروشتی مرۆڤایەتی بەهێز دەکا. ئەگەر ناسیۆنالیزم لەسەرخۆ دیاری کردن یان فۆرم دان بە خۆ ڕێنوێنی هەیە، کەوابێ ناسیۆنالیستەکان تا ڕادەیەکی زۆر سروشتی خۆی لە لایەن یان بە هۆی خەیاڵ و

تەسەور، فەرهەنگ و زمان دەخولقێنێ. ئەم خوو و رەوشتانە بەردەوام لە حالی دروست کردنەوە و قالبگیری سەرلەنوێ، بەم جۆرە، جەوهەرێکی سابت کە بکرێ لە سروشتی مرۆڤایەتیدا بناسرێ، بوونی نییە.

بەپێچەوانەی دەسەلاتی خالگەلی سەرەوە، هێندێ لایەن لە سروشتی مرۆڤدا بوونی هەیە کە ناسینی ئەوانە بەلای زۆربەی نووسەرانی ناسیۆنالیستەوە ئاسانە. بوونی واتایەک لە سروشتی مرۆڤدا بە مانای ئەوە نییە کە هەموو مرۆڤەکان یەکسانن. ئەوەی کە لە رواڵەتا ناسیۆنالیزم لەسەر ئەوە تەئکید دەکا ئەمەیە کە مرۆڤەکان لە باری پێکهاتەی بوونەوەرییەوە کۆمەلایەتین. ئەم بوونەوەرە کۆمەلایەتیانە، دەورگەلی تەنیایی، بایەخەکان و پلە و پایەکان و دۆزەکانی خۆیان لە دەروونی نەتەوەگەلێکدا بە دەسدێنن کە تاقمە کۆمەلایەتییەکان بنەمایتر دێنە ئەژمار. ئاکامەکانی ئەم نێونجییە دەبێ زۆر جیاواز بێ، چونکە تاقمە میللییە جیاوازەکان هێندێ سیستمی بایەخی جیاواز دروست دەکەن، بەلام بارودۆخێک کە لەودا مرۆڤەکان جیاوازی خۆیان نیشان دەدەن، کەمتاکورت بۆ هەموو جۆرەکان هاوبەشە. لەبەر ئەمە، بە بۆچوونی ناسیۆنالیستەکان هەموو مرۆڤەکان لێهاتوویی سەربەخۆیی تاکی و دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان هەیە. بێجگەلەمە، «خودی» مرۆڤ ریشەی لە کۆمەلگەدا هەیە؛ سەرەنجام ئەمەکە مرۆڤەکان لە لایەن جەماوەری نەتەوەی خۆیانەوە خۆیان ئاشکرا دەکەن و دەوام بە خۆیان دەدەن. بۆچوون دوایی لەگەل بەلگەی ئەخلاقی و زمانی ئیستیعارەی بەم کێشە دەگا کە نەتەوە دەتوانێ لە دەروونی کۆمەلگەی نێونەتەوایەتیدا خۆی بە راستەقینە بگەیێنێ.

سەرجەم ناسیۆنالیستەکان لە دەستەبەندی خووی سروشتی مرۆڤ رازی نین. لەوە دەچێ برێکیان لەگەل ئەم بەلگانە کە تاقمە نەتەوایەتییە جیاوازەکان دەتوانن بایەخەکان و پلە و پایەی خۆیان و پرۆژەکانی ژیانی خۆیان دیاری بکەن، هەست بە ئاستەنگی بکەن. بۆ وێنە ناسیۆنالیستە لیبرالەکان رەنگە بەلگە بێننەوە

کە نەبوونی مداخلە و ئاسانکاری نێوان نەتەوەکان هەڵقولاوە لە پێویست و زەرووری بوونی نەبوونی موداخلە و بێزیانییە. ئەگەر نەتەوەیەک زیان بە نەتەوەکانی دیکە بگەیێنێ، دوا بوارێک بۆ دەستێوەردان و سەپاندنی واتای دروستیکردەوەی مرۆڤایەتی بوونی هەیە. هێندێ لە لیبرالەکان لەمە بالاتر دەڕۆن دەربارەی سەرجەم بوونەوەری مرۆڤایەتی تەئکید دەکەن و ئەم بەیانە گرنگە رادەگەیێنن کە تایبەتمەندییەکانی کەلتووری تەنیایی بێزیان هەم بۆ قبوولکردن دەبێ و هەم مرۆڤایەتی دەولەمەند دەکا. بەم جۆرە، لە روانگەی ناسیۆنالیستە لیبرالەکانەوە بە چاوپۆشی لە وەتەنپەرستی تەنیایی ئەوان، هێشتا هۆکاری سەرەکی ئەخلاقی هاوبەش بۆ گشت مرۆڤەکان بوونی هەیە کە دەبێ سەرنجیان بدرێتێ.

پێچراوەترین و شاراوەترین رێنوێنی و بەڵگەیەک کە بە بابەتەکانی سەرەوە چاوەڕوان دەکرێ ئەوەیە کە ئەگەر لە برێک بابەخگەلی لیبرالی لە بواری سیاسی و ئەخلاقیدا ریشەیان هەیە کەوابێ ئەندامی نەتەوە دەتوانن بێ‌پلانی پرسیاری لەمەڕ ناسیۆنالیزم خۆیان دروست بکەن و فۆرمی پێ‌دەن. دەبێ ئەمە بە لیبرالیزمی ریشەدار ناودێر بکەین. لەم بۆچوونەی دوایدا، کە بەشێوەی دەروونی لەسەر جیهانی بوونی دۆزەکانی لیبرالی رێنوێنی دەکرێ، دێتە بەرچاو کە لیبرالەکان بەشێوەی دەروونی کاکڵ یان جەوهەری ئەوەی کە تاکەکان دەبێ بخوازن یان مەیلیان بێنێ، پێشنیار بکەن. ئەوان هەروەها وەک ئاماژە لە دووردوە باوەڕیان هەیە کە ئێمە دەبێ ئەم ناوەڕۆکە لە لایەن پرۆژەگەلی بنیادی حکوومەتی لیبرال «ریشەدار» بە راستەقینە بگەیێنین. لەم باوەڕەدا راستەقینەیەک هەیە کە لیبرالەکان، تەنانەت کاتێک کە بێزاری خۆیان لە ئاست ناسیۆنالیزم دەردەبڕن، لەسەر بواری یەکە نەتەوە یان خاسییەکانی سەرەتایی وەکو بەرانبەری، ئازادی و مافەکانی تاک پێدادەگرن و تەئکید دەکەن. لەبەر ئەمە ئەوان هەر تەنیا مەسەلەی ناسیۆنالیزم ناکەنە لایەنی دەربڕینیان چونکە بابەخەکانی لیبرالی ریشەی لە دەروونی جەماوەردا نییە.

باوەڕێک کە هەتا ڕادەیەک بەسەر کێشەی «ڕیشەداری»دا هێڵی باتڵ و گەندەڵی دەکێشێ پشتگر و پاڵپشتی سەرەکی ڕێنوێنی ناسیۆنالیستیکی دیکەیە. بەم چەشنە ڕەچەڵەکناسی بوونەوەری مرۆڤ لە نێوان حەز و مەیلی دەروونناسی ئەوان و واتا ئەخلاقی و سیاسییەکانی ئەوانی بەشێوەیەکی زەق لە نێوان کۆماکان و جەماوەردا لەگەڵ مێژووە جیاوازەکانی ئەوان حەرەکە دەکا. تەنانەت توندتر لەو، ئەگەر سروشتی مرۆڤەکان بە مێژووە کەلتوورییەکان کەم ببێتەوە و بەتایبەت زمانەکان جیا بکاتەوە، کەوابێ سروشتی مرۆڤ هەر تەنیا لایەنێک لە زمانە جیاوازەکان دەبێ. بە جۆرێکی دیکە، سروشتی مرۆڤ لە لایەن چیرۆکەکان یان ڕاپۆرتەکانی زمانناسی جیاوازانەوە بەیان دەکرێ کە ڕیشەی لە قەومە جۆراوجۆرەکاندا هەیە. سروشتی مرۆڤ لە ناخی زمانە جۆراوجۆرەکاندا «فۆرمی گرتووە». لەبەر ئەمە، ناتوانین بە هیچ چەشنە هۆکارێکی بەرچاو، یان دەروونناسی بوونەوەری مرۆڤ لە دەرەوەی هەرێمی ڕواڵەتی وتارە نەتەوایەتییەکان دەستمان پێی ڕابگات. بەم جۆرە، ناسیۆنالیزم لیبراڵ لەم ئاستەدا ڕەنگە هیچ پاڵپشتێکی بالاتر لە ڕاپۆرتی لیبراڵی ناوخۆی تایبەت نەبێ. بەم بۆنەوە مانای ڕیشەداری باوەڕەکانی لیبراڵی بەتەواو مانا بە هەند دەگیرێ.

لەگەڵ ئەم حاڵەدا، بە پاڵپشتی لە ڕادەبەدەر لەسەر ناوەڕۆکی ڕیشەداری، ڕواڵەتەن هەر چەشنە مانایەکی ژێر تیشکی سروشتی مرۆڤ لە کیسی دەدەین. سەر هەودایەکی لانی کەم پێچراوە لە ڕاپۆرتەکان و چیرۆکەکانی ناسیۆنالیستی بوونی هەیە کە هەرکام لەوانە واتایەک لە سروشتی مرۆڤ پێکدەهێنێ. خودی واتا بەهۆی چیرۆکەکان و ڕاپۆرتگەلی زۆرەوە خولقێندراوە. بۆ واتای سروشتی مرۆڤ، بێجگەلە وتارگەلێکی نەتەوایەتی جۆراوجۆر هیچ ئاماژەیەک نەکراوە. هەڵبەتە ئەو جۆرە کە لەمەوبەر باسکرا، هەموو بیرمەندانی ناسیۆنالیست بە کردەوە لەگەڵ باوەڕی ناوبراودا نین. هەر دەر و ماتزینی گوتویانە مرۆڤایەتی هاوبەش بالاتر لە نەتەوە تایبەتەکان بوونی هەیە. سەرەڕای ئەمە، بێجگەلەمە کێشە،

عاقلانەیە کە پرسیار بکەین بۆچی دەبێ بەرەو شتێک بەناوی «سروشتی مرۆڤ» بگەڕێینەوە کە هیچ شتێک لە دەرەوەی هەرێمی ئەو بۆ گەڕانەوە بوونی نییە. پێوەندی دێڕی پێشوو چییە و ئایا ئەمە هەر تەنیا وردبینییەکی زانستییە؟ تەنیا ڕێی چارەی ئەم پارادۆکسە ئەمەیە کە باوەڕیان ببێت. هەرچی ناسیۆنالیستەکان لە ڕاپۆرتە جۆراوجۆرەکانی خۆیاندا سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ دەیخەنەڕوو وەسفی جیاوازی دەرەکییەکانە. لە بناخەی ئەم جیاوازیانەدا تایبەتمەندگەلێکی مرۆڤایەتی قووڵتر بوونی هەیە ژێرخان و ژێربینای هەموو خەڵک پێکدەهێنێ. لەبەر ئەمە، وەسفە میللییەکان رووبینای (سەرخان) کۆمایەک لە خەڵک دروست؛ لەژێرخانی ئەودا چالاکیە هاوبەشییەکانی مرۆڤ ـ زاین، بە دەسهێنان و فێربوون، ئەوینی بەردەوام مردن بوونی هەیە کە بابەتی زانستی هاوبەشن. ژیان لە هەر کۆمەڵگەیەکدا زۆرتر دەورەیەکە کە زۆربەی ژیانی ڕۆژانەی خۆمان لەگەڵ ئەو ڕادەبوێرین. بەم حاڵەوە لەگەڵ گوتنی ئەمە هێشتا دەتوانین کێشە بکەین کە لەژێر ئەم سنوورەدا شتێکی هاوبەش لە مرۆڤایەتی بوونی هەیە. ئەم شێوە کردەوە هاوبەشە کە لە ڕووبەڕووی ڕاستیە سەرەکییەکانی لە دایکبوون و مەرگ و وەکو ئەوانە کردەوە لەخۆ نیشان بدەین. بەم بۆنەوە، ئەمە ڕاستە کە دەبوایە جیهانمان نەتەوەخوازانە دیبایە بەو مانایە نییە کە ئەم زانیارییە بۆچونیانە لایەنگەلێکی پڕەنسیپی یان شێوەی کردارە سەرەکییەکانی مرۆڤایەتی هاوبەش دەشارێتەوە.

سەرەڕای ئەمە، دوورە لەوە کە چاوی تیژبین و وردبینی لایەنگرانی ناسیۆنالیزم بکەوێتە ژێر کاریگەری ڕێنوێنییەکانی سەرەوە. فەرهەنگەکان و نەتەوە جۆراوجۆرەکان، عەمەل و کردەوەی نزیکایەتی، لە دایکبوون و مەرگ بەتەواوی بەشێوەی جیاواز ڕاڤە دەکەن. لەگەڵ ئەمەدا، دژایەتی نێوان «سروشتی مرۆڤی هاوبەشی بوون» یان «سروشتی مرۆڤ لە دەروونی نەتەوەی جۆربەجۆردا دروست دەکرێ لەوانەیە زۆر توند و بەهێز بێ. بە بیر و بۆچوونی من، ڕێیەکی مامناوەندی بوونی هەیە. ئەو جۆرە کە لەسەرەوە گوترا،

ناسیۆنالیزم بڕێک لە لێکۆلینەوە ڕەسمییەکان لەمەڕ بوونەوەری مرۆڤ پەسند دەکا: ئێمە مەخلووقاتی خودموختار و داهێنەری کەلتوورین؛ «خودی» مرۆڤ بەشێوەی کۆمەلایەتی پەروەردە کراوە؛ و مرۆڤەکان خۆیان لە لایەن جەماوەری نەتەوەیەوە خۆ دەدۆزنەوە و بە ڕاستەقینە دەگەن. ئەم تێز و لێکۆلینەوەیە ڕەنگە واتای ڕێکخستنی سروشتی مرۆڤ بخەنە قالبەوە. بەلام شێوازی لێکدانەوەی ناسیۆنالیستەکان زۆر جیاوازە. یەکەم تێز پێوەندی بە خودموختارییەوە دەبێ. ناسیۆنالیزم هەمیشە لەم ڕێنوێنییەی لیبرالی بۆ خودگەردانی (خۆبەڕێوەبەری) بەهرە وەردەگرێ. لە ڕاستیدا گشت ناسیۆنالیستەکان باوەڕیان بەوە نییە کە هەموو تاکەکانی مرۆڤ ئەم لێهاتوویی و شایستەگییەیان هەیە، ئەگەرچی ناسیۆنالیستە لیبرالەکان وەها باوەڕێکیان هەیە.[59] لە بینینی ناسیۆنالیستە لیبرالەکانەوە خودموختاری تاک هێشتا سازگار لەگەل خودموختاری میللی لیبرالە. هاوکات لەگەل ئەمە، دەبێ بەم خالەی دوایی زیاد بکرێ و ئەوە ئەمەیە کە ناسیۆنالیستە لیبرالەکانی پارادۆکس پێوەندی نێوان خودموختاری تاک و خودموختاری میللی چارەسەر ناکەن.[60] ناسیۆنالیستە لیبرالەکان لەسەر ئەو باوەڕەن کە تاکەکان بتوانن لە دەرەوەی نەتەوەی خۆیان بوونیان ببێت، بەلکو تاکەکان ئازادی لەگەل ئامێرە کەلتوورییەکان بەکار دەبەن.[61] ناسیۆنالیستەکانی دیکە، بەتایبەت ناسیۆنالیستە تەواو عەییارەکان و باقی سوننەتخوازەکان تاکەکان زۆرتر بە بەرهەمی ڕاستەوخۆی جەماوەری نەتەوە و میللی و یان نژادێک دەزانن کە بە کردەوە دیل و کۆیلەی فەرهەنگەکان، یان نەتەوەی خۆیانن. هێندێ لێکدانەوەگەلی ڕۆمانتیکیش بەتایبەت بەو جۆرەن. لەگەل ئەمەشدا، هێشتا خالێکی سەرەکی لە کێشەی دوایی دایە کە نەتەوەکان خودموختار و سەربەخۆن یان دەبێ ببن. ئەوەی کە لێرەدا هەمانە جێگۆڕکێیەکی نادیار و شاراوە لە ڕێنوێنی خودموختاری لە تاکەوە بۆ ئاستی کۆیە. نەتەوە لە ئاستێکی بالاتر لە تاک یان

خـۆی خودموختـاری بـه دەسـدێنێ. سـەرەڕای ئەمـە، لـە هـەموو ئـەم بـاوەڕە جۆراوجۆرانەدا، خودموختاری کەم و زۆر کردارێکی حەیاتییە.[62]

تێز و لێکۆلینەوەکانی دووەم و سێیەم لەمـەڕ سروشـتی مـرۆڤ دەتـوانن بـە بەراوردی راستەوخۆ لەگەڵ بزاڤی کۆخوازی هاوچەرخ، کە لایـەنگرانی سـەرەکی ئەو هاودەنگ لەگەڵ زێهنییەتی ناسیۆنالیستین، بەشێوەی بەردەوام دەخرێنە بـەر لێدوان.[63] لێکۆلینەوە سـەرەکی هـەم ناسـیۆنالیزم و هـەم کۆخـوازی لەسـەر ئـەم باوەڕەن کە باشییەکانی سیاسی و ئەخلاقی ناکرێ لەگەڵ ڕێنوێنییەکی گـشتی لـە بێخ‌هاتوو دەسنیشان بکرێ، بەلکو ئەوان لە دەرەوە لە جـەماوەری مێـژووی یـان خود نەتەوایەتی تایبەت سەرچاوە دەگـرن. هـیچ پێـشمەرج یـان دۆزی بـێ‌لایـەن بوونی نییە کە بکرێ ئەندێشەیـەک بـەپێی ئـەو سـاز بـدرێ. دووەم، کۆمـەڵ یـان نەتەوە بنـەمای عـەقل، بایـەخ و دادوەری سیاسـی و بـەکردەوە پێکـدەهێنێ. بـەم چەشنە تایبەتمەنـدی کۆبوونـەوەی مێـژوویـی زۆرتـر لـە لایـەن کۆخوازەکـان و ناسیۆنالیستەکان دژ بە کێشەی جیهانی بوونی لیبرالی دەسنیشان دەکرێ. سێیەم ئەمەکە، خۆی یان تاک لەگەڵ کـۆ، یـان نـەتـەوە فـۆرم دەگـرێ. چـوارەم ئەمەکـە بنەڕەتـەکانی ئـەخلاقی یـان عـەقلانی جیهـانی دەرەوە بوونیـان نییـە کـە بکـرێ کۆبوونەوەی مێژوویی و نەتەوەکان لە دەرەوەی ئەوان دابنرێ. جگە لەمە ئێمە بە بنەماگـەلێکی بۆچـوونی بـۆ ژیـانی کۆمەلایـەتی یـان نەتەوایـەتی بـەکردەوە پێویستمان نییە؛ بەلکو ئەوە لە راڤەگەلێکی لـە پـێش دروسـتکراوی سـوننەت یـان شـێوەی ژیـان بـەدەس دێـنین. کـردەوە لـە کۆبوونـەوە جیـاواز لـە ڕێنوێنییـە فەلسەفیەکانە.[64] ئەم دۆزە کۆمەلایەتییە شێوەیەکی بەڕاستی بوونـەوەری مرۆڤـی پانتای پێـشبڕکێی نێـوان ڕێبـازە جۆراوجۆرەکـانی ناسـیۆنالیزم نییـە. ئەگـەرچی شێوەی خوێندنەوەی ئەو بۆ لێدوان والای کردووە. ناسیۆنالیستە لیبرالەکان مایـل نین کە واتای بێ‌بایەختر و کـوێر لـە کۆبوونـەوەدا هەلـبژێرن کـە لەگـەڵ ئـازادی تاکـەکان کـۆک نییـە. ناسیۆنالیـستە سـوننەتی و تـەواو عـەیارەکان بـاوەڕێکی

بەهێزتریان بە تێگەیشتن لە کۆبوونەوە هەیە کە تاکەکان لیبراوانە لە دەروونی میتۆدە نەتەوایەتییەکان یان نژادیدا جێدەکەنەوە. ناسیۆنالیستە تەواو عەییارەکان دەیانەوێ لایەنی نەتەوەکانی لە پێشتر یان لە پاشتریشی پێوە زیاد بکەن.

جیاوازییە عومدەکانی نێوان ناسیونالیستەکان و کۆخوازەکان ئەوەیە کە دەستەی دووەم لەمەڕ کۆبوونەوە لە ئاستێکی بۆچوونی ڕێنوێنی دەکەن، ئێستا کە ناسیونالیستەکان بە ئاشکرا بە دووی سازدانی ناوەڕۆکێکی بە کردەوە دەوڵەمەندەوە بوون. ملیۆنەها مرۆڤ لەسەرانسەری جیهان بوونیان هەیە کە خۆیان لەگەڵ نەتەوەیەک هاوزات دەشوبهێنن و لەم هاوزات شوبهاندنەدا راستەوخۆ هۆکار بە دەسدێنن. کۆخوازانێک کە لەسەر حەسارێک پێ‌دادەگرن ناتوانن لە بەرامبەر ئەم راستییەدا بوێستن. بێجگەلەمە، ناسیونالیستەکان تێدەکۆشن تاکو نەتەوەکان راستەوخۆ لەگەڵ دەوڵەتەکان هاوزات بکەن. سەیر ئەوەیە کە کۆخوازەکان لەمەڕ ئەم بابەتە چاویان نووقاندووە و جگە لە بڕێک جار هەوڵیان نەداوە تاکو واتاگەلی کۆمەلایەتی خۆیان لەگەڵ دەوڵەتی مافەکان گرێ بدەن.[٦٥] ئەگەرچی کۆخوازەکان لەگەڵ مەسەلەی زیادی رووبەڕوو کە زۆر لە جەماوەر و ئەنجوومەنەکان «وەکو کلیساکان تایەفەیان ئەسناف» بالای دەوڵەتەکانن کە پێوەندی دەوڵەت/ کۆبوونەوە دووچاری گرفتێکی گەورەی دەکەن. هاوکات لەگەڵ ئەمە، ئەم گرفتە تایبەتە بۆ ناسیۆنالیزم و قەومخوازی نا ئاشنا نییە. سەرەنجام ئەمە کە، کۆخوازی لە زۆربەی بەرهەمەکانی خۆیدا، لە ناسیۆنالیزم بە شێوەی رزگاری و قوتار لە رەخنە مێژوویی‌یەکانی رەخنەی نەگرتووە. سەیر ئەوەیە کە ئەوەی لە کۆخوازیدا دەبینین، هەر ئەو «ناسیۆنالیزم لیبرالی»یەیە لە بیچمێکی دیکە دایە. واتای مایکل سەندل لە «مەسەلەی خۆی» لە دەروونی جەماوەرێکی لیبرالی فۆرمی گرتووە. چارلیز تایلۆر تێدەکۆشی تاکو تاکخوازی لیبرالی ئەخلاقی راستەقینە یان ناسنامەیەکی نوێ لە لاری نەجات بدا.

داکۆکی مایکل والزێر لە پانتاگەلی خاس باوەڕی پێچڕاوەتر بۆ کۆمەڵگەی لیبرالی چەپی زۆرخوازە.[٦٦]

بەیانی کۆتایی لەمەڕ سروشتی مرۆڤ و پێوەندی ناسیۆنالیزم: ناوەڕۆکەکانی ناوەندی کە لە دۆزی ڕۆمانتیکدا بوونی هەیە «خودئافەرینی»یە کە ڕەنگە بە شێوەی جوانترین لایەنی باوەڕی خودموختاری مامەڵە و چاوی لێبکرێ. ئەم فیکرە لە سوننەتی فەلسەفی ئەڵماندا وەبیرهێنەوەی دۆزی فێرکردن و پەروەردە بوو.[٦٧] لە دۆزی ڕۆمانتیک، خودئافەرینی، یان خۆخوڵقاندن، و داهێنان و نوی خوڵقاندن ڕەنگ دانەوەی لەسەر ئاشکرا کردن یان تەسەور هەیە و لەپێشتردە دۆزی فێرکردن و پەروەردە پێگەیەکی وردبینی لە واژەگەلی ناسیونالیستیدا هەیە کە زۆرتر بە باشی تاوتوێ نەکراوە ـ هەرچەند کە تایبەتمەندانە لەگەڵ ناسیۆنالیزم پێوەندی نییە. لە ناسیۆنالیزم و زۆربەی ئەندیشەی فێرکردن و پەروەردە، ئامانج بریتییە لە بە دەسهێنانی هاوئەهەنگی و ئازادی دەروونی. ئازادی لە بناخەوە بریتییە لە خودموختاری و پرۆژەی فێربوون و پەروەردەی خودی شەخس. ئەگەر ئەو جۆرە کە زۆربەی نووسەرانی ناسیونالیست کێشەی لەسەر دەکەن، خۆی لە دەرەوەی پێکهاتەی نەتەوە فۆرم دەگرێ، کە واتە خۆپەروەری خۆی لە خۆیدا نەتەوەپەروەرییە. ئەم کێشە بەتایبەت لە باوەڕکانی گرێبەستکراو بە زمانەوە دەبینرێ. بە بۆچوونی هەردر، زمان «ئەندامی هێزی ڕۆحە لە حوکمی ئامێری دەروونی ترین فێرکردن و پەروەردە و فێرکردن و پەروەردەی ئێمەیە».[٦٨] هەردر زمان هەر تەنیا بە ئامێر یان کەرەسەی وەدو نەکەوتن نازانێ بەڵکو ئەوە بە دەسەڵاتی مەعنەوی چالاکییەک دەشوبهێنێ کە ڕاستەقینە پێکدەهێنێ. بە بۆچوونی هەردر، هەر زمانێکی ڕۆحی جیاوازی هەیە و سەرچاوەی فێرکردن و تەعلیمی هەر نەتەوە و تاکەکانی ناخی ئەو دێتە ئەژمار ئەم خاڵە بە مەکۆی زمان بۆ ناسیۆنالیزم بە ئەنجام دەگا.

# زمانەکان و نەتەوەکان

کەسێک کە ئەم باوەڕە بێنێتە ئارا کە دەوڵەتەکان لە پلەی یەکەمی هەستیگەلی زماننناسی تاقانەدان، دەبێ هێندێ گومانە سەرەتایەکانیان بخەنە پشتگوێ و چاوی لێبقووچێنن، ئەگەر کەسێک دەس بکا بە توێژینەوە زۆرینەی دەوڵەتەکانی سەردەم بەتەواوی دەردەکەوێ کە کۆماگەلی زمانی جیاوازی هەر وڵاتێک بوونی هەیە، و ئەگەریش کە لە زۆربەی وڵاتەکان بە هێندێ زمانەکان کەسانێکی زۆرتر ئاخاوتن یان دیالۆگ بکەن. لەگەڵ ئەمەدا، لە هێندێ لە دەوڵەتە میللییەکاندا زمانگەلی حاکم و زالبوونی نییە. بۆ وێنە سویس چوار زمانی رەسمی هەیە. بێجگەلە مەش، ئەگەرچی زۆربەی خوێندکارانی ئاستی بالای سویسی بە زمان و زاراوەی ئەلمانی قسە دەکەن، دوورە کە دانیشتوانی رووهێر، یان باواریا [لە ئەلمان] هەمیشە بە رووونی لە زاراوەی ئەوان تێبگەن. نۆرویژ و دانیمارک بەتەواوی زمانی وێکچوو و هەڵقولاوەی قەومێکی یەک دەستیان هەیە، بەلام خۆیان نەتەوەیەکی جیا لە یەک دەزانن. لە راستیدا زمانی نۆرویژی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا هەر هەمان زمانی دانمارکی بووە. هەر دانیمارکییەکی خوێندکار دەتوانێ بە ئاسانی ئاسەواری ئیسبن بخوێنێتەوە. زمانی نۆرویژی بە شێوەی هەستیەکی جیاوازانە داهێنانەکانی ناسیونالیستی ئەم سەدەیە «سەدەی بیستەم» سەرەنجام ئەمە کە زۆرتر زمانەکان لە دەروونی دەوڵەتێکی میللیدا بوونیان هەیە و لە دەوڵەتە میللییە جیاوازەکاندا بە زمانێکی یەکگرتوو قسە دەکرێ. هەروەها تاقمە میللییە جیاوازەکان لە دەروونی دەوڵەتدا بوونی هەیە. بۆ وێنە ئەسکاتلەند و وێلز لە بریتانیا (ئەگەرچی نەک تایبەتمەندانە) بە زمانی یەکگرتوو قسە دەکەن. سەرەنجام ئەمەکە زاراوە ناوچەییە جۆراوجۆرەکانی زمانی یەکگرتوو پێ دەچێ باش تێگەیێنی بۆ یەکتر دژوار بێ. خاڵی حەیاتی دەربارەی زمان ئەمەیە کە ئایا دەکرێ لەوە بۆ جیاکردنەوەی نەتەوەکان کەلک وەربگیرێ؟ لە رواڵەتا وەلام نێگەتیڤییە. زمان ڕواڵەتەن ئامێرێکی راست و ئاشکرا بۆ دەسنیشان کردنی ناسنامەی سەربەخۆی میللی نییە.

بەپێچەوانەی ئەم خاڵە، زمان پێگەی باڵای لە لێدوانی ناسیونالیستیدا بە خۆی تایبەت داوە. هۆی ئەم کارە دەکرێ بە دوو پانتای بەرفراوان دابەش بکرێ: بوارە مێژوویی‌یەکان/ ئەزموونی و بوارە میتۆدەکان.

لە بوارەکانی مێژوویی/ ئەزموونی بەتەواوی وەلانانی ناوەندی زمان بۆ نەتەوەکان کارێکی دژوارە. ئەو جۆرە کە هابس بادن دەنووسێ: «بە گرانی دەکرێ قبووڵ بکرێ خەڵکێک کە پێکەوە ژیان دەکەن، بەڵام بە زمانگەلێکی نادیار بۆ یەکتر قسە بکەن خۆیان بە ناوی وتەبێژانی زمانێکی تاقانە بناسن».[69] ئەو جۆرە کە زۆربەی لایەنگرانی ئەندێشەی نوێسازی گوتویانە زمان، بەتایبەت هەمەلایەنەی زمانی، هۆکاری حەیاتی لە پەرە گرتنی دەوڵەتەکان و وڵاتەکانن و وەک هەمیشە لە لایەن سیاسەتەکانی فێرکردنی دەوڵەتەوە هان و پشتگری دەکرێن. هەروەها بەرامبەری و سازگاری زمانی لە زۆربەی وڵاتەکان لە باری چوونەناو کوی شارەزایانی ئەدەبی، ئیداری و سیاسی و هەروەها لە حوکمی ئامێری سەرەکی بۆ ئاسانکردنی پێوەندییەکان و بازاڕە ئابوورییەکانی ناوخۆ گرنگی حەیاتی هەیە. زۆر لە دەوڵەتەکان و وڵاتەکانی کۆخواز و رووڵەپەرە لە کۆتایەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەدەی بیستەم، تەنانەت سیستمە لیبراڵەکان، دەربارەی لەسەر چوونی ئەم سیاسەتە هەمەلایەنەی زمانی زۆر بڕیا سەختگیربوون. یەکەم وێنە لەم چالاکییە دەوڵەتیە چاوکراوانە، سیاسەتی ژاکۆبنەکان پاش ١٧٨٩ [شۆڕشی کە بیری فەڕانسا] بوو.[70] ژاکۆبنەکان زمانی فەڕانسەیان بەزۆر بەسەر وڵاتا سەپاند. هیچ چەشنە زۆرێکی قەومییەت نەدەسەپێنرا.

خاڵی شایانی باس دەربارەی چەمکە باڵاکان ئەوەیە کە تەنانەت ئەگەر زمان دەوری نوێخوازی گرنگ دەگێڕێ، زۆرتر بەرهەمی درۆ و کەڵەکە، چ ئامانجی دەوڵەتی کۆ بێ چ جیاوازی لەو. زۆرتر هۆکاری کێشەی ناسیونالیستی دەربارەی زمان لەسەر بنەمای سروشتی بوون و دێرینە بوونی ئەوە. بەم حاڵەوە، ئەو جۆرە کە لەوەبەر باسکرا، زمانی تایبەتی نۆرویژی داهێنانی سەدەی بیستەم بوو. بەر

لەو ئەم زمانە لە راستیدا هەر هەمان دانمارکی بوو. یان کولا، شاعیری سەرەتای ١٨٠٠ ئەسلوواک، باوەڕی هەیە (لەژێر تەئسیری هەردر) کە زمانێکی خالیس و بێخەوشی چک ئەسلوواک بوونی هەیە. ئەگەرچی زمانی چک لەودا زمانێکی گوندی بوو، کولار خوازیاری ئەوە بوو کە بە ناوی یەکێک لە زمانەکانی ئەدەبی ئەسلاو بە رەسمییەت بناسرێ (لەپاڵ زمانە روسییەکان، لەهێستانی و سربی ـ کرواتی). زۆر لە ئەسلوواکییەکان لەژێر کاریگەری ئەم باوەڕەدا نەبوون. زۆر کەس بۆ جێخستنی زمانی سربی ـ کرواتی بەناوی زاراوەیەکی گرنگی ئەسلاوە باشوورییەکان چالاکیگەلێکی ئەدەبی ئەوتۆیان ئەنجامدا. سربی ـ کرواتیش لەسەرەتاوە بەناوی زمانێکی ئەدەبی و قەومی لە دەیەی ١٨٣٠ برەوی پەیدا کرا. زمانە گالیسییەکان، کاتالان، باسک (ئەسکوارا) و گالیک هەموویان رەنگیان داوە و لە لایەن زماناسانی ناسیونالیستەوە دمەزەرد و چەق و ساو کرانەوە و بەتایبەت لە سەدەی نۆزدەهەمدا چوونە ناو ئەدەبیاتی ناسیونالیستی.[٧١]

یەکێک لە باوەڕە سەرەکییەکان لە نووسراوەی نوێدا کە لەسەر گرنگی مێژووی زمان بۆ ناسیۆنالیزم تەئکید و هەروەها لەسەر دەسکردبوونی ئەو سوورە، باوەڕگەلی مەوجوود لە کتێبی بێندیکت ئاندێرسۆنە. بە بۆچوونی ئاندێرسۆن نەتەوەکان بەشێوەی گشتی «جەماوەری ئەندێشەیی»، دروستکراوی کەلتوورن کە لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم لەسەر بنەمای زمانە هەرێمی و ناوخۆیەکان خوڵقێندران. بەبڕوای ئەو، نەتەوەکان لە راستیدا بە ناوی پێواری سیستمە کەلتوورییەکانی دێرینەتری وەکو مەزهەبخاستر هەستیان پێدەکرێ هەتا ئیدئۆلۆژییە چاوکراوەکانی سەدەی نۆزدەهەم. ئاندێرسۆن دەڵێ پەرەسەندنی زمانە ناوچەیەکان لە ئوروپا بەپێی «سەرمایەداری چاپ» بەڕێوە براوە. بە نووسراوەی ئەو: «هیچ شتێک باشتر لەسەرمایەداری زمانە ناوچەیەکانی «سەرهەمبەندی» نەکرد، زمانە چاپییەکانی لە ناخی بەرتەسکییە گراماتیکی و نەحوییەکاندا خوڵقاند، و ئەم زمانانە لە لایەن بازاڕەوە رەنگیاندایەوە».[٧٢]

بزووتنـەوەی ریفۆرمـاتی [مەزهـەبی] بەتایبـەت شـاهیدی پەرەسـەندنی مـەزنی بلاوکردنـەوە بـە زمـانی ناوچەیـەکان بـوو. هـەروەها وەکـو بەشـێک لـە ئیداری شاهانی ناوچـە و نـەهادە دەولـەتییەکان بەشـێوەی بـەرفراوان کەلـکیان لـە زمانـە ناوچەییەکان وەرگرت. لە راستیدا لە زمانی چاپی یان چـاپکراو لـە لایـەن داهێنـانی پلەبالا بۆ جەماوەر ئەندێشەیـەک بـەناوی بنـەمای زانیـاری میللـی کەلـک وەرگیر یەکێک لەو داهێنانە لێرەدا رۆژنامە بوو کە هەموو رووداوەکانی جیهـانی بـە زمانـە ناوچەییەکان بۆ جەماوەری میللی وەکو گومان دەیگێڕاوە.

لەگەڵ تەوژم و بەرفراوانی زمانە ناوچەییـەکان، هـۆگری فیکـری بـە زمانناسـی فەرهەنگنووسی ریشەناسی، رێزمان، لۆغەتنامە دوو زمانییەکانیش پەرەی سـەند وزەیەکی زۆری فیکری سـەرفی ئـەم چالاکیـە جۆراوجۆرانـە کـرا.[٧٣] ناسیونالیستە یۆنانییەکان، رووسی و سربی ـ کرواتی سەدەی نۆزدەهەم هەموویان لـە موتـالاتی بەشی زمان، زمانناسی وەسف و بەیان و داهێنانە ئەدەبییەکان ئیلـهامیان وەرگـرت ئاندێرسـۆن رێنـوێنی دەکـا: «لـە هـەر کـوێ خوێنـدەواری زیـادی کـرد، سـەرنج راکێشانی خەلک بۆ پشتگری ئاسـانتر بـوو و جـەماوەر شـکۆی نـوێی لـە گەشـە بالاچوونی زمانی چاپی پەیدا کرد». پاشان درێـژەی پێـدەدا: «لـە دەیـەی دوودەمی سـەدەی نـۆزدە، وێنـەیـەک لـە دەولـەتە میللییـە سـەربەخۆکان بـۆ چـاپی کتێـب نەشریات لەبەر دەستا بـوو». شۆڕشـی فەرهەنگنووسـی سـەدەی نۆزدەهـەم ئـەو باوەڕەی چەسپاند کە زمانەکان خاوەنداریتی تایبەتی هێنـدێ لـە گرووپـەکان کـە بـە نەتەوە دەشوبهێندران، هەن. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا ئاندێرسۆن تەسـەوری دەکـرد کـە گرێبەسـتکردنی نیزامـە پادشـایەتییـەکانی وەکـو رووسـییە لەگـەڵ ناسیۆنالیزم لە راسـتیدا «ناسـیۆنالیزمی رەسمـی» بـەدیهێنا ـ ئەگـەرچی ئـەو دەڵـێ «زیرەکی و فریوکاری داهێنەرانەنی تایبەتی پێویست بوو تاکو ئیزن بـە ئیمپـراتۆری [رووسییە] بدا کە بە شێوەی رێگرێکی میللـی بـەتوانا سەرهەلـبدا».[٧٤] ناسـیۆنالیزمی رەسمی لە بناخـەوە هـەمان هاوکێشی ناسـیۆنالیزمی پارێزکـار یـان سـوننەتخوا

لەگەڵ ناسیۆنالیزمی لیبرالی عامەپەسندتر بوو. ئاخرین شەپۆلی ناسیۆنالیزم بە شێوەی ناسیۆنالیزمی دژی ئیستیعماری لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقا پەرەی سەند و هەتا رادەیەک وەڵامێک بوو بە ئەمپریالیزم. ئەم ناسیۆنالیزمە تا رادەیەکی بەربلاویش لە پەرەگرتنی زمانە ناوچەییە چاپکراوەکان، بەتایبەت ئەدەبیاتی ئوروپایی لەمەڕ ناسیۆنالیزم کە لە بەردەستا بوو، سەرچاوەی دەگرت. ناسیۆنالیزمی ئوروپایی بناخەی داهێنانی جەماوەری خەیاڵی نوێی پێکهێنا.[٧٤] بەم شێوە ناسیۆنالیزمە دژی ئیستیعمارییەکان تا رادەیەکی فرە لە ئەزموونی ئوروپا بەهرەیان وەرگرت ئەگەرچی ناسیۆنالیزمگەلێکیان بە زمانە ناوچەییەکانی خۆیان بەدیهێنا.

بەم جۆرە بەگشتی ڕێنوێنگەلێکی ئەزموونی و مێژوویی بوونی هەیە کە زمان، بەتایبەت لە بواری زمانی چاپکراودا، هۆکارێکی حەیاتی لە دەرکی ناسیۆنالیزم دەزانێ. لەگەڵ ئەمەدا، لە نووسراوەی ناسیونالیستیدا بڕێکی زۆریش ڕێنوێنی میتۆدی دەربارەی گرنگی زمان بەرچاو دەکەوێ. بیچمی بەرچاوی ئەم ڕێبازە ـ کە هەمیشە لە ریزی گرنگی ئەم لێدوانە دایە ـ هەردرە. هەردر زۆرتر لە ریزی ناسیۆنالیستی ڕۆمانتیک و لە ریزەی فەیلسووفانی دژی سەردەمی ڕۆشنبیری زانراوە. ئەم راپۆرتە بەگشتی بێپایەیە. هەردر سەردەمی ڕۆشنبیری بەڕێزەوە شیاشی لێدەکرد. ئەو هەر تەنیا نیگەرانی ڕۆماتیکەکان وەکو ئەشلگل و نووالیس نەبوو، بە هیچ جۆر وەکو ڕۆمانتیکەکان لە حەسرەت سەدەکانی ناوەڕاست، زیندووکردنەوەی کاتۆلیکباوەڕی، پەروەردەی هەستی گۆشەنشینی، راز هەڵگری سروشتی و هەستخوازی نەدەسووتا و لە عاشقی و شەیدایی ئەوان سەبارەت بە هەستی و سەرخۆشی جیا لە سروشتیش برابەش نەبوو.[٧٦] بەپێچەوانەی ئەوە کە بە گرنگی جۆراوجۆری میللی باوەڕی قووڵی بوو، واتای کاکڵی هەموو فەلسەفەی ئەو بەرهەمی سەردەمی ڕۆشنبیری لەمەڕ مرۆڤایەتی بوو کە جەوهەری هاوبەشی مرۆڤایەتی دەگرتەخۆ. بە بۆچوونی ئەو، سەرەڕای جیاوازیە نەتەوایەتییەکان، کە

به بڕوای هەردر بوونی مرۆڤی دەوڵەمەند دەکرد، هەموو مرۆڤەکان لە بنەڕەتەوە لە جۆری تاقانە و یەکدەست بوو. سەرەنجام ئامانجی سەرجەم بوونەوەری مرۆڤ، باڵاترین و هاوئاهەنگترین پەرە و تەنینەوە فێرکردن و پەروەردە بووی مرۆڤایەتی بۆ هەردر تەم و مژێکی مەزهەبی بوو. ئەو دەنووسێ: «جەوهەری مرۆڤ ـ مرۆڤایەتی ـ بەرگ یان شتێکی درواو و حازر و ئامادە نییە بەڵکە شاراوەهەڵگری راستەقینەیە. ئەمە چ بۆ ئینسانخۆرەکانی نیوزیلەندی و چ نیۆتۆن بە یەک رادە هەڵدەسەنگێنرێ، چونکە هەموو مەخلووقاتی مرۆڤ لە یەک جۆرن».[77] دۆزی سیاسی هەردر بە هیچ جۆر قەراردادی نەبوو. لە راستیدا نە واتای کۆمەڵگەی دەوڵەتخوازی رەتدەکردەوە بەجێی ئەو شتێکی هاوکێشی ئانارشی زۆرخوازی دەخواست. بۆ وێنە ئایزایا برلین ئەو لەگەڵ پرۆدۆن، تۆروو و کرۆپۆتکین بەراورد دەکا.[78] هەردر هەروەها ئەوەی کە ئەمڕۆ ناوی ناسیۆنالیزمی سیاسی لێدەنێن هۆگرییەکی نەبوو. سەرنج بیری سەرەکی ئەو لەسەر ناسیۆنالیزمی کەلتووری بوو. ئەو لەگەڵ ئەوە کە بە زیندووکردنەوەی فەرهەنگ و زمانی ئەڵمانی، کەلتووری عامیانە، رەنگدانەوەی میللی و گۆرانییەکانی عاشقانەی خۆش دەویست، وڵات پەرستی دڵپاکانەی قبوول نەدەکرد و بە قەبێحی دەزانی و هیچ مانایەکی بۆ نەتەوەکان یان نژادە باڵا یان پاینەکان دانەدەنا.

هەردر بەپێچەوانەی سیفاتی ناوبراو، راشکاوانە را و ئەندێشەی لەمەڕ زمان پێشنیار دەکرد کە بە جۆرێکی سەیر لەمەڕ پێوەندی نێوان زمان و ناسیۆنالیزم داهاتووبینانە بوو. را و ئەندێشەی هەردر تا رادەیەک سەبارەت بە لێدوانی شاراوەکانی مەربووت بە سەرچاوە و جەوهەری زمان سوودبەخش بوو. روانگە و ئەندێشەی تایبەتی هەردر دەربارەی زمان کە هاوکێش لەگەڵ روانگەی ئەندێشەی کۆندیاک، رۆسۆ و سوسمیلکە رەخنەیان لێگرتوە، هەرچەند جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ ئەوان هەیە و میتۆدی نوێی بۆ لێدوان کردووەتەوە.[79] ئەندێشەیەک کە ئەو دەیهێنا ئارا، زمانی بە ئامێری زەخیرەی زانیاری و پێوەندییەکان دەزانی

وشـەکانی بـۆ جیـا کردنـەوە و هـاوێری ئەشـیا لـە جیهـان و ئەندیـشە لـە زێهـن بەکاردەبرێن. هەردر ڕێڕەوێکی ڕوونتر یان کۆکتری لەمەڕ زمان بوو. بە بۆچوونی ئـەو وشـەکان «یـارانی پێـشقەراولی حـەیات» بـوون. ئـەو جـۆرە کـە یـەکێک لـە لێکۆڵەرەوەکانی هەردر دەنووسێ: «جەوهەری پێکهێنەری زمـانی داهێنـان دەنگـی دەرەوە نییە، بەڵکو بەدیهێنەری نمادگەلێکی وشەیەکی دەروونیە».[80] زمان بەشـێکی جودایی هەڵنەگری چالاکی چاوکراوانـە و بـەرەو پێـشچوونی بوونـەوەری مـرۆڤ بوو. لەبەر ئەمـە، لـە بناخـەوە شـێوەیەک لـە کـردەوە دەهاتـە ئـەژمار. هـەر تـەنیا ئەشـیای دەرەوەی نـاوزەد و دەسنیـشان نـەدەکرد، بەڵـکو بـە عەکسەوە دەوری چارەنووسساز و چالاکی بوو. مرۆڤەکان لە لایەن زمانەوە هەم دروستیان دەکرد و هەم دروست دەکران. مرۆڤـەکان سروشـتیان بـە هـۆی وتـار و ئەندێـشەوە دەرک دەکرد. زمانە سروشتییەکان بە شـێوەی هـاوارە سـەرەتاییەکان، لەگـەڵ ئاخـاوتنی پێـشکەوتووی مـرۆڤ جیاوازیـان هەیـە.[81] زمـان، بەشـێوەی دیـالۆگ و وتـاری پێشکەوتووی مرۆڤ، ناوجێیکەری ئازادی و زانیارییە و سەرجەم وزەکـانی مـرۆڤ دەگرێتەوە. لێهاتوویی مرۆڤ بۆ چاوکراوەیش لە لایـەن زمانـەوە فـۆرم دەگـرێ و دروست دەبێ. بە بۆچوونی هەردر، تەواوی حاڵەتی چاوکراوانەکانی ئێمە لە زماندا فۆرمە دەگرێ. لەبەر ئەمە زمان «یەکەمین و گرنگتـرین پێویـستی حاشاهەڵـنەگرەی ئۆپەراسیۆنی مێشکی مرۆڤ و بەشێکی جوداییهەڵنەگری ئەندێشەیە». بوونەوەری مرۆڤ بە هۆی خۆداهێنەری بیرمەندانە کە زمان بەشێکی جـوداییهەڵـنەگری ئـەوە، شێوەی جۆربەجۆر دەگرێتەبەر.

بە بۆچوونی هەردر، زمان نەک هەر تەنیا بە تەوسیف بەڵکو هەروەها بـە بـەیان و ڕەنگدانـەوەی هەسـتی دەروون، دڵۆڤـانی، ئەندێـشەکـان و ئـیرادەی مـرۆڤ بـە شێوەی کۆیەک دێتە ئەنجام. ئەو زۆرجار دژی ئەمە کە عەقڵ بە تەنیا لێهاتوویی زاڵ و سەرکەوتووی مرۆڤ بزانین، ئاگاداری داوە و ڕەخنەی سەرەکی ئـەو لـە دەرکـی کانت لـە سروشـتی مـرۆڤ پێکـدەهێنێ. بـە بـاوەڕی هـەردر، زمـان لـە دەرەوەی

کارکردییە هەستییەکان دروست کراوە. چونکە کارکردی هەستی هەرکەس لە مەکانی سەرەکی زمان دروست دەکا، دەرەنجام باروودۆخی مەکانی (جوغرافیا، هەرێمی و سوننەتە کۆمەڵایەتییەکان) وەلامگەلێکی جیاواز دەخاتەگەڕ. لەگەڵ گۆڕین و پەرە گرتنی زمان، کۆمەڵگە و فەرهەنگەکانیش جۆربەجۆر دەبنەوە. زمان بەردەوامی بنەڕەتی مێژوویی کۆمەڵگە و سوننەتەکانی ئەو پێکدەهێنێ - سوننەتەکان دیاردەگەلێکی هەردەم راوەستاو نین بەڵکو وەلامگەلێکە بە حەرەکەیەکی دایمین. فەرهەنگ کەژاوەی مەعنەوی ئەم پرۆژەیە. لەبەر ئەمە، گشت ئەو مرۆڤانەی کە زمان لەم ئاستەدا بەکار دەبەن، بەهۆی وتوویژ و ئاخاوتن فەرهەنگە جیاوازەکان، دیرۆکەکان و جۆرەکانی بەیانی جیاوازانە دێننە بوونەوە. بە جۆرێکیتر، هەر volk (قەوم یان نەتەوە) کۆمەڵێک زمانی جیاواز بەدی دێنێ. هەر نەتەوە رۆحی میللی جیاوازی هەیە کە بیۆلۆژیکی یان نژادی نییە بەڵکو «بەردەوامییەکی مێژوویی و کەلتوورییە».[٨٢] بە بۆچوونی هەردر، ئەمە بەشێک لە دەوڵەمەندی مەزنی جیهانە کە ئێمە لەگەڵ فەرهەنگ و زمانی جۆراوجۆر رووبەڕوو دەبینەوە کە هەرکام تاقانە و دووپات نابنەوە. لەم بارەوە بە دەرەنجام دەگەین کە ناسینی جۆری مرۆڤ بە کەڵک وەرگرتن لە زمان «بەسەرهاتی کارکردەکانی و ماناکانی لە حالی گۆڕیندا ئاشکرا دەکا».[٨٣] هەردر بە ئەندیشەی موتالای بەرفراوانی تەجربی دەربارەی ئەم سامانە جۆربەجۆرەی مرۆڤناسانە هۆگری زۆری بوو.

دەتوانین بە روونی گرنگی میتۆدی زمان بۆ ناسیۆنالیزم لە روانگەی هەردەرەوە ببینین. بیرمەندانی دواتر لە ئەندیشەکانی ئەو زۆریان سوود برد و تێبینیگەلێکی بەحس هەڵایسێنی زۆریان لەسەر ئەو زیاد کرد. لە پاش هەردر یەکێک لە بەناوبانگترین نووسەرانی ئالمانی کە ئاوڕی لە زمان دایەوە، فیختە بوو کە بەتایبەت لە کتێبی خیتاب بە نەتەوەی ئەڵماندا بۆچوونەکانی ئەو هاتۆتە ئاراوە. یەکێک لە پرمەترسیترین لایەنەکانی فیختە ئەوەیە کە ئەو ناوەندی بوونی زمان بۆ

ناسیۆنالیزم دەسەلمێنێ، لەگەڵ ئەم شەرح و بەیانە گرنگە کە ئەو بە ناسیۆنالیزمی سیاسی و ئەمەکە هێندێ لە زمانەکان (و لەبەر ئەمە نەتەوەکان) بالاتر لەم و لەون، سەرنجی دابوونێ. ئەم خالانە لە ئەندیشەی هەردردا بوونیان نییە.

فیختە باوەڕی بوو کە زمان تێگەیشتن بە مرۆڤەکان دەبەخشێ و دەیگوت «مرۆڤەکان زمانیان دروست کردووە نەک زمان مرۆڤەکان» زمان جەوهەری راستەقینەی مرۆڤ پێکدەهێنێ. سەرەڕای ئەمە، فیختە لە نێوان زمانە سروشتییەکان لەگەڵ زمانە تێکەڵیەکان جیاوازی دادەنێ. زمانی ژێرمەنی زمانێکی urvolk سروشتییە. بە بۆچوونی ئەو زمانی ئەڵمانی «لەسەردەمێکەوە کە بۆ یەکەم جار لە وزەی سروشت لە دایک بوو، زیندوو ماوەتەوە». زمانە ئینگلیسی و فەرانسەیەکان زمانگەلێکی تێکەلاوی نوێی لاتینن کە کاردانەوەی تێکەڵ بوون نیشان دەدەن. بەپێی وتەی ئەو «لە زمانە لاتینییەکاندا، شاراوە بوون و پەی نەبردن، سروشت و پێگە ئەوانە پێکدەهێنێ». ئەم جۆرە زمانانە تەنیا «لە ئاستی سەرەوە» جووڵە دەکەن بەلام «لە ریشەوە مردوو»ن. بە بۆچوونی ئەو، فۆرم و بیچمی فەرهەنگ و ئەندێشە سیاسی ئەڵمانی چوونە ناوەوەی پڕەنسیپەکانی دەرەوە بە زمانە. ئەو وێنەیەک لە پیتەکانی وەکو مرۆڤایەتی، خۆشەویستی و دەستئاوالەیی و بەخشندەیی دەخاتەڕوو و دەڵێ: «کاتێک ئەم پیتانە لە ئاخاوتن دیالۆگی ئەڵمانیەکدا کە جگە لە زمانی خۆی زمانێکی دیکە فێر نەبوە، بەکار دەبرێ، جگە لە دەنگێکی نامەعلووم و بێمانا هیچ شتێکی دیکە نییە». پاشان دەبێژێ: «ئێستە ئەگەر بەجێی وشەی Menschlichkeit بە ئەڵمانییەک بڵێین کە هاوکێش و هاوپێواری ئالمانی هەر هەمان واژەیە، ئەو لەوە تێدەگا». بە بۆچوونی فیختە دەڵێ، پێتگەلێک کە لە ریشەوە نژادی ژێرمەنین، بەلام وەکو زمانە فەرانسییەکان و ئینگلیسییەکان لەگەڵ پڕەنسیپە نوێ لاتینییەکان تێکلاو بوون، لە باری ئەخلاقی و میللییەوە لەناوچوون. لەبەر ئەمە، ئەو تەئکیدی هەیە کە «زمانی ئەڵمانی ئەگەر هەر تەنیا لە هەموو ئیمتیازەکانی خۆی کەلک وەربگرێ دەتوانێ هەمیشە بالاتر لە بێگانەکان بێ و واتاکانی خۆی بەباشی

تێبگەیێنێ و تەنانەت باشتر لەوەی کە لاوەکییەکان لە یەکتر دەگەن». بە بۆچـوونی ئەو، لە حالێکدا کە ئەلـمانیەکان لەگـەڵ زمـانی زینـدوو و کـەلتـووری زیهـنی خـۆی یەکگرتوویی بەدەسهێناوە، فەرهەنگە لەناوچووەکانی دیکـە لـە زمـانی خۆیـان جیـا بوونەتەوە. کەلتووری زێهنی «گەمەی داهێنانە». هـەر تـەنیا ئەلـمانییەکان، لـە پلـەی خەڵـکێکی یەکپارچـە، دەتـوانن بەتـەواوی دەربـارەی کـەلتـووری زیهـنی خۆیـان سەختکۆش و کۆڵنەدەر بن. لەبەر ئەمە، بـە بۆچـوونی فیختـە، فەلـسەفەی هـەموو نەتەوەکان هەمیشە بۆش و دەرەکی دەمێنێتەوە. بیرکردنـەوەکی فەیلـسووفانە یـان شاعیرانە بە زمانی ئەڵمانی بە مانای شکۆفایی و ئازاد بـوونی و روونـاک ئەندێـشە چونکە هەرکەس لەگەڵ سروشتێکی دیکە پێوەندی بێ هۆ دەگرێ. لاوەکیانێک کە بـە زمانە تێکەلاوییەکان دەبێژن و ئاخاوتن دەکەن لە پێڕەوانی خۆیان دابڕاون «چونکـە ژیانی ئەوان لە جەوهەری ڕەسەنایەتی خۆی لای داوە».[٨٤]

دوو دەرەنجامی گرنـگ لـە بابەتـەکانی سـەرەوە دەردەکـەوێ. یەکـەم ئەمەکـە هەموو خەلکێک کە بە زمانی ڕەسەن قسە دەکەن دەبێ نەتەوە و لە ئاخردا دەولەتێک پێکبهێنن. بە نووسراوەی فیختە، «لە هـەر کـۆی زمـانی جیـاواز سـەری هەڵـداوە و ریشەی داکوتاوە، نەتەوەیەکی جیاواز بـوونی هەیـە مـافی ئـەوەی هەیـە بەشـێوەی سـەربەخۆ بـەڕێوەبردنی کاروبـاری خـۆی بـە دەسـتەوە بگـرێ و سـەربەخۆیدا حکوومەت بکات».[٨٥] ئەگەر خەلکێک چاوپۆشی لـە حکوومـەت کـردن بەسـەر خۆیـدا بکات، بە بۆچوونی فیختە ئەمە «بەرامبەرە لەگەڵ ئەمەکە دەیانەوێ زمانی خۆیان لـە دەس بدەن». دووەم، هـەموو نەتـەوەکان دەبـێ بـە زمـانی ڕەسـەن قـسە بکـەن.[٨٦] سنوورەکانی هەر دەولەتێکی میللی سنوورگەلی وتەبێژان بە زمانی نـاوخۆی ئـەوە. سـنوورەکانی یەکـەم، ڕەسـەن و... سروشـتی بـوونی دەولـەتەکان بێگومـان سـنوورەکانی نـاوخۆ و دەروونی ئەوانـە. ئەوانـەی کـە یەکپارچـە نـادوێن لەگـەڵ سنوورگەلێکی زۆر نادیار بەهۆی سروشتی خۆیانـەنوە لەگـەڵ یـەکتر یـەکگرتوویان هەیە».[٨٧] سنوورەکانی دەرەوەی دەولـەتەکان دەرەنجـامی سـنوورە ناوخۆیـەکانی

ئەوانن. بە بڕوای فیختە هۆکاری جوغرافی لە بەراورد لەگەڵ زمان گرنگیەتی ئەوتۆیان نییە. ئەگەر هۆکارە جوغرافیەکان لەگەڵ سنورەکانی زمانی هاوکێشیان بێ، وەکو ئینگلستان، بێگومان باشتر و سەمەربەخشتر دەبوو. فیختە لێرەدا خاڵی شووم هەڕەشاوی پێڕەو دەکا و دەڵێ ئەگەر سنوورەکانی خەڵکی ناوخۆیی لە رادەبەدەر تەنگ بێتەوە یان ئەو خەڵکە مەیلیان بێ کە ناوچەیەکی وشک لەگەڵ ناوچەیەکی پڕپیت ئاڵوگۆڕ بکەن، دەتوانن «ئەوە بە هۆی بە دەسهێنانی خاکی دراوسێوە بۆ بە دەسهێنانی فەزایەکی زۆرتر دانیشتوانی لەوەبەری لەوێ دەربکەن».[٨٨]

کردەوەیەکی دواکەوتوانە دەبێ کە هەوڵ بدەین ئەزموونی سەدەی بیستەمی ناسیۆنالیزم بەم بیرمەندانەی سەرەتاوە نیسبەت بدەین، لەگەڵ ئەمەشدا، ئەوان گرنگی زۆر زۆری زمانئیان وەبیری ناسیۆنالیزم هێناوەتەوە. زمان بۆ زۆربەی بزووتنەوە ناسیونالیستیەکان هەتا ئەم سەردەمە یەکێک لە پرەنسیپە گرنگەکان بوە، ئەم هۆکارانە بۆ بزووتنەوە جیاوازیخوازەکانی وەکو ویلزییەکان، کەوییەکان، فلاماندیەکان و باسکییەکان جێی سەرنجی تایبەتی بووە. ئەم ناوەڕۆکە تایبەتە تەنانەت بۆ ناسیۆنالیزمی Risorgimento لیبرال لە سەدەی نۆزدەهەمدا هۆکارێکی گرنگ بوو. Risorgimento بە مانای «بەهۆشهێنەرەکان»ە و زۆر لە بزووتنەوە لیبرالە بەهۆشهێنەرەکانی سەدەی نۆزدەهەم پێوەندی نزیکیان لەگەڵ لێکۆڵینەوەی زمانناسی بووە و لەسەرووی ئەوانەوە بوون و بە ئاشکرا کردن لەمەڕ دیرۆکە دێرینەکان، گۆرانییەکان بەیت و باوی گشتی و دابونەریت و کولتوور و کەلەپووری دێرینەوە سەرقاڵ بوون. موتالای بەرفراوان کە لە ئەڵمان لەژێر چاوەدێری بارون فون ئەشتاین بەڕێوە چوو - بیرەوەری مێژوویی ئەڵمان - بە کۆکردنەوە و رێکوپێکی برێکی فرە لە زانیاری مێژوویی و زمانناسی سەبارەت بە مێژووی ئەڵمان بەردەوام بوو. دەرەنجام کۆکردنەوەی ئەم ئاسەوارە، ئەو جۆرە کە پیتێر ئالتێر دەنووسێ: «لە سیستمە سیاسییەکانی رابردوودا بە شێوەی فەرمانڕەوایی دەوڵەتە میللییەکان

داهاتوو راڤەیەکی سەرلەنوێ دەکرا».[89] ئەم دیاردە لەسەرانسەری ئوروپادا دووپات کرایەوە. بەم جۆرە ناسیۆنالیزم لیبرال لەم گەشە و نەشە زماننناسییە لانشین نەبوو. ناسیۆنالیزمی سوننەتخواز زۆرتر بەرەو تایبەتخوازی دەچوو و لە جیهان خوازی ناسیۆنال لیبرال دوور دەکەوتەوە، لە برێک ئاستدا بۆچوونی فیختەیی لەمەڕ لە پێشبوونی ناسیۆنالیزمە تایبەتییەکانی قبووڵ دەکرد. زمان لە ناسیۆنالیزمی تەواو عەییاری سەدەی بیستەمدا لە پێشبوونی نەبوو بەڵکو جێی خۆی بەتایبەت دەربارە ناسیۆنالیزم لیبرال، بە هۆکاری نژادی و بیۆلۆژیکیدا.

## دەوڵەتە نەتەوایەتییەکان

دەوڵەتی نەتەوایەتی هەمەلایەنە پەسندترین و لەبەردڵانترین بیچمی ڕێکخراوەی سیاسی و لە سەدەکانی نۆزدە و بیست بوو و لەم خولانەدا زۆر بە تالووکە پەرەی گرت.[90] دەوڵەتە فرە نەتەوە دێرینەکانی سەدەی نۆزدەهەم هەرچەند زۆرتر بە شێوەی لەباوکەوتوو ـ و «زیندانی نەتەوەکان»ـ مامەڵە دەکران. ئەمە هەمان چارەنووسی ئەمپڕاتورییەکانی هابسبۆرگ، تێزاری رووسییە و عوسمانی بوو. لە سەدەی نۆزدەهەمدا نەک هەر تەنیا دەوڵەتی میللیان بە پێشمەرجی ئازادی دەزانی. بەڵکو ئەوەیان بە بوارێ بۆ نوێسازی و ئابووری دەشوبهاند. برێک لە توێژەران وەک وێنە بۆ ئەم گۆڕانکارییە تەسەوریان کردووە: یەکەمین دەوڵەتی میللی کە لە ناخی دەوڵەتە سەرەڕۆ و نیوەسەرەڕۆکانی ئوروپای ڕۆژئاوادا گەشەیان کرد. وەکو فەڕانسا و ئینگلستان، دوابەدوای ئەوانە دەوڵەتە میللییە کەلتوورییەکان لە ناوەند و باشووری ئەوروپا و بەتایبەت دەوڵەتە میللییە یەکگرتووخوازەکانی وەک ئالمان و ئیتالیا سەریان هەڵێنا. سەرەنجامیش دەوڵەتە میللییە جیاوازیخوازەکان لە باری کەمییەتەوە بەرفراوان بوونەوە و لە رووخانی دەوڵەتە فرەنەتەونەکاندا سەرکەوتنیان بە دەسهێنا.[91]

لە تاوتوێکردنی دەوڵەتی میللی دەبینین کە هێندێ مەسەلە و گرفتی عەقلانی و تەجروبی بوونی هەیە کە پێویست بە لێکۆڵینەوەیە. یەکەمین گرفت، واژەی

«دەوڵەت»ە. ئەمە یەکێک لە پێچڕاوەترین دۆزەکانی واژەگەلی سیاسی ئوروپایە. ئەم واژە لە ناخەوە جێی دژایەتی بووە و لەسەرانسەری سێ سەت هەتا چوار سەت ساڵی رابردوو و جێی سەرنج و رامان بووە. دەوڵەت دەتوانێ رێنوێنی بەسەر خەڵکێکدا بکات کە بەشێوەی (پێوەندیدار کە مەبەستمان لە واژەی خەڵک چ بێ) لەباری سیاسییەوە رێک خراون، یان رێخراوەگەلی حکومەتی (یان رێخراوگەلی تایبەتی دەرروونی حکومەت ـ وەکو باڵی بەڕێوەبەرایەتی یان دامەزرێنەری یاسا)؛ و سەرەنجام رەنگە بە مانای پێکهاتەی یاسایی یان مەشرووتەی حکوومەتەکان یان تەنانەت دەسەلات یان دەسەلاتداران، ئیدارات یان رێکخراوەکان بێ.[92] ئاشکرا نییە کام یەک لەمانە پێوەندی بە نەتەوەوە دەبێ، مەگەر وەک ئەگەرێک لەلایەن شەرح و بەیانی «هەبوونی» خەڵکەوە بەناوی دەوڵەت، ئەگەرچی ئەم وتارانە «دەسەلاتدارێتی خەڵکی» دەگێرێتەوە بۆ رابردوو و راستەوخۆ لەگەڵ ناسیۆنالیزم یەک ناگرنەوە. بێجگەلەمە، لەگەڵ ئەمەکە واتاگەلی دەوڵەتە سەرەڕۆکان و سەرەڕۆخواز، مەشرووتەخواز، ئەخلاقی، کۆمۆنیستی، زۆرخواز، فیدرالیستی، یاساخواز لە دەوڵەتا بوونی هەیە، ئاشکرا نییە کە ئایا هیچ کام لەوانە لەگەڵ ناسیۆنالیزمدا پێوەندیان هەیە یان نا. بە جۆرێکی دی، دەوڵەتی میللی پێویستانە هیچ جۆر، یان شێوەیەکی تایبەتی لە دەوڵەت ناگرێتە خۆ. لەم بابەتەوە بۆچوونی کۆمەڵێکی خالیسە. حکوومەتی سەرەڕۆ و تاکحزبی توندڕۆ رەنگە هەر بەقەدەر مەشرووتەخوازی لیبرال لەگەڵ ناسیۆنالیزم یەکسانی هەیە. لەبەر ئەمە، لەگەڵ ئەوەی کە پێگەی بێبایەخی «دەوڵەتی میللی» لە باری زمانناسی و ناو و ناوبانگی ئەو، هەمیشە ئەم سەرلێشێواوایەی باقیە کە ئەم لە دەسدانە بەتەواوی ئاشکرا و روونە هەم لەمەڕ جەوهەری دەوڵەت بوونی هەیە و هەم لەمەڕ پێوەندی دەقیقی ئەو لەگەڵ نەتەوە.

دووەم، ئەو جۆرە کە لە دێڕەکانی سەرەوە گوترا، شاراوەیەکی قووڵ لەمەڕ خودی تایبەتمەندی نەتەوە بوونی هەیە. واتاگەلێکی ئاشکرا لە «دەوڵەتی میللی» لە رێبازە جۆربەجۆرەکانی ئەندێشەی ناسیونالیستی مەوجوود هەن. بەم شێوە، جەوهەری دەوڵەتی میللی دەبێ، لەگەڵ تیپۆلۆژی تایبەت یەکسانی ببێ. لە باری

تیپۆلۆژی گشتی پەسندکراو و لەم بەشە، دەتوانین ئاماژە بە واتاکانی لیبرالی. سوننەتخواز، و تەواوعەییار لە دەولەتی میللیدا بکەین. یەکەم واتە واتای لیبرالی. سەدەی نۆزدەهەمدا پەرەی گرت و هەتا رادەیەکی بەرفراوان لەگەل بۆچوونی کلاسیک لە دەولەت و «دواتر لیبرالی نوێ یان کۆمەلایەتی» بەرامبەری دەکا کە لەگەل کێشەکانی ناسیونالیستی مامناوەندی یەکسان بوو. ناسیونالیستە لیبرالەکان هەمیشە لە شێوەی حکوومەتی پارلەمانی، دیموکراسی نوێنەرایەتی، مافەکان و ئازادی تاک، کۆمەلگەی مەدەنی گەشەکردوو، ئابووری بازار و حکوومەتی یاسا پشتگریان دەکرد. لە راستیدا بەپێچەوانەی ناوبانگی ناسیۆنالیزم بە تەئکید لەسەر تایبەتمەندی و مەکانخوازی، ناسیۆنالیستە لیبرالەکان هەمیشە لایەنگری نەتەوەی لیبرال بە شێوەی جۆرێک جیهانی بوون. ئەمە بێگومان ئامانجی گرووپی «ئیتالیای لاو» کە ئیلهامی لە ماتزینی وەرگرتبوو، پێکیدەهێنا و ئێستاش هەر لە لایەن ناسیۆنالیستە لیبرالە هاوچەرخەکانەوە پشتیوانیان لێدەکرێ.[93] هەروەها تەئکیدی هەموو رێبازە ناسیونالیستەکان لەسەر خودموختاری گرنگی هەیە. خودموختاری بەپێچەوانە مێژووی پڕباز و رەمزی خۆی لە سەدەی بیستەمدا، هەمیشە بە شێوەی هۆکارێکی بەهێزی لیبرالی ناسراوە. هێندێ لە زێهنگەلی لیبرالی تاکی خودموختار و نەتەوەی خودموختار هاوکێش لەگەل یەک دەزانن.[94] دەربارەی ناوەرۆکی لیبرالیزم شیکردنەوەیەکی زیادی بچووک لێرەدا زەرووڕەتی هەیە. زۆر بوونی کوتوپڕی نوێتری هۆگری ناسیۆنالیزمی مامناوەندی بە نووسەرانێکی وەک دەیڤید میلێر لە ناسیۆنالیزم بۆ پایەدارکردنی بەرانبەری بلاوکردنەوەی «سۆسیالیزمی بازار» سوود وەردەگرێ.[95] ئەمە رەنگە ئەم فیکرە بێنێتە ئارا کە ناسیۆنالیزمیکی سۆسیالیستی بوونی هەیە. رای من ئەوەیە کە ناسیۆنالیزمی سۆسیالیستی هەمیشە «بەتایبەت لە لێدوانگەلێکی تازەتر» بەشێوەی لیبرالی دەستەوداوێنی رێنوێنی دەبێ و لەبەر ئەمە، لە دەروونی وتراوەی ناسیۆنالیزمی لیبرالیدا ئاسانتر دەگونجێ.[96] ناسیۆنالیزمی پارێزگاری سوننەتخواز و ناسیۆنالیزمی تەواو عەییار واتە جیاوازەکانی خۆیان لەمەڕ دەولەت بەرفراوان کردۆتەوە. دەربارەی نووسەرانی سوننەتخوازی پارێزگار ئەم دۆخەیان بەجۆری شایان پاساوی ناوبراو دەکا، هێندێ

پرەنسیپ لە بریتانیا بەتەواوی لایەنگری سوننەتی Rechtsstaatن، هێندێکی دیکە لە فەرانسا و ئەڵمان زۆرتریان لە وێنەکانی وەک سنفخوازی، ئۆرگانیسیزم و پلەبەندی هەیە.[97] دەربارەی ناسیۆنالیزمە تەواو عەییارەکان (وەکو فاشیزمی ئیتاڵیا) دەبێ ڕینوێنی بکرێ کە ئەوانە هۆگریان بە دەوڵەتی بێوێنە و تایبەتخوازی ئەخلاقی بووە.

جگە لە شاراوەکانی سەرەوە لەمەڕ دەوڵەت و نەتەوە و پێوەندی ئەوان لەگەڵ یەکتر، گرفتێکی دیکەش بوونی هەیە کە دەکەوێتە پلەی یەکەمی ـ دەوڵەت یان نەتەوە. هۆی جوستوجۆی وەلامێک بۆ ئەم پرسیارە ئاسانە: زۆر لە نووسەرانی ناسیۆنالیست ئارەزوویان بووە کە بۆ نەتەوە بە شێوەی هەستییەکی سروشتی، یان لانیکەم شتێکی زۆر دێرین، لە پێش بوونێک قایل بن و لەم ڕووەوە گوتویانە نەتەوەکان، دەوڵەتەکانیان لە خەیاڵی خۆیاندا خولقاندووە. سەرەڕای ئەمە، بەپێچەوانەی ڕێنوێنیگەلێکی شاراوەی ئانتۆنی سمیت لەمەڕ پێگەی سەرهەڵدانی قەومی نەتەوەکان، بەڵگەکان ڕێگایەکی دیکە نیشان ئەدەن، بەتایبەت ئەگەر بەجێی «قەوم و تایەفە» سەرنج بدەینە «نەتەوەکان».[98] دەوڵەتە قەبیلەیەکان و تاقانە سواری گۆڕەپان لە ماوەی چەندین سەدە لە پێشبوونی نەتەوەکانەوە بوون. بێگومان بە ئەندام بوونی هاوبەش، پێکهاتەکانی یاسایی و سوننەتگەلی دەوڵەتەکان لەگەڵ چەسپاندنی سەرەڕۆ پێگەیەکی تەواو و دڵخواز بۆ «ناسیۆنالیزمە سەرەتایەکان»ە. بەلام واژەگەلی ناسیۆنالیزم هێشتا بوونیان نییە و دواتر دێتە ئاراوە. ئەگەر تەنانەت ناسیۆنالیزم هەنووکە بیچمێکی بەرچاوتری هەیە، ئەمەش گرنگە کە تێبگەین هەموو شێوەی ئەمەگناسی و ڕەوا لە ناخی دەوڵەتەکاندا توانیویەتی بوونی ببێت و لە ناو ئەوانەدا تەنیا ناسیۆنالیزم دیاردەیەکە کە لە دوو سەدەی ڕابردوودا سەری هەڵداوە. لەبەر ئەمە، دەوڵەتەکان سەدان ساڵ بەر لە نەتەوەکان لە ئوروپا بوونیان بووە، و بەپێچەوانەی دیرۆکەی ناسیۆنالیستی سەدەکانی نۆزدە و بیست، وا نایەتە بەرچاو کە ناسیۆنالیزم پێویستانە بە مانەوەی خۆی یان پاراستنی حکوومەت درێژە بدا.

گرفتێکی زاتی دیکە دەربارەی پێوەندی ناسکی نێوان نەتەوەکان و دەوڵەتەکان بابەتەکانی سەرەوە پێش دێ. پرسیاری سەرەکی لێرەدا بە جۆرێکی دڵەڕاوکێی ساکارە: ئایا دەوڵەتەکان و نەتەوەکان لە سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم ـ واتە ترۆپکی باوەڕی ناسیۆنالیستی ـ بە جۆرێک لەگەڵ واژەی تێکەڵی «دەوڵەتی میللی بەرامبەریان هەیە؟ شێوەگەلێکی زۆر بۆ ئەم پرسیارە بوونی هەیە. یەکەم ئەمە کە ئەم خاڵە جێی لێدوان و داکۆکییە کە ئەگەر لە روانگەی کردەوەیەوە بدوێین لە حاڵێکدا کە نەتەوەیەک لەگەڵ دەوڵەتێک سازگاری ببێت، ئەو دەوڵەتە باشتر بەسەر حکوومەت کردندا زاڵ دەبێ. بەم حاڵەوە ئەمە رەنگە بە دوو مانا بێ: دەتوانی تێبینییەکی ساکار بێ کە لە باری ئەزموونییەوە جێی باسە، یان ئەمە کە ناسیۆنالیستەکان ئەندێشەی ئاسانتر حکومەت کردن دێننە ئارا. تێبینی یەکەم لەگەڵ مامەڵەی کلاسیکی نووسەرانی سوننەتیتری وەک هەردر و فیختە پێوەندی هەیە لەبەر ئەمە کە دەوڵەت و نەتەوە لە ئاستی تەجروبی یان سروشتیدا کەمتاکورت سنووری هاوبەشیان هەیە. ئەو جۆرە کە هەردر دەڵێ: «سروشتیترین دەوڵەت بوونی نەتەوەیەک لەگەڵ تایبەتمەندییەکی میللییە».[99] تێبینی دووەم لەسەر ئەو بنەمایەیە کە نەتەوەکان پێکهاتەگەلێکی رواڵەتین کە دەوڵەتەکان بۆ ئاسانتر حکوومەت کردن پلان بۆ ئەوان دادەنێ. ئەم بۆچوونە بەرامبەری هەیە لەگەڵ بۆچوونی کەسانێکی وەک بێندیکت ئاندێرسۆن یان گێلنێر کە نەتەوە بە دیاردەیەکی رواڵەتی لەسەر بنەمای تەسەوور دەزانن. رێگای دیکە بۆ بەیانی پێوەندی نەتەوە دەوڵەت ئەمەیە کە نەتەوە ئەگەر لەگەڵ دەوڵەتی خۆماڵی بە حکوومەت بکرێ. پایەدارتر دەبێ. دەوڵەت گرێبەستکراوی پاڵپشت کردنی نەتەوە دێتە ئەژمار. ئەمە دەتوانێ لەگەڵ خاڵی یەکەمیش پێوەندی ببێت، چونکە دەکرێ وابیر بکرێ کە دەوڵەت کاتێک دەتوانێ باشتر حکوومەت بکات، کە نەتەوە هەر تەنیا لە ناخی پێکهاتەیەکی دەوڵەتیدا گەشە دەکات.

بەپێچەوانەی بابەتەکانی سەرەوە، گرفتگەلێکی زۆر بوونیان هەیە. دەوڵەتەکان پێکهاتەی مافە گشتیترەکانن کە بە ئەندام بوون لەواندا لەگەڵ یاسا پێناسە دەکرێ.[100] بە پێچەوانەوە نەتەوەکان جۆرێکی دیکە لە هەستی کۆمەڵایەتی.

تایبەتیتر، فەرهەنگمەدارتر و دلۆڤانترن کە بەشێوەی گشتی، لەگەڵ پێواری جۆرێکی دیکە پێناسە دەکرێن. ئەو جۆرە کە باسکرا، دەوڵەت لەباری مێژوویيەوە چەندین سەدە لە پێش نەتەوەوە بوە و بێ‌ئەو ئاشکرا دەوامی هێناوە. ئەم بابەتانە تا رادەیەک بێزەرەرن. لەگەڵ ئەمەدا، کاتێک لە پێوەندی لەگەڵ بابەتەکانی دیکە رووبەروو دەبینەوە، واتە ئەمە کە نەتەوەکان و گروپگەلێکی قەومی زۆر لە دەروونی زۆرینەی دەوڵەتەکاندا بوونیان هەیە، ئەوکات لێدوان هوروژێنتر دەبێ.[101] ئەم زۆر بوونی قەومیانە و زۆر بوونی ناسیۆنالیزمانە لە ماوەی چل ساڵی رابردوودا هاوکات لەگەڵ ئاوا بوونی ئیمپڕاتۆرەکانی «ئیستیعماری» رۆژئاوایی، زۆربوونی پێوەندییە هاموشۆیەکانی نێونەتەوایەتی و کۆچەرییە بەرفراوانەکانی خەلک، پەرەیان سەندووە. مەسەلە هەروەها لەگەڵ زۆر بوونی هۆگری بە نەبوونی کۆ، ناوچەگەرایی و فیدرالیزم لە دەروونی دەوڵەتەکان و ولاتەکاندا، تا رادەیەکی زۆرتر پەرەی سەندووە. دیاردەی حەز و مەیل بە زۆر بوونی فەرهەنگەکان و زۆرتر بوونی ناسیۆنالیزمەکان لە ولاتانی رۆژئاواخوازی وەک کانادا، زلاندی نەو، ئوسترالیا لایەنی بەبرەوتر و ئاساییتری گرتوە بەخۆوە و لە ولاتەکانی دیکەی وەکو بریتانیا، ئەڵمان، فەرانسا و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دیاردەیەکی هەمیشە روو (لە) زۆر بوونە؛ ئەگەرچی دەبێ بوترێ کە ولاتگەلێکی وەک ژاپۆن ئێستاشی لەگەڵ بێ، رووی خۆشی بە زۆر بوونی فەرهەنگ نیشان نەداوە.

بەم جۆرە، لە حالێکدا کە ناسیۆنالیستەکان دەوڵەتەکان و ولاتگەلی دێرینی فرەنەتەوەی سەدەی نۆزدەهەمیان کردبووە گالتەجاڕ، هەنووکە بارودۆخ هەڵگەڕاوەتەوە. هەنووکە تەسەورێکی بەڕاستی هەڵەیە کە بیر بکەینەوە هەموو ولاتەکان لەگەڵ نەتەوەکان سازگارییان ببێت.[102] ناسازگاری ناکۆکی راستەقینە لەگەڵ رەوەندی مێژوو و دواکەوتووخوازی و زیندانی مرۆڤایەتی ئەگەری واتای لە تەنگانە کەوتنی دەوڵەتی میللی لێدەکرێ. سەرەرای ئەمە، نەتەوەکان کۆما قەومەکان و زمانەکان کەوتوونەتە بالای سنوورەکانی دەوڵەتەوە. جگەلەمە، بڕێکی زۆری گروپەکانی بالانەتەوەیی بە شەریکە فرەنەتەوەییەکان؛ شەریکەگەلی جیهانی

لەگەڵ سەرچاوەی بەرفراوانتر لە سەرچاوەی دەوڵەتەکان، بە شەریکەکان و ئەنجوومەنگەلی نێونەتەوایەتی؛ بازرگانی و پێوەندییەکانی جیهانی؛ نەهادگەلی بالانەتەوەیی بوونیان هەیە. رواڵەتەن هیچ کام لەمانە لە دەولەتی میللیدا بەرتەسک نابنەوە. زۆر لە لایەنە لێدوان هورووژێنەکانی ژیان ـ پیسی، کۆنترۆلی پێگەی ژین، تێکنۆلۆژیگەلی هەستەیی و ئامێرە جەنگییە نوێکان ـ نە مەسەلەی میللین نە دەولەتی. دەولەت هێشتا بە ئاشکرا ئەرک و کارکردگەلێکی بەرفراوانی هەیە، بەلام دەوری ئەو تا رادەیەک کەم بوەتەوە و ئەم کارکردانە دەتوانن بێناسیۆنالیزم بە باشی بەڕێوە ببرێن. بەم حالەوە، لە ئێستادا تەنانەت خەیاڵ و تەسەوری جیهانی بێدەولەت دژوارە.

یەکێک لە مەسەلە گشتییەکان لە لێدوانی پێوەندی نەتەوە/ دەولەت ئەمەیە کە ئەم پێوەندییە بەتەواوی لە داوی واژەناسی دیکە ئەسیر بووە. بۆ وێنە پێوەندی بەهێزی نێوان ناسیۆنالیزم و ئەندێشەی دەسەلاتداریتی بوونی هەیە. واژەی دەسەلاتداریتی لە واژەگەلی سیاسی ئەوروپاییدا تا رادەیەک دێرینەیە و چەندین سەدەیە کە مانایەکی زۆر لە ئارادان کە لەم واژە بەر لە ناسیۆنالیزم سوودی لێوەرگیراوە. یەکێک لە مانای حەیاتی دەسەلاتداریتی کە لە سەدەی حەڤدەهەم هاتەئارا، حاکمییەتی خەلکە. ئەم واژەیە بەتایبەت لە واژەگەلی سەردەمی شۆرشی کە بیری فەرانسا گرنگی بە خۆوەگرت.[١٠٣] دەسەلاتداریتی ماوەیەکی زۆرە کە بەپێی یاسا، پاشا، یان فەرمانڕەوا دەرک ناکرێ بەلکو زۆرتر لە پێوەندی لەگەڵ خەلک «یان volk» دەناسرێتەوە و لە زۆربەی لێدوانەکاندا، واژەی «خەلک» هاوسنوور لەگەڵ «نەتەوە» بووە. خەلک یان نەتەوە لە باری یاسادانان و سەربەخۆیی و حکوومەت کردن بەسەر خۆدا لە دەروونی دەولەتی خۆدا بە حاکم زانراون. دەولەتەکان ئەم هاوکێش بوونەی خەلک و نەتەوە لەگەڵ هەمەلانە کردنی چاوکراوەیی جەماوەرەکان لە لایەن زمان و سیاسەتەکانی فێرکردنی دەولەتەوە بەهێزیان کردووە. ناسیۆنالیستەکان هەمیشە هەموو خەلک (بێجگەلە جارجارێک کۆچەران و کرێکارانی دەرەوە) بە هاوراوێژی خۆی دەزانێ. ئەوان هەروەها رەوا بوونی سیاسی لە دەروونی سەرجەمدا دەبینن. هەرکە رەوا بوون و مانا و گرنگی

سیاسی سەرجەم خەڵک جێکەوت، ئەو کات هەنگاوێکی کورت بەرەو واتای حەیاتی دیکە ـ واتە دیموکراسی ـ هەڵدێتەوە کە رەنگدانەوەی رواڵەتی ئیرادەی نەتەوە.[104] ئەم دیموکراسییە میللیانە مومکینە لیبرالی، شۆڕشگێڕی یان بەتەواوی پارێزگارانە بن. زانیاری خەڵکی یان میللی قۆناغێکی تایبەتە و زۆرتر لەژێر ڕێبەرایەتی برێک لە نوخبەگەرایی خاکم بە وەتەنپەرستی توندرەوی دوژمنی کردنی بێگانە بیچمی خۆی دەگۆڕێ. دیموکراسی بایەخی زاتی نییە بەڵکو زۆرتر ئامێرە. برێک مەسەلەی رەوا بوون چارەسەر دەکا، بەلام کاتێک هاوکێش لەگەڵ ئامانجە میللییەکانی دەوڵەت دەبێ، ئەو کات چارەنووسی تەواوی ئەو بۆ پێشبینی نابێ.[105] پێوەندی نێوان دیموکراسی و ناسیۆنالیزم لە نووسراوەکانی کەسایەتیگەلێکی وەک ئەرنێست رۆنان و جان ستوارت میلیشەوە بەهێز کرا. رۆنان تەوسیفێکی بەناوبانگی لە نەتەوە هەیە و ئەوە «بەهەموو پرسی هەموو رۆژە» ناودێر دەکا، و بە بۆچوونی میل ئیرادەی نەتەوایەتی رەنگدانەوەیەکی دیکە لە مادە و جەوهەری حکوومەتی دیموکراتیکی نوێنەرایەتی بوو.[106] بەم حاڵەوە، مانایەکی دیکە لە دیموکراسی وەکو دیموکراسی هاوبەشی سانترالیزمی دیموکراتیک یان «دیموکراسی سەرمایەداری» فاشیستی بوونی هەیە. دیموکراسی هەر تەنیا پێویستانە لەگەڵ دیموکراسی لیبرال بەتەنیایی پێوەندی نییە. دەسەڵاتی میللی دیموکراتیکی خەڵک دەتوانێ شاراوە مافەکانی تاک پێشێل بکات. ئەم کارە دەکرێ بەلای لایەنگرانی «دیموکراسی سەرمایەداری» ناسیۆنالیزمی فاشیستییەوە ببینرێ.

حەیاتیترین واتای یاسا، یان بەڵگەی ناسیۆنالیستی کە ئەمەش پێوەندی نزیکی لەگەڵ دیموکراسی و حاکمییەت هەیە، خودموختارییە. ئەمە پرەنسیپێکە کە لەسەر بنەمای ئەوە هەر نەتەوەیەک مافی هەیە خۆی لەگەڵ پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ فۆرم بدا و حکوومەت یاساکانی خۆی دەسنیشان بکات. ئەمە واتایە کە بەتایەت لە لێدوانەکانی سەدەی بیستەمدا بەهێزەوە هاتە ئارا، ئەگەرچی تەبارنامەی ئەو بەرەو داو و بۆ سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم دەگەڕێتەوە. زەمانی بالای ناوبانگ و ترۆپکی بەرچاوی ئەو بلاوبوونەوەی چواردە پرەنسیپی پرێزیدێنت ویلسۆن پاش جەنگی جیهانی یەکەم بوو. هەر ئەو جۆرە کە تۆژەرێک نووسیویە: «خودموختاری بە

بۆچوونی ویلسۆن پیتێکی دیکە بوو بۆ دەسەڵاتداریتی خەڵک».[107] بۆچوونی خەڵک لە ڕاستیدا هەمان بۆچوونی خودا بوو. ویلسۆن خۆی لە ڕادەی کەسانێک کە لە ئارەزووی خودموختاریدا بوون سەرسووڕ مابوو.[108] ویلسۆن هەروەک ماتزینی لە سەدەی نۆزدەهەم، بە بوونی برێکی ئاستەنگی نەتەوە باوەڕی بوو. هەر دووکیان وایان بیر دەکردەوە کە ڕادە و ئیمکاناتی کردەوەی هێندێ لە دەوڵەتە میللییەکان بەرتەسک دەکا.[109] پاش جەنگی جیهانی دووەم، خودموختاری یەکێک لە پایە گرنگەکانی وتووێژی دەوڵەتەکان دەربارەی پاککردنەوەی ئیستیعمار بوو.[110] لەگەڵ پێکهاتن و پەرە گرتنی ڕێکخراوە نێونەتەوایەتییەکان، خودموختاری ئەگەرچی ئێستە لە ناخەوە لەگەڵ شاراوە بوو بە واژەی وتاری سیاسی کۆتایی سەدەی بیستەم.[111]

ئەو جۆرە کە بەر لەمە باسکرا، لە ڕێنوێنی لەمەڕ خودموختاری گواستنەوەیەکی زیرەکانە لەباری گۆڕین بە ڕێنوێنی لیبرالی قەراردادی لە پێوەندی لەگەڵ ئازادی تاک بوونی هەیە. تاکی ئازاد خودموختارە لەبەر ئەمە، میللی ئازادیش بە ڕواڵەت خودموختارە. نەتەوە بووە بە پێواری حکوومەت. جگە لە گرفتێک کە لە وتن لەمەڕ «خودی» نەتەوەیێک بوونی هەیە، مەسەلەی حەیاتی لێرەدا ئەم ڕاستییەیە کە خودموختاری میللی پێویستانە لەگەڵ خودموختاری تاک یەکسانی نییە. ناسیۆنالیستە لیبراڵەکان ڕواڵەتێک لە ڕاگواستنی خودکاری یەکێک بە یەکی دیکە پەسند دەکەن. هەموو نەتەوە خودموختارەکان، دەتوانن لە هەمان حاڵدا نەتەوە ئازادەکان بن.[112] لەبەر ئەمە دیموکراسی نوێنەرایەتی دەتوانێ بەشی نەهادە بنەڕەتییەکان بێ. خودموختاری لە ئاستی تاکدا ڕەنگە بەم مانایە بێکە حکوومەت ئەوانەی کە ڕەئی دەدەن، ئازادانە دەسنیشان دەکەن. بەم حاڵەوە خودموختاری لە بوارێکی دیکەدا تەواوکەری مافی دەوڵەت یان جەماوەر بۆ مەوجوودیەتی سەربەخۆ و جیاوازی خۆیەتی. مافی volk [نەتەوە]ی ئەڵمان لەژێر فەرمانڕەوای ناسیۆنال سۆسیالیستەکان، یان هەر سیستەمێکی تایبەتخوازی دیکە، هەروەها لەگەڵ خودموختاری ڕەوا بوون بەدەسدێنێ. لەم بارەی دوایدا، تاکەکان دەکەونە هاوبەشی کردن یان «خۆیەکان»ی خۆیان لەگەڵ سیاسەتە میللییەکان دەناسن. بە بارێکی دیکە، لەم ڕوانگەی دواییدا پێگەیەکی کەم بۆ ئازادی تاکی ئۆرتۆدۆکس یان

دێموکراسی نوێنەرایەتی بە شێوازێکی لیبرالی یان سۆسیال دێموکراتیک بوونی هەیە. لە راستیدا لە باری واژەیەوە زۆر دژوارە کە بزانین چۆن خودموختاری تاکی خالیس دەتوانێ لەگەڵ خودموختاری میللی سولح بکات. هەر دوو رواڵەتەن لەگەڵ یەکتر بەشێوەی شاراوە جیاوازیان هەیە و بە چۆنیەتی راڤەیەکی ناسکەوە بەسراونەتەوە کە لە پێوەندییەکی تاک لەگەڵ نەتەوە بەرێوە بچێ. بەشێوەی رواڵەتی، ناسیۆنالیزم بەناوی خودموختاری هەر بەو رادە لەگەڵ فاشیزم سازگارە کە لەگەڵ لیبرالیزم چ بە ناوی دێموکراسی و چ دەسەلاتدارێتی واژەیەکی شاراوەیە.

## ئابووری میللی

لە ماوەی سەدەی رابردوودا ناسیۆنالیزمی ئابووری یەکێک لە رەوەندەترین خۆنوێنی بە کردەوەی، ئەگەرچی هێشتا دوولایەنە، لەگەڵ ئابووری سیاسی لیبرالی ئۆرتۆدۆکسدا بووە. لە بناخەوە، ناسیۆنالیزمی ئابووری رەوشتێکە کە دەخوازێ نەتەوە لە زەمانی شەڕدا بەشێوەی مامناوەندی خۆبژێو و لە خولەکانی ئاشتیدا لە ژیانی ئاسوودەیدا بێ. باوەڕی هەیە کە نەتەوەکان تێدەکۆشن کە پێوارەکان و قاڵبگەلی شیاوی ژیان بۆ ئەندامی خۆی بە هۆی رەچاوکردنی سیاسەتە لەپێشترەکان بۆ پیشەکانی خۆی و هاندانی خۆی و کڕیاران بۆ کڕینی کەل و پەلەکانی ناوخۆ پێکبێنن هەتا هاوکێش کردنی بازرگانی لەگەڵ دەرەوە و هەندەران و پێوارە میللییەکان پایەدار و مسۆگەر بێ. لەبەر ئەمە، گوزەران و ئاسوودەیی ژیانی میللی پێوەندی نزیکی لەگەڵ ئاسوودەیی ئابووری هەیە. لەسەرەکیترین ئاستی خۆیدا باوەڕی هەیە کە پرۆژە ئابوورییەکان لە پلەی یەکەمدا لە دەروونی سنوورەکانی دەولەتە میللییەکاندا دەسنیشان بکرێن نەک بەهۆی بازرگانی نێونەتەوایەتی. ئەم ناسیونالیزمە ئابوورییە بۆ پشتگری لە پیشە تازەپێگرتووەکان دژی بازرگانی گشت ولاتەکان دەتوانێ سیاسەتی شەڕخوازانە ـ کاتی راپەڕین بە قۆناخی ئەمپریالیستی ـ یان پشتگری ببێت.

ئەندیشەگەلێکی زۆر جیاواز زۆرتر دەربارەی ناسیۆنالیزمی ئابووری هاتوونە ئارا. لە پلەی یەکەمدا گرنگ ئەوەیە کە لە نێوانی ئەوانەدا جیاوازی دابنێین. بەم

حاڵـەوە، ناسـیۆنالیزمی ئـابووری زۆرجـار بەرامبـەرە لەگـەڵ دوو بزووتنـەوەی ئابووری ئۆروپایی تایبەت، واتە کامرالیزم و مێرکـانتیلیزم زانـراوە. بـەم جـۆرە بـۆ وێنـە ناسـیۆنالیزمی ئـابووری زۆرتـر لـە کتێبەکانـدا بـە نـاوی نئۆمێرکـانتیلیزم تەوسیفیان کردووە. ئەم ڕێبازە لەگەڵ خۆبژێوی ئابووری، ناسـنامەکان و پێرسـتی نرخەکان و سیاسەتە پاڵپشتەکانیش دەناسرێتەوە. هەموو ئـەم پرەنـسیپانە دەکـرێ بە ڕواڵەت و پلە جیاوازەکان لە ناسیۆنالیزمی ئابووری بزانرێ.

کامرالیزم لە سەدەی شازدەهەمدا لە هێندێ دەوڵـەتەکان و هەرێمـەکانی ئەڵـمان سەریهەڵـدا و پـەرەی گـرت. ئـەم ئەندێـشە ئابوورییـە پێوەندیـەکی نزیکـی لەگـەڵ مەسەلەکان و تێبینییە سیاسـەتە مالییەکانی ئیـدارەی حکوومـەتی و شـێوازی فـەنی بوو. لەم ڕووەوە کامرالیزم نەک هـەر تـەنیا لەگـەڵ باشـترین ڕێـی بـە دەسـهێنانی سـامان لـە لایـەن دەوڵـەتەوە بەڵـکو لەگـەڵ باشـترین شـێوازی بـەکاربردنی ئـەم سـامانەش سـەروکاری پەیـدا دەکـرد. ئـەم ئەندێـشە کۆمەڵـێک لـە خزمـەتکاران و کارپێـسپێراوانی فەرمانـڕەوایانی سیاسـی هێنایـە ئـاراوە.[114] هـۆگری و ئامـانجی سەرەکی ئەوان ئاسوودەیی ژیانی گشتی لە هەر دەوڵـەتێک یـان هـەرێمێک تایبـەت بوو. بنەڕەتی ئەم ئاسوودەییە لە دەسـتکەوتێکدا بـوو کـە لـە نیشاندانی نیازەکـان مسۆگەر دەبوو. بەم شێوە کـامرالیزم بـە نـاوی تێکنۆلـۆژی مـەدەنی بـۆ ئیـدارە و فەرمانـڕەوایی و حکوومـەت بـەرفراوان و پـەرەی گـرت. بـۆ زانـستی ئـابووری و بەتایبەت دەرامەتە مالییەکان بە شـێوەی پانتایـەکی سـەربەخۆ و جیـا لـە سیاسـەت نەدەڕوانین، بەڵکو لـە لایـەنێکی یەکپارچـەیی گرنگیـان دەزانی کـە لـە ئاسـوودەیی ژیانی گشتی هەرێمی یان وڵاتدا بەشی هەیـە. بـە جـۆرێکی تـر، ئـابووری پێـڕەوی ئاسوودەیی ژیانی سیاسی دەوڵەت بوو. زۆر لە هەرێمە خودموختارەکـانی ئەڵـمان لەو سەردەمەدا و تەنانەت هەتا سەرەتای دەیەی ١٨٠٠ لەباری جەماوەر و خاکـەوە بچووک بوون و لانیزۆری ئابووری وەرزێڕی و گوندییان بوو. بڕێکی زۆر لەوانـە ئەمیران و شازادە سەرەڕۆکانی ناوخۆ ئیدارەیان دەکرد. تـاک بەپێـڕەوی دەوڵـەت دەزانرا و دەوڵەت وەک بنەماڵەیەکی مەزنی یەکگرتوویی شازدە و ئـەمیر مامەڵـەی لە تەکا دەکرا.

کامرالیزم لەگەڵ مێرکانتیلیزم بەراوردیان کردوون، ئەگەرچی ئەم بەراوردە ئاستەنگیگەلێکی هەیە. لە لووتکەی گەشەکردنی کامرالیزمدا، ئابووری زانست جیا لە دەوڵەت نەبوو. لە لایەکی دیکەوە، مێرکانتیلیزم واتای خۆزانیاریانە لە ئابووری سیاسی بوو، ئەگەرچی هێشتا لەگەڵ بەرژەفرِی دەوڵەتە بنەماڵەیەکان، یان پاشایەتی کۆخواز پێوەندی بوو. سەوداگەران یان مێرکانتیلیستەکان باوەڕیان بە پشتگری کردن لە پیشە ناوخۆییەکان لە لایەن پێکهێنانی بەرگەی پێناسە، میزان کردنی بارودۆخی کارخانەکان بوو. تەنانەت بە دەسهێنانی موستەعمەرات لەم دەلاقەوە بۆی دەڕوانین و دەیان ویست لەوەی ماددە خاوەکان بۆ پیشەکان و کارخانە ناوخۆیەکان مسۆگەر بکەن. ئەم ڕێبازە هەروەها ئیدارەی بەراوردکراوی میزانی پاکردەکان بۆ سەرکەوتنی ئابووری بە حەیاتیان دەزانی. لایەنگری پێشکەوتن و بالا بردنی پیشەکانی ناوخۆ لە لایەن یارانە دان بە ناردن و نەبووین هاندان بەهێنان بوو. مێرکانتیلیزم لە ئینگلستان و کیشوەوی ئورووپا باوەڕی سەرکەوتوو و بەهێز لە بواری ئابووری سیاسیدا هەتا سەدەی هەژدەهەمی پێکدەهێنا. هێندێ لە لایەنگرانی ئەو سەردەمەی ئەم ڕێبازە رووداوی بەدەس هێنانی زێڕ و زیو لە لایەن یەکسان بوونی پێویستی بازرگانیشیان لە ریشەی مێرکانتیلیزم داناوە. ئامانجی مێرکانتیلیستەکان هەمیشە ناردن بالاتر لە هێنان بوو هەتا رووداوی بە دەسهێنانی ئاسنی بەنرخ و بە سوود. بەم جۆرە بەرهەمی مێرکانتیلیست لە سامان بەرامبەر لەگەڵ بەدەسهێنانی ئەم ئاسنەبە نرخە بوو.[115] هیچ کام لە مێرکانتیلیستەکان باوەڕیان بە ئابووری خۆبژێوی نەبوو. بازرگانی هەمیشە پێوست بوو، بەلام سوودی رووبەڕوو لە بازرگانی بە خەیالی خاو مامەڵەی لەگەڵ دەکرا.

مێژووی دۆزی دەوڵەتی خۆبژێو تەقریبەت دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای فۆرمگیری کۆبوونەوە سیاسییەکان لە یۆنانی دێرین.[116] بەم حاڵەوە، یەکێک لە کاملترین رەنگدانەوەکانی ئەم دۆزە دەکرێ لە کتێبی فیختەدا بەناوی دەوڵەتی بازرگانی بەسراوە بدۆزرێتەوە کە بە بۆچوونی هێندێ لە لێکۆڵەران لە ستایشی قوولی بە کۆششەکانی ژاکۆبنەکان لە کۆنترۆلی پاش شۆڕشی فەرانسا سەرچاوە

دەگرێ. لەو سەردەمەدا لە پرۆس مێرکانتیلیستەکان لەژێر گوشاردا بوون و رەنگبێ لە ١٧٨٦ لە مەیدانبەدەرکران کە بە ئالۆزییەکی ئابووری گەیشت. فیختە نە لایەنگری مێرکانتیلیزم بوو نە بازرگانی ئازاد. ئەو باوەڕی بە دەولەتێکی سەختگیر بوو کە کۆنترۆڵی ژیان، کار و هێمنایەتی هەموو هاوولاتانی بە ئەستۆوە بێ. ئەو هەستی دەکرد کە کار نابێ بۆ هاوولاتیان باری قورسی رۆژانە بێ بەڵکو دەبێ بە شێوەی کارێکی چێژبەخش هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکرێ. ئەم چێژە دەبێ لە لایەن بڕیارنامەی بە زۆرەملەی دەولەت لەگەڵ کرێکاران مسۆگەرە بێ هەتا کاری مەعاشی ژیانی ئەوان لە کاردا دەستەبەر بێ. دەبێ هەمووکەس لە سەرانسەر ژیانی خۆیدا لە هەژاری و دەسکورتی و کەم و کووڕی بەدوور بێ. دەولەت دەبێ چاوی لە خەلک بێ؛ لەبەرئەمە، هیچ کەس زیاتر لە نیازی خۆی پوول و پارە نەشارێتەوە و پاشەکەوتەی زیادی نەکات. لە راستیدا پێکهاتەی گشتی دەولەت بە شێوەی سەرهەودا پێچراوەکان لە بڕیارنامەکانی نێوان گروپە رێپێداکانی تەولیدکاران، پیشەوەران و بازرگانان تەسەوور دەکرا.[117] بە بۆچوونی فیختە، ئابووری کۆنترۆڵنەکراو بە کۆششی شێتانە بۆ بەدەسهێنانی پارە دەگەیشتە ئەنجام کە بەش بە حالی خۆی سەری لە ئانارشی و کەس لە کەس و شەڕ دەردەهێنا. تاقانە مالیات دەبوایە بۆ مەعاشی کارمەندانی رەسمی دەولەت، مامۆستایان و ئەرتەشیان وسوول بکرێ کە هەلبەت هەموو ئەمانە دەبێ مووچە و هاوکاری بەرامبەریان لەگەڵ گروپەکانی دیکە ببینێت. هەروەها دەولەت دەبوایە لە لایەن حوکمی رەسمییەوە هەموو نرخەکان و بایەخەکانی دیاری بکات. بایەخەکان بەپێی سوود وەرگرتن و گۆڕینەوە بوون. بایەخی سەرەکی بووشلێک (بەرامبەر بە ٣٦/٤ لیتر دانەوێلە بوو. بەم جۆرە هەموو بایەخەکان ئالوگۆڕ دەبوایە لەگەڵ «پارەی دانەوێلە بەراورد بکرێ و فیختە رێنوێنی دەکرد کە باشترە بەجێی لێدانی سکە، ئەسکناس تایبەت بەناوی (Landgeld ـ پوول و پارەی ولاتێک) بە چاپ بگات کە لە (weltgeld ـ پارەی جیهانی) کە دەبێ بەتەواوی لەژێر کۆنترۆڵی دەولەتدا بێ) بۆ ئالوگۆڕ ببینێت بووشلێک (کەویژ یان ربە) دانەوێلە بەرامبەر بە ئەسکەناسێک Landgeld بێ ـ فیختە پێشنیاری دەکرد کە ئەم ئەسکەناسە (پارەی کاغەزی پشتیوانەدار) دەکرێ لە پارچە

چەرمێک بێ.[118] سەرەنجام ئەمە کە، سنوورەکان دەبێ پلەپلە بەرووی هەموو بازرگانەکانی دەرەوە دابخرێ و دەوڵەت لە باری ئابوورییەوە خوبژێ و بکرێ. بە بۆچوون فیختە (لە دەوڵەتێکی پەسندکراوی عەقڵیدا کەسایەتی راستەقینە نابێ سەرقالی بازرگانی راستەوخۆ لەگەڵ خەڵکی وڵاتێکی دەرەوە بێ».[119] هەر چەشنە بەستنی نیوەکارە و زۆر کەمی سنوورەکان هەر دەیتوانی هۆی ئازار و رەنجان بێ. لەبەر ئەمە، داخستنی سنوورەکان دەبێ بەتەواوی بێ. مەکینەکان، ماددە خاوەکان و بەرهەمە وەرزییەکان دەبێ بە وەسیلەی دەوڵەت بێتە ناوەوە، بەلام سنوورەکانی دیکە دەبێ بەتەواوی داخراوبێتن. تاقە کەسانێک کە رێی سەفەر بە دەرەوەی وڵاتیان هەیە، بیرمەندان و لێکۆلەرەوانن کە زانیاری تایبەت بە داهێنان و فنوونی نوێ لەگەڵ خۆیان دێنن.[120] چاوەروانی لەوان دەکرێ لەگەڵ پیشە ناوخۆییەکان هاوکاری نزیکیان ببێت و داهێنان و فەنی نوێ رابگوازنە ناو ئەوان. بە بۆچوونی فیختە وەها وڵاتێک دەتوانێ بۆ هاووڵاتیانیش بێ بە بەهەشت. هێمنایەتی تەواو هاووڵاتیانیشی مسۆگەر دەکا و هەژاری لەودا بوونی نابێ، هەموو بەختەوەر دەبن، مالیات کەم دەبێ و تاوان کەم دەبێتەوە. باشترە وەبیر دێنێتەوە کە فیختە خۆبژێوی ناوبراوی لەگەڵ باوەڕی پتەو بە پێناسەی میللی بەپێی زمان پێکەوە گرێ دەدا و ئەمە هەر ئەو ناوەرۆکەیە کە لە کتێبی خیتابەکاندا لەمەڕ ئەو لێدوان کراوە. وڵات هەر تەنیا کاتێک سنوورەکانی لەباری بازرگانی بەتەواوی دادەخرێ کە بە «سنووره سروشتییەکان» گەیشتبێ، سەرەڕای ئەمە، وەها سنوورگەلێک مومکینە لە شێوەی پێویست لەگەڵ شەڕ و لە کاتی سەرکەوتن بەدەست بێن.[121]

کتێبی فیختە لە تاریکە شەوی سەدەی نۆزدەهەمدا بە دەستی فەرامۆشی سپێردرا، ئەگەرچی کەسانێکی وەک فێردیناند لاسال بوون کە لە ناخەوە بە کتێبی ئەو هۆگر مانەوە. زۆر لە ناوەرۆکە دایرکراوەکانی فیختەش لە بوارەکانی دیکەدا سەرهەڵدەدەن، ئەو جۆرە کە شوێنی پێی دۆزەکانی ئەو لە لووتکەی گەشە کردنی خولەکانی داڕشتنی پرۆژەی یەکێتی سۆڤیەتدا هێندێ کەس دەیبینن. ئەگەرچی ئەمە برێک تێکەڵ بە شات و شووتەوە و نەگونجاو دێتەبەرچاو.[122] لەگەڵ ئەمەشدا، کاتی ئابلۆقەی ئابووری لە لایەن هاوپەیمانانەوە لە جەنگی جیهانی یەکەم و پاشان

سەرلەنوێ لە ١٩٢٣، لە سەردەمی وەزارەتی دوکتۆر شاخت لە رژێمی نازی کە یەکەمین مێعمارانی پرۆژەکانی ئەڵمان بۆ خۆبژێوی بوو، هۆگری ئابووری بە ئاسەواری فیختە لە ئەڵمان سەرلەنوێ گەشایەوە. دۆزەکانی فیختە لە زەمانە بەشێوەی گشتی لە بواری ئابووری جەنگی خۆبژێوی دابوو کە بەریگای جۆربەجۆردا لەگەڵ روانگەی ئەو پێوەندی بوو. هەرچەند کە ئەندێشەکانی فیختە دەنگدانەوەیەکی تایبەت و دیاری لەسەر ناسیۆنالیزمی تەواو عەییار و ناسیۆنالیزمی سوننەتخواز بوە، لەسەر ناسیۆنالیزم لیبرال کاردانەوەیەکی ئەوتوی نەهێشتووە. بەم حاڵەوە، ئاشکرایە کە خودی فیختە بە وەها رێژەیەک رازی نەبوو.[123]

ناوێک کە زۆرتر لە هەمووان وەبیرهێنەری ناسیۆنالیزمی ئابووری پشتگرخوازی ئابووری لە سەدەی نۆزدەهەم دایە. فریدریش لیستی ئابووریزانانی ئەڵمانیە بەتایبەت لەگەڵ کتێبەکەی بەناوی سیستەمی میللی ئابووری سیاسی.[124] بوار و بەستێنی کتێبی لیست لە پلەی یەکەمدا دوژمنی ئەو سەبارەت بە سیاسەتەکانی توجارەتی ئازادی بریتانیا و شالاوگەلی بەرهەمەکانی کارخانەی ئینگلیستان بە بازاڕەکانی ئەڵمان بوو. ئەو بە تەواو هێزەوە لایەنگر یەکێتی مشتەریان بۆ هێندێ لە دەوڵەتە هەرێمەکانی ئەڵمان بوو (Zollverein) کە دەبوایە لە بەرامبەری پەلامار و تالانی پیشەکانی ئینگلیسی پشتیوانی لەوان بکرێ.[125] بەبڕوای لیست مێژووی بڕیارنامەکانی بازرگانی ئینگلیس کۆششێک بوو بۆ رەوانە کردنی دەستکەوتی کارخانەکانی ئینگلستان بۆ بازارە تازەکان و «لەناوبردنی پیشە ناوخۆیەکانی ئەو وڵاتانە».[126] لیست سیاسەتی بازرگانی ئینگلستانی بە یەکێک لە ریشەکانی شۆڕشی ئەمریکای دەزانی.[127] ئەو بەتایبەت لە مێژووی «یاساکانی زەریاوانی ئینگلستان» و گفتگۆکانی نێوان ئینگلستان و یەکێتی هانسای [کە رێکخراوەیەکی پێکهاتوو لە شارەکانی ئەڵمان و گروپە بازرگانییەکانی ئەڵمان لە دەرەوەی وڵات بۆ داکۆکی لە بەرژەوەندی بازرگانیان دەدرایە قەڵەم] لە عەزاب بوو. بە بۆچوونی لیست ئینگلستان بە هۆی ئاڵوگۆڕی بازرگانییەوە لەگەڵ مامەلەچیانی هانسای لە کێوی بوونی وەرزێڕی رزگار ببوو. ئەو کات بە هۆی

سیاسەتی داکۆکی و پشتگری، وەکو «یاساکانی زەریاوانی» کە نەترسانە لە بازرگانی دەرەوە لە دوورگەکانی بریتانیا بەرگری دەکرد، بالاتر بوونی پیشەسازی و بازرگانی هۆلەند و ئەلمان لە دوورگەکانی ئینگلستان دەکرد. لیست ئەم کارەی بە هۆکاری بەرتەسک کردنەوەی بازرگانی یەکێتی هانسای دەولەتە هەرێمییەکانی ئالمان ولاتی هولەند و هەروەها لەمپەرێک بۆ کۆچەری کرێکارانی شارەزا لە ئوروپا و ئینگلستان دەزانی. ئینگلستان بە کردەوە ئەم رووداوەی بە مەبەستی بەهێزکردن و باشکردنەوەی پیشەکانی خۆی دنەی دەدا. ئەم پرەنسیپە دەربارەی زوغالسەنگ و ماسیگیری قبوول و بەکاردەبرا. ئینگلستان پاشان نەترسانە بەهێزی دەریای بەتوانای خۆی پاسەوانی لەم سیاسەتە دەکرد.[128] لە راستیدا ئەو ولاتە حازر بوو بۆ پاراستنی ئەم سیاسەتە تەنانەت شەڕی بۆ بکات، وێنەی ئەوە جەنگی دەریای ئینگلستان و هۆلەندا بوو. ئینگلستان پاش گەیشتن بەم لە پێش بوونە بازرگانییە بە بۆنەی کەلوپەلی حەیاتییەوە بێبەزەییانە، خۆی بە پشتیوانی بازرگانی ئازاد پێناسە کرد کە لە راستیدا ئامێرێکی دیکە بوو بۆ پاراستنی سیاسەتی دلەکوتەی ئابووری خۆی لە بازارەکان. لەبەر ئەمە، ئامانجی لیست ئەوە بوو کە ئەلمان و نەتەوەکانی دیکە لە دەست سیاسەتی بازرگانی ئازادی ئینگلستان نەجات بدا.

لیست لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ئادام سمیت لەمەڕ وردەکاری مێژووی بازرگانی بریتانیا روالەتەن فەرامۆشی هەلبژاردن بووە.[129] لیست بازرگانی ئازاد، ئابووری بێ بەندوبار و جیهانوەتەنی دەدایە بەر پەلامار، بەلام بە ئیحتیاتەوە رێنوێنییەکانی خۆی دەخستە چوارچێوەی مێژووەوە. ئەو باوەڕی بوو کە هەموو نەتەوەکان لە قۆناخی دوایی خوارەوە تێدەپەڕن: شوانی؛ وەرزێڕی، پیشە کارخانەیەکان هاوکات لەگەل وەرزێڕی.[130] قۆناخی دوایی پێویستترین قۆناخ بوو بۆ سەربەخۆیی میللی بەو مەرجە کە نەتەوە خاوەنی خالی بەرفراوانی تەواو، جەمعیەت، سەرچاوەی سروشتی تەواو و ماددە خاوەکان بێ. بە بڕوای لیست، نەتەوە لەگەل زمان، ئەدەبیات، مێژوو، داب و نەریت، یاساکان، سنوورەکان و خوو و ریشەکانی خۆی دەناسرێتەوە و زۆرتر لە نێوان نەتەوەکاندا جیاوازیگەلێکی زەق

و حاشاهەڵنەگر بوونی هەیە. بە رای ئەو هەر نەتەوەیەکی بێ ئاو و خاکی تەواو یان زمانی جیاواز مەحکووم بە رووخان و شکان بوو. ئەو وەکو زۆربەی هاوچەرخانی خۆی بیری دەکردەوە کە نەتەوەکان لەسەر بنەمای سنووری دیاریکراو و ئاو و هەوای خۆی لەگەڵ یەکتر جیاوازیان هەیە - نەتەوەد سەرکەوتووترەکان دانیشتووی ناوچە خۆش ئاو و هەواکانن.[131] بازرگانی ئازاد بڕێک لە قۆناخەکان وەکو قۆناخی وەرزێری، پڕ بە پێست بوو؛ لەگەڵ ئەمەدا، کاتێک پیشە کارخانەیەکان لە حاڵی پێهەڵگرتندا بوون، لە قۆناخی سێیەم، دەبوایە بە بەرگە پێناسە گومرکییەکان پشتگری کرابان تاکو دەرفەتی بەربڵاوبوونەوەی تەواو بە دەس بێنن. ئازادی نێونەتەوایەتی بازرگانی بە مانای کۆیلایەتی میللی بوو. «ڕێنوێنی پیشەسازی تازەپێهەڵگرتوو» کە لیست ئەوە بە بەرامبەر لەگەڵ قۆناخی سێیەم دەزانێ، لە لایەکەوە ئەلکساندر هامیلتۆن لە کتێبی راپۆرت لەمەڕ بابەتی کارخانەجات پێڕەوی کرا و هامیلتۆن لەم کتێبەدا هەستا بە پشتگری کردنی حکوومەت بۆ هاندان و پاڵپشتیکردن لە پیشە ناوخۆیەکان ، لیست ئەم ڕێنوێنییەی بەرفراوان کردەوە کە دەوڵەتە هەرێمییەکانی ئەڵمان و پیشەکانی ئەو خولەی لە قۆناخی سێیەمدا دەبینی. توجارەتی ئازاد دیسان دەبێ لە قۆناخی چوارەمدا پڕ بەپێست بێ، واتە کاتێک کە نەتەوە بە رادەی پێویست بەهێز بوو بکەوێتە ململانێ. بەم حاڵەوە بۆ دووری کردن لە خولی گەڕانەوەی بەرەودوای ئابووری، سیاسەتی توجارەتی ئازاد دەبوو بە ترسەوە بەکارببرێ.

لیست لەنێوان ئەوەی کە ناوی ئابووری جیهانوەتەن و لەبەر ئەمە، بازرگانی ئازاد، دەیتوانی کار بکات. بەر لەوە، ئابووری میللی پێویست بوو تاکو مانەوە و گەشەکردنی پیشە ناوخۆیەکانی نەتەوە مسۆگەر بکات. لیست دەربارەی ئابووری جیهانوەتەنی هەم لەگەڵ ڕێبازی فیزیۆکراتەکاندا بوو هەم لەگەڵ ئادام سمیت.[133] ئەو حاشای لەوە بوو کە ئابووری میللی بەم بۆنەوە دەربەست لایەنگری گەڕانەوەد بۆ مێرکانتیلیزمە. بە عەکسەوە کێشەی بوو کە ئەو هەر تەنیا برێک پرەنسیپی بەبایەخی لە مێرکانتیلیزمی بە قەرز وەرگرتووە.[134] ئەو هیچ سکاڵایەکی لە جیهانوەتەن نەبووە. لە راستیدا بۆ ئەو ئاشکرا بوو کە نەزمێکی ئابووری بێخەوش

و ساخ دەبێ لە دوا لێکدانەوەیدا ئامانجی توجارەتی ئازاد بێ. ئەو هەروەها تەئکیدی دەکرد کە سیستەمی ئابووری سالم دەبێ وەکو بریتانیا، یان ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دارژاو لەسەر بنەماکان و بایەخە لیبرالەکان بێ. مەوجوودییەتێکی دەولەمەندی توجارەتی هەر تەنیا لەگەڵ پلەیەک لە ئازادییەکانی تاکی ناوخۆ گەشەی دەکرد.[١٣٥] لەبەر ئەمە، ئاشکرا بایەخە لیبرالەکانی بەتەواوی ستایش دەکرد و باوەڕی بوو لە ئەندێشەی سیاسیدا دەبێ لیبرال بی. سەرەڕای ئەمە، لەسەر ئەم باوەڕەش بوو کە ئۆرتۆدۆکسی ئابووریزانانی لیبرال نەیاندەزانی چۆن دەربارەی بنەماکانی ڕێنوێنیگەلی خۆیانەوە لێدوان بکەن.[١٣٦]

لیست زانیاری لە برێک لایەنە گرنگەکانی لیبرالیزمی زەرووری دەنرخاند. یەکەم ئەمەکە، نەتەوە لیبرالەکان، وەکو ئینگلستان کە لە بازرگانی ئازاددا بەهێزتر بوون ئەم پلەبەرزیەیان لەگەڵ وەلاتانی توجارەتی ئازاد لە رابردوو و پشتگری لە پیشە میللییەکانی خۆیان بە دەسهێنابوو. دووەم، بۆ ئەو ولاتانەی کە دواتر دەهاتنە ناو کێبەرکێی پیشەسازییەوە، پلەی بازرگانی ئازاد کەمتر بوو. لە راستیدا لە چاوی نەتەوەکانی لە حالی پەرەسەندندا، توجارەتی ئازاد زۆرتر وێچووی ناسیۆنالیزمە پەرەخواز و ئەمپریالیستی نەتەوە بەهێزترەکان بوو، بەلام بە بەرگێکی دیکەوە.[١٣٧] سێیەم توجارەتی ئازادی لیبرالی و بایەخە لیبرالییەکانی کاریان بۆ بازارە ناوخۆیەکان دەکرد و بەسوود بوون. بەلام هەمیشە بۆ بازرگانی دەرەوە پربەپێست نەبوون. ڕێنوێنی و باوەڕی توجارەتی ئازاد، بەرفراوانکردنەوەی مەنتقی ڕێنوێنی بوو کە هێرشی دەکردە سەر ئاستەنگییەکانی حکوومەت لە پانتای ناوخۆدا. سەرەڕای ئەمە، وەها پەرەسەندنێک هەمیشە مەجاز و شیاو نەبوو. لیست وەبیر دێنێتەوە کە لە «بازرگانی ئازاد»دا زەروورەتی جیاوازی نێوان ئازادی بازرگانی لە دەروونی ولات و ئازادی بازرگانی نێوان نەتەوەکان نەدرابووە قەڵەم.[١٣٨] ئەو دەیگوت ئەم خالە سەرەکییە لە بینینی ئادام سمیتدا پۆشراوە ماوەتەوە. چوارەم، لیبرالیزمی جیهانوەتەن بوونی نەتەوەکان بەتەواوی ناهێنێتە ئەژمار و لەبەرچاوی نەدەگرت. دەسەلاتی سیاسی ئەوان و کاریگەری کەلتووری دەخستە پشتگوێ و بەجێی ئەوە خوازیاری تاکخوازی ناکۆمەلایەتی دەبوو. لە

ئابووری لیبرالدا واتای بخۆری جیهانی وەپێش هاوولاتی میللی دەکەوت. پێنجەم، لیبرالیزمی جیهانوەتەن لە زانینی ئەم خاڵە کە سامانی راستەقینە نابێ لەگەڵ پوول و پارە بەراورد بکرێ بەڵکو دەبێ لەگەڵ دەسەڵاتی تەولید و دروستکردن بەراورد بکرێ، تێدا مابۆوە. بەپێچەوانەی ئادام سمیت و بۆچوونی ئەو، وزەی بەرهەمێنانی ئەو رادە کە لەگەڵ یەکگرتوویی کاری بەرهەمێنانی هاوبەش ئاسان دەبوونەوە لەگەڵ دابەشکردنی کار ئاسان نەدەبوونەوە. بە وتەی لیست: «وەکو کارخانەیەکی دەرزی دروستکردن لە نەتەوەیکیشدا بەهرەمەندی هەر تاکێک -لە هەر بالێکی جیاوازیانەی تەولیدا - و سەرەنجام نەتەوە بەگشتی، پێوەندی بە کۆششەکانی هەموو ئەو تاکانەوە هەیە کە لە پێوەندی تایبەتدا لەگەڵ یەکتر هەیانە».[139] یەکگرتوویی و یەکپارچەیی نەتەوە، هەم بناخەی بەرهەمهێنانە و هەم بنەمای ئاسوودەیی ژیان و بەختەوەری ئەوان. شەشەم، لیبرالیزمی جیهانوەتەن، دەرەنجامی نابینای خۆی سەبارەت بە مێژووی بازرگانی، لەم راستەقینە غافل ماوە کە دارژاوە لەسەر بوونی پێشووی نەتەوە. هەمیشە دەولەتخوازییەکی شاراوە و ناسیۆنالیزمێکی بەشێوەی ئاماژەیی لە ئەندیشەی لیبرالدا بوونی هەبووە. دەولەتەکان و نەتەوەکان دوا بواری سەرەکی بازارگەلی لیبرالی سەرکەوتوویان پێکدەهێناوە. چوارچێوەی یاسای میللی، داکۆکی میللی، ئاسوودەیی ژیانی میللی، ئامانجەکانی میللی و دەولەتی میللی، هێمنایەتی بەکردەوە هەستپێنەکراو و بەشێوەی بوار و راخەری بازار بووە. بە بۆچوونی لیست، لەبەر ئەمە، بێ هۆ نەبوو کە کتێبی گرنگی ئادام سمیت ناوی سامانی نەتەوەکانی لێنرابوو.[140] لیست لایەنگری ئەوە بوو کە ئامانجەکانی میللی بەشێوەی ئاشکرا لە چوارچێوەی لیبرالیدا بگونجێندرێ. دەستێبردن و دەستکاری حکوومەت لە بازاری میللی بەهۆی سیاسەتگەلی پشتگری، ئەوەی کە لەوەبەر لە ئەندیشەی لیبرالدا بەشێوەی دەروونی و ئاماژەیی بوونی بوو ئاشکرای کردبوو. دەبێ لێرەدا دەرکەوتبێ کە لیست لایەنگری تاقانە ترسی و تاقانە شەڕخوازی، ناسیۆنالیزمی سوننەتخواز یان ناسیۆنالیزمی تەواو عەییار نەبوو، بەڵکو لایەنگری لە ناسیۆنالیزمی لیبرالی بەبایەخ و پێچراوە دەکرد.

# دەرەنجام

لە میانەی هەموو ئیدئۆلۆژییەکاندا کە لەم کتێبەدا لەمەڕ ئەو لێدوانمان کردووە، ناسیۆنالیزم پێچراوەترین مەسەلەکان بەدیدێنێ. تەنانەت سەرسەریترین بینەری رووداوە سیاسییەکان لە دەیەی رابردوو، بە گرانی دەتوانێ رەتی کاتەوە کە ناسیۆنالیزم وزەیەکی زۆر بە هێزی لە جیهانی سیاسەتدا بوو. بە پێچەوانەی بە جۆش هاتنی مەزنی ناسیونالیستەکان لە خولی پاش جەنگی جیهانی دووەم لە ئاسیا، ئافریقا و رۆژهەلاتی ناوەڕاست، لەگەڵ ئەمەدا بە بۆچوونی برێک کەس ناسیۆنالیزم لە کۆتایی سەدەی بیستەم باوی بەسەر چووە و خولی بالای راستەقینەی ئەو سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بووە. گومانی تێدا نییە کە جیهان پاش سالی ١٩٤٥ پرەنسیپی بەرهەلستکاری بۆ هێندێ لە ئارەزووە بەرزەکانی ناسیۆنالیستی بووە. هاوکات بوونی مێژووی ناسیۆنالیزم لەگەڵ فاشیزم و ناسیۆنال سۆسیالیزم، لە گەشە و نەشەی شاراوەی ئەو، هەتا دەیەی ١٩٨٠ بەتایبەت لە ئوروپا کەم رەنگ و کال بووبووە. بێجگە لەمە، هەم کاردانەوەی دیموکراسی لیبرال و هەم کۆمۆنیزمی لە خولەکانی پاش جەنگ یەکێتی ناموقەدەسی نێوان ئەم دوانە دژی ناسیۆنالیزم سەری هەلێنابوو. بە زمانێکی ساکارتر، لە هیچ کام لەم دوو ئیدئۆلۆژییەدا حەز و مەیلێکی ئەوتۆ بە دۆزی ناسیۆنالیستی بەرچاو نەدەهات و ئەمە تا رادەیەک لەو رووەوە بوو کە هەر دوو خاوەنی ئارەزووی بەرزی جیهانوەتەنانە و نێونەتەوایەتی بوون. جگە لەمەش، جەنگی سارد و گفتوگۆکانی سیاسی نێوان ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت بووە هۆی ئاستەنگی و کەمبوونەوەی هەست و سۆزی ناسیۆنالیستی لە پانتاکانی بندەستی هەر دوو دەسەلات. دیموکراسییە لیبرالەکانیش لە روالەتا و تا رادەیەک بە هۆی سوور بوون لەسەر موداراکردن، زۆرخوازی و جۆربەجۆر لە دەروونی جەماوەرە مەدەنیەکان، مایلبوون کە کاریگەرییەکانی ناسیۆنالیزم خاو کەنەوە و لە دەوری خۆی بخەن. سەرەنجام، ئاسوودەیی ژیانی رێژەیی ماددی، و ئابووری زۆربەی سیستەمە دیموکراتیکە

لیبرالییەکان لەسەردەمی پاش جەنگ، گیرایی و کێششی ناسیۆنالیزمی بە شێوەی کەژاوەی دەنگ دەربڕین و سکالای بەرتەسک کرد.

لە حالی حازر، واتا و کردەوەی ناسیۆنالیزم لە هەڵوێستی نائاسایی دان. ئەو جۆرە کە لەسەرەوە گوترا، زۆر کەس تەسەور دەکەن کە ناسیۆنالیزم لە خولی پاش سالی ١٩٤٥ لە حالی ئاوا بوون و گیانەڵلا دایە. تایبەتمەندییەکانی ئەو رەوەندە بەردی بناخەی ناسیۆنالیستەکانی دژی ئیستیعمارە. لایەنگرانی «باوەڕی ئاوا بوونی» ئەم ناسیۆنالیزمە دژی ئیستعمارەیە لایەنێکیان لەژێرخان و خەندەکی میللی راڤە نەکردووە کە هەرکە دەوڵەتە میللییەکان دادەمەزرێن بە کرژی بەرەو لاواز بوون دەڕۆن. لە راستیشدا ئەمە تا رادەیەک راستە کە یەکگرتوویی بزووتنەوە ناسیونالیستییەکان و ئازادیبەخش، پلە بە پلە لەگەڵ دامەزرانی دەوڵەتەکان و پەرەگرتنی ئەوان لەناو دەچێ. لەگەڵ ئەمەشدا، رووداوەکانی پاش سالی ١٩٨٩ راست هیواکانی کەسانێک کە بەتایبەت لە ئورووپا چاوەڕوانی مەرگی ناسیۆنالیزمیان دەکرد، بەدینەهێنا. زۆر لە ترسەکان، رەخنەکان و گومانگەلی کەونی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم لەمەڕ ناسیۆنالیزم لە پڕ سەرلەنوێ زیندوو بوونەتەوە. لە زۆربەی بوارەکاندا ناسیۆنالیزم وا دێتە بەرچاو سەرلەنوێ سیستەمی تایەفییان ئاشکرا کردووە کە جارێکی دیکە زیندەخەوگەلێک لە نژادپەرستی، قەومکوژی و چەواشەخوازیگەلێکی چەکدارانە لەوانەوە سەری هەڵێناوە. دێتە بەرچاو کە ناسیۆنالیزمە لە بواری فیکریدا لەگەڵ شەپۆلی بەگوڕی بنەماخوازییەکانی هاوبەش بووە. ئەو جۆرە کە هابس باون دەنووسێ: «ئەگەری ئەوە دەکا کە دید و بینینی بالای زەمینی، تایبەت بە خۆ بوون و هەڵسوکەوت، ترس لە بێگانە و بنەماخوازی بە شێوەی لایەنگەلێک لە دیاردەکانی بێگانە (تاقانە) ببینێ».[141] تەنیا جیاوازی نێوان بنەماخوازی مەزەبی و ناسیۆنالیزم ئەوەیە کە ناسیۆنالیزم لە باری شاراوەتر بوون و کەمتر پرۆگرامدار بوونی کێشی زۆرتری هەیە. هیچ شتێک ناتوانێ بۆشایی ناسیۆنالیزم پڕ کاتەوە و جۆش و خرۆشی نامەنتقی بدۆزێتەوە. لە راستیدا ئەمە یەکەم رەخنەیە کە دەتوانرێ دژی ئەو بەکار ببرێ. پێچەوانەی گشت ئیدئۆلۆژییەکانی تر

